لەناو کوردان غیرەت کەم بووە! ........ ٥٨٢
ئەسەف بۆ مسوڵمانان بەناوی وەلی چی بۆیان نەقل کەن، قبوڵی ئەکەن! ........ ٥٨٣
لە هەموو عومری خۆم یەك ساعەت بە تەواوی مسوڵمان بام کافییم بوو! ........ ٥٨٣
کوڕێك دایکی خۆی عەزاب دەدا! ........ ٥٨٤
کە مانگ ئەگیرێ تەقە تەق ئەکەن! ........ ٥٨٤
کەمایەتییە، بە کلکە تەشی موقابەلەی تەیارەی بەریتانیا! ........ ٥٨٥
دوشمنە ڕاستیەکە ئەوانەن، کە ماون و فیراریان کردیە! ........ ٥٨٦
خەفەت زۆرە قسەم گەلێ ماوە! ........ ٥٨٦
نەصرەتی خوای بە کل لەچاو کردن ئەدرێ؟ ........ ٥٨٧
قوربان! وەقتی ئەو قسانە نییە، ئیشەکەم لەقیس ئەچی! ........ ٥٨٨
کورد لە مەلای سیاسی سفر بێ تاریخن! ........ ٥٨٩
ئەوەی دوای نەفسی خۆی کەوێ، عەمەلی ساڵح ناکا! ........ ٥٩٠
مسوڵمان نەبووبا نەیئەتوانی وا بکا! ........ ٥٩٠
ئەپاڕایەوە یا پانی شین! ........ ٥٩٠
وەکی پیرێژنان لە سینگی خۆیان ئەدەن! ........ ٥٩١
کورد بۆ بۆ سەر حوسەین ناگرین؟ ........ ٥٩٢
با من بۆ عەرەب و تۆ بۆ یۆنان بگریەین، ئەدی کورد؟ ........ ٥٩٣
ئەگەر کەسێ قەدحێ لە ئایاتی قورئان یا لە حەدیسێ بدا، عەرەبەکان ئەیڵێنێ: فەیلەسووف! ........ ٥٩٤
ڕیجالی سیاسی، تا ئیشی پێتە تەشیت بۆ ئەڕنێ! ........ ٥٩٥
شەخسێ دێتە ئێرە، لام وایە ئەحمەقە! ........ ٥٩٥
بە دوای ڕەسوولی سەلام مەکەون هەمووی درۆیە، سیاسەتە! ........ ٥٩٦
مسوڵمانان کەڵکی شەڕیان لەگەڵ ئەجانیب پێوە نەماوە! ........ ٥٩٧
باپیرم حاشییەکی هەیە بە ڕیسالە حیسابە! ........ ٥٩٧
ئێکی ڕووت و برسی و سەرمای بێ! ........ ٥٩٧
بۆیە خوا دەستی لێ هەڵگرتین، موبالاتمان پێ ناکا! ........ ٥٩٨
نەمزانی عیزرائیل مەخجوولم ئەکا! ........ ٥٩٨
لە کۆنە دارخورما دەرکان دروست ئەکەن، پێلەقەی پێدادەی پارچە پارچە ئەبێ! ........ ٥٩٨
کورد بێ پیاون! ........ ٥٩٩
هەڵێ، خۆ بشارەوە، هەی هاوار ڕووس هات، چی بکەین چارەسەرە؟ ........ ٦٠٠
گیتم! بەقوربانت بم! دەی بە سەدەقەت بم، لێی دە! ........ ٦٠٠
ئینگلیز دوشمنی غالب بە دۆستی مەغلوب نادا! ........ ٦٠١
وەفا بە عەهد بوویتە مایەی تێشکان! ........ ٦٠١
شیعە تەرجیحی موشریکان ئەکەن بەسەر سوننیان! ........ ٦٠١

نویژ بوو بە عادەت!..................... ٦٠٣
قسەیە مەعقوول، لاکین بیستم تەحقیریان کرد..................... ٦٠٤
بە ئیعتیماد سوننی بە عەمەل موعتەزیلی!..................... ٦٠٥
لە بنی زوبانیان ئەزاندرێ مەسدەری ئەو نەرمییە، حیزبیە، موخەننەثیە!..................... ٦٠٥
دوو فەقێ منیان دیت لەرزین!..................... ٦٠٦
ژنە ئەورووپایی ژن ڕەزالەت ئەکەن بۆ دونیا!..................... ٦٠٦
ئەلقابی کۆییان!..................... ٦٠٧
حەماغای کۆیە..................... ٦٠٨
جاسووسی!..................... ٦٠٨
گرانی گەورە!..................... ٦٠٩
هەر تائیفەیە بە قەومییەتی خۆی ئەنازی، غەیری کوردی بەستەزبان!..................... ٦٠٩
بە منداڵان ئەڵێن ئەسڵی ئینسان مەیموونە!..................... ٦١٠
بەناوی تەوازوع مەبنە ڕیاکار!..................... ٦١٠
تەصریفمان بە کوردی وەها پێدەگوترا!..................... ٦١١
بەڵایە عەزیم، مەسئەلەی بیدعەت و سونەت!..................... ٦١١
خودایە عیلمی ئالی جەلی نەبڕیەوە!..................... ٦١٢
بەهاری زەمانی جاران!..................... ٦١٢
جوولەکەی کۆیێ!..................... ٦١٢
شاعیران!..................... ٦١٣
درۆی وا ئەکەم خۆم ئەکەومە شوبهە!..................... ٦١٤
مەسەلەی نێر و مێ دونیای تێکداوە!..................... ٦١٤
گۆیا ڕوومان کردە ئاخیرەت، لە دونیا غافڵ بووین!..................... ٦١٥
عولەمای حەنەفی لە بەحسی کوفرییات، دنیا ئەکەنە چەرمی چوێلەکە!..................... ٦١٦
کە ئەووەل نۆبەت بە تەیارە فڕی، لە خۆشییان گریا!..................... ٦١٦
نێزیکی وەفاتی، بانگی کردم، دەستیم نایە ناو دەست!..................... ٦١٧
با لالۆ هەر بڵێ: سەحەرە بێ قەرارە!..................... ٦١٨
چارشەمووی بە شووم ئەزانن!..................... ٦١٩
لە وڵاتی مە چەند پیاوی گەورە هاتن، بێ ئەثەر ڕۆیشتن!..................... ٦٢٠
بەناوی تەزکیە، نەفسی خۆی موهان ئەکا..................... ٦٢١
بۆ ئەجینتان لە ماڵی مسوڵمانان بە ملیۆن کارخانە دانراوە!..................... ٦٢١
کورد لە بەهەشتێ چ شتەك قبوڵ ناکەن؟..................... ٦٢١
دوعا!..................... ٦٢٢
گەلێ چیا زۆر پیر بوون!..................... ٦٢٣
مەولوود کردن خصوص بەناوی ئەولیایان، خێرێ نین!..................... ٦٢٣

موجەددیدی تەنها بە مەلایەتی نابێ! ..................................... ٦٢٤
زمانی بەهەشتییان! ..................................... ٦٢٤
کە جەنەت ئاوی کوفارەی هەبێ، ئەبێ شەللالەشی بێ! ..................................... ٦٢٤
حۆری مەرحەبامان لێ ناکەن! ..................................... ٦٢٥
ئێرە خۆشترە یا لۆندەرە؟ ..................................... ٦٢٥
پرسیاری کرد ڕۆژوەکە بشکێنم وتم بشکێنە! ..................................... ٦٢٦
ئەوێ ساڵێ قالۆچە هەندە زۆر بوو، مەڕ و بزن ئەیانخوارد پێی قەڵەو ئەبوون! ..................................... ٦٢٦
هەزار سوێندی بە درۆ بە قورئان و خوا ئەخوا، بە سەری شێخی ناخوا! ..................................... ٦٢٧
عەلی (مکور اللیل والنهار)ـە! ..................................... ٦٢٧
کورد هەموو دەیوت معاشمان دەنێ! ..................................... ٦٢٨
کاك حاجی بۆ ناو و ناوبانگ، دوو سێ حەج ئەکا! ..................................... ٦٢٩
ئەو بلعاتە لەناو ئێمەدا نییە! ..................................... ٦٢٩
مەلایەتی و فەقیری! ..................................... ٦٣٠
بنۆرنە کتابی کەون ئەزانن، چ عیبادەتێ ئەمڕۆ بە کەڵك دێ ! ..................................... ٦٣٠
ئایەتی مار، مەحووی دەوڵەتی کردنەوە! ..................................... ٦٣١
سوننی، ئیستیفادەیان لە ئاسن نەمەیە؛ دەروێشەکان زورگی لێ دروست ئەکەن! ..................................... ٦٣٢
پیاوی وەکی ئیبن سینایان تەکفیر ئەکرد! ..................................... ٦٣٣
وەختێ هێرش کرایە سەر ئیسلام، غەزالی خەریکی خەڵوەت بوو! ..................................... ٦٣٤
حەیا بکەن، عەرەقی خەجاڵەت بڕێژن! ..................................... ٦٣٧
با فەقێ هەر بڵێ: ڕاتبە ڕەحمەت و لێ بێ، پێخۆری فەقێیان، بچنە بەهەشتێ! ..................................... ٦٣٧
دنیا بوویتە دز، ئەشرافی کوردان بە دزی ئیفتیخار ئەکەن! ..................................... ٦٣٨
سرتە سرت، پرتە پرت، فسکە فسك ! ..................................... ٦٣٩
ئەوانەی سەلام لێك ئەکەن، علی الاکثر لێك ئەمین نین! ..................................... ٦٣٩
عیلم شوەدەن چ ئاسان، ئادەم شوەدەن چ مشکل؟! ..................................... ٦٤٠
ئیمامەکانیش زۆر لە ئێمە بە حورمەتتر نەبوون! ..................................... ٦٤٠
ئیددیعا ئەکات ئەو فرقەی ناجیەیە و ئەوانی دیش ئەسحابی بیدعەن! ..................................... ٦٤١
مەسئەلەی سوننەت و بیدعەت، دەست و پێی بەستی! ..................................... ٦٤٢
خوا بە قوربانی کەنگری کا! ..................................... ٦٤٣
ئەڵێن؛ دەوڵەمەند پێنج سەد ساڵ پاش فەقیر ئەچنە بەهەشت! ..................................... ٦٤٤
لەبارەی مەلایان! ..................................... ٦٤٥
دوعا! ..................................... ٦٤٦
ئەهلی عیرفان لە نەشئەی جەدید تەرکی عیبادەتیشیان کرد ..................................... ٦٤٦
دەنگی تۆپی ئینگلیز دەهات، مسوڵمانان دەیانوت گیان، خێرابە بۆ نایەی! ..................................... ٦٤٧
لەو زەمانە سیاسەت بوویتە درۆی مەحز! ..................................... ٦٤٧

کەسێ بەڵایەکی بێتە سەرێ، ئەڵێن: ئەمە هیممەتی فڵان شێخ بوو گرتی!............ ٦٤٧
لە مەجلیس لەبەر مالم یا قەشە هەستی، چ نەقسێ بە مەقامت بە دینت ئەگا؟......... ٦٤٨
قورئان ئیمامە، دەستوور، لاکین موجەڕەد بۆ نوێژ و تەڵاق!............................. ٦٤٩
جاسووسی ژنان!................................................................................. ٦٥٠
شەرع گۆڕایە !.................................................................................... ٦٥١
لە سایەی فەحشیات فڕەنسە هاتە ئینقیراض!............................................ ٦٥٢
جەهلی ژنان لەم سەردەمە زۆرە!........................................................... ٦٥٢
هەر قەومێ ئازا بن، ژنیان ئازان.............................................................. ٦٥٣
هەرچەند ئیمان بەقووەت بێ، بەدەن گۆشتە، مودافەعەی گوللـەی پێ ناکرێ!....... ٦٥٤
ئەوەی فێسی لەسەر نابا، ئەیانوت: ئەمە کافر بووە!.................................... ٦٥٥
کوردیش هاتوونەتە خەڵەتان، گۆیا بعد النصر حکومەتیان بۆ تەشکیل ئەکرێ!...... ٦٥٧
شێخە جاهیلەکان، بە کەیفی خۆیان مەلایان داژۆن!...................................... ٦٥٧
بە حاکمی سیاسیی ئینگلیزم وت!............................................................. ٦٥٨
من ئیمانم بە کەرامەتی ئەولیا هەیە، بەڵام!............................................... ٦٥٨
دوعا!................................................................................................ ٦٥٨
دینیان کردە مایەی عەداوەت!................................................................ ٦٥٩
حەواری چۆن دەعوەیان کرد؟................................................................. ٦٥٩
بە حوشتر مەیە بۆ موقابیلی دەبابە!......................................................... ٦٦٠
لەبارەی تەزکییەی نەفس!..................................................................... ٦٦٠
من لە دژی مەعاریفی ئێوەم!.................................................................. ٦٦١
ئینسان ئەو ئینسانەیە، خۆی بێتە ئوستادی خۆی!....................................... ٦٦١
مەلیك تاوسی ئەهێنا، فڕێی ئەدا سەر عەردی، بە قونەرە ئەچووە سەری!.......... ٦٦٢
جوولەکە!........................................................................................... ٦٦٢
ئێستا لە کۆیە ئەو عادەتە هەیە!............................................................. ٦٦٤
تەعەددودی خوتبە!.............................................................................. ٦٦٤
لەتیفە:.............................................................................................. ٦٦٥
سوننە و شیعە!................................................................................... ٦٦٥
بەو ئەواخیرە قسەکیان بە زوبانی من هەڵبەست!........................................ ٦٦٦
مەلایەتی بە شرح مغنی و عبداللە یزدی و گەلەنبەوی تەواو نابێ!..................... ٦٦٦
موراقەبە لای من چییە؟........................................................................ ٦٦٧
نیفاق و سیاسەت یەك شتن!.................................................................. ٦٦٨
سوێندی بە درۆ.................................................................................. ٦٦٨
عیززەتی نەفس.................................................................................. ٦٦٩
بەسەرهاتی کەنئافێك و هاروونەڕەشیدا!................................................... ٦٧٠

ریسالەکم داناوە لە مەسئەلەی ئیختیارا! ..... ٦٧٠
هیتلەر عەقڵی لە نەوەد و سەد ملیۆن بەڵکو زیاتر گۆڕی! ..... ٦٧٠
لە زەمانی ئێمە تەربییەی عائیلەوی زۆر کەم بووە! ..... ٦٧١
خۆزی ئەو مزگەوتانە مەعمەل بان! ..... ٦٧١
ئەکثەری ئەولادی گەورە و خانەدان، هیچ و پووچ دەردەچن ..... ٦٧٢
ئاشەوان جۆی لە ئاشی نەدەکرد، مزەی جۆی وەرنەدەگرت، دەیگوت چی لێبکەم! ٦٧٢
دوعا! ..... ٦٧٢
ژنەکانی پێغەمبەر! ..... ٦٧٣
بەسەرهاتی خۆشناوەکە و جوولەکەکە! ..... ٦٧٣
وەختی بۆمباران لە تەنەثوران شیعری کوردیم دانا! ..... ٦٧٣
دەغڵ ئەچێنین و ئافات زۆرە! ..... ٦٧٤
ئەوەندەی لە عێراق بە فیڕۆ سەرف ئەکرێ، نیو هەندە لە بەریتانیا و ئەلمانیا سەرف ناکرێ! ..... ٦٧٤
ئەو نەوعە بەردە گەلێ جار لە ئاسمان دێتە خوار! ..... ٦٧٤
شێتێ لە سلێمانی هەبوو ..... ٦٧٥
ڕەز و باغی ئێمە چەند ساڵە بەرەکەی ئەکاتە ڕەژوو! ..... ٦٧٥
سەگ بە کەلاکە ئینسان خواردن هاربوون! ..... ٦٧٦
ساڵێ لە چنارۆك بووین ..... ٦٧٧
بۆمبارانی سلێمانی! ..... ٦٧٧
وتی: بابم کووە؟ وتی: وەفاتی کرد، وتی: بوومە پیاو! ..... ٦٧٧
معاشی خۆم ئەکەمە سێ قسم ..... ٦٧٨
عەیب نەبێ! ..... ٦٧٨
باران پردی غازری بردا ..... ٦٧٩
قەومی تەنبەڵ ئەیەوێ هەموو شت بێ مشەقەت، خوا بۆی بکا! ..... ٦٧٩
بوتپەرستی لەناو مسوڵمانان ئینتیشار ئەکات! ..... ٦٨٠
سیاسیەکان لەگەڵ بەشەر ناساغن! ..... ٦٨٠
ناوی شێخیان بیست های و هووی و نەعرە و گرمە و لرمە و لرفە ئەکەن! ..... ٦٨١
شەوبێداری! ..... ٦٨٢
ئیحتیفالی حاجی مەلا بەکراغا! ..... ٦٨٢
دەوڵەتی وا هەبووە، گەمەی بە کوڕەی ئەرزی ئەکرد، ئێستا بوویتە فۆتبۆڵ! ..... ٦٨٢
سێ سەد ساڵە ئێمە ساقیتین! ..... ٦٨٣
خصوص شێخەکان، تا قەوم کەرتر بن، کەیفیان پێ دێ! ..... ٦٨٣
خۆشناوێك لە بەغدا! ..... ٦٨٤
نفووسی فرەنسە سال بە ساڵ لە تەنەززول دایە! ..... ٦٨٤

هێشتاش مسولمانەکان عیبرەت ناگرن! ........................................ ٦٨٥
بەسەرهاتی عەرەبێك! ........................................ ٦٨٥
ئاوی کانیی خاتوونی چنارۆك! ........................................ ٦٨٦
صوەری غەریب و عەجیب لە ئەمریکا! ........................................ ٦٨٧
عافێتی خۆشناوان! ........................................ ٦٨٧
ئیعتیماد ئەدەنە سەر قسەی خۆشکەڵە خۆشکەڵە ........................................ ٦٨٨
دەڵێ ئەوەی ئینکاری دەججال بکا، کافر ئەبێ! ........................................ ٦٨٩
قەسری مەلیك لە پیرمام! ........................................ ٦٨٩
سوێند بە خەلیفەی ڕاشیدین دەخۆم! ........................................ ٦٨٩
خوتبەی من لەماڵی مەلا ئەفەندی! ........................................ ٦٩١
مەهدی هەر نەهات، نایەت! ........................................ ٦٩١
بەسەرهاتی دختۆرێك و ژنێکی حامیلە! ........................................ ٦٩٢
خەلکی لە برسان ئەمردن، نەدەناژران ! ........................................ ٦٩٣
دوو ڕکاعەت نوێژی وا لە عیبادەتی مەلائیکەت خێرترە! ........................................ ٦٩٣
شێخایەتی سوننیان و ئیجتیهادی شیعان سەعادەتی ئوممەتیان برد! ........................................ ٦٩٤
بەسەرهاتی خاوەن ماینەکە! ........................................ ٦٩٥
کچی شێخ نەبی ماویلی بەدوای قەتارچییەکی کەوت! ........................................ ٦٩٦
گەلێ شەو لە چنارۆك تا سبەینە نەدەنووستم، دەورم ئەکردەوە! ........................................ ٦٩٦
وڵاتی ئێمە شەوی سافی زۆر کەمە! ........................................ ٦٩٧
ئەشقیا! ........................................ ٦٩٨
کارەبا هێشتا نەهاتیتە کۆیە! ........................................ ٦٩٩
شێخ سەلیمی بامەڕنی و سوپەری صاعیقە! ........................................ ٦٩٩
لەبەر (سبح اسم) ەو (هل اتی) ی نایەمە جومعە! ........................................ ٧٠٠
فەقیر وەکی پەپوولە لە کوڵانان ئەخولێنەوە: خوا خێر و بنووسێ! ........................................ ٧٠٠
کوڕی جورجانی عەرزی بابی کردیە لە ماڵێ ئارد نییە! ........................................ ٧٠١
گەلێ شەو لەبەر گەرما و پێشکە خەومان لێ ناکەوێ! ........................................ ٧٠١
خانووی بێتواتە! ........................................ ٧٠٢
مەلای فەقیر چاوی لە دەستی هەرچی و پەرچییان بێ، چ خدمەتەکی پێ ئەکرێ؟. ٧٠٢
بە عیززەت تەرکی دونیامان کرد، بە زیللەت تەڵەبی ئەکەین! ........................................ ٧٠٣
مەلا و زمان زانین! ........................................ ٧٠٤
توخوا کەسێ سەجدە بۆ گوڵك ببا، حەق نییە وەکی گای گێرەی پێ بکەی! ........................................ ٧٠٤
سەعادەتمەند ئەو کەسەیە، کلیلی دەرکەی خێران بێ! ........................................ ٧٠٥
بەسەرهاتی مەلای مقوم الناقة! ........................................ ٧٠٥
عومەری خەییام! ........................................ ٧٠٦

نورەددینی برام و وەڵامی منداڵەکە! .......... ٧٠٦
ئیعدامی مەنصووری حەلاج! .......... ٧٠٧
چاوەشیان کردیتە قوتب! .......... ٧٠٧
فەقیری! .......... ٧٠٨
حەماغا گوتی دروستە بڵێی خوا ئازایە؟ .......... ٧٠٨
چووینە نوێژەبارانە! .......... ٧٠٩
بە منداڵی زۆر ئیشم نەکردووە! .......... ٧٠٩
عیلمی ئالی جەلی بە زایع چوو! .......... ٧١٠
ڕیش پان و درێژ، وەکی جۆرکی کەرێ، کلکی عەلی شیشێن! .......... ٧١٠
سەبەب چییە، ئەو دۆم و قەرەجانە ئاوارەن!؟ .......... ٧١١
لە عومری خۆی ئەو جنێوەی پێ نەدراوە! .......... ٧١٢
وتم: ماڵوێران تو ئەمڕۆ بۆ بەگژ هیتلەر و مۆسۆلینی و ستالین داناچی؟ .......... ٧١٢
علی الاکثر تەبعی بەشەر لەسەر دەنائەت و پەستییە! .......... ٧١٣
دوعای سەپانی! .......... ٧١٣
دەك لاڵ بم بۆتان عومەر و صەلاح .......... ٧١٤
کە دین زەعیف بوو، باغاتەکان هەموو بەڕەڵابوون! .......... ٧١٥
ئەوەی قانوون دادەنێ، ئەڵێی قەرداری موجریمانە .......... ٧١٥
قەلەمی خۆمان گۆڕیمانەوە بە قەلەمی مز و قەلەمی تەنەکە! .......... ٧١٥
لەوەتەی لە بەغدام نوێژ تامی جارانی نەماوە! .......... ٧١٧
مەسنەوی وەك قورئان تەماشا ئەکەن! .......... ٧١٧
کە حورمەتی قورئان نەما، حورمەتی لەیلەتولقەدر کوو ئەمێنێ؟ .......... ٧١٨
لەبارەی لەیلەتولقەدرەوە! .......... ٧١٩
ئەم هاوینە لە چنارۆك ڕیسالەکی کوردیم دانا! .......... ٧٢٠
بە خوای خدمەتی دین بە فەقیران ناکرێ! .......... ٧٢٠
قەزا و قەدەر! .......... ٧٢١
بوولەرزە! .......... ٧٢٢
باباگوڕگوڕ .......... ٧٢٢
حاشا لەو مەدەنییەتە .......... ٧٢٣
چیا! .......... ٧٢٤
بەسەرهاتی مەلا ئەحمەدی کۆرە .......... ٧٢٥
بە مردووان خۆهەڵەکێشن! .......... ٧٢٥
مەلای وەهابی! .......... ٧٢٦
پێم دەڵێن چونکی من ئیستیغاثە لەبەر غەوس ناکەم، بۆیە چانابمەوە! .......... ٧٢٧
لەبارەی عەزابی قەبران دوو نەزیرەی خۆش: .......... ٧٢٧

موقابەلەی قووەت بە قووەت ئەکرێ! ........................................ ٧٢٨
حەق گۆڕین بەلاێ گەورەیە! ........................................ ٧٢٩
تەعەصوبی مەزهەبی گەلێ شتی لێ گۆڕینە! ........................................ ٧٣٠
ئەگەر مالی دنیا نەبێ قیمەتی جاشکەکی نییە! ........................................ ٧٣٢
بەسەرهاتی من و گاجووتەکە! ........................................ ٧٣٣
هەروەك لەقلەق مارە ئەخوا، کێشکەش مێروو گێرکە ئەخوا، لەقلەق بەو گەورەییەی پێی ناوێرێ! ........................................ ٧٣٣
حۆقەی ڕوون وەها گران بوویە لە تەئریخی کۆیە وا نەبووە! ........................................ ٧٣٥
بەو تەرزە بڕوا، بڕوا مەکە. تا ئەبەد مسولمانان بینە ساحێبی خەلیفە ........................................ ٧٣٥
دین بۆ ئینسان ڕووحە! ........................................ ٧٣٦
هەتیو! ........................................ ٧٣٧
ڕیابازی! ........................................ ٧٣٨
سێ ساڵە لە نوێژی جەژنی قوربان مەحرووممم! ........................................ ٧٣٩
هاوارم ئەکرد ئەو هەموو حەیوانە لە مەککە خەسار ئەبێ! ........................................ ٧٤٠
ئەی موبەششیری قوون نەشۆر، دونیات پڕ کرد لە شەڕ و شۆڕ! ........................................ ٧٤١
نەسخ! ........................................ ٧٤١
ئێران عەینی جوولەکەیە! ........................................ ٧٤٣
من دیم کوتوبی دایەخەجێیان بە جۆ ئەفرۆشرا! ........................................ ٧٤٣
عەصرێکە ژن مەیلی شێخانیان زۆرە، بە عومووومی ڕوویان لە مەلایان وەرگێڕایە! ........................................ ٧٤٤
ئێزیدی! ........................................ ٧٤٥
وەفاتی مەلا ئەفەندی! ........................................ ٧٤٧
نوشتە و کشتەك! ........................................ ٧٤٧
وەسواس و خەنناس! ........................................ ٧٤٩
بەسەرهاتی من و تەفسیر ........................................ ٧٤٩
سەرچاوەکان: ........................................ ٧٥٣
پێڕستە وشە ........................................ ٧٥٦

# پێشەکی

نووسینی بیرەوەری یان یادداشتەکانی ژیانی هەر کەسێك بە بەشێك لە جۆرەکانی ئەدەبیات خەملێندراوە و لەناو ئەدەبیاتی هەموو نەتەوەیەك گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە، جا ئەم بیرەوەرییانە خودی بن یان بابەتی، بە واتای ئەوەی کەسەکە خۆی بەشێك لە ژیاننامەی خۆی نووسی بێت یان دەوروبەر و هاوڕێ و نزیکەکانی بۆیان نووسیبێتەوە. لەمەشدا دەتوانرێت لە خوێندنەوەی ئەم جۆرە بابەتانەدا پەردە لەسەر بەشێك لە ژیانی تایبەتی کەسەکە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئایینی و سیاسی و زانستییەوە هەڵبدرێتەوە و لە هەمان کاتیشدا ڕوانین و دونیابینیی کەسەکەش بۆ ژیان و دەوروبەر ڕوون بکرێتەوە، وێرای ئەوەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانستی و وڵاتیش لەو سەردەمەدا وێنا دەکرێت.

مەلا محەمەدی جەلیزادە (مەلای گەورەی کۆیی ١٨٧٦-١٩٤٣/١٠/١٢) بە یەکێك لە دیارترین زانا و کەسایەتییە کوردەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دادەنرێت و چ بە نووسین و چ بە ڕۆڵی هەمەجۆری لە ژیانی کوردەواریدا، ئەسپی خۆی تاوداوە و خاوەنی دونیابینییەکی تایبەت و ناوازە بووە لە سەردەمەکەی خۆیدا و وەك چاکسازیخوازێکی ئایینی تەفسیری تایبەتی بۆ تێگەیشتنی قورئانی پیرۆز و زانستەکانی دیکەی ئایینی هەبووە و لەو سۆنگەشەوە بەرهەمی تەفسیرەکەی قورئانی پیرۆزی لەچاو هەموو تەفسیرەکانی دیکەی کوردی بەتایبەت ئەوانەی لەدوای ئەو نووسراون، جیاوازە. تەنانەت لە زۆربەی تەفسیرە عەرەبییەکانیش جیا دەکرێتەوە، ئەگەرچی بە هەندێکیان سەرسامە بەڵام لە هەر شوێنێ قەناعەتی تەواوی بە شتێك نەبووبێ ئازایانە ڕەخنەی خۆی دەربڕیوە و فیقهی واقیعی میللەتی خۆی خوێندبۆوە و لەو ڕوانگەوەش دەیەویست بەو تێگەیشتنە تایبەتییانەی دەرمانێك دروست بکات و دەرد و نەخۆشییەکانی کۆمەڵگەی پێ کەم کاتەوە و یان بنبڕیان بکات.

دوای چاپبوونی سەرجەم بەرگەکانی تەفسیرەکەی لە ساڵی ۲۰۰۹دا، ئەو شێوازە تایبەتەی نووسینی تەفسیر بووە جێگەی سەرسامی و بڕ پێ شکانی خوێندەواران، بەتایبەت درەنگ چاپبوونەکەی سەرجەم بەرگەکان وای کردبوو چەند تەفسیرێکی دیکە پێش ئەو چاپبکرێن و هیچ کام لە تەفسیرەکانیش ئەو تام و بۆنەیان نەدەدا، لەبەرئەوە بووە جێی سەرنج و تێڕامان. لەو سۆنگەشەوە کاری هەرە تایبەت و دانسقەی ئەم تەفسیرەی مەلای گەورە ڕاڤەی ئایەتەکان بوو وەك ئەوەی ئەم ئایەتانە بۆ کورد و بۆ کوردستان دابەزی بن، بۆیە لە زۆربەی زۆری بابەتەکاندا جەنابی مەلای گەورە قسەی تایبەتی خۆی هەیە و لە زۆریشیاندا بە نموونەی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئایینی خەڵکی کوردستان بابەتەکە ڕوون دەکاتەوە، جا لەو چوارچێوەیەدا بەشێکی زۆری ژیانی تایبەتی خۆی و ماڵبات و زانایان و بارودۆخی ئەوسای وڵاتی کوردەواری ڕەنگڕێژی ناو تەفسیرەکە کردووە.

ئەوەی کە زۆر هانی دام و هەستی دنەدام کە لەسەر ئەم بابەتە بسەنگرێمەوە، ئەو ڕوانینە تایبەتییانە بوو کە مەلای گەورە بەگشتی بۆ ژیان و ئایین هەیبوون، لەوەش گرنگتر ئەوەبوو کە زانایەکی سەرەتای سەدەی بیستەم لەناو مێژووی کۆمەڵی کوردەواریدا دەیانخاتە ڕوو، بۆیە سەرەتا زیاتر لەسەر ڕوانینی جەنابی مەلا بۆ زانایان سەنگرامەوە و پتر لە بیست کورتە وتاری لە شێوەی گۆشە و ستوونی گۆڤارم بڵاوکردەوە و هەر جارە و بۆ زێتر ڕوونکردنەوە و بەڵگە هێنانەوە پشتم بە گوتە و ڕوانینێکی ناوبراو دەبەست. ئەمە سەری کێشا بۆ ئەوەی لەکاتی خوێندنەوەی تەواوی تەفسیرەکەدا قسەخۆش و بیرەوەری و ڕوانینەکانی ئەو و هەواڵ و دەنگوباسی ئەو کاتەی کۆمەڵی کوردەواری کە لەناو تەفسیرەکەدا کەم تا زۆر ئاماژەیان پێدرابوو، دەستنیشانیان بکەم و لە دواجاردا ژمارەکە ئەوەندە زۆر بوو، کە مرۆڤ پێی حەیف بوو ئەمانە لەناو دوو توێی تەفسیرەکەدا ون بن و خوێندەواری کورد بە ئاسانی بە دەستی نەگات. هەر لەو سۆنگەیە بوو ناوی خوامان لێ هێنا و هەموو ئەو بابەتانەمان لەم کتێبەدا کۆکردەوە.

**بەرنامەی کارکردنمان لەو کتێبەدا:**

پلانی ئیشکردن لەم کتێبەدا خۆی لە چەند خاڵێك دەبینێتەوە، کە پێویستە بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەر قامکیان بۆ ڕاکێشین:

**کۆکردنەوە:** بەرگی یەکەم تا بەرگی دەیەمی تەفسیرەکە، واتە هەر دە بەرگەکە چەقی سەرەکیی وەرگرتنی ئەو زانیارییانە و بیرەوەرییانەیە کە لەم کتێبەدا کۆکراونەتەوە، هەر بۆیە بە ڕیزبەندی وەرمانگرتووە و بابەتەکانمان لێك جیانەکردۆتەوە، چونکە جەنابی مەلای گەورە زیاتر لە دە ساڵ خەریکی نووسینی ئەو تەفسیرە بووە، لە ماوەی ئەم دە ساڵەدا چ بیرەوەرییەکان و چ ڕوانینەکان و چ بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردستان و ناوچەکە گۆڕاون، بۆیە بۆ ئەوەی خوێنەر سەرەتا و کۆتایی ڕوانین و بیرەوەرییەکان بزانێ، وام بە پەسەند زانی کە بە پێی ڕیزبەندیی تەفسیرەکە، بیرەوەرییەکانیش بنووسرێنەوە و لە کۆتایی مژارەکەدا دوو ژمارەمان داناوە، یەکەمیان ئاماژەیە بۆ بەرگی تەفسیرەکە و ئەوەی دیکەش ئاماژەی لاپەڕەکەیە.

**ڕێکخستن:**

بێگومان کۆکردنەوەی ئەم هەموو قسەی خۆش و سەربردە و ڕوانینانە کە لە هەزار و سەد دانە زیاتر دەبن، پێویستیان بە پۆلینکردن و ڕێکخستن هەیە، لەو ڕوانگەوە لەم کتێبەدا دوو هەنگاو گیراونەتەبەر:

یەکەم: بە لەبەرچاوگرتنی خاڵی سەرەوەی ناو بنەمای کۆکردنەوە و بۆ ئەوەی مێژووی نووسین و کاتی ڕوانینەکان ون نەکرێ، ڕیزبەندییەکەمان تێك نەداوە، بەڵام ئەوەندە هەیە لە سەرەتادا بەشێکمان تەرخانکردووە بۆ بیرەوەرییەکانی جەنابی مەلای گەورە لەگەڵ باوکی خۆی کە (مەلاعەبدوڵلای جەلی زادە) یە .و هەروەها گێڕانەوەی هەموو ئەو بەسەرهاتانەی تایبەتن بە باوك و بنەماڵەکەی و لەگەڵ باسکردنی سەردەمی منداڵی خۆی و چۆنیەتی هەراش بوونی و پێگەیشتنی لەناو دەرس و زانست و کۆڕی فەقێیان و قۆناغەکانی خوێندنی، هەموو ئەمانە لە هەر دە بەرگەکەی تەفسیرەکە وەرگیراون و خراونەتە بەشی پێشەوەی ئەم کتێبە.

دووەم: لە سۆنگەی ئەوەی سەربردە و بەسەرهات و بۆچوونە

تایبەتییەکانی (مەلای گەورە) هەندێکیان کورت و هەندێکیشیان درێژن و لە ڕووی مژاریشەوە مژاری جۆراوجۆرن، بۆیە ئاسان نییە خوێنەر بە ئاسانی دەستی بە هەموویان بگات، لەبەرئەوە بۆ هەموو بابەتێك و یان ڕوونتر بڵێین بۆ هەر سەربردە و بۆچوونێك ناوونیشانێکمان داناوە، لەوەشدا بەشی هەرە زۆری ناوونیشانەکەمان لە ناو خودی دەقەکە هەڵهێنجاوە، جا وەرگرتنەکە کت و مت وەك خۆی یان بۆ گونجانی لەگەڵ تایبەتمەندی ناوونیشان و نووسینی ئێستا دەستکاری کراوە. ئەگەریش لەبەر سیاقی دەقەکە و چنینی شێوازی دەربڕینەکە نەلوابێ لەناو خودی دەقەکە وەریبگرین، ئەوا لە چوارچێوەی بابەتەکەدا ناوونیشانێکمان بۆ هەڵبژاردووە کە زۆر نزیك بێت لە بابەتەکەدا. ئەمەش بە ئامانجی ئەوەی خوێنەر بە ئاسانترین شێوە لە پێڕستەکەدا، ناوونیشان هزری پەلکێشی ناو بابەتەکە بکات.

سێیەم: وەك ئاشکرایە چاپکردنی تەفسیرەکە بە ئیملایەکی کۆن و نارێکخراو، جوانیی و چنینەکانی دەقی شێواندبوو، ئێمە لە گواستنەوەی ئەم بۆچوونانەی تەفسیرەکەدا هەوڵماندا‌وە بە ڕێنووسی ئێستا و بە شێوەیەك کە ئاسانتر خوێنەر لێی تێ بگات و بیخوێنێتەوە، گواستوومانەتەوە.

**پەراوێز:**

لەم کتێبەدا نزیك بە دوو سەد ژمارەی پەراوێز هەن، ئەمانەش بۆ چەند مەبەستێك داندراون، لەوانە:

هەندێك جار لە باسی مژارێکی دیاریکراودا، سەرچاوەی ترمان دەستکەوتوون کە هەندێك نهێنی ژیانی مەلای گەورەیان ڕوونکردۆتەوە، ئێمە بۆ ئەوەی بابەتەکە دەوڵەمەندتر بکەین و لە ژیاننامەی خودییەوە بۆ ژیاننامەی بابەتی هەنگاو بنێین، جار جار سەرچاوەی دیکەمان بەکارهێناوە و ڕوانینی کەسانی ترمان گواستۆتەوە ناو پەراوێزەکە، بەتایبەتی مامۆستا مەسعوود محەممەدی کوڕی مەلای گەورە، لەوەشدا لەبەر زێدەبوونی قەبارەی کتێبەکە، دەستمان پێوەگرتووە و بۆ هەموو بابەتێك پشتمان بە سەرچاوەی تر نەبەستووە، مەگەر بابەتەکە پێویست

بووبێ و زیاتر نزیك بووبێ لە ژیانی تایبەتی مەلای گەورە.

هەنـدێك جـاریش خـۆی لە تەفسـیرەکە ڕووداو یـان سـەربردە و ڕوانیـنەکەی پەیوەسـت کـردووە بە تەفسـیری ئـایەتەکە و لە دەقەکە بـۆ نموونە گوتویەتی ئەم بەسەرهاتە ئەم ئایەتەی بەسەردا ئەچەسپێ، خوێنەر نازانێ مەبەستی کام ئایەتە،بۆیە ئێمە لە پەراوێزدا ئاماژەمـان بـۆ ئـایەت و سووڕەتەکە کردووە.

جاری واش بووە لە هێنانەوەی ڕووداوەکانـدا سـاڵی کـۆچی هێنـاوە، ئێمە لە پەراوێزدا ساڵە میلادییەکەمان هێناوە، بـۆ ئەوەی خـوێنەر ڕوونتـر مێژووەکەی لەبەرچاو بێ.

زۆر جاران لەناو دەقەکەدا شیعری شاعیرێکی کورد یان عەرەب یـان فارس هاتووە، کەچی کە لێی ڕاماوین و بەدوایدا گەڕاوین، دەرکەوتووە بە هەڵە نووسـراوە، جـا بەشـی هەرە زۆری هەڵەکەش لە چـاپکردنی تەفسـیرەکەدا بـووە، بـۆیە ئـێمە سـەر لەنـوو لە پەراوێـز شـیعرەکەمان بە دروستی نووسیوەتەوە.

بەشی زۆری پەراوێزەکانیش (ئەوەی بۆمان کرابێ) بـۆ کـورتەیەك لە ژیاننامەی ئەو کەسایەتییانە تەرخانکراون، کە لە دەقەکاندا ناویان هاتوون جا کەسایەتی کورد بن یان نەتەوەکانی تر، یان هەندێك جار ناوی تاقم یـان بزاڤێـك هـاتووە و لە پەراوێـز ناسـاندوومانە. ئامـانجیش لەوە زیـاتر بەرچاوڕوونی و تێگەیشتن و تێکەڵ بوونە لەگەڵ مژارەکەدا.

### ئاستەنگەکانی بەردەم کارەکە:

یەکێك لە ئاستەنگە هەرە گەورەکـانی بەردەم ئەم کـارە، ڕێنووسـی کوردی بوو، وەك ئاشکرایە تەفسیرەکە وێڕای هەڵەی زۆر، پڕە لە کەوانە کە زۆریـان پێویسـت نەبـوون، وێـڕای ئەوەی شاشـیی زۆریـش لە ڕێنووسـەکەدا هەبـوو، ئـێمە ئەوەنـدەی بۆمـان کرابـێ بەشـێك لە وشـە عەرەبییەکانیشمان بە ڕێنووسی کوردی نووسـیوەتەوە، بەتـایبەتی ئەوانەی بە نووسـینەوەیان بەم ڕێنووسـەی ئێسـتا کێماسـییەك لە ڕووی واتـاوە پەیداناکەن. چونکە پێمان وایە ئەم کتێبە بۆ خـوێنەری کـوردە و نـاکرێ

وشە و دەستەواژە عەرەبییەکان کە هاتوونەتە ناو کوردی ئێمە هەر بە عەرەبی بیاننووسینەوە، مادەم بۆ کورد واتایەکە نەگۆڕێ، ئاساییە وەك ئاخاوتنی خۆمان بیاننووسین، بەتایبەتی لە پیتەکانی (ص، ض، ظ، ط) دا. ئێمەش بە گوێرەی بۆ لوان بە کوردیمان نووسیون و لە کوێش پێمان وابووە وەك خۆیان بنووسرێنەوە، ئەوا وەك خۆیمان نووسیوەتەوە. بەڵام هەر بە تەواوی دەرەقەتی هەمووی نەهاتووین.

هەرچی سەبارەت بە مانای وشە بێگانەکانە، بەتایبەتی وشە عەرەبییەکان کە سیاقی گوتنەکە وای لە مەلای گەورە کردوە هەندێك جار وشە عەرەبییەکانی زیاتر بن لە وشە کوردییەکان، ئەگەرنا لە هەندێك دەقی ناو ئەم کتێبەدا ناوبراو بە زمانێکی کوردیی وا ڕەوانی نووسیوە، بۆ ئەوسا زۆر جێی سەرنج و لێکۆڵینەوەیە. لەوەشدا ئێمە سەرەتا بەرنامەمان وابوو کە فەرهەنگۆکێك بۆ واتای وشە بیانییەکان دابنێین، بەڵام لەبەر زێدەبوونی قەبارەی کتێبەکە و لەبەر زۆری وشەکان و سیاقە جیاوازییەکانیان و زاراوە شەرعی و ئایینییەکان، کاری فەرهەنگ دانانەکە زۆر زەحمەت بوو، بۆیە ئەوەمان بۆ خوێنەر بەجێ هێشت و لەوەدا و لە ئاستەنگی پێشووتریش دەخوازین خوێنەران لە کێماسیمان ببوورن.

هیوادارم ئەم کتێبە کەلێنێك لە ڕێکخستنی ئەدەبیاتی بیرەوەری و ژیاننامەنووسینی کوردی پڕبکاتەوە و بەشێك لە مێژوو و سەربردەی کۆمەڵی کوردەواری بە هەموو چین و توێژەکانییەوە بە نەوەی نوێ بناسێنێت و چەند لایەنێکی نادیاری ژیانی مەلای گەورەی کۆییش نیشان بدات و کەمۆکەکیش بێت بڕی خوێنەران بشکێنێت.

هێمن. ع. خۆشناو
بینگۆل- باکووری کوردستان
٢٠١٦/١٢/٦

## بیرەوەرییەکانی مەلای گەورە لەگەڵ باوکی

بابم جەمالەددین ئەبو محەمەد الحاج الغازی[1]، کاك مەلا عەبدوڵلا ئەفەندی جەلیزادە، ئیبن ضیاءالدین الحاج الغازی کاك مەلا ئەسعەد[2]ەفەندی جەلیزادە، ابن الواثق بالله الحاج ملا عبدالله ابن الجلی، ابن مجد الدین الحاج کاك ملا عبدالرحمن الجلی، روح الله أرواحهم، وەکی لە دەستخەتی باپیرم دیمە، لە ٢٦ی مانگی شەووال ١٢٥٠ ی هیجری/ قەمەری هاتیتە عالەمی شهوود. لە حوجرەی باب و داکی بەخێو ئەکرێ، گەورە ئەبێ، ئەچێتە قوتابخانە، پاشدان ئەچێتە مەدرەسە. وردە وردە پێ هەڵئەچێ، خۆی ئەیفەرموو: ئەمزانی تێناگەم، لاکین موحافەزەم باش بوو، ئەوی لە مامۆستام وەرگرتبوو، بە تەواوی ئەدام ئەکردەوە، بۆ فەقێی خۆم!

ئەیفەرموو: لە کەمالی دڵم کرایەوە، زۆر ئیخلاصی لە حەقی کەمال، شاریحی شافیەی ابن الحاجب[3] بوو، وە بۆ فەقێیەتی ئەچووە لای

---

(١) لەقەبی (الغازی) واتە غەزاکەر، ناوبراو بەشداری غەزای نێوان عوسمانییەکان و ڕووسی کردووە.

(٢) ناوی ئەسعەد زیائەددینە کوڕی مەلا عبدالله ی کوڕی مەلا عبدالرحمانی جەلییە، ساڵی ١٨١١ لەدایك بووە، لە خزمەت باوکی دەستی بە خوێندن کردووە، ساڵی ١٨٣٠ باوکی کۆچی دوایی دەکات، لەو کاتە محمد پاشای ڕواندز هاتۆتە کۆیە و چاوی بە مامۆستا دەکەوێ و هەموو پلە و پایەکانی باوکی پێ دەبەخشێ، ساڵی ١٨٤٤ چووە شام لەوێ ئیجازەی تەفسیر و فەرمووودە و شەریعەتی لە شێخ عبدالرحمانی الکزبری وەرگرت و لەوێ چووە حەج و دواتر گەڕایەوە کۆیە. هەر بۆ خوێندن چووە بەغدا و ئیجازەی مەلایەتی لەلای مەلا عەبدولرەحمانی ڕۆژبەیانی وەرگرت. مامۆستا بە شافیعی دووەم ناودەبرا لەبەر زۆر زانایەکەی. مامۆستا جارێکی دیکە دەچێتە حەج و ئەمجارە مەلا عەبدوڵلای کوڕی لەخزمەتی دەبێ، لەوێ لە ساڵی ١٨٧٢ لە مەککە کۆچی دوایی دەکات.

(٣) ناوی ئەبو عومەر عوسمان کوڕی عومەر کوڕی ئەبوبەکر کوڕی یونس الدوینی الاسنانی یە و بە (ابن الحاجب) ناسراوە، شەرعزانێکی مالیکی بووە هەروەها نەحووزانیش بووە. لە ساڵی ١١٧٤ ی زایینی لە صەعیدی میصر لەدایك بووە و لە

←

باڵەکان[1]، لای مەلا محەمەد کاك عەبدوڵلا شێخ وەتمانی[2] تەحصیلی زۆر هەبوو، وە زۆر ئەنای ئەکرد، لای شێخ تەهای سوورسووری وە مەلا محەممەدی خەتێی[3] مەشهوور خوێندنی بووە. ئەمما مەلای خەتێ ئەوسا پیر بووبوو[4]. ئەیفەرموو مەلا بە دەرسی گولستان[1] خەریك بوو،

١٢٤٩ کۆچی دوایی کردووە. باوکی سەربازێکی کورد بووە و لەگەڵ ئەمیر عزەددین موسەك بووە کە کوڕە خاڵی سولتان سەلاحەدینی ئەیوبی بووە. ئیبن حاجیب لای چەند گەورە زانایەکی وەك ئیمامی شاطبی و ئەبولقاسمی بوصیری و ئەحمەد البرمك و چەندانی تر خوێندویە، چەند کتێبێکی نووسیوە و شەرح کردووە، کە دیارترینیان کتێبی الشافية یە لە تەصریفدا و کە ڕەواجێکی زۆری لەناو خوێندکارانی زانستە ئاینییەکان هەیە و تا ئێستا نزیك بە ٣٠ شەرحی بۆ کراوە.

(١) مەبەست دۆڵی باڵەیانە کە سەر بە قەزای چۆمانی پارێزگای هەولێرە.

(٢) ناوی محمد کوڕی مەلا عەبدوڵلا کوڕی مەلا مەحمودە، ساڵی ١٧٨٩ لە گوندی شێخ وەتمانی باڵەکایەتی لەدایك بووە، لە خزمەت باوکی خوێندویەتی و هەر لای ئەویش خوێندنی تەواو کردووە، حاشیەی لەسەر زۆر لە کتێبان هەیە. مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە و حاجی قادری کۆیی لای ئەویان خوێندووە، لە ساڵی ١٨٦٧ بە سەفەر هاتۆتە هەولێر و لەوێ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخەڵلا بە خاك سپێردراوە.

(٣) ناوی مەلا محەممەد کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی ئیسماعیل کوڕی شێخ سلێمانە، لە ساڵی ١٧٨٥ لە گوندی (خەتە)ی خۆشناوەتی لەدایك بووە، لە چەند مەدرەسەیەکی کوردستان دەرسی خوێندووە و مامۆستایانی وەك ئیبن و ئادەمی باڵەك و مەلا ئەبوبەکری میرڕۆستەمی دەرسیان پێداوە و لە دواجاردا لە لایەن مەلا عەبدولرەحمانی ڕۆژبەیانی ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ و لە ساڵی ١٨١٥ لەلایەن موحەممەد پاشای ڕواندز دەکرێتە موفتی گشتی ئەمارەتی سۆران. ناوبراو لە ساڵی ١٨٦٠ کۆچی دوایی کردووە، لە بەرهەمەکانی ئەوەی تا ئێستا هاتبێتە دیتن، رسالة العلم ـە و لە ساڵی ٢٠٠٦ چاپکراوە.

(٤) مەسعوود محەممەد لە کتێبی (حاجی قادری کۆیی) دەنووسێ: یەکێك لەو مەعلووماتانە ئەوەیە هەر لەو گەشتی خوێندنی لەگەڵ حاجی قادردا باپیرم بەینێك لای مەلای خەتێ ی خوێندوە کە لە مەلا هەرە زلەکانی سەردەمی خۆی بوە و لە عومریشدا گەورەتر بوە لە حاجی مەلا ئەسعەد، باوکی باپیرم، بە دەلیلی ئەوە کە حاجی مەلا ئەسعەدیش لەکاتی گەنجایەتی دەرسی خوێندوە لای مەلای خەتێ، حاشیەی نووسیوەتەوە بە دەوری کتێبانەوە و لەکۆتایدا دەڵێ لە مەدرەسەی مەلای خەتێ ئەم حاشیەم تدوین کرد. دیارە مەلایێکی وا زل دەرس بە فەقێ و سوختە ناڵێتەوە.

مەلای خەتێ لەسەر مەوزووعی شێخ نەبیی ماویلی دڵی شکا بوو لە حاجی مەلا

←

عەبدولحەکیمی کوڕی گوڵستانی سەعدی لا ئەخوێند، لە سبەینێ تا نیوەڕۆ، خەریکی موتاڵا بوو، موراجیعەی کتێبی لۆغەتی ئەکرد، لە نیوەڕۆوە تا درەنگ دەرسەکەی تەواو ئەکرد، ئێمە مەحرووم ئەماین. ڕۆژێ عەرزم کرد:

ئەگەر موساعەدە ئەفەرمووی، من دەرسی گوڵستان بە مەلا عەبدولحەکیم ئەڵێم، توو دەرسەکانی ئێمە بفەرموو!

وتی: باشە! ئەمما ئەووەڵەن دەرسەکی لای من پێ بڵێ، ئەگەر ڕام لێ بوو، فبها!

وتم: کتێب بێنە!

فەرمووی موتاڵا ناکەی؟

وتم: نا!

لە حزووری مەلا دەرسەکی قۆزم پێ گوت[2]. پەسەندی فەرموو،

---

ئەسعەدی باوکی باپیرم. هەرچەند لە سەرەتای عومریدا شێخ نەبیی لە مزگەوتی مەلای خەتێی خوێندوە (کتێب هەیە لای ئێمە حاشیەی دەستنووسی شێخ نەبیی بەسەرەوەیە و لە هەندێ جێگەدا دەڵێ لە مەدرەسەی مەلای خەتێ لای شێخ مصطفی ئەمەم نووسیوە)، بەڵام لە دواییدا کە شێخ نەبی جەنبەی تەریقی نەقشبەندی دەگرێ و دەبێ بە «شێخ» و دەست دەکا بە «ارشاد»، مەلای خەتێ لێی دەڕەنجێ و دەکەوێتە دژیەوە. وەک بیستراوە مەلای خەتێ نەقشبەندی خۆش نەویستوون، بەتایبەتی ئەو شێخە نەقشبەندیانەی لەبەر تەماعی دونیا ئیرشادەکە بۆ دین ناکەن.

(١) گوڵستان لە کتێبە کۆن و گرنگەکانی ئەدەبیاتی فارسییە و سەعدی شیرازی لە ساڵی ٦٥٨ کۆچی نووسیویەتی و لە هەشت بەش پێکهاتووە و زیاتر ئامۆژگاری و ڕەوشت و دانایی لەخۆدەگرێت، لەناو کورد وەك نەریتێك وابوو بۆ گەشەکردنی زمانی فارسیان، هەر لە دەستپێکەوە گوڵستان و بوستانی سەعدی دەخوێندران.

(٢) مامۆستا مەسعوود محەمەد لە کتێبی گەشتی ژیانم دا دەربارەی تەدریسی مەلای گەورەی باوکی دەنووسێ: (باوکم مەلا بوو، بەڵام مەلایەك کە بتوانێ لە هەموو زانستەکانی ئیسلامدا کتێب دابنێ، تەنانەت لە گەلێك مەسەلەدا (ئیجتیهاد)ی خۆی بەکاردەهێنا، بە درێژایی عومری مەلایەتی خۆی دەرسی گوتبێتەوە، یەکسەر بێ ئامادەکردن دەرسی گوتۆتەوە. دەمدیت کە دەکەوتە سەر شەرح و تەقریری دەرسەکان وەك تاڤگە قسەی لێ هەڵدەڕژان. ناوە ناوە لە گەرمەی تەقریردا هەڵوەستێکی دەکرد و چاوی دەبڕیە شتێکی نادیار. دەیگوت لەو تەرزە حاڵەتەدا چەند ڕێبازێکی شەرح بۆم دەکرێنەوە، لەو هەڵوەستەدا یەکێکیان پەسەند دەکەم. واش دەبوو کە پێویست بە شەرح نەبووبێت بە چەند قسە و هێمایەك لە دەرسەکە

←

ئەوجا دەرسەکانی فەقێیانی ئەفەرموو. وە ئەکثەری تەحصیلی لە خدمەت بابی، لە حەیاتی بابی، بووە مەلایە تەواو. لە مزگەوتی گەورە تەدریسی ئەکرد. وە لای باوکیشی ئەیخوێند، تاکو تەئریخی ١٢٨٨ هـ لە خدمەت باوکی چووە حەج. لە حەلەب لە شام لە بەیرووت لەگەڵ مەلایان موناظەرەی ئەفەرموو، زاهیرەن لە کیسوەی قەتارچیان، مەلایە وا عەجیب زۆر تەعەجوبیان ئەکرد. دوای ئەدای فەریزەی حەج مانەوە، باوکی (حاجی کاك ئەسعەد) لە مانگی مەولوودێدا لە ١٢٨٩ وەفات ئەکا، ساڵی ثاتی تەشریفی هاتەوە کۆیە، ئەعشاری چەند دێهاتێ کە لە زەمانی بابان و حوکمداری ڕەواندز مەربوطی مەدرەسەی کاکی جەلی کرابوو، لە تەرەف حکومەتی عوسمانی مەحلوول کرا. وابزانم لە نەوەد و دوو چووە بەغدا، بە خدمەت موفتی زەهاوی[1] موشەرەف بوو، گەلێ لوتفی لە حەق ئەنواند، وە لەوێ بە خدمەت حەزرەتی کاك ئەحمەد[2] گەیشت. هەروەها لەگەڵ شێخ بەهائەددین و شێخ عومەری برای مولاقاتی بوو، لە تەرەف زەواتی باریزەی بەغدا گەلێ حورمەتی هەبوو، وە زۆر سەعییان بۆ کرد، مع الاسف چی بۆ ڕێك نەکەوت، ئەیفەرموو: لە بەغدا چوار شتی نایابم دی، ویقاری نەقیب سەید سەلمان، علمی زەهاوی، جوانمەردی جەمیل زادە محەممەد ئەفەندی، عەقلی دەروێش

---

دەبۆوە). بڕوانە (گەشتی ژیانم، مەسعوود محەممەد، چاپی سێیەم، کۆیە، ل٢٠.)

(١) ناوی شێخ محەممەد فەیزی زەهاوی کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی حەسەن بەگ کوڕی ڕۆستەم بەگ کوڕی ئەمیر سلێمان کوڕی ئەحمەد بەگ کوڕی بوراق بەگ کوڕی خدر بەگ کوڕی حوسێن بەگ کوڕی میر سلێمانی گەورەی سەرۆکی خانەدانی بابانییەکان بووە. باوکی چۆتە زەهاو و لەوێ ژنی هیناوە بۆیە ناوی کوڕەکەی بە زەهاوی ناسراوە. یەکێك بووە لە مەرجەعەکانی زانست لە عێراقدا و دانراوی لە بارەی مەنتیق و فەلەکیات و کەلام هەیە. پۆستی موفتیی بەغدای وەرگرتووە. لە ١٤ی دیسەمبەری ١٨٩٠ کۆچی دوایی کردووە.

(٢) ناوی ئەحمەد کوڕی شێخ محەممەد مەعروف کوڕی شێخ مستەفا کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەدە، لە نەوەی شێخ عیسای بەرزنجەیە، ساڵی ١٧٩٢ز لە شاری سلێمانی لەدایك بووە، لە خزمەت باوکی خوێندوویەتی و پێگەیشتووە، زانایەکی دیار و پایەدار بووە. زیاتر لە دە کتێبی نووسیوە، وێڕای مەکتووباتەکانی بە زمانی فارسی. لە ساڵی ١٨٨٧ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە مزگەوتی گەورە بەخاك سپێردراوە.

ئەفەندی حەیدەری[1]. قەریب سێ مانگ لەوێ بوو، ناچار گەڕایەوە.

بە هەر حاڵێ بوو دەوامی لەسەر تەدریسی فەرموو. کە ئیعلانی حەربی ڕووس و عوسمانی لە نەوەد و سێ[2] کرا چووە غەزا. لە جیهەتی قارس و بایەزید ئیشتیراکی حەربی فەرموو، شێر ئیسماعیل پاشا زۆری خۆشویست، لای صادق و موحتەرەم بوو. بەعدەهوو هاتەوە، خەریکی تەدریس و وەعز و فەتوا و خەطابەت بوو، گشتی بۆ خوا. لەگەڵ ئەوەشدا گەورە گەورەکانی شار دائیم خەریکی عەداوەتی بوون. تاکو سێسەد و شەش یا حەوت بە واسیتەی تاهیر پاشای والی موصل[3] هەزار قرۆش، یەعنی دە لیرە معاشی بۆ بڕاوە. هەرچەند ئەو وەقتەی دە لیرە زۆر بوو، ئەمما مەعاش کەم ئەدرا، سندوقی خەزێنە دائیم بەتاڵ بوو.

لە تەئریخی سێسەد و نۆ بە ئیرادەی پادشاهی چووە سابڵاغ موەففەق بوو. موقابیلی ئەو خدمەتە لە تەڕەف خونکار ئوچنجی نیشان، نیشانی مەجیدی لە تەرەف شای ئێران، یەك حەلقەی ئەنگوستیلەیی ئەڵماسی بۆ هات. دوای یەك دوو ساڵ یەکێ لە گەورەکانی حکومەتی شاهی ئەمیر جەنگ بهادور حوسێن خان[4]، بە خدمەت بابم گەیشت، چەند مەجلیسێ صوحبەت و ئولفەتیان بوو. خان وتی: عەلی خانی حاکمی سابڵاغ[5] غەدری کردیە تۆی بە حەق نیشانی شاه نەدابوو، وە ئیللا بۆ توو عەصایە موجەوهەر ئەهات! وای نواند، کە ئەو ببێتە واسیتەی ناردنی

---

(١) ناوی محمد دەروێش کوڕی محمدامین کوڕی کوڕی عبداللە کوڕی عیسا غیاث الدین کوڕی صبغة الله گەورەی حەیدەرییە.

(٢) مەبەست ساڵی ١٢٩٣ی کۆچییە بەرامبەر ساڵی ١٨٧٦ی میلادی.

(٣) تاهیر پاشا لە ساڵی ١٣٢٦ی کۆچی بەرامبەر ١٩٠٨ بۆتە والی موصل. بڕوانە تأریخ الموصل، سلیمان صائغ، المجلد الاول، مصر١٩٢٨، ل ٣٢١.

(٤) حوسێن پاشا خان (ئەمیر بەهادور) لە دەوروبەری ساڵی ١٨٤٥ کۆچی مانگی لە تەورێز لەدایك بووە، لەلایەن ناصرەددین شاوە لەقەبی ئەمیر بەهادوری پێدراوە. سیاسەتمەدارێکی ناسراوی ئێرانی بووە و لە سەردەمی موزەفەرەدین شا و میرزا مەحموود خان، وەزیری جەنگ بووە و لە سەردەمی محەمەد عەلی شادا سەرۆك وەزیری مشیر السلطنة بووە. لە ساڵی ١٩١٧ کۆچی دوایی کردووە.

(٥) عەلی خان حەیدەری موکری (سالار سەعید) لە ١٩١١ و ١٩١٢ حاکم و شەهرەداری سابڵاغ بووە.

عەصای موجەوهەر. وە وەعدیشی لەگەڵ من دا کە سیاحەتنامەی شاهیم بۆ بنێرێ. نە ئەم، نە ئەو چتاقیان نەبوو!

تا نەزیکی سێسەد و هەژدە، خۆی تەدریسی ئەفەرموو. بە نەوعێ محیر العقول بوو، لە أقصر الایام بیست و چوار دەرسی قورسی ئەفەرموو، حەتتا ڕۆژێ پاش تەواو بوونی دەرسەکان، زوبانی وابزانم ئەخورا، سەبرۆکە ددانی پێداهێنا، خوێنی لێ تکایەوە، نواڕیە جیهەتی ئاسمان، فەرمووی: خوایە ئەوە بۆ تووە!

مەلا رحمة الله علیه زاتێ بوو، بە شەوکەت، هەیکەلی نورانی، وەك خوا لە حەق طالووت ئەفەرمووێ: ﴿وَزَادَهُۥ بَسۡطَةً فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِۖ ٢٤٧﴾ البقرة: ٢٤٧. بەلیغ، فەصیح، قسەخۆش، نوکتە سەنج، بەشووش، قەهقەهەی خەندەی لە قەپقەپەی کەبکی دووری خۆشتر بوو. لە فارسی و عەرەبی قەلەمێ زۆر بەقووەتی هەبوو، ئەمما مەیلی تەئلیف و حاشیەکردنی نەبوو. ڕۆژێ عەرزم کرد: قوربان بۆ شتێ نانووسی لەسەر ئیبن حەجەر، یان بەیزاوی؟

فەرمووی: ڕۆڵە چ جێم لەوانە نایەتە بەر نەزەر، کە ئیحتیاجم بە حاشیە هەبێ!

ئەمما لە ئەواخیری عومری فەرمووی: موحەممەد! ئەمڕۆ ئەزانم بەیزاوی، توحفەی ئیبن حەجەر[1]، بەعزە جێیە ڕەقیان هەن، ئیزاحیان پێ ئەوێ!

فەرموی: ئەوە ئەثەری ضوعف و پیریە.

تا چووە ڕەحمەتی خوای، قەوی و لەجێی خۆبوون، کەمێ گوێی گران بووبوو[2]، حەتتا ئاخیری زستانی حەیاتی، شەو موتاڵای تەفسیری

---

(١) مەبەست کتێبی تحفة المنهاج بشرح المنهاج ی ئیبن حەجەری هەیتەمی یە.
(٢) مەسعوود محەمەدی کوڕی مەلای گەورە لە کتێبی حەماغای گەورەدا وا دەنووسێ: باوکم گوتی، جەژنەیەکیان حاجی مەلا عەبدوڵا ناساغ بوو نەیتوانی بچێتەوە بۆ لای ئەو کەسانەی کە لە جەژنەدا دادەنیشن و خەڵق بۆ جەژنە پیرۆزانەیان دەچوو (ڕۆژی یەکەم دەهاتنە لای باپیرم، بەدوا ئەودا لای باوکم. ڕۆژی دووەم باپیرم، بەدوا ئەودا باوکیشم، دەچوونەوە لای خاوەن قوناغەکان. ڕۆژی سێیەم دەچوونەوە بۆ لای شێخەکان و مەلاکان و هەندێک لەو توجارانەی لە جەژنەدا دیوەخانیان دەکردەوە). لەجیاتی خۆی حاجی مەلا ئەحمەدی مامی (واتە مامی ←

روح المعانی سەید ئالووسی ئەکرد، با وجودی کاغەزی سپی و خەتی چاپی وردە. لە تەئریخی هەزار و سێسەد و بیست و شەش، چواردەی حوزەیرانی ڕۆمی، ماهی عەرەبیم چاك لە خاطر نییە، چووە ڕەحمەتی خوا، تەئریخی وەفاتی[1] (ئۆست مغفور)[2] رضی الله تعالی عنه.

لە ئەولادی ذکوری، دوو وەلەدی لە دوا ما، یەکێ: دوعاگۆتان. یەکێ محەمەد ڕەئووف کە مەشهوورە بە شێخ نوورەدین، من مولەققەب بە کەمالەددین. وەکی بابم ئەیفەرموو: ئەبو مەسعوود جەلیزادە محەمەد بن عەبدوڵلام، والیدەم عائیشە کچی حاجی مەلا ئەبوبەکر ئاغای نامدار، زاتێ عالی میقدار، ئاغایە قەدیر، خادیمی عیلم، ساحێبی جامع الکبیر. خاڵی بابم، بابی داکم، هەزار ڕەحمەتی لێ بی، ئێمە (لە الحمد) لەوانە نین بە خاڵوان بنازین، مەقسەدم بەیانی علوی نەسەب و خانەدانییە، لە هەردوو تەڕەف، وەکی کوردی ئەڵێ: بەر ئەتڵەسی پشت مەخموورا!

**نژاد از دو سر دارد این نیك پەی**
**زو افراسیاب و زو کاوسی کەی**

تەڕەفی داك زۆر بە تەئەثورە، عولوی عولووی و عەباسی و عوسمانی

---

باوکم) هەنارد بۆ سەرلێدانی ئەو کەسانە. باوکم گوتی منیش مێردمنداڵ بووم لە خزمەت ماممدا بەشداری ئەو گەڕانە بووم. لە دوو کۆڵانەی جوداوە تاقمی ئێمە و تاقمی حەماغا گەیشتینەوە یەکتر و ڕووشمان لە یەک جێگا بوو. حەماغا و حاجی مەلا ئەحمەد بۆ سڵاو و چاکوچۆنی ڕاوەستان قەرەباڵغیش بەدوایانەوە مۆنجەی دا، کە هاتین بەڕێ بکەوینەوە حاجی مەلا ئەحمەد پێی چەقاند، چونکە پێش حەماغا نەدەکەوتەوە. حەماغا ڕووی تێکردم گوتی کاک حەمەد پێش کەوە. گوتم ئاغا ناشێ پێش جەنابت و مامم بکەومەوە. حەماغا هەنگاوی هەڵێنا و قۆڵی گرتم و پێشی خستم گوتی، شوونی خۆتە پێشم کەوە. ناچار بەو منداڵییەوە بوومە پێشڕۆی ئەو هەموو حەشاماتە...

(١) مامۆستا مەسعوود محەمەد لە کتێبی "گەشتی ژیانم" دا دەنووسێ: حاجی مەلا عەبدوڵا لە ساڵی ١٩٠٨ز / ١٣٢٦ک لە کۆیێ بە ڕەحمەتی خوا شاد بوو. دوای ئەوە کوڕە گەورەی، محەمەد، کە دواتر بە «مەلای گەورە» ناوی دەرکرد لە جێی دانیشت. حەوت هەشت ساڵێک بوو خوتبەی جومعە و دەرسی فەقێکان لەلایەن باوکییەوە بەو سپێردرابوو.

(٢) پێدەچێ ئەم دوو وشەیە بە هەڵە نووسرابێ، چونکە بە پێی لێکدانەوەی حیسابی ئەبجەدی ئەم دوو وشەیە دەکاتە ساڵی ١٧٩٣، کە ئەمەش دوورە لە ڕاستی. بەڵکو تەنیا وشەی (مغفور) بە حیسابی ئەبجەدی دەکاتە ١٣٢٦.

لەبەر داك، تەسەککونی جەوهەری خانەدانیان فەصح بۆوە.

بینا بە دەستخەتی باوکم، وە خۆشی ئەیفەرموو: لە ئاخیری ماهی ڕەجەب بە وەلەد بوویم. وەکی باسی شەوارەیان ئەکرد، دیارە لە هاوین بووە، گۆزەبانەی شەوێیان ترێ بووە، بە ئاوی ترێ ڕووخساری بەعزە پیرەژنانیان ڕەنگا و ڕەنگ کردیە. سەنەی هەزار و دوو سەد و نەوەد و سێ ١٢٩٣هـ[1]. لە نەوەد و شەش بابم والیدەی نورەددین خاتوو زەینەبەی کچی مەرحووم سەید عەبدولکەریم مەشهوور بە بابەشێخ مارەی کرد و گواستیەوە. چەند ڕۆژێ پاش هاتنی خاتوون، دایکم وەفاتی کرد، خوا لێی خۆش بێ. خاتوو زەینەب ئەلحەق سەییدەیە بوو، بە عیلم و عیرفان، بە ئیملا و ئینشا خۆش بەیان، خۆش خوان، نادیرەی زەمانی خۆی بوو، لە خەواتینی سادات و کوردان. چەندم پێ خۆش بوو، زستانان بابم ئەچووە ژێر لێف، خاتوون ئەسکەندەرنامە، یا شانامە، وا ئەبوو تەفسیری کەبیری بۆ ئەخوێندەوە. وای چەند خۆشە ژن و مێرد مەلا بن، حورمەتی یەکیان بە لاوە زۆر بێ.

نورەددین[2] لە هەزار و سێسەد هاتە دونیا، تەئریخی (غلام، مصطفی).[3] لە ڕادەی سێسەد و سێ یا چوار، چوومە قوتابخانە، نیصفی قورئانم خوێند، ئەمما چ خوێندن؟ بەو شەرتە هیچی لێ نەزانین، وە سەد ساتمە لە )قل هو اللە( ی بکەین. بەعدەهو ڕەسائیلی فارسی، سمایلنامە، ناگەهان، وصف النبی، گولستان، کلیما، یەعنی پەندی عەطار، وردە وردە مەشقمان ئەکرد. ئەمما هیچ، بێ ما حصل، بەعدەهو هاتینە مەدرەسە، سەد خۆزی بە قوتابخانە، تەسریفی زنجانی، مەتن بە عەرەبی، شەرح بە کوردی، ئەمما بە لوغەتێ کە مندالْ تێی نەگا. ئەووەل مامۆستام مەلا حەسەن لا ڕەش، خەڵکی کوێستانان بوو، بابم پێی

---

(١) کە دەکاتە ١٨٧٦ی میلادی.

(٢) نورەددین کوڕی مەلا عەبدوللا کوڕی مەلا ئەسعەد کوڕی مەلا عەبدوللا کوڕی مەلا عەبدولرەحمانی جەلییە، ساڵی ١٨٨٣ لە شاری کۆیە لەدایك بووە، لەلای باوکی سەرەتا خوێندویەتی و پاشان لەلای مەلا محەممەدی برای خوێندنی تەواو کرد و ئیجازەی لێ وەرگرت، لە مزگەوتی گەورەی کۆیە وتاری دەدا و دەرسی فەقێیانی دەدا. لە ١٩٥٢/٨/٢٠ کۆچی دوایی کردووە.

(٣) ئەم دوو پەیڤە بە حیسابی ئەبجەدی دەکاتە ساڵی ١٣٠٠.

فەرموو: ئێوە خەڵکی هەورازن، بە چیای ئەڵێن: کێو، لە مەعنای (کنزول الثلج علی الجبل)، تەفسیری (جبل) بە چیا بکە، بە کێو مەکە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان وەکی وەحشی کێوی، فەرقی شتی وایان نەدەکرد.

شێخ عەلی ئەفەندی رحمة الله علیه زۆر گلەیی ئەکرد، لە ئوصولی خوێندنی کوردان، پاش عومری حەفتا ساڵی، ئەوەی فەرموو: عەلی کوێر بێ، تازە ئەزانم، (لما) لە (حین)انە، کە لە ئەووەلی تەصریفی پێمان ئەڵێن، لە (حین)ا، مەعنای (لما)یە!

ڕۆژێ بابی (إقعنسس) مان ئەخوێند، لە قسمی ثالث لە ئەقسامی (مزید فیه)، وتم ماموستا لام وەیە ئەوە غەلەطە، چونکی ئەتوو لە (فرح)ە، (تکسر) ە، (إطهر)ە، (إحمار)ە، (إحمر)ە وتت (إجتماع المثلین) ثەقیلە، ئەووەلی ساکین لە ثانی موتەحەریك دەغم ئەکرێ. کەوابێ ئەبێ ئەوە (إقعنس) بێ، حەرەکەی سینی ئەووەل ئەبەینە سەر نوون، وە دەغمی ئەکەین لە سینی ثانی.

وتی: بەخوای ڕاست ئەکەی، کتێبەکە غەلەطە.

وە دەرسم خوێند، چوومە سەربانی مزگەوت، بابم لە هەیوانێ بوو، دەستم کرد بە تیکراری دەرسەکەم، تا زەریف لەبەرم بێ. وتم: (إقعنس، یقعنس، إقعنساسا).

بابم بانگی کردم: موحەممەد!

وتم: قوربان ئەمر کە!

چوومە خدمەتی فەرمووی: بۆ وای ئەخوێنیەوە؟!

ماجەرام عەرز کرد، زۆر لای خۆش هات. ئەمما زۆر تەقدیری مامۆستایەکەمی کرد، فەرمووی: ئەوەندەی نازانی، ئەوە لە مولحەقاتە!

عەرزی کرد: ئەگەر قاعیدەی ئیلحاقم زانیبا، بە غەلەط نەدەچووم.

مەقسەدم بناغەی خویندمان بەو نەوعە ئوستادە داندرایە!

ئەسبابی مەنع و صەرفی شەرحی موغنیم لای شێخ حامیدی طالشی خوێند، زۆر باش بوو، مورەبییە چاك بوو. مع الاسف زوو ئیجازەی وەرگرت، بۆ وەتەنی خۆی چۆوە. باز لەو دەست لەم دەست تاکوو

حاصل و مەحصولی جامی، ئەوجا لای مەرحووم مەلا محەمەد ئەمینی کونەفلووسەیی[1]م خوێند، حەققەن سیراجی دڵم کراوە، بە دروستایی نەحووی کوردی، ئەمتوانی دەرسەکەی خۆم تەرکیب کەم، تا مەنصوبات. تەشریفی بە سەفەر چۆوە، عەودەتی فەرموو، قسمێ لە مەنصوباتی تا مەبنیم لە خدمەتی خوێند، تەواو لە تێگەیشتن فەراقە بووم. باز کەوتمەوە دەستی ئەیدی ناقیصە، تا دەستم کرد بە خادیم، شەرحی باپیرە گەورەم مەلا عەبدولرەحمانی جەلی[2] لە فەریدە، لە عیلمی بەیان هەتا مقدمة بوو، چبوو، کە گەیشتینە مەقسەد، مەلا عەبدولرەحمانی گەناوی ڕەحمەتی، وتی: بەخوای دەرسی ئەو کتێبەی بە من ناگوترێتەوە. دەرسم زۆرن، دەرسی خۆشم ئەخوێنم، ئەوەش ئیحتیاجی هەیە بە موتاڵەعە و موراجیعەی (مطول) و حاشیەی سەیید و شەرحی عصام الدین و حاشیەی حەسەن زێباری، ئەوە بە من ناکرێ.

چوومە خدمەتی بابم، وتم: قوربان ئەگەر خۆت دەرسم پێ ئەفەرمووی باشە، وە ئیللا ناخوونم!

---

(١) ناوی محەمەد ئەمین کوڕی مەلا شێخ محەمەدی کوڕی مەلا داودی کوڕی مەلا عەبدوللای کوڕی مەلا حوسێنە، ساڵی ١٨٦٦ لەدایک بووە، باپیری لە بێتواتە دانیشتووە و باوکی هاتۆتە زێوە، پاشان لەسەر داوای شێخ نەبی ماویلی چووەتە گوندی کونەفلووسە. لای باوکی خوێندویەتی و پاشان بۆ خوێندن چۆتە شەقڵاوە و ڕواندز و شێخ مەمووندیان و دواتر گەڕاوەتەوە کونەفلووسە و دواتر چۆتە کۆیە و لای مەلا عەبدوللای جەلی کۆتایی بەخوێندن هێناوە. لە هەولێر لە مزگەوتی حاجی قادری دەباغ دەکرێتە مەلا و مودەریس، لە ژیانی دا پەنجاو حەوت ئیجازەی زانستی داوە. لە ساڵی ١٩٤٠ کۆچی دوایی کردووە.

(٢) ناوی عەبدولرەحمان کوڕی ملا عەبدوللا کاکی جەلی کوڕی مەلا محەمەدی شیوانشانی مەلا زادەی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی مەلا حەسەنی کوڕی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا حەسەنی کوڕی مەلا ئەبوبەکرە، وەك بەم دواییانە دۆزرایەوە مێژووی لەدایك بوونی دەور و بەری ساڵی ١٧٤١ـە، یەکەم جار لە قوتابخانەی گوندی جەل ی خۆشناوەتی دەرسی بە فەقێیان داوە، دوای ئەوەی پاشای بابان مزگەوت و قوتابخانەی لە کۆیە دروست کرد، فەرمانی گواستنەوەی بۆ دەرکرد و لە جەلەوە هاتە کۆیە، مەولانا خالید حەزی کردووە لای ئەو بخوێنێ، بەڵام مامۆستا نەخۆش بوو نەیتوانی بوو وەریبگرێ، بۆیە چووە لای مەلا محەمەد ئیبن باڵەك. لە بەرهەمەکانی وێڕای ئەوەی حاشیەی لەسەر زۆر تەفسیر و کتێبەکان هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا چوار نامیلکە و کتێبیشی لەپاش بەجێماون.

من ئەمەویست مامۆستام خولاصەی دەرسەکەم بۆ تەقریر کا، قاعیدەکم پێ بڵێ، دەخلی بە عیبارەتی موختەلیفە و قیل و قالی موحەشیان نیە. ئەو نەوعە مامۆستایەم دەست نەدەکەوت.

بابم فەرمووی: باشە کتێبێ بێنە!

وتم: ئۆخەی! ئەوجا دەرسی بە کەیفی خۆم ئەخوێند. لەسەر دەرسی دوێنێی تەقریر ئەفەرموو، وە مزج ی ئەکرد، لەگەڵ دەرسی ئەمڕۆ. خولاصە و لوببی دەرسەکەی بەیان ئەفەرموو، بە کوردیە پەتی پەتێ، ئەو نەوعە دەرسەش واقیعەن هەموو جۆرە کەسێ تەحەممولی ناکا. دەرسی مەلای بابم بۆ کەسێ چابوو، کە دەرسی خۆی بە موتالەعە تەواو زانیبێ، ئەوجا بە دڵ گوێی لە تەقریری مەلا ڕاگرتبا، ئەیزانی چی ئەفەرموێ، چۆن ئیعتیرازان دەفع ئەکا. تا نیهایەت لە خدمەتیم خوێند، نەچوومە فەقێیەتی، گاهـ گاهـ لە بەعزە ئوموری تافیهە تووڕە ئەبووم، ئەیفەرموو: حەقتە! وەکی بابت بە حیلم نی، چونکی چینکە نانی ڕاتبە[1]ی فەقێیانت نەخواردیە!

لەسەر ئەمری ئەو، چەند حەواشی عبدالحکیم، شرح شمسیە[2]، لە ئەوائیلی تەصدیقاتم خوێند. ڕۆژێ عەرزم کرد: حەز ئەکەم شەرحی (موختەصەری مونتەهای عضد)ی بخوونم، جەوابی نەدا، نە بە لا، نە بە نەعم. سبەی چوارشەموو بوو، کتێبم برد، لەسەر مبادیء اللغة دەستم پێ کرد، پاش دەرس فەرمووی دەوام کە!

---

(١) مەسعوود محەممەد لە کتێبی (حاجی قادری کۆیی) دەنووسێ: باوکم لە باوکی خۆی دەیگێرایەوە، کە ئەویش لە جیلی پێش خۆی بیستبوو، مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد کەوا کەوتۆتە سەر خەتی شوورەی دەوری شار، سەردەمێک لە دەرەوەی شوورەوە ٧٠ ڕاتبەی بۆ هاتۆتەوە، هەڵبەت ٧٠ ڕاتبە بۆ ژمارەیێکی کەم لە نانخۆران کۆ ناکرێتەوە، دەبێ فەقێیەکی زۆر لە مزگەوتەکەدا ژیابن تا پێویستیان بەم هەموو خۆراکە بووبێ. خۆ ئەگەر ڕاتبەی ناو شاریش بخەیتە سەر ئەو ٧٠ ڕاتبەیە ئیتر بۆ خۆت بیر کەوە لەو هەموو قەڵەباڵغیەی لە مزگەوتێکدا کۆبۆتەوە کەهەموو غەریب بوون چونکە بە عادەت فەقێی شار لە ماڵی خۆی نان دەخوا و دەنوێ. حاجی مەلا عەبدووڵلا لە هەرەتی تاقەتی دەرس گوتنەوەی، ڕۆژانە ٢٤ دەرسی گوتۆتەوە. باوکم دەیگوت هەندێ دەرسی پێش بەرچایی سبەینان و هەندێکیش دوای نوێژی خەفتنان دەگوتەوە.

(٢) کتێبێکی بواری مەنتیقە.دانراوی نجم الدين بن عمر بن علي القزويني يە.

عەرزم کرد: قوربان بۆ دوێنێ چت نەفەرموو بخوونە، یا مەخوونە؟

فەرمووی: لام وەبوو تێی ناگەی، وە دلم نەهات پێت بلێم تێی ناگەی، ئەمما ئەمڕۆ لام مەعلووم بوو تێی ئەگەی، دەوام کە!

وتم: قوربان لەو کتێبە ئەگەر عوشری تێبگەم، ئەتوانم حاشیەی لەسەر جمع الجوامع[1] بکەم، ئەمما بە جمع الجوامع چ ماحصل یێ نایەتە دەست.

ڕۆژێ حەزرەتی شێخ عەلی[2] فەرمووی: کاك حەمەد باوکت لە حەق جمع الجوامع ئەڵێ چی؟

وتم قوربان پێی ئەڵێ فهرستی اقوال الاصولیین!

فەرمووی: حق الانصاف چاکی فەرمووە.

ئەویش تەقدیری شەرحی مختصری ئەکرد، ئەمە وایە، ئەمما هەموو کەسیش ناتوانی بە دەرس بیڵێتەوە، حەقیقەتەن مەلای ئەوێ.

لە زەمانی ئەو خوتبەمان دەست پێکرد[3]، بە خوندن تەدریسی بە بەندەی خۆی عەتا کرد، وە چەند ئیجازەمان دا لە حزووری ئەو. خولاصە لە ئەییامی حەیاتی ئەو بووینە مەلا، وە هەر خدمەت ئەکرا بۆ

---

(١) کتێبێکە لە باری ئوصولی فیقهـ و دانراوی عبدالوهاب بن علی السبکی تاج الدینە.

(٢) مەبەست شێخ عەلی کوڕی شێخ عەبدولرەحمانی تاڵەبانییە.

(٣) مامۆستا مەسعوود محەممەد لە بارەی وتاردانی مەلای گەورەی باوکی دەنووسێ: (باوکم (خطیب) بوو، بەڵام (خطیب)ێك کە بتوانێ بە کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی تا حەز بکات لەسەر بابەت بدوێ، بێ حازرکردن و بێ کاغەز و بێ ئەوەی پێشتر ئاگادار بووبێ لە چ دەدوێ. باوکم لە دەروونـدا ئیمانی بە "حەق" هێنا بوو. لەو ئیمانەدا تێکڕای بوونەوەر لەبەرچاو و لەبار تەبعی جۆرێك لەنگەری بەستبوو کە ئیتر گۆڕانی باری بوونەوەر نەتوانێ لەنگەر بەستنەکە تێك بدات، بۆیە بوو هەرگیز لە بارێکەوە بۆ بارێك نەدەگۆڕا. لە ماڵەوە و لە مزگەوت و لەنێوان ئاپۆڕەی خەڵق و لای دەستەڵاتدار و بێدەستەڵات یەك زەڕڕە فەرق بە قسە و بە ڕەفتاری نەدەکرا، چ لە ژووری خۆی تەنها بایە و کتێبێکی خوێندبایەوە و چ لە دیوەخانە یان لە مزگەوت لەگەڵ خەڵق دانیشتبایە، یان لە هەر هەڵکەوت و هەڵوەستی دیکەدا بایە هەمان ڕەفتاری دەکرد. واتە تەنهابایە و خەڵق دیار بایە بایی سەری موویەك حەرەکە و سەکەنەی نەدەگۆڕا، هەر بە قەدەر ئەوەی شەرم لە سێبەری خۆی بکات شەرمی لە خەڵق دەکردەوە). بۆ زیاتری زانیاری بڕوانە (گەشتی ژیانم، مەسعوود محەممەد، ل٢٠-٢١).

خودا بوو، نە جەبرە، نە هیچ، وە ئەحوالمان زۆر خۆش نەبوو، خصوص لە جیهەتی عەداوەتی خزمان، گەلێ ناڕەحەت بووین، حەزناکەم ناویان بێنم، وە سەییئاتیان زیکر کەم. ئەمما من لە سایەی ئەو بە غەیری ئیفادە و ئیستیفادە چیترم نەئەکرد، ئاگام زۆر لە ناخۆشیی گوزەران نەبوو، تا ئەو بە تەئریخی سابق چووە ڕەحمەتی خوا. ئەوجا دەرکەی بەڵا و فیتنە و موسیبەتم لەسەر کرایەوە، بێ یار و یاوەر و موعین. لایە تەدریس، لایە فەلاحەت و گوزەران، ئەشقیا[1]ش لێ نەدەگەڕان خێر لە فەلاحەتەکە ببینین. والسلام.

## سەفەری باب و باپیرم بۆ حەج و بەسەرهاتی ئەوێ!

لە زەمانی خەلیل و ئیسماعیل [2] بەیتولحەرامیان گێڕا بە مەجمەع و مەئمەن بۆ ئینسانان. مەجمەعی دڵ، نەك بەدەن و بەس، مەجمەعی ئوخووەت و پاڵ پێکدان، نەك نەفرەت و لێك بوونەوە. فی الحقیقە پاش عەسری سەعادەت، بیت الحرام زۆر بێ حورمەت بوو لەناو مسوڵمانان، ئەمن و ئاسایشی تێدا نەبوو، لە ئەتراف و ئەکنافی ئەرز، عالەم ئەچوون بۆ حەج، کەس لە ڕووح و ماڵی خۆی ئەمین نەبوو. ئەوەی قەرامیتە[3] بەسەریان هێنا لە چ دەورێ بەسەریا نەهاتبوو.

بابم لە خزمەت بابی، لە تەئریخی (١٢٨٨)ی هیجری چووبووە حەج. ئەو وەقت بە وەلەد نەبووبووم، دوایێ ئەیگێڕایەوە، یەکێ لە حاجیان قۆڕ دەبێ، بە ئەغلەبی شەو ئەچوو بۆ تەواف و نوێژ، بەعزێ ئەیبینن ئەچێتە

---

(١) هەموو ئەوانەی لە سەردەمی عوسمانیدا و دوای ئەوان، لە حکومەت یاخی دەبوون و دەچوونە چیایان و جار جار بەرامبەر خەڵکی تاوانیان دەکردن.
(٢) مەبەست حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلە.
(٣) قەرامیتە بزاڤێکی ئایینی سیاسیی کۆمەڵایەتی بوون، یەکەمین بانگەشەکەریان ناوی حەمدان قەرمطە بوو لە عێراق. دواتر لە بەحرێن گەشەیان کرد و دەستیان بە زۆر لە ناوچەکانی ئیسلامیدا گرت. ساڵی ٩٣٠ مەککەیان داگیرکرد و بەردی حجر الاسودیان برد و پاش بیست و دوو ساڵ هێنایانەوە. دەسەڵاتی قەرامیتەکان لەسەر دەستی عیونییەکانی بەحرێن کۆتایی پێ هات لە ساڵی ١٠٢٧.

ڕکوع و سجود، بۆزاییەکی لەناو گەلاندایە، وا گومان دەبەن کیسە پارەیە لەوێی بەستووە. شەوێ هجومی ئەکەنە سەر بە چاپووکی ئەیخنکێنن، کەچی تەماشا ئەکەن ئەو بۆزاییە شتێ ترە، لاشەکەی ئەبەن ئەیهاوێنە ناو بیری زەمزەم، پاش دوو ڕۆژ بێگەنی ئەبێ، ئەڵێن ئەسبابی چییە؟ ئەمە قەت نەبووە. ئەچنە ناوی ئەبینن لاشەی ئینسانە تیایا تەعەففونی کردیە.

حاصلی خولاسە ئەو سەییئاتی لەوێ ئەکرا، لە هیچ دارالفسقێ، بەڵکو لە دارالکفریش نەدەکرا. حکومەتی عوسمانی هەرچەند سەعی ئەکرد، لە دەفعی ئەو نەوعە قەبایحە بێ فایدە بوو، تا لەو چەند ساڵانە عبدالعزیز بن السعود (1) سوڵتانی نەجد، حیجازی گرت، بوویە مەلیکی حیجاز، بەستی ئەمن و ئاسایشی تیا کرد. ئەوی دێتەوە لە حەج، هەموو دوعای بۆ ئەکەن. مسوڵمانان سالیمەن غانیمەن ئەچنە حەج و دێنەوە، خودا بەرقەرای کا، لە تەعەصوبی مەزهەبی دووربێ.

١٥/٣

## نوورەددین ڕووباری!

لەو چەندانە بەرناردشۆ(٢) کاتبی شەهیری ئینگلیزی لە هیند نوتقێکی دابوو، خیتاب بۆ شوبانی تەلامیزی مەداریس، وتبووی: زۆر ئاگاداری عەقڵی خۆتان بن! ڕوئەسای مەداریس بە غەیری ئەمە عەقڵی فیتڕیتان لێ

---

(١) عەبدولعەزیز کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی فەیسەڵ کوڕی ترکی کوڕی عەبدوڵلا کوڕی محەممەد ئالسعودە، لە ساڵی ١٨٧٦ لە ڕیاز لەدایك بووە و لە ١٩٥٣ کۆچی دوایی کردووە، دامەزرێنەری شانشینی عەرەبستانی سعودیەیە و یەکەم پادشای ئەو وڵاتە بووە.

(٢) جۆرج بەرنادشۆ George Bernard Shaw (١٨٥٦-١٩٥٠) نووسەرێکی بەناوبانگی ئیرلەندایە، لە شاری دبلن لەدایك بووە، و لە بیستەکانی تەمەنیدا دەچێتە لەندەن، زیاتر لە شەست شانۆنامەی نووسیوە، لە ساڵی ١٩٢٥ خەڵاتی نۆبڵ و لە ساڵی ١٩٣٨ خەڵاتی ئۆسکاری لە ئەدەبیات وەرگرت.

نەزع نەکەن. عەقڵێکی دی بە ئارەزووی خۆیان بهاوێتە دەماغتان، هیچ مەقسەدی تریان نییە!

حاکمی سیاسی کۆیە (ڕەندێل) لە وەختی ئیحتیلالی کۆیە، تەماشای ئاداب و سلوك و خواردن و ئەلبیسەی ئێمەی ئەکرد، تەعەجوبی دەما، ئەیگوت:

هەرچی دەرحەق کوردان بە ئێمەیان گوتووە، ئیفتیرا بوو! بە منداڵی پێیان ئەگوتین کورد وەحشین، ئینسان خۆرن، تەربیە و ئادابی بەشەرییەتیان نییە!

حیکایەتێ هەیە عەرز ئەکرێن وەلەو سووئی ئەدەبی تیایە، ئەمما بە موناسەبەی حەبلی ڕوئەسای میللەتان، زۆر بە جایە! بابم فەرمووی: زاتێ هەبوو نورەددین ڕوودباری ناو، لە ئەهلی فەزڵ و عیلم، بەینێ لەم وڵاتە بوو، دوایێ چۆوە وڵاتی خۆی. نالی لە فیراقنامەی ئەینووسێ:

**بۆی لە چاوی ڕوودبارم نووری دیتن وەختە ناری بێ**

**ئەوەش با ماجەرای هیجران و دووری ڕوودباری بێ**(١)

بە سنە دا ئەڕواتەوە، والی سنە دەعوەتی ئەکا، ئەبینێ دوو وێنە بە دیوار هەڵواسراون، یەکێ ڕووت بابۆڵە نان بە دەستەوە قەپاری لێئەدا، دەستەکەی تری لەسەر عەورەتی داناوە. ئەویتریان بە شکلی شاهانە لەسەر تەختی دانیشتووە، دەستێکی بۆ لای وێنە ڕووتەکە درێژ کردووە.

والی ئەڵێ: نازانی ئەمە چییە؟

نووری ئەڵێ: نا!

والی ئەڵێ: ئەو ڕووتە وێنەی عومەرە، بەو هەیئەتە نان ئەخوا!

---

(١) لە ڕاستیدا شیعرەکە لە دیوانەکەدا وا هاتووە:
لە چاوی ڕوودبارم نووری دیتن وەقتە ناریی بێ
ئەمیش با ماجەرای هیجرانی نووریی ڕوودباریی بێ
مامۆستا مەسعوود محەمەد لەبارەی ئەم نووری ڕوودبارییەوە دەڵێ:
من لە بارەی ئەم شێخ نووری ڕوودباری یەوە هەر ئەوەندە دەزانم بەینێك لە کۆیێ ژیاوە و پیاوێکی بەرچاو و ڕیزلێگیراویش بووە. بە پێی گێڕانەوەی دەماودەمی باوکم لە باپیرمەوە، شێخ نووری نانی بە شێخایەتی پەیدانەکردووە. خۆی خاوەن بەخشین بووە و بە ماڵی خۆی خزمەتی خەڵقی کردووە.

ئەویتر وێنەی ئەمیرولموئمینین عەلییە! بە دەست ئیشارەی بۆ ئەکا ئەڵێ عەبیە!

نووری ئەڵێ: وا نییە، ئەم صورەتە دەستی درێژ کردییە، ئەڵێ پاروێکم نان بدەیە، ئەویش ئەڵێ مەگەر ئەتدەمێ.

والی ئینتیباهی ئەبێ وێنەکان لائەبەن!

ئیتر عەوامی قوربەسەر چی بکا لە دەست ئەو ڕوئەسایانەی بێ مروەت و بێ ئینساف؟

٣٦/٤

## من و مەلا مەولوودی هەولێری!

زاتێ بوو، مەلا، مەلایێ چاك! مەلا مەولوودی هەولێری[1] ! وەڵڵاش فەقێی بابم بوو، زۆری لە خدمەت باپیرم خوێندبوو، هاتە کۆیێ بە قازیەتی. چەند جاران گفتوگۆمان ئەکرد. ڕۆژێ لە خزمەت بابم چووینە تەکیەی بابەشێخ (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ). قازییش تەشریفی هات، فەرمووی: کاك محەمەد ئیشکالێکم هەیە، حەددم نییە عەرزی بابت بکەم، ئەمما عەرزی تۆی ئەکەم. وە شەو و ڕۆژێ، سێ شەو و ڕۆژ، دوو هەفتە مۆڵەتت بێ ئەگەر جوابم بدەی!

حەقیقەتەن دڵم کەوتە دەغدەغە، زاتێ وا مودەقیق لە قەریحەی خۆی ئیشکالێ وا هەڵسێنێ، ئەبێ چی بێ؟

وتم فەرموو!

فەرمووی: مەعلوومە هەموو کتێبێ حیکمەت و کەلام ئەڵێن: حیسی موشتەرەك دەوری مودریکیە، خۆشی ئەیداتە خەیاڵ، لەوێ حیفز

---

(١) ناوی مەولوود کوڕی لوتفوڵلا ئەفەندی کوڕی داودە، نازناویی حەنەفی زادەیە، یەکێك بووە لە مەلا چاکەکانی هەولێر، هاوچەرخی شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی بووە، دەگوترێ ڕۆژانی سێشەممە و هەینی مەلایەکان لەلای مەلا مەولوود کۆدەبوونەوە، گفتوگۆیان لەسەر تەفسیری بەیزاوی دەکرد، ئەگەر گەیشتبانە زەحمەتییەك، مەلا مەولوود بۆی ڕوون دەکردنەوە. ساڵی وەفاتی دیارنییە تەنیا ئەوە دیارە، کە نووسراوێکی لەساڵی ١٨٨٣ نووسیوەتەوە.

ئەکرێ! ئەمڕۆ لە تەفسیری بەیزاوی دیتم ئەڵێ: حیسسی موشتەرەك لە خەیاڵ وەرئەگرێ! ئەوەندەی دەستڕەسم بوو لە کتێبی حیکمەت و کەلام پشکنیم، چم نەدیت ئیشکالەکە دەفع بکا.

وتم: ناکا لە تەفسیری خەونی حەزرەتی یوسفت دیبێ؟

وتی: بەلێ وەڵڵا!

وتم: خوا عافوت کا ئەمە جێی ئیشکال نییە! بێ قەزا بی بەیزاوی باسی خەون ئەکا، لە خەودا حەواسی ظاهیر بێ کار ئەمێنن! ئەو وەختە حیسسی موشتەرەك لە خەیاڵ وەرئەگرێ، لە وەقتی بەخەبەریدا لە حەواسی ظاهیرە، سەمع و بەصەر و زەوق و لەمس وەرئەگرێ ئەیداتە خەیاڵ، فەرموودەی بەیزاوی چ ئیشکالی تیا نییە! وە لەگەڵ ئەوەشدا شێخی ڕەئیس ئەفەرموێ: قیوای باتینە وەك مەرایای موتەقابیلن، لێك وەرئەگرن.

کە ئەو جوابەم دایەوە بەو سووکی و ئاسانییە، مەلا زۆر مونفەعیل بوو، ساکیت بوو تا هەستاین. بابم فەرموی: ڕۆڵە ئەبا موساعەدەی قازیی بکەی، ئەو زۆر ئیشکالەکەی ئیستیعزام کرد، تۆش زۆر بەبێ ئەهەمییەتی جوابت دایەوە، گەلێ موتەئەسیر بوو.

وتم: قوربان بەخوای لای وابوو تۆش ناتوانی جوابی بدەیەوە، ئەمما ئەدەبی نواند، ئەو زاتە زۆر خەریك بوو من بشکێنێ، ئەمما لە لوتفی خودا بۆی ڕێك نەکەوت.

عولەمای تەبیعیون خەریکن، بەلام بۆیان حەل نابی خەون چییە، ئەو دیتن قبل الوقوع موئەووەل لە چییەوەیە؟! بە قەواعیدی تەبیعەت چیان بۆ مویەسسەر نابێ. ئەوەی ئەڵێ خەون هیچ نییە، ئەوەی لە ڕۆژ ئەیبینێ، لە خەو دێتە خەیاڵت، هەذەیان ئەکا! لەگەڵ خۆی ئەڵێ.

٢٢٠/٤

## باب منداڵی بێ دایکی خۆشتر ئەوێ!

بابی ئەصیل، منداڵی بێ داکی خۆشتر ئەوێ لە گەوران، خصوصەن کە داکیان مابێ، لەبەر بێ ڕەحمی زڕ داك زۆر شەفەقەتیان لە حەق

ئەنوێنێ. سبحان الله برایەکم هەبوو کاکە بەهائەدین، دایکی پلکم بوو، کە وەفاتی کرد، بابم داکمی خواست، عومرم سێ چار ساڵانی بوو، دایکم مرد، باوکم بەخێوی کردم. زۆری خۆشدەویستم، کاکەباو تووڕە ئەبوو، حەتتا گەلێ جار ئەیگوت کاك حەمەد وەك یوسف وەهایە ڕقی لێ ئەبۆوە، مەیلی خوێندنی نەبوو، من ئەمخوێند، بابم زێدە ئیعتینای پێ ئەکردم، ئومێدی بەقووەت بوو ببمە مەلا، لە سایەی لوتفی خوا و ئیعتینای ئەودا بوومە مەلا، چەند ئیجازەم لە حزووری وی دا. خوایە بۆ حورمەتی ئەو دوو بابە عیلمی ئالی جەلی نەکوژێنیەوە تا ئەبەد. لەگەڵ دەوڵەت و عیززەت، عالمی گەورە لە ئەولاد و ئەحقابی من نەبڕێ. ئیلاهی خۆت ئەزانی عەسر زۆر ناموساعیدە بۆ ئێمە ئیتر خۆت و مەرحەمەتت.

٢٢٤/٤

## ئەگەر هێندە مەلا بای بتزانیبا ئەمن چەند مەلام، بەست بوو!

حاجی مەلا ئەحمەدی مامم ڕۆژێ ئەو ئایەتەی[1] لە بابم پرسیەوە. بابم بە سووکی و هاسانی جوابیدا، مەعنای بۆ ئاشکرا کرد. مامم فەرمووی: کاکە ئەوە چیە؟ چ سرە هەردووکمان لە یەك داك و بابێکین، ئەمنیش زۆرم خوێندیە، بۆ ئێمە هەتا شتێکی دەزانین زۆر ماندی دەبین؟ کە سوئال لە توو دەکەین بە هاسانی بێ موراجیعەت جوابمان دەدەیەوە؟

فەرمووی: ڕۆڵە ئەگەر هێندە مەلا بای بتزانیبا ئەمن چەند مەلام، بەست بوو!

٢١/٥

---

(١) مەبەستی ئایەتی (قالوا جزاؤه من وجد في رحله فهو جزاؤه كذلك نجزي الظالمين/ يوسف٧٥) یە.

## عیشق!

١-بابم (روح الله روحه) لە زەمانی تەحصیلیا عاشقی حەلیمەی کچی مەلا محەمەدی کاك عەبدوڵڵای شێخ وەتمانی بووبوو. ئەمما عیشق و غەرامی پاك، نیهایەت خوا نسیبی نەکرد. پاش چەند وەختێ لەسەر بانی مزگەوتی خۆمان دەیفەرموو: دەورم دەکردەوە حسب العادة دەهاتم و دەچووم، کە ڕووم دەکەوتە لای شەرق بۆنی حەلیمم بۆ دەهات، دەمگوت یارەبی ئەمە چییە؟! کەمێکی پێ چوو لە دامێنی هەیبەسوڵتان سیاهێ دەهات بۆ لای کۆیە تا دەهاتە پێش، بێنی ئەو یارەم بۆ زیاتر دەبوو.

خولاسە مەعشوقەی قەدیمی بوو، بۆ تەداوی هاتبوو بۆ کۆیێ. گەلێ جار دەیفەرموو: ڕۆڵە ئەو کەسی ئەو نەوعە غەرامەی نەبووبێ، وە لە دوورەوە بۆنی مەحبووبەی نەکردبێ، بە تەواوی ئیمان بەو ئایەتە، یەعنی (إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ) ناهێنێ[1].

---

(١) باپیرم لە خوێندنی باڵەکەتی ئاشقی حەلیمەی مەلای شێخ وەتمان بووە. چەندی دەکا باوکی، حاجی مەلا ئەسعەد، بۆی داخوازی ناکات، ئەویش بێ پرس مل دەنێ بۆ لای مەلا عەلی تورجانی لە مەڵبەندی سابلاغ کە داخوازیەکەی بۆ بکات. گێڕابوویەوە گوتبووی، کە گەیشتمە دەربەندی ڕەمکان ماندوو بووم لەبن دیواری قەڵاکەی دەربەند سەرم بە بەردێک کرد و نووستم. کاتێک لە ڕەپەی پێی زەلامێک خەبەرم بۆوە کە سەیرم کرد حەماغا بوو لە بانی قەڵاتەوە دیتبوومی هەر لەوێوە خۆی هەڵدابوو بۆ سەر زبلگەیەک بانەکەش زۆر بلند نەبوو بە سەلامەتی دابەزی... پێی گوتم فلانەکەس دەزانم نیازت چییە، وەرە بەسەرمدا تێمەپەڕە و نامەردم مەکە با من ئەم مەسەلەیەت بۆ جێبەجێ بکەم. باپیرم پێی دەڵێتەوە نییەتم هەڵقەناوە بۆ لای مەلا عەلی. حەماغا لەو ساڵەدا میرقەلات بووە کە بە زاراوەی ناوچەیی کۆیێ پێی دەڵێن «ئاغادەربەند». لە نووسینی دیکەمدا بە لێکدانەوەی تێروپڕ ئەم ساڵەی پەنابردنی باپیرم بۆ مەلای تورجانی لە ١٢٧٥ تێپەڕ ناکات، چونکە باپیرم بە ئیلحاحی حاجی مەلا ئەسعەدی باوکی لە پاش ئەم ساڵە کچی حاجی بەکراغا مارە دەکات و لە ١٢٧٨ دووەم کچی لێی بەرهەم دێت. هەڵبەت ئەو تۆرانەی باپیرم کە حاجی مەلا ئەسعەدی ناچارکرد بەدوایدا بچێت و لە دەوروبەری سەردەشتەوە بیگێڕێتەوە بۆ کۆیێ بەدوا ئەوەدا هەتا ئاشتی دەکاتەوە و لە حەلیمەی ئومێدبڕ دەکات و پێی

←

بە موناسەبەی بوونی بە موفتی، شێخ محەمەد سەیدی بەرزنجی، لە ئەستەنبۆڵ هاتەوە، بە کۆیێ دا چووە سلێمانی. بابم پاش مەغریب چووە زیارەتی، دەست لە ملان بوون یەکتریان بۆن کرد، مەوقیعەکە وابوو ئەوانەی لە موعییەی دا بوون، کەوتبوونە تاریکییەك دوو کەس پێش من چوونە دەست ماچکردنی، من چووم زیارەتم کرد دەستی بەرنەدام.

وتی: ئەو زاتە نسبەتی چییە لەگەڵ جەنابی مەلا؟

وتیان: کوڕیەتی.

وتی: سبحان الله ئەو بێنی لە جەنابی مەلام کرد، عەینی ویم لەم زاتە کرد! زانیم قەرابەتی لەگەڵی هەیە.

٢- بێن زۆر دەڕوا، غایەتی قووەی شاممەی موختەلیفە. وەك حوکەمایان دەڵێن بەعزە تەیرێك لە زەخمە، لە مەسافەیەکی دوور بێن دەکا، بە دوای بۆنی لاشەدا دەچێ. ئەو تەیرە بە کوردی پێی دەڵێن داراش. دەفعەیێ لە جەل[1]-جەلی بووین، چووینە زیارەتی باپیرە گەورەمان مەلا عەبدوڵلای کاکی جەلی. لە ئەسنای زیارەتی مەرقەدی لە جیهەتی شیمالەوە دوو جار لەگەڵ نەسیمێکی فێنك، بۆنێکمان بۆ هات

---

دەسەلمێنێ کچی حاجی بەکراغا بهێنێ.(مەسعوود محەمەد، کتێبی حەماغای گەورە).
ئەم ساڵەی ١٢٧٥ـە مێژووی ژن هێنانی باپیرمە. لەم چوار ساڵەی پێشتردا داستانی پرسۆزی دڵدارییەکەی باپیرم و حەلیمەی مەلای شێخ وەتمان ڕووی داوە و لە سێ ساڵان پتر هەر دوویانی بەدەم ئومێد و نەومێدییەوە تلاندۆتەوە تا سەری گەیاندوە بە نەومێدی یەکجاری. دوای سەرکەشیەکی بێهوودەی پڕ لە دڵگەرمی و تۆران و تەقەڵلای ئێرە و ئەوێ، باپیرم ناچار بوە دەست هەڵگرێ لەو ئاواتە زلەی و سەر دانوێنێ بۆ فەرمانی حاجی مەلا ئەسعەدی باوکی و کچی حاجی بەکرئاغای لێ مارە بکرێ. داستانی حاجی مەلا عەبدوڵا و «حەلیمەی مەلا محەمەدی شێخ وەتمان» کە مامۆستای باپیرم بوە لە نهێنی و ژێرپەردەیی دەرچوە و بەسەر هەموو زار و زمانانەوە بوە، عاتیفەیەیێکی ئەوەندەش پاک لە نێوانیاندا هەبوە نە باوکی حەلیمە شەرمی لێ هاتۆتەوە نە باپیریشم لە کەسی شاردۆتەوە. باوکم دەیگێڕایەوە کە وا باپیرم تا دوارۆژانی ژیانی ناوبەناوە بە چاوی تەڕەوە دەستی لە سەر دڵی داناوە و گوتویەتی: ئێستەش برینی حەلیمەی تێدایە. (مەسعوود محەمەد: کتێبی حاجی قادری کۆیی).

(١) گوندی (جەل) زێدی بنەماڵەی جەلیزادەیە و ئێستا سەر بە ناحیەی سکتانی قەزای کۆیەیە.

ئەوەندە خۆش بوو موتەعەجیب بووین ئەو بێنە چبوو؟! لە کێوە هات؟ دوایی هەرچەند ئیستینشاقمان کرد بەرەو شیمال ڕاوەستاین چیدی نەبوو.

٣-لە مەجەلـــلەی (کــل شـــيء) ی میصـــری عەدەدی (٤٣٧) ڕۆژی چوارشەموو، یەنـایەر ١٠ ڕەمەزان ٢٤ی سـەنەی هیجری ١٣٥٣، سـەنەی میلادی ١٩٣٤ صەحیفە ٢٥، بە عینوان (حاسة واحدة أم خمـس حـواس) دەڵێ: بێنـی خـۆش و مۆسـیقا تەقـویەی بەصـەر دەکەن، ئەنەهـو سـوئال دەکا، سەبەبی چییە ئەگەر گوێت لە شتێ خۆش بـوو تەئسیر لە بەصـەر دەکا؟ پەسیو تەئسیر لە بەصەر و سەمع دەکا، چاو یا گوێ ئێشان تەئسیر لە قووەتی شاممە دەکا. لەگەڵ ئەوەشدا هەریەك مەرکەزی خاصی خۆی هەیە لە مێشـك، کەس حەللـی نەکـردیە تـاکو دکتـۆر هارتومـان[1] ئەو نەزەریەی دانا، دەماغ موستەودەعە بۆ قووەی فیکر و خەیاڵ و ئیحساس، زاهیرەن مونقەسیمە، ئەمما لە باتین و حەقیقەتدا تەقسیم نیـیە! بەڵکە یەك مەنبەعیان هەیە! قووای زهنییە لەوێـڕا فەیـزان دەکـا، لەلای ئەو مەرکەزە موعەیینە تەیباراتی حەواس لە ئەعزای حەواس، بەصەر و سەمع و شەم و زەوق و لەمس، تەلاقی دەکەن.

سروور لە تەقویەی خوا زۆر دەخلی هەیە، حەتتا لە کوردیـدا دەڵـێ: ئینسان بە گوێ قەڵەو دەبێ، یەعنی بە قسەی خۆش! وە قووای عامیلەش بە قووەت دەبێ، هاضمە و غازیە و نامیە، تەئسیریان زیاد دەبێ.

٣١/٥

## بابم بە هەنگوین مرد!

هەنگوین بۆ گەلێ عیللەت باشە، شیفای تیـا هەیە. جەنـابی ڕیسـالەت ئەمری فەرموو، دایانە زگچوو، ئاخری پێی چابوو. ئێستا تەداوی ئیسـهال بە موسهیل دەستوورە لە بەینی ئەتیبا، سبحان الله مـن زگـم پـێ دێشـی. حاجی مەلا ئەحمەدی مامم بە زەحیری دەمەوی موبتەلا بوو، علی الدوام

---

(١) ناوی ئەلیکسیس فرانك هارتمانە. پزیشـکی بـواری منـداڵان بـووە لە سویسـرا، لە ساڵی ١٨٩٨ لەدایك بووە و لە ساڵی ١٩٦٤ کۆچی دوایی کردووە.

شەربەتی هەنگوینی ئەخواردەوە.

عەرزم کرد مەخۆوە، خراپە، تۆ خوێن دادەنێی.

تووڕە ئەبوو ئەیفەرموو: خوا ئەفەرمویٚ فیه شفاء للناس.

ئەمگوت: قوربان مەعنای وا نییە، بۆ هەموو دەردێ، بۆ هەموو کەسێ شیفایە. نیهایەت ئەو شەوەی تیای چۆوە ڕەحمەتی خوای، حەڕەمی ئەیوت:

شەربەتی هەنگوین ناخۆیەوە؟

ئەیفەرموو: نا، کاك حەمەد ئەڵێ خراپە.

لاکین وەقتی نەمابوو.

ڕەحمەتی خوای لێ بێ بابم هەنگوین و تەڕەیاغی ڕۆنەکەرەی خوارد. کردیە ئیسهالی دەمەوی کەبەدی، پێی چووە ڕەحمەتی خوای. ئەمما من هەتا ئەیخۆم ئەلەمی پێی نابی. هەنگوینی شەمەترێنکە لە پشدەر هەیە ئەڵێن: خۆشە، خەفیفە، ئەمما نەمدیوە! ئەو هەنگوینە چۆن پەیدا دەکا؟ ڕاوەستاین بەلکو لە ولاتی خۆمان لە ساحێب مێشان بەعزە تەحقیقاتێ نوێ دەسترەس دەبێ! چی وا نەبوو!

دوو شتم مەقصود بوو یەکێ زەواج یەکێ مەخرەجی هەنگوین! بۆ لیقاح و زەواج ئەوانی ئێمە خەبەردار نین، (فەخر)[1] دەفەرموێ: هەر هەنگوین دەخوا!

وا نییە! بەڵێ مەیلی لە شیرنایەتی، لە ترێ لە هەنجیر لە هەرمێ هەیە، لە گۆشت دەنیشێ دەیخوا، هەلاڵە دەکێشێتەوە بۆ فەرخان، مەوادی حولوە گرد دەکاتەوە و وەکەزا (شەمێ)، لاقی بە کولکە ئەگەر ئەو کولکە نەبێ چی بۆ خڕ نابێتەوە. بەعزە لە ساحێب مێشان عەرز ئەکەن هەنگوین لە ژێر باڵی دێتە دەرێ، لام وایە موافیقی عیبارەتی قورئانە. ئەو شیرنایەتییەی دەیخوا لە دەروونی هەزم دەبێ، قابیلە شتێ وەك مەحەك لە بەینی باڵی بێ. پاش هەزم لێی دەچۆڕێتەوە ناو خانە وەك گوانی حەیوان کە بیدۆشن ئەو شتانەی تەواو بوو بوو تۆی تێکرا ئەوانی ئێمە دەڵێن: لەسەری کورك دەبن، بە موددەی سێ ڕۆژی تەواو دەبێتە

---

(١) نەمانزانی فەخر (فخر) کێیە، پێدەچێ مەبەستی فەخری ڕازی بێ.

مێش، وە لەسەر شانەکە دەگەڕێن، شلفەی ئەووەل شایەکی هەیە کە دەرکران دەوری شای خۆیان دەدەن لە دەوری جەمع دەبن، شولفەی دووەم و سێیەم شایان موتەعەددیدن.

وە ئەوانەی ئێمە دەڵێن: نارەحەت دەبن بە ئیزتیراب دەکەون، تا یەکێ ئینتیخاب دەکەن، ئەوانی تر دەکوژن. وە ئیللا پارچە پارچە دەبن. هەر پارچە بە دوای شایێ دەکەون، ئەگەر وابوو دەیانگرینەوە. شایێ دێڵینەوە ئەوانی تر دەکوژین، ئەوجا هەموویان کۆدەبنەوە سەر یەك شا، وە دادەمەزرێن.

بە دامەن زبل دەکەن، دەڵێن لەناو ماڵی خۆیان زبل ناڕێژن دێنە دەرەوە، وە قسمێ هەیە کەرە مێشیان دەڵێنێ زلن، بەعزێ دەڵێن تەوەززەلن هەنگوین دەخۆن. ئەوانی تر نایەڵن دەیانکوژن، عەسەل تا زستان ناخۆن. بۆ زەواج لە تەنتاوی دەڵێ: مەلیکە دەچێتە دەر، زەوجێ لە خاریجی ڕەعیەی خۆی پەیدا دەکا، بعد اللقاح دێتەوە.

ئەمما ئەوە وا نییە! مەلیکە بچێتە دەر، ئانەن هەموویان دوای دەکەون! ئەمما لە کتێبی ترم دیوە لە کەرەمێشەکان کە نێزیکی ئینتیخاب دەکەن بۆ زەواجی مەلیکە، بعد اللقاح زکورەکان هەموو دەکوژرێن. حەققەن ئیش نەچێتە دەست واحید، ئینتیزامی نییە!

لەو وەقتە ئێرەم دەنووسی، لە ماڵە دیانەکی مێشێ دەبڕنەوە، ئەز قەزا شایەکە دەفەوتێ، ساحێبی بۆمی نەقل کرد: عمومی مێشەکە هاتە دەر بەگژ یەکا چوون، بە زەرفی دوو سەعات یەکتریان کوشت، دیاریان نەما. حەتتا وتی: مێشی ئەوەندە بەقووەت و زۆر بوو بە تریانی ساواران لاشەیانمان لە ماڵێ فڕێ دا.

ئەو کائیناتە بێ ئیلاه نابێ! وە لەگەڵ تەعەددود ئینتیزام غەیرە قابیلە!

زستانێ ئەگەر سارد نەبێ وەك ئەو ساڵ، دەرکەی ناگرێ! وە ئیللا دەرکەی لەسەر خۆی پێوە دەدا سڕ دەبێ لە گەرمەی بەهار بە خەبەر دێ- وەکی ئەصحاب الکهف- دەرکەی دەکاتەوە بە ئەستووری هاموشۆی دەکا. لەو مەیانە تا شسناسی و شیرنایی پەیدا دەبێ، زەخیرەی خۆی دەخوا، مارت و نیسان ڕایەڵە دەکا. لە مایس و حوزەیران هەنگوین دادەنێ، بەعدەهو نابێ!

جارێ ئەوەندە بەسە تا خەبەرم لای شێخی سەلان بۆ دێ دائیر بە

زاووزێ، لەوێم چ بۆ بێ تەحریری دەکەم. ١٦١/٥

جا جێی ئیعتیبارە لە نەحل، ئینتیزام و ئیرادەو تەشکیلی حکومەت و ئیتاعەی سەردار و ئیتیحادی تام. وە دەڵێن ئەکثەری ئوموری هامەی ئینسان لە حەیواناتی وەرگرتیە. ئێمە مع الاسف لەو دیقەتە مەحرومین. خاصەتەن عولومی کەونییە و فیعلییە، بۆ مەلایان نوقصانە! مەلا چ حەقی هەیە بزانێ نەحل شانە چۆن دروست دەکا؟ کوو عەسەل خڕ دەکاتەوە؟ ئیدارەیان بە چ تەرزە؟ نەحل نەخۆش دەبێ زەردووی دەگرێ، سەبەبی چییە؟ بە چی تەداوی دەکرێ؟ جەواب، جەهلە!

خۆخ بۆ زوو دەمرێ ئەوەندە جەویە دەردەکا؟ بڵێم چی کاری خودایە، ئەوەی دەزانم –علی نهج الاشاعرة- لە ئەسبابی عادی دەپرسم! سێو، هەلوچکە، ئالی بالی، زەردەلوو و قەیسی بۆ کون دەبێ؟ جەوی دەردەکا بە فەساد دەچێ؟ نازانم، کاری خوایە!

بەڵێ من دەزانم بەعزە حەشەرات هەن دەرزیلەی باریك باریکیان بەدەمەوەیە لە میوەکەی دەدا، ئەو حەشەراتە بە چی دەفەوتێن؟ هیچ! ناشکوری نەبێ سەراسەر جەهلە! باغەوانێ چل ساڵ لەناو باغ عومر ڕادەبوێرێ مع الاسف لەمن جاهیلترە، مومکینە ئەو نەوعە کەسە لە سالفی ئەییام لە ترسی مەلایان نەوێرابێ تەماشاکا وە ئەسباب و عیلەلی بۆ زاهیر ببێ.

ئەی قەومی نەجیب! بنۆڕنە تەفەڕوقی خۆتان و ئیجتیماعی نەحل، مەحصولی وان و حاصلی خۆتان. وە تەئەممول کەن بە چەند هەزار مەرتەبە لە ئێوە لە ئالیهەتان زیترن، فائیدەیان چەند زۆرە، ڕێ چۆن دەردەکەن؟ ئێوە چەند گومران! چارە ئیتیحادی کەلیمەیە، ئیتاعەتی زاتێ واحیدە، بارێ هیچ نەبێ قورئان مەکەنە (أضحوك)ـە، بە (هذیان)ی شیعان، گوێ مەدەنە قسەی بۆفی زلزلی پفەمای سۆفیان. بنۆڕنە نەحلی ئەرواحی جیبال، ئەنواری زاتی ئەشجار، ئەنواری صیفات، ئەنواری عروشی ئەفعال نووری بەهای ئەنوائی زاتیە، ئەزهاری ئەنواری ئەفعالییە. شەرابی مەعریفەتوڵلا، بێ تەئویل و مەئویل، تەتەبوعی ئاساری ئایاتی خوا کەن. بە عیلمی عەمەلی زیاد موستەفید بن، پاش ضلالی حەیوانات و ئەمەرات، نەختێ تەماشای خۆتان کەن.

١٦٢/٥

## مەلا عەبدوڵڵا ئەفەندی زۆر مەلایە، ئەمما قسەی ڕەقە بۆ دونیا و دین!

لە تەئریخی هەزار و سێسەد و چار (١٣٠٤هـ)[١] تەحسین پاشا والی موصل، هاتە کۆیە، ئەعیان و وجەهای بەلدە لە خزمەت بابم چووینە زیارەتی، ئەو وەقتی هەمەوەند[٢] ڕێگایان گرتبوو، بە شەقاوەت عالەمیان خستبووە ئیزتیراب، کەس نەیدەوێرا بۆ تیجارەت بچێتە دەر، وتی: حازیرات تەدبیرێکی بکەن، لەو وڵاتە تەرەقی تیجارەت بە چی دەبێ؟

بابم فەرمووی: تەرەقیی تیجارەت بە ئەمنیەتی ڕێگایان دەبێ، ئەگەر ئەمنیەت بوو، بە تەبیعەتی خۆی تیجارەت تەرەقی دەکا!

یەك دوو دەفعەی دی عەینی سوئالی کردەوە، بابم عەینی جوابی داوە.

وتی: ئەوە حکومەت، خۆ ئێران عائیدی وییە!

بابم فەرمووی: بۆ وێ نابێ!

پاش عەودەتی بۆ موصڵ فەرموو بووی: حاجی مەلا عەبدوڵڵا ئەفەندی زۆر مەلایە، ئەمما قسەی ڕەقە بۆ دونیا و دین. ئەمە نیعمەتە ئاسایش و سیعەتی ڕزق، جا ئەگەر پیاوی تیا بێ، علیمیش تەرەقی دەکا.

خولاصە حەیاتی تەیبەیان بوو، ئەمن و ئاسایشی دێهاتی.

١٨٥/٥

## بەدخوا نازانێ ئەڵێ چی!

تازە لە طەریقی عیلمی پێ ئەگەیشتم ڕۆژێ دوازدە دەرسم ئەگوت، وە دەرسیشم لای بابم ئەخوێند، ئەوەی لە ڕێ داماڵابوون دەیانوت:

---

(١) واتە ساڵی ١٨٨٧ی میلادی

(٢) هۆزێکی کوردن و لە ناوچەی چەمچەماڵ دەژین.

شەوێ ئەو دوازدە دەرسە لای بابی ئەخوێنێ، بە ڕۆژ دەیڵێتەوە بە دەرس.

کە بیستم وتم: بەخودای ئەو ئیقتیدارەم نییە بە شەو دوازدە دەرس بخوێنم، وای وەرگرم سبەی بە فەقێیانی نیشان دەم تێیان بگەیەنم. ئەو تەعنە بۆ من مەداری فەخرە ئەگەر وابا، بەڵام مع الاسف ئەو لیاقەتەم نییە! ئیتر بەدخواه نازانێ ئەڵێ چی!

٢٢٠/٥

## شەڕی پیران و مامەشیان و پلاری بابم لە شیعان!

لە زەمانی عوسمانی، شەڕێ بوو لە بەینی پیران و مامەش، (جاداو ڕوو) کە عەسکەری ڕەسمی ئێران بوون، موداخەلەیان کردبوو. مەسئەلە ببووە مەسئەلەی دەوڵەتی، لە تەڕەفەین تەحقیقات مەئموری هەناردرا. لە فەسڵی بەهار، ئەو وەقتە ئەمیری جەنگ بهادار حوسێنی خان لەگەڵ جەمعێ هاتنە بیتوێن، وای ئیجاب کرد ئیسماعیل بەگ ئەرکانی حەرب کە لە تەڕەفی عوسمانی ناردرابوو، بابمی جەلب کرد بۆ بیتوێن. بۆی نووسی بوو ئەگەر نەیەی ڕۆژی قیامەت لە خزمەت خودا و ڕەسوولی خودا شکاتت لێ ئەکەم. بابم چوو، منیش لە خزمەتی چووم. ڕۆژێ لە میانی صوحبەت لەسەر نانخواردن، ئەمیرخان عەرزی مەلای کرد: ئێوە دەرحەق صاحب الزمان[1] چ ئەڵێن؟

فەرمووی ئەوەی لە بیری سامەڕای موختەفی بووە؟

گوتی: بەڵێ تصدقت شوم!

وایزانی تەصدیقی ئەکا. فەرمووی: ئێمەش ئەووەل گومانەکمان بوو، ئەمما ئێستا لامان موحەقیقە مردیە، لەناو بیر خنکایە!

گوتی: ئامان، چۆن؟

فەرمووی: موددەی ئیختیفا وەك لە قورئان وەرئەگیرێ سێسەد و نۆ

---

(١) صاحب الزمان مەبەست ئیمام مەهدی چاوەڕێکراوە.

ساڵە! ئەو مادام لە هەزار ساڵ تێپەڕی، بێ شك نەمایە!
ئەوانی ئێرانی لە تاوان دەستیان ڕاوەستا لوقمەیان پێ نەجوورا.

٢٦٥/٥

## والی و ئیسراف!

بابم فەرمووی: لە بەغدا بووم ساڵی ١٢٩٢هجری[1] جەمعێ لە ئەشراف ئیسرافیان کردبوو لای والی دەربارەی (سید سلمان نقیب الاشراف) زۆر دوابوون، چەند مەصرەفی کردیە لە ژنێ، هێناویەتی بە هەزار لیرە دوو جاریەی کڕیە، ماڵی ئەوقافی ئەستانەی نەهێشت، لە هەوای نەفسی خۆی خەرجی ئەکات. بالمقابل والی ساعەتێ قیمەتدار هەدیە ئەنێرێ بۆ نەقیب، کاغەزەکی بۆ ئەنووسێ گلەیی ئەکا بۆ ئیشتیراکی حەفلەی عورسی دەعوەتی نەکردیە؟ ئەوانی شکایەتیان کردبوو، زۆر پێی تێك چووبوون. لەو هەنگامە ڕۆژێ لە خزمەت موفتی زەهاوی چووینە خزمەت نەقیب، ئەو ماجەرایە باسی لێکرا. بەیانی تەئەثور و ئینفیعالی بەدخواهانی سەییدیان کرد، موفتی بەداهەتەن فەرمووی:

من ساعة اعطيتها زلزلوا
زلزلة الساعة شيء عظيم

١٦٢/٦

## مەلا حسێن قەڕەناوی و نوورەددین!

مەلا حسێن قەڕەناوی ڕەحمەتی لێ بێ، مەلایە باش بوو، موجازی بابم بوو. هاتە زیارەتی ئوستادی، لە وەقتی عەودەت، نورەددین سعاتەکەی تێك چووبوو، دایێ بینێرێتە کەرکووك بۆی چاك کرێتەوە. چەندی پێ چوو، تەئخیر بوو، سعاتەکە نەهاتەوە. نورەددین بۆی نووسی:

---

(١) واتە ساڵی ١٨٧٥ زایینی.

(وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا) لەتیف واقیعەن بە چاککراوەیی هاتەوە.

١٦٩/٦

## دین لە عالمان وەردەگرین و ڕوومان لە شێخانە!

محەمەد ئەمین ئاغای پیران، پیاوێ زیرەك بوو، بە موناسەبەیێ عەرزی بابمی کرد: قوربان سەبەبی چییە ئێمە دین و ئاین و ئاداب و ئەخلاق لە عولەمایان وەرئەگرین، کەچی ڕوومان لە شێخانە مەیلی وان ئەکەین؟

فەرمووی: ئەوە لەبەر موناسەبەیە. ئەسپێ ئەصیلی نەژدی ڕاگرن، کەرێ ببەستنەوە، گاڕانە کەرێ بەرەڵلا کەن ڕوو لە کیهەیان ئەکەن؟

وتی: ئەڵبەتە لە کەرەکە، ئەوە مەعلومە!

٢٦٤/٦

## دوو ئافرەت شەرع دێننە لای بابم!

ڕۆژێ لە مزگەوت هاتمەوە ماڵێ، نۆڕیم لە هەیوانێ دوو ئافرەت لە پشت پەنجەرە دانیشتینە. یەکێ جەمیلە، یەکێ پیر. لای بابم شەرعی ئەکەن. بابم ڕەحمەتی خودای لێ بێ زۆر موتیعی شەرع بوو، بەناوی شەرع بانگیان کردبا کۆلانێ، ئیتاعەی ئەکردن. وە لەگەڵ موخاصمان زۆر باڵ قووڵ بوو وە بە تەحەممول بوو. چوومە خزمەتی لە هۆدە- بعد المحاكمة- بە پیرەژنی فەرموو:

حەق ئی تووە!

جەمیلەکە گوتی: وەڵا مەلا شەرعت گۆڕی.

گوتی: نەمگۆڕی.

گوتی: گۆڕیت.

گوتی: نەمگۆڕی.

گوتی: بەڵێ والله گۆڕیت.

فەرمووی: ناوەڵلا نەمگۆڕی، لە قسانت دیارە تۆ جەمیلە و تەنك و

تۆڵی، ئەوی تر پیرەژنێ فەرت و فۆلە، بۆ پیرەژنێ فەرتووتی نافیرە جا شەرع ئەگۆڕم؟

من تەمام بوو لێیان توورەبم دەریان بکەم، فەرمووی: ئامان تەحەممول کە! مادام بەناوی شەرع هاتینە، چی دەڵێن با بڵێن.

خولاصە مسوڵمانی بە ڕۆژوو نوێژ زۆرن، ئەمما موتیعی حوکم بە دڵ و جان زۆر نادرن.

٢٨٥/٦

## شێخ عەبدولقادر یان مەلا عەبدولقادری گەیلانی!

ئەگەر ئایەتێ بەسەر شێخان قیرائەت کەی، هار ئەبێ، موریدەکانی ئینسانی کافر ئەکەن، دێن:

بە شێخێ ئەڵێی؟ واو وا ئایەتی بەسەر شێخێ دا ئەخوێنیتەوە؟

جارێ لە وەعزا وتم: مەلاعەبدولقادری گەیلانی وای فەرمووە. قادرییەکان هاربوو بوون، کو مەلا بە حەزرەتی غەوس ئەڵێ: مەلا!؟

ئینسانێ لە نوصحی ناصیحان موستەغنی نابێ، مەلایە.

بابم فەرمووی: لە خدمەت کاك ئەحمەد بەعزە ڕەسائیلی ویمان ئەخوێندەوە، ئەغلاتی کیتابەتیم عەرز ئەکرد، تەصحیحی ئەفەرموو. ڕۆژێ نوسخەکی هێنا، فەرمووی: ئەگەر ئازای غەلەت لەو نوسخە بگرە.

دەستم کرد بە خوێندنەوەی، لە لاپەڕێ دوو سێ غەلەتی تیا بوو فەرمووی: حەلی ناکەم، چاوت زۆر تیژە.

وتم: قوربان نا، ئینسان عەیبی خۆی نابینی.

زۆر گریا، وتی: بەخوای ڕاست ئەکەی.

چاك وایە ئینسان دائیما لە عەیبی خۆی وردبێتەوە.

٢٦/٧

## شاعیران!

لە أفاك ی اثیم، مهبط وحی شیاطون شوعەران، دیارە خۆیـان مضـلن ئەتباعیـان ضـالن، گـومراهن، هـائیم و مـوتەحەییر و بـێ مەسـلەك و بـێ مەبدەئـ و بێ غایە، هەتکی ئەعراض، قەدحی ئەنساب، زەممی ئەشـراف، مەدحی ئەجلاف، موبالەغاتی درۆ، بێ ئەنداز ئەکەن.

ئەو شوعەرایانە بوون، ماڵ و دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسـییان بە قـوڕێ گرت. خەزێنەی حکومەتیان چۆل کرد، سازندگی وەکـی ئیبـراهیم بـن ئیسحاق موصلّی[1] میراتـی سـێ ملیـۆن دینـار بـوو، ئیمـامی شـافیعیش بە قەرداری مــرد. ئەو حکومەتــانە ئەژیەن؟ خۆیــان ئەوەنــدە ڕەزیــلانە و سفیلانە جولانەوە صونعەتی شیعریشیان بێ قیمەت کـرد. ئەمـڕۆ زاتەکـی مەدح ئەکەن، سبەی هەجوو. عەجایب لە پیـاوە گەورەکـان، کـوو پێیـان خۆش بووە مەدحیان بکەن؟ ئەیانزانی مەدحیان بۆ جەلبی ماڵە، نە بەیـانی حەق، خەلقیش ئەیزانی وان.

خولاسە سەییئاتی شاعیران —خصوص لە ئیسلامەتی- نایەتە تەعداد.

ئەفلاتوون زۆر لە دژی شاعیرانە، ئان زیادە ئەوانەی بە خەیاڵ ئـالیهە ئیعتیبار ئەکەن، وە شەڕیان ئەهاوێنە بەین، ئەفەرموێ: ئەمە زۆر خراپە بـۆ عەوام، ئـالیهە لە نەزەڕ وان مەبـدەئی سـەعادەت و خەیـرن، کە ئەوان بە شەڕ بێن، ئێکدی بکوژن، ئینسان ئەبێ چ بکا؟

گوێ لە شێخ ڕەزا[2] کوڕی شێخ عەبدولرەحمان و برای شێخ عەلـی

---

(١) ئیبراهیم موصلی (٧٤٢-٨٠٤) ناودارترین مۆسـیقاژەنی عەرەبە، لە کـووفە لەدایـك بووە و لە بەغدا مردووە، گۆرانیبێژ و عوودژەن بووە لە سەردەمی مەهدی و هادی و هارونەڕەشید.

(٢) ناوی ڕەزا کوڕی شێخ عەبدولرەحمانی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی مەلا شـێخ مەحموودی کوڕی یوسف ئاغایە، ساڵی ١٨٣٧ لەدایـك بـووە، زانـا و زمـان ڕەوان و شاعیر بووە، بە عەرەبی و فارسی و تورکی شیعری نووسیوە، لە کەرکـووك و بەغـدا و ئەستەنبوڵ ژیاوە، بە فەرمانی شێخ عەلی براگەورەی چـۆتە بەغـدا بـۆ سەرپەرشـتی ←

تاڵەبانی چ بەخۆی ئەکا لەگەڵ هەتیوە بولغاری، تا ئەچێتە لای ئەحمەد پاشای بابان شتەکی بداتێ. حق الانصاف ئەحوال و ئەتوار و مەسلەك و غـایەت و دەعـوەتی مـوحەممەدی نیسـبەتی لەگەڵ کەس نیـیە. لەسەرامەدانی صلاح، (فکیف) لەگەڵ کاهین و شاعیر و کلی نانی؟

کـورد تـا گەیشـتە دەورەی نـالی بە کـوردی شـیعریان نەبـوو، لە (وتیرە)ی شیعری عەرەبی و فارسی بەندی شاییان هەبوو: خزمینە گوێ و لەمن بێ، بـۆو دەکەم مەدحـی یـاری! بە لاوك یـا غەیـری تەرزی لاوك بەعزە وەقائیعیـان ڕێـك ئەخسـت، چ حەڕب- وەکـی دمـدم. یـا عیشـق، وەکی مەم و زین و برایمی مەلا زێندینان و قەل و گـوڵەزەرد و ناسـرو ماڵ ماڵ[١]. ئی بەڕاستی مۆسیقی و غەرامی بێ حەیرانی ئێمەیە. واقـیعەن بە شیعری تاگور[٢] و سائیری ئەورووپاییان ئەچێ، بەندەکی کورتە، ئێکی درێژە، ئێکیتری وەسـەتە، بەنـدی ئەحـمەدی کـۆر[٣]، مەیلـی تەسـەووف ئەکا، شاعیری میللیمان غەیری حاجی قادر نیـیە، منیش بەعـزە ئەشـعارم دانا، لە سۆزی دڵم، بۆ کوردان و ئیتاعەیان بۆ موتەشەییخان. مع الاسـف بۆ من زەرەر بوو، ئەوانیش نەفعیان لێ نەدیت!

**من یەقەی خۆم لە بۆیە دادەڕم**
**ئێوە نابن بە هیچ و من دەمرم**

حەقیقەتەن کورد نـابن بە هـیچ، ڕووحیـان نەمـاوە، وەکـی ئەشـباحی سینەما دێن و دەچن.

من لە ئەوائیلـی عـومرم حەزم لە شـاعیری بـوو، ئەممـا شـتێ بـوو بە

---

تەکیەکەیـان. لە سـاڵی ١٩١٠ لە بەغـدا کـۆچی دوایـی کـردووە و لە گۆڕسـتانی عەبدولقادری گەیلانی ئەسپەردەی خاك کراوە.

(١) ئەمـانە چەنـد بەیتێکـی فۆلکلـۆری کـوردین و بە شـێوەی حەکـایەت و لاوك و سەربردە و شیعر و پەخشانیش دەگوترێن.

(٢) تاگوور (رابندراناتە تیگۆرTagore) (١٨٦١-١٩٤١ز) لە کەلکۆتای هینـد لەدایـك بـووە، شـاعیرێکی هینـدییە، شیعرەکانی بە گیـانی ئـایینی و نیشـتمانی تێرئـاوکراون، خاوەنی چەند بەرهەمێکە و وێڕای ئەوەی لە ساڵی ١٩١٣ خەڵاتی نۆبلی وەرگرتووە.

(٣) حاجی قادری کۆیی لەبارەی ئەحمەدی کۆر دەڵـێ: ئەحمـەدی کـۆر لـە شـاری سابلاخە/ بەیتێکی داخە بەیتێکی باخە.

مانیع، ئارەزووم ئەکرد، لە ئیبتیدای کار شیعری دەقیق و پڕ مەعنا و ئابدار، وەکی کەلیم[1] و صائیب[2] و کەمال[3]ی هیندی دانێم، ئەمەش مومکین نەبوو، مەیلەکەم داکەوت، کول بوو قووەتی نەساند (للـه الحمد).

بابم شیعری خۆشی هەبوو، فارسی و کوردی، بە منداڵی شیعری بۆ دادەنام، تەشویقی ئەکردم لەسەر خوندن:

عەزیزی ڕۆژ و شەو بۆ خۆت بخوینە
لەناو گێژاوی جەهلدا مەمینە
لە دونیادا عەمەل تەحصیلی عیلمە
ئەوی عیلمی هەبێ دائیم بە حیلمە
مەلازادەی نەخوندی میسلی سەگسار
دەبی هەر هەڵپەڕی وەك سەگی هار
قول و قاچی مسولمانان دەرێنی
لە سفرەی زاڵمان نانی ڕفێنی

ئەگەر ئەشعاری کۆکراباوە دیوانێ ئەبوو.

شوعەرای ئەوروپایی ئەمڕۆ، ڕوو لە حیکمەت و هیدایەتی ئوممەت ئەدەن، تەشویقیان بۆ مەصالیحی دەوڵەتی ئەکەن. ئەوی حیکمەت و عیلم و عیرفان نەزم نەکا، ڕوحی حەماسەت و شەجاعەت و مەجد و کەرەم کاری بهاوێتە دەماغی قەوم، حەقیقەتەن شایانی تەبجیلە، لای خواش بە

---

(۱) کەلیم (؟-۱٦٥٠ز) شاعیرێکی هیندی/فارسییە، بە مەلیکوششوعەرا ناسراو بووە، دیوانێکی هەیە کە پڕە لە قەسیدە و مەسنەوییات، هەروەها خاوەنی کتێبی پادشانامەیە کە لە پەسنی جیهانگیری ئیمپراتۆری مەغۆل دایناوە.

(۲) میرزا محەمەد عەلی ناسراو بە صائیب (۱٦٠٣-۱٦٧٧ز) شاعیرێکی ئێرانی بووە، لە هیند نیشتەجێ بووە و خۆی لە شاجیهان نزیك کردۆتەوە، بە یەکێك لە ناودارترین شاعیرانی ئێرانی دادەنرێت.

(۳) کەمالەددین ئیسماعیل بە کەمال ئەصفەهانی ناسراوە (؟-۱۲۳٧ز)، پەسنی شاعەلائەدین و میرەکانی ئەصفەهان و خوارەزمی کردووە. کە مەغۆل هاتنە ئەصفەهان ناوبراو بە دەستی ئەوان کوژرا. خاوەنی دیوانێکی شیعرییە.

حورمەتە. ئەمانەن خوا ئیستیسنایان ئەکا (الا الذين امنوا.....) تەبیعی ئەوانە هەجوو ناکەن، مەدحیش بکەن بە ئەندازە ئەیکەن (وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا) بالمقابلە ئەمما تەجاوز ناکەن لە میقداری حەقیان. زەواتێ عیزام شیعریان دانایە، ئەبوبەکر و عومەر، وە ئەشعاری عەلی لە تەبەقەی عولیا دایە. ئیمامی شافیعی لە مەشاهیری شوعەرایە، حەتتا بەعزێ لە حەقی ئەڵێن: كان شاعرا غلب عليه الفقه! ئی ئەصمەعی بیلعەکسە: كان فقيها غلب عليه الشعر!

من ئەوەم لە حەق بابم و شێخ ئەوت: بابم شاعیر بوو مەلایەتی غەلەبەی کرد. شێخ ڕەزا مەلا بوو شاعیری غەلەبەی کرد. شێخ ڕەزا تووڕە ئەبوو بەعزە جار، ئەیوت: بۆ پێم ناڵێن مەلا؟

بۆ ئوممەت پێگەیاندنی، ئەووەڵەن داك بە لای لایە ئەتوانی منداڵ پوختە بکا. دووەم شاعیر، سێیەم مامۆستایە تێگەیشتنی، مع الاسف هیچ و برسی (یۆك)[1].

٥٨/٧

## دینداری لەگەڵ فەقیری مومکین نییە!

ئەساسەن بەنی ئادەم لای خوا موهان و ڕەزیل نییە، ئەفەرموێ: وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ ، لاکین نەزەر بە ئینسان، فەقیر موحقەر و موهانە، خاصەتەن لەو زەمانە. لە ئەییامی منداڵیم بابم بەعزە شیعری کوردی بۆ دادەنام، ئەز جوملە ئەیفەرموو:

**ئەوی ماڵی نەبێ قوربان هەنووکە**
**لەوی ماقووڵترە خواجە حەنووکە**

ئێستا بە جارێ بەدتر بووە، بەڵێ کەسێ عیزەتی نەفسی هەبێ، مومکین بێ ویقاری خۆی ڕاگرێ، نەختێ بە حورمەت ئەبێ.

(١) یۆك وشەیەکی تورکییە واتە نییە.

گەلێ جارم وتیە، لەو عەصرە دینداری لەگەڵ فەقیری مومکین نییە، چونکی مەلایەتی ئەمڕۆ نانی تیا نییە، عالەم ڕووی لێ وەرئەگێڕێ. فەقێیە، زۆر قابیل، عومری خۆی صەرف ئەکا تا ئیجازە وەرئەگرێ، دوایە ئەبێتە گاوان. بەم ڕەزالەتە کێ ئەیەوێ؟ الی الله المشتکی!
٥٠١/١٠

## چۆن موقابەلەی شیعان بکەین؟!

واقیعەن موباحەسەی ئێمە لەگەڵ ئەهلی کیتاب و شیعان زۆر موشکیلە. ئەوان دەربارەی ریسالەت پەنا و یارانی گوزیدی، زوبان ئەوەشێنن، ئێمە چۆن موقابەلەیان بکەین؟ بەعزە ئینسانێ جەسوور بە تەوریە، بە حیلە شەرعێ ئەتوانێ موقابەلە بکا. وەکی قلنجی زادە ئیسماعیلی تورك، لام وایە نەقلم کردیە، موقابیلێ بەعزێ لە مەسیحییان وتی: موحەممەد هەرچی بێ داك و بابی مەعلومە.

بابم کە قسەی لەگەڵ شیعان ئەکرد ئەیفەرموو: عەلی ئێوە.

جەلال نووری ئەیوت: خەرستۆفی دیانان، عیسای قورئان نا.

١٧٣/٧

## ئەمنییەت!

لە تەئریخی ١٣٠٤ی هیجری[1] تەحسین پاشای والی موصل هاتە کۆیە، بۆ پشدەر ئەچوو، ئەشراف و وجەهای خڕکردنەوە لە سەرای حوکمەت. فەرمووی: لە جێ دانیشتین، تەدبیرێ بکەین، تەرەققی تیجارە بە چی ئەبێ؟

بابم فەرمووی: تەرەققی و تیجارە بە ئەمنییەتی طورق ئەبێ. ئەو وەقتی عالەم لە موحاصەرە دابوو، لەبەر ئەشقیای هەمەوەند.

(١) واتە ساڵی ١٨٨٨ زایینی.

دووبارە ئیعادەی ئەمری کردەوە، دووبارە بابم وای جواب داوە. وە کذا دەفعەی سێیەم والی وتی: ئەوە عائیدی حکومەتە.

بابم فەرمووی: بۆیە نابێ. واقیعەن وەکی بابم فەرمووی.

وایە عالەم مەجبوورە، بە عەرز و تەڵەبی ئەشیا لە یەك، پەك لەسەر ئەمنییەت ئەکەوێ.

٤١/٨

## قووەتی قەلب و حەرام خواردن!

قەلب کە مەیلی کرد، ئەعزا هەموو دوای ئەکەوێ. ئەگەر مەیلی بە قووەت و سادق بێ، ئەمڕۆش قورئان کە چاك بخووندرێ نەوعەن ما، تەئسیرێ ئەکا لە دڵان. ئەمما تەواو نییە، سەوقی ناکا بۆ عەمەل و وەقتییە. لە رادیۆ ئەکثەری ناس گوێ ئەگرنە قورئان خووندنی ئەمسالی شێخ محەمەد رەفعەتی میسری، تەئسیری لە دڵیان پەیا ئەبێ گەلێ کەس ئەهەژێنێ. ئەمما زوو بەسەر ئەچێ. سەبەبی یەکانە لە قووەتی قەلب حەرام خواردنە، حەقیقەتەن زۆر نەماوە بە کوللی دڵ بمرن.

حەکایەتێ ئەکەن لە بابم بیستییە، ئەویش لە جەلیزادە حاجی کاك ئەسعەدی بابی ئەویش لە بابی حاجی مەلا عەبدوڵلای ئیبن جەلی: شەخسێ دێتە خدمەت بابی، یەعنی مەلا عەبدولرەحمانی جەلی، عەرزی ئەکا: وەقتێ دڵێ خۆشم هەبوو، ساف، زۆر موتەلەزیز، ئەبوو بە موناجات، ئێستا تێك چووە. مولاحەزە ئەکەم تاریك ئەبێ، دووکەڵ دەورەی داوە، ئەو لەزەت و حاڵ خۆشییەم نەماوە. لەگەڵ ئەوەشدا چ بە خۆم شك نابەم. ئەفەرموێ: سبەی وەرەوە بەڵکو شەو لە خەو شتەکم بۆ مەعلووم ئەبی.

سبەی دێتەوە خزمەتی ئەفەرموێ: وام بۆ زاهیر بووە، ئێوە نان بە تەپاڵە ئەکەن، یەعنی تەپاڵە ئەسووتێنن لە بەدەل دار، ئەو سێڵەی نانی لەسەر ئەکەن کونەکی تیایە، دووکەڵی تەپاڵەی لە نان ئەنیشی، نانەکە ئەخۆی دڵتی تێکداوە، بڕۆ سێڵێ نوێ بکڕە نانی وا دووکەڵاوی مەخۆ، دێیەوە سەر خۆ.

حەقیقەتەن ئەچێتەوە ئەنۆڕێتە سێڵ وەکی فەرموویەتی، وا بووە.

بەعدەهو نانی خاوێن ئەخوا دڵی چاك ئەبێتەوە. ئەمە وا لە بەغدا جەمعێ لە قەحپان پارە بە ریبا وەرئەگرن، معامەلەی پێوە ئەکەن، مسوڵمانان رزقیان لێ ئەکرن، ئیعاشەی پێ ئەکەن، ئایا دڵ ئەمێنێ؟ حاشا.
برام کەڕامەت ئەگەر خێری دینی تیا بێ قبوڵی ئەکەم، ئەمما کەسێ بڵێن: وەلییە، مورشیدە، ناوی لەسەر هەرچی بهێندرێ، حەڵاڵ و زەلاڵ ئەبێ، ئەمە کوو قبوڵ کەم؟ دین، شەرع لەگەڵ ئەو گوفتار و ڕەفتارە کوو ئەمێنێ؟ جەنابی سەییدی ئالووسی بەعزێ ئەحوالاتی سۆفییە زیکر ئەکا، کە قورئان ئەبیەن، ئەهاڕێنن بێ هۆش ئەکەون، ئەمە بە بیدعەت ئەزانن. حەقیقەتەن ئەگەر بە دەست خۆی نەبێ، بە مونافیقی و جعلی نەیی کا قسەی لێ نییە، وەکی سەعدی ئەڵێ:

**تعذر صيحة الواجدين فصاحوا**
**ومن صاح وجدا ما عليه جناح**[1]

من لە وەقتێ عیززەت و تەعالی ئیستیلای ئیسلام مەسلەکی تەسەووفم لا باشە بۆ شەخس، ئەمما مونافیقی زۆر هەڵئەگرێ. وە هەم ئەمڕۆ بۆ عالەمی ئیسلامییەت ئی ڕاستی مەسلەکێ موافیق نییە. ئەمڕۆ ئوممەت ئەبێ موقابیلی ئەورووپی و ئەمریکی ڕاوەستی، زوعەمای وەکی هیتلەر[2] و مۆسۆلینیمان[3] پێ ئەوێ، کارخانە جاتمان لازمە، عولەمای موختەریعمان گەرەکە. مع الاسف هیچ، بڵێ: یۆك.
بەڵێ وەکی عەرزم کردینە ریعایەتی موقتەزەلحال لازمترە لە ئەقوال. قووەت، ئیتتیحاد، سەعی، عەتاڵەت نەمینی ئەمە خۆیەتی.

٢٢٨/٨

---

(١) ئەم بەیتە بە هەڵە لە تەفسیرەکە نووسرابوو، ئێمە لێرەدا ڕاستمان کردۆتەوە.
(٢) هیتلەر Hitler (١٨٨٩-١٩٤٥ز) ڕابەری حیزبی نیشتمانی سۆسیالیستی (نازی)، ڕاوێژاری ئەڵمانیا بوو لەساڵی ١٩٣٣، هەروەها لە ساڵی ١٩٣٤ بووە سەرۆکی وڵات. شەڕی دووەمی جیهانی هەڵگیرساند و لە شوورەی بەرلین خۆی کوشت.
(٣) ناوی بینیتو ئەندریا مۆسۆلینی یە، لە ساڵی ١٨٨٣ لەدایك بووە، فەرمانڕەوای ئیتاڵیا بووە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٢ و ١٩٤٣. لە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی فاشیستی ئیتاڵیابووە، بەشداری شەڕی دووەمی جیهانی کردووە و لە شکستەکەدا هەوڵی ڕاکردنی داوە و لە ساڵی ١٩٤٥ دەستگیر کراوە و لەگەڵ حەفدە لە هاوکارانی لە دار دراوە.

## هیچ نووسینێك بە سووك سەیرمەكە!

بابم ئەیفەرموو: ڕۆڵە قەت نووسراوت لا سووك نەبی هەرچی بی موتالەعەی کە ئیستیفادەی لێ ئەکەی. لەم وەسیەتە بە قیمەتەی بابم زۆرم ئیستیفادە کرد.

٢٤٥/٨

## حاجی عبدالصمد هاڕاندی!

بابم ڕەحمەتی خوای لێ بی، کەمێ ناساغ بوو، شەوێ حاجییە فەندی زاتێ موبارەك بوو، قورئانێ خۆشی ئەخوێند، هاتە خزمەت جەنابی مەلا بۆ ئەحواڵ پرسینی، خزمەکمان هەبوو ڕەحمەتیان لێ بێ، حاجی عبدالصمد خەلیفەی شێخ عومەری بوو، جەنابی مەلا ئەمری کردە حاجییە فەندی، عەشەرەیە قورئان بخوێنێ. ئاخیری ئەم سوورەتی (الزمر)ی خوێند، کە گەیشتە ئەو ئایەتە (وَأَشْرَقَتِ الْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا)، حاجی عبدالصمد هاڕاندی، کەوتە زەوی لەو وەقتە من خەیاڵم کرد، ئەو زاتە وای هاتیتە خەیاڵی کە خوا جسمێ زۆر گەورە و مونەووەر و بە هەیبەتە، خەوف و دەهشەت گرتی بۆیە هاڕاندی و لەخۆچوو. پاش قیرائەت لە جەنابی مەلام پرسی:

قوربان! مەعنای ئەو ئایەتە چییە؟ مەقسەدم وابوو ئەو زاتە تێبگا.

مەلا ئیزاحی مەعنای فەرموو. حاجی هەستا دەستی مەلای ماچ کرد، ئینابەی فەرموو.

وتم: توخوا وات خەیاڵ نەکرد، کە خوا جسمی هاکەزاییە، وە بۆیە هاڕاندت؟!

وتی: بەڵێ، وەڵڵا! الحمدلله کە جەنابی مەلای ئەو وەهمەی دەفع کردم.

٢٥٣/٨

## عیسا سەففاری قەردار!

مەلای بابم فەرمووی چوومە حەلقەی دەرسی سەید ئەحمەدی دەحلان، دەرسی تەفسیری ئەفەرموو. تەسادوفی دەرسی ئەم ئایەتەم کرد (وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ). لەمەیانە فەرمووی شەخسێ هەبوو لە شام، عیسا سەففار نام، زۆر قەردار بوو، ساحێبی قەردی بەسەر ڕۆژی جومعە تەفرەدابوو. ئێوارەی پێنج شەمموو تەدبیر ئەکا، ئەڵێ: شەوێ ئەچمە سەر منارە خۆم ئەشارمەوە، بزانم خوا چ ئەکا؟

هەتا سبەی لەسەر منارە ئەمێنێتەوە. بۆ نوێژی سبەینێ موئەزین سەرئەکەوێ، شەخسێ ئەبینێ، ئەڵێ توو کێی؟

ئەڵێ من عیسام!

موئەزین هاوار ئەکا: ایها الناس نزل عیسی!

مەئموومی ڕاست ئەبنەوە، دەست ئەکەن بە های و هووی. خەبەر بڵاوئەبێتەوە، شێخ و مورید بە دەفە و ڕمبەك، مرۆ بە نەعرەتە، ژن بە لۆلەلۆلە، سۆفی بە زریك و هۆڕ، منداڵ بە چۆیکە، لە سەحنی مزگەوت خڕئەبنەوە. والی، قوماندانی عەسکەری، سائیری ئومەڕای گەورە دێنن، قیامەت بەرپا ئەبێ. دوو لە مەلای گەورە، بە کەمالی تەوقیر و تەمکین و خوضوع و ئەدەب بەسەر ئەکەون، تا حەزرەتی عیسا بهێننە خوار، عەرزی ئەکەن: توو کێی؟

ئەڵێ: عیسا!

أی عیسی؟

عیسی الصفار.

وەلەك، مەلعوون، ئەمە چیت کرد؟ دنیات خستە زەلزەلە.

لەزگ ئەبن بە لێدان و تێهەڵدان بیهێننە خوارێ. ئەلێ: بۆ لێم ئەدەن؟

ئەڵێن: ماڵ وێران، نابینی ئەم معامەلە چی بەسەر هات؟

وتی: قەباحەتی من نییە. موئەزین ناوی عیسای بیست، هاواری کرد، نەیپرسی کام عیسا؟

خولاسە هاتە خوار، بردیانە خدمەت والی، سوئالی لێکرد: ئەمە بۆ واتکرد؟

وتی لە ترسی قەرداران، خۆم لەسەر منارە شاردبۆوە، ئەمن چووزانم وا ئەقەومێ.

والی تەبەسسووم ئەکا، ئەفەرموێ میقدارێ پارەی بدەنێ، قەردی پێ بداتەوە، کەمێ گوزەرانی پێ بکا.

## باپیرم لە حەج وەفات ئەکا!

بابم لە خدمەت بابی، بە تاریخی ١٢٨٨ی هیجری[١] ئەچێتە حەج، بەعدەهو ئەدای فەرزییە، باپیرم وەفات ئەکا، بابم ساڵێ لەوێ ئەمێنێتەوە، دوایە عەودەی فەرمووبۆوە.

٨٤/٩

## بۆ بە گژ مۆسۆلینی و هیتلەر ناچی بۆ بەگژ ئەبو هورەیرەدا[٢] ئەچی؟

یەك دوو ساڵ لەمەوپێش، مەلایە شیعە تەئلیفێ نامونەلیفی کرد. ئەکسەری بەگژ ئەبوهورەیرە و فوقەڕایانی ئەسحاب دا دەچوو. ئەی خانە وێران، موحیببی حەیدەری کەڕڕار[٣]، بۆ بەگژ مۆسۆلینی، هیتلەر،

---

(١) دەکاتە ساڵی ١٨٧١ ی زایینی.

(٢) ئەبو هورەیرە: ئەبو هوڕەیڕەی دەوسی، دەوس تیرەیەکی ئەزدییەکانە، ناوی عەبد شەمسە و خۆی دەڵێ باوکم نازناوی ئەبو هوڕەیڕەی پێ بەخشیم، چونکە من شوان بووم و بەچکە پشیلەی کێویم دۆزینەوەو هێنانمەوە، کە باوکم ئەمەی بینی پێی گوتم ئیتر تۆ بووی بە باوکی پشیلان، ناویشم لە سەردەمی نەفامیدا عەبد شەمس بوو. باوکم ناوی عەمر کوڕی عەبد غەنەمە. لە ساڵی ٥٩ی کۆچی لە تەمەنی حەفتا و هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات، ساڵێك پێشتر ئەبو هورەیرە نوێژی مردووی لەسەر حەزرەتی عائیشە کردووە.

(٣) حەیدەری کەڕاڕ، نازناوی ئیمام عەلی کوڕی ئەبی تالبە.

ستالین[١]، شیمیرلین، سائیری ئەئیممەی ئەعدای دین داناچی؟ چت بەسەر ئەو فوقەڕایە مردیانەی بێ دەسەڵات دایە؟ خودا لەبەری دەمت دا، لەگەڵ خۆت و تەئلیفت، مومکینە مل نشی و تەصفیقیان بۆ کردبی.

بابم فەرمووی: چابوو الحمدلله خۆم ئاگاداری تەرجەمەی حالی حەزرەتی عەلی و شێخ عەبدولقادری گەیلانیم، وە ئیللا لەبەر ئەتباعیان ئینسان ڕقی لێ ئەبوونەوە.

تەعن لە ئەبوهورەیرە ئەدەن، وە دەڵێن: (حب الهرة من الایمان). والله المستعان.

١٩٢/٩

## ئەری ئەبو هورەیرە کوردە!؟

نەقل لە ئەبو هورەیرە، قەومی نەجیبی کوردە، حەقیقەتەن قەومی (اولي بأس) بەغیرەت و ناموس و شوجاعەت و وەفا و جەنگاوەر و بێ حیلە و دەسیسە. مەردی مەیدانی مەحشەرە. زۆر مەمنون و تەشەککوری جەنابی حەق ئەکەین، کە جزیەی لە کوردان قبوڵ نەکردیە، وەکی عەرەب، ئەبێ مسوڵمان بن، عولەما و پیاوی گەورەیان، بێ حەدد و حەسابە، ئەگەر لە ڕیجالی مولك و حوکمداری، غەیری ابن الصلاح وە لە ڕیجالی عیلم غەیری ئیبن صەلاحیان[٢] نەبا، کافی بوو بۆ ئیفتیخاری کوردان.

---

(١) جۆزف ستالین Staline (١٨٧٩-١٩٥٣ز) لە گەورە پیاوانی دەوڵەتی ڕووس بووە، سکرتێری یەکەمی حیزبی شیوعی بووە و دەستووری ڕێکخستووە و پاشان بۆتە سەرۆکی کۆمسیۆنی گەل و ئەنجا لە ساڵی ١٩٤٣ بۆتە فەرماندەی گشتی لەشکری سۆڤییەت. لە شاری مۆسکۆ کۆچی دوایی کردووە.

(٢) ئیبن صەلاح (٥٧٧-٦٤٣ك) ناوی عوسمان کوڕی موفتی صەلاحەدین عەبدولرەحمان کوڕی مۆسای کوردی شارەزوورییە، بە ئیبن صەلاح ناسراوە، یەکێك لە زانایانی بواری فەرمودەیە. لە لای باوکی خوێندویەتی و پاشان بۆ خوێندن چۆتە موصل و دواتر چۆتە قودس، پاشان لە شام دەگیرسێتەوە. چەند بەرهەمێکی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە.

لە دیانەت هیچ قەومێ ناگاتە کوردان، تا ئەمڕۆ یەکێ بەناوی ڕیسالەت و ڕیئاسەتی دین، خیلافی نەهاویشتیتە بەینی بەشەر، علی الاکثر: شافعي المذهب، أشعري العقيدة، ڕەسوولیان عەرەبی، ئیمامی فروع و ئوصولیان عەرەبی، شێخ و ئیمامی طەریقیان تا ئەم ئەواخیرە، تەنها قطب الاقطاب، السيد محي الدين عبدالقادر الگيلاني، الغوث الاعظم، الحسني، العلوي الهاشمي، العربي، ئەبوبەکری هەواری بووە، هەوار عەشیرەتێ بوون لە کوردان، لە تەڕەف بەصرە بوون، ئەم زاتە عظيم الشأنە لە وانە. کەڕامەت و خەواریقی سەید ئەحمەدی ڕەفاعی[1] کە خوارزایەتی لە مەڕ وی یە. تەسخیری مار و ئەژدیها و شێری، لە تەڕەف وی بووە، حەتتا وەکی لە بوحبوحتە ئەڵێ: حوکمی لەسەر ماسی موقەددەس، کە عالەم و مەلەك و بەردی سەر پشتی گا و گاوی ژێر زەمین لەسەر وینە. جاریی بووە لەبەر ئەمری وی نەبا، خۆی ئەجولاندەوە، هەموو ولاتی ژێرە و ژێر ئەکرد!

الله اكبر لام وەیە ئەو قسەیە، لای مەعالی ئەمین زەکی بەگی[2] زۆر

---

(١) ئەحمەدی رەفاعی (٥١٢-٥٧٨ك) شەرعزانێکی شافیعی و ئەشعەری و صۆفی بووە، بە أبو العلمين و شيخ الطرائق و الشيخ الكبير و استاذ الجماعة ناسراوە کە بۆ تەریقەی روفاعی لەناو سۆفیەکان دەگەڕێتەوە و یەکێك لە قوتب و مەزنەکانی سۆفییەکانە. دوازدە بەرهەمی لەپاش خۆی بەجێهێشتوون.

(٢) محەمەدەمین زەکی (١٨٨٠-١٩٤٨ز) لە سلێمانی لەدایك بووە و لە مەدرەسەی روشدییەی عەسکەری خوێندویەتی و لە ساڵی ١٨٩٦ لە ئامادەیی سەربازیی بەغدا خوێندویەتی و دوای سێ ساڵ چۆتە ئەستەنبوڵ و قوتابخانەی حەربییەی لێ تەواو کردووە و لە لیژنەی دەستنیشانکردنی سنوور کاری کردووە. پاشان کراوەتە جێگری سەرۆك ئەرکانی شەڕ لە لەشکری حەوتەم بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال. لە ساڵی ١٩٢٣ گەڕاوەتەوە عێراق و بە پلەی عەقید لە سوپای عێراق دامەزراوە و لە ساڵی ١٩٢٥ کراوەتە وەزیری ئەشغال و گەیاندن و دواتر بە تێکڕا لە دە وەزارەت کاری کردووە، وێڕای ئەوەی بۆ یەکەم جار نوێنەری شاری سلێمانیش بووە. چەند بەرهەمێکی لەپاش بەجێماوە لەوانە: پوختەی تاریخی کورد و کوردستان لە ساڵی ١٩٣١ چاپ کراوە. هەروەها مێژووی دەوڵەت و میرنشینە کوردییەکان و کتێبی ناودارانی کورد و کتێبی مێژووی شاری سلێمانی و دەوروبەری. ناوبراو جگە لەوەی مێژوونووس بوو، ئەدیب و شاعیریش بووە و دەورێکی باشی هەبووە لە نووسین بۆ گۆڤاری گەلاوێژ.

خۆشە. وە ئەو شێخ ئەبوبەکری هەواری، خەبەری بە وجودی حەزرەتی گەیلانی داوە، تا ئەو ئەواخیرە یەك مەزهەب و یەك طەریق بوون، لەو ئەواخیرەدا بەعزە کوتوبی حەنەفی هاتنە مەیدان، مەلای وانە بوو، لە عولەمای حەنەفی ڕاستەم لێی وەرگیرێ، کۆلکە مەلا دوای کەوتن، گەلێ شتی نالایەق لەناو کوردان پەیابوو، وە کذا مەولانا خالید[1] کە مایەی ئیفیتخاری کوردانە، طەریقی نەقشی هێنا ناو کوردان، زەمانی وی زۆرباش بوو، حەتتا مەلای وەکی باپیر مەلا عەبدوڵلا ئیبن الجلی م وە مەلای وەکی مەلا یەحیای مزووری[2] طەریقیان لێ وەرگرت. لە بەرەکەتی غایەت موستەفید بووم. ئەمما زۆر نەچوو، تێکیان دا، کەوتە دەستی نائەهلان و جوهەلایان، خصوص شەدەڵەیی بە جارێ لە شیرازەی دین و شەرەف و ناموس و غیرەتی بەشەری دەرچوون. ناوی کوردیان لەکەدار کرد. بۆ تەدبیری مولك زۆر نەچوو، پاش صەلاحی ئەیوبی، قەومی من کەوتنە دەوری مەنکووبی، هەروا بەرەژێر هاتن، تا ئەمڕۆ ناشکوری نەبی، بەناوی حوکمداری کەسیان نییە. ئەووەلەن لە بەینی حکومەتی عوسمانی و صەفەوی پارچە پارچە بوون، لەم ئینقیلابە، بە جارێ هەلا هەلا کران، ئەمڕۆ ئەوەندە موتەفەرریقن، پێکەوەنووسانیان مەحاڵە.

---

(١) مەولانا خالیدی نەقشبەندی ناوی خالید کوڕی ئەحمەد کوڕی حوسێن (١١٩٠-) لە عەشیرەتی جافی میکائیلییە و لە قەرەداغ لەدایك بووە و دواتر چەند شوێنێکی کوردستان گەڕاوە بۆ خوێندن. دوای هاتنی نەخۆشی تاعوون بۆ شاری سلێمانی لە ساڵی ١٢١٣ك، چەند ساڵێکی تر دەمێنێتەوە و لە ساڵی ١٢٢٠ دەچێتە حەج و لەگەڵ زاناکانی ئەوێ کۆدەبێتەوە و پاشان دەچێتە هیند و تەریقەتی نەقشبەندی وەردەگرێت و دواتر دەگەڕێتەوە شاری سلێمانی و دوای ئەوەی ململانێی تەریقەتی قادری و نەقشی لە سلێمانی زیاد دەبێ، ناوبراو دەچێتە بەغدا و دواتر دەگەڕێتەوە شام و لەوێ کۆچی دوایی دەکات. لە ساڵی ١٨٢٧ کۆچی دوایی کردووە.

(٢) ناوی یەحیا کوڕی خالید کوڕی حوسێنی مزوورییە، ساڵی ١٧٧٢ لە گوندی بالەتەی نزیك بریفکان لەدایك بووە، لە گەلێك شوێندا خوێندویەتی، ئیجازەی لای مەلا جەرجیس ئەفەندی هەولێری وەرگرتووە. لە موصل وەك مودەڕیس دامەزراوە. شێخ نورەدین بریفکانی یەکێك لە قوتابییەکانی بووە. زیاتر لە دە کتێبی بە نووسین و حاشیە نووسیوە. لە ساڵی ١٨٩٤ لە ئەترووش کۆچی دوایی کردووە.

مع الاسف بێ داکن، بێ شاعیر و مەلای چاکن، داکێ نییە، بە لای لایێ مێشکی منداڵی لەناو لانکی پوختە بکا، وە شاعیری میللی غەیری حاجی قادریان نەبوو، مەلای قەید و تەضبیبی کتێبیان زۆر بوو، مەلای تەهذیب و تەدبیریان کەم بوو. یەعنی مەلایە بتوانی لە مەقامی قسە بچەسپێنێ، لەگەڵ ڕیجالی سیاسەت بدوێ قسەیان پێ بسەلمێنی. دوو مەلام پێ شك دێ، یەکی موفتی زەهاوی، یەکی بابم حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلیزاد. مەرحووم زەهاوی حورمەتی بابمی زۆر ئەگرت، لای بە قەدر و حورمەت بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زەهاوی بە عومر لەوی زۆر گەورەتر بوو. حەتتا بابم بەتەما بوو لای بخوێنێ، دەفعەیە لە کۆیە سوئالێ شەرعییان نووسییە خدمەتی، جەوابی:

لە جێیە کاك عەبدوڵلای تیابێ، شەرم ئەکەم فتوای شەرعی بۆ وێ بنێرم.

یەکێ عەیبی عەزیمی کوردان، بێ تاریخییە، تازە ئەوا ڕێکی ئەخەن، أمین هذه الامة زەکی بەگ زۆر خەریکە. وکذا سەید حوزنی[1] خوا کەیفخۆشیان کا، لەبەر بێ تاریخی هەر قەومە، بەلای خۆیدا دەکێشێ، ئەمما بۆ ئیستیخدام عەرەب ئەڵێن: لەمەن، ئێرانی ئەڵێن: لەمەن، لەو ئەواخیرە ئەڵمانی ئەڵێن: ئێمە و کورد خزمین. ئەسڵی ئەوان کرمان بوون، لە شەرقی ئێمە هیجرەتیان کردیە بۆ غەرب، تەحریف کراون، بوونە جەرمان، ئاخیری بوونە ئەڵمان. ئەمما ئێمە بە کرمانجی ماینەوە لە ئیبتیدای تەشکیلی حکومەتی عێراق- لە مەجلیسی تەئسیسی- لە جەلسەیە غەیرە ڕەسمی، بە یارانم وت: عەجایبە ئەقوامی دی، شەڕ لەسەر مولکیانە، ئێمە کە کوردین، شەڕ لەسەر ماڵ و مولك و نەسەبمانە!

عەرەب و فارس هەر نەئیسە، ئەڵمان توو لە کێ، کورد لە کێ؟ ئێمە

---

(١) حوسێن حوزنی کوڕی سەید عەبدولـلەتیف کوڕی شێخ ئیسماعیل کوڕی لەتیف خەزایی یە (١٨٩٣-١٩٤٧ز)، لە مهاباد لەدایك بووە و بە نازناوەکانی (حوزنی، خدۆك، بێژەن، داماو) نووسیوەیەتی. بەرهەمی زۆری نووسیوە، لەوانە: خونچەی بەهارستان، پێشەوای ئایین، مێژووی میرانی کورد، خۆشی و ترشی، بزنۆکە و مەڕۆکە.......هتد

کە لای خۆمـان، خـانەدانی عیلمـین، ئەزانـین وە مەلامـان زۆرە- مـاڵی جەلـی- هەر یەك لە عەصـری خـۆی مومتـاز بـووین، تـاریخی ئابـا و ئەجـدادمان لا نیـیە، کـاك ئاوڕەحمـانی جەلـی، کە مەجـدی کـوردانە، تاریخی ولادەتی مەعلووم نییە، هەمووی بێ ڕەغبەتی یە، دائیم خەریکی خەڵك بوین.

حاجی مەلا ئەبووبەکر ئاغای حەوێزییان[1]، بـانی مزگەوتـی گەورەی کۆیە، موحیببی عیلم و موڕەوویجی دیـن و ئەدەب، لەسـەر ئەو هەمـوو خدمەتە، وەختە ناوی —خـودا نەکـا- بـزر بـی، مع الاسـف، هەرچەنـدە ئەولادی زۆر بوون، ئەمما بۆڕ بوون. بە وەجاغ کۆر حەسابە.

لە حیکایەتێ ئەڵێن: پیاوێ بوو چل کوڕی بـوو، ئەممـا وەجـاغ کـۆر بـوو، حەقـیقەتەن حـاجی بەکراغـا شـتێ وابـوو، وا کتێبخـانەکی غـایەت قیمەتداری دانا، لەبەر بێ خەلەفەکانی تێکیان دا، فەوتـا، نەمـا، ئەو خێـرە عەزیمەیان نەهێشت، بحولە تعالی تا عیلمی خانەدانی جەلی مـابێ، نـاوی خێری حاجی بەکراغا لەنـاو نـاچێ، زاتـێ دامـاوی وەکـی حـاجی کـاك ئەسعەدی جەلی زادە، خوارزایە وەکی حـاجی مەلا عەبـدوڵلا ئەفەنـدی، کچەزایە وەکی منـی هەبـێ، هەر ئەمێنـێ، نـاوی نێکـۆی لەسـەر زوبـان نابڕێ.

نازانم چ بڵێم، حاڵی کوردان پەرێشانە. بێ حیسسن، دەرکـی ئەلەمـی زیللەت ناکەن، حورمەتی عولەمایان لا نییە، عولەمایان زۆر کەمن، ئەوی هەیە فەقیـرن، مەلای فەقیـر چـی پـێ ئەکـرێ؟ ئەخـلاق زۆر بە فەسـاد چـووە، جەهـل عـاممە، ڕوئەسـای دیـن و دنیایـان هەمـوو جـاهیلن، لە مەصالیحی دین و دونیای قەومی غافڵن، وەکی مەسەلەی کوردی ئەڵـێ:

---

(١) ناوی بەکر ئاغای کوڕی محەممەد ئاغا کوڕی حەوێز ئاغای کوڕی محەمـەدەمین ئاغای حەوێزییە.ساڵی ١٧٨٥ لە شاری کۆیە لـەدایك بـووە. چ لـە لایـەنی زانسـت و زانیاریی و چ لە لایەنی دەستەڵاتەوە پایەیەکی مەزنی هەبووە. ساڵی ١٨٤٢ مزگـەوتی گەورەی کۆیەی دروست کرد. ناوبراو دیوانێکی شیعری کە بە فارسـی نووسـیویەتی لەدوا بەجێ ماوە و نازنـاوی لـە شـیعردا (قاصـد) بـووە. سـاڵی ١٨٥٢ کـۆچی دوایـی کردووە.

کفن بە من ببڕێ، مردی گۆڕبەگۆڕ چی. خۆیان باش بەڕێوە بچن، سەلبی ماڵ و عەقڵیان لێ بکەن، هەرچی بادا، بادا!

کوردی پوخت، صرف کورد کێیە؟ خوونی بۆ کوردان بێتە جۆش، ئەڵێن: ئەکسەری سەییدن، عەلەوین، ئومەوین، عەبباسین، خالیدین، بۆ کوردایەتی کێ ئەمێنێتەوە؟ دۆم و قەرەج و کوردی گەلالی و کافرۆشی. ئەمما چینی کورد، هەرچی بوون، موحافەزەی خوونی خۆیان نەکرد، لەگەڵ هەموو کەس تێکەڵاو بوون، خوونیان مەخلوط بوو، جۆش و خرۆشی کوردایەتی نەما، زیندی کردنەوەی ئەو قەومە زۆری ئەوێ.

چەند ئەشعارێ لە جگەرسۆزی لەسەر قەلەم موداهات بووە باعیسی حاڵ گۆڕانم، وە کەس ئیمدادی نەدام، بەڵکوو پێم خۆش بوون. ئەمەیان زۆر خراپە.

٢١٠/٩

## بابم و کاک ئەحمەدی شێخ!

ئەڵێن زاتێ هەبوو لە ئەولیا، مەشهوور بوو بە خیر نساج[1]، دەفعەیە تۆپە جانگەکی بە ڕادایی بۆ شەخسێ دروست کرد، کە لێبۆوە، لای وابوو زۆر بێ عەیبە، خاوەنی عەیبی لێ دۆزییەوە. شێخ گریا. کابرا وتی: بۆ ئەگریەی؟ بە عەیبیشەوە پێی ڕازیم.

وتی: بۆیە ناگریەم، بەڵام عیبادەتی خوا ئەکەم، لای خۆم بە بێ عەیب و قصور، تۆ کە عەیبم لە صونعی دەرخەی، ئەبێ خوا چ بە ئەعمالم بکا؟!

---

(١) ناوی ئەبولحەسەن محەمەد کوڕی ئیسماعیل ئەلسامرییە (٨١٧-٩٣٤ز) یەکێك لە زانایانی ئەهلی سوننەتە و سۆفییەکی ناوداری سەدەی چوارەمی کۆچییە. کەشف و کەرامەتی لێ دەگێڕنەوە و لە بنەڕەتدا خەڵکی سامەڕایە و لە بەغدا دانیشتووە. ئیبراهیمی خەواص و ئەبوبەکری شبلی لە حزووری ئەودا تۆبەیان کردووە.

بابم فەرمووی: لە بەغدایە، بە خدمەت کاك ئەحمەدی شێخ گەیشتم، گاهـ گاهـ بەعـزێ مەکتووبـاتی خـۆی ئێنـا، وە ئەیفەرمـوو: بیخـوێنیەوە، بـزانین غەلەتیـان هەیە؟ غەلەتیـان ئەبـوو، تەصـحیح ئەکـران، ڕۆژێ فەرمووی: ئەو نوسخە مەکتووبە زۆر موصەححەحە، ئەگەر ئازای غەلەتی لێ بگرە، لە لاپەڕی، دوو سێ غەلەتی تیا بـوو. حەرفـێ زائیـد، حەرفـێ ناقص، فەرمووی: حەلی ناکەم، تۆ چاوت زۆر تیژە.

وتم قوربان سەبەبی ئەمە نییە، بەڵکو ئینسان عەیبی خۆی نابینی.

دەستی کرد بە گریان، فەرمووی: بەخوا ڕاست ئەکەی، بەخوا ڕاست ئەکەی، وایە.

٢٤٧/٩

## تۆ مەلا، من فەرخە مەلا،
## شێخ بە نەزەر هەردوومان جاهیل!

مەلا عـومەری خەیلانـی[١] لەبەر دەسـتی شـێخ عوبەیـدوڵلا[٢]ی

(١) نـاوی مەلا عـومەر ئەفەنـدی کـوڕی ئەحـمەد، لە عەشـیرەتی خەیلانیـە، مەلای مزگەوتی گەورەی ڕواندز بووە، ناوبراو ساڵی ١٨٠٥ز لەدایك بووە، بەر لە مردنـی بە چوارده سـاڵ چـاوی کـوێر بـوونە، لەم مـاوەیە بە لەبەر دەرسـی داوەتەوە، لە سـاڵی ١٨٨٥ لە ڕوانـدز کـۆچی دوایـی کـردووە و لە گۆڕسـتانی گەردەگەردی ڕوانـدز ئەسپەردەی خاك کراوە.

(٢) ناوی عوبەیدوڵلا کوڕی سەید تەهای گەورە کوڕی ئەحـمەدە لە نەتەوەی شـێخ عبدالعزیزی کوڕی شێخ عبدالقادری گەیلانیـە، نـاوبراو لە ساڵی ١٨٢٠ز لە گونـدی نەهری سەر بە شـەمزینان لەدایـك بـووە، زانـایەکی خوانـاس بـووە، یەکێـك بـووە لە پیرەکانی نەقشبەندی، چەند دانراوێکی هەیە لەوانە دیوانی کـوردی، دیـوانی فارسـی، هـۆنراوەی عەقائیـد، هـۆنراوەی (کفایـة الاسـلام). شـێخ عوبەیـدوڵلا لە شـەڕی نێـوان رووسـیا و عوسـمانی، زۆر یـارمەتی لەشـکری عوسـمانییەکانی دا، لەبەرئەوەی داوای مافی کوردانی کرد، عوسمانییەکان لێی هەڵگەڕانەوە و جارێـك دەسـتگیریان کـرد و ئەویش ئازایانە خۆی لە زیندان دەرباز کـرد و لە سـاڵی ١٨٨١ دووبـارە دەسـتگیریان کردەوە و خۆی و ماڵ و منداڵی بۆ حیجاز نەفیکـران، لەوێ مـایەوە تـا سـاڵی ١٨٨٨ کۆچی دوایی کرد.

ڕادەوەستا، مەلای بابم پێی ئەوت: ما هذه التماثیل التی انتم لها عاکفون؟!

نازانم حیکایەتی مەلای بابم لەگەڵ مەلا ئەحمەدی نۆتشی[1] نووسیە یان نا؟ خولاصە: شێخ بەهائەددین ئەچێتە حەج، مەلای نۆتشی لە خدمەتدا ئەبی، بابم ئەو وەختە لە بەغدا بووبوو، هەموویان لە خانەقای مەولانا خالید لای ئەحمەد ئەفەندی مدرس زادە موسافیر بوو. ڕۆژێ مەلای بابم و مەلا ئەحمەدی نۆتشی دائیر بە معامەلە و موجامەلە لە خدمەت شێخ بەعزە قسان ئەکەن. مەلا بە بابم ئەڵێ: باوە مەلا بەخوا نەفست زۆر ئەستوورە!

بابم عەرزی ئەکا: باوە مەلا بەخوا نەفسم لە نەفسی تۆ باریکترە. ئەمما بە ئینساف بدوێین: ئەمڕۆ ئەو عیلم و شەرعە کە پێی ئەڵێن عیلمی زاهیری، لە نەزەر عەوام زۆر ڕەزیل بووە. تۆ مەلا، من فەرخە مەلا، شێخ بە نەزەر هەردوومان جاهیل. ئەگەر ئێمە لەبەردەستی ڕاوەستین، عیلم چەند ڕەزیلە، هەندی دی ڕەزیل ئەبێ. ئەڵێن: با بڕوا ئەو عیلمە حیزە، ئەگەر چ کەلکی هەبا، ئەو مەلایە ئەو فەرخە مەلایە، لەبەر دەستی ئەو شێخە جاهیلەی ڕانەدەوەستان. ئەوەی ئێوە ئەڵێن: تەزکیەی نەفسە، من نایکەم، نەفسی خۆم ئەکەمە فیدای شەرعی رسول الله ی (صلی الله علیه وسلم).

حەققەن مەلایان عیلمیان ئابڕوو برد، عولەما بوونە خەسارەتمەندی دونیا و قیامەت. انا لله.....

٢٥٠/٩

(١) ئەحمەد کوڕی مەلا عەبدولڕەحمان کوڕی مەلا ئەحمەدە، خەڵکی گوندی نۆدشەی هەورامانە، لە ساڵی ١٨١٣ لەدایك بووە و لای باوکی خوێندویەتی و پاشان لە ڕوانـدز لای مەلا محەمەدی خەتێ خوێندویەتی و تا ئیجازەشی لای ئەو وەرگرتووە. پاش مردنی باوکی، لە مزگەوتی مەلکەندی لە سلێمانی نیشتەجێ دەبێ و دەست بە دەرسدانەوە دەکات، لە ساڵی ١٨٧٣ لەگەڵ شێخ محەمەد بەهائەدین دەچێتە بەغدا و میوانی موفتی زەهاوی دەبێت. ناوبراو شیعری کوردی و فارسیشی هەیە و لە شیعردا نازناوی (فانی) بووە. لە ساڵی ١٨٨٤ کۆچی دوایی کردووە.

## قەشمەری بە خەڵکی ئەکەن و ئەڵێن: مسکین، ڕەعیە، کرمانج!

گەلێ کەس بە سەروەت و بە سامان، یا بە خانەدانی خۆی مەغروور بووە، قەشمەری بە عالەم کردیە، ئەوەندە نەچووە خۆی بوویتە قەشمەرجار. ئەمە سەیرە، گەجەر و گوجەری کۆنەخانەدانەکانی ڕووت و ڕەجال، کەنناف و کەنناس، سوخرییە بە ڕەعیە ئەکەن. بە خەڵکی ئەڵێن: مسکین، ڕەعیە، کرمانج!

(لە الحمد) من کەیفم بە قەشمەری نایە، خصوص ئەوانە مولازیم بن، وەلەو ئی وا بین، قەشمەری لێ بێ، حەتتا بابم وەسیەتەکی لێ کردم، زۆرم ئیستیفادە لێ کرد: ڕۆڵە تەحقیری نووسراوە مەکە، ئەوەی کەوتە بەر نەزەرت موتالەعەی بکە، حیکایەت بێ، هەزەلیات بێ، هەرچی بێ.

واقیعەن ئەم وەسیەتەم بەجێ هێنا، وە خێرم لێ دیت. واقیعەن بە ئەندازە ئینسان هیچ شتی لا سووك نەبێ باشە.

ژن زۆر قەشمەری بە یەك ئەکەن، خصوص ژنە گەورە، دائیمەن خەریکن یەکتر بشکێنن، حەتتا ئێستا -بە زۆری- قەشمەری بە مێردیان ئەکەن، ئەوانیش -وەکی پیاوان- خوا نەهیان ئەکا، لە تەحقیری یەك.

من هەرچەندە تەرەفداری خانەدانیم، لاکین لە ناخانەدانان، پیاوی وا، ژنی وا هەڵئەکەوی، هەزار خانەدان ئێنێ.

٢٥٩/٩

## تا ژن بەحورمەت بن نەسلی موحتەرەم ئەدەن!

قەومی کورد، بە ئەکثەری زۆر بە چاوی حەقارەت تەماشای ژن ئەکەن، ئەمە خراپە، تا ژن بەحورمەت بن نەسلی موحتەرەم ئەدەن، لەگەڵ ئەوەشدا لە ئەمسالیانا شێر لە بێشەی بێتەدەر، چ نێر، چ مێ.

کورد بەعزە ژنێ زۆر گەورەیان لێ هەڵکەوت، خانزادی حەریری[1]، بووك عەنبەری شەقڵاوەیی، ئالئانیش دەوامـی مەدرەسـە و عـیلم لەوێ لە سایەی وییە. خانمی وەسمان پاشـای ژنـێ نایـاب بـووە. مامۆسـتا مەلاژنە عەنبەر وەلییە زۆر گەورە بووە. بابم غایەت لای بە حورمەت و عەقیدەیە تەواوی پـێ بـووە، ئەرواحـی ئەهـاتنە لا، لام وایە شـەوی دووشـەممو، حەرەمی بابم والیدەی نورەددینی برام، حەققەن لەهـو، عـیلم و ئەدەب و ئەنشـەئو تەقـوا لە نایابـان حەسـاب بـوو. خەجێـی مامەنـداغای خوشـکی هەمزاغای مەنگوڕ، ئەتـوت کە کەیسـیابانووە سـواری مـاینی مـوعەننەك، ڕمبی هەژدە قەفی لەسەر شانی، تیپی سواری بەدواوە، دەهشەتی ئەدا. من بە منداڵیم دیت، زۆر بە هەیبەت و ئیحتیشـام و ویقـار بـوو، شـەجاعەتی مەشهوورە. زاتەن هەر عەشیرەتێکی پیاویان ئازابن، ئـازان. ئـی ترسـنۆك، ژنیان ترسنۆکن. حاصلی ژن مەصدەری ئینسانن.

ئەمڕۆ بۆ من ئافرەتێ هەیە، کافیە ناو[2]، وەکی تەیمووری لەنـگە، بـۆ

---

(١) خانزادی حەریری یان خانزادی سۆران یان خانزادی قولی بەگی کچـی حەسـەن بەگ، کچێـك بـووە دوای کـوڕی دوایـی میرسـلێمان بەگـی بـرای کە لە بەغـدا ژەهرخـوارد کـرا، پۆسـتی میرایەتـی وەردەگرێـت و دەبێـتە نمـوونەیەکی جـوانی حـوکمرانی لەسـەردەمی خۆیـدا. دەسـکەوتی باشـی بـۆ گەلەکەی بەدەسـت هێنـاوە، تەنانەت وەك پارچە شیعر لەناو خەڵکی بڵاوە کە چ ڕۆڵێکـی گەورەی هەبـووە، وەك دەگوترێت:

هەتا خانزاد خانزاد بوو
خانزادی سۆران میر بوو
بەردی بەستان پەنیر بوو
ئاوی رووباران شیر بوو.

(٢)کافیە: ناسراوە بە کافیەی مەلایان (١٩٠٠-١٩٨٠)، ناوی کافیە حوسێن ئەحمەد فەقێ مەحمود بنجوو بوو. لە کۆیە لەدایك بووە، لـە ڕۆژگـاری گرانییەکـەی سـاڵی ١٩١٧ دا دایك و باوکی لەبەر نـەبوونی و هـەژاری دەمـرن، دوو خوشـکی هـەبوون، گەورەکەیان ناوی بەگم بوو و هاوسەری حەمەد بەگی قالە چاوشین بوو، سـەد و دەساڵان ژیا، خوشکی دووەمی ئەلفیە خێزانی حاجی قادری سەلمەی بوو. کافیە دەبێتـە مارەبڕی کەسێك بە بێ ڕەزامەندی خـۆی، بۆیـە وازی لـێ دێنێـی و خـۆی دەخیلـی مـەلای گـەورە دەکـات و مەسـەلەکەی تێدەگەیـەنێ، ئـەویش وەك کچـی خـۆی

←

مەلا، سەعی خدمەتی ماڵ و مولك و مەدرەسەم ئەو ئەیکا، ئەو نەبێ کاروبارم گشتی موعەتتەڵە.

٢٦٠/٩

## مەلایە شیعە بۆ شا ئەنووسێ!

ئینسانێ بوو مەستییە فەندی ناو، کوڕێکی هەبوو، ناو هۆشیار، لاکین هوشیار مەستی، تەڕ بوو، ئینسانێ ئەدیب بوو، لە خدمەت مەلای بابم حیکایەتێکی گێڕاوە گۆیا: لەسەر مەسئەلەیە ئیداری، مەلایە شیعە بۆ شا ئەنووسێ:

**از آن داده یزدان تو را پادشاهی**
**کی اسایش خلق بر خود کنی فرض**
**وگرنه تو بر ملك حق نداری**
**ولله ملك السموات والارض**

ئیلاهی ئەو ئوممەتە لەسەر ئەم حاڵە چۆن عیلاج ئەکرێ؟

٩:٢٧٠

## بە هەموو کتێبێ ئەوێرم بە قورئان نەبێ!

---

دەپارێزێ. کافیەش زۆر بە دڵسۆزی خزمەتی مەلای گەورە و بنەماڵەی مەلای گەورە دەکات و بە مەلای گەورە دەڵێت کاکە و دەبێتە هەڵسوڕێنەری ئیش و کاری ناو ماڵ و دەرەوەی ماڵ و نازناوی کافیەی مەلایان بە ڕەزامەندی مەلای گەورە وەردەگرێت. هەموو بەیانییەك دەچێتە خزمەتی تا ئیش و کاری ڕۆژانەی پێ بسپێرێت. مەسعوود محەمەد لە گەشتی ژیانمەکەیدا زۆر بە باشە باسی کافیە دەکات و ئاماژە بەوە دەدات کە زۆر خزمەتی ئەوانی کردووە. هەروەها دەنگخۆشیش بووە و بەیتی سەیدەوانی بە دەنگێکی خۆش و بە دڵێکی حەزینەوە دەگوت. تەنانەت لە پرسەی مەلای گەورەشدا سەردولکەی گوتون و ژنانیش لەدوایان گوتوتەوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: کافیەی مەلایان ١٩٠٠-١٩٨٠، حوسێن حاجی قادر (ئاری)، گۆڤاری کەکۆن، ژمارە ٤، حوزەیرانی ٢٠٠٩، ل ١٠.

تەسهیلی قورئان بۆ لەبەرکردن، لام وایە ئێرە جێی نییە، حەقیقەتەن قورئان بۆ مەلایان نەبێ، سەهل دێتە بەر منداڵ. کۆری جاهیل کەمێ بە موحافەزە بێ، بە ئاسانی لەبەری ئەکا، ئەمما مەلا لە زەمانی مەلایەتی بۆی ناکرێ، چونکی بە گوێرەی قەواعید تەڕەدودی لە عیبارات زۆرە، حوزوری موتەشابیهات لێی تێك ئەدا، ئەبێ دائیمەن موراجیعەی نووسراو بکا.

بابم ئەیفەرموو: بە هەموو کتێبێ ئەوێرم بە قورئان نەبێ، هەر کتێبێ لێ نەقل کەم ئەتوانم عیبارەتەکی لە ئەصلی چاتری بۆ دانێم، ئەمما لەگەڵ قورئان چبکەم؟!

٣٦٤/٩

## خێوەتی ناو باغ زۆر خۆشە!

خیامی ناو باغات زۆر خۆشە، تەعریفی خیامت بۆ بکەم؟ حاجەت ناکا، خێمە بێ و لە جەننەت دا بێ. ساڵێ من لە خدمەتی بابم، فەصلی بەهار، مانگی مارت چووینە بیتوێن، یەکێ لە تەرەف حکومەتی ئێران، ئەمیر جەنگ بەهادور حوسێن خان، بۆ موهر هاتبووە بیتوێن، خەیمەی شاهزادەی وەلی عەهدی ئێرانی پێ بوو، هەڵیدابوو، حەقیقەتەن ئینسان ئەچووە ناوی، تەحەییوری ئەکرد، لەو زیبا و زینەت و ئارایش و نەقش و نیگار و نەسجە.

٣٩٨/٩

## هەم برسییە، هەم حەزی لە شەرابە!

عیززەت پاشای کەرکووکی[1]، لە خدمەت بابم بە موناسەبە گێڕایەوە

(١) عیززەت پاشا کوڕی زەینەل کوڕی عەلی کوڕی ئیسماعیل کوڕی محمد کوڕی بوداق کوڕی محمد پاشا صاری کەهیەیە، لەساڵی ١٨٦٩ لە گەڕەکی صاری کەهیەی کەرکووک لە دایک بووە، خوێندنی سەرەتایی لە کەرکووک و روشدییەی عەسکەری لە بەغدا تەواو کردووە، پاشان پەیوەندی بە قوتابخانەی عەسکەری لە ←

و وتی: یەکێ لە بەگتاشییان، قڕووشەکی پێ ئەبێ، هەم برسییە، هەم حەزی لە شەرابە، پارەکەش هەردووکی پێ نەدەهات، وتی: بیدەم لە شووشەکی گچکەلۆکەی شەڕاب، بیخۆمەوە، ئاگام لە برسییایەتیش نامێنێ!

چوو، شووشە شەڕابی کڕی، بە دەستییەوە بوو ئەگەڕاوە مەوقیعی خۆی. تەصادوفەن نێزیکی دوکانی ئاسنگەرێ بوو، لەو وەقتە تەزرە ئەباری، دەنکە تەزرەیە بە شووشەکەی کەوت، شووشەی تەنك و نازك، شووشەکەی شکاند، بەگتاشی لە دوکانی ئاسنگەر، پارە ئاسنێکی لەبەر تەرزە ڕاگرت، وتی: ئەگەر ئازای ئەوە بشکێنە!

رەجا وایە مسوڵمانان لە قووەتدا بنە ئاسن، وە ئیللا وەکی شووشە بە دانە تەزرەیە ئەشکێن، خوا بۆ ئێمە، ڕەهبانییەتی لا خۆش نییە. أنزل الحديد فيه بأس شديد، القوة القوة يا اهل المروة، وە ئەم یەك دوو شیعرە کوردییەی خۆتان عەرز ئەکەم:

**مەلای نادان بە عینوانی شەریعەت**

**حەرامی کرد لە تۆ عیلمی تەبیعەت**

**لە بۆیە هەرچی لەم عەردە بەدەرکەوت**

**لە زێڕ و زیو و پۆڵا و ئاسن و نەوت**

**بە کوللی کەوتە ژێر دەستی فەرەنگان**

**چیا و چۆلان ئەنۆڕن وەك پلنگان**

---

ئەستنبۆلەوە کردووە و بە پلەی ملازمی دووەم لە ساڵی ١٨٨٧ دەرچووە. دوای وەرگرتنی وەزیفەی عەسکەری لە ئادەنە و پاشان بە پلەی ملازمی یەکەم دەگەڕێتەوە عێراق و لە ساڵی ١٩٠٧ پلەکەی دەبێتە عەمید. لە ساڵی ١٩١٣ بە فەرمانێکی سوڵتانی دەبێتە ئامیر لیوا و والی بە وەکالەت لە شاری بەصرە. لە حکومەتی کاتی نەجیب گەیلانیش لە بەغدا لە ساڵی ١٩٢٠ پۆستی وەزیری مەعاریف و تەندروستی وەردەگرێ. لە ساڵانی دواتردا چەند پۆستێکی تر وەردەگرێ و لە ساڵی ١٩٣٢ کۆچی دوایی دەکات و لە ژوورێکی مزگەوتی حاجی عەبدی بەگ لە گەڕەکی صاری کەهیە لە کەرکووک ئەسپەردەی خاک دەکرێ.

بیـان نـۆڕێ، چیایـان چـۆن ئەکـوڵن
هەتا کەی هەر ئێوە بەرمـاڵ بە کوڵن.

حەیـف و سـەد حەیـف لەبەر غەم و ئەلەمـی بەدەنـی و ڕووحـی، حەفتەیەکە چم نەنووسینە. ڕۆژی شەموو، سعات یانزدە، بعد العصر ١٤ی نیسانی ڕۆمی ١٩٤٠.

٤٥٩/٩

## نەزر لە سەیدان دروستە یان نا!؟

ئەگەر لەبەر درێژی نەبا، ماجەرای بابم لەگەڵ مەلا عومەری خەیلانی لە قـارس و بایەزیـد سـاڵی غەزای ١٢٩٣ی هیجـری و وکـذا مـاجەرای لەگەڵ مەلا ئەحمەدی نۆتشی لە بەغـدایە پێشـی غەزایە عەرزم ئەکـردن، ئەمما بۆ جێیە موناسیب بێ، ئینشائەڵلا تەحریریان ئەکەین.

٢١/١٠

لە موحـارەبەی نەوەد و سـێ، لە موحـارەبەی دەوڵەتـی عوسـمانی و ڕووسـی، لە ئەوائیلـی سـەڵتەنەتی عەبدولحەمیـد خـانی ثـانی، شـێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە جیهەتی قارس و بایەزید[1] سوئال لە بـابم ئەکـا، نەزر لە سەیدان دروستە، یان دروست نییە؟

بابم ئەفەرموێ: دروستە!

مەلا عومەری خەیلانـی مەلایە مـوعەممەر ئەفەرمـوێ: دروسـت نیـیە. ئیستیدلال بە عیبارەتێ لە توحفەی ئیـبن حەجەر دێنـێ، وکالزکـات کـل واجب کالنذر ودماء النسك.

مەلای بـابم ئەفەرمـوێ: مەلا عەبـدولرەحمانی بـاپیرم لەسـەر ئێـرەی نووسیە: أي کالمنذور. دوایە ئەفەرمـوێ: فتأمـل فقـد غلـط فیـه الفظـلاء.

---

(١) قارس ناوەندی ویلایەتی قارسە کە دەکەوێتە باشـووری ئەنەدۆڵ لە تورکیـا، بە هەمان شێوە بازیدیش شارێکە لە باشووری ئەنادۆڵ.

باپیرم کەرامەتی بووە، زانیتێ فاضلێ وەکی توو، لێرە بە غەلەط ئەچێ، چونکی نەزر نەکا، گوناهی نییە.

شێخ عوبەیدوڵڵا زۆری پێ خۆش ئەبێ، گەلێ تەقدیری تەحسینی عیلمی مەلای ئەکا، مع الاسف دوایە لەگەڵ بابم تێك چوو.

۳۲۳/۱۰

## ئەوەش دیعایەی کاذبە، مومکینە بە ملیۆن ئینسانیان پێ خەڵەتاندبێ!

ئەمیری جەنگ بەهادور میرزا حسێن خان، لە بیتوێتێ ڕۆژێ عەرزی مەلای بابمی کرد: ئیمامی شافیعی فەرموویەتی: علی حبە جنة! مەحەببەتی حەزرەتی ئیمامی عەلی، مەتاڵە، لە ڕۆژی جەزا شەرارەی ئاگری جەهەننەمی لە موحیبی ڕەد ئەکا!

مەلا فەرمووی: ئەوە بۆ ئێمەیە، ئەمما بۆ ئێوە علی حبە جنة! شێتییە!

وتی: ئامان بۆچی؟!

فەرمووی: ئێمە ئیخلاصی حەزرەتی ئەمیر و سائیری یارانی کیرامی ڕیسالەت پەناهمان هەیە، لاشك لە مەحەببەتی ئیستیفادە ئەکەین. ئەمما ئێوە هەرچەند مەحەببەتی حەزرەتی عەلیتان هەبێ، بوعزی سائیری یارانی گوزیر، مانیعە لە ئیستیفادەتان، ئەو مەحەببەتە مەتاڵ نییە، گەوجییە!

وتی: قسیم النار والجنة!

مەلا فەرمووی: حاشا ڕۆژی قیامەت بە غەیری تەقسیمی جەنەت و نار، چ ئیشی دی نیە، ئەویش عەلی ببینێ، خوا موعەتتەڵ ئەبێ!

ئاه، توخوا ئەمە جەننەت نییە؟ کەسێ وا گومان بیا، غەیری خوا ئێکی تر ئەو تەقسیمە ئەکا؟

بنۆڕێ ئەوەش دیعایەی کاذبە، مومکینە بە ملیۆن ئینسانیان پێ خەڵەتاندبێ!

۲۵/۱۰

## نێزیك بوو ڕووس هجووم کاتە سەر دەوڵەتی عوسمانی لەسەر مسوڵمانبوونی ژنێك!

لە تەئریخی (١٣٠٩)،[1] ئافرەتێ لە تەبەعەی ڕووس مسوڵمان بوو، بۆ پیاوێ لە تەرەفی سابڵاغ. دەوڵەتی ڕووس هاتە هەیەجان، تەضەییوقی حکومەتی ئێرانی کرد. پیاوەکە و ئافرەتەکە، دەخالەتی شەهبەندەرخانی دەوڵەتی عوسمانییان کرد. تەبەعەی عوسمانی لەوێ پێیان ئەگوتن: خاریجە! حیمایەی ئافرەتەکەیان کرد، نەیانداوە دوژمن. نێزیك بوو ڕووس هجوم کاتە سەر دەوڵەتی عوسمانی. ئەملاو ئەولا، کەشماکەش، بەسەر حاڵ لە بەعزە شروط ڕازی بوون دەستیان لە ژنەکە هەڵگرت. یەکێ لە شەرتان ئەمە بوو، خارجەکان لە سابڵاغی دەرکرێن. خارجەکان قبوڵیان نەکرد، لە شەهبەندەرخانە مەحصووربوون. نیهایەت جەنابی مەلای بابم و عەبدوڵڵا پاشای ڕواندزی[2] بە ئیرادەیە سەننییە بوونە مەئموور، بەسەر وەعز و نەصیحەتی جەنابی مەلا قبوڵیان کرد. بۆ مەمالیکی عوسمانییە گەڕانەوە، چەند ئەموالی صەرف کرا، تا ڕێك کەوت!

٧٤/١٠

(١) واتە ساڵانی ١٨٩١ یان ١٨٩٢ی میلادی

(٢) عەبدوڵلا موخلیس بەگ کوڕی ئەسعەد بەگی کوڕی ڕەسوول پاشایە، لە ١٢٧٧ك لە بەغدا لەدایك بووە، لە ١٣٠٧ وەك مەئمورییەتی لێکۆڵینەوە چۆتە کۆیێ و ڕواندزێ، لە دواییدا چەند جارێك لە سەلاحییە و مەعمورە و قەڵادزێ و ڕانیە و شوێنانی تردا قائیمقامیەتی کردووە، لەگەڵ محمد پاشای چەچاندا بە سەفەر چۆتە لاجانێ و لە ١٣٢٥ لە موصڵ کراوەتە مەعاونی مەکتووبچی، تا وەختی ئیحتیلال، پاش ئیحتیلال ماڵەکەی گواستۆتەوە هەولێر و لە ساڵی ١٩٢٤ بووە ئەندامی مەجلیسی تەئسیسی و لە ١٩٢٥ بوو بە نوێنەری هەولێر و لە ١٩٤١ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و تەنیا یەحیا بەگی لەپاش بەجێماوە.

## حەرەمی بابم دەستبڵاو بوو!

ژن لە ماڵی مێردی دزی بکات، ئەو ماڵە زۆر بێ بەرەکەت ئەبێ. بێوەژنێ ئەولادی بە دەرەوە بێ، ئیللا دزییان بۆ ئەکات، وە گەلێ ژنی سادە دڵ هەن، گوایا بە ڕەحمن، دەستە خوشکیان هەن، نەختێ فەقیرن، بە پای پیلان شتیان بۆ دەنێرن، نانۆڕنە مەسرەفی ماڵی.

بابم ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لەو خصوصە زۆر حاڵی ناخۆش بوو، زەخیرەی حەفت مانگی دادەنا، بەشی سێ مانگی نەدەکرد، حەرەمی دەست بڵاو بوو، ئاگای لە ماڵداری نەبوو.

٧٦/١٠

## کە ڕەشید ڕەزا وەفتی کرد قادیانی زۆر مەسروور بوون!

رحمة الله الهندی[1] تەصنیفەکی کردیە دائیر بە ئیثباتی تەحریفی تەورات و ئینجیل، ئیثباتی نەسخی تەحقیقی موبەششیرات. حەقەن شایانی موتاڵەعەیە. وەقتی جەلیلی زادە ئەیوب بەگ چەند نوسخەکی بەناوی بابم ناردە کۆیە، بابم (رحمة الله علیە) بەسەر مەلایانی دارەبەخش کرد. لکن مع الاسف ئیستیفادەیان لێ نەکرد.

بەڵێ مەلای کوردیان لەبەر نەحوو و صەرف و تەحقیقاتی عولەمای بەلاغەت، (تطاول لی لك بالاثمد) فیە سێ التفات: التفات بۆ موتاڵەعەی

(١) ناوی رحمة الله الهندی الکیروانی کوڕی خلیل الرحمانە، زانایەکی ناوداری مسوڵمان بووە، لە کەیرەوانەی سەر بە دەلهی پایتەختی هیند لە ساڵی ١٨١٨ لەدایک بووە و لە ساڵی ١٨٩١ لە مەککە کۆچی دوایی کردووە. لە ناودارترین قوتابییەکانی مەلیك شەریف حوسێن کوڕی عەلی هاشمی و هەروەها شێخ عەبدوڵلا سەراجی شێخی زانایانی مەککە و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی دەوڵەتی هاشمی. لە گرنگترین کتێبەکانی کتێبی (إظهار الحق)ـە.

شتێ هاکەزا ناکەن، ئێمە بۆ ئیثباتی ڕیسالەتی ئەحمەدی موختار، ئیحتیاجیمان بە موبەششیرات نییە. ئیمان بە ڕیسالەتی ئەحمەدی، موجیبە بۆ ئیمان بە ڕیسالەتی سائیری ڕوسولی مبشرین. ئەمە وا لەو ئەواخیرە پیاوێ پەیا بوو، لەلای هیندستان، ناوی غولام ئەحمەد [1] خەڵکی قادیان، ئیددیعای ئیصلاح و تەوفیقی بەینی مەسیح و موحەممەدی ئەکرد، دوایە بووە مەسیحی مەوعوود و(مبشر بە). دوایە دیم لە موجەلەیە ئیددیعای ڕیسالەتیان بۆ ئەکرد، وە ئەم ئایەتەیان بۆ ئەکردە بەشارەت بۆ ئەحمەدە هیندیەی موصلیحی ئەعزەمی موحیببی سەلام، دەوڵەتی بریطانیا العظمی زۆری قووە دایە. مع أنە ئەووەل و ئاخیر بەشارەی ئیشارەی صیدقی لە لۆندەرە[2] هات، حتی سەید ڕەشید[3] بۆی ئەنووسی: مەسیح صەلیب ئەشکێنێ، تۆ عادە پەرستوشی صەلیب ئەکەی، خادیمی ئینگلیزە.

مەسیحییەت کەوا زۆریان ڕق لە سەید ڕەشید ئەبۆوە کە وەفاتی کرد، ئەتباعی قادیانی زۆر مەسروور بوون، ئەووەل و ئاخیری دینی ئیسلامی لە دەست حەییالان قورتار نەبووە.

٨٧/١٠

---

(١) میرزا غولام ئەحمەد قادیانی (١٨٣٩-١٩٠٨ز) دامەزرێنەری کۆمەڵی ئەحمەدییە لە قادیانی هیندستان، لەلای پەیڕەوکەرانی بە مەهدی و مەسیحی چاوەڕێکراو دەناسرێ، هەندێکیشیان پێیان وابووە نوێکەرەوەی ئیسلام بووە لە سەدەی چواردەی کۆچی. بە گوێرەی ڕوانینەکانی ئیسلام حەزرەتی عیسا لە ژیانە و لە ئاسمانە و لە ئاخیری دونیادا دێتەوە سەر زەوی، بەڵام غولام ئەحمەد پێی وایە عیسا لە لەخاچدان ڕزگاری بووە و چۆتە کشمیر و لەوێ وەفاتی کردووە. لەدوای مردنی خۆی خەلیفە نورەدین و لەدوای ئەویش میرزا بەشیرەددین و لەدوای ئەویش میرزا ناصر و میرزا طاهر و ئێستاش میرزا مەسروور ئەحمەد لە شوێنی دانیشتوون و ئێستا لە لەندەن نیشتەجێیە.

(٢) لۆندەرە، واتە لەندەن.

(٣) محمد ڕەشید عەلی ڕەزا (١٨٦٥-١٩٣٥ز) لە گوندی قەلەمونی لوبنان لەدایک بووە. بیرمەند و بانگخوازێکی دیاری ئیسلامیی بووە و لە بانگەشەکەرانی چاکسازیی ئیسلامی بووە کە لە سەدەی چواردەی کۆچی دەرکەوتن. جگە لەمەش ناوبراو ڕۆژنامەنووس و نووسەر و ئەدیب و زمانەوانیش بووە. یەکێک لە قوتابییەکانی محەممەد عەبدە بووە و گۆڤاری المناری چاپکردووە. جگە لە تەفسیری المنار زیاتر لە دە کتێبی تری چاپکردووە.

## بە ئەنواعی بەهانە لە شەڕی هەڵدەهاتن!

مەلای بابم ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ئەیفەرموو: لە موحارەبەی قارس و بایەزید، یەعنی موحارەبەی سالی ١٢٩٣. بەعزێ لە ئەهالی کۆیە ئەگەڕانەوە، ئەیانوت: ساوارمان نەکولاندیە! بەعزێ ئەیانوت: نێزیکە باران باری، خانوومان دلۆپە ئەکا، کەس نیە بیپەستێتەوە! بەو نەوعی عوزر و بەهانە هەڵئەهاتن، لە کۆلانی کۆیە، کە ئەخولانەوە ئەتگوت: پۆلا کرۆژن، دائیم دەست لەسەر خەنجەر!

بەڵێ حەرب پیاوی پێ ئەوێ، بە لاف و گەزاف و خۆ هەڵشەکاندن نابێ.

٩٨/١٠

## ئەکثەری خوتبە، خوتبەی نۆك و نیسك و عاشوورا و شتی وایە!

بۆ ئیستیماعی خوتبە بڕۆن بۆ مزگەوتی گەورە، دیارە مەقسەد لە جومعە خوتبەیە، نوێژ هەموو ڕۆژێ هەیە، قەومێ بچیتە مزگەوت، کۆببنەوە گوێیان لە خوتبە نەبێ، یاخود گوێیان لێ بێ وە تێی نەگەن، وەکی کوردان چ فائیدەی هەیە؟ خوتبە هەفتە بە هەفتە دەرسێکی عمومییە، بۆ فەهمی لازمە زۆر سەعی بکرێ. مەعلومە تەعلیمی عەرەبی بۆ قەومی کورد، مەسەلەن، موشکیلە ئەمما تەرجەمە یاخود خوتبەیە بە زوبانی قەوم، دانانی بۆ مەلای خەتیب سەهلە، با ئەرکانەکانی هەمووی عەرەبی بێ، وەعزەکە کوردی بێ مەسەلەن، لازمە خوتبە نوێ بێ، بە گوێرەی ئەحوالات بیگۆڕن. لاکین مع الاسف ئەمڕۆش علی الاکثر کۆنە خوتبەی حەوت سەد ساڵ پێش ئەمڕۆ دانراو ئەخونن، باوەڕ ناکەم لەو عەصرە، غەیری بابم وە من، کەس خوتبەی نوێی خۆی بە نسبەت حاڵ و وەقت بخوێنێ. وعلی الاکثر مەلای زۆر گەورە و بە قسمەت، خوتبە ناخوونن، پیاوێ عادی لە بازاڕ هەڵئەستێ، ئەچێتە سەر مینبەر.

چوومە موصل بەعدەهو چوومە بەغدا، زۆر موتەئەسسیر بووم،

تەئەسوفم کرد بۆ ئەو مینبەر و میحرابانە. مینبەری ئەعزەمییە، مینبەری ئاستانە، حەیف سەد حەیف یەکێ وەکوو بابم، لەسەر ئەو مینبەرانە نەخوونێ، قوببەی مزگەوت نەهێنێتە هەژان! ئەکثەری خوتبە، خوتبەی نۆك و نیسك و عاشوورا و شتی وایە، عەلاوەی ئەم سەییئاتە، لە هەموو مزگەوتێ مەرقەدێکی لێ هەیە، ئەننەهو خوتبە بەناوی ئەو زاتە ئەخوێندرێ، وەی لەو بلعەتە!

نازانم تاکەی ئەوە دەوام ئەکا؟

## لەتیفە:

وامزانی یەك دوو ساڵ پێش ئەمساڵ، مودیری ئەوقافی بەغدا ئەمر ئەکا: جەمعێ لە عولەمای دارالسلام لە دائیرە کۆببنەوە، مەلایان لەمیعاد دا ئەچن، مودیر ئەفەرمووێ: لازمە ئەو کۆنە خوتبانە تەرك کەن، خوتبەی نوێ دانێن، بە گوێرەی زرووف، چی لازمە، بەسەر عیبادی خوا قیرائەتی کەن.

مەلایەکان ئەفەرموون: زۆرباشە. لیجنەیە لە عولەمای بولەغاء تەشکیل ئەکەن، دیوان الخطب ێ دائەنێن، بەعدەهو وەلی ئەمر ئەمرکا لەسەر مەنابیری عێراق ئەو خوتبانە بخووندرێتەوە.

یەکێ لە مەلایان (ناقل ناوی نەدەزانی) وتی: من قسەیە ئەکەم، بە موساعەدەی ئێوە: ئەوەی نوێژی جومعە ئەکات، چەقاڵ و بەقاڵ و کت و کۆر و تەقاویت و حەممال و پینەدۆزن. ئەوانە خوتبەکانی کۆنیان لێ دەوەشێتەوە. هەر وەقتێ وزەرا و نوواب و ئەعیان و ئەعمیدە و ئەساطین و زوعەما و ڕوئەسای بەلەد هاتنە جومعەیە، بە تەبیعەتی خۆی، خەتیب و خوتبە ئەگۆڕێ، لیسان تەبەددول ئەکا. ئێستا خوتبەی عەصری بۆ کێی دانێن؟ بۆ کێی بخوێنێتەوە؟

ناقل وتی: گەلێ لۆمە و تەحقیریان کرد، ئەمما حەقیقەت شایانی ئەنا و تەبجیلە.

١٠٨/١٠

## بابم و یازدە پیاو و ئافرەتەکە!

ڕۆژێ لە هەیوانی حوجرەی مزگەوتی گەورە ڕاوەستابووم، دیم یانزە کەس هاتن، بەرماڵ بە کۆڵ، وتیان: بابت تەشریفی لە کوێیە؟ ئیشی شەرعیمان پێیە!

وتم: تەشریفی لە ماڵێیە!

وتیان: ڕێ دەبێ؟

وتم: ئا!

ئەوان بە ناو بازاڕی، من بە سەربانی بازاڕ هاتین بۆ لای ماڵەوە. بە خدمەت بابم موشەررەف بوون، دەستیان زیارەت کرد، یەکێ لە مەیانە هەستا وتی: قوربان من ئیددیعام هەیە لەو کابرایە، ژنی منی مارەی کردیە! ژنی بە شاهید و ئیثبات لە تەحتی نیکاحیە، ئەوە مارەی کردیە!

فەرمووی: کوا شاهید؟

دوو کەس ڕاستبوونەوە وتیان: اشهد بالله وبرسوله ئەو ئافرەتە مەنکوحەی ئەو پیاوەیە، ئێمە شاهیدی نیکاحین، وە تا ئێستا لەژێر نیکاحی دا ماوە!

یەکێ هەستا وتی: قوربان ئەو ژنە، نە ئی وییە، نە ئی وییە، ئی منە!

شاهید دوو کەس لەمەیانە شاهیدیان دا، ئەوە حەوت لە یانزدان.

بەعدەهو یەکێ دی هەستا و وتی: قوربان ئەو ژنە نە ئی وییە و نە ئی وییە و نە ئی وییە، ئیشارەی بۆ مێردەکان کرد، ئی منە!

شاهید دوو کەس شاهیدیان دا، ئەوە چوار مێرد و شەش شاهێد. تلك عشرة كاملة.

یانزدەمین هەستا وتی: قوربان ئەو ئافرەتە، نە ئی وییە، نە ئی ویە، نە ئی وییە و نە ئی وییە، ئی پیاوێ ترە لە فلان دێی پشدەر. وە ئەو ئافرەتە هەڵاتووە، بەو صورەتە موتەسەللیلە مێردی کردیە. ومن العجایب مولەققینی هەمووی، مەلا تەهای بۆگدی بووە!

۱۵۳/۱۰

## لە سەدا سی ژن و پیاو سوورەتی مولکیان لەبەر بوو!

لە ئەوائیلی نەشئەتی ئێمە لە کۆیە، وەقتە بڵێم: لە سەدا سی، ژن و پیاو ئەو سوورەتە (الملك)یان لەبەر بوو. وەختێ مەیتیان ئەهاویشتە ناو قەبر، جەماعەتێ زۆر، دەوری قەبریان ئەدا، سوورەی تەبارکەیان ئەخویند. وە عەدەدێ زۆر لە ژنان سورەی کەهف، یاسین، حامیم دوخان، إذا وقع ەیان لەبەر بوو. گوێم لێ بوو، پیرەژنێ خەڕەکی دەڕێست، وە سوورەی یاسینی ئەخوێند. ئیستا ئەوە نەماوە، خەڵکی لەبەر تڕ و زڕی دەروێش و سۆفیان ئاگایان لە قورئان نەما. ڕابیعەی عەدەوییە[1]ی کوردان، وەلییەی کامیلە مەلاژنە عەنبەر، مەرقەدی پڕ لە عەنبەری ڕەحمەتی ئیلاهی لێ بێ، بۆ تەربییەی ژنان، ڕوکنێ عەزیم و بێ نەزیر بوو. نەمبیستووە لە کوردان، سەییدەیەکی وەکی وی، هەڵکەوتبێ، واقیعەن سەییدەی شەریفەی کەریمەی سەید عەبدولکەریمی بەرزنجی حەرەمی بابم، والیدەی نورەددینی خاتوو زێنەب، لە عیلم و ئەدەب و عیلم بێ هەوتا بوو. ڕەحمەتیان لێ بێ، ڕۆیین!

١٧٦/١٠

(١) ناوی أم الخير رابعة کچی ئیسماعیلی العدوية البصرية القيسية یە، بە یەکێك لە نموونەکانی ژیانی رۆحی لە ئیسلامی سەدەی دووەمی کۆچی دادەنرێ، زانیاری لەبارەی ژیانی کەمە، بەشێکی دەچێتە ناو بواری ئەفسانەوە، لە بەسرە لەدایك بووە و لە ساڵی ١٨٥کۆچی وەفاتی کردووە، بە یەکێك لە زاهیدە هەرە گەورەکان ناسراوە، هەتا لەبارەی گوتراوە کە پیاوێکی دونیایی بە رابیعە دەڵێت: چیت پێویستە داوام لێ بکە. ئەویش دەڵێ: من شەرم دەکەم داوای دونیا لەو کەسە بکەم کە خولقێنەری دونیایە، چۆن داوا لە کەسێك بکەم کە هیچی نەخولقاندبێ و خاوەنی هیچ نەبێ. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: جمالية الرمز في الشعر الصوفي- محي الدين ابن عربي نموذجا، رسالة ماجستير، هدى فاطمة الزهراء، كلية الاداب والعلوم الانسانية، جامعة ابى بكر بلقايد، الجزائر، ٢٠٠٦م، ص٨١

## بەسەرهاتێکی مەولەویی شاعیر!

لە بـابم بیسـت، فەرمـووی: دەفـعەیە مەلا عەبـدولرەحیمی مەولەوی[1] ئەچێـتە سـلێمانی. جەماعـاتێ لە سـاداتی کیـرام لە خـدمەتی دادەنیشـن. بەعزێ ئەڵێن: سەییدی ئەولادی الرسول هەرچی بیکا، عەفووە!

مەولەوی ئەفەرموێ: ئەوە خاصی پیاوانیانە یا بۆ ژنانیشیان وایە؟

زۆر مونفەعیل ئەبن. حەزرەتی کاك ئەحمەد ئەو گفتوگۆیە ئەبیەتەوە، زۆر خۆی لە خزمەکانی عاجز ئەکا بە شیددەت لەو نەوعە قسانە مەنعیان ئەفەرموێ.

١٨٣/١٠

## چاوپیسی!

هەرچەند ئینسان عیللەتـی حەقیقـی نـازانی، ئەممـا چاوپیسـی چـاوێتی ئینکار ناکرێ، عەجایبە تەئثیری. شەخسێ هەبوو لە کـۆیە خـوا عـافووی کا، زۆر عەجایب بوو، خیکایەتی زۆرە، لە ئەتراف شـوهرەتی سـاندبوو، خۆیان لێ ئەپاراست. ڕۆژێ چاوی بە جوانە مـاینەك کەوت زۆر جـوان

---

(١) ناوی سەید عەبدولرەحیم کوڕی مەلا سەعید و لە ماڵباتی پیر خدری شاهۆن، لە ساڵی ١٨٠٦ لە گونـدی سەرشـاتەی دەڤەری تـاوەگۆزی لەدایـك بـووە، لای بـاوکی قورئانی خوێندووە و بۆ دەرس خوێندن چووە پـاوە لە هەورامـانی لهـۆن و نـاوچەی مەریوان و سنە و بانە و پاشان چـۆتە سـلێمانی و لە مزگەوتـی گەورە مـاوەتەوە، لەو کاتەدا هێشتا شێخ مارفی نۆدەیی (خاوەنی لۆغەتنـامەی مەنزوومـی ئەحـمەدی) لەوێ مامۆستا بووە، دواتر چووەتە هەڵەبجە و جوانرۆ و جارەکی دی چۆتەوە سنە و پاشان هاتۆتەوە سلێمانی و لای مەلا عەبدولرەحمانی نۆتشەیی ئیجازەی زانستی وەرگرتیە.
مەولەوی لە گەلەك جێگە مەلایەتی کردیە و لە کۆتاییەکانی تەمەنـی دا، کتێبخـانەی سووتا و گەلەك دەستنووسی فەوتـاون، هەروەهـا عەنـبەر خـاتوونی هەڤژینـی وەفـاتی کردیە و حەفت ساڵ پێش مردنـی خـۆی، چـاوی کـۆر بـوون و بەهـۆی کـۆرییەوە لەسـەر ولاغەکەی دەکەوێ و پشـتی دەشـکێ و بەو سـەبەبە لە سـالی ١٨٨٢ وەفـاتی دەکات و لە سەرشاتە بن ئاخ دەکرێ.

بوو، لە دەور و پشتی داکی گەمەی ئەکرد، وتی: پف چەند جوانە؟
دووسێ شەقاوی هاویت، جوانییەکە لەرزی لەرزی، ڕاقەنا، مرد!
مەلای بابم فەرمووی: پیاوێ هەبوو زۆر چاوپیس بوو، ڕۆژێ تەماشای تەیرەکی کرد، لەسەر داریێ نیشتبوو، وتی: چاوی چەند جوانە!
دەرحاڵ تەیرەکە چاوی ڕژا، کەوتە خوار!

٢٢٨/١٠

## ئەحمەد پاشای بابان!

بابم فەرمووی: لە حاجی مەلا بەکراغایان پرسی: کوو تێدەگەی لە ئەحمەد پاشای؟ فەرمووی: پاشای دەوڵەتی عوسمانی بە ماڵی خۆی دەنازی، فکری پەنجەبازی لەگەڵ ئاورووپای هەیە، بەو لوێژە عەسکەری چۆن ئینسان وا مەغروور ئەبێ؟ زۆر نەچوو هەڵات، چووە عرووسییات، دوایە بە واسیطەی ڕووس دەخالەتی درایە چووە ئەستەنبوڵ، حکومەتی بابان منقرض بوو.

٢٣٩/١٠

## بەسەرهاتی جنۆکان!

مامۆستا مەلا ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێ بێ، فەرمووی: جین پەلەیان لێ کردم کچەکەم لێ مارەکەن.
وتم: باشە، بە شەرتی شاهید لە خۆمان بێ.
قبوڵیان نەکرد، وتیان شاهیدیش لە خۆمان بێ!
منیش قبوڵم نەکرد.
مامۆستا پیاوی درۆ نەبوو.
بابیشم لە تەرەف جن نەساغییەکی بەسەرهات، نازانم نووسیتم یان نا؟
موجمەلەن شەوێ دوو ئەجیننە دێنە خزمەتی ئەڵێن: بۆ سوئالی تەلاق هاتینە خدمەت. ئەفەرموێ. ئیوە مەلاتان نییە؟
عەرزی ئەکەن بەڵێ، هەیە، ئەمما حەزمان کرد بێینە خزمەت توو.

تەقریری تەڵاقەکە ئەکەن. مەلا ئەفەرمووێ: تەڵاقتان کەوتووە.

ئەوانیش لایان گران ئەبێ، عەرزی ئەکەن ئەمە ئەچینە هۆدەی بن دەرکە ئینتیزاری جوابێ خۆش ئەکەین.

سبەی چوومە خدمەت بابم مضطربم دیت، تا پێنج ڕۆژان لە عەزابێ دا بووم، خودا بزانێ وەقت بوو دڵم دەرچی لە غەمان، ئەیفەرموو: فەتاوا بێنە تەماشاکە تەحقیقی ئەو تەڵاقە بکە. توحفە بێنە بە دیقـقەت بنۆڕێ. ڕۆژێ فەرمووی: تەلەغرافی بابم بۆ هاتییە لە مەککە ئەفەرمووێ: دیققەت کە لەو مەسئەلە، ڕۆژی پەنجەم پاش نیوەڕۆ فەرمووی: کێ لێرەیە؟

عەرزم کرد: بەندە.

فەرمووی: چابوومەوە، ثم الحمدلله!

پاشان ماجەرای بۆ گێڕامەوە، وە دائیمە ئەیفەرموو: ئاگاتان لەو میوانانە بێ، لە هۆدەی، لە بن دەرکەی ئەچووین، چ میوان نەبوو. فەرمووی لەو وەقتەدا وامزانی چوونە خدمەت بابم، نەوعەن ما، شکاتیان لە من کردبوو، ئەویش موخابەرەی لەگەڵ کردم، تا ئەمڕۆ جوابم دانەوە. بە تەڵاق نەکەوتن مەسروور بوون، ڕۆیین، وە لێم گەڕان. وە بابم زاتێ نەبووە هیچ خەلەلی هەبێ، لە هەموو جیهەت قیوای بەدەنی و ڕووحی و دەماغی زۆر کامڵ بوو.

٢٨١/١٠

## من و بابم!

من دائیمەن لە خزمەت بابم بووم، بچووبا هەر مەجلیسێ لە خدمەتی ئەچووم، مەلا یەحیای کوڕی شێخ عەبدولرەحمان، شێخ موحەممەد سەعیدی وحید الاب، لێرە قازی بوو. ڕۆژێ بە منی وت: عەجایبم دێ توو ئەوەندە ملازمی خدمەتی بابتی؟!

وتم: ئەمن زۆر عاجباتیم دێ، بەو چەند قرووشەی ئەوەندە دوور ئەکەویەوە لە بابت!

حەقـقەن ئەولادی چاك و بە قیمەت دائیم بەر نەزەری بابیان بن، نیعمەتێ گەورەیە.

٢٩٦/١٠

## شێخ عەبدولرەحمانی تاڵەبانی و فەقیرەکە!

باوەڕ مەکەن کەسێ ئیطعامی طەعام بکا، وە لیباس ببەخشێ، بۆ ڕووتی موستەحەق، خوا جلکی نەکا. لە بابم بیست، فەرمووی: لە خدمەت شێخ عەبدولرەحمانی تاڵەبانی بووم، فەقیرێ هات، وتی قوربان ڕووتم!

چاوی گێڕا، شەخسێ عەبایەکی لەبەر بوو، فەرمووی ئەو عەبایەم بدەرێ!

عەبای وەرگرت، هۆدەیە گچکە لە جەنبی غورفەی مەجلیس بوو، شێخ چووە ئەو هۆدە، بانگی پیاوەکی خۆی کرد، فەرمووی: ئەو جلکانە بدە ئەم فەقیرە، ئەمما هیچی لێ مەگێڕەوە.

وتی: بەڵێ!

شێخ هەموو لیباسی خۆی حەتتا کڵاو و مێزەر بۆ سائیلەکەی نارد، خۆی هاتەوە مەجلیس، عەبای کابرای لە خۆوە پێچابوو. دانیشت سروورێ زۆر عەزیمی لە ڕووانـدا دیار بوو، هەندەی پێ نەچوو، بوخچەکیان لیباس هێنا خدمەت، چووە ئۆدەکەی گچکە یەك بە یەك پارچە لیباسەکانی لەبەر کرد، دوایە بانگی پیاوەکەی کرد، فەرمووی: ساعەتەکەی منت نەدایە فەقیرەکە؟

وتی: بەڵێ قوربان دامێ!

فەرمووی: درۆی ئەکەی، مەعنای چی؟ ئەوەی دراوە بە فەقیرەکە هەمووم چاتر بۆ هاتیە، سعاتی تیا نییە.

مەجبوورەن کابرا وتی قوربان سەعاتەکە زۆر چا بوو، حەیفم هات، بیدەمە ئەو فەقیرە.

فەرمووی: خراپت کرد، ئی چاترم بۆ دەهات.

لە شێخ عەلیم بیست فەرمووی: لە خدمەت بابم یەعنی شێخ عەبدولرەحمانی تاڵەبانی ڕاوەستا بووم، فەقیرێ هات، وتی: دەرپێم دڕایە، نوێژم دروست نییە!

شێخ فەرمووی: عەلی گەلێ کەس بۆ دونیایان داکەندیە، با من بۆ خوای داکەنم!

دەرپێی لە پێی خۆی داکەند و دایە فەقیرەکە!

ئەگەر ئەو مەئاظیرە لە مەعبوودەکی شیعان واقیع بووبا، چەند سوورەتیان لە حەق نازل ئەکرد، خوای تەعالان قسە لە ئەشخاص ناکا، ئەنۆڕێتە ئەعمال.

٣٢٥/١٠

## کاسەی دروستکراو لە قوڕی کەربەلا!

تەئریخێ لەمەوپێش ئێکێ لە ئومەرای عەجەم، ئەمیری جەنگ بەهادور میرزا حسێن خان هاتە بیتوێن، لەگەڵ بابم مولاقاتیان کرد، منیش لە خدمەتی دابووم. تاقمەی ئاوخواردنەوەی هەبوو، دەستەباشی زیو، مونەققەش، تاسەی زێڕ موحەللی، پیاڵە موزەیین، بە تیل و زێڕ، وە دانە دانەیی جەواهیر لە مەیانی دیار، شتێ مائیل بە سیاهی ئەیانوت: ئەمە لە قوڕی کەربەلای مەعلا دروست کراوە. بۆ تەبەڕوك ئەمیر ئاوی پێ ئەخواتەوە.

وە کوڕێ هەڵی ئەگرت، ئەگەر بۆ جێیە چووبا، ناو (عەلی مەعصوم) ئەیوت: پەنجەیی ئافتابە.

ئایا ئەوانە لەو پیاڵانەی جەننەت ئەخۆنەوە؟

٤٨٦/١٠

## عولەمای کوردان

بابم فەرمووی: لە بەغدا ڕۆژێ چوومە لای عەبدولرەحمان ئەفەندی ئەو وەقتی ئەو نەقیب نەبوو، باسی عولەمای کوردان کرا، زۆر تەقدیری کردن، وتی: مەلای کورد هەرچەندە لە عەرەبی دا زۆر باڵا بێ، ناگەیێتە مەلایە کە ئەسڵەن عەرەب بێ، بۆ ئیستیشهاد چەند ئەبیاتی موفتی زەهاوی خوندەوە، ئەشعارێ بەلیغ و فەصیح، ئەمما تەماشاکەن، چ نسبەتی نییە، لەگەڵ ئایەتی فأما من أعطى...

بابم فەرمووی: وتم سبحان الله کأنـه حەزرەتـی سـەیید لە کەلامـی بەشـەر چـی نەدۆزیەوە، موقـابەلەی کەلامـی زەهـاوی کـا، مەجبـورەن تەشەببوثی بە ئایەتی قورئان کرد.

حەقـیقەتەن غەفڵەتـێ عەجیـبە، وابـزانم بـابم لە تەئریخـی ١٢٩٢ی هیجری[1] چووبووە بەغدا و موصل و بەصرا، هەمـووی یەك ویـلایەت بـوو. والیـیە ئیـدارەی ئەکـرد، دوای حەرِبـی نەوەد و سـێ، کـرایە سـێ ویلایەت.

٥٢٨/١٠

## سەڵاوەتی من بووە حەفتسەد!

بـابم فەرمـووی لە بەغـدا شـەوێ چـوومە خـدمەت حەزرەتـی کـاك ئەحمەدی شێخ لە ئاستانە موسافیر بوو، شەوەکە شەوی جومعە بوو، پاش نوێژی عیشا فەرمووی: با نەختێ سەلاوات لێدەین!

دەستمان کرد بە سەلاوات لێـدان، بە دزی. ئـێمە دەوری تەسـبیحمان تەواو نەبووبوو، شێخ فەرمووی: ئی من ئەوە حەوت سەد!

پاش سەلاوات، شەخسـێ حـاجی مەلا عەبـدوڵڵای حـاجی مسـتەفای بـابی تـاهیر چەلـەبی خۆمـان عەرزی کـرد: قوربـان ئیزهـاری ئەوەنـدە سەلاواتە باش بوو؟

فەرمـووی: نـا، لام وابـوو ئـی ئێـوە سـەدی تەواو نەبـووە، ئـی مـن حەوسەد. عوجبەکم هاتە دڵ، لە ترسی عوجب ئیزهـارم کـرد، تـا خێـرم نەمێنێ، وە نەفسم بشکێ!

گەلێ جار مامۆستا مەلا ئەحـمەدی کـۆر[2]، بە ڕۆژوو ئەبـوو، ڕۆژی

---

(١) دەکاتە ساڵی ١٨٧٥ی میلادی.

(٢) مەلا ئەحمەدی کۆر کوڕی باباڕەسووڵە، لە نەوەی پیرخدری شاهۆییە لـە سـاڵی ١٨٢٥ لە گوندی ئۆمەرگومبەتی کۆیە لەدایك بـووە. لـە سـاڵی ١٩١٦کـۆچی دوایـی کردووە. مەلای گەورە زۆری خۆشویستووە و لە تەفسیرەکەیدا زۆر پەسـنی ئاکـار و تەقوای دەدا.

درێژ، گەرم، چارەگێ پێش مەغریب، لەسەر قسەی من، یا کەسیتر:

تووخوا مامۆستا ئەگەر ئەودانە ئالی بالیییەی نەخۆی!

مەسەلەن، دەرحاڵ ئەیخوارد، بە دزی بە منی ئەفەرموو: ئەوەم بۆ باشترە، نەفسم زۆری پێ ناخۆشە ئەڵێ: بۆ چارەگێ، ئەجری ڕۆژێ ئەبەی!

بەڵێ هەرچی پیاو چاك بیکەن، لە ویجدان و زەوق خۆشە، ئەمما بە تەقلید زۆرم لا گرانە، بێ مەعنایە. بەعزێ زەوات ئەکەونە مەقامی شهوود، ئەننەهو غەیری خوا کەسیان لا نامێنێ، ئەوانە بەس زیکری جەلالە ئەکەن، الله الله الله حەتتا حەرفی نیداشیان لا نییە. بەڵکو لەفز نامێنێ، ئەکەونە مەحزی یاد، زۆر چاکە، زەوقییە، ویجدانییە، لەخۆچوونە، لە خەوبوونە، مەحوە. ئەمما کەس ئەبینی، ئەوەندە مەشغوولی دنیایە، ئەسلەن خوای لە یاد نییە، زیکری نەفی و ئیثبات ناکا، ئەڵێ: یادی غەیری تیایە!

مونافیقێکی بەڕاستی، یادی خوات کردیە؟ ئەوانە ئەوەندە بە تەماعن، خەریکی دونیان، وەکی کوردی ئەڵێ: بە ددانی مووی لە قوونێ سەی دەردێنێ! زیکری لا إله إلا الله ی ناکا، وەك بە لەعنەت بێ، تەقلیدی جەهالەت و حەماقەتی بەعزێ تەفسیری نیعمەت بە نبووەت، بەعزێ بە قورئان ئەکەنەوە.

٥٤٤/١٠

## لە مەککە بابم هاتە ڕووحدان، من ئەگریام!

بابم فەرمووی کە سەیدای مەجذووب هاتە کۆیە، لەبەر پەنجەرەی لای شەرقی مزگەوت جێمان بۆ چاکرد. کە هات نەیتوانی لەوێ دانیشێ، فەرمووی:

زەواتێ زۆر گەورە لێرە دانیشتینە، ئەمن ناتوانم لە جێی وان ڕۆنیشم!

فەرمووی: دوایە هاتە بەرچاوم، بە عەیانی، دڵی هێنامە دەرێ، بە قەڵەم بڕەکی بەعزە زەرنووقە زەرنووقەی وەکی ژەنگی لێ ئەکردەوە، تا

خاوێن بۆوە. دوایە بە قەلەمێ واضح بە میدادی نوورین، کەلیمەی الله ی لە دەوری دڵم نووسی، دڵی لە جێی خۆی دانامەوە.

بابم فەرمووی: لە مەککە بابم هاتە ڕووحدان، من ئەگریام. فەرمووی: عەبدوڵلا مەگری، ئەو کەلیمەی الله کە سەیدا مەجزووب لە دەورەی دڵمی نووسیە، هەر ماوە، نەکوژایەوە!

ئەجا ئینسان بە کەسێ وەك حاجی مەلا عەبدوڵلا و حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە بڕێ حەکایەتێ چکەڵۆکە: بابم نیوە کارەکی هەبوو، ئەمین ئەحمەد حاجی، هەمووساڵێ عەرزی مەلای ئەکرد: گاجووتێ ئی توو، یا دوو مردینە. ئەبێ گاجووتێ یا دوو گاجووت بکڕی!

ئەیفەرموو: ئەدی ئی توو نامرن؟

ئەیوت: نا!

ئەیفەرموو: بۆ؟

ئەیوت: کاری خوایە، قەزا و قەدەرە، ئی توو ئەمرن، ئی من نامرن!

ئەیفەرموو: ئەوە چ مەعنای نییە، قەزا و قەدەر هەر بۆ گاجووتی من هەیە، بۆ ئی توو نییە!

دوایە فڕو فێڵی جوتیار و نیوەکارانیان عەرز کرد، ئەوجا گاجووتەکانیان هاویشتە بەر یەك، یەعنی هەموو موشتەرەك. ئەوجا ئی جەنابی مەلاش دەوامیان بوو، ئیصلاحی قەزا و قەدەر کرا.

٦٠٨/١٠

## کورد دوو مەلای موفەککیری بووە

من گەلێ جار ئەڵێم کورد مەلای کتێبیان زۆر بووە، ئەمما مەلای موفەکیر کە بتوانێ لە زیهنی خۆی بە گوێرەی مەقام قسە بکا دوو مەلایان بووە، یەکی موفتی زەهاوی، ئەوی تر بابم ڕەحمەتی خوایان لێ بێ.

حەققەن ئەو دوو زاتە لە نەوادیراتی دەهر بون.

٢٤١/٢

## مەرقەد و قەبری کەری پیرێژنێ

بە عمومی لە وڵاتی ئێمە چەند چاك و پیر هەن: ئۆمەرمەنـدان، خـاڵ خاڵان، مامۆستا کەرەم، چاکی زایەری، مەلا مرادی، چنـارۆکی خۆمـان. کە ئەلئان تەفسیر و شـەرحی ئەو ئـایەتە لە چنـارۆك ئەنوسـرێ (حـاجی ڕەسوول)، ژنان بۆ ئاوس بوون ئەچنە سەریان، زیارەتیان ئەکەن. گیسـك و جەرگ و نـاو دڕك و سـەر و پێچکیـان بـۆ ئەکەنە خێـر، بـۆ حـاجی ڕەسوول شەرتە ژنەکە لە دوور دابەزێ، بە بێ دەرپێ ڕوو لە مەرقەد کا، بە غار بڵێ حاجی ڕەسوول لە گوڕ هاتم بۆ کوڕ هاتم.

بەعزەکیان ئەبێ ژنەکە حەوت جار بەم لاو بەولای قەبرەکە بە لینگی ڕووت بازدا. هەی کاکی خۆم لەناو قەبرەکە صەفا ئەکەی! ئەوجا ئەگەر ئاوس بوو کوڕی بوو، ئەڵێ: ئەو زاتە پێی کەرەم کـردیمە. ئەگەر زێـدە مسـوڵمان بـێ ئەڵـێ: خـوا بە تکـای ئەو زاتە موبـارەکە پێـی بەخشـیون. ئەکسەری ئەوانەی بە بێ چـوونە حەج پێیـان ئەڵـێن حـاجی، مەحصـولی هیممەت و بەرەکەتی حاجی ڕەسوولن.

وە سائیری مەملەکەتی دیش بەو مینـواله چەنـد مەراقیـدیان هەیە، بـۆ ئەو نیـازە ئەچـنە سـەریان. حەتتـا لە لای دۆڵـی سـەحابان، قەبـرێ هەیە قەبـری (کەری پیرێژنـێ) دەڵـێن مەخصوصـی وڵاغ ئاوسـکردنە. ئەوەی وڵاغی نەزێ ئەچێ گیسـکێکیٚ ئەکـاتە خێـر، گۆچـانێ یـا بەرچیغـێ لە دەورەی قەبری ئەچەقێنێ بە نیـازی وڵاغ زان. ئیتـر ئـێمە چیمـانە بەسـەر حەزرەتـی ئـادەم؟ ئەگەر تووشـی ئەم شـیرکە بـووبێ چ جێـی تەعـنە لە ئەولادی، خصوصی جوهەلا؟

ئیعتیقـادی ئەنـام دەرحەق بە شـێخ و ئەولیـای مـردی و زینـدی زۆر بەقووەتە. عەلی ئەفەندی هەولێری لە سراج السالکین ئەڵـێ: شـێخ حسـام الـدین ڕۆژێ بە دەروێـش حەسـەنی وت ژنەکەت ئاوسـە، حەمـلەکەی کچە، ئەوا زەکەرێکمان پێوە چەسپاند، یەعنی کردمانە کوڕ. سبحان الـله ئەوە فوق الشرکة!

خودا کچی خەلق کردبوو شێخ کردی بە کوڕ! پیاوێ وا ئەو نەوعە قسە بکا، ئەبێ خەڵکی تر چ بلێ؟ ئەو شیرکە عیلاج ئەکرێ! دەنگی دین و ئیعتیقادیاتی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتی وەرگرتیە. (کرامة الاولیاء حق) ئەدی! خولاصە ئەو طوروقانە ڕێی کوفر و شیرکیان بۆ مسوڵمانان گوشاد کرد بە تەرزێ، کە بە ڕێی وەحدانیەت و ئیمانی ئەزانن.

بابم ڕەحمەتی خوای لێ بی، فەرموی: کە چووین بۆ غەزای قارس و بایەزید[1]ساڵی١٢٩٤هیجری، ڕێمان بەناو پسمامان[2] کەوت، سەید عەبدولکەریمی سۆزی، لە بەتبۆ لە هۆبە ماڵێ، پیاوێ منداڵێکی هێنا لای شێخ دوعای بەسەردا بخوێنێ، شێخ دوعای بۆ کرد، وتی خوا عومری درێژ کا.

وتی بابۆ وا مەبێژە! خودێ دوو کوڕی دامێ بردیەوە. ئەو کوڕە شێخ (یەعنی عوبەیدوڵلای نەهری) پێی کەڕەم کردم، دوعای بکە شێخ عومری درێژ بکا!

حیکایەت زۆرە خولاسەتولکەلام ئەو شیرك و کوفری ئەمڕۆ لەناو مسوڵماناندا هەیە، حاشا لەناو موشریکینی عەرەب نەبووە.

٢٩٣/٣

## بابمم لە خەو دیت!

پاش وەفاتی بابم، شەوێ لە خەوما دیت، تەشریفی لە مەدرەسە بۆ لای ماڵێ ئەهاتەوە. منیش ئەچووم بۆ مەدرەسە، لەوسەری کۆڵان ڕاوەستا، ئەمنیش لەم سەری کۆڵان ڕاوەستام. دیتم زۆر بە ڕق بوو لە ڕقان ڕەنگی سوور هەڵایسا بوو، بە توندی فەرموو: ڕۆڵە ئەوە مەعنای چیە بەعزە کەس بە سەییئاتی ئەولاد تەعن لە بابی ئەدەن؟

(١) شەڕی نێوان ڕووس و عوسمانییەکان (١٨٧٧-١٨٧٨ز) بوو، کە هاوپەیمانی ئەرزەسۆکسی ڕۆژهەڵاتی و هەندێ وڵاتی بەڵقان بە سەرکردایەتی ئیمپراتۆری ڕووسەکان بوو دژی عوسمانییەکان.

(٢) پسمام هۆزێکی کوردن.

عەرزم کرد: وائەبێ بـاب خولـوقێکی بەدی هەیە، ئەممـا بە عەقـڵ و کەیاسـەت دایدەپۆشـێ، ئەسـەری دەرنـاکەوێ. ئەو خـولقە خـراپە بە حوکمی وراسەتی مەعنەوی بۆ وەلەدی نەقل ئەکا. ئەویش ئەو کیاسەت و سیاسەتەی نییە ئەثەری بزرکا، شەرارەی دەرئەکەوێ، زەرەرە بە عیبـاد ئەگەیەنێ. بۆیە لۆمەی بابی ئەکەن!

بە جەوابەکەم مەسروور بوو ڕقی نەما، فەرمووی: ڕاست ئەکەی.

٣٢٥ /٣

## خەونێکم!

چەند ساڵێ لەمەو پێش لە خەومـا (بـابم، شـێخ عەبـدولکەریم، شـێخ مەعـرووف و شـێخ محـی الـدینی کـوڕانی بـابە شـێخ، بە کـۆمەڵەیی لە مەوقیعێ دانیشتبوون. منـیش نەختـێ لەوان دوور لە تەڕەفـی شـەرقی وان پاڵم بە پـێچکەی تـاقێ دابـوو. لە پشـت سـەرم تـاقێ شـکل موغەیریـانە هەبوو، دەنگێ هات و ئەمانزانی لە جیهەت حەزرەتی کیبریائی بوو (وما أنا بظلام للعبید) بوو، بابم و وان هەموویان سەریان نەوی کرد. هەیبەتی خوا ئیستیلای کردن، من هەسـتام بە گریـانەوە وتـم: کەس حەددی نییە بڵێ تۆ زاڵمی! ئەمما ئەو قوڕبەسەرییەی بەشەر تێیدایە چییە؟

بە گـرین و لەرزەوە بە خەبەر هـاتم. زۆر نەچـوو تەعبیـر دەرکەوت شێخ مەعرووف وەفاتی کرد، دوای ئەو شێخ محی الـدین، دوایـێ شـێخ عەبدولعەزیز کوڕی شـێخ مەعـرووف ڕۆیـی، بـووە برینـی سـەر هەمـوو برینان! تەکیەی هەلەجە مع الاسف تێك چوو!

١٦/٤

## خۆی و کەرێ شین!

روئەسای دینی جووان و دیانان، ئوممەتی بێ چـارە بە قسـەی وان ئەکەن، پێیان ئیغوا ئەبن، ئەوانیش بۆ تەمەعی ماڵ، خۆیان ئەکەن بە ضال

و مضل! بە درۆ و دەلەسە بەهەشت ئەفرۆشن. جەهەننەم ئەکڕن، بە پارە و بەرائەت غوفرانیان بۆ ئەنووسن. زوهد و تەقوا ئەکەن بە دوای دونیا. خوا ئەزانێ قوببەکانی زێڕ و قەفەسەکانی زێڕ و زیو و پۆلا، مەحصولی ئەقوالی باتیڵەیە.

سبحان اللە چەشم بەندی وا ئەکەن، کە حسسی هەموو عالەم بە غەڵەت ببەن، حەتتا زەکاتیش نادەن، دونیا لەسەر قەومیان ژێر و بەرە ژوور بێ پولێکی سەرف ناکەن! بەڵێ بۆ جەلبی عەوام نان ئەدەن، ئەستووکە جۆ و، دۆی ترش، وشکە توو، شۆربای بێ تام، کە بۆ ڕیازەت داران دەست بدا. گەلێ کەس چووینە دێیێ، خۆی و کەرێ شینی، بە ناوی تەریقەت و دەست لە دونیا هەڵگرتن، خەریکی تاعەت و عیبادەت بووە. قاقەناسی گەیاندیتە خۆی لە برسان، ئەگەر ڕەقەنانێکی بە دوو گۆڵم ئاو خواردبا، دەستی ئەکرد بە فنگەفنگی گریان، ئاه، ئۆفف، ئێمە لە حیسابی ئەو نیعمەتە چۆن دەرئەچین؟ تا وەك فریزی ڕەگی دادەکوتا، هێندەی پێ نەدەچوو ئەبووە مالیکی دێیەکە! ئەهالی ئەصلی ڕووت و ڕەجال ئەهاتنە دەرێ! گەلێ کەس لە گاوان و شوان بەو حیلەکاریانە بووینە ساحێب خەزانە و ملیۆنێر! وعلی الدوام بە مەزموونی ئەو ئایەتە خەڵکی ئەترسێنن! خاسەتەن لەسەر قەولی ئەبازەڕی ئەڕۆن، ئەوەی لە حاجەت زیاتر دابنێ، بە کەنز حیسابە! نەقدو حبوبات فەرقی نییە، ماڵ بێ و بەس! ئەوانە چ جای ئینفاقی فی سبیل اللە، بێ وەسیەت ئەمرن! خولاصە دونیا لەبەر چاوی خەڵك ئەخەن، تاکو بۆ وان بێ!

بابم ئەیفەرموو: مەلا حەبیبی پێبازۆکی لە ئەییامی فەقێیەتی دا، ئەگەر بیزانیبا ئەو شیوەی بەبەر خۆی و ڕەفیقەکەی کەوتیە بەشی دووان ناکا، تفی دەهاویشتە ناو شیوەکە، ڕەفیقەکەی بێزی ئەبۆوە، نەیدەخوارد. خۆی بە تێری ئەیخوارد!

فی الحقیقە ئەو ئایەتە (وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ) ئینزاری تیایە بۆ مەلای شیعان و موتەشەییخانی ئێمە. ئەمما عولمای سوننەی بەستەزمان، ئەکسەریان موحتاجی لوقمە نانێکن!

٥٣/٤

## شیفا و ئایاتی شیفا!

نازانم بە کوردی لە جێی (وعض) بڵێم چی؟ بۆیە بێ ئیفرات و تەفریتە! هەر واعیزێ بە گوێرەی مەیلی تەجاوز ئەکا لە حەدا! (وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ) لە ئەمرازی قەلبی. دڵ لە ڕەزائیل لە قەسوەتی جاهیلی، لە ئونوسەت و خنوسەتی مەسیحیین، لە بەعزێ موتەصەوویفینی، لە حەسادەتی مەلایانی موتەحەسسیدین، پاك ئەکاتەوە!

لاشەك لێرە ئەوە مرادە، نەك شیفا لە ئەمرازی و ناساغی جەسەدی! بەڵێ ئایاتی شیفا دەنووسرێتەوە، زۆر وا ئەبێ نەخۆش، دوای سوانەوەی، ئەیخواتەوە، خوا شیفای ئەدا! حەزرەتی کاکە ئەحمەدی شێخ ئەیکرد، وە ئیجازەی دابووە بەعزێ زەواتی کیرام، یەك لەوان، بابم بوو. یەك لەوان مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئۆمەرگومبەدی[1] بوو –ڕەحمەتی خوایان لێ بێ-. بەڵێ وایە، بەڵام خوای تەعالان بۆ شیفای دەرد و ناساغی، قەواعیدی داناوە! ئیعتینا بە وان، لازمە! ئەمما مع الاسف ئێمە حالەن، مەحرومین! مەعنەویاتمان چوو، ماددیاتمان نەبوو!

١٤١/٤

## زۆر گرنگە ئینسان سیاحەت بکات

جاران ئینسان ئەگەڕا گەلێ لە کوردستان بۆ ئێران، لە ئێران بۆ تووران، حەتتا لە وڵاتی تاڵش و ڕەشت و خلخال و گێلان فەقێ ئەهاتنە وڵاتی ئێمە بۆ خوندن. زۆر منداڵ بووم بە فکرمە فەقێیە ئیجازەی لە بابم وەرگرت پێیان ئەگوت مەلا یاسینی مەغریبی، خەڵکی لای تونس بوو، ئێستا لەبەر سەییئاتی سیاسەتی دوەل ئەوە نەمایە کەس ناتوانێ بجووڵێتەوە. لەو مەشی و حەرەکە ئیکتیفا بە ظاهیری سەطحی مەکەن

---

(١) ناوی ئەحمەد کوڕی محەممەد ئۆمەرگومبەتە، مەلایەکی زیرەك و بەتوانا بووە، سالی ١٨٨٧ لە گوندی دووسەرە مەلا بووە، ناوبراو دەربارەی تەسەووف و جەزبەی سۆفییان دانراوی هەیە.

بیکۆڵنەوە بیکێڵن لە جەواهیری دەروونی ئیستیفادە بکەن.

زۆر خۆشە بە فائیدە ئینسان مەلا و زوبانزان بێ وە بە سەروەت بێ لەگەڵ یەك دوو ڕەفیقی باش سیاحەت بکەن، لە ئەتراف و ئەکناف، ئەرزی بگەڕێن، مەشهوودات بنووسن.

١٩٩/١٠

## جادووکەران بە یەك دوو هێلکەی سەرقەڵەمانە گوزەران ناکەن!

چەند ساڵ لەمەوپیش، شەخسێك هاتە کۆیێ، لە حزوری باوکم و شێخ عەبدولکەریم بەرزەنجی، گەلێ چشتی عەجایبات و غەرایباتی کرد. حەتتا لە من، چوار پوولە سۆرکەی سکەی عوسمانی وەرگرت، هاویشتییە ناو کاسەیێ ئاو، دەسەسرێکی بەسەردا دا، نەختێ پستەپستی کرد. پولەکانی هێنایە دەرەوە، عەینەن لیرە بوو بە زێڕی خالص و پاك، بە تاریخ و طورەی شاهانە!

من پێم گوت: مادەم ئەمە ئەزانی، بۆ ئەگەڕێی بەم لیباسە شڕ و ونجڕە، لەمێ و لەوێ ئەخولێیەوە؟ هەر وەقتێ ئارەزووت کرد یەك دوو پولەکە سۆرکە بکە لیرە و بۆ خۆت زەریف گوزەران بکە.

گوتی: قوربان ئەوە (بۆفە، رووکەشە، موزەخرفە)، کەم وەقتێ خۆی بە لیرە ئەنوێنێ، پاشدان ئاشکرا ئەبێ. نیهایەت سەرم بە هیلاك ئەچێ.

دوایی لیرەکانی هاویشتەوە ناو کاسەکە، بەعەزێ ئەفسوون و مەفسوونی پێداخوێند، هێنایەوە دەر پولە سۆرکەکانی خۆم بوو. بەستەزمانە بەو نەیرەنگی و شعبەداتە، بووبووە سەرسەری و سوالکەر.

بۆیە ئەمانە[1] بە یەك دوو هێلکەی سەرقەڵەمانە گوزەران ناکەن ئەبن بە سوالکەر، لێرەو لەوێ ئەخولێنەوە. بێ قەدرو قیمەت و سفیل و سەرگەردان ئەبن.

١٢٩-١

---

(١) ئەم دوو پەیڤە خۆمان دامانناوە، چونکە لەناو ئایەت و تەفسیرەکەدا ماناکەمان هەڵێنجاوە.

## حوققەبازانی ئێرانی لە کۆیە!

چەندێ لەمەوپێش جەماعەتێك لە حوققە بازانی ئێرانی هاتنە کۆیێ، لە حەوشەی قەهوەخانەی موتتەصیل بە مزگەوتی گەورە، گەلێ ئیشی سەیر سەیریان کرد. بانگی مسوڵمانانیان ئەکرد:

ئەی برادەران! پێمان هەڵمەخەڵەتێن، بەخودا ئەوە گشتی پروپووچە. حەقیقەت نییە. دیارە ئەربابی ئەو صنعەیە لە کۆیە نین، ئەگەر ئێمە لە تەبریز بواین لەمێژبوو حیلەمان بەدەر ئەکەوت.

لەسەر ئەو ڕاستییە گەلێ ئافەرینم لێ کردن. لەگەل ئەوەشدا ئەگەر بەناو شێخاتی بهاتبوونایە و ئەو عەجایبات و غەرائیباتانەیان بنواندبایە، گەلێ کەس پێی هەڵئەخەڵەتان، ئەبوون بە مریدیان. گەلێ ماڵیان بەدەست ئەکەوت و بە کەمالی حورمەت ئەژیان. جا چشتی زۆر خراپ بوو.

## حیکمەت لە گاوانیش وەربگری پێی عەیب نییە!

وەك لە حەدیس ئەفەرموێ: حیکمەت چشتێکی بزربووە بۆ موئمین، لە هەر جێیەك بیبینیتەوە ئەیگریتەوە. بەڵێ ئەوی (توشنە لەبی)[1] حیکمەت و عیرفان بێ، ئەگەر حیکمەت لە گاوانێك وەربگری، پێی عار نییە.

لە سەرەتای تەحصیلم باوکم فەرمووی: ڕۆڵە وەسیەت بێ تەحقیری نووسراو مەکە، هەرچی دەستت کەوت موتالای بکە، خالی نابێ لە فائیدە. فی الحقیقە فەرموودەی باوکم زۆر نەفعی بۆ من بوو. ئەز جوملە ڕۆژێك دەرسی توحفەم ئەگوت لە باسی (قصاص)، تووشی مەسئەلەیەك بووم: کەسێك زەهرێکی کەم لە ڕێی دەم بداتە کەسێك و بمرێ، قصاصی لەسەر نییە. ئەمما ئەگەر لە ئەعزای خاریجی، بە دەرزییەك

---

(١) واتە تینوو

زەهری کەم باوێتە ناو بەدەنی کەسێك و بمرێ، قصاصی لەسەرە. من جیهەتی فەرقم بۆ مەعلووم نەبوو. تاکو پاش بەینێك تەماشای جەریدەی (ثروت و فنون)[1]م ئەکرد، موباحەثەیەکی لەبەینی دوو جەڕاح ذیکر ئەکرد، یەکێك ئەیگوت: لە زەردێنەی هێلکە زەهر هەیە، بۆیە گەلێ جار برینێك، کە مەرهەمی هێلکەی لەسەر دابندرێ، تەشەنا ئەبێ کێمی لێ پەیدا ئەکا.

ئەوی تر ئەیگوت: ئەگەر وابێ ئەبوایە ئەهلی پاریس هەموو بمرن چونکی بێ حەد و حیساب سالێ هێلکە ئەخۆن. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ قەید ناکەن.

دختۆری یەکەم جوابی دا گوتی: زەهر لە هێلکە کەمە، بە خواردن حەرارەتی مەعیدە و جگەر، قووەی هاضمە مەنعی تەئثیری ئەکەن، بەڵام لە خارجەوە قووەتێکی وا نیە، کە مودافەعەی ئەو زەهرە کەمە بکا. بۆیێ تەئسیر ئەکا، ئەوجا لەو ماجەرایە حیکمەتی مەسئەلەکەی شەرعیم لێ مەعلووم بوو و زۆر مەسروور بووم.

کەوا بێ تەحقیری حیکمەتی ئەرستۆ و ئەفلاتوون بۆ مسوڵمان نەهاتووە. تەماشا بکەن ئەوی چاکە قبوڵی بکەن و ئەوی خراپە ڕەدی بکەن، تەنفیری عیباد لە حیکمەتی حوکەمای ئیلاهیون، بێ شك لای خودا و پێغەمبەر خۆش نییە.

٣١٣/١

سەردانی (احتشام السلطنة) ی ئەرکانی ئێران بۆ لای مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە

چەندێ لەمەو پێش شەخسێ لە ئەرکانی حکومەتی ئێران مولەققەب بە احتشام السلطنة بۆ مەسئەلەیەکی سیاسی بە کۆیەدا چوو بۆ موصل زیارەتی باوکمی کرد. باوکم دائیر بە ئیتیحادی ئیسلام، بەعزە فەرمایشی

---

(١) ثروت فنون گۆڤارێکی ئەدەبیی و ڕۆشنبیریی سەردەمی عوسمانییەکان بوو، لە سالی ١٨٩١ یەکەم ژمارەی لێ بڵاوبوویەوە. خاوەنەکەی ئەحمەد ئیحسان تۆکگۆز بوو. دواتر کۆمەڵەی ئەدەبیی فەجری ئاتی سەرپەرشتیان کرد و تا سالی ١٩٤٤ بەردەوام بوو. بە یەکێك لە گۆڤارە هەرە زیندوو و ناسراوەکانی تورك دادەنرێت.

فەرمووی، کە لە خدمەتی هەستا وتـی: ئەگەر عـالەمی ئیسـلامییەت چـوار مەلای وای هەبا، ئەم شیقاق و خیلافە لە بەینی ئێمەدا نەئەما.

١٤٧/٢

## موجەدیدی دین مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە لە سابڵاغ

لە تەئریخی ١٣٠٩هـ، باوکم بە ئەمری پادشـاهی ئـالی عوسـمان، بـۆ مەسڵەحەتێك چووە سابڵاغ. حاکمی سابڵاغ عەلی خان ناو، پـاش چەنـد مەجالیسە، کە لە فکر و عولووی و هیممەتی باوکم تێگەیشـت. دەفـعەیە لە مەجلیسێ گەورە گوتبووی: من هەر مەلایەکی دیبووم، عـیلم ئەوانـی گەورە و قیمەتتدار کردبوو، ئەمما ئەشهەد و بیللا حـاجی مەلا عەبـدوڵلا ئەفەنـدی عیلمـی قیمەتـدار و گەورە کردبـوو. لە هەمـوو مەسـلەکێ ئەو نەوعە زاتە بە نـادر هەڵـئەکەون. منـیش لە ناوەنـدی دڵـمەوە ئەڵـێم: بە ئیخلاص، بێ ڕوو(ڕیا). ئەشهەد و بیللا حەزرەتی محمد المصطفى خاتم الرسل پێغەمبەرایەتی ئەرزونـدە کـردووە. وە بـاوکم موجەددیـدی قرنـی چواردەمینی هیجری بوو، بەڵام لە زاویەی کۆیە بە زایع چـوو. ئەگەر لە جێیەکی وەکو میصر بوایە، نەفعی ئەو بۆ ئیسلام لە محەممەد عەبدە زیـاتر ئەبوو، وە صەیتی لە صەیتی ئەو دوورتر ئەڕۆیی.

١٦٤/٢

## خوتبەی باوکم و هاووهووی دەروێش!

منـداڵ بـووم بـاوکم ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ، خـوتبەیەکی زۆر موئەسـیری خوێنـدەوە، دەروێشـێ گەلـێ هـاووهووی کـرد، پـاش نـوێژ ئەمری کرد، کابرایان هێنا. فەرمووی تۆ ئەو هەرایەت بۆ کرد؟ نەتهێشت مسوڵمانان بە تەواوی گوێیان لە خوتبەکە بێ؟

وتی لە شەوقی خوای.

فەرمووی تۆ خوای ئەناسی؟

وتی من هەندە هەندەی نازانم، خوا و پێغەمبەر و غەوسی گەیلانی ئەو عالەمەیان خەلق کردییە.

٣١٦/٢

## بەشەر بە زۆری دەبێ خوارەکێك و پێچەکێکی بۆ بکەی!

سبحان الله بەشەر کەی بە ڕاستی بە ڕێی ڕاستیدا ئەڕوا؟ ئەکسەر ئەبێ خوارەکێك و پێچەکێکی بۆ بکەی، ئەوجا قبوڵی ڕاستی ئەکا. بۆیە موزەخرەفات و خەرافات و غەل و غەش ئەکەوێتە ناو دین، حەق بە نەوعێکی لێدێ، قابلی تەصفیە نابێ. ڕۆژێ ئەو شیعرەیان خوێندەوە:

راستی موجبی رضای خوداست

کس ندیدم کی گم شده از رهی راست[١]

باوکم فەرمووی: ڕاست ئەکا، کەسی نەدیوە بە ڕێی ڕاستدا بڕوا، تا گوم بێ.

٢٠٢/٣

---

(١) شێخ عەلی کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی خالص کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ مەلا مەحموودی زەنگەنی قادرییە. لە ساڵی ١٢٤٨ی کۆچی بەرامبەر ١٨٣٢ی زایینی لە کەرکووك لەدایك بووە. هەر لە تەکیەکەی باوکی دەستی بە خوێندن کردووە و لە خوێندندا بۆتە هاوەڵی شێخ عومەر زیائەددینی کوڕی شێخ عوسمانی سیراجەدین. دواتر بۆ خوێندن چۆتە کۆیە و لای حاجە مەلا ئەسعەدی جەلیزادە خوێندوویەتی و هەر لەسەر دەستی ئەویش ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. دواتر گەڕاوەتەوە کەرکووك و لای باوکی چۆتە نێو دونیای تەسەووف و دوای مردنی باوکی، بۆتە جێنیشینی ئەو و لە خزمەت بەردەوام بووە. ناوبراو قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەر بووە لەگەڵ زۆربەی فەرموودەکانی سەحیحی بوخاری. لە سەردەمی ئەودا کەرکووك بۆتە مەڵبەندێکی گەورەی زانست و زانیاری و خزمەتی کۆمەڵایەتی و هاوکاریی هەژار و لێقەوماوان. ساڵی ١٩١٢ کۆچی دوایی کردووە و لە یەکێك لە ژوورەکانی تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووك نێژراوە.

## ئەو میللەتە چۆن سەردەکەوێ بڵێ پایز هات و ساوارمان نەکوڵاندیە!؟

باوکم حاجی مەلا عەبدوڵلا ئەیفەرموو: بەعزە کەس لە موحارەبەی قارس و بایەزید ئەگەڕانەوە، ئەیانگوت: پایز نێزیك بووە، ساوارمان نەکوڵاندیە، بانمان سواغ نەکردیە.

ئیتر ئەو نەوعە میللەتە چۆن سەرئەکەون؟ چۆن مەحوو نابنەوە؟

٤٥/٤

## ڕۆڵە ناترسی لەبەرت نەمێنێ؟

شێخ عەلی خالصی[1] فەرموی: چواردە جزوم قورئان لەبەرکردبوو، باوکم پێی زانیبوو، خەبەری بیستبوو. فەرمووی: ڕۆڵە ناترسی لەبەرت نەمێنێ؟

ئەیفەرموو: لەو قسەی بابم زۆر ئەترسم. بۆیە دائیمە خەریك بووم بە تیلاوەتی قورئان لەبەر.

کەڕامەتێکی عەجایبم لێ دیت، قورئانی لە تەنیشت خۆی دانابوو، گاهـ گاهـ لە دڵدا تەڕەددودی ئەبوو لە ئایەتێ، وای ئەکرد قورئانەکەی بێ تەوەققوف لێك ئەکردەوە، ئەینۆڕییە ئایەتەکە، وەهاکەزا بێ نیشانە و بێ عەلامەت.

١١١/٦

---

(١) کوڕی عەبدوڵلا موخلیص بەگە، کە لەم کتێبەدا ژیانی باوکیمان نووسیوە.

## یەحیا بەگی قائیمقامی ڕانیە

یەحیا بەگ[1] لە ڕانیە قائیمقام بوو، لە جەوابی کاغەزمدا ئیمزای دانابوو (المخلص ابن المخلص) زۆر لەتیف بوو. چونکی باوکی موحتەرەمی ناوی عەبدوڵلا موخلیص بەگ بوو. وە باوکیشی لە حەقم زۆر بە لوتف و، لە حەقی باوکم زۆر موخلیص بوو.

١٥١/٨

## کێن ئەبن بە سەگسار؟!

ئەوی ئیفتیخار بە ئاباو ئەجدادی خۆی بکا، عاقیبەت ئەبێ بە سەگسار. بە جارێ لە تەبیعەتی ئینسان دەرئەچێ. بۆیێ باوکم لە زەمانی منداڵیمدا، بەعزێ ئەشعاری کوردی موشفیقانە و ناصیحانەی بۆ دائەنام. ئەز جوملە ئێستاش ئەم دوو بەیتەم لە خاطرە:

مەلازادەی نەخوندی مثلی سەگسار
دەبێ هەر هەڵپەڕێ یا وەك سەگی هار
قوول و قاچی موسڵمانان دەرێنێ
لە سفرەی زاڵمان نانێ ڕفێنێ

ئەمما مع الاسف ئوممەت وەها مەسخ بۆتەوە، عەللامەی دەورانیان لا لە مەیمون کەمترە.

٩٣/١

---

(١) کوڕی عەبدوڵلا موخلیص بەگە، کە لەم کتێبەدا ژیانی باوکیمان نووسیوە.

# ئەوەی پەیوەندی بە مەلای گەورە [1] خۆی هەیە

## من بۆ نەبوومە قوتب؟!

لە خزمەت شێخ عەلی ئەفەندی بووم لە کەرکووك، عەرزم کرد شیعرێك هەیە ئەڵێن ئی حەزرەتی گەیلانییە:

افلت شموس الاولين وشمسنا

ابدا على افق العلى لا تغرب[2]

ئاوابوو ڕۆژی ئەوانی پێشی، بەڵام ڕۆژی ئێمە قەت لەسەر ئوفوقی بڵندی ئاوا نابێ.

ئیمام فارووقی سەرهەندی[3] لە مەعنایدا ئەفەرموێ: هەر قوتبێ پێش گەیلانی هاتبێ، سەربەخۆ بووە، ئەمما ئەوی لە دوای ئەو حەزرەتە هاتبێ، وەکیلی قوتبی گەیلانییە، ئیستقلالییەت بۆ وان نییە.

---

(١) لە ساڵی ١٣٣٧ھ ١٨ی ماهی صفری مجهول، جەنابی جەلی زادە (مەلا محەممەد ئەفەندی) بووە حاکمی شەرع، وە جەنابی غەفووری زادە (محەمەد ئاغا) بووە حاکمی شار، وە جەنابی حەوێزی زادە (جەمیل ئاغا) معاونی حاکمی شار، وە چەلەبی زادە (محمد طاهر ئەفەندی) کاتبی تەحریرات، وە جەنابی حاجی عەبدوڵلا بەگ مەئموری ئەوقافی پێ سپاردراوە، وە جەنابی غەفووری زادە مەلا ئەحمەد ئیسماعیل ئاغا حاکمی صولح، وە تۆفیق ئەفەندی کاتبی شەرع، خوای تبارك وتعالی عاقبەتی بەخێر بگێڕێ.

مێژووی کۆیە، ب٢، تاهیر ئەحمەد حەوێزی، بغدا، ١٩٨٤، لا١٤٠

(٢) شیعرەکە بەم شێوەیەش هاتووە:

أَفَلَتْ شُمُوسُ الأَوَّلِينَ وَشَمْسُنَا

أَبَداً عَلَى فَلَكِ الْعُلَى لاَ تَغْرُبُ

(٣) نووسەر نووسیویەتی سهرندی. لە راستیدا سەرهەندییە نەك سەهرەندی، ناوبراو ناوی ئەحمەد سەرهندی فاروقی (٩٧١-١٠٣٤ك) یە. لە سەرهندی هیندستان لەدایك بووە و هەر لەوێش مردووە، تەریقەی نەقشبەندی وەرگرتووە و پاشان تەریقەتی موجەدیدییەی دامەزراندووە. لە بەرهەمەکانی (مکتوبات الربانية) یە.

شێخ عەلی فەرمووی: من ئەوە نازانم، غەیری نبووەت هیچ دەرگایەك نەبەستراوە، من و تۆ الضاغین، ئەگەر هیممەتی عالیمان هەبا سەعیمان کردبا، تۆ ئەبوویە ئیمامێك وەك شافیعی. من ئەبوومە قوتبێك وەك گەیلانی.

ئافەرین خودا لە شێخ عەلی ڕازی بێ، خوداوەندا یارەبی ڕێی ڕاستمان ئەوێ، ڕێی ڕاستمان ئەوێ.

٣٤/١

## برووسکە لێدان!

لەو سالانە لەلای بێلاوە [1] برووسکە لە دوو کەسانی دا، یەکێکی دەرحال کوشت، ئەوی تریان چاکی نەگرتبوو، بەلام وەك مردوو وابوو بردیانەوە چەند ڕۆژ لە جێ کەوت، بێ هۆش و گۆش، بێ خواردن و خواردنەوە. دوایی وردە وردە چاك بووەوە، لاکین پاش چەندێ لە شەخسێکی بێلاوەیی ئەحوالم پرسی، گوتی حەقیقەتەن چابۆتەوە، ئەمما ئێستاش هەر گێژ و وێژە، چ ئاگای لەخۆی نییە. ئەو نەخۆشە برووسکە لێ دراوانە، گیان و بەدەن سوتاوانە، لاشەك ئیحتاجیان بە دوو چشت هەیە، یەك سێبەر بۆ فێنکایەتی، یەك خواردنێکی لەتیف، هەم دەروون پاك بکاتەوە، هەم قووەت بدات.

٨٠/١

## بیرەوەریم لەگەڵ هیندۆسییەك!

ئەو ساڵە (١٩٢٤ز) کە لە بەغدا بووم شەخسێکی هیندۆسی طاوس ناو لەو ئوتێلە بوو، کە منی تێدا بووم. ئەویش لە حوجرەیەکی دابوو زۆر تەڕەددودی لای منی ئەکرد، لە دینی خۆی پیاوی باش بوو، ڕقیق

---

(١) گوندێکە لە دۆڵی بالیسانی ناوچەی خۆشناوەتی.

القلب بوو. ئەمدی ئێوارە و سبەینە ڕوو لە مەشریق و مەغریب، خەریکی عیبادەت بوو، کتێبێکی ئەخوێندەوە، کە لەلایان کتێبێکی سەماوی بوو. ڕۆژێ پێیم گوت: تۆ بۆ ڕوو ئەکەیتە مەشریق و مەغریب لە وەقتی عیبادەت؟

گوتی ئێمە ڕۆژ ناپەرستین، بەڵام لە وەقتی هەڵاتن و ئاوابوون ڕووی تێ ئەکەین، تا وەکوو شاهیدیمان بۆ بدا لە خزمەت خودا.

گوتم: عەجەبا بە چی ئەزانن؟ ڕۆژ عیلمی هەیە؟ ئاگاداری حاڵی ئێوەیە؟ سەنەدتان لێ وەرگرتووە، کە ئەدای شەهادەت لە خزمەت خودا بکا، وە ئەگەر ئەدای شەهادەتی نەکرد، عەجەبا خودا نازانێ، کە ئێوە عیبادەتی ئەو ئەکەن؟

کە وام پێ گوت تەماشای کردم ئاوی لە چاو هات.

گوتی: چی بکەین وایان پێ گوتووین.

ڕیوایەتیش ئەکەن یەکێك لە ڕەهبانان، پاش ڕەفعی عیسا، گوتی: من بە خزمەت عیسا [1] گەیشتم، فەرمووی: من ڕۆژم زۆر خۆش ئەوێ، هەموو ڕۆژ بە شوعاعی خۆی سەلامی من تەبلیغی سوککانی ئەرز ئەکا، بۆیە دیانان مەشریقیان کردە قیبلە. سەیری دەسیسەی ئەو نەوعە مەلایانە و حەماقەتی ئەو نەوعە ئوممەتە!

١٦٨/١

## من عەللامەم یان فەقێ محەممەدم!

فرقەیەکی گەورە لە ئەهلی کیتاب حەق بزر ئەکەن، با وجودی ئەزانن، کە حەقە، حەسادەت و عیناد، بوغز و عەداوەت، کە لە دڵدا قووەتی ساند ڕووی ئینسان لە حەق وەرئەگێڕێ. ئەو نەوعە عنود و حەسودە لە هەموو زەمانێ زۆرن، لەناو هەموو قەوم و صنفی بەشەر بڵاون، کەسێ ئەحواڵاتی ڕوحییەی ئەقوام بزانێ، تەجاربی بەشەری کردبێ، هیچ گرفتی لەو قسەدا نییە. شەخسێك لە خزمانی خۆم

(١) مەبەست عیسای کوڕی مەریەمە (سەلامی خوای لەسەر بێ).

موحیببەتی لە حەقم هەبوو، کە ناوی ئەهێنام بە عەللامەی یاد ئەکردم. تەصادوفەن ساردییەك کەوتە بەینێ، بیستمەوە، کە ناوی ئەهێنام ئەیگوت: فەقێ محەمەد.

منیش تەبەسومم کرد، گوتم: بۆ دوێنێ عەللامە بووم و ئەمڕۆ بووم بە فەقێ محەمەد؟!

١٧٠/١

## تا مەلاتر بن عنودتر ئەبن!

من فکری مەلایان چاك ئەزانم، تا مەلاتر بن عنودتر ئەبن و لایان وایە حەق ئەوەیە، کە ئەوان بیڵێن: کالشمس فی رابعة النهار. غەلەتی خۆیان لێ مەعلوم بێ، دەستی لێ هەڵناگرن. بە قونکە بیور لە تەختەی ناوچەوانیان بدەی ناگەڕێنەوە. خصوص بۆ حیفزی مەقام و نفوذی خۆیان لەسەر ئوممەت، ئەسڵەن پێ لە حەق نانێن، خۆیان ناشکێنن. هەتا بەعزێك وایان لێ دێت، لە فەرش تا عەرش حوکم ئەکا بە فەنا و نەبوون و ئاگای لە خۆی نییە، کە ئەو زەڕڕەیەکی ئەحقەرە لەو کائیناتە عەظیمە. ئەگەرچی لازمە بڵێم (الحذر! الحذر) لەو نەوعە کەسانە، ئەمما چ فائیدە ئیشی خۆیان کرد، خورافاتیان لە دەماغی مسوڵمانان ناوە و چەسپاند، ڕوحی حەیاتیان برد (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ)

١٧٩/١

## قەڵەوەکە مردبوو، لاوازەکە مابوو!

ئەڵێن دوو کەس، یەکێك زۆرخۆر و قەڵەو، یەکێك کەمخۆر و لاواز، چوونە شارێك، بە جاسووسی ئیتیهام کران. لە ژوورێك حەپس کران، سدالبابیان لێکرا، پاش دوو سێ ڕۆژ سەریان لێدان، دیتیان قەڵەوەکە مردبوو، لاوازەکە مابوو، تەعەجوبیان کرد! هۆشمەندێك گوتی: ئەمە عاجباتی نییە ئەگەر بە عەکسەوە بوایە عەجایب بوو، ئەوەی قەڵەو

فێری برسیایەتی نەبوو مرد. ئەوی لاواز فێربوو قەیدی نەکرد.
ئێمەیش لە زەمانی قاتی و گرانی ساڵی ١٣٣٦هـ، دیتمان گەلێ کەس، کە بە لذائذ فێرببوو لەبەر بێ ڕزقی نەمرد، لەبەر بێ لذائذی مرد. کەوابێ ئیقتیات بۆ دونیا و قیامەت باشە.
حەکیم ئەڵێ: بخۆ بۆ ئەوەی بژی، نەوەك بژی بۆ ئەوەی بخۆی.
٢١٤/١

## تا شەڕ تەواو ئەبێ، مەشروب حەرامە لە ئێمە!

یەکێکی مەوثوق بۆی گێڕامەوە لە وەقتی حەربی عمومی، مەجبوری هیجرەت بووبوو لە ئێران بۆ ئێرە. گوتی: پێش ئیعلانی حەرب ئامیرێك لە ئومەرای عەسکەرییەی ڕووس لە سابلاغ دەعوەتێکی عمومی کرد هەموو لایەك لەسەر سفرە گردبووینەوە، ئەنواعی تەعام و مەشروباتی ڕوحی لەسەر سفرە بوو. لە ثانی دەست پێکردن بە خواردن، تەلغرافێکیان دایێ خەبەری ئیعلانی حەربی ڕووسی تێدابوو، دەرحاڵ گوتی: ئەو مەشروباتە هەڵبگرن، ئیتر حەرام بوو لە ئێمە، تا زەمانی حەرب خەلاص ئەبێ، نابێ کەس لە ئێمە موسکیرات بخواتەوە.
یا للعجب! ئەوەندەی ئەمڕۆ ئەجانیب خەریکن مەنعی شەڕاب و قومار بکەن، مسوڵمانان زیاتر خەریکن تەعمیمیان بکەن. ئەمڕۆ لەناو کوردانیش ئەوا سرایەت ئەکا! ئەمینم ئەوجا کورد نابن بە هیچ! ئەوەندی بوون لە ئەوەندیش ئەبن.. خودا ئەزانێ ڕەفاقەتی ڕوئەسای دینی ئەو عەصرە، گەلێك لە شەڕاب و قومار خراپترە بۆ عەقڵ و ماڵ بردن، وە لە زیادەخراپیش ناموس بەرباد ئەکا. بۆ سامعین دەرئەکەوێ جوابی ئەم سوئالە زۆر تەواوە، ئەمما ئەوانی سوئالیان لە ئینفاقی ماڵ ئەکرد، حەزیان لێبوو بەیانی مەصرەفیان بۆ بکا، چ صەرف بکەن؟ بیدەن بە کێ؟ خصوص ئەو سوئالە لە زەمانی حەرب بوو، ئارەزوویان وابوو کە بۆ موجاهیدان بێ.

٢٤٥/١

## فەرموودەی باپیرە مەلا عەبدوڵلام!

لای شافیعی بۆ دایك هەیە تەڵەبی رضاع لە مێردی خۆی بکات و لەسەر بابیش ئیجابەی لازمە، وەلەو لە (أجرة المثل)یش زیادبێ. بینا بە فەرمـوودەی بـاپیرە مەلا عەبـدوڵلام ئەوی تەڵاق درابێ بالاتفاق حەقی حەضانەی هەیە، تاکو ژنەکە بە قووەت بێ و لە برسان یان لە سەرمان تووشی نەخۆشی بێ شیری نەبێ. ئەوەیش دیسان لە مەرحەمەتی باوکییە، باوکیش لە قەضا ئەخوازێ بۆ خاتری جگەرگۆشەی خۆی، بە زەریفی تەماشای دایکی بکا، نەنوارێتە نەفرەت و قەتعی عیلاقەی خۆیان.

٢٦٢/١

## بۆنی بەر و باوەشی دایك بۆ منداڵ!

میللەتێك موبالات نەکا بە خزمەتی منداڵ زۆر نابی. وەك میللەتی کورد، ئەگەرچی منداڵیان زۆر ئەبێ، ئەمما سەبەب بە جەهلی دایکیان و بەخیلی باوکیان، کەمیان پێئەگەن، ئەکثەر بە دایانیان ئەدەن. خانمەفەندی نـاتوانێ بەخێـوی بکـا، لەگـەڵ ئەوەشـدا وەك بـاپیرە مەلا عەبـدوڵلام ئەفەرموێ: بۆنی بەر و باوەشی دایکی، گەلێ چاکترە بۆ ڕوح و فیترەتی منداڵ، لە خزمەت و شیردانی ئەجنەبی. وە بۆ ئەخلاقیش گەلێ تەئسیری هەیە، رضاعی طەبیعەت ئەگۆڕێ، طەبیعەتێکی ثانیەی تێدا پەیدا ئەکا، زۆر ئەبێ لەسەر طەبیعەتی ئەوەلییە غەلەبە ئەکا.

٢٦٣/١

## شیردانی دایك!

ڕەحمەت لە باپیرە مەلا عەبدوڵلام بێ: ڕازی نییە بەو قسە، کە ئەگەر

دایك تەڵەبی ئوجرەتی زیاتر لە (اجرة المثل)ی کردو ئەجنەبییەك ڕازی بوو بە کەمتر منداڵەکە بدرێتە دایان و تەعەجوب ئەکا لەو عولەمایانەی، کە بەو نەوعە فتوایان داوە، کە ڕیعایەتی صەرفی ماڵ ئەکەن، ئەمما ڕیعایەتی ئەحواڵاتی ڕوحی و بەدەنی منداڵەکە ناکەن. وە عیلمی طبی ئەمڕۆ زۆر ئیهتیمام ئەدا بە شیردانی دایك، مادام الامکان، ڕێ نادا بۆ شیردانی ئەجنەبی.

٢٦٤/١

## چۆن دڵ بڕوا ئەدا، منداڵی خۆی تەسلیمی بێگانە بکا؟

موسوڵمانێکی باش، دراوسێی ئێمە، کچێکی دا بە دایان، نەکە لادێی بوو، هەموو ئاخیری مانگان ئەینارد بۆ (جیرە) بەشارەتی بۆ ئەناردن. کە منداڵەکە الحمدلله زۆر چاکە، صیحەت و عافیەتی موکمیلە، ما شاء الله لانکی پڕ کردووە! وە بەعزەن خۆی ئەهات، زۆر خزمەتیان ئەکرد صابوون و چیت و شەکر و خورمایان ئەدایێ. ئەیانگوت: ئەو منداڵە چۆن صەبر ئەکا، تا تۆ ئەچیەوە؟ چونکە دێیەکە نزیك پێنج سەعات لە شار دوور بوو.

ئەیگوت سپاردوومە بە ژنێکی باش و منداڵەکەیش ئولفەتی پێوەگرتووە، تا ئەچمەوە ئاگاداری ئەکات. ئامان! با خێرا بڕۆم، نەوەك کچەکە عاجز بێ و بیرم بکا. بەو نەوعە تا نزیکی ساڵێك. دەفعەیەك چەند ژنێك لە ئەهالی دێیەکە دێنە شار، تەصادوف دەچنە دوکانی باوکی کچەکە، تا بەعزێك چشتی لێ بکڕن، ئەحواڵی ڕۆڵەی خۆی لێیان ئەپرسی، ئەڵێن: کچی چی؟ بۆ تۆ هێشتا نەتزانیوە، نزیکی حەوت مانگە ئەو بەستەزبانە مردووە؟

بێ چارە دەست ئەکا بە گریان. ئەوجا چۆن دڵ بڕوا ئەدا، منداڵی خۆی تەسلیم ئەجنەبی بکا؟

٢٦٥/١

## خوایە کوردەکان بکەیە ساحێب جێ!

خــودای تبــارك وتعــالی، ســاحێبی فەزڵ و کەرەمە لە حەق ناســان... گەلێ میللەتی زیندوو کردۆتەوە کە نەدەهاتە خاتر و خەیاڵ:

زۆر بـــــووە بەرخەکـــــی لەڕ و لاواز
بوویتە خورتێکی دونگ زەلام و قەڵەوا!
یـــــان منـــــاڵێکی سیســـــە مـــــردۆخە
بویتە مەردێکی گورج و گۆڵ و پتەوا!
گەلــێ مــیللەت وەهــا بەســەر کەوتــن
کە نەبێـــتە خەیـــاڵ و وەهـــم و خەو
بــۆیێ ئومێــد ئەکەم لە لــوتفی خــودا
خـــالقی مانـــگ و ڕۆژ و ڕۆژ و شـــەو
کوردەکـــانیش بکـــاتە ســـاحێب جاهـــ
(ســـــنة اللـــــه فـــــی الـــــذین خلـــــوا)

## زۆر مەلای عەللامە هەن، لە ئیدارەی ماڵ و منداڵیان دەستەوەستانن!

قووەتی بەدەنی، عیلم، تەدبیر و سیاسـەتی زیـاد کـردووە. مەشـهووره عیلمی صەحیح لە بەدەنی صەحیح دایە. خاصەتەن ئەعصاب و دەماغ، تا دەماغ ساغتر بێ، نەسیج و تەرکیبی مونتەزەمتر بێ، ئینسان عـاقڵتر ئەبـێ. عیلمی لیسانی (کل فاعل مرفوع) و (قـال) ئەصـلی (قـول)یە و تەدبیـری موڵك و سیاسەت، سەلتەنەت، پارەیەك ناهێنێ.

کەمال بەگ[١]ی شاعیر و کاتبی تورك ، لە وەقتی سولْتان عەبدولعەزیز پادشاهی ئالی عوسمان[٢] ، گەلێك تەعنی لە حکومەت ئەدا و زەمی ئیدارەی ئەکرد. بۆ تەجرەبە پادشا کردی بە موتەصەریفی لیوایەك. مانگێك نەچوو، تەلەغرافی بۆ مابەینی هومایۆن لێدا، تەڵەبی قبوڵی ئیستیعفای کرد. پادشا قبوڵی کرد، فەرمووی: کە هاتەوە بیهێننە حزوور!

کە هاتە حزوری شاهانە فەرمووی: بۆ ئیستیعفات کرد؟

گوتی قەومێکی خراپ بوون، ناڕاحەت بوون، ئیدارەیان زەحمەت بوو.

پادشاش فەرمووی (عەزیزم شاعر لگ بشقە، ادارە ملك بشقە[٣]).

زۆر مەلای موتەبەحیر هەن، کە بە نووکی قەڵەم ئەرز و ئاسمان ژێر بەرەژوور ئەکەن، ئەمما لە ئیدارەی عائیلەی خۆیان عاجزن.

٢٧٨/١

## ئەوان بە مەترەلیۆز و تەیارە، ئێمەش بە کۆنە شمشێران!

ئەورووپایی بەسەر ئێمەدا غالب بوون، بە ئیختراعی ئالات و ئەدەواتی

---

(١) سوڵتان مەبەست محمد نامیق کەمال شاعیر و ئەدیب و ڕۆژنامەنووسی ناسراوی تورکە، لە ساڵی ١٨٤٠ لەدایك بووە و لە ساڵی ١٨٨٨ لە دورگەی کریت کۆچی دوایی کردووە. بە یەکێك لە ڕابەرانی بزافی نەتەوەیی تورکی و بزافی عوسمانییە گەنجەکان دادەنرێ. بە شاعیری نیشتمان و شاعیری ئازادییش ناسراو بوو، بەرهەمی زۆری لە بورای شیعر و شانۆنامە و مێژوو و ڕۆمان لەپاش بەجێماوە.
(٢) سولْتان عەبدولعەزیزی یەکەم (١٨٣٠-١٨٧٦ز) سی و دوویەمین سولْتانی عوسمانییەکان، باوکی سولتان مەحموودی دووەم بووە، ماوەی پازدە ساڵ لەسەر حوکم بووە. هەندێك دەڵێن خۆی کوشتووە و هەندێکیش دەڵێن هەر لەلایەن ئالی عوسمانەوە کوژراوە.
(٣) ئەم رستەیە تورکییە و واتە (عەزیزم شاعیری شتێکە و بەڕێوەبردنی مولکیش شتێکی دیکەیە).

حەرب. ئێمە بە کۆنە شیر و کوتەکی قیر و ڕمب و تیر، ئەوانیش بە تۆپی سەریع ئاتەش و مەترەلیۆز و بۆمبا و تەیارە. لای گەلێکمان وابوو واجبە، هەر بەو ئالات و ئەدەواتی، کە لە زەمانی پێغەمبەر شەڕی پێ کرابوو، ئێمە پاش سێزدە، چواردە قەڕن شەڕی پێ بکەین. بە بیدعەتیان ئەزانی بۆیێ تێشکاین و شکاین.

٢٨٣/١

## مێوی مەلا ئەحمەد ئاغا!

مێوی مەلا ئەحمەد ئاغای سمایل ئاغا هەشت نۆ بەر دەدا.

٣٠٨/١

## نێرەمووك!

ئەڵێن لە ئەییامی خەسرەو [(١)]، ماسیگرێك هەبوو، ڕۆژێك ئەچوو بۆ ماسی گرتن، گوێی لێ بوو ئەهلی عیلم قسەیان لە (خنثی مشكل) ئەکرد. کابرا بە دوای کاری خۆیدا ڕۆیی، ئیتیفاقەن ماسیەکی زۆر جوانی گرت، هاویشتیە ناو تەشتێ پڕ لە ئاو و بردی بۆ خزمەت خەسرەوی پەروێز. خەسرەو زۆری پەسندکرد، گوتی (زە).

قاعیدەی وا بوو دەربارەی شەخسێکی ئەم کەلیمەی بگوتایە چوار هەزار دەرهەمیان ئەدایێ. ڕاوکەرەکە پارەکەی وەرگرت، حەرەمی خەسرەو گوتی: ئەمە ئیسرافە موقابیلی ماسییەك چوار هەزار درهەم چۆن ئەدرێ؟

گوتی چی بکەم؟

---

(١) خەسرەوی دووەم یا خەسریوی پەروێز لە نێوان سالانی (٥٩٠-٦٢٨ز) ژیاوە، بیست و چوارەمین پاشای ساسانی بووە و لە جێگای باوکی خۆی (هورمزی چوارەم) لەسەر تەخت دانیشت.

عەرزی کرد: بیگێڕەوە و پێی بڵێ ئەگەر نێرە، مێیە بهێنە، ئەگەر مێیە، نێرەی پەیدابکەوە، ئیللا نامەوێ!

شەخصەکەیان گێڕایەوە. ڕاوکەر لە جوابدا عەرزی کرد: ئەو ماسییە (خنثی)یە، نە نێرە، نە مێیە.

خەسرۆ جوابەکەی پێ خۆش بوو، گوتی (زە).

چوار هەزار درهەمی تریشی وەرگرت و ڕۆیی. درهەمێکی لێکەوت، هەڵیگرتەوە و ماچی کرد، نایە سەر سەری، پاشان خستییە گیرفانی.

دیسان حەرەمی خەسرەو فەرمووی: بنواڕە ئەو صەییادە چەند لەئیم و نامەردە، لە هەشت هەزار درهەم درهەمێکی لێکەوت و هەڵیگرتەوە و ماچی کرد و نایە سەر سەر و، ئەوجا لە گیرفانی نا، چاك وایە بیگێڕیەوە و پارەکەی لێ بستێنیەوە.

گێڕایانەوە. خەسرەو فەرموی: بۆ ئەو لەئامەتەت کرد، با ئەو درهەمە فەقیرێك هەڵی بگرتابوایەوە!

صەییاد گوتی: قوربان ئەمەم لە لەئامەت نەبوو، چونکی درهەمە صورەتی شای تێدا بوو، نەمتوانی صورەتی شاهـ ببینم بە زەلیلی بکەوێتە سەر خۆڵ و ژێر پای ئاینده و ڕەوەندە، بۆیێ بە کەمالی حورمەت هەڵمگرتەوە.

ئەمجارەیش خەسرەو فەرمووی: زە!

چوار هەزار درهەمی تریشیان دایێ، گوتی: ئەوجا بڕۆ بەسیە!

نووسی: کەسێك بە قسەی ژنی بکا، لەجیاتی چوار هەزار درهەم، دوازدە هەزار درهەم ئەدا.

٣١٥/١

## بارسووکی لە هەموو وەقت چاك نییە!

گرانی تەکلیف بە نەظەر شەخص. بە نەظەر قەوم ئەگۆڕێ. قەومێك، کە لە ڕووی ئیمان و ئیخلاص، ڕوح دانان و ماڵ سەرفکردنی لا سەل بێ، ئەبێ چی لەلا گران بێ؟

مەعلومە بارسووکی لە هەموو وەقت چاك نییە! پاپۆڕ لە بەحر باری

سووك بێ، بە سووکی ئەخنکێ، بالنسبە تا گران بێ باشە. قەومێ مەیلی زیللەت و ئەسارەتیان هەبێ، عیزەت و ئیستقلالیەتیان غایەت لەلا گرانە، خادمی نادەن بە مەخدوومی، مەئموریی ناگۆڕنەوە بە ئامیری، گزیریان لە ئەمیری پێ خۆشترە. قەومێ ئەجانب پەرست بێ، ئیتاعەی (خۆیی)یانی لا لە کێو هەڵگرتن گرانترە.

کەوابێ دیارە مسوڵمان لە سووکی ئەترسن، لە ئیستیلای ئەجانیب خۆفیان هەیە، لە تەشریعی ئەترسن، کە بە ناوی تەزکیە، سوخریە و ئیستعبادی تیا بێ، وەك شەرعی عیسا: کەسێ زللەکت لە ڕوو بدا، ڕووەکەی تری بۆ ڕاگرە، زللەکیش لەو بدا! کەسێ فرسەخێ بە سفر بیت، دوو فرسەنگ لەگەڵی هەڕوو!

زاتەن من لەمێژە عەرزی مسوڵمانان ئەکەم، هەر عەقیدەیێ، هەر ئەمرێ سەوقی کردن بۆ حەیات، بۆ عەمەل، خەفەتی ڕوحی و بەدەنی دا، بزانن ئەوە لە ئەحکامی ئیسلامییەیە. وە ئیللا غەشە. ئەساسەن لە دینی ئیسلام نییە، بۆ کوشتن ئوممەت هاویشترابی، حاصڵی، تەڵەب ئەکەن جەنابی حەق بارێکیان باوێتە سەر، خەفەتێکی ڕوحی و نەشاطی عەمەلی بدا، نەك گرانیان کا بە کەسالەت و عەتاڵەت، ڕوحیان غەلیظ بێ. ئەوی لەگەڵ فیتڕەتی خۆمان موافیق بێ، نیهایەت جرفمان کا لە خراپە بۆ چاکە. وەکو جوو بوونە ژێر دەست، خادیمی هەیکەلی (ثەوری اخرس)، موحیببەتی عەمەل چی بەسەرهێنان؟ وە هەم تەماشای مەیلی (مفرط)مان مەفەرموو، تۆ عاقبەت چاتر ئەزانی. بەینی سەهل و گران، دینی حەنیف.. ئەمڕۆ ئەتوانین ئەو سەدەماتی باری زۆر گران هەڵگرین، سبەی نا.

گەلێ هەیە مەیلی تاعەت، ئەیخاتە ژێر باری زۆر قورس، ئاخری ئەوەستێ، وەك ڕەهبانیەتی دیانان و زوهدی ئێمە.

٣٣٤/١

## ناردم لە دوو دوو دکتۆری تورك و ئینگلیز!

لە ئەوائیلی ئینقیلاب یەکێ لە ئەفرادی عائیلە نەساغ بوو. دوو دوقتوری باش لێرەبوون، یەکێ تورك و موسوڵمان نەسرەت فوئاد. یەکێ ئینگلیز میللەر. ناردم لەدوویان، هاتن پاش عەصر بوو، موعاینەیان کرد گوایا عیللەتەکەی (حەمای مرزخیە). بەوگوێرە تەرتیباتیان دانا. شەو زۆر بێ سیحەت بوو، ئەو دەرمانەی ئیستیعمالی ئەکرد، زیدە ئەلەمی ئەدا، زیتر تەحریکی کۆکەی ئەکرد. سبەینێ زوو نەسرەت هات بەتالووکە، بە مشەوەشی.. گوتم: خێرە وا زوو هاتی بێ لەدوا ناردن؟!

گوتی: لام وایە لە کەشفەکە بە غەڵەت چووین، تەشخیسی عیللەتەکەمان بۆ نەبووە.

گوتم حەقیقەتەن وا بەدەر ئەکەوێ، ئەمشەو پاش تەرتیباتی ئێوە زیادە بێ قەرار بوو، تیکراری موعاینەی کرد.

گوتی بەڵێ غەڵەت بووین ئەو نەساغییە (ذات الرئة)یە.

لەو ئانەدا میللەریش هات، نەسرەت بە لیسانی طبی عەرزی کرد، ئەویش موعایەنەی کردەوە، بە دەنگی بڵند: پاردۆن نەسرەت[1]! تەقدیری مقدرەتی نەسرەتی کرد. بالاتفاق تەرتیبێ، کە بۆ ذات الرئة موافق بێ، کردیان. شوکر نەساغەکە چا بووەوە.

١/ ٣٤٢

## بەسەرهاتی عارەبێك و هارووونە ڕەشید!

ئەڵێن عەرەبێ هاتە حزووری هارووونە رەشید[2] ، بەو حیشمەت و

---

(١) واتە ببوورە نەسرەت.

(٢) ناوی ئەبو جەعفەر هارون کوڕی محمد المهدی کوڕی ئەبی جەعفەری مەنصورە، لە نێوان ساڵانی ٧٦٦-٨٠٩ز ژیاوە. پێنجەم خەلیفەی عەبباسی بووە، لە ←

جەلالەی لەسەر تەختی عالی دیت، وتی: (السلام علیك یا الله).

وتیان هەو نییە، بەرەژێر!

وتی السلام علیك یا رسول الله.

وتیان هەو نییە، بەرەژێر!

ئەوجا وتی: السلام علیك یا أمیر المؤمنین.

دیققەت بکەن ئەوانی بوون بە ڕوئەسای عەقائید، ئەکثەری لەو نەوعە بەدەوییانە بوون... ڕەش و ڕووتی قاووت و جورج خۆر لە کەلامی ملووکانە چۆن تێئەگا؟ هەر حەملی ئەکاتە سەر مفکور موخەییلاتی خۆی.

ئەڵێن فیردەوسی[1]، لە حەپسدا، بەعزەن متأثرانە ئەشعاری ئەخوێندەوە و پیاوێکی پیر لە مەحبەس بوو، تا فردەوسی ئەیخوێندەوە، ئەویش ئەگریا.

فردەوسی شەوق و زەوقی زیاد ئەبوو، ڕۆژێ لێی پرسی بۆ ئەگریێی؟

وتی: وەسایەقەت بم، من نێریی باشم هەیە لەناو پەت، کە تۆ ئەخوێنی ڕیشت ئەجوڵێتەوە، بیری نێرییەکەم ئەکەم. لە وەقتی کاوێژ ئەویش ڕیشی وەك ڕیشی تۆ ئەجوڵێتەوە.

٣٤٧/١

## لە سایەی ئەوان بوو مەدرەسەکان نەما!

گەلێك ساحێب مێگەل هەن، دڵیان ئەکزێتەوە بۆ گۆشت، دڵیان نایە گیسکێك سەر بڕن، مەگەر نەخۆش بێ بێتە مردن. ئەو وەقتە بە کەمالی ئەسەف ئەکوژێتەوە و بە حەسرەت سندانی ئەکەن. ئەوی لە دنیا لەزەتێکی لێ ببینێ ئەهوەنە، ئەمما ئەویش چەند ڕۆژێکە ئەبڕێتەوە، ئەوی

---

ناودارترین خەلیفەکانی عەبباسییە و لە هەمووشیان زیاتر لە سەرچاوە بیانییەکانەوە باسی کراوە. لە گرنگترین دەسکەوتەکانی دامەزراندنی بیت الحکمة بوو لە بەغدا.

(١) ئەبولقاسم ئەلفیردەوسی (٩٣٥-١٠٢٠ز) شاعیرێکی فارسە و لە گوندی فازی نزیك شاری تەبارانی هەرێمی تووسی خوراسان لەدایك بووە. لە سەردەمی دەسەڵاتی سامانییەکان و قەزنەوییەکانی زەمانی عەبباسییەکان ژیاوە و خاوەنی کتێبی شاهنامەیە.

خۆشی لەززەتی لێ ببینێ و بیشییەخشێ لە ڕێی خودا صەرفی بکا، وەتەن و میللەتی پێ نەجات بدا.. بەخ.. بەخ! لەو قانزاجە، لەو سەعادەتە! ئەمەیە، کە حەزرەتی ڕیسالەت ئەفەرموێ: (ذهب اهل الدثور بالاجور).

فەقیری قەلەنـدەر چـی لەمسـت دێ؟ خصوصـی ئەمـڕۆ. ئەدەرۆف نـاوێکی یۆنـانی وەسـیەتی کـرد، یەك ملیـۆن و نیـو لیـرەی بـۆ بـدەن بە پاپۆڕی حەربی، ناوی خۆی لێ نێن بۆ حکومەتی یۆنـان، لەسـایەی ئەوە غەلەبەی کرد لەسەر دەوڵەتی عوسمانی، با وجودی لەپێش دا ژێردەستی بوو، میللەتی دی وەسیەتیان بۆ حکومەتە، حکومەتیش لە تەعالی میللەت وەسیەتەکە بەجێ ئەهێنێ. حالاش میللەتی ئیسـلام لەو فکـرەدا نیـیە... بـۆ ئۆمەرمەندان، خاڵ خالان، پیرەمەگروون، پیری دابان، خانەگای شێخ... لە سایەی ئەوان بوو مەدرەسەکان نەما.

٣٥٣/١

ئەمشەو ٢٤ی نیسانی ڕۆمی، ٢٣ی موحەڕەم قیامەتێ بوو هائیل[١]

## ئوممەت وەك حەیوان تەسلیمیان بووە!

لە سەرەتای ظهوری شەدەڵیەکان، کابرایێ مـل قەوی، ڕیـش پـان و ورگ ئەستوور، فلتە فلتی ئەکـرد. ئەیـانگوت ئەمە قورئـان ئەخـوێنێ، بە کەرامەتـی شـێخ هەر ٣٠ جـزوی قورئـانی هـاتیتە بەر. سەرسـپییەکان ئەیـانگوت ئەمە سـوربانییە، ئەمەش نەتـیجەی کەڕامەتە، ئەنـواعی درۆ، ئەزانـن درۆیە. جەنـابی حەق ئەو نەوعە کەسـانەی چـۆن خـۆش ئەوێ؟ ئەمە نەبووە و نابێ، مادەم شممەیەکی لە بەشەرییەت تیا بێ.

٣٩٥/١

حەقیقەتەن ڕوئەسای دین، ئەمڕۆ زۆر مـاڵوێرانن، لەبەر حـوببی دونیـا ئاگایان لە ئیمان بە قیامەت و عەزاب نەماوە، بە جەهـل خۆیـان مەغـرور کردووە. ئوممەتیش وەك حەیوان (لایعقل) تەسـلیمیان بـووە (نعـوذ باللـه من غضبه وعقابه)

٤٠١/١

(١) مەبەستی باو و باران و برووسکە و تەرزەیە.

## ئاگاداری مەلای بێگانە بن!

لە غەیری خۆتان لازمە لە ئەجانیب زۆر بە حەزەر بن خاصەتەن ئەو مەلایانەی ئەجانیب کە مسولمان ئەبن، تا تەجرەبەی ئەتواڕیان نەکەن لێیان ئەمین مەبن. چ ڕۆم چ ئێرانی. کوردی ئەڵێ: دۆی ئازمودە لە ماستی نا ئازمودە چاکترە.

من نایێتە دڵم مەلایەك لە دینێك بۆ دینێ ئینتیقال بکا لە غەلل و غەشی دینی پێشوو قاڵ ببێتەوە (إلا بعد حین). زاتەن تەفرەقەی کوللی میللەت لەوانە پەیابوو، ئەوانی هەم دین و هەم عونصری ئێوە نین. قسوور ناکەن لە حەق ئێوە، مەنعی نوقصان و هیلاك و موشەققەت و کول بوون ناکەن، سەعی ئەکەن لە نەقصتان بە هەموو مەعنای (خبال) سمی قاتلن. کێم و خوزاوکن، ئەعزا بە خۆرك ئەدەن عەقڵتان لێ ئەگۆڕن، لەو ئیفساداتە قووەتی خۆیان سەرف ئەکەن. مشەققەت و زەرەری ئێوە ئەحوبێنن پێیان خۆشە. ئێوە کەمێ ئینتیباهتان هەبێ تێیان ئەگەن، هەرچەندی سیاسی بن خۆیان ناگرن، قسەی وایان لە زاری دەردەپەڕێ، کە مافی الضمیریان بزاندرێ. ١٦/٢

فەللاح هەموو قووەتی خۆی صەرف ئەکا، لە کشتو کێڵ، وە تەوەککول ئەکا، لەسەر کەرەمی خوا، بۆ باران و شین کردن و بێ ئافاتی و حیفز لە سووتان، وە سەپان بەدەست کەوتن – کە ئالئان زۆر سەخڵەتین بۆ سەپان- نە مەلائیکە، نە جنۆکە، نە شێخەفەندی، نە قوتبی عالەم کەس بە فەریادمان نایەت.

٢/ ٤١

## ڕۆژێ عەرزی شێخ عەلی فەندیم کرد: ئێوە چ ئەفەرموون لە خولفی وەعید؟

فەرمووی سبحان الله کەسێك خۆی بە عەبدی خوا بزانێ ئیددیعای ئەدەبی مع الله بکا، مەسئەلەیەك عینوانی خیلاف بێ چۆن نیسبەتی بۆ خودا ئەدا؟

مـن ئەڵـێم ئەگەر تەماشـای قەهـر و غەلەبەی بـکەی، هەردوو لای جائیزە، لا یسأل عما یفعل، ئەگەر تەماشای هیدایەت و عەدالەت بکەی، هیچیان جائیز نییە، وە تەفرەقەی نەزەر، تەفرەقەیە.

٦٢/٢

## کورد بێ دایکن!

گەلێ جار ئەڵێم دیقەت بکەن، هەر عەشیرەتێك ئازا بن و جەنگاوەر، ئەوە ژنیـان ئـازان، دڵ قەویـن، بە غیـرەتن. هەر عەشـیرەتێ حیـز بـن و ترسنۆك، ئەوە ژنیان بە ترسن، دڵ زەعیفن، بێ غیـرەتن. وە لە مەجـالیس عەرزی بـرادەران ئەکەم: کـورد بـێ دایکـن، ژن لای ئەوان بـێ قەدرە، ژنەکان بنەڵۆکن، بێ عیززەت و حورمەت بوون، بۆیە کورد نابنە ئینسان. هەزار ناصیحی وەك مـن، شـاعیری وەك حـاجی قـادر [1]، بـۆ تەربییـەی قەوم، نابێ بە دایکێکی چاك.

٦٢/٢

## ئینعامی ئیلاهی!

ئینعامی ئیلاهی لە دونیا عاممە، وە بۆ ئەوانەی ئیمانیـان بە خـوا و بە ڕۆژی قیامەت نییە زۆرترە. زیرا ئەوان بە غەیری دونیا هیچ ئەمەلیان نییە، ئەگەر ئیمانیشـیان بە قیـامەت هەبـێ، بە ئـومنیەی شـەفاعەت و نیسـبەتی (أبا)یان (إعتنا)یان پێ نەماوە. بۆیە دائیمەن جەولان ئەکەن، لەو شـار بـۆ ئەو شار، لەو مەملەکەت بۆ ئەو مەمـلەکەت، بە تیجـارەت، بە قومـار، بە

---

(١) حـاجی قـادر (١٨١٦-١٨٩٧ز) شـاعیرێکی نـاوداری کـوردە، مـاوەیەکی زۆر لە ئەستەمبوڵی پایتەختی عوسمانی ژیاوە، تایبەتمەندی شیعرەکانی ئەو ئەوەیە زیاتر باسی خەمەکانی کـۆمەڵگەی کـوردی کـردووە و بە هیـوا بـووە کە کـورد ببێـتە خـاوەنی ڕۆژنـامە و لە ڕووی ڕۆشـنبیری و سیاسـییەوە بەرەو پـێش بچـێ. حـاجی قـادر کاریگەریی زۆری بەسەر فکری مەلای گەورەدا جێهێشتووە.

حیلە، ئەموال کۆئەکەنەوە. وا ئەبێ غیرەتی قەومییەتیان ئیتیحادیان ئەکا، بە حەربیش ئیستیلا ئەکەن.

٦٣/٢

## دیدارم لەگەڵ سلێمان نظیف

سلێمان نظیف[1] حیکایەتی بۆ کردم فەرمووی: لەگەڵ جەمعێ لە ئودەبا دانیشتبووین لە هەر تەرەف قسەمان ئەکرد. بەحسی حەزرەتی عیسا کەوتە مەیدان، ئەدیبێ یەهوودی لەمیانەدا بوو ڕووی کردە بەعزە ئودەبای فرەنسە، وتی: سەبەبی عەداوەتی ئێوە لەگەڵ ئێمە چییە؟

وتی ئێوە عیساتان کوشت و صەلبتان کرد.

وتی ئێوە حەقتان چییە عیسا خزمی خۆمانە، خۆمان کوشتمان ئێوە خوێنگر و خوێن ئەستێنی عیسا نین و، ئەو وەقتە کە عیسامان کوشت ئێوە وەك حەیواناتی وەحشییە لە چیا و چۆڵی ئەورووپا بە سەرتان ئەبرد، ئێستا چ موداخەلەتان هەیە؟

## نوێژکەرێ لە شەوی زستانی کۆیەدا

خوا ئەزانی شەوی زستان خاصەتەن لە کۆیێ، سەرما و بەفر و باران و باو شەختە و بەستەڵەك ئاوی سارد شووتی شەق ئەکا. مسوڵمان لە

---

(١) سلێمان نظیف کوڕی سەعید پاشا، شاعیر و سیاسەتمەداری دەوڵەتی عوسمانی بوو، لە ساڵی ١٨٦٩ لە دیاربەکر لەدایك بووە، زمانەکانی عەرەبی، فارسی و کوردی و تورکی زانیوە. بەرپرسیارێتی کاری ئیداری لە دەوڵەتی عوسمانیدا لە زۆر شوێنی بن دەستەڵاتی عوسمانی بەرپرسیاریەتی هەبووە. وەك والی لە بەسرە، قەستەمۆن، ترابزۆن، موسڵ و بەغداد کاری کردووە. هەروەها لە زۆر ڕۆژنامە و گۆڤاری ئەوسای عوسمانییەکان شیعر و نووسینی بڵاوکردۆتەوە و چەندین کتێبی چاپ کردوون. لە ساڵی ١٩١٣ وەك والی لە موسڵ بووە و دواتر گەڕاوەتەوە ئەستەنبوڵ و ساڵی ١٩٢٧ هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

جێی خۆی هەڵئەستێ دەستنوێژ ئەشوا دوو ڕکعەت نوێژی سبەینێ بەجێ ئەهێنی، هەموو بەهەشت لە پاداشت ئەو ئیتاعەیە کەمە. ئیجرای وەزائفی عبودیەت لە ئیجرای وەزائفی ئولوهییەت گەلێ زەحمەت ترە و خصوصەن فەزڵی ئینسانی موتیع لەسەر مەلائیکە چۆن ئینکار ئەکرێ؟ (الأجر علی قدر المشقة). ئاخ ئینسان خۆی خۆی ڕەزیل کردووە، سەجدە بۆ کەر و گا ئەبا، وە ئیللا ئینسان زۆر بە قەدر و قیمەتە، زوبدەی مەخلوقاتی خوایە.

حاصلی ئینسانی چاك لە هەموو شت چاترە، ئینسانی خراپ لە هەموو شت خراپترە.

٢٣٨/٢

## ڕەمەزانی ١٩٣٢ و مردنی شێخ محی الدین و شێخ عبدالعزیز

ئەو موددەی لە چنارۆك بووم هیچم نەنووسی، دوایێ چوومە تەعزیەی مەرحوم شێخ محی الدین، کە هاتمەوە ناساغ کەوتم. تەواوی ڕەمەزانم بە ناساغی ڕابوارد، لە شەشی شەووال شێخ عەبدولعەزیز وەفاتی کرد، حەققەن داغێکی نابەسەر جەرگم دائما ئەکزێتەوە. بێ هێزی کردم، جەنابی حەق بیهاوێتە ناو ڕەحمەتی خۆی. ٢٠ی شوباتی ١٩٣٥.

٢٤٢/٢

## ئەتباعی پۆلس الرسول لە هەموو شتیان تێپەڕاندیە

حەیوانی دڕندە هەموو نەوعە گۆشتێ ناخوا، ئەڵێن شێر ئیستینکاف ئەکا فەریسەی غەیر بخوا وە مردار ناخوا. گەلێ جارم دیوە پشیلە مشکی مرداری نەخواردیە، ئەوەی خۆی شکاری بکا ئەوی ئەخوا. لاکین ئەتباعی (بولس الرسول) لە هەموو شتیان تێپەڕاندیە.

٢٤٧/٢

## گەزۆ و شێلاقە

لە وڵاتـی ئـێمە لە شـاخ و داخـی کوردسـتانمان زۆر ئەکەوێ، وەك خوناوك ئەنیشێتە سەر دار و بەرد. لەو جێی تەواو فێنك بێ ئەمەیی، ڕەق ئەبـێ. لەو جێـی گەرم بـێ، یـا وشـك نـابێ، کە کـۆ بکـرێتەوە ئەوەی ئەکەوێتە سەر گیا و بەرد خەسار ئەبێ. ئەوی ئەکەوێـتە سـەر دار بـاری بـێبەر، لقەکـانی دارەکە ئەبـڕن لە ئـاوی گەرمـی هەڵئەکێشـن، ئـاوەکە ئەکوڵێنن، تا نەختێ پەیت ئەبێ بە دۆشاوی شۆك.

لە کوێسـتانان ئەوی سـەر بەردان خـڕ ئەکەنەوە، سـپی و خـاوێن، ئەکـثەری ئەینێـرن بـۆ سـلێمانی، حەلـوایەکی زۆر خۆشـی لـێ دروست ئەکەن، ئەوی ئەکەوێتە سەر (گوێن)ی لە وەقتی تەکاندندا وردە پەلك و تۆزی گوێنی لەگەڵ تێکەڵ ئەبێ، بۆر ئەنـوێنێ. ئەوی لەسـەر داران بـێ تەبیعی لە وەقتی تەکاندندا، وردە پەلکی تێکەڵ ئەبـێ سـەبز ئەنـوێنێ. وە هەمـووی زۆر شـیرین و خـۆش و بە لەزەتە و نەرم ملـی نەو، بە گەلـێ دەرمان ئەشێ. (سلوی) تەفسیر ئەکەن بە نەوعە تەیرێـك و (سـمانی) یـا نەفسی سمانی، ڕەنگە لە ئاسمانی وەرگیرا بێ. یا لەبەر ڕەنگـی سـماوی، کە ئەو تەیرە مەیلە و شینە، یا زۆر لە بڵندییە و دێ و ئەنیشێ.

گەلـێ جـار لە بـاوکم ئەبیسـت، کە تەعبیـری بە شـێلاقە ئەفەرمـوو. حەقیقەتەن شێلاقەش تەیرێکی مەیلە و شینە و زۆر نـافڕێ، بـاڵی سسـتە، گرتنی سەهلە، حەتتا کەسێکی شلەپەتە بێ، بە کاوەخۆ بـڕوا بە کـوردی ئەڵێن: ئەڵێی شێلاقەی باڵ شکاوە.

٨١/١

## بە کەنگرخواردن ئەژیان!

کێوی طور وەکی کۆسرەت و چیای سەفینی ئێمە، چیایەکی بە گیا و داروبــارە. ئەنــواعی خۆرشـــی تێـــدا هەیە.. گەلـێ کەس بەو مەوادی طەبیعیە ئەژی. حەتا لە ساڵی گرانی (١٣٣٦) ئەکثەری ئەهالی، بە کەنگر و ئەمثالی وی زۆر چاك ژیان، لە مردن دەرچوون.

٨٢/١

## ئەم نەوعە موحیببەتە عەینی عەداوەتە!

لە زەمـــانی عەبدولمـــەلیك[1] ، مەلایـــێ لام وایە (شـــعبی)[2]یە، بە سەفارەت چووە ئەستەنبۆڵ، لەپاش بەعزێ گفتوگۆ، فەزڵ و عیلمـی لای ئیمپراتۆر مەعلووم بوو، گوتی:

تەعەجوب ئەکەم لە عەرەب پیاوی وەکو تۆ هەبێ، بەو هەموو عـیلم و فەزڵە، عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان بکەنە خەلیفە. مەلاش فەرمووی:

ئەوت نەدیوە، وەئیللا منت ئەمەندە نەدەهاتە پێش چاو.

---

(١) مەبەست عەبدولمەلیك کوڕی مەڕوان کوڕی حەکەم کوڕی ئەبیلعاص کـوڕی أمیة القرشي یە لە نێوان ساڵی(٦٤٦-٧٠٥ز) ژیاوە. خەلـیفەی پێنجەمینـی ئومەوییەکـان بووە و یەکێك بووە لە زانا و شارەزایانی بواری شەرع. ماوەی خەلافەتـی عبـدالملك مـاوەیەکی پـڕ لە کێشـە و گێـرە و ئـاژاوە بـوو، بەڵام مێژوونووسـان باسـی چەنـد دەسکەوتێکی گرنگی وەك دروستکردنی یەکەم دیناری ئیسلامی لە زێڕدروستکراو و بە عەرەبـی کردنـی دیوانەکـان و ئـاوەدانکردنەوە ی وڵات و بینـای کەعـبە و دروستکردنی چەند شارێك لە عێراق و تونس و باکووری ئەفریقا.

(٢) نـاوی عـامر کـوڕی شـەراحیل کـوڕی عەبـد کـوڕی ذی کبـار ئەبـو عەمـری هەمەدانی الشـعبي یە، بە ئیمـامی شـەعبی ناسـراوە، یەکـێ بـووە لە زانـا تابیعیەکـانی سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان. لە ساڵی ٦٣٧ز لە کووفە لەدایك بـووە و لە ساڵی ٧٢١ هەر لە کووفە کۆچی دوایی کردووە.

شـــعبی گەڕایەوە، جاسووســـی عەبدولمـــەلیك پێشـــین خەبەری دا بە عەبدولمـەلیك ، ئەو گفتوگـۆیەی بـۆ نـەقل کـرد، کە مەلا بە حـزووری خەلیفە موشەڕەف بوو.

عەبدولمەلیك گوتی:

لەو قسـە کە ئیمپراتـۆر بە تـۆی گـوت، چ دەسیســەیەکی تێـدایە، تێیگەیشتی؟

گوتی تۆ بفەرموو بزانم چی تیایە؟

گوتی: ئەو مەلعوونە بەخیلی هات، کە مەلایێ وەکوو تۆ لەناو ئێمەدا هەبێ، ئەو قسەی بۆیێ کرد، تاوەکو من، کە بیستم لە فەوڕانـی غەزەب بتکوژم. ئەمما ئافەرین لە تۆ، کە جوابێکی چاکت دایەوە.

کەوابـێ ئەم نەوعە مـوحیببەتە عەینـی عەداوەتە، هەزار ئـافەرین لە عەبدولمـەلیکی کە سـاحێبی ئەو نەوعە ذەکـایە بـوو. سـەعدیش[1]چـاك ئەفەرموێ: دشمنی دانا به از نادان نادان دوست.

١٢٤/١

## نوشتەی کولفەکون!

ئینسانێك کە سەعادەتی قەوم و میللەتی خۆی بوێ، ئەتوانێ بەعـزێ ئەسبابی شەڕ بکا بە ئالەتی خێر. وەك حەزرەتی کاك ئەحمەدی شێخ، کە ئەو وفق و نووشـتە و دوعـایەی مەحضـا بـۆ خێـری فـوقەڕا و مەسـاکین دائەنا. حەتا ئەوانی گولـلەبەند و تیغ بەندیان هەڵئەگرت، شـەرتی لەگەڵ ئەکردن، کە حەتا جنێـو نەدەن، چ جـای سـەییئاتی تـر، بەڵام ئەو نەوعە زاتە زۆر نایابن، حەققەن کە بوون پێیان بڵێن مەلەك.

---

(١) مەبەست شاعیری گەورەی ئێرانـی سـەعدی شـیرازی یە، کە نـاوی ابـو محمـد مشـرف الـدین مصـلح کـوڕی عبداللـه کـوڕی موشـەڕەف سـەعدی شـیرازییە، لە دەوروبەری ساڵی ١٢١٠ی زایینی لە شیراز لەدایك بـووە و لە سـاڵی ١٢٩٢ی زایینـی هەر لەوێ کۆچی دوایـی کـردووە. شـاعیر و نووسـەرێکی نـاوداری ئێرانـی بـووە و نازناوی استاد سخن. پادشا سخن، ئوستاد بووە و بەرهەمە هەر ناسراوەکانی گولسـتان و بوستان و دیوانە شیعرییەکەیەتی کە بە کولیاتی سەعدی بەناوبانگە.

ئەلئانیش نویشتەی ژن ڕەشکردن لەبەر چاوی مێردی لەناو ئێمە و جوولەکاندا هەیە. بە یەکێکی ئەڵێن (یەکساتە) کانە وەك سم الساعة زوو تەئسیر ئەکا، یەکی تریشیان هەیە بۆ هەوێ باران ئەیکەن، کە لەبەرچاوی مێردی خۆشەویست ببێ، پێی ئەڵێن (کن فیکون)، کوردەکان ئەڵێن کولفەکون.

خودا ئەیزانێ من ئەمانە نازانم، ئەمما لە یەکی زۆر نزیك و (موثوق بە) ئەم موجمەلاتەم وەرگرتووە.

١٣٩/١

## جنۆکە لە لەش دەرکردن!

خەڵك هەیە[1] حەتتا ئەوەندە گێژ ئەبن، سەبەبی شێتی نازانن، ئەچنە لای ئەو (کلی نانیانە) عەزیمەتیان بۆ بکەن، بڵێ ئەمە جنۆکەیان چووەتە ناو دەروون:

(اخرج بحقه آه شراه، اخرج بحق سليمان، اخرج بحق قرنائيل و رفيمائيل) جا لێی ئەدەن: جنۆکەکان بڵێ، ناویان بینە: (سوژن، بوژن، تریانە، کوتك، تەبەق).

ناوەکانیان ئەنووسن، ئەیخەنە ناو ئاگرەوە ئەیسووتێنن و جنۆکەکانیش ئەسوتێن و هەم وا ئیعتیقاد ئەکەن ئەم دەوڵەت و سەلتەنەت و حشمەتی مسوڵمانان، بە سایەی دوعا و هیممەت و بەرەکەتی فلان پیری بووە. مەرقەدی فلان کەس لە فلان شارایە. حیفزی ئەکا چ حەددی هەیە دوژمن نێزیکی بکەوێ.

بە ئەمری فلان کەس تۆپ بۆ خۆی چوو بۆ مەیدانی حەڕب، لە خۆیەوە گوللەی فڕێ ئەدا، دوژمنی شکاند! کەوابێ چ ئیحتیاجمان هەیە

---

(١) دەربڕینی (خەڵك هەیە) ئێمە خۆمان دامانناوە، چونکە سیاقەکە وا دەخوازێ و قسەکە لە ناو سیاقێکی تر هاتووە کە ئەم مانایە دەبەخشێ.

بە سوپا و فنونی حەربی. وەك شێخ ڕەزا[1] لە مەدحی ناصرەددین شادا ئەڵێ:

**از انجمش سپاه فزونتر بود ولی**
**انجا که حیدر است چ حاجت سپاهرا**

خۆزیا ئێمەش بە یەکی وەك (حەیدەر) هەڵخەڵەتابواین. ئەوجا لە هەموو تەرەفەوە ئەو میللەتە نشسوت ئەکا، لە هەموو تەرەف دوژمن بەسەریاندا غالب ئەبێ، سەلبی موڵك و سەڵتەنەتیان لێ ئەکا. هەزار دوعا بە پوولێك کەڵك ناگرێ.

١٣١/١

## شێخی نەساج!

زاتێ بوو لە قودەمای سۆفییە، مەشهوور بوو بە شێخی نەساج. جاوی دروست ئەکرد و ئەیفرۆشت، گوزەرانی پێ ئەکرد. جارێ بە ڕادایی تۆپە جاوێکی بۆ شەخسێك دروست کرد، لای وابوو زۆر بێ عەیبە، شەخسەکە تەماشای کرد، یەك دوو عەیبی لێ دیتەوە، عەرزی شێخی کرد، شێخ دەستی کرد بە گریان.

شەخسەکە گوتی: قوربان مەگریێ، پارەکە ئەدەم و جاوەکە قبووڵ ئەکەم.

فەرمووی: بۆیێ ناگریم، بۆیێ ئەگریی تۆ لەو تۆپە با وجودی زۆر

---

(١) شێخ ڕەزای تالەبانی (١٨٣١-١٩١٠ز) ناوی ڕەزای کوڕی شێخ عەبدولرەحمانی تاڵەبانی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا مەحموودی زەنگەنەیە کوڕی یوسف ئاغای زەنگەنەیە. لە گوندی قرخی نزیك چەمچەماڵ لەدایك لووە. لای باوکی خوێندویەتی و شارەزای ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسی و تورکی بووە. ساڵی ١٨٦٠ چۆتە ئەستەنبوڵ و دوو ساڵ لەوێ دەبێ و پاشان دەگەڕێتەوە کەرکووك، لە ١٨٦٦ جاریکی تر دەچیتەوە ئەستەنبوڵ و لە ڕێگەی میسرەوە دەچیتە حەج. ساڵی ١٨٩٨ دەچێتە بەغدا و تەکیەی تاڵەبانی لەوێ بەڕێوەدەبات. ساڵی ١٩١٠ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

سەعیم تێدا کردبوو کە هیچ عەیبم لێ نەئەدیت، عەیبت دیتەوە. جا خودا بەو عیلم و بەصیرییە ئەبێ چەند هەزار عەیب لە عەمەلی من بدۆزێتەوە، کە لای خۆم زۆر بە خالص و موخلیصی ئەیکەم.

١٣٧/١

## ئەوانەی ئەڵێن تەنیا ئێمە فرقەی ناجیەیەن!

گەلێ لە مسوڵمانانیش ئەڵێن ئێمە هەر ئێمە (ناجین)، غەیری ئێمە هەموو فرقەی ئیسلامی ئەچێتە ئاگر، نە تەنها فرقەی اعتقادیات، بەڵکو ئەرباب طوروق و مەزاهیبیش وا ئەڵێن.

ئەگەر ئینساف بکەین، ئەو لاف و گەزافی لەناو ئێمەدا هەیە، باوەڕ ناکەم لەناو جوولەکە و دیاناندا هەبێ، بەڵام ئەوانە قورئان خوێن نین، ئیعتیقاد بە قسەی ڕوئەسای خۆیان ئەکەن.

لە کتێبێکی ڕافزییانم دیت، کە خودا ئەفەرموێ: هەر کەسێك عەلیی خۆش بوێ، تا عەنانی ئاسمان گوناهی هەبێ، من لێی خۆش ئەبم. ئەوی ڕقی لە عەلیی بێتەوە، ئەگەر مابەینی ئەرز و ئاسمان چاکەی هەبێ لێی قبوڵ ناکەم عەزابی ئەدەم.

منیش نووسیم: ئەگەر حوسنی معامەلەی لەگەڵ خودا هەبوایە، ئەبوایە ئەویش لە موتیع و موحیبانی خوا خۆش بێ، با ڕقیشی لێیان بێتەوە!

بەڵێ ئینسان بە قسەی خۆشکەڵە خۆشکەڵە، هەڵئەخەڵەتێ. ئەو نەوعە خودپەسەند و هەرزەگۆیانە ئەبێ جەزایان چی بێ؟ هەر خودا ئەیزانێ، بە کەس نایێتە بەیان.

١٣٩/١

## چ دوعایەك بۆ مەلایان باشە؟!

حەقیقەتەن ئەو دوعایە زۆر باشە (رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولً.. هتد) بۆ مەلایان بە خصوصی، زۆر مەلا هەن بە عیلم و حیکمەت ئەبن بە جەربەزە، موفسید، عنود، ئەو عیلم و حیکمەتە بۆ ئەوان ئەبێ بە ئافەت.

جاهیلێ لەو نەوعە مەلایە گەلێ چاکترە.

حاڵی ئینسان لە بەینی حەضارەت و بەداوەت، یەعنی شارستانی و لادێی زۆر سەیرە. ئینسانی مەدەنی مەیلی عیلم و حیکمەت و کیتابەتی ئەبێ، سەعی ئەکا، تێئەکۆشێ، کە ببێتە یەك لە سەرامەدانی زەمان. ئەمما نیفاق، شەیطانەت، کیبر و ئەنانییەت، ئەخلاقی زەمیمە، ئەعمالی سەییئە ڕووی تێ ئەکا، دەوری لێ ئەدا، زۆر نادر و نایابە ئینسانێکی دڵ خاوێن لە حەضارەت هەڵ بکەوێ.

بەدەوی لادێیی، جەهل و غەباوەت و تێنەگەیشتن، نەفرەت لە کەسبی عیلم و کیتابەت و حیکمەت لەسەری زیاد ئەکا. لە گەلێ لە کرمانجانم ئەبیست لە دەوری سابق، ئەیانگوت، ئەوەندەی لە قەڵەم ئەترسێین، ئەوەندە لە تفەنگ ناترسین.

١٥١/١

## ئێمە لە خاتمە ناترسێین لە ئەووەلی ئەترسێین!

گەلێ جار عەرزی مسوڵمانانم کردووە لە وەعزدا، کەسێ لە حەیاتی خۆی سەعی بکا، ئیمانێکی کامڵی بێ غەل و غەش بهاوێتە ناو دڵی خۆی، لە سوئی خاتیمە ئەمینە. حاصڵی کە ئیمان بوو بە مەلەکە، زەواڵی نابێ. بەڵکو لە سەرەمەرگدا قووەتی زیاد ئەبێ. ئەوی بیستوتانە کە لە سەرەمەرگا کافر بووە، موحەققەق لە حاڵی زندەگانی ئیمانێکی باشی نەبووە، بەڵام ئاگاداری خۆی کردووە، بە بەرزی ماوەتەوە. لە هەنگامی کردن ئەو هۆش و متمانەیەی نامێنێ، کە غەلل و غەشی خۆی بپۆشێ، کفری زەمانی حەیاتی لێ ظاهر ئەبێ، بۆیێ بەعزێك لە ئەولیا ئەیانفەرموو: ئێمە لە خاتمە ناترسێین لە ئەووەلی ئەترسێین، حەتتا گەلێك ئینسان ئەبینین لە وەقتی شێنەیی موئمینی باشە، مسوڵمانە تاعەتگوزارە، ئەمما کە شیددەتێکی هاتە سەر، موسیبەتێکی لێ قەوما، تووڕە ئەبێ، هەزار کوفریات ئەکا.

١٥٤/١

## ئوممەت کەوتە ژێر چەپەڵۆکی عالەم!

ئینسان تەعەججوب ئەکا لە حاڵی مسوڵمانان، چۆن لەم ئایەتە (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ..هتد) غافڵ بوون؟ ئەڵێی ئەسڵەن نەیانبیستووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەبوایە، هەر مسوڵمانێ عالیم و جاهیل، عارف و عامی، سەید و ئوممی، عومەری و حەیدەری، ئەشعەری و جەعفەری، ئەو ئایەتەی لە لەوحەی خاطری خۆی بنووسێ. دائیما بیهێنێتە بەر نەزەڕی تەفەککور و ئیعتیبار، نەکا پشت بە کەس ببەستێ، بە ذل و ئینکیسار لەبەر دەستی کەسێك ڕابوەستێ، ئومیدی نەجاتی بە ئەو و ئەم بێ.

خودا ئەیزانێ ئەگەر مسوڵمانان ئەو ئایەتەیان بکردبوایە دەستور العمل، نە لە دین، نە لە دنیا نشستیان نائەهێنا. ئەو ڕووحە، کە لە سەدری ئیسلام چووە بەر بەدەنی مسوڵمانان، لەناو دڵیان قەراری گرت، حەیاتێکی پێدان، بە نەوعێك سەعی و ئیجتیهادیان کرد، وا سەرکەوتن، کە بوونە سەر تاجی ئومەم، بەڵام ئەو ڕوحە زوو دەرچوو، بەڵکو زوو دەریانچواند.

هەیکەلی ئوممەت، وەکو بەدەنی بێ ڕوح تەفەسسوخی کرد. ئەعزای لەباریەك هاتە دەرەوە، پارچە پارچە بوو، بوونە ژێر چەپەڵۆکی عالەم.

وایش! عیززەتی پاش زیللەت چەند خۆشە. زیللەتی پاش عیززەت — کەسێ حیسسی هەبێ- چەند ناخۆشە، لە مردن تاڵترە!

مع الاسف بەعزێك مەلامان بوون، لە هەر ئایەتێ ڕوحی حەیاتی ئوممەتیان تێدا بدیتابوایە، دەرحاڵ زەهرێکی هەلاهل، (قتال) یان ئەهاویشتێ ڕووحەکە نەدەما، ئایەتەکە وەکو مقەببای بۆش ئەمایەوە. ئوممەت مەحرووم بوو. حالەنیش کۆنە قسەی ئەوان لەسەر زوبانی مەلایانی عەصری، دەوران ئەکا و بە دڵ و گیان قبولی ئەکا.

خۆزیا ئوممەت، کە هەر هەڵئەخەڵەتا بە لوتفی ئیلاهی، بە شەفاعەتی نەبەوی خۆیان خۆش بکردابوایە، بەڵام ئیعتیماد ئەدەنە سەر بەعزێکی، کە لە بەهائیم بێ ئیدراکترن. هەزار هەزار فرسەخ لە ساحەی (قرب و

قبول) دوورن، ئەسڵەن دەرگەی شەفاعەت بۆ ئەوانە ناکرێتەوە، چ جایێ، کە شەفاعەت بکەن(1).

١/ ١٥٦

## دین و عەقڵ!

تێفکرن، کەسێکی عەقڵی هەبێ، چۆن کەتمی ئەو حەقایقە ئەکا و ئەڵێ: خالیقی ئەرز و ئاسمان عیسایە؟ کەسێکی کەمی شعور و ئیمانی هەبێ، چۆن ئەڵێ تەدبیری کائینات بە قوتب سپاردرایە، بێ ئەمر و ئیرادەی ئەو، زەرراتی کائینات حەرەکە ناکا؟ ئەو نەبێ ئەرز و ئاسمان وەرئەگەڕێ؟ کەسێکی لە غایەتی جەهل نەبێ، چۆن ئەڵێ عەلی موکەویری لەیل و نەهارە؟ باری لە نبووەت صەرفی نەزەر! بۆچی بە عەقڵ، خەیاڵی صەحیح تەماشای ئەرز و ئاسمان ناکەن، بزانن ئەو عالەمە چییە؟ بزانن ئەو عالەمە عەزیمە بە چ قووەت و ئیرادە و عیلمێك خەلق کراوە؟ بە چ حیکمەتێك بەو ئینتظامە غەریبە داندراوە، بەڵام کە عەقڵ نەما، قسە لەگەڵ کێ بکەین؟ بالخاصە، کە کەڕامات هاتە گۆڕێ بە جارێ عەقڵ و عیلم و حیکمەت ئەفڕێ، نیزامی کائینات ژێر بەرەو ژوور ئەبێ.. حەق و حەقیقەت گوم ئەبێ.

خودایە تۆ شاهیدی هەر دینێك، هەر مەزهەبێك، هەر مەشرەبێك لەگەڵ عەقڵ موخالیف بێ، من لێی بەریم، دینێکم ئەوێ.. بە مەزهەبێك ڕازیم، کە بە ئیمتزاجی عەقڵ و نبووەت ڕوحێکی خالیصی تیا پەیدابوو بێ و منیش نائیلی ئەو حەیاتە موعتەدیلە ببم و ئەو دینەش حەقیقەتەن دینی ئیسلامە. ئەم ئیمتزاجەیش خالقی ئەکوان، منزلی قورئان بۆ ئێمەی کردووە، ئێمەیش (لله الحمد) پێی ممتزج بووین و زۆریش سەعی

(١) ئەم چەند بیرەوەرییانەی سەرەوە لەناو قورئانەکە و لە جزمی یەکەم دایە، مەلای گەورە لە مێژووی ڕۆژی دووشەم، نزیکی عەصر، لە ٣ی زیلحەجە موتابیقی شەشی مانگی مارتی ڕۆمی ١٣٥٢ی هیجری قەمەری نووسیویەتی.

ئەکەم، کە عەوامیش بەڕاستی لە حەق و حەقیقەت بگا با لایشیان مەنفوور و بێ حورمەت ببم.. خودا ئەزانێ لە عەبدولرەحمانی جەلی هەتا من، کە لە کۆیێ ژیاوین، خیانەتمان لەگەڵ دین و میللەت نەبووە.
١/ ١٨٢

## موحیببەت!

بەرزیی موحیبەت کە دڵدا شین بوو، ڕەگی داکوتا بەو دەمارانە، کە بە دڵەوە موتەصیلە ئەڕواتە خوارێ تا وەکو لەگەڵ خوێن و گۆشت و ئێسك، مێشك تێکەڵاو ئەبێ، جەبرەن ئینسان سەوق ئەکا بۆ ئیتاع.، بێ تەوەقوف و تەئەمول و موحاکەمە، چییان پێ ئەمر بکا بەجێی ئەهێنن.. ئەو مەککارانەی، کە دەعوەت بۆ بیدعەتی خۆیان ئەکەن، ئەزانن موحیببەت لە هەموو چشتێ بە تەئثیرترە. لەو ڕێگایە دێنە پێشێ، ئالیهەی خۆیان بە ئەنواعی درۆ و دەلەسە، خۆشەویست ئەکەن.. ئەوی مائیل بە سەفالەت بێ بە دانەی تەزویریان هەڵ ئەخەڵەتێ. موحیببەت زاڵمێکی وایە، ئەسڵەن عەقڵ و ئیرادە ناهێڵێ!

تەماشا بکەن لە حیکایەتێ، ئەسکەندەر و ڕۆستەم و عەنتەر پاڵەوانێك، کە مەدحی زۆر بکرێ و لە ئەغلەب شەڕان بەسەر بکەوێ.. خاصەتەن شیرێکی لە تەوقی سەری دوژمنێکی (قویال) بدا، مەردوو (مرکب) بە تیغی ئابدار وەك خەیاری تەڕ بکاتە دوو کەرتك، سامعین چەندیان خۆش ئەوێ! هەزار جار خۆیانی بە قوربان ئەکەن... وەك دەستت نەڕزێ! چاوی سەرم بی، لەمنت کەوێ! غولامی گوفەکێت بم!

با وجودی نە ئەصلی هەیە نە فەصل. کێ هەیە حیکایەتی ئەسکەندەری گوێ لێ بێ و بابا نەسیم و ئەرستۆ و محەمەد شێرزادی خۆش نەوێ؟ کێ هەیە ڕقی لە جالینۆس و شێرزاد خانی شیردرە و هەیکەلانی پیر نەبێتەوە؟ تەماشا بکەن بە بەند و باوی دەروێش و سۆفییان، بە حیکایەت و چیرۆکەی مەلایان، عالەم چ مەحەببەتێکی لەگەڵ شێخان پەیدا کردووە! بە خودایان ئەزانن بەڵکو خودایان هەر

بۆیێ ئەویێ، وەکو نەفەری (ئەمر بەر) ئەمر و ئیدارەی شێخ پێك بهێنێ و ئەو ئیعتیقاداتەیش بە حەق و حەقیقەتی دینی ئیسلام تێ ئەگەن.

(والذین امنو اشد حبا لله) موحەببەتی خودایان لە هەموو چشت لەلا زیاترە، مەحەببەتی خودا بە نەوعێك جێگیر ئەبێ لە دڵی ئیماندارانی بە حەق، کە موحیببەتی غەیر جێی تێدا نابێتەوە. ئەوی خۆشیشیان بوێ، بۆ خودایان خۆش ئەوێ، حەقیقەتی ئیمان وا لە (قضا) ئەخوازێ. بەڵام ئەمڕۆ باوەڕ ناکەم لە دوو ملیار نفووسی بەشەری سەد کەس هەبێ، بە حەق خودای خۆش بوێ. وە ئەگەر نەیکەنە (سوء الظن) ئەتوانم بڵێم لەسەر ئەرز موحیببی خودا نییە.. نییە. حوببی ڕوئەسای دین بە نەوعێك جێگیر بووە، کە ساحێبی دینیان (بالکلیة) فەرامۆش کردووە. موحیببەت پەیدا ئەبێ.. پەیدا ئەکرێ، جەلبی خاطر بۆ زانایان زۆر سەهلە، لاکن مەحەببەت چییە؟ حەقیقەتی نازانرێ، بەس ئەوەی موحەببەتی هەبێ بە ویجدان، ئەزانێ چ شتێك هەیە سەلبی سەبرو ثەبات و قەرار و ڕاحەتی لێ ئەکا.. ئیرادەی پێ ناهێڵێ. وەکو مستەفا بەگی کوردی[1] ئەڵێ:

صەبرو ثەبات و تاقەت و ڕاحەت نەما بەلام هەر ماوە
ڕوح و پێی بڵێ (کوردی) ئەتۆش بڕۆ[2]

مەحەببەت ئاگرێ لە دڵدا هەڵئەکا، باڵۆن بە هەوای ئەخا، صاحیبیشی نازانێ: ئەوە چییە، دائیما لە یادی مەحبوبی خۆیەتی، ئەسڵەن لێی غافڵ نابێ.. وە نازانێ لەبەر چییە تا مەحەببەتی خودا لە دڵاندا نەما.. چی لێهات؟ مسوڵمان چۆن بڵاوبوونەوە؟ سەر بەرەو ژێر بوون. ئەمڕۆ لازمە مەحەببەتی خودا لە دڵاندا پەیدا بکەن، نەك وەکو (مرجئه) عالەم بکەینە

---

(١)مستەفا بەگ کوڕی مەحموود بەگی ساحێبقرانە لە شیعردا نازناوی (کوردی) بووە. لە دەوروبەری ساڵی ١٨١٢ لە سلێمانی لەدایك بووە، هەر لە سلێمانی لە ساڵی ١٨٥٠ کۆچی دوایی کردووە، بە یەکێك لە کۆڵەگە گرنگەکانی قوتابخانەی شیعری بابان لە قەڵەم دەدرێ. لە دوای خۆی دیوانێکی شیعری لەپاش بەجێماوە.

(٢)لە دیوانی (کوردی) شیعرەکە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**سەبر و قەرار و تاقەت و راحەت نەما لە لام**
**هەر ماوە ڕۆح و پێی بڵێ کوردی ئەتۆش بڕۆ**

صەگە بەرەڵلا. هەرچی خودا پێی ناخۆشە بیکەین، وە بلێین ئیمانمان کافییە بەڵکو بە نەوعێك، کە ڕووبکەنە چاکە، نەفرەت بکەن لە خراپە، بزانن خودا چاکە چاکەی ئەوێ، چاکی خۆش ئەوێ مەلاذ و مەلجەئی خاصە لە ڕۆژی جەزا هەر ئەو لە حەدیس ئەفەرموێ:

قەومێك ڕۆژی قیامەت لەسەر مەنابری نوور دادەنیشن، پێغەمبەر نین، نبی- ش نین، ئەمما ڕوسول و ئەنبیا تایبەتی بە ئەحواڵی ئەوان ئەخوازن.

عەرزیان کرد یا ڕەسوولەڵلا ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانە، ئەوانەن خودا لای عباد، و عباد لای خودا خۆشەویست ئەکەن.

موحەققەق بزانن تا مەحەبەتی ئەم و ئەو لە دڵاندا بێ، مەحەبەتی خودای ناچێتێ. تەئویلی مەحەببەت کە مەلایانی ئێمە وە موعتەزیلە ئەیکەن، باش نییە. وەحی ڕووحی مەحەببەت ئەبا.. ساردی ئەکاتەوە بەو نەوعەی، کە قورئان ئەفەرموێ، مەحەبەتی خوداتان هەبێ، بە مەحەببەتی ئەغیار کەتمی مەحەببەتی خوا مەکەن.

١٨٥/١

## ئوممەت کەڕە، کوێرە!

ئەو پەتك و گوریسەی ئەوان دەستیان پێوە گرتبوو، بڕا. ئەو داوی تەزویری ئەوان دایان نابووەوە، پارچە پارچە بوو. ئەو داوە پسپسۆکە خۆی لەبەر ئاگر ناگرێ. زۆرترینتان دیتتان ئەو ڕۆژە، کە کۆیێ بۆمباردومان کرا، سەگ و شێخ و مەلا و سۆفی و فەقێ هەموویان هەرایان ئەکرد خۆیان ئەشاردەوە، ئەچوونە ناو ئەشکەوتان، کونەسەگان. ئەوجا قوڕتان بەسەر تەمەعی ئەوەن، کە ئەوانە لە (هەول)ی قیامەت نەجاتتان بدەن؟ پەنا و مەلجەئو مەلاذتان ئەوانە ئەبن؟

نموونەی قیامەت لە دونیا زۆرە، بەڵام چ بلێم ئوممەت کەڕە، کوێرە.

١٨٧/١

## کفن بە من ببڕێ، مردوو گۆڕ بە گۆڕ چێ!

ئەبو عەلای مەعەری[1] ئەلێ: ئەوی لە سەرەمەرگ ئاوزینگان ئەدا، ئەوە تالاتی حەیات قەی ئەکاتەوە. وە گەلێ کەس مردن بە دەرمان. ئەزانن بۆ دەردی حەیات، شەریعەتی تەبیعەت، تا ئەمڕۆ تەنزیمی حەیاتی نەکردوە، لەسەر ئەو ناخۆشیە، بەشەر بە شەڕ زیاتر ناخۆشی بکا شایانی عەقڵ و ئینساف نییە. حەوادیسێك، کە خەلەل بە ئەمن و نیزامی عام بگەیەنێ متەوالیەن ئەبێ بۆ مەنعی ئینتیشاری فەساد چارەسازییەك بکرێ. بۆیێ عوقەلای ئینسان ڕێیان بە تەشکیلی حکومەت بردووە (ئالعییون، تەبیعیون) ئەو تەشکیلەیان لە زروریاتی حەیاتی ئیجتماعی دیوە و ئەفرادی حکومەت تەبعەن موقەدەس نین. ئەوانیش بەشەرن میولی فاسدەیان هەیە، بۆیێ ئیحتیاجیان دیوە بە قانونێك، کە ئیکمالی ئەو تەشکیلە بکا.

بینائەن عەلەیهی ئیجاب ئەکا واضعی قانون بێ مەیل و موحابا، ساحێبی ویجدانی پاك بێ بە ئەحواڵی ڕوحییەی ئینسان خەبەردار بی. ئەو جۆرە بەشەرە لە هەموو زەمان زۆر کەمن، خاسەتەن لە عەصری حەزارەت و مەدەنیەت. موحەقەق بزانن ئەمڕۆ لە شەرق و غەرب، لە شیمال و جنوب، لە قەتەعاتی خەمسەی ئەرز، یەك ئینسانی تێدا نییە بە وجدانی نەزیه، بە قەلبی پاك لە مەیلی دین، تائفی، مەزهەبی، حزبی هەبێ. هەر قانونێکی داینێن خالی نییە لە مەیلی فەساد. بە لاف و گەزافی سیاسیون هەڵمەخەڵەتێن. ئەوان لە هەموو کەس غەشیان زیاترە، ئێمە بۆیێ ئەڵێین (لابد) شارعی قانون ئەبێ خودا بێ، کە رب العالمینە.

---

(١) ابو العلاء المعری (٩٧٣-١٠٥٧ز) ناوی ئەحمەد کوڕی عبداللە کوڕی سلێمانی مەعەرییە، شاعیر و فەیلەسووف و زمانزان و ئەدیبێکی عەرەبی بووە لە سەردەمی عەباسییەکان. لە معرة النعمان ی باکووری سووریا لەدایك بووە و هەر لەوێش مردووە. خاوەنی دیوان سقط الزند و رسالة الغفران و چەند کتێبێکی دیکەیە.

ئەسراری عباد، مەلی صەلاح و فەساد بە ئێمە بگا، ئەو زاتە بە بەشەر لە هەزاری، نۆ سەد و نەوەد و نۆی بە ترس نەبێ ئیصلاح نابێ. کەوابێ ئەگەر کەسێك بە زوڵم و تەعەدا بە تەصەوور و تەصمیم کەسێك بکوژێ، بۆ پڕبوونەوەی ئەو برینە لە هەیکەلی ئیجتماعی چی چاکە بکرێ. حقوقییون تا ئەمڕۆ دوو فیرقەن:

فیرقەیەك: تەرەفداری (قصاص) نین، ئەڵێن: قاتل ئیصلاح بکرێ بە حەبس، خەلقیش لە شەڕی ئەمین ئەبن، ئەویش پاشماوەی حەیاتی ئیمرار ئەکا لە حەپسخانە بە ساکتیو سالمی. (كأنه) کە چووە حەپسخانە ئەبێتە پیاوی موقەدەس، چاك و پاك.

فیرقەیەکی تر تەرەفداری ئیعدامن، ئەفەرموون: ئەو جۆرە قاتلە ئیزالەی وجودی نەکرێ ئەو برینە پڕنابێتەوە. جەنابی حەق، کە خۆی (اعلم العالمین) و (احكم الحاكمین)ە، ئەو فکرە تەرجیح ئەکا و بەیانی سەبەبیش ئەفەرموێ بە نەوعێك، کە ئەوی ساحێبی ویجدان بێ، تەصدیقی ئەکا و ئەفەرموێ: لەو نەوعە قصاصە عادلانە بۆ ئێوە حەیاتێك هەیە، ئەمما چ حەیات؟ حەیاتێك، کە وەسف ناکرێ بۆ ئێوە، ئەی خاوەندی عەقڵی خالص و پاك!

حەقیقەتەن، ئەوەی ساحێبی (لوب) بێ، تەصدیقی ئەو حوکمە ئەکا، ئەزانێ بڕینەوەی نیزاع، کوژانەوەی فیتنە، ئارامی دڵی خزمانی مەقتول بەڵکو ئیستراحەتی ظاهری قاتل لە ئیعدامی دایە. ئەو نەوعە قاتلە ئەمەلی ئیصلاحی لێ ناکرێ، تا وەکو فیترەتی بەشەریەی (بالکلیة) مولەوەث نەبووبێ، ئیقدام لەسەر نەوعە قەتڵە ناکا. ئەو نەوعە کەسە دەستەڵاتی بەسەر هەر کەسێکدا ببێ، لاشەك ئەیکوژێ، بۆیێ خودا ئەفەرموێ: ئەوی نەفسێ بکوژێ، کەئەننەما هەموو کەسی کوشتووە.

مانعی فطری، دینی لە دڵی دا نییە ئەو حەیاتەی قاتل لە حەپسخانەدا ڕایئەبوێرێ، ئەگەر لەگەڵ عەزاب و ئەعمالی شاقە بێ، مردن گەلێ خۆشترە لەو عەزابە دوورو درێژە. ئەگەر خزمەت بکرێ لە بالاخانەیێ هەوادار، مینابەند، ناظر لەسەر باغ و باغات، ئێوارە و سبەینە بێ ڕەنج و تەعەب، لە کیسەی ئوممەت حەتتا لە ماڵی ئەیتامی مەقتول، سفرە و

شیلانی بۆ برازێندریتەوە، بە کەوچك و چەتاڵ محەلەبی فڕ بکا. گۆشتی سوورکراوە نۆشی گیانی بکا. غایە مافی الباب فێری بەتانیە دروستکردن و، کیفە سعاتی منقش و کڵاوی قولابەچن ببێ و زەمانی حەبسیشی وردە وردە کەم ببێتەوە بە عەفووی شاهانە، جلوسی ملوکانە، ولادەتی هومایون، ئینقلابی سەڵتەنەت. بە مەرگی مەلیك و دانیشتنی مەلیکێك، بە موژدەی فەتح و پیرۆزی، بەو نەوعە حەپسە چۆن ئیصلاح ئەبێ؟ ئەولاد و ئەقاریبی مەقتولی مەزلووم لەو حەپسە، چ فەرامۆشییەکیان پێ دێ، خەڵقی دی چ عیبرەتێ ئەگرێ؟

حاصڵی تەجروبە شاهیدە، کە فکری فیرقەی ئەووەل، فکرێکی فایدە، ئەگەر مەلیك ئەمر بکا مەسرەفی ئەو موجریمانە لەسەر ئەو ساحێب مەرحەمەتانە بێ، عەجەبەن ئەو فکرەیان ئەمینێ؟ ئەو نەوعە کەسە ئەگەر معاشخۆری حکومەت بێ، نزیکی سەری مانگ پارە لە سندوق دا نەبێ حکومەت بۆ تەئمینی معاشی ئەفەندی گۆشت و پیست لە ڕەعیە بکاتەوە، عەجەبا ئەفەندی دڵی پێی ئەسووتێ؟ (حاشا ثم حاشا).

کەسێك بچێ بۆ کەسابەت، بە ئەمەلی قازانجێك بێتەوە بۆ جەژن، پلاوێ بۆ منداڵانی خۆی دروست بکا، چ نەبێ سەر و کراسی چیتی سووریان بۆ بکا، وەقتەن ئەو سوورە ساقەتانە ئەبینن، ناگاه لاشەی بابیان بە مێشکی پرژاو، بە سنگی شەقکراو، بە زگی دڕاو، بە جەرگی پارچەپارچەکراو بۆیان بێتەوە. ئەو تەرەفدارانەی موجریمەکان، ئایا دوو قران ئەدەن بۆ ئەو مەئیوسانە؟ بۆ ئەو دڵ سوتاوانە بدەن بە جلك، چێشتی جەژنیان بۆ لێنێن. پێنج شەش فلسیان بدەنێ، بچن بۆ جۆلانە و چەرخ و فەلەك. هەیهات! هەیهات! پولێکی خۆی بە حەیاتی هەموو بەشەر نادات، وەکو مەسەلی کوردی: کفن بە من ببڕێ، مردوو گۆڕ بە گۆڕ چێ.

تەعەجوب ئەوەیە، بەعزێك مسوڵمان بە سەفسەتەی ئەو محامییانە هەڵئەخەڵەتێن، تەعن لە دینی خۆیان ئەدەن، نازانن ئەوانە بەقییەی ئەو موفسیدانەن، کە پێیان خۆش نیە هیچ خێرێك لە تەرەف خوداوە بۆ ئێمە بێ. عەجیبترین ئەوەیە عولەمای تەفسیر و بەلاغەت، سەعی ناکەن بۆ تەئیدی ئەو ئایەتە، بۆ ئیجرای ئەو معدلتە، خەریکن موقابەلەی ئەو ئایەتە کەریمە ئەکەن لەگەڵ مەتەلۆکێکی عەرەبان (القتل انفی للقتل) بە سەد

(چلك برده چلك برده) مەنع و موعارەزە، گۆیا ئیثباتی ئەکەن ئەو ئایەتە بەلیغترە لەو عیبارەتە. مع أنه ئەو کەلامە کەلامێکی زۆر بێ تامە، ئینسانی بالغ شەرم ئەکا بەرابەر عیبارەتی قورئانی ئەو قسە پڕوپووچە بنوێنێ.

پاش ئەم طول و تەفصیلە، عەرز ئەکەین مع الاسف مسولمانان لەو ئیمتیحانە دەرنەچوون، لەپاش فاروقی ئەعزەم تا ئەمڕۆ ڕەئیسێك مەرئوسێك، بە قووەتێك بە زوعفێك، دەستەڵاتدارێك بەبێ دەسەڵاتێك نەکوژراوەتەوە. وجودی مەسعودی سەرکاری ئاغای خۆش بێ، با سەد هەزار کەس لەو سەگە گەورانە بکوژرێ، چ ئەهەمیەتی هەیە، ئەم حوکمە قصاصەش ئەنجامی دێ، بە ئومێدی خۆتان بپارێزن لە قەتڵی ناحەق.

١٩٩/١

## شەریعەت نەماوە و ئێمەش خەریکین، ئایا نەسخ لە قورئاندا هەیە یان نا؟!

ئەمڕۆ گرۆهی بێ دەستەڵات لە مسولمانان ساکنی لۆندەرە، متەوەطینی پاریس، نشیمەنی بەرلین، دەرحەق بە دوژمنانی قەوی چی ئەڵێن؟

دەڵێن (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ، رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا ، فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا) عەجەبەن ئەمریان ئەکرێتێ بە؟ (وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ ، وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ) حاشا، ثم حاشا حوکمێ لە وەقتی عیزز و شکۆهـ و سەڵتەنەت، لەگەڵ حوکمێ لە زەمانی فەقر و زیللەت و مەسکەنەت، چۆن وەکوو یەك ئەبێ؟ زۆر لەیەك دوورن. حوکمێك جەنابی کیبریائی بۆ حەزرەتی ڕیسالەت پەناهی بنێرێ، چۆن نەسخی ئەداتە دەست جەنابی نەبەوی، حوکمێکی ئیلاهی ثابت و موقەرریر، چۆن عیبارەتی لە قورئان دا ناهێنشترێتەوە؟

حاصڵی هیچ نەبێ وەکوو ئیمامی شافیعی بە زۆری ڕێی نەسخ نەدرێ

باشە. مع الاسف ئەمڕۆ سەبەب بە تەعەصوبی عولەمایانی مەزهەب و، بێ تەفریقی زەمانی صعود و هبوط، شەریعەتی ئیسلامییە، بالكلية سقوطی کردووە. هەتا دەوڵەتە ئیسلامەکان بۆ مەحاکم قەوانینی ئەجنەبی وەرئەگرن و حوکمی پێ ئەکەن و لەگەڵ ئەوەیش ئێمە خەریکین، ئایا نەسخ لە قورئاندا هەیە یان نا؟

٢٠٣/١

## ئەوی شێخ بی، ئەبێ دائیمەن ئاگاداری حاڵی مورید بێ!

حاڵی بەشەر زۆر سەیرە لەلایێ ئەیگێڕییەوە، لەلایەکی تر دەرئەچێ. نەفسی ئینسانی زوو مونفەعیل ئەبێ، ڕوو لە خودا ئەکەی ئەیەوێ دەست لە هەموو چشت هەڵگرێ. ئەیگێڕییەوە نەختێ ڕووی لە دونیا ئەکەی، ئەیەوێ مستغرق بێ لە لذائذی دونیا، بۆیێ لەوی (هادی) بێ، ئەبێ دائیمەن ئاگادار بێ، وەکو ئەو سوارانەی جوانوو تەعلیم ئەدەن، دار بەدەستەوە ئەگرن، لەملا و لەولای ملی جوانووەکە ئەدەن، تا ڕاست بڕوا و لاری نەبێ. بۆیە ئەفەندییەکانی ئێمە ئەڵێن ئەوی شێخ بی، ئەبێ دائیمەن ئاگاداری حاڵی مورید بێ بە قووەی قودسییەت لە خراپەی بگێڕیتەوە.

بەڵێ ئەگەر ببێ، ئەبێ وابێ، بەڵام ئەو تسلطە مەعنەوییە نەدراوەتە پێغەمبەر، نازانم چۆن ئەدرێتە خەڵقی تر؟ یەعنی ئەم (توجه الی الله) تان لە حاڵەتی ڕۆژوو وابێ، ئەمما شەو لەگەڵ ئەنیس و جەلیسی خۆتان ڕەفیقەی حەیاتتان، هەمدەمی خەڵوەتتان موعاشەرە بکەن. ئەمما لە مەیلی فیتڕی زیاتر نەبێ، بەقەدەر دەغدەغەی شەهوەت بێ..

٢١١/١

## دەستی خۆی بە خواردن پیس ناکا،
## بە کەوچك و چەنگاڵ ئەخوا!

مەقسوودتان ئەمەیە بە واسیتەی ئەو صەرفیاتە باتڵە، خۆتان بخەنە ڕیزی حاکمان، گەورە گەوران، یاخود مەقسەدتان ئەوەیە بیکەن بە وەسیلەی نزیکی لە حاکمان، خۆتان ڕەپێش بکەن لەلایان. نەتیجەی ئەو صەرف و ئیهلاکە خۆهێنانە ڕیزی حاکمان، قەرزدارییە. کأنە غایەتان ئەوەیە هەتا گەلێ ماڵی مەخلوقان بخۆن. بکەوێتە قورگتان بێ حەق، بێ مەعذیرەت خۆتان گوناهکار ئەکەن، وەکوو بەقاڵ و شەکرفرۆش و سائیری ئەصنافی بازاڕی. یا بە ئارایشی مێزی ئەبەنۆسی و هەناردنی سینی تەعامی لذیذ بۆ حوککامان، ئەیکەنە وەسیلەی خواردنی ماڵی خەڵق، تاکو ئەگەر شکایەتیش بکەن بە خواردنێ، کە خۆتانی پێ ڕابگرن ئیکتیفا بکەن.

حفظی ماڵی یەك لە ضروریاتی خەمسەیە.. پارازتنی دین، پارازتنی عەقڵ، پارازتنی نەسەب، پارازتنی ناموس و شەرەف.. نە حەج نە قیتاڵ بێ ماڵ ناکرێ. کە ئەو نوعە صەرفیاتە وەباڵی زۆرە. عاقبەتی خراپە، بەڵام ئینسان بێ عارە، بێ ئیعتبارە.. گەلێکمان دی لە گرانی ساڵی ١٣٣٦هـ بە دەخیل و ئامان، بە سوئاڵ و پاڕانەوە، تا لوقمە نانێکی چنگ ئەکەوت، بە هەزار جرنیا و فرنیا تا نەجاتیان بوو. ئەمڕۆ بە نان و ساوار و نیسك و داندۆك ڕازی نابێ، دەستی خۆی بە خواردن پیس ناکا، بە کەوچك و چەنگاڵ ئەخوا، ئەڵێی نە بای پێدا هاتووە و نە باران.

٢١٥/١

## نامووسی خۆی ئەبا بۆ شەڕەفی خەڵق!

ئەڵێن لە زەمانێك میصری تەقدیسی پشیلەیان ئەکرد. ئێرانی کە چوونە سەر میصر، ئەوەیان زانی لە ڕۆژی شەڕ، بەعزە پشیلەیان لەپێشی

لەشکری خۆیان ڕاگرت، میصرییەکان تیریان نەدەهاویشتن، مەبادا بەسەر پشیلەکان دا بڕوا و حورمەتی پشیلەکان بشکێ. ئێرانی بە کەیفی خۆیان تیرەبارانیان ئەکردن. وردە وردە لێیان ئەچوونە پێشێ، تا بەسەریاندا غالب بوون، حورمەتی خۆیان شکاند بۆ حیفظی حورمەتی پشیلە. ئێستایش ئەو نەوعە کەسە زۆرە، ناموسی خۆی ئەبا بۆ شەڕەفی خەڵق.

٢٢١/١

## ئای لەو بێشەرمییە!

اللــە! لەو معــامەلە عــادیلانە، ئەی ئەهلــی ئینســاف تەماشــای ئەو ئەحکامانە بکەن، هیچ میللەت کتابی و غەیرە کتابی ئەو قانوونەیان نییە. قــانوونی عیســا وەکــو ســۆفییەکانی ئــێمە، کە بە تەبەعیەتــی مەســیحی وەریانگرتووە، حەتا شێخی عەرەبــی ئەفەرمــوێ: جەزای خــراپە، کەســێ خــراپەت لەگەڵ ئەکــا گــوێی مەدەرێ، موقــابەلە مەکە. وە ئــیللا تــۆیش وەکو ئەو تووشــی خــراپە ئەبــی.. ئەو نەوعە قــانوونە بە مــوتڵەقی غەڵەتە. خصوص ئێرە هەر جێــی نییە، ئەویــش مەوقیعێکــی تــر هەیە، وە قــانونی عیسا لای عیسەویان بە قەدەر زەڕەیەك ڕیعایەت ناکرێ. ئەورووپایی گوایا عیسەوین، لە هەموو عالەم دوورترن لە قانوونی عیسا، بە بەهانەیەکی هیچ و پــووچ شــارێك بۆمباردومــان ئەکەن، ژن و منــداڵ و خەســتەخانە و حەیوانات ناپارێزن، ئێمە خۆمان دیمان بە زەریفی، لە سیاسەتی ئوممەتی ڕەسوولی سەلام گەیشتین!

ئای لەو بێ شەرمییە! ئەلئانیش تەعن لە حەزرەتی محەمەد ئەدەن، کە حەڕبــی کــردوە، قەواعــدی حەربــیش ئەوەیە، کە ئەیبیــنن و خــۆی و خولەفای لەسەر ئەو ڕێیە ڕۆیشتن. هەتا لە حەزرەتی ئیمامی عەلــی نەقــل کراوە لەگەڵ پیاوێکی پاڵەوان و نەبەرد زۆر تێکۆشــی، تــا لە ئەرزی دا، لەو وەختە تفێکی لە ئیمــامی عەلــی کــرد. حەزرەتــی عەلــی دەســتی لــێ هەڵگرت.

کابرا لە ڕووی تەعەجوبەوە گوتی: ئەمە بۆ؟

فەرمووی: تا ئێستا بۆ خودا شەڕم لەگەڵ ئەکردی، چونکە تفت لێکردم قینم هەڵستا. ئەگەر بتکوژم هەوای نەفسی تێدایە.
کابرا لە ڕووی ئینساف مسوڵمان بوو، ئەوروپایی لەسەر ئەم هەموو زوڵم و تەعەدای بێ ئەندازە، ئێستایش بەشارەت ئەدەن بە ڕەسوولی سەلام. ڕەسوولی سەلام لای عالەم خۆشەویست ئەکەن، تاوەکوو ئەوی بکەویتە داویان، وەکو خۆیان بیکەنە مایەی فەساد.

٢٢٢/١

## حەیفە عولەمای دین بە ناوی سەلەفی، عالەم لە گێژاوی تەشابوهدا بهێڵنەوە!

ئەوانی کە ساحێبی حوسنی نەزەرن، زهنیان بەقووەتە، بۆ کەشفی حەقائیق نەزەریان نفوذ ئەکا، لە بەردی ڕەق بێ، شەقی ئەکا، ئەزانێ کلۆرە. ئەوانی بێ لوبب و خولاصە بن، سەرسەری و سەتحی بەسەر شتدا ئەڕۆن. چی تیایە؟ هیچ! گێل و گەوج لە ئەسراری نازانێ، کەسی بە ئینساف، بێ تەقلیدی سەلەف و خەلەف، تەماشای سیرەتی عولەمای دین و تەبیعەت بکا، ئەزانێ کە موتەشابیهـ مەنشەئی تەرەقی عیلمە. ئەحکامی ئەدیان و ئەحکامی ئەکوان، ئەگەر لەسەر بەساتەت بڕۆیشتایە دینی مەوجودات زۆر بەسیت و سادە ئەبوو. عیلم بێ قیمەت، عالەم بێ سەعی، تەبابەت و کیمیا، ئەسڵەن نەدەگەیشتە ئەو دەرەجەیە.
ئینسان شتێ کەم لە فەوقی مەیمون ئەبوو، تا قووەتی لە عالەم زیاد بێ، خەفای تەبیعەت زووتر فەهم ئەکا. (همس الخطابی) تەبیعەتی چاتر گوێ لێ ئەبێ و تا تەشابوهـ لە بەینی ئەشیادا شەدیدتر بێ، قووەی تەفریق زیاد ئەکا. قووەت لە بەینی عولەمای تەشبیهـ، قووەیان گەیشتە دەرەجەیێ، گیایان هێنایە دەرەجەی ئاوریشم! ئەگەر قووەی فاریقە نەبێ، عالەم چی بەسەر دێ؟ دیمان بە ملیۆن خەسارەت لە نەزانان کەوت، تا لە ئەهلی عیلمەوە پێیان گەیشتن، فەرقی تەلەفۆن و ئاوریشمیان کرد. حەیفە عولەمای دین بە ناوی سەلەفی، لە حەقائیقی دین مەحرووم بن و، عالەم لە گێژاوی تەشابوهدا بهێڵنەوە.
چۆن تەصەوور ئەکرێ ئایەتێ لە تەڕەف خوا بۆ پێغەمبەری خۆی بنێری و عیباد نەیزانێ و بڵێن: (استأثر الله بعلمه) و بعضا بعضه ئەصفیای

خۆی بە طەریقی غەیرە موکتەسەب بۆ بەشەر ئیطلاعیان ئەداتێ. زاتەن هەر بەو نەوعە بۆ کەشفی حەقایقی مەوجوداتیان لەکیس خۆدا. بڵێ ئەمە ئیشی خوایە. قسە لە تەبیعەت مەکە کافر ئەبی. هەر خوا مؤثرە. هیچ قیوا تەئثیری نییە. ئاو و ئاگر بۆ تێروی و سوتانی فەرقیان نییە. هەر خوا پاش خواردنەوەی ئاو، تێراوی خەلق ئەك.، پاش مومارەسەی ئاگر سووتان خەلق ئەکا. نەساغی خەڵاتی خوایە! هەتا بەعزێك تەداویان لا حەڕامە. لایان وایە موقابەلەی خوایە. نارەزاییە بە خەتی خوای.

تاکو بە جارێ هەموو ئەسراری دونیا و مەوجودات لەدەست چوو. خوا ئەیزانی، ئەگەر فرقەی حوکەمای ئیلاهیوون نەبان، عولەمای ئیسلامیش فەرقێکیان لەگەڵ عولەمای جوو و دیانان نەدەبوو. هەر کەسێ ئەمین و عاقڵ بوویێ، لە عولەمای ئیسلام ئیزالەی پەردەی لە موتەشابیهات کردووە، بە وەجهی لایەق ڕووی حەقی بەدەرخستووە، ئەگەر بە تفویضی عیلم لێ بگەڕێین، لوبب و ڕوسوخی فی العلمی چی پێ ئەوێ. بلاهەت و بەساتەت کافی یە، ئەگەر بە تەفویض لێگەڕابان، ئەو هەموو عیللەتانە چۆن تەداوی ئەکران. میکرۆب کوو کەشف ئەبوو؟ قووەتی کەهرەب، چیای ڕۆنتکین، قووەتی ڕادیۆ، چۆن بەدەرئەکەوت، کوو بۆ نەفعی عیباد تەسخیر دەکرا؟

لە بەعزێ ئەشعاری کوردیی خۆم عەرزم کردبوون:

مەلای نادان بە عینوانی شەریعەت
حەرامی کرد لە تۆ عیلمی تەبیعەت
لەبۆیێ هەر لە ئەو عەردە بەدەر کەوت
لە زێڕو زیوو توج و پاقرشو نەوت
بە کوللی کەوتە ژێر دەستی فەرەنگان
چیاو چۆلان دەنۆڕن وەك پلنگان
بیانئۆڕێ، چیایان چۆن ئەکۆڵن
هەتا کەی ئێوە هەر بەماڵ بەکۆڵن؟

## جۆرەکانی ئارایش!

ئارایش سێ نەوعە:

١- ئارایشێ بە خەلق و ئیجاد، ئەوە صرف عائیدی خالقە، ئەو هەموو ئەشـــیای مــزین و مفتخـــر و قیمەتـــدار، غەیـــری خـــوا کەس موداخەلەی لە خەلقیدا نییە.

٢- ئارایشی بەڕاستی، کەسێ نەفرەت لە شـتی بـاش ئەکـا، بەڕاسـتی مەنافیعی بۆ بەیان بکـرێ، بە عیبـارەتی جـوان و ئەدەبـی خـۆش بخـرێتە زهنی، ئەمەش زۆر باشە، عائیدی جەنابی حەق ڕوسول عظـام و (راسـخ فی العلم) ی ئەمین لەگەڵ عیبادی خوایە.

٣- ئارایشــی مـوزەخرەف بە وەسوەســە و تەسـویل و تەلبـیس شـتی خراپ زینەت بدا، لەبەر نەزەری خەڵـك جـوانی بکـا، ئەوە زۆر خـراپە. عائیدی ئیبلیس و تاغووت و شاعیرانی بەدنیهاد و خائین لەگەڵ عیبادە و ئەمثالی ئەوانە. بێگومان ئەو مشهیاتە و مستلذاتە خۆشن، ئینسان فیتـرەتەن مەیلیان بۆ ئەکا، بەڵام مەحەببەت بە دەرەجەیێ بـێ، کە ئینسـان پێیـان بە فیتنە بچێ ناشیرینە، خراپە، عاقیبەتی بە هیلاك چوونە.

موحیببەتی ژن و ئەولاد بە دەرەجەیێ، کە مەنعت بکـا لە ئیمـان زۆر خراپە، هەتا ئێستا گەلێـك ڕیجـالی ئەوروپـی حەز ئەکەن مسـوڵمان بـن، چونکە ژنیان، یا ئەولادیان موافەقەیـان ناکـا، مسـوڵمان نـابن. مـوحیببەتی ئەولاد لەسەر فیتڕەتی پاك، سەوقت بکا بۆ تەربیەیـان، فەرقـی نێـر و مـێ نەکا لە ئەصڵی موحیببەت، زەریفە. ئەممـا حـوببی ئەولادی نێـر و بەس، خـۆی نیــیە وەك قەومــی عەرەب، کە کچیــان زنــدە بەگــۆڕ ئەکــرد. کوردیش زۆر کەیفیان بە کچان نایێ. ئەوروپایی بیلعـەکس مـوحیببەتی کچانیان گەلێك پترە لە کوردان، تورکیش لەو مەیلەدان، حاصلی ئیفراط و تەفریط، هیچیان باش نییە.

٣٥١/١

## بەشەر مسوڵمان و تەبیعیوونە!

من لە ئەحواڵی ئوممەم ئەفکرم، گەلێ جار ئەڵێم، حەقی بەشەر وایە ببنە دوو قسم: مسوڵمان و طەبیعیوون. باقی گشتی، فەن و فێڵە و حەقولئینساف بە سەهلی ئەتوانێ ئینسان هەم تەبیعی بێ، هەم مسوڵمان بێ. مونافەرە لەبەینی شەریعەت و تەبیعەت نییە، بەڵکو و لدی التقدیر غایەت موافقن. ئەو ئایاتی کائینات، کە خوای پێ ئەناسین، لە عەینی ئایات ئەتوانین ئیستیفادەی دنیەوی لێ بکەین.

خولاسە واضعی دینی ئیسلام و خالیقی ئەنام یەکە، قەواعیدیشیان یەکە، مودریکی ئەحکامی کەونەین و فارقی (بین المتشابهات)و ناظمی موتەباینات، عەقڵە.

عولەمای ئیسلام، نەدەبا عەداوەت بخەنە بەینی دین و عەقڵ و تەبیعەت. بەڵام ئەوانیش مع الاسف، وەك عولەمای ئیسرائیلی ئەمانەیان کەم و زۆر لەیەك کردە دوژمن.

٣٥٦/١

## کەسێ لە نەوەی خەلیفان بێ، ئەگەر لیاقەتی نەبێ بۆ گاوانی باشە!

کەسێ بێ لە سولالەی خولەفا بێ، کە بالذات لیاقەتی نەبێ بۆ گاوانی باشە. نەفەرێکی لایق و زەکی و ماهر، ئازا و بە عیلم و ئیدراك، مودەبیر و سیاسی لایقی دەیهەمی خوسرەوییە، ئەگەرچی لە شوانان بێ، بۆیێ نافەرموێ (والشر[1]). تەئریخ ئەو نەوعە تەقەلوباتەی زۆر دیوە، خاصەتەن ئێمە لە زەرفی هەشت نۆ ساڵ ئینقلاباتێکمان دیت، محیر

---

(١) مەبەستی ئایەتی(بیدك الخیر....)ە، سورەتی ئالیعیمران ئایەتی ٢٦.

العقـول. چەنـد پادشـا و شاهــ و ئیمپراتــۆر مولکیــان لــێ داڕنــدرا و دەربەدەرکران. چەند حکومەت شکڵی ئیدارەیان گۆڕا. چەنـد خـانەدانی قەدیمـی موڵـك و سـەڵتەنەت، ئـاوارەی دارو دیـار بـوون، کە نەدەهـاتنە خەیاڵ و تەخمین.

بەڵام خوا ئەوەی بیکا، ئیللا جیهەتی خێری تێدا ڕیعایەت ئەفەرموێ، چونکە هەم قەدیرە و هەم حەکیمە. ئەو تەقەللوباتە غەریبە وا نییە هەر لە جیهەت موڵك بێ، لە زەمانیشدا هەیە. خوایە تۆ شەو ئەهـاوێیە نـاو ڕۆژ، هەمووی یا بەعزێك، کەم یا زۆر. وە ڕۆژ ئەخەیتە نـاو شـەو، بەو نەوعە تەساوی شەو و ڕۆژ (علی التحقیق) نادیرە و زاهیرەن ئەبـێ، کە شـەمس بکەوێتە سەری بەهار و سەری پایز، کە لەو دوو نوقتەیەی لادا، درێـژی شەو و ڕۆژ ئەگۆڕێن. تا مەملەکەت لە (ئیستیوا) نزیکتر بـێ، ئیختیلافیـان بە مــوددە کەمتــرە. تــا بە لای قــوتبەوە بــێ، چ شـیمالی چ جنــووبی، ئیختیلاف زۆرترە.

لە ئەواخیری ئەقـالیم نیـزام تەواو ئەگـۆڕێ، تـاکو شـەوو ڕۆژێکیـان ئەبێتە ساڵێکی ئێمە. لە نصفێ ڕۆژ ئەکەوێـتە نـاو شـەو، لە نصـفێك شـەو ئەکەوێتە ناو ڕۆژ. ئەو ئەحواڵی لە وەضعی ئەرز و ڕۆژ پەیا ئەبێ، عیلمی هەیئەت بە تەفصـیلات بـۆ ئەو ئەحـواڵاتە کـافلە، ئەگەر کەسـێ عیلمـی هەیئەت کەمێ بزانـێ، لەو ڕێـگەیە تووشـی کفریـات نـابێ. ئەزانـێ ئەو وەضع و ئەساسە لە تەڕەف خوایە، کاری عیسا و عەلی نیە.. ناتوانم بڵێم عیسا بە تەواوی عیلمی هەیئەتی زانیبێ، ئیحاتەی بە ئەحواڵی ئەرز دابـێ. من دوای قەومی خۆم، کە کوردە تەئەسوف بۆ یۆنان لە هەموو مـیللەت زیاتر ئەکەم، ئەو علومـانە لە ئەوانە، حوکەمـای یۆنـان مەنبەعیـانە. چۆن دەسـتیان لەو حکمیــاتە هەڵگرتبــوون بە عیســەوی. حەقــیقەتەن جێــی تەعەجوبە قەومی کوردیش پاش ئەو هەمـوو عـیلمە، کە لە کوردسـتاندا بوو، چۆن وا زوو بە تەریق و مەریق گۆڕان، خولیای کەرامەتیان کەوتە سەر، عیلمیان لا مەبغـوض بـوو، تووشـی ئەو جەهـالەتە هـاتن! نەك هەر عەوامیـان، بەڵکـو ئەوانەی لای ئەوان لە ئەخەصـی خەواصـن. نیهـایەت سەری کێشا بۆ ئەمڕۆ، کە لە سایەی تەریقی نەقشـبەندی فەزڵ لە عـیلم، شەجاعەت، سەخاوەت، غیرەت، کە لە مەزایای کوردان بوو لایـان نەمـا

(إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) ئەو تەقەلوباتە نەك لە زەمان و مەکان، بەڵکو لە عالەمی حەیاتیشدا هەیە.

وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ ، زیندی لە مردی ئەهێنییە دەر (وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ) بیلعەکس.. یەکەمیان وەك ئیلاجی لەیلە لە نەهار، کە ڕۆژ وەقتی حەرەکاتە، دووەمیان موقابلی ئیلاجی نەهارە لە لەیل، چونکە شەو وەختی ئارام و سکونە.. ئەو زیندی و مردییە عیبارەتە لە چی؟ ئیحتیمالاتی زۆرە، هەمووشی جوانە. حەیوان لە نوتفەیە و نوتفە لە حەیوان، نەبات لە حبە و حبە لە نبات، دار لە ناوك و ناوك لە دار، جاهل لە عالیم و عالیم لە جاهل، پاك لە پیس و پیس لە پاك، صالح لە فاسق و فاسق لە صالح، کافر لە موئمین و موئمین لە کافر، زیرەك لە نازیرەك و نازیرەك لە زیرەك.

کەس نەڵێ ئەو زاتە مادەم پێغەمبەرە، ئەبێ لە پێغەمبەران، یان لە چاکان بێ، ئەوی ئەولادی ئەوە، ئەبێ پێغەمبەر بێ علی الاقل، ئەبێ چا بێ. ئەوە خانەدانی سەڵتەنەتە، هەر ئەبێ ئەو پادشا بێ. ئەوە کوڕە جوتیار، ئەبێ هەر جوتیار بێ؟! خوا ئەزانێ بەعزە ئەولادی خانەدانان هەیە، لە هەموو خصوصێ لە بنەڵۆکی دۆمان هیچترە. ئەوانی مەنسوبی خانەدانی نبووەتن، جەنابی فاطر چ مزیەتی فیطری نەدانێ، تا بڵێین لای خودا مومتازن! ئیتر خەیالاتی ئەو حەشیشە کێشانە، لای خوا قیمەتی نییە. قیمەتی ئینسان عەقڵە، عیلمە، تەقوایە، ئەعمالی چاکەیە، ئەخلاقی فازیلەیە، ئەوەندە بۆ فەهمی مەقسەد کافییە حەیات چییە؟ حەقیقەتی نازاندرێ. بەڵام ئاثاری (ذی الحیاة) مەعلومە، حەرەکەی زیندی لەگەڵ حەرەکەی جەماد جیاوازە. حەیات مەنشەئی لە چییە؟ لە ئەرز پەیا بووە، یا لە ئاسمان بۆی هاتووە؟ مادەی حەیەوی لە ماددەی غەیرە حەیەوی نەشاط ئەکا، یان نا؟ عولەمای تەبیعەت قسەیان زۆرە، حەقیقەتی حاڵ بە عیلم بۆیان کەشف نەبووە و کەشف نابێ.

٣٦١/١

## مەسلەکی سواڵکردن ئایاتیش تێك ئەدا!

شەخسی خاریج، ئەسراری ناو ماڵی ئینسانێ بزانێ، دیارە شائیبەی نەیرەنگ و تەلبیسی تیا نییە، دڵ چاتری پێ دادەمەزرێ، ئەمما بەعزە کەس لە دەروێشانی سەرسەری، دەچنە دێ و شاران لەپێشەوە بە واسیتەی منداڵیان، یا لە ئەم و ئەو تەحقیقی ئەحواڵی بەعزە عائیلات ئەکا، پاشان ئەچی خەبەریان ئەداتێ بە خەفایای ماڵەکە.. بە کەراماتی ئەزانن، گەلێ ساوار و داندۆك و پارەی ئەدەنێ.

نعوذ بالله مەسلەکی سواڵکردن ئایاتیش تێك ئەدا.

٣٧٩/١

## ئەوروپایی کە زاڵبوون، بە مەسیحییەتی نییە!

وامەزانن لە تەئریخی عالەم مەسیحییەکانی موزەخرف غالب بوون. ئەمڕۆش ئەوروپایی کە غەلەبەیان بەسەر مسوڵماناندا کردیە، بە مەسیحییەتی نییە، بەڵکو:

یەك: لایەك بە عیلم و عەقڵە، بە ئیکتیشافات و ئیختیراعاتی قووەتی طەبیعەتە، کە ئەساسی مەسیحی لەگەڵ طەبیعەت موتەنەفیرە، موتەباینە. لە هەموو وەقت موئمین بەسەر کافر غاڵب ئەبێ. ئیمان بەخوا، کە موافق نەبێ کوفرە. مسوڵمانان وەك جوو و دیانان، دوای خەواریق و شەواز کەوتن. بە خیلافی قورئان ئیمانێکیان ئیختیراع کرد، نە عەقڵی هێشت، نە عیلم، نە قووەت، نە قودرەت، نە سەعی و عەمەلی صالح و خونجایی بۆ دنیا و دی. بە واسیتەی کوفر بە قەواعیدی ئیلاهی، بە قورئانی حەکیم، ماڵێ وێران بوون، حالەن ئیفاقەیان نەبووە، ئەگەر هەر وابن عاقیبەت، مەسخ ئەبن بە کیسەڵ، بە قالۆچە ئەکەونە ئەدنا مەراتبی حەیوان.

دوو: لایەکی تر بە مەیلی نەفسانییە، ئیباحەی شەهەوات و تەرویجی فسق و فجور و قومار و خمور و سائری کردەوە بەدەکان، کە نەفسی حەیوانی حەزی لێ ئەکا و، فیترەتی بەشەری بە فەساد ئەبا.

٣٨٤/١

## هەرچی بوو دایانە هیممەت و کەڕامەت!

دەوڵەتێ میللەتێ نییە، ئەو ئەییام و ئەوقاتە، جەنابی حەق ئەو دەست و ئەم دەستی پێئەکا، لە بەینی ئینسان، کافر، موئمین، صالح، فاسق، مەڵێن: مادام مسوڵمانین، وە لە خدمەت ساحێب ڕیسالەتین ئێمە هەر غالب ئەبین، قەت مەغلوب نابین.

زۆر نەزیکە، پاش فەتح و زەفەری بەدر، ئەو فکرەیان بۆ پەیا بووبێ. زاتەن ئەو نەوعە خەیاڵاتە شکستی دا مسوڵمانان عیبرەتیان نەگرت. بە قسەی خائینان فریتەبوون هەرچی بوو، دایانە هیممەت و کەڕامەت، تا ئەوەمان بەسەرهات، کە صەحائیفی تەئریخمان ڕەش بوو.

٢٦/٢

## قسەی بەرئاگردانێ لە کێ، تاوی بەرازی لە کێ؟

ئەوانەی سەتری حەق ئەکەن، بە لاف و گەزاف خۆیان، لە ئەقویای میللەت، مەلاذی ئوممەت پشت و پەناهی دین و دەوڵەت، خاوەنی قووەت و قودرەت، ساحێبی هیممەت و کەڕامەت، مەردی مەیدان، شێری ژیان، شمشێری بوڕان، حیساب ئەکەن. خوای تەعالان مەحوو نابوودیان بکا.

لە ساڵی بۆنباران، پێشی واقیعە گەلێکم هاوار کرد، گوێیان نەدامێ. ئەیانگوت: تەیارە وەکو کۆلارەیە، غایەتی جیقنەیەکی بەردایەوە، پاشان کە هات، یەك دوو بۆمباری بەردایەوە، تەق و شەق کەوتە ناو شار، عالەم هاتە هەژان. ئەوانە بۆ کونان، وایان هەر ڕائەکرد، بابانیم تۆزی پێی نەدەشکاندن. کوردێ ئەڵێ: قسەی بەر ئاگردانێ لە کێ؟ تاوی بەرازی لە کێ؟ ئایا ئێوە لەو عیبرەتە نەفکرین؟ لەپێش ئێوە کە تووشی بن، ئەهوال و شەدائیدی حەربتان نەدیبوو؟ کە حەربی تەڕابلووسی غەرب دامەزرا، لە بەینی دەوڵەتی عوسمانی و ئیتالیا، گەلێ کەس لێرە خۆیان قەید ئەکرد خۆیان ئەخواردەوە، لە حەسرەتان قەصدیان هەبوو، لە

کۆیەوە بە یەك غار هەڵکوتنە سەر ڕۆما. کە حەربی عومی داکەوت، ئەحوالی حەربیان دیت، چیان ئەکرد؟ چۆن لە چۆل و صەحرا، لە لادێیان، لە شاخان خۆیان ئەشاردەوە، چەندیان ڕشوەت دەدایە جەندرمان، کە تووشیان بوون نەیانگرن! کە ڕووس هاتە ڕەواندز گەلێ سەرسپی بە مەترەق ڕۆیشتن بۆ سەر لەشکری ڕووس. کە صەعیقەی تۆپ و تەقەی تەقینەوەیان گوێ لێبوو، هەر کەس وەکی ڕێوی کلکی بەناو گەلانی شۆڕبۆوە، هەڵاتن، هاتنەوە.

۲۸-۲۷/۲

## کەم بژی کەڵ بژی![1]

(١) مامۆستا مەسعوود محەممەد لەبارەی گەورەیی وشەی مەلا لەلای جەنابی مەلای گەورەوە دەنووسێ: مەلیك فەیسەڵی یەکەم لە هەولێر پێشوازی لێ دەکرا. ئێوارە بەلەدیە لە یانەی فەرمانبەران داوەتێکی گێڕا لەسەر شەرەفی مەلیك. مەلا ئەفەندی و باوکم بۆ داوەتەکە لە باداوە هاتن بۆ هەولێر من منداڵێکی ١٠-١٢ ساڵی بووم لە خزمەتیاندا هاتم. لەبەر دەرگەی نادی ئۆتۆمۆبیلەکەی مەلا ئەفەندی و هی موتەسەڕیفی هەولێر لە یەك کاتدا وەستان و خەڵقەکەیان لێ دابەزی. موتەسەڕیف سڵاوێکی کرد و پێش مەلا ئەفەندی و باوکم کەوتەوە بەرەو شوێنی داوەتەکە. باوکم هەنگاوی هەڵێنا و دەستی موتەسەڕیفی گرت و پێی گوت: جارێ نۆرەی ئێمەیە. موتەسەڕیف، ماڵم حەقە، بەسەرەخۆی نەهێنا و گوتی: مرازم ئەوە بوو ڕێبەڵەدی بکەم، نەکا ئێوە شارەزای شوێنەکە نەبن، باوکم پێی گوتەوە، باش شارەزاین و (نشکرکم). ئیتر مەلا ئەفەندی و باوکم لە پێشەوە و موتەسەڕیفیش بە دوایانەوە بەرەو کۆمەڵەی داوەت کرانەوە ڕۆیشتن. خەڵقیش کە جەمبوورەی بەستبوو بە دەوری نادیەوە، چاو ئەبڵەق بوون. هەر لەو داوەتەدا باوکم هێندێ قسەی بە مەلیك فەیسەڵ گوت گەلێك بەولای ڕاگرتنی موتەسەڕیفەوە بوو. خوێنەر دەبێ وردبێتەوە لە ڕاگەیاندنی ئەو جۆرە هەڵوەستە، لە هەزار مەلا یەکێکی زات ناکا قۆڵی مودیر ناحیە بگرێت و بە دوای خۆیەوەی بدا، هەر نەبێ لەبەرئەوەی کە دەزانێ بۆی ناچێتە سەر لەوە هەر بگەڕێ کە نان بڕانی تێدایە، کە مەلاش زات نەکات کەسی دیکە زات ناکات. ئەدی چۆن مەلای کۆیێ موتەسەڕیفی دواخست و دواتریش قسەی بە مەلیك فەیسەڵ بڕیەوە؟ لەبەر ئەم هۆیانە:
١-خۆی لەسەر حەق دەزانی.
٢-بڕوای بێ سنووری بە خۆی و کەسایەتیی خۆیەوە هەبوو تا ئەوەی ڕەفتارەکە بە لایەوە وەك ئاو خواردنەوە بوو.

←

حەیاتی کوللی نەفسێ لە ئێوە، یا حەیاتی دونیا، حەیاتێ موقەریرە، موئەجیلە، مەحدودە، بە زەمانێ هەر ئەبڕێتەوە، با زۆریش درێژ بێ. هەزار ساڵ بژیە، عاقیبەتی هەر مردنە، ئەمما وەك کوردی ئەڵێ : کەم بژیە، کەڵ بژیە. ژینی بە ڕەزالەت و ئەسارەت و عبودییەتی عەمر و زەید، چ خۆشییەکی تێدا نییە. ئەوانی غیرەتدار بن، مردنی بە عیزەت و شەرەفیان پێ خۆشترە لە ژینی بە زیللەت و سوکایەتی.

٢٩/٢

## قەومی بە غایەت!

هەر قەومێ بیەوێ حوڕ بی، ئەبێ غایەتەکی هەبێ ئەوەندەی

---

٣-ترس و تەمای لە دڵدا نەمابوو.
٤-بەخۆیدا ڕادەپەڕموو زاڵ بێت بەسەر هەر ئەنجامێکی لەو هەڵوەستانەدا بکەویتەوە.
٥-شەرمی لە خۆی دەهاتەوە لە ئاست داخوازی هەڵکەوت خامۆش بێت.
٦-کەرەستەی هەموو هەڵوەستێك و هەڵکەوتێکی، لەوانەی بێنە بەر هەنگاوی مرۆی وەك خۆیەوە، بە زیادەوە هەبوو: هەر لە زمانی پاراو تا ڕەوانبێژی تا زانستی سەردەم تا مێژووی گەلان تا دڵی هۆشیار تا جورئەتی بێ سنوور..
٧-بەگژ نارەواییدا دەچۆوە نەك ڕەوایی.
٨-مەلایەتی بەلای ئەوەوە ژووررووی هەموو پایەیێکەوە دەهات.
لە ڕوونکردنەوەی ئەم نوختەیە شتێك دەگێڕمەوە لە زاری ڕەحمەتی حاجی میرزا عەبدوڵلای خادمەوە. ڕەحمەتی گوتی: جارێکیان لە وەعزی ئێوارەیەکی ڕەمەزاندا کە هێندەی نوێژی جومعە خەڵقی تێدا کۆدەبوونەوە (بۆ بیستنی گوتاری ئەو وەعزانە زۆر لەوانەی دینداریش نەبوون تێیدا حازر دەبوون) شتێکی لە غەوسی گەیلانییەوە گێڕایەوە و بە مەلا عەبدولقادری گەیلانی ناوی برد.. هەندێك مێشك وشك وەتەنگ هاتن لەو جۆرە ناو بردنە نارەزاییان درکاند.. قسەکە گەیشتەوە مەلای گەورە. لە ئێوارەیەکی دیکەی وەعزدا بۆ قسەکە چۆوە و گوتی: بیستم هەندێك لە گوێگرانی ئەو ڕۆژە لێیان گران هاتووە گوتوومە مەلا عەبدولقادری گەیلانی. ئەوەی لەو زاتەوە سوودی هەبێ بۆ ئێمە عیلمەکە و مەلایەتییەکەیتی، کەشف و کەرامەتی لەگەڵ خۆی بەسەرچوون. مەلایەتیش ناوێك نییە بۆ غەوس و نە بۆ لەویش گەورەتر کەمایەتی تێدا بێ، چونکە مەلایەتی دەکاتەوە عالمایەتی، ئەگەر ئەو کەسانە بەوە ڕازی نین لێرە بە دواوە دەڵێم (مەلا خوا). (گەشتی ژیانم، مەسعود محەمەد، لا١٩-٢٠)

مەقسوود بی، ئەوەندەی مەیلی بە دڵ و ڕوح لەگەڵ بێ، کە لە ئۆغری نەفس و نەفیسی صەرف بکا. کە ئێستا تەعبیری ئەدەنەوە، بە مەثەلی ئەعلا و ئەو غایەتە ئەبێ غایەی هەموویان بێ، کە بە یەك قووەت بۆ تەحصیلی تێبکۆشن، تەفرەقەیان نەبی. غایەی ئێوە تەحصیلی ڕەزای خودایە، بۆ ئیعتیلای بەشەر و ئازادی، لە زیللی عبودییەتە، تا لەسەر ئەو فکرە بن ئیختیلافتان نابی، یەك غایە و یەك حەرەکە ئەبن.

ئەوانی کافرن، مەثەلی ئەعلایان چییە؟ یەکە، دووە، هەزارە؟ تەحصیلی ڕەزای کێیە؟ بڵندکردنی کێیە؟ چونکە ئالەتیان موختەلیفە، ئەفکار و ئامال و غایەشیان موتەفەریقە، وەقتێ کە دێ بەهۆش بێتەوە، ئەڵێ: ئەمە چی ئەکەین؟ بۆ کێی ئەکەین؟ ئەو وەقتە ئیمانیان بێهێز ئەبی، قووەتیان سست ئەبی، ترسی ئێوەیان پڕ دڵ دەبی، جەنابی واحدی بێ شەریك ترسیان ئەهاوێتە دڵی.

٣٢/٢

## شەیتان پێش هەموو کەس مەلا و شێخان هەڵئەخەڵەتێنێ!

شەیتان، ئیبلیس بە تەبلیس و تەزویرێ شاعیرانە ئەولیای خۆی ئەترسێنێ، خاصەتەن بەناوی دین بێنە پێش، پێشی هەموو کەس مەلا و شێخان هەڵئەخەڵەتێنن، ئەگەر خوانەخواستا ئێوە هەموو چوون، کێ ئەو دینە حیفز ئەکا؟ ئەو هیدایەت و ئیرشادە هەمووی بە هەدەر ئەچێ، ئەوانیش بە دڵ ئیعتیمادی ئەدەنە سەر، بەڵکو بە ئیلهام و وەحی ئیلاهی تێئەگەن.

٥٠/٢

## ئەوەی بەڵایەکی بێتە سەر، ئەڵێن: ئەوە خوا خۆشی ناوێ!

ئەمڕۆ ئەوە لە بەینی مسوڵمان و غەیرە مسوڵمانی بوویتە فکرەیەك ئەوەی بەڵایەکی بێتە سەر، ئەڵێن: ئەوە خوا خۆشی ناوێ، خوا ڕقی لێ ئەبێتەوە، بۆ خاتری شێخێ یا قەشەیە یا مالمێ ئەوەی بێ دەرد و بەڵا بژیە، قەڵەو بێ ملی ئەستووری، قونکە هەوجاری ماڵ و دەوڵەتی زۆر بێ. ئەڵێن: ئەوە خوا ئەیەوێ، لەبەر خاتری ئەو زەواتە موقەددەسە، کەرەمی لەگەڵ ئەکا.

گەلێ قەشە لەو ئاخیرانە ئەیانوت: دیارە دینی ئێمە حەقە، چونکە دوەلی ئەوروپا، کە مەسیحین، بەسەر دوەلی مسوڵماناندا غالب بووین، ئەگەر دینی مسوڵمانان حەق بوایە، مەغلووب نەدەبوون. مع أنە غەلەبەی ئەوروپایی بە عیلم بوو، نەك مەسیحیەتی، ئەگەر لەسەر مەسیحیەتی بمابوونایەوە تا ئەبەد سەرنەئەکەوتن، بەو قسە پڕوپووچانە عالەم ماڵ وێران بووە. گوناهـ لەسەر گوناهـ زیادئەکەن، ئەسڵەن ترسی خوا و ڕۆژی جەزایان نییە.

٥١/٢

## بەخیل زۆری کەیف پێدێ مەدحی بکەن!

بەخیل زۆری کەیف پێدێ مەدحی بکەن، بە سەخا. تەدریس ناکا، کەیفی پێدێ بڵێن ماشاء اللە شەوو ڕۆژ خەریکی دەرسە. تەحریفی کەلامی خودا ئەکا زۆر خۆشنوودە بڵێن: ئەمینی خودایە، عیمادی دینە، حافیزی کەلامی خوایە. ئەو نەوعە کەسە لە هەموو میللەتان زۆرن.

٥٨/٢

## عەجایباتی تەبیعەت!

کەسێ ئەمڕۆ شتێ لە عیلمی تەبیعەت و کیمیا و تشریح الأبدان و فەلەك بزانێ، ئەزانێ خوا چی خەلق کردووە. عەجایباتی وای تیایە، کە بە خەیاڵی ئەووەلیندا نەهاتووە و ئەزانی سعەتی مولکی خوای عیبارەت نییە. لە سێزدە کوڕەی وەك قەپێلکە پیازی بەسەریەکدا هاتووە و ئەزانێ مەنزومەی شەمسی ئێمە بە هەموو سەییارات و ئەقماری، جوزئێ موحەققەڕە، لە مەنزوماتێ (لا تعد ولا تحصى)ی شەمس و سەییارات و ئەقماری دی.

٥٩/٢

## رابیتەی حەزرەتی شێخ!

عەلاقەی ئیمان لە بەینی خۆتان بەقووەت بکەن لە یەکتان ببەستێ، بە شیددەت ئەکریتەوە، بە ئەفسوونەی فیتنەبازان نەپسێ، بە خێرخواهی یەك غایەت مونتەزەم بن. مع الأسف ئەم ڕابیتە بە قووەتەیان سست کرد، گۆڕیان بە ڕابیتەی حەزرەتی شێخ: چاو بقووچێنە، صورەتی موبارەکی حەزرەتی پیر بێنە بەر خەیاڵ، کەپووی بەرانییە، نێوچاوانی زەقە، مووی زەردە، چاوی شینە، ڕەنگی سوورە، ددانی گڕە، ڕیشی پانە، ملی ئەستوورە، وەك قوونکە هەوجارە، قوببە قوببە زوڵوماتی ئیبلیسی بەسەردا دەباری.

٦٥/٢

## موسیبەتی گەورە سیاسیوونن!

یەگانە سەبەبی شیقاق و شەڕ و شۆڕ، پاش بەعزە ئەسبابی خولوقی، ئیختیلافی مەلایانە. لەبەر حەسەد و بوغز و عەداوەتی خۆبەخۆیی، بە فەسادچوون. عالەمیان بە فەساد دا، بەشەریان لە نیعمەتی ئیتتیحاد

مەحرووم کرد، ئێستاش لەو نەسەقە ئەڕۆن، زیاتر عولەمای دینی ئاورووپی، سەددی عالەم ئەکەن لە دینی ئیسلام، کە دینی تەوحیدە. موصیبەتی گەورە، سیاسیوونن حوببی ڕیئاسەت و ئیستیلا و ئیستیعباد، لێیان ناگەڕێ، دائیمەن خەریکی فیتنە و فەسادن، بەعزە عولەمای تەبیعەت حەسرەت ئەخوا و ئەڵێ: عولەمای دینمان تەهوین کرد. ئەمڕۆ ڕێی تەرەققی بەشەر ناتوانن بگرن، ئەمما زوڵوماتی سیاسەت مانیعە.

ئەهلی عیلم لە هەموو میللەت و دەوڵەت یەکبگرن، ئیستیفادە لە عیلمی یەك بکەن، ئەو وەقت، ئیکتیشافات و ئیختیراعاتی بەشەر ئەگاتە دەرەجەیە مەقبوول. ئەبوایە عولەمایانی ئیسلام بکەوتبانە ئەو فکرە، عەداوەت و حەسادەتیان لە بەینا نەمایا، خۆیان موتتەحید بان، هیچ نەبوایە ئەو عەداوەتە بە قووەتەیان لە بەینی مسوڵمانان تەهوین ئەکرد. بەڵام ئەوە هەر لە ئیمکانی خەیاڵی دایە، هاتنی بۆ ساحەی ظهور نەزیکە مەحاڵ بی. وا ئەزانم، چونکە بەعزە ئەهلی عیلم ئەوەیان بە مەحاڵ زانیوە. خاصەتەن لە زەمانی ڕەسوول (صلی الله علیه وسلم)، واسیتەی مولاقات لە بەینی بەشەر نەبووە، تا دەعوەتیان پێ بگا، فەزڵ لە نەیلی مەقصود، فەرموویانە مەقصود لە (ناس) عەرەبە.

خۆزی ئەوانیش ئیتیحادیان کردبا، هەر باش بوو، ئێمەش ئیستیفادەمان ئەکرد.

٦٩/٢

## ئەوها ئیش و کارتان قەت ڕێك ناکەوی!

توخوا، تو ئەو خوایەی بە حەققی ئەناسی، سوئالت لێ ئەکەم، بۆ خوا جوابم بدەوە؛ هەروەکوو ڕابیطەی ئیمان، بیکەن بە ڕابیطەی وەحدەتی ئیمان. یەکێ بڵێ: بە یەزدان، یەکێ بڵێ: بە ئەهرەمەن، یەکێ بڵێ: بە ئافتاب، یەکێ بڵێ: بە قەمەر، یەکێ بڵێ: بە ئاتەشگەدە، یەکێ بڵێ: بە بوتخانە، یەکێ بڵێ: بە عیسا، یەکێ بڵێ: بە غەوس. یەکێ بڵێ: بە شاهی نەقشبەند. ئەوها ئیش و کارتان قەت ڕێك ناکەوی.

٧٠/٢

## لەبارەی ژن!

ئەمـڕۆ بەحسـی تەعەددودی زەوجـات ئەزهـانی عـالەمی مەشـغول کردیە، بەعزێ حەق ناشوناس، یا ناحەق شوناس، سـەبەب بە تەعەددودی زەوجات جنسی لەتیفی ئاوروپی لە دینـی ئیسـلام تەنفیـر ئەکەن. ئەزانـن زومامی ئیدارەی جنسی خەشین لەدەست ئەواندایە. بەعزە دەوڵەت پـاش حەڕبی عمومی فائیدەیان زانـی، حوکمیـان کـرد بە لزومـی تەعەددود، تـا زایعاتی نفوس پڕبکـاتەوە. وە بەعـزە ئەهلـی ئینسـاف ئەفەرمـوون ئەگەر تەعەددودی زەوجات لە عمومی بەشەر قبوڵ کرابـان قەحپەخـانە لە دنیـا نەدەمان. گەلێ ئەدیبەی ئاوروپی، حەسرەت بە خـادیمەی مـاڵە گەورەی مسوڵمانانی شەرقی هەڵئەبەن. حاصـلی تەعەددودی زەوجـات بە نسـبەت مەسڵەحەت بۆ هەردوو لا واجب نییە، بەڵکو بۆ ئوممەت سوننەتیش نییە. وە ئەساسەن ژن هێنان لە دینی ئیسلام واجـب نیـیە، مەسـئەلە مەسـئەلەی تەبعە، تەعدیلی عائیدی شەرعە.

٧٢/٢

ئەگەر منداڵ بن بیانلاوێننەوە، ڕۆڵە ئەو ماڵە بۆ تووە، ئی تووە، سبەی گەورە ئەبی، بە عەقڵو بە هـۆش ئەبـی. ئەو وەقـتە مـاڵەکەت بە زیـادی تەسـلیم ئەکـرێ، کـوڕی گەورەم عەزیـزم بەسـیە، وەرەوە سـەرخۆ، حـورمەتی مـاڵ بـزانە، لە شـەڕاب و قومـار و قەحـپەی صـەرف مەکە، ماڵوێرانی دنیا و قیامەت ئەبی. بە برادەران هەڵمەخەڵەتێ، تا ماڵـت هەیە، لەدواتـن، دوایە مەرحەبـات لێنـاکەن، هەر وەقتـێ هـاتیەوە سـەرخۆ، لەو سەییئاتەت دەست هەڵگرت، ماڵ مـاڵی خـۆتە، کەس حەققـی بەسـەرەوە نییە.

ئەگەر ژنە عەرزی بکە: عەزیزم ڕەفیقەی حەیاتم، تۆ سـاحێب مـاڵی، من پەیای ئەکەم، تۆ خەرجی ئەکەی، ئاگـات لـێ بـێ، بەولا و بەولای دامەدە. بە پیرێژنەکانی زوبان لـووس مەفـرەوێ، ئەولادت بەخێـوکە، تـۆ لای خـوای زۆر بە حـوڕمەتی. خـدمەتێکی گەورەی پـێ سـپاردووی،

ئینسان پێ ئەگەیەنن، ئەمە قیاس لە هیچ عیبادەت ناکرێ. حاصلی ئەوە بزانن چاکە - بە عەقڵ یا بە شەرع- دەربارەیان بیبێژن.

٧٤/٢

## بیستو یەك لیرەم هەیە، کافیو وافییە!

دۆستێکی باشم هەبوو، لە مولازمانی ڕەدیف لە ئەهلی خەرپووت بوو، ناوی عەلی ڕەزا، ئەیفەرموو: معاشی خۆم ئەکەمە سێ قسم، قسمێك دائەنێم کەئننەهو نیە، قسمێك بۆ نەساغی، بۆ حەوادیساتێ کە لە حیساباندا نیە. قسمێك سەرف ئەکەم. زۆری پێنەچوو نەقلیان کرد بۆ لای تورکیا. پێم وت: مەساریفی نەقلیەت هەیە؟ تەبەسسومی کرد وتی: بەڵێ لەو پارەی کە (كأن لم يكن) دامناوە، بیست و یەك لیرەم هەیە، کافیو وافییە.

بە شەڕەف ڕۆیی شرت و پرتی مەزاد نەکرد، دایە چاوەش و ئۆنباشی خۆی.

٧٧/٢

## ژن لە گەڵێ جیهەت حصصەمەندە کە پیاو لەو جیهەتە بێ بەشە!

شەریعەتی ئیسلامیەت وەك فیترەت تەرجیحی لای نێری بەسەر مێیەدا ئەدا، وە بە موقابیلی ئەوانەی مەیلی مێیەتی زیاد ئەکەن، حەتتا لە خەیاڵاتیان، ئەکثەری ئالیهە بە موئەنەث تەصویر ئەکەن. وە عەرەبیش لەلایەك عاریان بە مێیە، وە لەلایەك مەلائیکەت ئەکەنە بنات الله، ئیجاب ئەکا جەنبی زکوڕەت تەرجیح بدرێ لەسەر جەنبی ئونوسەت. مع أنه ژن لە گەڵێ جیهەت حصصەمەندە کە پیاو لەو جیهەتە بێ بەشە، ماڵێ پیاو بۆ کێیە؟ هەر بۆ ژنان نیە؟

٨٠/٢

یەکێک لە ئەغنیای ئەورووپی ئەولادی خۆی مەحرووم کرد، لە وەسیەتنامەی نووسیبووی: لە تەقالید و عاداتی عائیلەی ئێمە نییە، کە کەسێك لە ئێمە دەوڵەمەند بێ و بە جیدد و سەعی خۆی، بیداتە ئەولاد. بەخێوم کردن، تەعلیمم دان، پاش ئەوە واجبە لەسەر ئەوان سەعی بکەن. یەکێك ئەڵێ: باب بۆ چییەتی؟ بۆ کێیەتی؟ ئەمڕۆ یا سبەی ئەڕوا. لە ئەولاد: پیاوی ناندەر، جەنگاوەر، بێهێز و بێ قووەت با بمرێ، ماڵی بۆ چییە؟ بۆ کاکم چاکە، ئەیبەخشێ، ئەیتەخشێ، بۆ نێران بێ، مێ چییە؟ ئەمڕۆ لە ماڵی باوکیەتی، سبەی ئەچێتە ماڵی مێردی، ماڵ لە عائیلەیە نەقل ئەکا بۆ عائیلەیەکی تر، ئاوو بەراویان لێ داگیر ئەکەن، فەلاحەتیان لێ تێك ئەدەن!

بەعزێ ئەڵێن: نەخێر بۆ کچ باشە. خاصەتەن کەسێ ناشیرین بێ، ماڵ نەبێ، ئەمێنێتەوە، کەسابەتی پێ ناکرێ، پیاو بەرەڵلایە، لە هەر کوێ بێ خۆی بەڕێوە ئەبا. خاصەتەن ئەمڕۆ گەلێ قەوم تەرجیحی کچان بەسەر کوڕاندا ئەکەن. ئەفکار و ئارایە موتەخالیف و موتەباین! ئەمما جەنابی حەق، ڕەببی هەموانە، مەیلی بۆ ئەم و ئەو نییە، قەواعید و قەوانینی مەعقول و مەقبولتان بۆ دائەنێ، تەماشای حالی قەوی و زەعیف، ساغ و ناساغ، نێر و مێ، دایك و باوك، کوڕ و کچ ئەکا. بە عەدالەت نەسەبی حیصصەتان بۆ دائەنێ.

٨٢/٢

## لەبەر مارەیی نەبوایە، هەر ڕۆژە ژنێکی ئەهێنا!

عالەمی بەشەرییەت وا تێئەگەن مەقسەد لە زەواج هەڵاوتیکەیە. ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو ژنەیە، سبەی لەگەڵ ژنێ تر، ئەوەیان بەرەڵلا ئەکا، چی بەسەر دێ؟ چۆن ئەژیە؟ گوێی ناداتێ. لە هەزاری یەك حقوقی عائیلە نازانی، یا بشزانێ، ڕیعایەتی ناکا. گەلێکمان دیتون، لەبەر مارەیی نەبوایە، هەر ڕۆژە ژنێکی ئەهێنا، وە یەکێکی تەڵاق ئەدا. لە ئەکسەری ئەقتار نەوعە تەنەببوهێ بووە، بۆ فەسادی ئەو ئەحواڵە. بەڵام لە میللەتی ئێمە

ناشکوری نەبی (الآن کان کما کان). دیومە ئافرەتێك منـداڵەکی بەدواوە بووە، دەستی یەکێکی گرتووە، یەکێکی لەباوەش دابووە، حاملەش بووە، مێردی تەڵاقی داوە. کچەتیمێکی لینگ بە ترشاوی یەکیتری هێناوە. ئەی وا لە ئینساف و مورووەتی بەشەر!

وە بیلعەکس لە دەرەوە لەو بەینە، ژنێك هەشت ئەولادی بەجێهێشت، وە بەدوو کەوت. ئیلاهـی ئیصـلاحی ئەو بەشـەرە، چۆن ئەکـرێ؟ لەنـاو کوردەواری لەوەتی کوتوبی مەزهەبی حەنەفی پەیا بووە، وە ئەڵـێن: لای ئیمامی ئەعزەم بێ پرس و ڕەزای وەلی، ئافرەت خۆی پێ مارە ئەکرێ، دەرکەی کچ و بێوەژن بەدووکەوتن کراوەتەوە.

٩١/٢

## مارەیی!

ئەوجا بێینە سەر باسی مارەیی، ئایا گران بێ باشە؟ یا سووك؟ من لام وایە، بە ئەتـوار و بە ئەحـواڵ ئەگـۆڕێ. وەك سـابیقەن عەرزم کـردن، گەلێك کەسم دیتوە لەبەر زۆر مارەیی، ژنی نەبـوایە، ژنـی خـۆی تەڵاق ئەدا، بۆیە ژنە کورد ئەڵێن: مارەیی کۆڵەگەی ناوماڵە.

ئەگەر ئەم ترسە نەبی، مارەیی تا سووکتر بی چاکترە.

٩٣/٢

## مەلایەتی و صەرف و نەحوو

مەلایەتـی صـەرف و نەحـوو ئەمـانە، کەڵکـی ئیـدارەی مولـك و سەڵـتەنەت نـاگرێ. عیلمـی ئیـدارە و سیاسـەت بەدەسـت هەمـوو کەس ناکەوێ، هەموو مەلایـانی عێـراق و حیجـاز نینـۆکێکی فەیسـەڵیان[1] تـێ

---

(١) فەیسەڵ: ناوی فەیسەڵ کوڕی حوسێن کوڕی عەلـی کـوڕی حەسـەنی هاشـمییە، ←

نابی. لە مەیادینی سیاسەت، خەتیبێك بوو، کە خوتەبای سەر مەنابیر لاڵ ئەبوون، نەیانئەتوانی شەققەی شففە بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا مەلا نەبوو، ئەمما بە ئەخلاق و بە سیاسەت بوو. بوو بە زەعیم بوو بە مەلیك، تەئسیسی دەوڵەتی عێراقی کرد. حەققەن فەیصەل ئەگەرچی نەسەبەن عەلەوی و حەیدەری بوو، ئەمما حەسەبەن و مەشرەبەن عومەری بوو. ڕەحمەتی خوای لێ بی.

٩٤/٢

## تەعنی مەلایان دەرحەق بە یەکتر

من گەلێ جار وەسیەت ئەکەم لە تەلامیزی خۆم: گوێ نەدەنە تەعنی مەلایان لەحەق یەك، بەڵکو تەماشای حەق و حەقیقەت بکەن.

٩٩/٢

---

(١٣٠٠ - ١٣٥٢ هـ = ١٨٨٣ - ١٩٣٣ م) بە ئەبو غازی، مەلیکی عێراق ناسراوە، لە ناودارترین مەلیکەکانی عەرەب بووە لە چەرخی تازەدا. لە تائیف لە دایك بووە، لە بیابانی حیجاز لە خێوەتەکانی بەنی عوتەیبیە گەورە بووە، لەگەڵ باوکی بووە کاتێك بۆ ئاستانە لە ساڵی ١٨٩١دوورخرانەوە. دواتر لە ساڵی ١٩٠٩ گەڕانەوە. بە نوێنەری شاری جیددە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عوسمانی هەڵبژێردراوە، بۆیە لە نێوان حیجازو ئاستانە لە هاتوچووندابووە، لە ساڵی ١٩١٦ بە نهێنیی پەیوەندی بە کۆمەڵەی لاوانی عەرەبی (الفتاة العربیة) دەکات و سوێندی دڵسۆزییان بۆ دەخوا. هەر لەو ساڵەدا باوکی، شۆڕش بەسەر عوسمانییەکانەوە دەکات و فەیسەڵ سەرکردایەتی سوپای باکوور دەکات و لەو ساڵەدا لەپاڵ ئینگلیزەکان شەڕی فەلەستین دەکات. پاشان لە ساڵی ١٩١٨ سوریاش دەگرێت و ماوەیەك دەچێتە ئیتاڵیا و دواتر لەگەڵ داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەوە بۆ تەختی عێراق هەڵدەبژێردرێ و دەبێتە مەلیك فەیسەلی یەکەم لە عێراق. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (الاعلام، خیرالدین الزرکلی الدمشقی، دار العلم للملایین، ج:٥، الطبعة ١٥، ٢٠٠٢، ص١٦٣)

## ژن هەیە و ژنۆچکەش هەیە

لە بەینی کوردان مەشهوورە، ژن و ماڵ، یا ماڵ و ژن. ئەکثەری تەرجیحی ژن و ماڵ ئەکەن، ئەمما لە واقیعدا وەك کوردی ئەڵێ: ژنیش هەیە و ژنۆچکەش هەیە، بۆ ژن، ژن و ماڵ. گەلێك ژن هەن مێردیان دەوڵەمەند ئەکەن، ماڵ و حاڵی خۆش ڕێك ئەخەن، من زۆرم دیت.

پیاوێکی فەقیر ژنێکی ئەهێنا، لە حوسنی تالیع ژنێکی باشی بە نەسیب ئەبوو، زۆر نەئەچوو دەوڵەمەند ئەبوو، باسیان ئەکردن، من ئەموت: تەماشا بکەن. ئیللا ئەمانە ئەبێ ژنیان باش بێ، ماڵداری بکا، بە حوسنی ئیدارەیی.

حەقیقەتەن وابوو، ئەمما ژنۆچکە بێ ماڵ ئیدارە ناکرێ.

١٠٢/٢

## کەسی خراپ پێی خۆشە هەموو کەس خراپ بێ

ئەوانەی دوای هەوا و هەوەسی خۆیان ئەکەون، ئارەزوو ئەکەن، ئێوە مەیل بۆ سەییئات بکەن، ڕوو لە حەسەنات وەرگێڕن. لازم نییە بڵێین: ئەوانە کێن؟ چونکە عینوانیان کافییە، هەر کەسێ تابعی شەهەواتی نەفس بێ، حەز ئەکا هەموو کەس وەك ئەو فاجر و فاسق بێ. لەمەوپێش شەڕابخۆرەوە، نوێژنەکەر، لە وڵاتی زۆر مەخجوول دەبوون، چونکی کەم بوون، ئێستا زۆر بوون، قەشمەری بە شەڕاب نەخۆران و نوێژکەران ئەکەن.

١٠٧/٢

## ڕێزی ژنان

ئەڵێن: لاق فەخری لەسەر زگ کرد. وتی: خێرا مـن تـوو ڕائەگـرم، ئەتگێڕم، ئەگەر من نەبم، توو موعەتتەڵی.
زگ وتـی: خێـر، مـن تـوو ڕائەگـرم. ئەتگێـڕم، ڕاوەسـتانی تـوو بە منەوەیە.
مەرجیان کرد، زگ نەیخـوارد، تـا لاق سسـت بـوو، حەرەکەی پـێ نەکرا. بەڵێ وایە، هەر ئەعزایە، قیمەتێکی هەیە لەویتردا نیـیە، هەمووشـی لازمن، بۆ هەیکەلی ئینسان. خودای تەعالا خزمەتێکی بە ژن سـپاردووە، لە فەوقی هەموو خدمەتانە، منداڵبوون و بەخێوکردن. بۆیە ئەبـێ پیـاو ژن موحافەزە بکا، لەو مەسئەلەدا پیاو وەك دختۆرێکە، شرینقەی لێبدا، ماددە بگەیەنێتە موقەڕی لازم، بۆ تەکەوونی سەبەبی کەسبی.

١١٤/٢

بەعزێك لە نەورەسیدەکانی تابعی خیدعەی ئەوروپایی ئەڵـێن: ئەبـوایە ژن و پیاو لە حقوقی ئیرسی موساوی بان. ئەمە زۆر قسەیەکی موعەتتەڵە، ناقیصە، ئەجوەفە. ئەگەر خودا ئیمتیازی نەدابا ژنان، لازم بـوو ژن ئیـرث وەرنەگرێ. لە هەموو عەصر و زەمان کە ژن لێی قەوما بی، پیاو بەخێوی کردووە، سەعی و کۆشش و تەقەللای پیاو، بۆ ئیدارەی ژنە. پیاو خـۆی جانگ لەبەر ئەکا بۆ ژن لیباسی ئاوریشم دروست ئەکا، ئەوەندە میـرات پێدانە مەحزەن لە لوتفی خودایە، دەرحەق بە جنسی لەتیـف. لەو مەقـامە مەخصوص بەیانی موززیەتی جنسە، وە ئیللا بەعزێ ژن هەن، هەزار پیاو ئەهێنن، لاکین موقابیلی ئەوە، پیاوی وا هەیە گەلێ لە فەوقی ئەوە.
ئەوەی بەیان کرا لە ئیدارەی ژن، بە حیمایە و ئینفاق، شـەئنی پیـاوی چاکە، قسە لە ئیمان نییە.

١١٥/٢

## من ٣٨ ساڵە، ساحێبی عائیلەم، لێدان ڕووی نەداوە

مرووەت و شەهامەتی ئینسانییەت، کە ژن حیفز ئەکا، لە شتی ناموس شکەنانە. گەلێ حەیوانات ئەبینن، خصوص باڵدار، تا مومکین بی، خـۆی

تەسلیمی غەیری ئەلیفی خۆی ناکا، حەتتا مریشك ئەبینن، ئەو بـان و ئەو بان ئەفڕێ، هەڵدێ، لەبەر کەڵەبابێکی، کە ڕامی نەبووبی.

قورئان ڕێی وەسیط ئەنوێنێ، لە بەینی ئیفراط و تەفـریط، حوکەمـای غەرب، حەتا بەعزێك، ڕازی نین پێیان بڵێن: جنسی لەتیـف، وە بەعزێـك ئەیانکەنە ئیلاهـ

دەرەجەی ژن بڵنـدە، ئەممـا پیـاو لەو بڵنـدترە، وە لەو بڵندییەشـدا، حامییە، سەییدێکی خادیمە، ئەو نەوعە ژنە قابیلە ئیصلاحی مێرد بکـا. چ حاجەت، کە مێرد نەصیحەتی بکا...

١١٦/٢

لێدانی ژن شەرعەن مەزمومە، کەسێکی بە ویجدان بـی، تەحەممـولی عەزاب ئەکا، وە لێی نادا. لە حەدیسـی شـەریفدا هەیە: ئایـا شـەرم ناکـا، کەسێك، لە ئێوە لە ژنی خۆی بدا، وەك لە عەبـد ئەدا، لە ئەووەلـی ڕۆژ. دوایە موعاشەرەی بکا، لە ئاخیری ڕۆژ؟

من ٣٨ ساڵە، ساحێبی عائیلەم، لێدان ڕووی نەداوە.

١١٧/٢

## قەپۆز بڵندان

شەخسێك هەبوو، کاتبی تابووری ڕەدیف لە کۆیە. بـاوکێکی پیـری صالحی هەبوو، شەو کە ئەچووە بەعزێ قۆناغان، لە جیـاتی خـدمەتکار، فانوسی پێ هەڵئەگرت.

١٢٠/٢

## دەعیەیان ناهێڵی بڵێن فڵان کەس باوکمانە!

خوای تەعالا ئەو کەسانەی خۆش ناوێ، کە قەپۆز بڵند و بە دەعیە و خـۆهەڵکێش بــن بەقســە، ئەو نەوعە کەســە لە بەدئەســلان زۆرن، کە نەختێك دەوڵەمەند بـوون، یـا بـوون بە مەئمـوور، خۆیـان لـێ ئەگـۆڕێ،

حەتتا دەعیەیان ناهێنی بلێن فڵان کەس باوکمانە، یا فڵان و فڵان خزمی ئێمەن، چ جایە ئیحسانیان لەگەڵ بکەن. لاشەك ئەو جۆرە کەسە لای خودا و خوداییان خۆشەویست نین، ئەگەر ئەوانە نەوعەن ما ئیحسانێکیان هەبی، هەر نەئیسە، خۆیان هەڵبدەنەوە.

١٢١/٢

## پیسۆ!

بەعزێك هەن چلکن، پیسی بۆری نەوتاوی، زۆر دەوڵەمەندن، حەز ناکەن کەس بزانێ ماڵیان هەیە. شەخسێك بۆ ئێمەی حیکایەت کرد، وتی: پیاوێك وتی: میقدارێکی تەواو پارەی شەخسێکم لابوو، لە خوا بەولاوە کەس نەیئەزانی. ڕۆژێ گوتیان: فڵان کەس نەساغە.

چوومە لای وتم: چۆنی؟

وتی زۆر چاکم، چ بەڵام لێ نییە.

پاش دوو ڕۆژ، وتیان بێ صیحەتە. چوومە لای ئیشارەم بۆ کرد، ئەنگوستی هاویشتە سەر دەم: وس.

هەستام دەنگم نەکرد، پاش ڕۆژێك، وتیان ئەوا ئەمرێ لەسەری ئەگریەن.

چووم لێی نزیك بوومەوە، هۆشی هەبوو، باز ئیشارەی کرد: دەنگ مەکە!

منیش وتم وەڵڵاهی ئەیخۆم. کابرا مرد، نەیویست کەس بزانێ، پارەی لای من هەیە!

١٢٢/٢

## لە غەیری قەولی خوا و پێغەمبەر قەولی کەس حوججە نییە!

ئەو نەوعە کەسانە لە هەموو عەصردا هەن، مەلان، ئەهلی صەلاحن،

نافذ الکلمەن معتبر القولن، قسەیان لای سەوادی ئەعزەم، لە بەینی مەلایان حوججەتە، فەرمایشیان عادەتەن حەدیس و ئایەتە. ئیمانیان هەیە، بە شێت و گێژ و وێژ و عەورەت بەرەڵلا و قون نەشۆران، لەبەر دەستی جاهیلان کە جیبت و تاغووتی عەصری خۆیانن، بەناوی ویلایەت ڕائەوەستن. بیاننوارێ عەینەن بوت پەرستن، تەعن لە علومی دینیە وە ئەئیممەی دین ئەدەن، عیلم و شەرع لەپێش چاوی ئوممەت ئەخەن، عیلم، عیلمی کەشفە، عیلمی زاهیری چ نییە، عولەمای عیلم لە مردیان وەرئەگرن. ئێمە عیلم لە (حی، قیوم) وەرئەگرین، مل شۆڕ ئەکا، سەر ئەباتە (جیب)ی موراقەبە: حدثنی قلبی عن ربی. حەققەن ئەوانە موسیبەتن بۆ دین، بۆ عەقڵ، واجبە لەسەر عولەمای ئوممەت نفوذی ئەوانە کەم بکەن.

ئەی مسوڵمانینە بە غەیری قەولی خوا و پێغەمبەر، قەولی کەسیتر حوججەت نییە، قابیلی غەلەت و سەهوو نسیانن.

١٣٧/٢

## حاشا (إختلاف أمتی رحمة) حەدیس نییە!

لە عولەمای مەزاهیب، چ ئیعتیقادی چ ئەعمالی، حوببی ڕیئاسەت، تەمەعی دونیا، عالەمی گێژ و وێژ کرد. ئەسڵەن گوێیان نەدایە کەلامی خودا. لە مونازەعاتی دینی، نەوعە نەفرەت و تەفرەقە و عەداوەتێک کەوتە ناو مسوڵمانان، وا مومەزیق بوون، چ ئوممەت و ئەدیان تووشی ئەو نەفرەتە نەبووین. حالەن ئەو عەداوەتە دەوام ئەکا پاش ئەو هەموو زیللەت و نەکبەتەی بەسەر مسوڵماناندا هات. وە بەڵکو بە واسیتەی قادیانی، بهاء اللەی بابی، عەداوەتی جەدید و شەدیدی حوکم فەرمایە، هەتا ئێستا چاك بوو، ئەگەر کەسێك دەعوای ڕیسالەتی کردبایە، حکومەتی ئیسلامی لە چەنەی ئەدایەوە، وە ئەیفەوتاند. ئەمڕۆ ئەوەش نەماوە، مەیدان واسعە، هەر کەس ئەتوانێ دەعوای ڕیسالەت بکا، وە بۆشی سەرئەگری. هێشتاش سەوادی ئەعزەم لە مەلایان وائەزانن،

إختلاف أمتي رحمة حەدیسی پێغەمبەرە، حاشا، ثم حاشا، قەت ئیختیلاف ڕەحمەت نییە، بەڵکو غەزەبی ئیلاهییە. حاشا ئەوە حەدیسی ڕەسوولی خودا نییە. عولەمای کەلام لە کوتوبی کەلامی زیکریان کردووە، وە ئەوانیش موحەددیث نین.

١٤٦/٢

## بە شەرع دەکەی یان بە قانوون؟!

لە کوللی عەصر ئەو نەوعە کەسانە زۆرن، کە دەعوایەکیان کرد، ئەیانەوێ هەر بیبەنەوە. من گەلێکم دیوە لە مسوڵمانان، مسوڵمانی چاك، بە تاعەت و تەسبیح و تەهلیل، ئەگەر دەعوایەکی بووبی، زانانـدبێتی بە شەرع ئەیدۆڕێنێ، وتویەتی: من بە قانوون ئەکەم.

یا بە قانوون حەقی نەدرایتێ، وتویەتی: من بە تیجارەت ئەیکەم. دیومە کەسێ حوکمی بە شەرع بۆ درابێ، ئەیوت: دەستێ شەرع بیبڕێ خوونی لێ نایە، ئێمە بە چی مسوڵمانین؟ بە شەرع!

ئەگەر دۆڕاندبێتی ئەیوت: ناوەڵلا مەلا، بە خوای شەرعت گۆڕی، چۆن وا ئەبێ؟

چەندێ لەمەو پێش زاتێکی بە دین و موتتەقی بە تەسبیح و ویرد و ئەوراد و ئەمین، موئتەمەن، حاجییولحەڕەمەین، لەگەڵ کرمانجێکی ئەهلی گۆپتەپە، بۆ دەعوایە هاتنە لام.

زاتە بەدینەکەی فەرمووی: کەسێك عەلبە گەنمێك بچێنێ، پاش شین بوون، نیوە عەلبە لەو بنە تۆیە بە شەخسێ بفرۆشێ، دروستە یان نا؟

وتم: نا، قابیلی بەیعی نییە، گەنم بە گەنمی نەماوە، مقدور التسلیم نییە.

بە کرمانجەکەی وت: ئا، بابم پارەکەم بدەوە، ئەم معامەلەیە حەڕامە، بێ شەرعییە.

کرمانجەکە وتی: قوربان ئەم حوکمە هەر بۆ ئەم ساڵە، یا هەموو ساڵێك وایە؟

وتم ئەو قسەیە مەعنای چییە؟

وتی قوربان ئەو زاتە چەند ساڵە ئەو معامەلەیە لەگەڵ من ئەکا،

هەموو ساڵێك دەغڵێ زۆر وەرئەگرێ، دەنگ ناکا، چونکە قازانجیەتی. ئەمساڵ دەغڵ خراپە، پیك بڕەی لێداوە، سن و کیسەڵە خواردویەتی، ئەزانێ زەرەر ئەکا، بەرۆکی گرتووم بچینە شەرع. من بەسەرچاو ڕازیم ئەوەندە دەغڵی لەو ساڵانە لەمنی وەرگرتووە بمداتەوە، منیش ئەو پارەی لە ئەوم وەرگرتووە، هەمووی ئەدەمەوە.

منیش گەلێکم سەرزەنشتی حاجییەکە کرد، بە کەماڵی مەخجوول هەستا. ١٤٨/٢

## بە سواری کەرێ شین ڕووبەرووی تەیارە نەبنەوە

ئەوەی ئەسبابی خۆپاراستنە، بیگرن، ئیمانی بەقووەت و قودرەتی خوا مەغرورتان نەکا. بەتەمای دوعا و موعا و هیممەت و میممەتی فلان و فلانە مەبن، ئیعتیماد مەدەنە سەر موعجیزە و ئاڵا و ماڵا، وەك جوو، کە قووەتی قەلبیان بە تابوت بوو. ئەی وای! مسوڵمانان چۆن موخالەفەی ئەمری خوایان کرد؟ تاکو لە هەموو مەیادینی قیتال شکان، بە تۆبزە قیڕ نییە، هەڵکوتانە سەر تۆپ"میگواری أحسن لو تویەك؟!" وە بە تفەنگە شینکە و شەنایدرش چوونە موقابەلەی هەوان و تۆپ و قەنابیل و ڕەشاشات، بە سواری کەرێ شین، چوونە موزاحەمەی قیتاڕ و سەییارە و تەیارە. هەی هاوار: غەوسی گەیلانی[1] هاوار، شێخ شازلی[2]، فەریاد.

---

(١) عەبدولقادر ئەلجەیلی یان جەیلانی یان گەیلانی (١٠٧٧-١١٦٥ز)، ناوی ئەبو محەمەد عەبدولقادر کوڕی موسا کوڕی عەبدوڵلا بە سوڵتانی ئەولیایان ناسراوە، ئیمامێکی سۆفی و شەرعزانێکی حەنبەلی بووە، پەیڕەوانی بە تاجی عاریفان، محی الدین، قوتبی بەغدا ناوی دێنن و تەریقەتی قادری لەوەوە سەرچاوەی گرتووە. وێڕای دیوانێکی شیعری، ژمارەیەکی زۆر بەرهەمی نووسراوی لەپاش بەجێماوە.

(٢) ئیمام ئەبولحەسەن عەلی کوڕی عەبدوڵلا کوڕی عەبدولجەبار کوڕی یوسف، نەسەبیان دەگەڕێتەوە سەر عەلی کوڕی ئەبو تاڵب، لە ساڵی ٥٩١ك لە مەغریب لەدایك بووە، سۆفییەکی مەزنی سەردەمی خۆی بووە. زانایان زۆر پەسنی دەکەن. لە ساڵی ٦٥٦ك کۆچی دوایی کردووە.

دەسـوقی[1] فەریـاد. ئیمـام ڕەزا دەخیـل. شـێخی سنوسـی. هـای گەنـج عوسمان. وای تۆپی کەلـلە، فائیدەی نیـیە، خـوا خـۆی ئەفەرمـوێ: خذو حذرکم، ئەمانە هیچیان حذر و حرز نین، بۆ قیتال کەڵك ناگرن..

١٥٦/٢

## هاتنی ئینگلیز بۆ کۆیە

وەقتێ کە ئینگلیز هاتن بۆ وڵاتی ئێمە، ئەوەندەی مانەوە، مسوڵمانێك نەیتوانی کەسێك بکوژێ، ڕێگری بکا، پووش بسووتێنێ، مامرێك لە ئـاو بکا. ئەو شەوەی کە حاکمی سیاسی لە کۆیە ڕۆیشت، لە زەرفی شەو و ڕۆژێك، لە ئەتڕافی شار یازدە کەس کوژران. دزی، ڕێگـری، نەهـب و غارەت، قەتل و قتول، شەڕ و شۆڕ گەیشتە ئەوجی ئەعلا.

ڕۆژێك بەعزێ لە بەگزادانی خۆشناو و ئاغاواتی کۆیە هاتنە لای من، بۆ بەعزە ڕا و تەدبیر، پێم وتـن: ئەگەر خـوا سـوئالیان لێبکـا، بـۆچی تـا ئینگلیز لەناوتان بوو، ساکن و ساکت و بە ئارام و بـێ سـەییئات بـوون؟ کە ڕۆیشتن، نائیرەی فیتنە و فەسادتان بەرپا کرد؟ جوابتـان چیـیە؟ دیـارە جواب ئەو ئایەتەیە (وَقَالُوا رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ) بـۆچی شـەڕکردنت لەسەر نووسین؟ ئێمە ئارەزووی سـیلممان هەیە، عیبـادەتی تـوو ئەکەیـن، نوێژ ئەکەین، زەکات ئەدەین.

گەلـێ کەس لە مسـوڵمانان ئەیـانوت: چ قەیـدیە؟ ئینگلیـز ئیسـتیلای وڵاتی کردووە، مەنعی نـوێژ و ڕۆژوومـان ناکـا، دەخلـی ئـادابی دیـن و قەومیمان ناکا.

١٦٠/٢

---

(١) مەبەسـت ئیبـراهیم دەسـووقییە، نـاوی ئیبـراهیم کـوڕی عەبدولعـەزیز کـوڕی ئەبولمەجدە (٦٥٣ هـ/١٢٥٥ م - ٦٩٦ هـ/١٢٩٦). پێشەوایەکی سۆفییانی میصر بـووە و تەریقەتی دەسووقی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

## جاسوسیی بۆ دوژمنی خۆی دەکا و دەڵێ مسوڵمانم

ئەو نەوعە ئینسانە لە هەموو عەصرێ لە هەموو میللەتێ هەن، کە پێیان گەیشتبایە شەئن و حالێ دائیر بە ئەمن و صولح و موسالیمە، یا دائیر بە حەڕب و موجیبی ترس، بێ تەئەممول و تەفەککور لەگەڵ هاتنی ئەمرەکە ئیشاعەیان ئەکرد. نە یەکێ، بە کوللی زۆرن، حەتتا قسمێك، ئەحوالاتی حەڕبییە، یا سلمییە، وە سائری کاروباری تەدبیری مولك و سیاسەت، بێ فکری خیانەت ئیفشا ئەکا کەئەننەهو شتێکە بۆ ئەوان بۆتە تەبیعەت، وەك ئەڵێن:

نیشی عقرب نی ئەز پەیکی کینەست
موقتەزای تەبیعەتاش این است[1]

وە گەلێکیان (من حیث المسلك) لەو مەقامە زۆر دوورن، لام وایە بە نسبەتی نفوسی ئەو گرۆهە، لە کوردان، لە هەموو میللەتێك زیاترن، ئەبینی ذبالێکە، لە سیاسەت ئەدوێ، گۆیا مۆسیلینی یە، یا هتلەرە، یا باڵدۆنییە. شاگرد چەقۆ کەرێ لە ئوموری تەشریعی قسە ئەکا، ئەڵێی عەلی حەیدەری أبو الحقوقیونە و گەلێ کەس، جاسوس بۆ عەدووی میللەتی خۆی ئەکا. وە ئەشڵێن: ئێمە مسوڵمانین.

١٦٨/٢

## برایەك برای خۆی کوشت لەسەر دوو مست نۆك

لە ئەییامی ئێمە شەخسی وا هەبوو، ئەیوت: من کە کەسێك ئەکوژم، کەیفم بە لینگەفڕکێی دێ. فی الحقیقة قیاسی قەتل لە گوناهێ تر

---

(١) ئەمە پەند و ئیدیۆمێکە و لە یەکێك لە شەرحەکانی گولستانی سەعدیشدا هاتووە، لە بنەڕەتدا بەم شێوەیەیە:

نیش عقرب نە از رە کین است
اقتضای طبیعتش این است

ناکرێ، بینای خوا- کە هەیکەلی ئیجتیماعی ئیسلامییە- بیلا موجیب تێك ئەدا، سەبەبی بە قەولی ئەسحابی ئێمە قەتل لای مسولمانان زۆر سووك بووە.

حەتتا لەو چەندانە، برایەك برای خۆی کوشت لەسەر کۆتکە جۆیەك، برایەك برای خۆی کوشت لەسەر دوو مست نۆك. لە مەعزەرەتدا ئەڵێن: سەد گوناهـ و یەك تۆبە. ئەمڕۆ تا سبەی تۆبە ئەکەین، خوا لێمان خۆش ئەبێ! توخودا سوێندت ئەدەم بە خودا: تەصەووڕ ئەکەی، کەسێ میسقالە زەڕڕەیەکی ئیمانی هەبی، مسولمانێ فەقیر، بەخۆ و کەرۆکەیەکی، بە سەرمای زستان، بچێتە چیا بارەدارێکی بینێ، بۆ قووتی خۆی و عائیلەی بیفرۆشێ، کەسێ تووشی ببێ، بە تەماعی کەرێ، چوار مەنگەلی باوی و دوو پەتکی گوریس و تەوراسێکی کولە بیکوژێ؟ حاشا ثم حاشا قیاسی قاتل لە کافر ناکرێ. کافر دوشمنە، بە موقتەزای دوژمنایەتی، ئەوەی بیکا، ئەیکا، کە ڕیفعەتی عەداوەتی بوو بە ئیمان هێنان، قبولی تۆبەی زۆر مەعقولە. ئەمما موئمین لەگەڵ موئمین هیچیان لە بەینا نەبی بە غەیری جیهەتی ئیتیحاد و مەحەببەت و ئیثار، موئمین بکوژێ؟ چۆن تەوبەی قبوڵ ئەکرێ؟ وە لە هەموو تەئویلاتی ئەسحابی ئێمە دوورتر، کە لەگەڵ مەقام ئەسڵەن موناسەبەی نییە.

١٨٠/٢

## سیاسی دینی نییە

ئێستا کە سەوادی ئەعزەم لە مسولمانان لەبەر دەستی فڕەنسە و ئینگلیز و سائیری دوەل دان، سوپاهی نەصرەت پەناهیان، بە ئەکثەریەت مسولمانن. وە سیاسەت بالکلیة – وثوقی بە دین نەهێشتووە- سیاسی ئیجاب کا مسولمانە، بوتپەرستە، دیانە، جووە. وە لە حەقیقەتدا، هیچ دینی نییە. خولاسە مەوقیعی ئێمە بە نەزەر ئەو سیاسیانە، زۆر موشکیلە، ئەمڕۆ گەلێکیان ئیمان ئێنن، ئەڵێی قبول نییە، نابی، شەرع مانیعە. ئەڵێی قبوڵە، تووشی هەزار فتنەت ئەکا. هەموو ئەسراری مسولمانان ئەزانی، وە

بۆ قەومی ئەنووسێ، بە جارێ پڕوپاتاڵمان بەدەر ئەکەوێ. بە هەمە حاڵ، ئیعتیراز و ئیحتیراس، لەوانە لازمە، مەخفی نەبی.

١٨٢/٢

## سیاسییەکان دین و شەرەف و عەهد و پەیمان دەخەنە ژێر پێ

لە زەمانی ئێمە قسەی لێ ناکرێ، سەوادی ئەعزەم لە مسوڵمانان، لەژێر حوکمی ئینگلیز و فرەنسە و ڕووس دان. حەتتا لە زەمانێک، سیاسیی ئینگلیز وتیان: مەلیکی ئێمە خەلیفەیە، چونکە ئەوەندە مسوڵمانی لەژێر ئیدارەی ئەون، لەژێر ئیدارەی پادشاهی ئیسلام نین، وە گەلەکیان ئەڵێن: دەوڵەتی ئینگلیز ئەکبەر دەوڵەتی ئیسلامییە. بەڵێ ئەمڕۆ دین و خەلافەت -بەڵکو خوا- مەلعەبەیەکی سیاسییە بەدەست سیاسییونانەوە.

لە ناپلیۆن نەقل ئەکەن، ئەیوت: من ئیمانم بە ئەدیان نییە، لە میصر مسوڵمان بووم، لێرە کاسۆلیکم. بچمە قودس بۆ خاتری جوولەکان، تەعزیمی هەیکەلی سلێمان ئەکەم. شەڕی ئەوانە عیلاج ناکرێ، مەگەر بە سیاسییە وەکی ئەوان. ئەمەش لە دینی ئیسلامدا نییە، یەکێک لە سیاسییونی ئیتاڵی وتبووی: وا ئەبیە مەردی سیاسی، بۆ نیلی مەقسەد دین و شەرەف و عەهد و پەیمان بهاوێتە ژێر پێ.

ئەو وەقتە گەلێ لە ئەورووپاییەکان زەمیان ئەکرد، ئەمما ئێستا هەموو ئەوهان لەبەر نامەردییە ئیفتیخار ئەکەن، چونکی لەو ڕووەوە قازانجیان کرد.

١٨٨/٢

## نوێژ لە کاتی بارانی تەیارە لە کۆیە

ئێمە کە بارانی تەیارەمان دیت لە شاری کۆیە، بەعزە بۆمبا بە بەرد، یا بەجێیە ڕەق ئەکەوت، شەهقەیەکی وای لێ ئەهات، لە فەوقی صاعیقەی هەوری موتەراکیمی بەقووەت. لەو ئانەدا، دەهشەتێ ئیستیلای

ئینسانی ئەکرد، ئینسان ئاگای لە مردنیش نەدەما، لەو نەوعە حەڕبانە نوێژ چۆن ئەکرێ؟! ئەوی نوێژ لەسەر ئەو موحاریبانە فەرز بکا، مەقسەدی ئەوەیە لای خوا گوناهباریان بکا. لەگەڵ ئەوەشدا عەسکەری بێ چارە، ڕوحی لەسەر دەست داناوە، لە ڕێی خودا بەختی ئەکا، لەو وەقتەدا، خدمەت لەوە گەورەتر ئەبی.

١٩٣/٢

## ئەو بوغز و نیفاقی لە بەینی مەلایاندا هەیە، لە بەینی عەوامدا نییە!

یەکێ لە عولەمایەکان ئەڵێ: ئێستا عیلم زۆر ناقیصە، چونکە سەبەبی بە سوئی سیاسەتی دوەل، مەلایەکان مولاقات لەگەڵ یەك ناکەن. عالیمی ئەڵمانی لەگەڵ عالیمی ئینگلیزی و فەڕەنسەیی بۆ موداوەلەی ئەفکار، لەسەر ئەسراری تەبیعەت لە جێیەك گردنابنەوە. وەکەذا سائیری عولەمای دوەلی موحاریبە و موعادیە. پێش ئەمڕۆ دوو عائیقی هەبوو، یەکێ دین، ئەوما (مهما أمكن) ئیزالە کرد. ماوەتەوە عەوائیقی سیاسەت، ئەم ئیزالە ناکرێ. مع الاسف علوم بە تەواوی تەرەققی ناکا! فی الحقیقەت ئیجادی ئەکرد، ئەهلی عیلم لەهەر فرقە و ئوممەتێ بێ، بە یەك کوتلە حیساب بن، عەداوەت نەهاوێنە دڵی خۆیان. ئەمما بیلعەکس ئەو بوغز و نیفاقی لە بەینی مەلایاندا هەیە، لە بەینی عەوامدا نییە، بەڵکو عەداوەتی عەوام مەنشەئی لە عەداوەتی مەلایانە.

١٩٨/٢

## ئەوانەی دەماغیان وەك ناوکە کدووە

حاشا ئەو مەککارانە، ئەو سیاسیونانە، مەقصودیان، ڕەزای خوای نییە. سەوادی ئەعزەمیان ئیمانیان بە خوا نییە، هەرچی بیکەن، هەرچی بیڵێن، هەووی مەکرە، حوقەبازی، هەڵخەڵەتاندنی، بێ هێزانە، ئەمریکانی، ئینگلیز، فەرەنسە، ئەلمانیا، سائیری دوەلی غەرب، بینای موستەشفا و

مەکاتیبیان بۆ سەعادەتی بەشەرە؟ بۆ ئیرتیقای ئینسانە؟ ئەی وای کەسێك ئەو گومانە بیا جاهیلە، نەفامە! بە غەیری هەدمی دین و حەق و شەرەفی بەشەری هیچ غەرەزیان نییە. وەعدی ویلسۆن و موبەششیران بۆ چییە؟ زوعەفا لە چەنگ ئەقویا نەجات بدەن؟ ئینسان لە عەزابی قیامەت قورتار بکەن؟ کێ ئەو خەیاڵە ئەکا؟ مەگەر کەسێ دەماغی وەك ناوکە کدوو بێ. کەللەیە مێشکی تیا بی، ئەو تووڕەهاتەی پێوە نانووسێ.

١٩٩/٢

## ژن پەرستەکان

عەجایبە ئەوانی موشریکن غەیری ئیلاهی حەڕب، باقی ئالیهە بە کچێکی حەسنا تەخەییول ئەکەن. ئێستاش جەمعێ هەن لە بەشەر فەرج ئەپەرستن، کچێ لەوانە بگاتە دەرەجەی غایەت لە حوسن و جەمال، ئەیکەن بە ئیلاهـ لە بەعزە مەراسیمی دین، لەسەر تەختی موجەوهەر دائەنیشێ جوق جوق بە بەردەمیا تێئەپەڕن، دەستیان بە فەرجی موبارەکی دادێنن، دەستی خۆیان ماچ ئەکەن لەسەرچاویان دائەنێن. وە ئەوروپایی بالعموم ژن پەرستن، سیادەت هی ئەوانە پیاوەکان عەبد و خزمەتکارن. بەعزێ مام ئالی لە ئێمە زۆر حەز ئەکەن سیادەتی ژنان لەناو مسوڵمانان تەعەمموم بکا.

٢٠٠/٢

## کاری شەدەڵییەکان ئابرووی کوردانی پێ چوو

قسمێ لە سۆفییەکانی ئێمە نەختێ لە مەلایان حاصڵی سۆفستائییەکان لە تەغییر و تەهوینی عەقڵ خەریکن، بە موغالەتات بە موشاغەبات بە تەبعی شاعیرانە هێزی عەقڵ نایێڵن، تاکو خەڵکی وەك گوێ درێژ علی العمیان تەسلیمیان بین. عەقڵ بە ترساندن خصوص لە عیقابی ئیلاهی زوو تەسلیم ئەبێ. لەو ڕووەوە بێ (لِمَ) گەردەن دادەی ئیتاعەی ئەبێ، مەحالات هەزم ئەکا، ئەو تەفسیرە مەبنییە لەسەر ئەوە کە بڵێین تەغییرە

کە ئەبێ، وە ئیللا ئەتوانین بڵێین گاجووت ئەکەن بەخوا، ئەمما نابێ ئینسان بکەنە کوڕی خوا. بەخوا ئیبن مەریەم نابێ بە ئیبنولڵا، مەلائیکە ئەکەن بە کچی خوا، وە کوللی تائیفە لە ئەهلی عیلم و حیکمەت خاڵی نییە. ئەوجا یا بەعزە مەخلوق ئەگەیننە دەرەجەی خوا، یا خوا ئەهێننە دەرەجەی مەخلوق.

تەفسیری تەئریخ، تەفسیری ئەوصاف لە شیمەی جولەکان و قەساوسەی ئەوروپایی و ئەمریکانیەکان لە ئەفشەحی ئەشیایە. خولاصە شەیتان نەصیبی خۆی وەرگرت، ئەمما لە سەدی نەوەدو نۆ. ئەمما شەیتان عالی هیممەتە، شکم نییە کە بە کردەوەی شەدەڵیان ڕازی نییە نەبڕا لە هەمو قیود بەدەرە، حەتتا کوفریش نییە، چونکی کوفر مەعنایەکی هەیە، ئەمما ڕەفتاری ئەوان هیچ مەعنای نییە. یەك ئەمەرەی هەیە، کە ئابڕووی کوردانی پێ چوو، نە جوو، نە دیان، نە ئیباحی، نە بتپەرست، نە سەگ پەرست، نە فەرج پەرست، بە موعامەلەیان ڕازی نییە. ئەمما تەفسیری بە کوتان بە ددان لە چەرخدان، بە ڕیش تاشین و شتی وا لام زۆر بێ قیمەتە.

٢٠٢/٢

## کوردەکان کچان وەك جاشك و گۆلك ئەفرۆشن

صالحانی مەلایان لەگەڵ صالحانی جاهیلان جوایەزە، صالحانی دوقتور لەگەڵ صالحانی کاروانچی فەرقی هەیە. وەکەزا صالحانی دەوڵەمەند و صالحانی فەقیر فەرقیان دیارە و صالحات بە وەقت ئەگۆڕێ. چ نێر، چ مێ فەرقیان چییە نەزەر بە چاکە؟! ئەگەر چی مێ لای ئێوە موهانە. ئەمڕۆ کوردەکان وەك جاشك و گۆلك ئەیانفرۆشن لە پێناو ئامالی خۆیانیان دائەنێن، گوایە بە مێردیان ئەدەن. بەڵام خوا ڕەببولعالەمینە، فەرقی ئەو تائیفە و ئەو تائیفە ناکا، ئیسرائیلی و قورەیشی و قیبتی و حەبەشی لای موساوییە.

٢٠٤/٢

## مارە بە جاش

ئەوانەی هجووم ئەکەنە سەر تەڵاق وا نەبێ، دەست بەجێ پەشیمان ئەبنەوە. ئەو مەلا و ئەم مەلا تەزەللول و پاڕانەوە و ڕەشوەت دان. عیبارەت گۆڕین مەلای بەستەزمان نازانی چی بکا، کتێب هەڵگێڕ و وەرگێڕ ئەکا، ئاخری ئەمر أعز الله الشرع الشریف چارە مارە بەجاشە. هەرچی موافیقی شەرع بێ باشە. گەلێك مەعنایان بۆ دەوڵەمەندکردن لێداوەتەوە، حەقیقەتەن وا ئەبێ ژنەکە مێردی چاتری بەدەست ئەکەوی عومری بەخۆشی سەعادەتی لەگەڵ ڕائەبوێری. ئەمما کوللی نییە ئەکثەریش نییە.

٢٠٩/٢

## سەگی بەرەڵڵا کوشتنیان لازمە

سەگە گڕەوەکانی بەرەڵڵا کوشتنیان لازمە، ئەوانیش نەجاتیان ئەبێ ئینسانیش دەرد و بەڵای کەم ئەکا. نەقل ئەکەن لە شاهی نەقشبەند، لە ئەوائلی مەعنا مەئمور بوو بە تەداویکردنی سەگەکانی گڕوو و بریندار و شەل و نەخۆش. ئەیفەرموو کە تیمارم ئەکردن، ئەنووزانەوە و دوعایان بۆم ئەکرد، من هەر بەرەکەتەکی نائیلی بووم لە دوعای ئەو سەگانەی ئەزانم.

سبحان الله ئەمە حاڵی شاهی نەقشبەندە، ئێستا گەلێ لە ئەتباعەکانی لە سەگی گرد خراپترن. حاشا ئەتباعی ئەو نین بەڵکو ناوی ئەو زاتە موحتەرەمە و بەناوە، بەدل ئەکەن. خوا بیانکوژی ئەو سەگانە لەکۆڵ مسوڵمانان بکاتەوە.

.٢٥٢/٢

## فاتێ خۆزیا خۆزیا بە تەنێم ئی خۆ بای!

نێرو مێ ئەبنە دۆستی ڕاستی بێ مەیلی خیانەت، ئەحوالی بەشەر لە سایەی غەریبان زۆر گۆڕاوە. ئەبینی ژن قۆڵی لە قۆڵی دۆستی هەڵکێشاوە، وە مێردەکەشی بە دوایاندا ئەڕوا گەلێ مەسروور و مەمنوونە. شەرقیش گەلێ کەیفیان بەو نەوعە دۆستییە دێ. کەسێ تەماشای جەرائید و موجەللات بکا، ئەبینی لە ڕووی دۆستی چی فەزائیح ئەقەومێ. ئەمما لای مونەووەر و مەدەنیەکان هیچ عەیب و عاری تیا نییە. حەقیقەتەن چۆن ئینسانی غیور وە بە نامووس، حەز ئەکا ژنی تەنها بۆ خۆی بێ وەك کابرای خۆشناو بە ژنی خۆی ئەگوت: فاتێ خۆزیا خۆزیا بە تەنێم ئی خۆ بای. ژنیش حەز ئەکا پیاو بەتەنێ ئی خۆی بێ، هەردوو لا عەفیف بن، چاو لەدەر نەبن. ئەوسا بە سەلامەتی ڕایئەبوێرن، مەقاصیدی ئیزدیواج بەجێ ئەگەینن.

٢٥٤/٢

## سێ شت لەناو عوسمانییەکان هەیە

جوو (جوولەکە) خەتای خۆیان بوو. واقیعەن مسوڵمانیش شەرعیان زۆر گران کردیە، خصوص شعوب و مەزاهیب. بۆ ئینسانێ عومرێ درێژ لازمە، تا ئەیزانێ، ئەوجا کەی عەمەلی پێ ئەکا؟

پێش حەربی عوومی سەفیری فڕەنسەی موصل چووبۆوە پاریس، لەوێ مەقالەیەکی نەشر کردبوو، خیتاب بۆ عوومی ئەورووپا:

ئێوە بۆ تەقسیمی مەمالیکی عوسمانی شەڕ مەکەن، نەفس و ماڵ بە زائیع مەدەن. چونکە سێ چشت لەناو وان هەیە، هەریەك لەوانە کافیە بۆ ئینقرازی عاجل: فەقر، عەداوەتی خۆبەخۆیی، ئەنواعی نەساغی. پاش چەند ساڵێ ئەوانە مونقەریز ئەبن، ئەوجا بێ شەڕ و دەعوا میراتیان تەقسیم کەن.

٢٥٦/٢

## مەلا خەریکی نیزاعی موعتەزیلییانن!

هێندەی پێ نەچوو پاش وەفاتی پێغەمبەر دەستیان دا شمشێر چەند مەیدانی کارزانیان لە خوێنی یەك سوور کرد تەفرەقەیان بوو لە ئیعتیقادیات، لە عیبادات لە تەدبیری مولك و سیاسەت. چەند خیلافەت و مەلەکییەتیان تەشکیل کرد، لەبەر شەڕ و شۆڕی خۆیان هەموو مونقەریز بوون. تا دەوڵەتی عوسمانی پێگەیشت، ئیسلام قووەتێکی بوو، ئەوانیش لەگەڵ حکومەتی ئێران تێك گیران، دەوامی حەربیان بوو، هەردوو لایان سست بوون، ئەوروپایی قووەتیان ساند. وردە وردە بە تیجارەت بە دۆستی بە ڕەقس و بە دانس، بە کارخانەچییەتی بە شەڕ بە تۆپ و تەیارە، لە هەموو جەوانیب بەسەر مسوڵمانانندا غالب بوون. تا حەربی عومومی بە جارێك وەحدەتی ئیسلامیان تێکدا، بۆ ئیغوا موبەششیریان بڵاوکردەوە تا مسوڵمانان وەرگێڕن بیانکەن بە دیان. بە تەحریکاتی وان چەند کەس وەك باب و قادیانی هندی وە بەهایی ئێرانی هەڵستانە سەر پێ، دەعوای ڕیسالەتیان کرد. ئەلئان بە کەمالی حوڕییەت دەعوەتی مسوڵمانان ئەکەن بۆ ئیمان بەو جرو جامووشتانە. مسوڵمان بێ ساحێبن. ئیسلامەتی بێ کەسە.. حاصلی ئیسلامەتی چ ڕۆژی وای نەدیوە، دۆست و دوژمنی لێی بوو بە دوژمن. ئەلئان کان کما کان، مەلا خەریکی نیزاعی موعتەزیلییانن، جەعفەری لەسەر ماتەم و زیارەتی ئیمامانە، فاك و فیکی شێخ و ئەولیایان لەوێ ڕاوەستێ. شێخ قوتبە مودەببیری عالەمە لەگەڵ دەوراتی کائینات تێکەڵە، هیچ شت بێ ئەمر و ئیرادەی وی حەرەکەیەك ناکا. خودا گەر ڕەحمێك نەکا زۆر ناچێ بە جارێ دینی ئیسلام مەحوو دەبێ (نعوذ بالله تعالی).

وا مەزانن ئەمڕۆ نیهایەتی فتوحاتتانە، لە مەولا ئەمرتان ئەکرێتێ، بە تەوەجوهـ بۆ دەوڵەتی ڕۆم، بۆ دەوڵەتی فارس، مەڵێن ئێمە چۆن ڕووکەینە ئەو دوو دەوڵەتە جەببارە؟ حەقیقەتەن بەعزێ لە عەرەب لەژێر دەستی ئەو دوو دەوڵەتە بوون، ئەمما زیللەت و ڕەزالەتیان وەکی بەنی ئیسرائیلی نەدیبوو، وە ترسیان لە دڵدا شین نەبوبوو.

٢٧٧/٢

## بەسەرهاتی ئەصمەعی و ئەعرابییەکە

ئەصمەعی[1] ئەڵێ سورەتی مائیدەم ئەخوێند، ئەعرابییەکم لەگەڵ بوو لە ئاخری ئایەتی سیرقەت وتم: (واللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ).

ئەعرابی گوتی: ئەو کەلامە ئی کێیە؟

گوتم: کەلامی خوایە.

گوتی: ئە بیخوێنەوە!

دیسان وام خوێندەوە. دوای تەنەبوهم، خوێندمەوە (و اللهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)

گوتی: ئەلئان ئیصابەتت کرد.

گوتم: بەچی ئەزانی؟

گوتی: یا هذا! عەزیزی حەکیم ئەمر بە قەتع دەکا، ئەگەر لێرە ڕەحمی کردبایە وە لێخۆشبایە، ئەمری بە دەست بڕین نەدەکرد. کەوابێ دیارە بەلاغەتی قورئانی (من حيث المعنى) بە فائیدەترە لە (من حيث اللفظ).

٢٨١/٢

## بەهائوڵلائییەکان!

میرزا حەسەن بەهائوڵلا[2] گوایە لەبەر ئەو ئەحکامانە ئەڵێ شەریعەتی

---

(١) ناوی عەبدولمەلیك کوڕی قەریب کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی عەلی کوڕی ئەصمەع الباهلی یە لە نێوان ساڵانی (٧٤٠-٨٣١ز) ژیاوە. یەکێك بووە لە پێشەوایانی زانست و ئەدەبیات. خەلیفەکان بە تامەزرۆییەوە گوێیان لێ دەگرت، بەرهەمی نووسراوی زۆری لەدوای خۆی جێهێشتووە.

(٢) بەهائوڵلا (١٨١٧-١٨٩٢ز) لە تاران لەدایك بووە و لە عەککا مردووە. بە میرزا حسێن عەلی نووری ناسراوە، جێنشینی عەلی محەمەدی (باب) بووە کە دامەزرێنەری بەهائییەکانە. دەستەڵاتی ڕۆحی بۆ عەباس ئەفەندیی (عبد البهاء)ی کوڕەکەی جێهێشتووە و لە گرنگترین دانراوەکانی کتێبی (الاقدس) و (الايقان)ـە.

ئیسلامی ناقیصە، دەستی دز بڕین وەحشەتە لەگەڵ زەمانی مەدەنییەت ڕێك ناکەویٚ. ئایا ئەو (سەبوك مەغزە) وا ئەزانیٚ ئەو نەقصە زانی ڕیسالەت پەناهی ئەو دەرکی کردووە؟ هەر بە ڕیشی خاوەنی. ئەو قسانە هەزار ساڵ پێشی ئەو کرایە و جوابی درایتەوە.

ئەگەر ئەحکامی ئیلاهی ئیجرا کرابا ئەمڕۆ لە جێیێ وەك بەغدا و سائری بیلادی ئیسلامی، قەحپەخانە و مەیخانە بە ئیجارە ئەدرا؟ ئەو هەموو ژنانە تووشی ڕەزالەت و وەقاحەت ئەبوون؟ حاشا! ئەمما دینی ئیسلام دینی بولهەوەس و بێ شەڕەفان نییە. آمنا بالله ودینە.

٢٨٠/٢

## مەلای بێ ئەسڵ و برسی!

خوا ئەزانی کە مەلا برسی بوو، وەك حاجی قادر ئەڵێ: قورئان بە دوو نانان ئەدات و ناترسێ.

هەر دینێك کە تێك چوو لە مەلایانی بێ ئەسڵ و برسی تێك چوو، ئەگەر زادەکان بووبانە مەلا قەت دین زیللەتی نەدەدیت.

٢٨٦/٢

## ئەوی بێ دەسەڵاتە دوعا بکا خوایە لێم نەقەومێ!

ئەساسەن شەرائیع و حکومات خاصەتەن کە ئەحکامی جەزائی دا بۆ حیفزی بێ دەسەڵاتانە لە شەڕی زۆرداران. کەچی بیلعەکس موعزەمی ڕیجالی حکومەت و میللەت لە ئەکثەری ئەزمان و ئەعصار تەرەفداری ئەقویا ئەکەن. کەسێ زەعیف، بێ کەسێ بێ، هەرچی بەسەری بێ، ئەهەممیەتی نادەنێ. ئان زیادە زاڵم و غەددار محامییەکانن، ئەوی بێ دەسەڵاتە دوعا بکا خوایە لێم نەقەومێ.

٢٨٧/٢

## بە هەزار گورزی گران ئەو دڵە نەرم نابی!

من ئەوەندە ئەڵێم: مەحەببەت بۆ ئیتاعە لە هەموو دەلیل و بورهان بەقووەترە، بۆیە ئەوانەی دەعوەتی ناس ئەکەن، بە ناوی مەسیح، یا عەلی، یا شێخێ لە شیوخی تەریق. تەمامی قووەتی خۆیان، لە ئیلقای موحەببەتی ئەوانەیە بۆ ناو دڵی عیباد. ئەمڕۆ ژاپۆنیا نەوعە مەحەببەتەکی مەلیکی خۆیان هەیە، بە ئەمرێکی ئەو خۆیان ئەهاوێتە ناو ئاگر، وە عەینی سەعی ئەکەن بۆ بوغزی حەزرەتی موحەممەد و ئەبوبەکر و عومەر و عولەمایانی ڕاسخی ئیسلام. کە ئەو مەحەبەت و بوغزە لە دڵی داگیر بووە، قەتعیەن ڕووناکاتە حەق. بە هەزار گورزی گران، ئەو دڵە نەرم نابی.

٢٩٥/٢

## مەهدیی ناو بیر خنکا!

با بمرن لە ئینتیزارا، مەهدیی ناو بیر خنکا. مەهدی کە ئەڵێن لە مەککە زوهور ئەکا، تا ئەمڕۆ نەهاتووە. لەمڕۆش بەولاوە تا حکومەتی وەهابی لە حیجاز دابێ، هیچ؟ ڕەنگە مورتەدەکان پاش ئیستیلای ئیبن سعود بە وەهابیان تەعبیر بدەنەوە. ئەوانە هەذەیانن...

٢٩٦/٢

## مەلا تەجدیدی دین ناکەن!

قەومێ دینی ئینسانی لا سووك بێ، چۆن موالاتیان لەگەڵ ئەکرێ؟ ئەو کەسی بە حەق موتەدەیین بێ، دینی لا لە ڕوح و لە جگەرگۆشە خۆشەویستتر و بە حورمەتترە. ئەمڕۆ مع الاسف موعزەمی مسوڵمانان دینی خۆیان کردیتە مەسخەرە، قەشمەری و گەمەی پێ ئەکەن. هێشتا ئەوانی ئەهلی بیدعەتن لەو ڕووەوە ئەهوەنترن. ئەمە عەجەبا سەبەبی چییە؟ لای من سەبەبی بێ مێشکی مەلایانە تەجدیدی دین ناکەن، بە

نەوعێ کە لای لاوانی تازە پێگەیشتوو شیرین بێ. لەزەتێکی لێ بزانن لەسەر ئەو هەموو تەجەدودی کە لەم عەصرەدا هەیە ئەوان هەر لەسەر حالی دە عەصری پێش ئەمڕۆ ئەڕۆن. کەس خۆی ئاگای لە ئەساساتی دینی ئیسلام ببێ، ئەو ئەحوالاتەی سەوادی ئەعزەمی مسوڵمانان لەسەرین، بە دینی نازانێ گەمەی پێئەکا.

عولەمای ماددە و تەبیعەت ئیشیان گەیاندە دەرەجەیەك، کە ئینسان تیا حەیران ئەبێ، ئێستاش ئەکثەری فیرەقی مسوڵمانان لەسەر مەعنەویات ئەڕۆن، ئەمما مەعنەویاتێ کە لە حەقیقەتدا هەمووی شیرکە. وە بە عەینی تەوحید و دینی حەقی ئەزانن، کە هاتنە باسی اولیاء اللە مەپرسە بە جارێ نیزامی کائینات تێك ئەدەن. حەتتا ئیش لە دەستی خوا دێننە دەر. ئایا کەسێ کەر نەبێ بەو نەوعە موعتەقەداتە ڕازییە؟ حاشا.

٢٩٨/٢

## بانگی سبەینان و بانگی مەحموود ئاغای خاڵۆزام!

ئێستا زۆر سەیرە لە بەینی مسوڵمانان کەسێ نوێژێ بکا گەمەی پێ ئەکەن. لە کوردستانی ئێمەش ئەثەرێکی لەو مەسخەرە تیا پەیا بووە. پەنا بەخوا، خوا خێران کا. عەجایبە کەسێ ئەدنا شعوری هەبێ، گەمە بە بانگ و نوێژ بکا. ئاذانی محەمەدی بە دەنگێ خۆش بە لەهجەی شیرین ئەدا بکرێ، حەقیقەتەن زۆر موئەسیرە. خاصەتەن بانگی سبەینێ. ئەمما ئەگەر کەسێ وەکی مەحموود ئاغای خاڵۆزام بانگ دا زۆر گران و موستەکریە دێتە بەر گوێ. بەعزە موئەزین بانگ ئەدەن ئینسان قەصد ئەکا لۆکە لەناو گوێ خۆی بنێ.

٣٠٠/٢

## ئەوەی سوخریە بە دین بکا،
## خوا چۆن گەمەی پێ ئەکا!

لە نەزەری ئینسانێ، کە ئینسا بێ، عیبادەتی بت و ئەصنام و صوەر و هەیاکل، گا و پشیلە و قالۆچە، وە کەسێ وەك خۆی بەشەر هەر کەسێ بێ، مەزەلـلەتی زیاتر تیایە لە مەسخ بوون بە مەیموون. مەیموون شەرەفێکی حەیوانی تیایە، ئەوانە لەو شەڕەفەش مەحروومن، خەسیس و دەنیئ موحەقڤیر و موهان. عەجایب ئەوەیە ئەو دەنی تەبعانە ئەو دەنائەتە حس ناکەن پێی موتەئەلیم نابن. بیلعەکس موتەلەزیز دەبن، شێخ قبوڵ بکا لەبەر دەستی ڕادەوەستی، چاو لەسەر یەك، مل شۆڕ، بە فەخری ئەزانێ. سبحان اللە لەو بەشەرە چ بەشەرە؟ ئەوانە هەمووی ئیستیهزای خوایە، ئەگەر لای خوا موحەقیرو موهان نەبان، وایان بەسەر خۆ نەدەهێنا (نعوذ باللە من غضب اللە)

بزانن ئەوەی سوخریە بە دین بکا، خوا چۆن گەمەی پێ ئەکا! ئینپراتۆرێ کە حوکمی لەسەر ٤٠٠ ملیۆن نفوس بەشەریەن وەك مەیمون ڕەقس و سەما و دانسی پێئەکا. لە ویقاری بەشەری بە عینوانی فنونی جەمیلە ئەیکاتە دەر. سەرامەدانی سیاسەت مودەببیرانی مەملەکەت وەك بەراز بێ غیرەت و ناموسی ئەکا. ژنیان، کچیان، خوشکیان لەگەڵ ئەجانب ڕان لەناو ڕان، قۆڵ لە قۆڵ هەڵکێشراو ئەیانسوڕێنێ، لەسەر ئەو هەموو زیللەت و نەقصە تەعن لە دینی ئیسلام ئەدەن؟ هەی هاوار بەعزە ئەشعاری ئەبی عەلای مەعەری: وقال السە للشمس انت ضئیلة[1]، ئیرادەی جوانە.

٣٠٣/٢

(١) شیعرەکە لە تەفسیرەکە بە هەڵە نووسراوەتەوە، ڕاستیی شیعرەکەی ئەبی عەلای مەعەری بەم شێوەیەیە:

وقال السها للشمس: أنت ضئيلةٌ
وقال الدُّجى للصبح: لونك حائلُ

## وەقتێ ئەوروپایی خەیاڵیان لە حەجی مسوڵمانان ئەکرد!

ئەڵێن وەقتێ ئەوروپایی زۆر ئەترسان خەیاڵیان لە حەجی مسوڵمانان ئەکرد، ئەیانگوت هەموو ساڵێ ئەو هەموو مسوڵمانانە ئەچن بۆ مەککە، ئەڵبەتە سندوقێکی عمومیان هەیە، هەر حاجییە میقدارێ پارەی ئەهاوێتێ. شایەد حەربێ عمومی ببێ ئەو پارەیە سەرف ئەکەن. ئەڵبەتە تا ئەمرۆ ئەو سەرووەتە لە ملیارێ لیرە تەجاوزی بووە.

بۆ تەحقیقی ئەو خەیاڵە بەعزێ لە ڕووس مسوڵمان بوون ناوی خۆیان لێنا ئەحمەدۆف، ئیبراهیمۆف، فلاتۆف، خۆیان سونەت کرد. چوون بۆ حەج تەماشای حاڵی حەجاجیان کرد تێفکرین ئەو نەوعە خەیاڵە بە دەماغیان دانەهاتووە، وە ڕوئەساشیان بەس بە دو ئەتماعی خۆیان کەوتوون، حەجاج ڕووت ئەکەن و ئەیخۆن. گەڕانەوە حەقیقەتیان بۆ قەومی خۆیان بەیانکرد، ئەو ترس و هەراسەیان نەما. حەتتا مع الاسف ئەمرۆش ئەو فکرە لای ئێمە نییە.

٣٠٣/٢

## ئەوانەی دەست بۆ خوا پەیا ئەکەن!

ئەوانەی دەست بۆ خوا پەیا ئەکەن، غولامی ئەحمەد قادیانی ئەڵێ خوا هەزار دەستی هەیە. ژاپۆن هەیکەلێکیان هەیە هەیکەلی خوای سەد دەست. قادیانی یەعنی پێغەمبەری نۆکەر، ئەمەندەی بکەم دیوە ئەم خەلقە و ئیجادە بە سەد دەست ناکرێ. هەورازی بردووە بۆ هەزار. بەخودا ئەگەر ئیشی خودا پەکی لەسەر دەست بکەوێ خەلق و ئیجاد و تەرتیب و نیزامی ئەو عالەمە عەزیمە بە ملیۆنێ دەست ناکرێ.

٣٠٦/٢

## جوو و مسوڵمان و فەلەستین

حەقیقەتەن تا ئەمڕۆ هەر کەیدێ جوو لە حەق مسوڵمانانیان کردبێ بێ تەئسیر بووە. تەئسیری وای نەبووە. ئەمما ئەمڕۆ لە فەلەستین لە حەق مسوڵمانەکان قصور ناکەن. پشتیوانیان بەقووەتە، ئومێد وایە خوا ئاگری هەردووکیان بکوژێنێتەوە، مسوڵمان ئەمجارەش نەجاتیان بێ. واش بووە جوو زۆر تەئیدی مسوڵمانانیان دایە لە فتوحاتی شام و ئەندەلوس. لاکین ئەمە لە زێدە عەداوەتیان دەربارەی ڕۆم و غوط بووە. وە نەصاراش علی الاکثر ئاگریان ئەکوژایەوە، حەتتا ئەو ئاگرە عەزیمەی بەترۆس ناسك[1] ی ناکەس لە ئەورووپا هەڵیکرد، عمومی دوەلی ئەورووپای سەوق بوو بۆ سەر مەمالیکی ئیسلام کرد. ئەو ئاگرەش بە غیرەت و ئیقدام و صەبر و سەباتی کاکی خۆمان صەلاحی ئەیوبی[2] کوژایەوە. وە ئەورووپا چەند قرنێ زەبوونی دەوڵەتی عوسمانی بوو تا لەگەڵ دەوڵەتی ئێران تێك ئەنگژان، تەڕەفەین بێ هێز بوون. ئەورووپایی ئیستیفادەیان زۆر کرد، لە هەموو لایەك غالب بوون، تا سەری کێشا حەڕبی عمومی مسوڵمانان لە شەرق و غەڕب زەبوون بوون. لەگەڵ ئەوەشدا مسوڵمانان خۆبەخۆیی ڕۆژ بە ڕۆژ پتر تێك ئەچن، وە ئەکثەری خۆیان بووینە دوشمنی دینی خۆیان. عاقبەتی خێر بکا...

٣٠٧/٢

---

(١) بەترۆس ناسك (؟-١١١٥ز) راهیب و وتاربێژێك بووە لە شاری ئەمیانی فەرەنسا، یەکێك بووە لە کەسایەتیە سەرەکیەکان لە مێژووی هێرشی یەکەمی خاچپەرستەکان، کەسایەتیەکی کاریزمایی هەبووە لەسەر جەماوەر، فەرمانـدەی ڕۆحییان بووە. سەرپەرشتی لەشکرێکی گەورەی کردووە بۆ سەر قودس، کە پێکهاتبوو لە چل هەزار کەس.

(٢) ناوی یوسف کوڕی ئەیوب کوڕی شادی کوڕی مەروان کوڕی یەعقوبە، ناسراوە بە صلاح الدین (١١٣٨-١١٩٣ز) فەرماندەیەکی سەربازی بووە و دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەیوبییە کە میصر و شام و حیجاز و یەمەن و ناوچەکانی تری هەموو کردە یەك، ناوبراو سەرپەرشتی چەند هێرشێك و شەڕێکی کردووە لە دژی خاچپەرستان و ئەورووپییەکان بۆ وەرگرتنەوەی بەیتولمەقدیس.

## کێ پشتی ئیسلامی شکاندووە؟

خودا بە قەهری خۆی عیرقی فەساد هەڵکەنێ. عەلاوەی فەسادی جوو و دیان و فەسادی قادیانیان، بەهائیان، شەدەڵەییان و ئەمثالیان پشتی ئیسلامیان شکاندووە. بەناوی ویلایەت و ئیرشاد و ئیصلاح بەجارێ ڕوشد و صەلاحی ئیسلامیان بەرباد کرد. ڕەببی چارە چییە؟ قووەت و ظەهیری بێ. دینی ئیسلام نەما. چارەسازێ نییە بە غەیری حەول و قووەتی تۆ.

٣٠٧/٢

## دوو هۆکاری شکستی مسوڵمانان!

دوو شت بووە سەبەبی شکستی مسوڵمانان؛ ئیختیلافی خۆیان بێ ئیعتینایی بە عیلم و عەمەلی تەبیعی، غلو لە دین و لە مەعنەویات، ئیعتیماد لەسەر خەواریق و کەڕامات. ئیستیلای ئیعتیقادی جەبری مەحض یا نیمە مەحض، ئینتیزاری خروجی مەهدی و نزولی عیسا. ئەورووپایی بە عیلم و عەمەلی تەبیعی و کیمیاوی بەسەر ئێمەدا غالب بوون، نا بە ناوی موسەوویەت و عیسەوویەت. وە نایەتە خاطر میللەت ئیصلاحی ئیعتیقادیات و ئەفکاری خۆی بکا.

## مونکیر و تەکفیری شێخان!

دەعوەتی عالەم ئەکەن بۆ ئەو کوفر و ضەلالە لە مەشریق و مەغریب موبەششیریان بڵاوبوویتەوە، دەوڵەتە موتەمەددینەکان پارەیان لێ سەرف ئەکەن، تاکو خەڵکی لە دینی حەق وەرگێڕن، بۆ ئەو کوفر و زەندیقییە. عەجایبە ئەوەی لەناویاندا مووەحید بێ، مەسیح بە خوا یان بە کوڕی خوا نەزانێ پێیان ئەڵێن مولحید. وەکی موتەشەییخەکانی ئێمە، ئەوەی پێیان هەڵنەخەڵەتێ، ئەیلێنێ مونکیر، وە بەڵکو تەکفیری ئەکەن.

٣١٧/٢

## یەك ئیختراع لە سەد هەزار کەرامەت بۆ بەشەر بەسوودترە!

فی الحقیقة جێی تەعەجوبە کەسێ بڵێ من ئیلاهییم، تاڵیبی حەقم، یا مورشید و دەلیلم، حەقی بۆ ئاشکرا بێ وە دەست لە ئیعتیقاداتی باتڵی خۆی هەڵنەگرێ. لە عەسری ئێمە کە ئەڵێن عەسری نوورە، زوڵوماتی ئیعتیقادی سەوادی ئەعزەم لە بەشەر زیادە ئیشتیداد دەکا. ڕوئەسای ئەدیان بیلا تەفریق بە نەزەر عولەمای تەبیعەت ئەمڕۆ (إبن هبنقە) نابن، کەچی بەعزێ دەعوای ڕیسالەت ئەکەن. عەجایب ئەمەیە ئەو ئیختیراعاتی عەجیبە کە هەر یەکێ لە سەد هەزار کەرامەت بۆ بەشەر نافیعترە، لە سەمەرەی عیلمی شەیتانی حیساب ئەکەن.

ئەبا عولەمای ئەدیان سەری لووتی خۆیان ڕەش کەن، موقابیل بەو عوزەمای عیلمی تەبیعەت چاو هەڵنەهێنن. وە ئەبایە باسی کەرامەت لە کوتوب مەحوکەنەوە. غولام ئەحمەد قادیانی لە عەسری ئەدیسۆن، چۆن زاری هەڵ ئەپچڕێ بڵێ من مەلام. فەزڵ لە ڕیسالەت، وای لەو جەهالەتە! لەو بێ شەرمییە، عەجایبتر ئەوەیە گەلێ لەو موختەریعە گەورانە حالەن لەسەر کۆنە دینەکەن لە ئیعتیقادیات خۆیان لە کەرە عامیەکان جودا ناکەن.

٣١٨/٢

## مورید لەبەر دەستی شێخ وەك مردی وایە لەبەر دەستی مردووشۆر!

قسمێ لە ضلال هەیە گەلێ ئاشکرایە فکر و تەئەمولێ وای پێ ناوێ کە بە عەوام نەکرێ. ئەمما ئەبالیسەکان ڕێی ئەو بەدیهاتەش ئەگرن، ئەیانترسێنن وەك دیانان ئەڵێن: ئەمە لە زرووریاتی دینە موخالەفەی ئەمە بکەی کافر ئەبی، موستەحەقی لەعنی ئەبەدی ئەبی.

وەك فرقەیێ لە ئێمە ئەڵێن: ئەبێ مورید لەبەر دەستی شێخ وەك مردی بێ لە بەینی دوو دەستی مردیشۆر. کەسێ بە شێخ بڵێ (لِمَ) فەلاحی نابێ. کەسێ ئەو قسە ئینکار کا بە کافری ئەمرێ.

حاصلی خەریك ئەبن سەلبی عەقلیان لێ بکەن، ئەوجا بە هەوەسی خۆیان لێیان ئەخوڕن.

٣٢٠/٢

## هاتنی نەشاجی ئەحمەد نەزمی بۆ کۆیە!

لە وەختی حەڕبی گەورە، بینباش طابور نەشاجی ئەحمەد نەزمی هاتە کۆیە. مولاقاتمان کرد، لە ئەسنای حیکایەتی حەڕب، وتی: ئێمە خوراین، چ ئەڵمان بەسەر بکەوێ، کە دۆستمانە هەر ئەمانخوا، چ ئینگلیز کە دوشمنمانە سەرکەوێ هەر ئەمانخوا.

٣٢٣/٢

## ئینسان کە حەسەبی نەبوو نەسەب بە فەساد دەدا!

فی الحقیقە تەکەبور ئینسانی لە گەلێ سەعادەت مەحروم ئەکا، هەرچەند من تەڕەفداری خانەدانیم. ئەمما بەو نەوعە نامەوجەڕەد ئینسان خۆی پێ هەڵداتەوە خۆشی چ نەبێ، ئینسانی بەڕاستی ئەو کەسەیە حەسەب و نەسەبی باشی بێ. کە حەسەبی نەبوو، نەسەب بە فەساد دەدا.

٣٢٤/٢

## دکتۆر کە گوێی لە قورئان دەگرت دەگریا!

شەخسێ لە کۆیە بوو دکتۆر ناو سلێمان، بە دائیمی لەگەڵ ئێمەدا هەڵدەستا و دادەنیشت. بەعزە جاریان کە گوێی لە قورئان خوێندنی حاجی ئەفەندی ئەبوو، غایەت موتەئەسیر دەبوو، ئەگریا.

٥/٣

## کەسێ بووە مسوڵمان ئەڵێن پەشیمانە!

قسمێ لە کافرەکان مسوڵمان ئەبن دەست لە ئەولاد و سەروەت و جاه و ئیعتیباری خۆیان هەڵئەگرن. ئەگەرچی (مع الاسف) مسوڵمانان لەم عەسرە حورمەتیان تەواو ناگرن، بەخێویان ناکەن. حەتتا شەخسێ لە هەولێر مسوڵمان بوو، ئینگلیز بوو، لەناویان بە حورمەت، ساحێب معاش و وەزیفە بوو، هەمووی تەرك کرد. ئەڵێن زۆر پەرێشانە.

لەو بەینە من لە هەولێر بووم، تەمای بوو بچێتە بەغدا، بەڵکو مەئمورییەتێکی دەدەنێ پێی بەڕێوە بچێ. وە قسمێ زۆر حەز ئەکەن مسوڵمان بن، ئەڵێن (مَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ)، ئەمما پابەندی ئەهل و عەیالن، وە زیادەی بێ حورمەتی لەناو مسوڵمانان، ئەبێتە مانعیان.

خوای تەعالان مسوڵمانان بە خەبەر بێنێ، ماڵ لەو نەوعە کەسە سەرف بکەن، نەك لە ورگ گەورە و مل ئەستوور و عەتەڵە و جەهەلە.

٦/٣

## شایەدی مەسیحییەك بۆ موحەممەد!

لەو بەینە دیتم مەسیحیێ لە مەقالەیێ ئەیوت: تەعلیماتی عیسا بەشەر قبولی ناکا، ئەمما تەعلیماتی موحەممەدی زۆر موافیقە. دین لە ئێوە تەربییەی نەفس و تەزکییەی ئەوێ. تەعزیب و تەزلیلی ناوێ. سۆفییەی ئێمە هەڵخەڵەتان بە ڕەهبانییەتی مەسیحی، بۆ دینی ئیسلام زۆر زەرەر بوو. شتی خۆش بخۆ، وە بخۆوە، ژن بێنە ئەولاد بەخێوکە، ئەمما (لدی الایجاب) ڕوح و ئەولاد و ماڵ نەفس و نەفیس لە ڕێی خوا سەرف بکە. دوای قسەی غەزالی و ئەمسالی مەکەوە. عضوێ عامیل بە لە هەیکەلی ئوممەت. بە نەساغی و لاوازی، بە بێ هێزی، بە فەقیری خدمەتی دین و قەوم و مەفتەنت پێ ناکرێ.

٧/٣

## وتەی مامۆستا مەلا ئەحمەدی کۆر!

مامۆستا مەلا ئەحمەدی کۆر ڕەحمەتی خـوای لـێ بـێ، بە تەعـریض ئەیفەرمـوو: ئـێمە بە عیـززەت تەرکـی دنیامـان کـرد، ئەممـا بە زیلـلەت تەڵەبی ئەکەین.

١١/٣

## ئەوانەی عیلم دەکەنە عیلمی شەیتانی!

ئەم عەسرە پێی ئەڵێن عەسری نوور، عەسری عیلم و عیرفـانە. لەگـەڵ ئەوەشدا لە هەزار کەس نۆ سەد و نەوەد و نۆ و نیوی هەر لەسەر فکری پێشوون، ئەو عیلم و عیرفانە ئەکەنە عیلمی شەیتانی. موزەخرەفاتی خۆیان ئەکەنە عیلمی ڕەحمانی، سەوادی ئەعزەمیش دوایـان ئەکەوێ. (*الآن کان کما کان*).

٢١/٣

## مەسیحییەك زۆر مەحەببەتی منی هەیە!

زاتـێ هەیە لە عیســەوی، نـاوی ڕاجـزە، قەریبـی سـی ســاڵ ئەبـێ مەحەببەتـی منـی هەیە، زۆر موخلیصـە. وە ئینســانێ بە فەزڵو عیرفـانە، خەرافاتی یەسوعیانی لەدەماغدا نییە. وتی: من ملازمی خـدمەتی سـلێمان بەگی جەلیلی زادەی موصڵی بووم، زۆرم ئیستیفادە لە سوحبەتی ئەو زاتە گەورەیە ئەکـرد. شـەوێکی ڕەمەزان، پـاش تەراویـح، لە سـەلاملغی ئەو، قورئانیان ئەخوێند. ئەویـش بـۆ کـارێ تەشـریفی لەلای دائیـرەی حەرەم بوو، یەك لە قورئانخوێنان ئەو ئـایەتەی خوێنـدەوە (وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى

ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِ...) [1]. بەعـزێ مەلاش لەوێ بـوون، سوئالم لێکردن، لاشەك قورئان ئەوەی واقیع و موحەقەق نەبێ نـایڵێ. وە کەس لە ئێمە عیبارەتی مەریەمی نەکردووە، ئەمە چییە؟

ئەوانیش لەبەر بێ ئیتڵاعی جوابیان نەبوو. بەگ تەشریفی هـاتە دەر و وتی: ئیعتیقادت لە حەق (فلائل ڕەفی) خۆتان چۆنە؟

وتم: قسەی موعتەبەرە (موثوق بە)یە!

چـۆوە ژۆر، ڕیسـالەکی ئەوی هێنـا دەر، تیـای بـوو، کە قەومـێ لە عیسـەوی عیبـادەتی مەریەمەی کـردووە بە شـیعار، وە مەعبەدیـان بـۆ دروست کردیە.

٣٠/٣

## ئەرێ قوتبی فەرد عیلمی وەك عیلمی خوایە؟!

نـازانم ئەوانەی ئەڵـێن قـوتبی فەرد، عیلمـی وەك عیلمـی خـوایە، لەو ئـــایەتە قَـالَ سُـبْحَانَكَ مَـا يَكُـونُ لِي أَنْ أَقُـولَ مَـا لَـيْسَ لِي بِحَـقٍّ إِن كُنـتُ قُلْتُهُ...[2])ئەڵێن چی؟ شکم نیـیە نـازانن کەیفییەتـی عیلمـی خـوا چـۆنە؟ ئەمما تەسەووف هەموو دەرکەی جەهالەتی بۆ مسوڵمانان کردەوە، تـا لە مەیانیاندا سۆفی ئەحمەدی قادیانی خۆی بە نەبی و مەسیحی مـونتەزیر لە قەڵەم دا. قادیـانی و سـائری عولەمـای ئیسـلامی و مەسـیحی نیزاعیـان لەبارەی مردن و چوونە ئاسمانی عیسا هەیە. قادیـانی ئەڵـێن مـردیە و بـۆ ئاسـمان نەچـووە، بە دزی هەڵاتـووە، پـاش چەنـدێ لە کشـمیر وەفـاتی کـردیە. مـن خـۆم بەو هەرا هەرایە مانـدی نـاکەم، ئەوەنـدە ڕەجـا لە مسوڵمانان ئەکەم، بۆ ئیصلاحی حـاڵی خۆیـان ئینتیـزاری نزولـی عیسـا و خرووجی مەهدی نەکەن. خۆیان تێکۆشـن لە زیللەت دەرچن، ئەوەش

---

(١) سورەتی المائدة/١١٦.

(٢) سورەتی المائدة/١١٦

دیاره بەچی ئەبێ؛ بە ئیتیفاق و ئیختیراع ئەبێ. ئەوەندەی بە مەعنەویات خۆیان خەریك ئەکەن، موقابیلی دوشمن خۆیان بە مادديات خەریك بکەن، بێ شك سەرئەکەون، وە ئیللا فەلا.

٣٢/٣

## وەفاتی سەید ڕەشید ڕەزا!

تەفسیری سورەتی مائیده لە ڕۆژی سێ شەموو ٢٣ی ڕەجەب، موافقی ٩ی تشرینی ئەووەلی ڕۆمی، ئەمما قەریبی چوار مانگە، چیمان نەنووسیوە، لەبەر مەشاغیل و ئالام و غموم. وە غەمی لە هەمووی گەورەتر غەمی وەفاتی سەید ڕەشید ڕەزایە. حەققەن مردنی ئەو نەوعە مەلایە، لەو هەنگامە، تەئەسسوفێ زۆر ئەدا. خودا لێی ڕازی بێ، وە عولەمای ئیسلام موەفەق کا لەسەر نەهجی ئەو، تەفسیری قورئان تەواوکەن. ئامین. ١٣٥٤ی هیجری[1].

٣٤/٣

## شیرك عیلاجی ناکرێ، تا هایو هووی تەریقداران لە ناوماندا بمێنێ!

لە زەمانی ئێمە شیرك ئەوەندەی تەرەققی کردیە، لە شیددەت و ڕەخا، ئەوەی فەرامۆشی کەن، هەر خودایە. ناوی خوای بە غەیری سوێندی بە درۆ پێخواردن، لەسەر زوباناندا نەماوە. حیکایەت هەڵئەبەستن، بۆ عەوامی قوڕبەسەر تا لە ئیمانیان بکەنە دەر.

کوڕە فەلاحێ هاتەوە ماڵ باوکی، وتی: ڕۆڵە گاجوتەکانت چی لێکرد؟

وتی لە پاوان بەجێم هێشت بلەوەڕێن.

---

(١) دەکاتە ١٩٣٥ی میلادی.

وتی: بە کێت سپارد؟

وتی بە غەوسی گەیلانی.

وتی باشە.

سبەینێ کە چوو دیتی وڵاغەکان ساغ و سەلیم تێرو پڕ پالکەوتوون، کاوێژ ئەکەن. ئەو ئێوارەش چۆوە، وتی وڵاغەکانت تەسلیم کێ کرد؟

وتی بە شاهی نەقشبەندم سپارد.

وتی باشە.

باز وڵاغەکان بە صیحەت و سەلامەت مان. ئێوارەی سێیەم وتی تەسلیمی کێت کرد؟

وتی تەسلیمی خوام کرد.

وتی ئەها وڵاغەکانمان چوون.

سبەی تەماشایان کرد، گاجووتەکان شەق و پەق کراین.

کوڕە وتی بابە ئەوە چییە؟

وتی ڕۆڵە غەوسی گەیلانی و شاهی نەقشبەند بەغیرەتن ئەوەی تەسلیمیان بکرێ، ئاگاداری ئەکەن. ئەمما خوا بێ باکە ئەوەی ئەمانەتی بکرێ، بمێنێ، نەمێنێ، پەکی پێ ناکەوێ.

ئەڵێن خوا موقەددەسە، ئێوە مونەججەسن، نابێ بانگی ئەو بکەن. جاران هەر نەیسە ناوی زاتێ وەك غەوس و شا هەبوو، ئێستا لەبەر جرو جاموشتان، ئەوانیش ناویان گوم بوو. لام وایە ئەو شیرکە عیلاجی ناکرێ، تا های و هووی تەریقداران لە ناوماندا بمێنێ. پەنا بەخوا.

٦٣/٣

## ئومێدم پاش گرانی ١٣٣٦!!

پاشی گرانی تەئریخی ١٣٣٦ی هیجری[1]، وە ئیستیلای ئینگلیز، ئومێدەکەم بوو بە ئینتیباهی قەوم بۆ ئیقتیصاد، خصوص تەڕەفی ئیستیهلاك. وە ئەمەلەکم بۆ ئیتتیفاق و ئیتتیحاد بۆ مەنعی تەجاوزی زیلل

---

(١) دەکاتە سالی ١٩١٧ی میلادی

و ئیضطهاد، مع الاسف، کەهانەتم نەهاتە جێ. ئەو ئیسراف و تەبذیری پاش گرانی بوو، نایەتە عەقل و خەیاڵ. ئەوەی بە سەد گیانە هاری و مەرگە مەلە لە گرانی قورتار بوو، ئەمڕۆ لە هەموو کەس موسریفترە. وە ئەو ئیتیحادی لە بەینی بەعزە ئەشخاص بوو، ئەمڕۆ ئەویش نەماوە.

٦٥/٣

## کورد و قومار و شەڕاب!

شوبهەم نییە ئەگەر مسوڵمانان لەسەر حاڵی ئێستا بمێنن، خەلاس ئەبن و دواییان دێت. لەو ڕۆژی کە مسوڵمانان لە ئەندەلوس تەرد کران، تا ئەمڕۆ زەڕەباتی موتەوالیەیان بەسەردا دێ، حالەن نایەنەوە هۆش، بەڵکو ئەمڕۆ فسق و فجور و تەبذیر لە عالەمی ئیسلامیدا زۆر ئەفزونە. شەڕاب خواردنەوە تا ئەمڕۆ لەنا کوردان بە کوفر حیساب بوو، ئەمڕۆ مع الاسف نێزیکە لە سوفەهای غەربی تەقەددوم بکەن. لەسەر ئەو فەقر و فاقە قومار تەعەمومی کردیە. زۆر ئەترسم معاذ الله ئەوجارە زەڕبەیەکی قاتیعیان لێبدرێ، خوانەکا یاخوا، ڕەجا ئەکەین، وەکی خەییام[1] ئەڵێ:

بر موجبی عەقل زیندەگانی کردن، خواهی کردن ولی ندانی کردن

---

(١) ناوی ئەبولفەتح عومەری کوڕی ئیبراهیم ئەلخەیامە، پێدەچێ باوکی خێوەتی دروستکردبن و فرۆشتبنی، بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە. لە ساڵی ٤٣٠ك لە نەیسابوور لەدایك بووە. لە نێوان ساڵانی ٥٠٦و ٥٣٠ ك، هەر لەوێ مردووە. زانایەکی مەزنی سەرەمی خۆی بووە، بە بیرکاریزان و فەلەکناس ناسراوە. لەگەڵ چەند ئەستێرەناسێك، لە ساڵی ٤٦٧ ڕۆژژمێری کۆچی مانگی، بۆ کۆچی هەتاوی بۆ مەلەکشای سوڵتانی سەلجوقی گۆڕیوە. وێڕای ئەمە بە چوارینەکانی ناوبانگی دەرکردووە، کە بە زمانی فارسی دایناون و هەمویان لەسەر کێشی هەزەجی هەشتین. دەگوترێ دوای مردنی، زۆر چوارینیان داوەتە پاڵیو ئەو خاوەنی ئەم هەموو چوارینانە نەبووە. لەبەر ناوبانگی چوارینەکانی، شارەزابوونەکەی لە بیرکاری و فەلەکیات لەبیرکراوە، ئەگەرنا بە زمانی عەرەبی بەرهەمی لەبارەی فەلەکو بیرکاری داناون. (المعجم المفصل فی الادب، ص٤٢٠).

استادی توروزگـاری چاپـك دسـتت چنـدان بسـرت زنـدگی دانـی کردن[1].

٦٥/٣

## نوێژی بەیانییەك بە ئاوی سارد، ملیۆن نوێژی جوبریل دێنێ!

شـەوێك وەك ئەمشـەو سـەرما، مسـوڵمانێك ڕووت لەسـەر پـارچە حەسیرێ ئەخەوێ. لێفەشڕێ بەخۆی دادەدا. خۆی وێك دێنێ، هەناسەی ئەبـاتەوە بەر خـۆی. بە سـەد تەقەلا خـۆی نەختـێ گەرم ئەکـا، لەناکـاو (الصلاة خير من النوم) بانگ دەکرێ. دێتە گوێی: لَبَّيْكَ، ئیجابەی داعی خوا ئەکا، بە ئاوی سارد دەستنوێژ ئەشوا. بە لەرزە لەرز و چەق و هۆڕی ددانی، دوو ڕکعەت فەریزەت بەجێ ئەگەیەنی. حـق الانصـاف ملیۆنێـك نوێژی جبریل دێنێ. عبودییەت و عیبادەتی بەشەر، خاسـەتەن لە زەمـانی ئێمە قیاس لە ئیتاعەی مەلەك ناکرێ. وە عەجایبـاتی صـونعی بەشـەری بە دەرەجەیەکە، ڕەنـگە مەلائـیکەت تێـی مـوتەحەییرن. لام وایە مـاددی و مەعنەوی تەفزیلی بەشـەر لەسـەر مەلەك باشـترە ڕێـی تەرەققـی بەشـەری تەوسیع ئەکا. وە بۆ ئیقاظی عوببادی ئەڕواحی لەتـیفە، وە ئەوانەی ئەڵـێن مەلائیکە (بنات الله) ن، گەلێ ئەوفەقە.

٦٩/٣

---

(١) راستیی چوارینەکە بەم شێوەیەیە:

بـر موجـب عقـل زنـدگانی کـردن
چون می نکنی؟ که مـی توانی کـردن
استاد تو روزگـار چابـک دسـت اسـت
چندان به سـرت زدن کـه دانـی کـردن

## مەیدانی درۆ فراوان بووە!

فەرق و تەمیز بکەن بە عەقڵی خۆتان، حەق و باتیڵ لێك کەنەوە. بەسیەی تاکەی باب‌و باپیرمان وابووین وا ڕۆیشتین، ئێمەش وەدوای وان ئەکەوین. فلان مەلا فلان شێخ وای وتیە، بەڵێ وایە. چۆن ئەو مەلایە گەورەیە، ئەو شێخە عەزیمە قوتبی زەمان عارفی باللە، موتەلیع لەسەر خەزانەی غەیب، ناظری فی اللوح، بە غەلەت ئەچێ؟ خیلافی حەق و حەقیقەت ئەڵێ؟ وای وەی، وەی وەی ئەم کوفرە! ئەوەی ئەو هەذەیانانە نەکا مولحیدە، زەندیقە، بڕوای بە ئەولیایان نیە. کەس تەنقیدیان ناکا بۆیە مەیدانی درۆ و دەعوای باتیڵە تەوەسوعی کردیە.

٧٠/٣

## ئەولادی فەقیران و مەکتەب!

لەوەتی مەکاتیب و مەدارسی ڕەسمییە دامەزراوە تا ئەمڕۆ علی الاکثر، حەتتا لە سەدا نەوەد و پێنج ئەولادی فوقەڕا نەجاحیان ئەبێ. نمرەی عالی و ئەعلا وعلی الاعلی وەرئەگرن. ئەولادی ئەغنیا و ئەقویا یا ڕاسب ئەمێنن، یا ئیکمالن، یا بە یەك دوو نمرەی زیاد دەرئەچن. ئەوەش مومکینە لە ڕووی ڕیا و ڕەعیەت بێ.

سەبەبیان لە من پرسی. وتم ئەولادی فوقەڕا کە ئیزن بوون هیچ نییە پێی مەشغول بن، بە غەیری دەور تەماشای کتێب و دەرسی خۆیان. بۆیە لە خاریجی مەکتەب سەعی ئەکەن. ئەمما ئەولادی ئەغنیا هەزار شتیان هەیە، لە ئەسبابی لەزەت و تورەف تیای ڕووئەچن، ئاگاشیان لە کتێب و دەفتەر و قەلەمی خۆیان نییە.

دینی فیترى ئەبێ لەگەڵ فیترەت بڕوا، شان بە شان، ئەو زەعیفانە فیترەتەن قابیلترن بۆ ئیمان و ئیهتیدا. ئەقویا علی الاکثر فیترەتیان تێك

چووە، وە ڕیسالەت و دینی عام ئەبێ وابێ، نەوەك سیاسەت هەر بەلای قەویدا بتراشێ. زوعەفا بکاتە بەردەباز و گێسکی بەر پێیان.

٧١/٣

## هاتنی مەهدی و مەلا ئەحمەدی ئۆمەرگومبەدی!

چەند ساڵ لەمەوپێش عولەمای تەقویمی ئێران، بە نامی نامەی حەزرەتی صاحب الزمان تەقویمیان ئیستیخراج ئەکرد، بە حیسابێ چروك و تووڕەهات ئیعلانیان ئەکرد لە تەئریخی ١٣٥٢ هجری[1]؛ مەهدی ئەفەندی زوهور ئەکا، گەلێ سەبوك مەغزانی ئێمە بڕوایان پێئەکردن. ئەوە ساڵی ١٣٥٤ هیجرییە، نە خەبەر هەیە لە مەهدی، نە ئەسەر. ئەو وەختە وتم ئەگەر خوا بمانژینێ، درۆیان دەرئەکەوێ.

٧٧/٣

پاش ئەوە ماجەرایەکم هاتەوە خاطر، حەز ئەکەم لێرە بینووسم. مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئۆمەرگومبەدی، زاتێ زۆر گەورە بوو، ئەتوانم بڵێم بە حەق وەلی بوو، عومرێ زۆری لە شەرع و تەقوا ڕابوارد، بەعزێ ئەشعاری مەهدینامە[2]ی لەبەر بوو، گەلێ جار ئەوانەی ئەخوێندەوە:

بە حەفتی دی دەججالی شئوم
بەهەشتی دی مەهدی یقوم
قەت دەرناچێ لەو موددەتێ

وە هەموو جارێ زەلزەلەی دەکەوتە جەسەدی. ڕۆژێ عەرزم کرد مامۆستا! چەند ساڵە ئەو شیعرانەت لەبەرە؟

نەختێ تەئەمولی کرد و وتی: یارەبی خوا خێرت بنووسێ، ترست لە دڵ بردمە دەر. من پەنجا ساڵ زیاترە ئەوانەم لەبەرە، وە گەلێ پێش ولادەتی من ئەو مەهدینامە داندراوە.

---

(١) دەکاتە ساڵی ١٩٣٣ی میلادی

(٢) بەرهەمێکی بواری عەقیدەیە و نووسەرەکەی ئیبنولحاجە، لە ساڵی ١١٧٦ی کۆچی نووسراوە.

خودا دەرەجەی عالی کا، بە بەرەکەتی وی لەمەش خۆش بێ.
٧٨/٣

## کورد نە عیلمی بەڕی هەیە، نە عیلمی بەحر!

وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ ،ناشوکری نەبێ، کوردی نە عیلمی بەڕی هەیە، نە عیلمی بەحر. نازانم بە کوردی بڵێم چی؟ چیایان هەیە، ڕەن و شیوە دۆڵ و بانو و باسك و نەرمان چەرگان و ڕەقێن و چەقێنی چۆل، جۆگە و ڕووبار و زێیان هەیە. جار جار موقابیلی بەحر و ئیشکانی ئەڵێن: ئەوەی لە بەڕ و بەحر بێ، خوا ئەیزانێ لێ گوم نابێ
٧٨/٣ .

## لە بەغدا بووم!

لە تەئریخێ، لە بەغدا بووم، لە سەین و بەینی تەصدیق و ڕەفزی موعاهەدە، شیددەتی موزاکەرەی مەجالیس، لەسەر مەسئەلەی هاممە. شەوێ تەماشام کرد لە مەقەڕی عەسکەری ئینگلیز بە جیاو موخابەرەیان ئەکرد، حوروفاتی نووورینی لە جەووی سەما تەرقیمی ئەکرد. وە جەماعەتێ لە ئەهلی بەغدا دەورەیان دابوو لە ئوستاز ئیبراهیم تەمبوورەچی، بەزم و ڕەزمیان ئەکرد، تا بوو بە بەیان، من لە جێی خۆم نەخەوتم، تەماشای حاڵ و وەزعییەتم ئەکرد.
دەبینی ئێمە بەچی مەشغوولین؟ ئەوانیش بەچی خەریکن؟ مع أنە دەعوای ئیتسقلالیەتمان ئەکردن، بەو حاڵە بچینە مەصافی دوەلی ڕاقییە؟

٧٩/٣

## لوح المحفوظ

بنۆڕنە قەوانی گرامەفۆن، ئەو خطوطی بە نووکی دەرزیلە لێی نوسراوە چۆنە؟ چۆن ئەخوێندرێتەوە؟ ئەو ئیهتیزازی هەوا، کە لە قسەی بەشەری پەیا ئەبێ، چ لە هەواو چ لە صەمماخی گوێدان چ لە ئیستوانەی گرامەفۆن چ نەقشێ تەرسیم ئەکا؟ ئایا ناظری لوح المحفوظ ئەگەر تەماشایان کردبا بێ وەی کە بۆیان لێ بدرێ، مالي فُتِنْتُ[1] ی ئوم کەلسوومیان [2]چۆن ئەخوێندەوە؟ ئەو هەموو عولوم و عیبارەتە لە زیهنی ئینسانێ چۆن ئەنووسرێ؟ چۆن ئەخوێندرێتەوە؟ ئی وا هەبووە قەریبی ملیۆنەکی ئەشعار لەبەر بووە، لە چی خەززانەیەك داندراوە؟ کوو حیفز کراوە؟ جل الخالق وعنده مفاتح الغیب الا هو.

٨٠/٣

## لە الحکم وهو اسرع الحاسبین!

ناشکوری نەبێ، چونکی کورد حەکیمیان نەبووە، لە زوبانی کوردی هەرچەند ئەکەم کەلیمەیە نادۆزمەوە، ئەو مەعنایە بگەیەنێ. تەفسیری

---

(١) گۆرانییەکی ئوم کەلسوومە و سەرەتاکەی ئەمەیە:
مالي فُتِنْتُ بلحْظِكِ الْفَتَّاكِ
وسَلَوْتُ كُلَّ مَلِيحَة إِلاَّكِ
يُسْرَاكِ قَدْ مَلَكَتْ زِمَّامَ صَبَابتي
ومَضَلَّتِي وهُدَايَ في يُمْنَاكِ

(٢) ئوم کەلسووم: ناوی فاتمەی کچی شێخ ئیبراهیمی سەید بەلتاجییە، گەلێك نازناوی هەن، دیارترینیان ئوم کەلسوومە. گۆرانیبێژێکی میصری بووە. لەساڵی ١٨٩٨ لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٧٥ لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە.

قورئـانی وا پـان و بەریـن، بە زوبـانی کـوردی تەسـك و کـورت حـق الانصاف زۆر گران و زەحمەتە. حوکم هەر بۆ خوایە لە هەموو ژمێـران لە ژمارە تیژترە لەسەر هیچ دانامێنێ. کەوابێ شەریك و شەفیعی بۆ چییە؟ نەوەك فێری لێکەن؟ لە موحاسەبە شتێ نەزانـێ پێـی بڵـێن؟ چەراکەکەی لەدەست قوتارکەن؟ حاشا معاذ الله لەو ئەوهامە.

٨٢/٣

## موشریکی ئەو زەمانی، لە موشریکی ئەم زەمانەی ئەهوەنتربوون!

ئەو سـاڵە کە بۆردومـان کـراین، ئەووەل ڕۆژ لە کـۆیە یـوم أهـوال وشدائدم موشاهەدە کـرد. ئەووەل نەوبە هەڵئەهـاتین، لە هەیـوان بـۆ ژێـر کۆشك. یەکێ ئەیوت یا غەوس یا غەوس و یا غەوس، غاری ئەدا.

من وتم یا غەوس و یاغەوسی چی پێئەوێ؟ ئەمڕۆ خۆشی لەگەڵمـان با، هەڵئەهات بۆ کونێ و خۆی ئەشاردەوە. دوایـێ ئەو قسـە گەیشـتبۆوە سەید شـێخ محـی الـدین خـودا عەفـوی بکـا، فەرمـووی فـلان زۆر بـێ موبالاتە، چۆن ئەو نەوعە قسە دەربارەی غەوس ئەکا؟ ئەویش لە گوندی ناسراغای، ئەشکەوتێ هەبوو، سبەینە و ئێوارە کە تەیـارە بـۆ سـەر کـۆیە ئەهات، لەو ئەشکەوتە خۆی ئەشاردەوە. پاشی بەینێك مولاقاتمـان کـرد، پێم وت:

تۆش محی الدین لە عەینی خانەدانی، بـۆچی لە ئەشـکەوتی پشـیلان خـۆت ئەشـاردەوە؟ پێغەمـبەر لەبەر قورەیشـیان هەڵات لە غـار خـۆی شاردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا نە تەیارەیان هەبوو نە بۆمبا، ئایـا تـۆ غەوس لە پێغەمبەر بە زیاتر ئەزانـی؟ بە بەردێ برینـدار و ددانـی شـکا، غەوس بەر بۆمبا بکەوێ زەرەری پێناگا؟

وەی وەی لەو جەهلە! لاشەك لە جیهەتی ئیعتیقاد بەخـوا موشـریکی ئەو زەمانی، لە موشریکی ئەم زەمانەی ئەهوەنتربوون.

٨٣/٣

## هەر فرقەیە لەسەر فکری خۆیەتی!

هەر قەوم و میللەتێ عەداوەتیان کەوتە بەین، زەڕبەیان لێکتر چێشت، بە یەك مەشغوول ئەبن، تاکو زەعیف و مەلول ئەبن، دوژمن لەلا ڕا بەسەریاندا غالب ئەبێ. وفی الحقیقە، بۆیە لەبەر ئەوەی گوێیان نەدا، ئەمسالی ئەو ئایەتە (لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ)، ئەو ئوممەتە (یوما فیوما) ئیختیلافیان زیاد ئەکا. ئەمڕۆ بێ هەرا هەرای بەهائی و قادیانی و سەلەفی و خەلەفی، جەنگ و جیدالی ئیجتیهاد و تەقلید، لە ئیشتیعال دایە. خاسەتەن لە موصل الحدباء. وە عولەمای ئێمە مع الاسف موباحەثەیان لە دائیرەی ئەدەب نییە، تەهەوور و تەحقیر و جوێن و تەکفیرە، زاتەن موباحەسەیێ لەسەر ئەوە بێ، بۆگەنی ئەبێ.

بەعزێ ئەڵێن ئەمە ئیرادەتوڵلایە، ئەبێ هەر وابێ. سبحان اللە العظیم خودا ئیرشاد دەکا کافر موتەفیق بن، مسوڵمان موختەلیف بن؟ بەعزێ ئەڵێن مادام پێغەمبەر خەبەری دایە، دەبێ وابێ، تا ببێتە موعجیزەی پێغەمبەر. سبحان اللە دینی ئیسلام زەلیل ببێ، ببێتە ئینقیراز و مەحوو بۆ تەحقیقی موعجیزەیەکی پێغەمبەری. مع أنە دائما نەهی لە ئیختیلاف ئەفەرموێ، یا ربنا ئەلئانیش ئەڵێن اختلاف امتی رحمة حەدیسە، مع انە موحەددیسێ ئەو حەدیسەی نەقل نەکردووە.

خولاسە لاشەك ئەو خیتابە، خیتابە لەگەڵ موشریکان، ئەمما لازمە مسوڵمانان عیبرەت وەرگرن ئەمین نەبن لە عەزاب. لاکین گوێیان نەداین، تەفرەقەیان کرد، بوون بە دوشمنی یەك، مەغلوب و ڕەزیل بوون. (الآن کان کما کان)، هەر فرقەیە لەسەر فکری خۆیەتی ڕوویان لە ئیتیفاق و دۆستی نییە.

٨٥/٣

## مێردەزنۆکەی کوردان و غولی عارەبان!

لە ئەوائیلی منداڵی من، باسی مێردەزنۆکە زۆر بوو، لە نێو کوردان بە مێردەزنۆکە، لەناو عەرەبان بە غۆل مەشهوورە. گۆیا دەعبایێ (کریة المنظر) بانگی ئینسان ئەکا، دوای ئەکەوێ لە ئاوەدانی دووری ئەخاتەوە و بزری ئەکا. ئەمە لە حەقیقەتدا حەق و حەقیقەتی نییە، لە ئوموری وەهمیە و خەیالییە. پێغەمبەر ئەفەرموێ غۆل نییە!

ئەمما من سەعیم کرد بۆ ڕەفعی ئەو نەوعە خەرافاتە، شوکر ئێستا لە کۆیە هیچ ناو و نیشانی نییە، وە ئەو حیکایەت و خەرافاتە ئەکثەر لای شێخ و مێخان بڵاوئەبۆوە. وە حیکایەتی غۆل و دێو شوکرولیللا ئێستا بزر بووە. زاتەن تا عەقڵ زیادکا خەرافات کەمتر ئەبێ. لەخوا ئەخوازم ئوممەتی موحەممەدی ڕۆژ بە ڕۆژ عەقڵ و عیلم و هۆش و ئیدراکیان زیاد بێ، بالمرة لە قیودی ئەوهام و خەیاڵاتی فاسیدە دەرچن.

٨٨/٣

## شیرک لەناو میللەتان ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادەیە!

مع الاسف شیرك لەناو ملیون ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادەیە. سەوادی ئەعزەم بوت پەرستن، غایەتی ئیلاهیان گۆڕاوە، هەنجەت هەر ئەو هەنجەتە، وەساتەت و شەفاعەتی موقەڕیبانە، لە هەموو شت عەجایبتر ئەمەیە: بەعزێ ئەبنە زاوای شێخی خۆیان کە ئەچنە ماڵەوە خضع الرقاب، نواکس الابصار، گەردەن کەچ، چاو لەبەرخۆ، دەست لەسەر دەست، بە کەمالی خضوع و خشوع ڕائەوەستێ، بێ ئەمری خاتون ناتوانێ پێ لەبەر پێ دانێ، توخوا ئەمە زۆر سەیر نییە؟ لەپاش ئەمە ئینسان تەڵە و ڕیویانی لەگەڵ ژنی خۆی کرد، ئەو سەتوەت و حیشمەت و جەلال و کیبریائیەی چۆن لە دڵدا دەمێنێ؟ یاخود لەگەڵ ئەو هەموو ئیحتیشام و

هەیبەتە چۆن لەگەڵی دروست ئەبێ، ئەو مەیلە ئەکا؟ ئەمما ئەوان ئەڵێن ان علمی حالت تو نمی دانی[1].

٩٦/٣

## ئینسان بێ نمەکە!

سبحان الله بەشەر وا ئەزانێ خۆی لەخۆڕا فێربووە، نازانێ ئەصلی تەعلیم و تەربیە لە ڕوسول وەرگیراوە، ئەگەر ئەوان نەبان، ئەو بەشەرە وەکی گا و سەگپەرستان ئەمڕۆ بێ هۆش و گۆش و ئیدراك ئەبوو. ئەمما ئینسان بێ نمەکە. ئەمڕۆش تا لە نبووەت نێزیکن چاکن، تا دوورئەکەونەوە بەدتر ئەبن. چی وا نازانن کە بۆ بەشەرییەت کەڵك بگرێ، لەبەر بێ تەربییەتی و بێ ئەخلاقی عیلمەکەیان ئەبێ بە مایەی شەڕ و فەساد.

بۆ ئینسان عەقڵ زۆر عەجایبە، زوو هەڵناخەڵەتێ، وەك ئەو شێتەی ئەڵێن منداڵان دوای کەوتبوون، بەردبارانیان ئەکرد، وتی منداڵینە لە ماڵی فلانی مەولوودە، ئەنواعی ئەتعیمە و شەکەریات ئەبەشنەوە، منداڵەکان بۆ ئەو ماڵە غاریان دا، ئەویش بە غار بەدوویان کەوت، وتیان ماڵ خراپ ئەتو بۆ؟

وتی بەڵکو ڕاست بێ. وەك ڕوجتاف لوبون[2] ئەڵێ عەقڵ لەبەر لافاوی مەیل خۆی ناگرێ.

١٠٤/٣

---

(١) واتە ئەوە عیلمی حاڵە و تۆ نایزانی.

(٢) گۆستاف لۆبۆن (١٨٤١-١٩٣١ز) پزیشك و مێژوونووسێکی فەرەنسایییە، لە ئەورووپا و ئاسیا و باکووری ئەفریقادا کاری کردووە. لە بارەی شوێنەوارناسی و ئەنترۆپۆلۆجیا و ژیاری ڕۆژهەڵاتی نووسیویەتی، لە گرنگترین بەرهەمەکانی ژیاری عەرەب و ژیاری هیند، پاریس، ژیاری میصر، ژیاری عەرەب لە ئەندەلوس....هتد. یەکێك لە ناودارترین فەیلەسووفانی ڕۆژئاوا بووە، هەروەها یەکێك لەوانە بووە کە پەسنی ژیاری ئیسلامی داوە. لەبارەی جوولەکەکانەوە ڕوانینی تایبەتی خۆی هەیە کە پێی وایە جوولەکەکان کەسانی بەدەوی و خوێنڕێژ و دڕندە بوونە.

## حجر الاسود یمین الله نییە!

حجر الاسود کە پێی ئەڵێن یمین الله! معاذ الله، خوای حجر الاسود کە چڵ ساڵ لەسەر گوفەکی کوفەی فڕێدا لە ئەییامی قەرامیتان. وە لە ئەییامی عەبدولمەجید خانی عوسمانی گولـلەیەکی پێکەوت، چەند پارچۆکەی لێکردەوە. ئەگەر یمین الله بێ، ئەبێ خوا هەیکەلی حەجەری بێ. ئەوانەی بە دوو ڕکعەت شەو نوێژ و دوو سێ ڕۆژ ڕۆژیگرتن و نەختێ ڕیازەت، خوا بێتە چاو و دەست و لاقیان، ئەدی ئەبێتە چی بۆ پێغەمبەرەکانی عیزام؟ بۆ ئەوانەی سەر و ماڵ و ڕوح و ئەولادیان دادەنێن لە ڕێی خوا؟

١١٧/٣

## بەهاری کۆیە!

ئەمڕۆکە کە فەصلی بەهارە، خاسەتەن بەهاری کۆیە، زۆر بەدیعە عارف و عامی تەماشای باغ و ڕاغ و کێو و کەژ ئەکا. ئەوی زانایە لە غەرائیب و عەجایبی صونعی پەروەردگار، حەیران و مەدهۆش و مەبهوت ئەمێنێ لە موشاهەدەی جەمال و حوسن و زینەتی فەصلی حەیات، مەست ئەبێ. ئەوی نادانە دێ و دەچی، بە غەیری مەنزەرەکەی زاهیری چیتر نابینێ. چاویان هەیە ئەمما پێی نابینن، چونکی چاوی دڵیان نییە.

١١٨/٣

## بیرەوەری سەردەمی فەقێیاتیم!

لە ئەیامی فەقێیەتیم، شەوێ لە حوجرە باسکرا، کە جوو زۆر جوون بە پێغەمبەری ئێمە ئەدەن. فەقێیێ دەستی کرد بە جوندان بە حەزرەتی موسا. نەهرەتمان لێکرد، وتی بۆ ئەوان جوون بە پێغەمبەری ئێمە ئەدەن، بۆچی ئەمن جوون بە پێغەمبەری وان نەدەم؟

سەییدی ئالووسی[1] ئەفەرموێ: خۆم دیم شەخسێ لە عەوامی سوننی گوێی لێبوو، بەعزێ ڕافیزی زۆریان جوون بە حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر دا. ئەویش دەستی کرد بە جوویندان بە ئیمامی عەلی.

وتیان چۆن تۆ جوون بە حەزرەتی ئیمامی عەلی ئەدەی؟

وتی من زۆرم ڕق بۆوە مەقسوودم بوو موقابەلە ڕقیان کەمەوە. وە هیچم نەدیت وەك سەببی عەلی ڕقیان پێ ببێتەوە، بۆیە وامکرد. دوایێ ئینایەتی پەشیمانیم کرد.

١٢٠/٣

## ڕەشبەڵەك

کوللی قەومێ گەلێ ئاداب و عەنعەنات و عاداتێ زۆر ناشیرینیان هەیە، ئەمما لایان گەلێ شیرین و جوانە. ئەز جوملە بنۆڕنە ڕەشبەڵەکی کوردان، ژن و پیاو تێکەڵاو ئەبن، پەنجە لەناو پەنجە، ڕان بە ڕان، شان

---

(١) ناوی مەحموود شەهابەددین حوسێنی ئالووسی (١٨٠٣-١٨٥٤ز)یە، ڕاڤەکەری قورئانی پیرۆز و فەرموودەزان و شەرع زان و ئەدیب و شاعیرو خۆشنووس بووە. بە نەسەب دەچێتەوە سەر ئالی بەیت و لە بنەڕەتدا خەڵکی شاری ئالووس بوونە کە دورگەیەکە لە ناوەڕاستی ڕووباری فورات لە پارێزگای ئەنباری عێراق. دوای هێرشی هۆلاکۆ کەوتوونەتە بەغدا. ناوبراو بە فەرمانێکی دەوڵەتی عوسمانی دەبێتە موفتی. دەورێکی کاریگەری لە پێشخستنی زانست و زانیاری لە بەغدا هەبووە. سوڵتان عەبدولمەجیدی عوسمانی ڕێزی لێ ناوە. جگە لە تەفسیرەکەی کە ناوی (روح المعاني)یە، نزیکەی بیست دانراوی تری لەپاش بەجێماوە.

بە شان، دەست ئەکەن بە هەڵپەڕین، گەلێ پیاو، ژن و کچ و خوشکی خۆی لە دەستی پیاوی بێگانە ئەبینێ. هەتا قیت و قۆز خۆی بنوێنێ و قنجیلەتر هەڵپەڕێ کەیفی پێ دێ.

دانس شتێکە بەشەریيەت قبوڵی ناکا، ئەمما بەناوی فنونی جەمیلە زۆر بەکارێ موستەحسەن و شیرن حیساب ئەکرێ. خاسەتەن هەر سەیئات و قەبائیحێ بووە مەزهەڕی تەقدیری ئەوروپاییان، لای عومومی بەنی ئادەم بە ئیعجاب و تەقدیر قبوڵ ئەکرێ. حەتتا وای لێهاتییە، ئینپراتۆڕێ کە حوکمی لەسەر چوارسەد ملیۆن ئینسان ئیجرا ئەکرێ، لە گەلێ ئیحتیفالات هەیە ئینپراتۆر بەچە ڕەقس ئەکا، ئەگەر نەختێ مەهارەت بنوێنێ هەموو جەرائیدی دونیا ستایشی ئەعلا حەزرەتی شاهەنشاهی ئەکەن.

بەعزێ حوکەمای غەرب ئیدديعا ئەکەن هیچ شتێ قەبیح نییە، بەڵکو مەدار لەسەر ئیعتیاد و عەدەمە ئیعتیادە. خۆ ئەگەر ناوی دینیشی هاتە سەر، ئەوجا بە ملیۆن تڕ ئەکەنن. وە ئەمەش لە زومرەی کەرامەتی ئەولیائوڵڵا عەد ئەکەن. وەهاکەزا خۆت بنۆڕە ئەحوالاتی بەشەر، شەڕ و شۆڕ و ئوموری سەیئە، عادەتەن بوویتە فیترەتی ثانیە، عائیدی تەربیەیە. بۆیە جەنابی حەق نیسبەتی ئەو تەزەیینە بۆ خۆی ئەدا.

١٢١/٣

## دوو ساڵی سەردەمی ئینگلیز لە کۆیە و وەزعی دزان!

قەریبی دوو ساڵ، یەك دوو حوککامی سیاسی ئینگلیزی لە کۆیە و ڕانیە بوون. ئەوانەی عادەتیان گرتبوو بە ڕێگری، بە ئینسان کوشتن، بە ماڵ دزین، بە خەرمان و خانوو و پووش و پاوان سوتاندن، تەرکی عادەتیان کرد. ئەو بەدکارانە قەتعیەن نەیانئەتوانی مەڕێ لە ئاو بکەن، باقە پوشێ بسوتێنن. ئەو شەوە کە حاکمی سیاسی لە کۆیە ڕۆیی، شەوی جومعە بوو. بە شەو و ڕۆژێ لەناو شار و حەوالەی شار، یازدە کەس کوژران، کما فی السابق بۆوە دەوری مسوڵمانان، قەتل و نەهەب و

سەلب و دزین و ڕێگری و ئیحراق، نیسابی پێشووی گرتەوە. وە تا ئەمڕۆ ساڵ دوای ساڵ لە زیادی دایە، کەوابێ دیارە ئەو تەزەییونە قابیلی زەواله.

١٢٢/٣

## هێشووە تری!

کەسێ بە دیققەت و زەوق، تەماشای هێشووە ترێیێ بکا، لە دەقایقی صونع و تەرکیبی بفکرێ، هەم بە زەوق لەزەت لە تامی ئەبینێ، هەم بە عەقڵ لەزەتێ (فوق تلك اللذە)ی ئەچێژێ. وەك شێخی عەرەبی ئەفەرموێ: بۆ ئینسانی بە ویجدان، کوللی لەزەتی حیسی لەزەتێ عەقڵی ڕوحی تیایە.

١٢٧/٣

## شێخ عەلی ئەفەندی تاڵەبانی!

چەند ساڵ لەمەوپێش بە خدمەت شێخ عەلی ئەفەندی تاڵەبانی گەیشتم لە کەرکوك. ڕۆژێ عەرزم کرد: جەنابتان لە مەسئەلەی خولفی في الوعيد، چی ئەفەرموون؟ شێخی عەرەبی لە فصوص[1] زۆر قووەتی ئەداتێ کە ئەو خولفە جائزی علی الله-یە.

فەرمووی: سبحان اللە کەسێ دەعوای عبودییەت و ئیخلاص و ئەدەب بکا، لە خدمەت خوا مەسئەلەیێ عینوانی خولف بێ، چۆن نیسبەتی بۆ خودا ئەدا؟

١٢٩/٣

---

(١) مەبەست کتێبی (فصوص الحکم)ی ئیبن عەرەبییە.

## برا برای دەکوژێ، چ ئینسانێ بکوژی چ صەیێ!

لەو عەسرە شوومە کە ئەڵێن عەسری مەعاریف و عیلم و نوورە، عەسری مەدەنییەتە، عەسری مەعدەلەت و مەشروتییەتە. قەتلی ناحەق زۆرە و بێ ئەهەممیەتە. چ ئینسانێ بکوژی چ صەیێ. لەو دوو سێ ڕۆژە دوو برا، سەپان ئەبن، برا گەورە نەختێ ناساغ ئەبێ، برا گچکە ئەڵێ ئەمساڵ سەپانیت نادەینێ، تۆ چ ئیشت نەکردیە، ڕقی ئەبێتەوە بەردێ ئەدا بەسەری برا گچکەکە. کە ئەویش داسی بەدەستەوە ئەبێ، دایئەوەشێنێتە براگەورەکەی نوکی لە زگی ئەچەقێ ڕایئەکێشێ لەو کەلەکە بۆ ئەم کەلەکە هەڵیئەدڕێ، ئەکەوێ، دەرحاڵ ئەمرێ. سەرشکاویش ئەوا تەداوی ئەکرێ، پار شیوعی بەست، برایەك برایەکی کوشت لەسەر کۆتکە نۆکێك.

١٥٧/٣

## خەڵك ئەوەندەی لە حاکمی سیاسی ئەترسان ئەوەندە لە خوا نەئەترسان!

وەقتێ ئینگلیز ئیستیلای کرد، حاکمێ سیاسی لە کۆیە، یەکێ لە ڕانیە دانیشت. عالەم ئارام بوو، قەتل نەما، دزی و درۆزنی و زینا، ژن هەڵگرتن و ژن بەدووکەوتن، خەرمان و خانوو و پووش و پاوان ئەسوتان، بێ ناوونیشان بوون. ئەمما مسوڵمانان ظاهیرەن زۆر سەغڵەت بوون: ئاخ کافرمان لەسەر، بووینە ژێردەستی گاوری!

ئەشقیایەکان ئیزهاڕی تەئەسسوفیان ئەکرد، زوعەفا و بەستەزوبانەکان زیاتر لەوان مەحزوون بوون، تا حوکمەی سیاسی ڕۆیشتن دەرکەی گوناه و سەییئات و فەحشیات کرایەوە. مازیی بەڕەڵابوو، تا ئەمڕۆ ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادیە. دیارە ئەوەندەی مسوڵمانەکان لە حاکمی سیاسی ئەترسان عوشری میعشاری لە خوا ناترسن. وە شەرم لە پێغەمبەر و دینی ئیسلام ناکەن. عەقڵی چی! شعوری دینی چی! ئایینی چی!

١٥٧/٣

## معاشی مودەڕیس و شێخەکانی پایتەخت لە کوێ دێ؟

جوێنی ناشیرین بە موحصەناتان کە زۆر قەبیحن، شیددەتی قوبحیان بە شەرع و عەقڵ ثابتە، بە قەحپان ئەڵێن فاحیشە. هەرچی زۆر ناشیرین و ناڕێك بێ لەگەل بەشەرییەت فاحیشە چ بە ئاشکرایی، چ بە دزی، تخونی فەواحیش مەبن. مەچنە قەحپەخانە، قەپاتمان مەگرن، دۆست و بناژۆتان نەبێ نە لەگەڵ حوڕڕان نە لەگەڵ جاریان. کاری فەحش مەکەن لە خەلوەتخانان، لە زیارەتگاهی موقەددەسە، خۆتان بپارێزن. نعوذ بالله لە ژێر زەمینەکان، لە مەخادیعی پاکی و لە مەرەد و شەرەدەی ساحێب تەریقان. لەو عەسرە مەنحوسە فەواحیش ئەوەندە تەعەمموومی کردیە نایەتە خەیاڵ. سەربەستی و حوڕڕی و بێ موبالاتی و بێ شەرمی، ئەوە هەمووی نەشئەت لە ئەورووپا دەکا. گەرچی ئەورووپایی فەحشیاتیش بێ فائیدە ناکەن. ئەمما ئاسیایی بە تەقلیدی وان بێ هوودە سەرفی نەقدیەتی حەیاتی خۆیان ئەکەن.

ئەوەندەی چاکە ئەگەر خەزینەی ئەوقاف کیفایەت نەکا، معاشی مودەڕیس و شێخەکانی عاصیمە وە یاخود ئەربابی مەناصیبی عالیە لە ئیجارەی قەحپەخانە و مەیخانە تەئمین ئەکرێ.

١٥٦/٣

## پەنا بەخوا لە شەڕی کۆلکە مەلایان!

مەسئەلەی زۆر عەجیب دەوران ئەکا لە کوردستان، ماڵی هەتیو چا ئەکەنەوە. لابوددە سەنێ ئەچێ ئەوەی حەقی هەتیو مردە زیندە قابیلی دەوام و ناقابیلی بە کەسێ لە ئەقاریبی ئەفرۆشێ حەتتا حەقی (ما في بطن أمه).

گەلێ جار سوئال لە ئێمە لە ئابای ئێمە ئەکەن و کراوە، عەرزیان ئەکەین ئەمە نابێ موافیقی هیچ قاعیدە و مەزهەبێ نییە. باز کۆلکە مەلا ئەیکەن چ نەبێ بزنێك مەڕێك، جەوارێك، هەمبانەیەکیان پێ ئەبڕێ. پەنا بە خوا لە شەڕی کۆلکە مەلایان! بالمناسبە عەرزتان ئەکەم دوێنێ

تەحریرەن سوئالێکیان لێ کردم:

شەخسێ بە سێ تەڵاقە خولعی لەگەڵ ژنی خۆی کردیە دەرحال لێیان مارەکردیتەوە، ئەمە چۆنە؟

بزانن جەهل چی ئەکا! فەقری مەلایان بالخصوص ئوممەت، دین و شەرعیان تێك دا.

١٥٨/٣

## ئوممەت لە ئیختیلاف هیچ ڕەحمەتێکی نەدیت!

تا ئەمڕۆ ئەو ئوممەتە لە ئیختیلاف چ ڕەحمەتێکی دیت؟ چ فائیدەی لێ بەدەست کەوت؟ ئەمڕۆ مەلایێ شیعە بەعزێ مەتاعینی کۆنە لە حەق ئەسحابان ئەنووسێ، ئەیکا بە کتێب باسی فیتنە ئەنگێزی حەزرەتی عائیشە ئەکات. ئاگای لە کەمترین فیتنەی مەلیکەی ڕووس و فیکتۆریا مەلیکەی ئینگلیز نییە، چیان بە عالەمی ئیسلامییەت کرد، چۆن پشتی مسوڵمانانیان شکاند؟!

ئەمڕۆ مەلایان تەماشای موبەششیری مەسیحی بەهائی و قادیانی ناکەن، مەتاعین لە حەق ئەبو هورەیرەی مسکین ئەنووسن! دەك کۆر بن دەستی قەلەمیان بشکێ! وە ئوممەت ئەمڕۆ هەر وەکو پێشوو دوای ئەو خائین و موفسیدانە ئەکەوێ، لاشەك پێغەمبەر لەوان نییە، ئەوان لە پێغەمبەر نین، ڕەسوولی کیبریا لەوان بەرییە، ئەوان لە ڕەسوولی کیبریا بەرین.

١٦٤/٣

## بەشەر خەریکە لە لیباس دەردەچێ!

ئەمڕۆ بەشەر خەریکە لە لیباس دەرچێ، خاصەتەن خاتونی ئەورووپایی، بەڵێ سەواتەین دیار نییە، ئەمما دەوران دەوری مەکشوفە. بانگی تەتاران ئەکا، گۆیا مەدەنییەت لە غەربە، هەرچی غەربی بیکەن، لای شەرقی غەببی، وایە عەینی مەدەنییەتە. قسمێ لە غەربی، خەریکن

عەیب و عار لەناو بەشەر هەڵگرن. حەتتا لەلای ئێمەش فێری منداڵە مەکتەبیلەکان ئەکەن، عەیبە عەیبە. لە زەمانی جاهیلییەت کە تەوافی بەیتیان ئەکرد، خۆیان ڕووت ئەکردەوە، بە ڕووتی تەوافیان ئەکرد. ئەوە لە ئیسلام تەبدیل کرا بە ئیحرام، ئەیانگوت بەو جلکی کە گوناهی تێدا کراوە تەواف ناکەین. ئەمە ئیجابی ئەکرد خۆیان تەواف نەکەن، خۆیان گوناهیان کردبوو. جلکی چی؟

١٨٢/٣

## بەسەرهاتم لەگەڵ دزێك!

ڕۆژێ تووشی پیاوێ بووم خرارێکی هەردروو بوو لەبەری کردبوو. منیش تەقدیری بۆنی تەزویرم لێکرد. وتم ئەگەر ئەمە بۆ خوای با، باش بوو!

زۆر نەچوو گەلێ پێلاوی دزیاری مزگەوتانی لێ ئاشکرا بوو.

١٨٣/٣

## ئەنواعی جل و بەرگ!

من بە فکرم دێت بەعزە کەس بە ئێمەنی دوروانی دەگوت ئێمەنی باشم بۆ دروست بکە. بۆیە مەجیدیەکی[1] پێئەدەم تا ساڵێکی لەسەر بخولێمەوە.

کەوایەکیان ئەکرد، ئەقەلەن سێ تا چوار ساڵ لەبەریان ئەکرد، دوایێ لە سەییئاتی ئاوروپا کارخانەی گەورە گەورە دروستکرا. ئەنواعی ئەلبیسە

(١) مەجیدی دراوێکی عوسمانی-عێراقی بوو، لە زیو دروستکرابوو، بەناوی سوڵتان عەبدولمەجیدی عوسمانی کرابوو، روبعە مەجیدی دەیکردە بیست قرووش، هەروەها مەجیدی بچووکیش بەهایەکەی هەشت قروش بوو. نیو مەجیدییش بەهاکەی چل قروش و مەجیدی گەورەش هەشتا قروش بوو. بڕوانە قاموس المصطلحات الاقتصادية فی الحضارة الاسلامية، د.محمد عمارة، دار الشروق، الطبعة الاولی، ١٩٩٣، ص٥٠٥.

لە خوری لە لۆکە لە مودە تا فەنتازی و تەلەفون پەیدابوو. ئەقمیشەی جوان و نازك ئەمڕۆ لەبەری ئەکەی سبەینێ ڕەنگی ئەچێ، دوایێ لەباریەك دێتە دەر.

لە سایەی مەدەنیەتی ئاوروپا عالەم هاواریەتی.

١٨٤/٣

## تەڕەفدارانی سفوور!

لاشەك ئەوەی لە ئەییامی ئێمە تەڕەفداری سفوورن، مەقسەدیان هەتکی سەواتە. ئەگەرچی وا ئەنوێنن، کە خزمەتی بەشەریەت ئەکەن، جنسی لەتیف لە ئەثارەت و قەید و بەند ئازاد ئەکەن. وە ئەعزایێ عامیلە بۆ هەیکەلی ئیجتیماعی زیاد ئەکەن. لاکین خوا ئاگاداری مافی الضمیریانە. وە ئەگەر سفووریشیان بە قەدەر سفووری پیاوان بێ، بە حالی تەبیعی بێ، پەردە و تەوالیت وەك ئێمە بچنە دەر، ئیش و کاری خۆیان بکەن و بگەڕێنەوە ماڵ، ئەهوەنە. ئەمما تەعەددیات زۆر ئەکەن. خولاسە غەیری دارڕندنی لیباس شەڕەفی بەشەری غیرەت و حەیا بێ ناموسی چیتریان مەقسەد نییە.

هەروەها ئەئیممەی سفوور لە لیباسێ وانە، نایان ناسن، ئاگاداری مەنەوویاتیان نین، بە دڵ لە کین دان، بەدخواهی دین و دنیان، خۆیان بە تەڕەفدار و خێرخواه نیشان ئەدەن، غەیری ڕەسوول ئەوەی ئیددیعای دیتنیان بکا درۆیێ ئەکا.

١٨٥/٣

## خشونەتی گوزەران!

ئەو تەقەشوف و خشونەتە، کە ئەیکەن لە لیباس و لە خواردن و لە مەسکەن، موافیقی ئەساسیاتی ئیسلام نییە، ئەو ڕەهبەنەتە لە مەسیحیان هاتیتە ناو ئێمە.

ئێمە ئەڵێین: ئیمام زین العابدین[1] کەسای خەززی ئەکرێ بە پەنجا هەزار دینار، هاوینێ ئەیبەخشی. وە ئەو ئایەتەی ئەخوێندەوە. وە ئەڵێن: پێغەمبەر تەشریفی هاتەدەر ڕیدایەکی لەسەر بوو قیمەتی هەزار درهەم بوو. ئیمامی حەنەفی[2] ، ئیمامی مالیك[3] ، لیباسی چاکیان ئەپۆشی. ئیمامی شافیعی[4] خواردنی زۆر لەزیزی عافێت ئەکرد. بەلێ بۆ پادشاهان

---

(١) ناوی عەلی کوڕی حوسێن کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالب (٣٨-٩٥ك)، بە زەینولعابیدین ناسراوە، ئیمانی چوارەمی شیعەکانە. چەند نازناوێکی تری وەکو ذوالثقنات، زین الصالحین، منار القانتین هەیە. بەرهەمێکی بەناوبانگی هەیە ناوی (الصحیفة السجادیة)یە کە چەند دەربڕینێکی پەرستش و پەیڤێکی ڕەوانبێژییانەی لەخۆگرتووە. دوای کتێبی نهج البلاغة بە کتێبێکی گرنگ لەلای شیعەکان دادەنرێت.

(٢) ناوی أبو حنیفة النعمان کوڕی ثابت الکوفي (٦٩٩-٧٦٧ز) شەرعزان و زانایەکی مسوڵمانە و یەکەم ئیمامە لە هەر چوار ئیمامەکەی ئەهلی سوننەت و خاوەنی مەزەبی حەنەفییە لە فیقهی ئیسلامی، بە ڕەوشتی جوان و زانستە زۆرەکەی ناسرابوو، هەروەها بە یەکێك لە تابیعینەکانیش دادەنرێت و چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر (د.خ)ی بینیوە لەوانە ئەنەسی کوڕی مالیك. ناوبراو لە کووفە لەدایك بووە و چەند بەرهەمێکی نووسراوی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە.

(٣) ناوی أبو عبدالله مالك کوڕی ئەنەش کوڕی مالك کوڕی أبي عامر الاصبحي الحمیري المدني (٧١١-٧٩٥ز)یە، شەرعزان و فەرموودەزانێکی مسوڵمانانە، دووەم ئیمامە لە چوار ئیمامەکەی ئەهلی سوننەت. خاوەنی مەزەبی مالکییە لە فیقهی ئیسلامی، بە زانایی و شارەزاییەکەی لە فەرموودەناسی بەناوبانگ بووە. کتێبی الموطأ ی ناوبراو بە کتێبەکانی دەستپێکی فەرموودەی پێغەمبەر دادەنرێ و تەنانەت ئیمامی شافیعی لەبارەی ئەم کتێبە گوتویەتی کە لە دوای قورئان کتێبێك زۆرترین پاداشتی پێوەبێ کتێبی الموطأ ی ئیبن مالیکە. لە مەدینەی پیرۆز لەدایك بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.

(٤) ناوی أبو عبدالله محمد کوڕی ئیدریس الشافعي المطلبي القرشي (٧٦٧-٨٢٠ز)یە. سێیەم ئیمامە لە چوار ئیمامەکەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و خاوەنی مەزەبی شافیعییە لە فیقهی ئیسلامی، دامەزرێنەری زانستی اصول الفقه بووە و زانایەکی بواری تەفسیر و فەرموودەناسی بووە و کاری قازییایەتی کردووە و هەروەها شاعیریش بووە. ناوبراو لە شاری غەززە لەدایك بووە و دواتر هاتوونەتە شاری مەککە و لە حەوت ساڵی قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە و پاشان کتێبی الموطأ ی ئیبن مالیکیشی لەبەرکردووە. لەلای ئیبن مالیکی خوێندووە و پاشان چۆتە یەمەن و بەغدا و میصر و چەند شوێنێکی تریش گەڕاوە. بەرهەمی زۆری لەپاش بەجێماوە و لە میصر کۆچی دوایی کردووە.

و ڕوئەسایی عیزام خشونەتی عەیش لازمە، نەك تەبەسسوت بکەن و ببنە باعیسی وێرانی بیلاد و هیلاکی عیباد. بۆیە خولەفای ڕاشیدین موبالەغەیان ئەکرد، لە خشونەتی گوزەران.

١٩٠/٣

## میکرۆفۆن و قورئان خوێندن!

ئەمرۆ لە سایەی عیلمی ئەهلی هونەر، بە تەلەفۆن لە ئەمسەر و ئەوسەری دونیا بانگی یەك ئەکەن. وە ئەبینێ بە تەلەفزیۆن صورەتی یەکدیش ئەبینن. بە میکرۆفۆن چەند هەزار کەس گوێیان لە بانگی بانگدەرانی نوێژ ئەبێ. وە بە ڕادیۆ گوێیان لە دەنگی قیرائاتی قورئان خوێنان ئەبێ، لە شارەکانی زۆر دوور. چەند خۆشە کە شێخ محەمەد ڕەفعەتی ئەمیرولقورڕا[1] ، کە قورئان ئەخوێنێ لە ئیزاعەی قاهیرە، ئێمە لێرە لە شاری کۆیە گوێی بۆ ئەگرین. حەققەن ئەگەر بڵێین قیرائەتی ئەم شێخە موافیقی قیرائەتی واقیعی قورئانە. ڕەحمەتی خوای لێ بێ.

٢٠٢/٣

---

(١) شێخ محەمەد ڕەفعەت لە ساڵی ١٨٨٢ لە قاهیرە لەدایك بووە، یەکێك بووە لە قورئانخوێنە بەناوبانگەکانی جیهانی ئیسلامی، لە تەمەنی دوو ساڵیدا چاوەکانی کوێر بووە، لە تەمەنی پێنج ساڵیدا قورئانی لەبەر کردووە و لە ساڵی ١٩٣٤ ڕادیۆی میصر دوای ئەوەی شێخی ئەزهەر محەمەد ئەحمەد ئەلزەواهیری فتوای ئەوەی دا کە دروستە قورئان لەڕادیۆ پەخش بکرێ، سەرەتای کردنەوەی ڕادیۆکە بە سوورەی الفتح بە دەنگی محەمەد ڕەفعەت کرایەوە و ئێزگەی بەریتانیا (بی بی سی عەرەبی) کە دەنگەکەی بیست، داوایان لێکرد کە بۆیان بخوێنێ، بەڵام ئەو بە پاساوی ئەوەی ئەوان نامسوڵمانن، ڕەتی کردەوە بۆیان بخوێنێ. پاشان ئیمام مەراغی بابەتەکەی بۆ ڕوون کردەوە کە حەرام نییە، ئەنجا ئەویش سوورەتی مەریەمی بۆ تۆمارکردن. لە ١٩٥٠/٥/٩ کۆچی دوایی کردووە.

## لە سوودی نەوتی بابەگوڕگوڕ مەحرومین!

کە نەفتی بابەگورگوڕی لە کەرکووك جەریانی پێدرا، بۆ حەیفا و ساحیلی بەحری سپی ناوەڕاست، بۆ دارالقدرە، جێی تەعەجوب نامێنێ. لە هیندستانەوە بە تەیارە ئەرزاقیان ئەهێنا لە ئەتڕافی ڕەواندز بۆ عەسکەریان فڕێ ئەدا. بەڵام مع الاسف ئەو فەیزە لە دونیا بۆ ئێمە نییە، لەو نەوعە قودرەت و خاریقە، مەحروومین.

٣/ ٢٠٦

## ئەفەندی بە پێڵاوەوە ئەچێتە بەهەشت!

ئێستاش ئەو نەوعە قەشمەریە زۆرە، کەسێ نوێژ بکا، نەخواتەوە، قومار نەکا، پێی ئەڵێن : بەڵێ ئەفەندی ئەولیایە! بە پێڵاوەوە ئەچێتە بەهەشت، ئەڵبەتەش بۆ ئێمە تکا ئەکات!

٢٢٣/٣

## کوێرێکی دز!

لە ئەوائیلی منداڵیم کوێرێ هەبوو لە شاری کۆیە، مەلا ڕۆستەمیان پێ ئەگوت، دزی ئەکرد، ماڵی ئەبڕی، لاشەك کەس شکی نەدەکرد، کە ئەو کوێرەیە ئەتوانێ دزی بکا. تا دەفعەیێ بەعزە جلکی ژنان بە شەو لە خمخانەی خۆی خمی ئەدا، غافڵانە دێتەوە ماڵی خۆی، جلکەکان زەریف ناگوشێ قەترە قەترە خم ئەرژێتە سەر عاردی لە خمخانە تا ماڵێی.

سبەینێ شوونیان بردە سەر ماڵی مەلا ڕۆستەم. گەلێ ماڵی دزیاری لە ماڵەکەی دەرکەوت. حەتتا دەفعەیێ بە شەو ئەچێ بۆ دێی شێخ مەنسووری، ئەبیێ دەنگی پیاوێ لە ئەهلی دێ، ولاغ لێئەخوڕێ، ئەوا دێ بۆ کۆیە. ڕۆستەمی کۆر خۆی ئەخاتە کەمین، تا پیاوەکە نێزیك ئەبێتەوە، دەنگی لێئەدا، هجومی ئەکاتە سەر، ئەیگرێ، ڕووتی ئەکا،

ئەیبەستێ. وڵاغەکان ئەداتە پێش خۆی بۆ دێیەکە ئەڕوا. ئەو حیکایەتە بۆ ئەهالی ئەگێڕێتەوە، بەعزێ ئەچنە سەری، کوڕە فلان چت لێقەوماوە؟ فڵانی دەنگ مەکەن تا ئەچینەوە دێ، لەوێ حیکایەتتان بۆ ئەکەم! نۆدەم هاتنە سەر ڕێ، چەند پیاوێ بەقووەت دەوریان لێدام، گرتمیان بەستمیان، وڵاغەکانیان برد.

مەلا ڕۆستەم ئەڵێ لە قورت نیم، وەڵلا هەر ئەمن بووم بە تەنیا ڕووتم کردی، لە ترسان ئەوەندە هۆشت نەما، تەماشام بکەی کۆرم؟ چاو ساغم؟ کێم؟ کێ نیم؟

زۆر کۆر هەن لە کۆرانی شاری کۆیە، با وجودی زۆر ناهەموارە، بێ دار، بە سەربەستی ئەگەڕێن. کۆرێ هەیە لە دێی ئێمە (پێبازۆك)، ناوی لەتیفە. دەچێتە کاروان، بۆ شاری کۆیە دێت دەچێتە بیتوێن، چ پەکی لەسەر دار ناکەوێ. حەتتا وا ئەبێ مەڕێ بزر ئەبێ، ئەگەڕێ لەناو مێگەلی خەلکی مەڕی خۆی ئەناسێتەوە.

خولاسە ئەوانەی بە منداڵی کۆر ئەبن، یا زگماکن، زۆر بەحس ئەبن زیهنی غەریبیان ئەبێ. ئەمما عافانا الله ئەوانەی بە گەورەیی کۆر ئەبن، زۆر شپرزە و زیهن کۆر و ناشارەزا ئەبن، بە دەست ڕاکێشان نەبێ ڕێ دەرناکەن، دار عەسا کەلکیان ناگرێ.

٢٢٦/٣

## لە قسەی چاکی زانایان خۆتان مەحرووم مەکەن!

سبحان الله ئەو نەوعە تەزوێرە چەند مەشهوورە و موئەسیرە، قەدح و زەمی شەخسێ ئەکەن، ئینسان بیلا موحاکەمە نەفرەت لەو شەخسە ئەکا، ئەیکرهێنێ، حەز لە چارەی ناکا. حەتتا ئەوە لە بەینی ئەهلی عیلم زۆر مونتەشیرە، لە ئەووەلی نەشئەتی عیلم زەمی کەسێ وەك شێخ عەلی ئیبن سینا[1] ، زاتێ وەك ئیبن تەیمیە[1] ئەبیسی لە بەعزە مامۆستایەك، ڕقت

---

(١) ئەبو عەلی حسێن کوڕی عبداللە کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی سینا (٩٨٠-
←

لێیان ئەبێتەوە. ئەگەر خوا ڕەحمت پێ نەکا لەسەر ئەو بوغزە ئەمێنی، لە عیلمیان مەحرووم ئەبی. بۆیە من وەسیەت لە تەلامیذی خۆم ئەکەم: بەو نەوعە زەمـــمە هەڵنەخەڵەتـێن ئەگەر خۆتـان لە تەئلیفـاتی ئەوانە شـتێ خراپتان دیت، قبوڵی مەکەن! وە بە ئەوەنـدە، لە قسەی چاکیـان خۆتـان مەحرووم مەکەن، مەسـەلەیێ تـورکیە: بـالقی باشـنن قۆقـار، واتـە ماسـی لەسەریەوە بۆگەنی ئەبێ.

٢٢٧/٣

## ئیدامەکردن گرنگە!

مەرحوم سلێمان نظیف بەگ، والی موصل ئەیفەرمـوو: دروسـتکردنی بینـــایێ عەزیـــم زوموحتەشـــەم ســـەهلە، بەڵام لازمە لە ئەووەلەوە دوشونمیشی[٢] ئیدامە بێ.

یەعنی ئیدامە زەحمەتە، ئیعتینای زۆری پێ ئەوێ. فی الحقیقە زۆرمان دیت، زۆرمان بیست دەوڵەتێ تەشەککولی کرد، گەورە بوو تەوەسـوعی

---

١٠٣٧ز) بە ئەبو عەلی سینا و ئیبن سینا و پوورسینا ناسـراوە، لە ڕۆژئـاواش بە ئاڤیسـنا هاتۆتە ناساندن. لە بوخارا لەدایك بووە و پزیشـك و شـاعیرێکی ناسـراوی ئێـرانییە و نزیکەی ٤٥٠ کتێبی لە بواری جۆراوجۆر نووسیوە، کە گرنگترینیـان کتێبـی قـانوونی پزیشکی یە.

(١) شێخولئیسلام ئەحمەد کوڕی عبدالحلیم کوڕی عبدالسلام کوڕی عبدالله کـوڕی ئەبولقاسم کوڕی تەیمیەی حۆرانیی دیمەشقی حەنبەلیـیە. لە سـاڵی ٦٦١ی کـۆچی لە حەڕان لەدایك بووە، بە یەکێـك لە زانـا هەر دیارەکـانی سـەردەمی خـۆی دادەنـرێ، بەهۆی زیرەکی و فتواکانییەوە چەنـدین جـار تووشـی زینـدان و ڕاگواسـتن بـۆتەوە، بەتـایبەتی لە نێـوان قـاهیرە و ئەسـکەندەرییەدا. لەو سـۆنگەیەوە لەگەڵ سـۆفییەکان ڕووبەرووی کێشەی زۆر بۆتەوە. فتواکانی، خۆی لە چەند بەرگێکی کتێب دەبیننەوە، وێڕای بەرهەمی تری لەبواری شەرعناسیدا. لە سـاڵی ٧٢٦ی کـۆچی، کـۆچی دوایـی کردووە. بۆ زیاتر زانیاری بـڕوانە: ( المجموعـة الفتـاوی، لشـیخ الاسـلام تقـی الـدین احمد بن تیمیە الحرانی، حققە وخرج أحادیثە وعلق علیە:خیری سعید، المجلد الاول، المكتبە التوفیقیة، القاهرة، ٢٠٠٨، ص١٠-١١)

(٢) دوشنمیش پەیڤێکی تورکیە واتە بیرکردنەوە.

کـرد، مـع الاسـف ئەخلاقـی ئەو مەردانە، ئیـدامەی نەتـوانی. عـاقیبەت پەڕاگەندە بوون و مەحوو و نابووت بوون.

۲۳٤/۳

## خەواریق هەموو قەواعیدی عیلم و عەمەل تێك ئەدات!

بە منـداڵی تەصـریفمان ئەخوێنـد پێیـان نیشـان ئەدایـن، شـاذ قاعیـدە تێکنادا. نازانم بۆ تێی ناگەین؟ سەوادی ئەعزەم بە تەمـای کەڕامەت لێـی گەڕاون، تەصـریف خـوێن و موفەسـسیرەکانیش فەرقیـان نیـیە. بەحـری عولوم و مەعاریفی موحیتە بە تەئریخی عالەم کە هـاتە باسـی خەواریـق، چی لە فیکر نامێنێ. هەموو قەواعیدی عیلم و عەمەل تێك ئەدات.

۲۳٥/۳

## سیاسییەکان بێ عەهدن!

سبحان الله العظیم عوزەمای ئیسلام ئەو ئایەتەیان (وَإِن وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ) بیستیە، بەڵام مع الاسـف تـا ئەو ئـاخیرە، تێـی نەگەیشـتین، کە ڕیجالی سیاسەت بێ عەهدن. پێیـان هەڵخەڵەتـان، عەروەی ئوخـووەت و ڕابیتەی دینیان لەگەڵ یەك شـکاند و پسـاند. بەگژیەکـا چـوون و لە بـاڵ یەك هاتنە دەر. باوەڕ بکە ئەلئانیش زۆر کەس بڕوایان پێ ئەکات!

۲۳۷/۳

## ئافاتی کیبر!

هەتـا ئەمـڕۆش ئەوانەی زادەگـانن کەمـن. ئەبـنە ئینسـان لەبەر کیبـر کەسابەت ناکەن، ناخوێنن. لە مەداریسی حکومەت ئەوجا لە سەدا یەکێ لە زادەگان ناجیح ئەبێ، بەڵکو ئیکمالیشیان کەمە، علـی العمـوم ڕاسـیب ئەبن. لەبەر کوبڕا ئەحفادی حاجی بەکراغای کۆیە، ساحێبی سەرووەت و

سـامان و عیـزز و جـاه و عەمەل و ئـاداب و شـوهرەتگیری ئافـاق ئەکسەریان بووینە زەبیال و کەنناف و کەنناس. لە شاری کۆیە نەتیجەی کیبرە، ئەکسەری ساداتی کیرام بە سوئال بەڕێوە ئەچن. میلەل و ئەقوامی عەزیمە ئەکسـەری مەحـوو پەریشـان بـووین. (سـبحان اللـه) لەو قاعیـدە موتتەڕیدە، لەو سوننەتە لا یتغیره. مع الاسف ئوممەت گوێ نادەنە ئایاتی قورئانی ڕوویان لێوەرگێڕاوە، بۆیە خوا لێی وەرگێڕان.

٢٥٥/٣

## بەهۆی عیلمەوە ئێمە هەردوو لامان چوو!

ئێستا سەبەب بە نووری عیلم و عیرفان، سەبەب بە ئیکتیشافاتی عولەمای تەبیعەت، ئەبێ قەومێ هەزار بەلای بەسەر بێ، وەکی ئێمە؟ لە ماوەی ئەم شەش حەوت ساڵە، بەلای وامان هاتۆتە سەر نەهاتۆتە سەر ئەقوام و ئومەمی ڕابردوو. چەند ساڵ لە دوای یەك کلۆمسکە دوو ساڵ مەعەهو کلۆزەردە دونیایان وێران کرد. مەئمورینی حکومەت دەرمانیان ئەهاویشت بۆ کلۆ، ماڵات و وەحشیات ئەیانخوارد زەهر ئالود ئەبوون ئەمردن. ئەهالی فریادیان ئەکرد لە ڕێی خوا لێی گەڕێن ئەو دەرمانە زەرەری پترە لە کلۆ. بە سەعی حکومەت نەفەوتان با وجودی فوق الحد مەسرەفی کرد لەو جێگایانەی گەلایان لێ دانابوو، پاش پەلە بارانێکی وای نەبوو، دەغڵ و گیا و گوڵ زەریف شین بێ. وەقتی بەهار فەرخە کلۆ ژیانەوە لە قەوان هاتنە دەر، هەفتەیێ نەژیان هەموو مردن.

ئەمما وڵاتی هەولێر وەخت بوو بە جارێ لەبەر بێ لەوەڕی بفەوتێن، مەڕو ماڵاتیان لە سەدا هەفتای بە قڕ چوو. کلۆ خەلاس ئەوجا زەنگەسوورە، زەردەواڵە، زەرگەتە دوو ساڵ بە نەوعێ زۆر بوون، باوەڕ ناکەم تەئریخ دیتبێتین، میوەیان نەهێشت، مێشنگوینیان فەوتاند. بە ڕۆژ خواردن، خاسەتەن گۆشت مومکین نەبوو، خوا ئەیزانێ لەگەڵ پاروو ئەچوونە ناو زاران، ئەویش خەلاص! ئەمە دوو ساڵە ژەنگ پەیا بوو لە دەغڵ، لە ترێ، لە سائیری میوەجات، خاسەتەن ئەمساڵ ئەووەلەن لە بەهار بەهارێ زوو، پەلەپیسکە لە درەختی دا، دوایێ ژەنگ. ئەمڕۆکە ئەووەلی تەمووزە، گەلێ باغاتی مێو پەلکی هیشك بووە، بەرەکەی بە هەتاو سووتاوە، ئەوەی پەلکی مابێ ژەنگ لێی داوە، لە مێش و مەگەزو تەپۆ و پێشکە قسە ناکرێ!

نە کەس ئەوانە حەمل ئەکاتە سەر غەزەبی ئیلاهی، وە بە تەوبە و نابە چارەی بکا، نە حکومەتیش چی پێ ئەکرێ. با وجودی بۆ تەداوی نەباتات و ئەشجار و دەفعی عیلەل و ئەمرازی مەزروعات، وەك دوەلی

ڕاقیه وەزارەتی خاصی هەیە، فائیدەی مەساریفی بێ هوودە چوو، بەڵکو مع الضرر. کرمێ پەیا ئەبێ ئێمە پێی ئەڵێین هاری، شتلە توونن ناهێڵێ. لەو ساڵانە حکومەتی فەخەیمەمەز[1] ناردی ڕیجالی موتەخەصیصین خەریجی کولیاتی ئەورووپی هاتن، بۆ دەفعی هاری زەهریان بە دوکانە شتلە تووتنان وەرکرد، پاش یەك دوو ڕۆژ شتلە تووتن دەستی کرد بە وشك بوون، نیهایەت سوتان مەحوو بوون. مەگەر لە برسان، وە ئیللا دانەیێ هاری زەرەری نەدیت. حەتتا لە سایەی ئەو ڕیجالە موتەفەنینانە ساڵی دوایێ ئەرازییەکە گیاشی لێ شین نەبوو. حاصلی لەبەر تەرەقییاتی فنون و عیلم و مەعاریف مەعنەویاتمان چوو، لە ماددیاتیش غەیری زەرەر ئیستیفادەمان نەبوو. خسر الدنیا والاخرة ماینەوە.

٢٥٦/٣

## ئیجتیهاد بۆ لە عالەمی ئیسلامی قەتع بوو؟!

لە مەجەلەی میصریم دیت، بەرناردشۆ کاتبی شەهیری ئینگلیزی لە مەجمەعێ خوتبەیەکی داوە، بۆ شوببانی مەکاتیب، ئەز جوملە ئەڵێ: کە ئەچنە مەدارس ئاگاتان لە عەقڵی خۆتان بێ، چونکە ئەساتیذە سەعی ئەکەن، عەقڵی خۆتان لە سەرتان لابەن، عەقڵی خەڵکی لەناو دانێن.

حەققەن وایە خوێندەوار نابێتە ساحێبی عەقڵ و فکر و هۆشی خۆی، تابعی عەقڵ و فکر و هۆشی خەڵك ئەبێ. خاسەتەن مەلایێ کە مەیلی دڵی لەگەڵ بێ، هەرچی لەوی نەقل بکرێ، بیلا موحاکەمە قبوڵی ئەکا. ئیجتیهاد بۆچی لە عالەمی ئیسلامیەت قەتع بوو؟ هەر تائیفە قەولی ئیمامێکی قبوڵ کرد. ئەوەندەی موجتەهید سەعی لە کەلامی خواو پێغەمبەر ئەکرد، ئەوان سەعیان لە کەلامی ئیمامیان ئەکرد. تەعەصوب

(١) دەربڕینێکی تورکییە، واتە حکومەتی خاوەن شکۆمان.

کەوتە ناویان، ئەدیللەی شەرعییە ئیهمال کرا، ئیجتیهاد نەما. ناشکوری نەبێ، ئەمڕۆ لە زومرەی عولەما پیاوێکمان نییە بە پیاوان بچێ.

٢٦٣/٣

## گۆیا ئەوانە فەیلەسووفن!

دیتومانە ئینسانێ، جوانی ناسك، هێسك دەقیق، پێست ڕەقیق، پاش سی چل ساڵی دیومانەوە وەك ورچی لێهاتبوو. داروینی[1] ئەڵێن ئینسان لە زگی دایکا هەموو تەتەوراتی بەشەری بەسەر دادێ، تا ئەبێتە ئینسان. کەوابێ ئێمە موددەیێ لە ڕەحمی والیدەمان بووینە مەیموون!

مسوڵمانی ئێستا عەجایبن قسەیێ لە عالەمێ تەبیعی ئەورووپی ببێن، دەرحاڵ قبوڵی ئەکەن! ئەمما ئەگەر حوکمێ لەوە نێزیکتر لە ڕەسوولێ نەقل بکرێ بڕوا ناکەن! گۆیا ئەوانە فەیلەسووفن!

٢٧١/٣

## ئەمڕۆ نەجاتیان بدا سبەی ئەیانکاتە لوقمەی خۆی!

حەتتا لەو عەسرەش لە تەڕەف بەعزێ ڕجولی سیاسی ئەورووپی، زەهری مەرگ ئەچێژن، دەربەدەریان ئەکەن. ئەمما ئینگلیز خەریکە لە فەلەستین شتێکیان بۆ بکا، بەڵام ئەو سیاسییە مەککارە جێی ئەمنیەت نییە. ئەمڕۆ ئەگەر لە دەست عەرەبەکانیان نەجات دا، سبەی ئەیانکاتە لوقمەی خۆی.

---

(١) داروینی مەبەست پەیڕەوانی داروینە، داروین ناوی چارلز ڕۆبەرت داروینە، زانایەکی بواری مێژووی سرووشتی و جیۆلۆجی بوو، خەڵکی بەریتانیا بوو و لە ساڵی ١٨٠٩ لە ماڵباتێکی زانستپەروەری ئینگلیزی لەدایك بووە و لە ساڵی ١٨٨٢ کۆچی دوایی کردووە. ناوبراو دامەزرینەری تیۆری پەرەسەندنە و لەبواری زیندەزانی دا زانایەکی دیاری سەردەمی خۆی بووە. تیۆرەکەی بووە جێی ڕەخنەی زۆر لە زانایان و دواتر بە چەند لێکۆڵینەوەی جیاجیا بەرپەرچ درایەوە.

**تو از جەنگالی گورگم دەر بودی**
**چودیدم عاقبت گورگم تو بودی[1]**

۲۷۱/۳

## غەزەبی تەبیعەت یان خوا؟

ضەربەی ئیمتیحانی ئیلاهی بۆ هەموو قەومێ بووە، حەتتا بۆ ئێمەش لە جەنگیز تا ئینگلیز وا ئەبێ؟ مسوڵمانانیش خاسەتەن کورد ئینابە ناکەن! بەڵکو بە عمومی خراپتر ئەبن! هەر فسق و فجور و بێ ناموسی و بێ شەڕەفی هەیە لە ئەوروپاییان وەریئەگرن، ڕوو لە موحاسینان ناکەن! حەققەن ئەحوالی عالەم گەلێ گۆڕاوە. بایێ دێ شاران وێران ئەکا، چەند پاپۆڕێ بەحرێ پارچە پارچە ئەکا، تۆفانێ دێ دونیا کاول ئەکا، مەزروعات بە فەساد ئەبا، ئەڵێن ئەمە غەزەبی تەبیعەتە. کەس ناڵێ ئەمە لە تەڕەف خوایە با پەشیمان بینەوە. سەوادی ئەعزەم لە بەشەر ڕووی لە چاك نییە، ئەوەی زاهیرەن ڕووی لە چاکە بێ لە دڵدا شتێ ترە، غەرەزێکی خۆی هەیە.

۲۷۲/۳

## مەلا و مەتاعی دونیا!

مەتاعی دونیا چییە؟ بێ دەوامە دێ و دەڕوا، مەتاعێ نێزیك لەبەر دەست، تەبیعی بێ حورمەت، بێ ئەوەی ئەدنای ئەدونە بۆ ئەمە چاویان لە دەست خەڵکە، یا بە زەکات و سەدەقە لێیان وەرئەگرن، یا بە ڕشوەت بۆ حوکم گۆڕین، یا تەحریفی کیتاب. بەڵێ ئەهلی عیلم مونقەتیعن لە کەسابەت و معامەلە تاکو ببینە مەلایێ بیست و چوار عیلم، ئەبێ

---

(۱) ئەم بەیتە شیعرەی سەعدی بە هەڵە لە تەفسیرەکە نووسراوە، ڕاستییەکەی ئەمەی خوارەوەیە:

که از چنگال گرگم درربودی
چو دیدم عاقبت گرگم تو بودی

ئوممەت بەخێومان بکات. ئوممەتیش مەلایێ ساغ بێ نایانەوێ، ناعیلاج بە حیلە و دەسیسە و وریای و مەککارێ، خۆیان خۆشەویست ئەکەن. ئەوجا لەلای ئوممەت مەقبوول ئەبن، کۆنە عەبا و جلکی مردویانیان ئەدەنێ، بە ترش و گۆشت دەعوەتیان ئەکەن. وعلی الاکثر ئەمما ئەکثەری ساحیق (لایعد لا یحصی) مەلایەکانی ئیسلامی سەفەلیانن سەفەلەن، بێ عیزەتی نەفس، بێ دەمار و خوێنی پاکن، بالمرە دین لە دەستی ئەوانە ڕەزیل و بێ قەدر و قیمەت ئەبێ.

٢٧٣/٣

## مەلا و مەیلی منداڵی

ئەکثەری بەشەر لە ئوموری مەئلوفە غافلن، بە دیقەت تەماشای ناکەن، مع أنە ئایەتێ لە ئایاتی کەونییە، لە سەد هەزار موعجیزە و خاریقە ئەنفەعترە. هەر ئایەتە ئەبێتە میفتاح بۆ عیلمێ کە بەشەر ئیفتیخاری پێ بکا، لەسەر مەلەك، کافەی ئەنام ئیستیفادەی لێ بکەن. بەڵام مع الاسف مەیلی منداڵی خراپ وایە لە کۆڵ بەشەر بێتەوە. حەتتا گەلێ مەلای چاك لەسەر ئەو مەیلە ماون، ئەوانیش وەك عەوام کەیفیان بە شتی سەیرۆکە دێت.

٢٧٦/٣

## دیدارم لەگەڵ مەرحوم سلێمان نظیفی والی موصل!

بەعزە حەکیم هەیە ئەبێتە جەربەزە، زۆر بلێ، فێلکەر، حەییال، مەککار، خەدداع. وامەزانن هەر کەسێ پێیان گوت حەکیم، یان مەلایەك و نیهاد و حسن الخلقن! لە خزمەت مەرحوم سلێمان نظیفی والی موصل بەعزە صوحبەتمان بوو، فەرمووی: من کەسم نەدیوە لە ئەهلی عەمامە وەك تۆ موحیببی مەعاریف بێ.

عەرزم کرد: لەگەڵ ئەوەشدا من لە دژی مەعاریفی ئێوەم.

فەرمووی بۆ؟ وتم عیلم و مەعاریف لەسەر چی دابندرێ، قووەت ئەداتە وی، ئەوەی بەدنیهادە سەیئولخەلقە بە واسیتەی عیلم ئەتوانی بە

شەرارەی شەڕی خۆی زەربە لە خەڵك بدا، عالەمێ بە فەساد ببا. ئەوەی نیهادەکەی طینەتەکەی خاوێن بێ بە عیلم ئەتوانێ عالەمێ مونتەفیع بکا. بینائەن عەلەیهی ئێوە ئەوەلەن تەصفیەی ئەخلاق بکەن، ئەوجا عیلم و مەعاریفی لەسەر دانێن، تاکو ئوممەت و دەوڵەت ئیستیفادە لە ئەهلی عیلم و عیرفان بکەن.

نضیف بەگ تەصدیقی کردم و تەحسینی فکری فەرموو.

٢٧٩/٣

## ساڵی کلۆزەردە!

ساڵی کلۆزەردەی عەرزی کلۆیانم ئەکرد، ئێوە پێستی دارەکان مەخۆن، بە بەر و پەلك ئیکتیفا بکەن. تاکو ساڵی ئاتی بۆ نەسلتان بەر بداتەوە. ئێوە ئەوا پێستیان ئەخۆن، دارەکان هیشك ئەبن، ئەولادتان پەکیان ئەکەوێ! خێرا! بە کێ ئەڵێی؟ گوێیان نەدامی! لەوان تۆزێ ویجدان هەیە، لەمان هیچ! وەلەو بشزانێ عەمەل بۆ موستەقبەلی میللەتی خۆیان ناکەن، معامەلەیان معامەلەی غافلانە. ئەوانە حەز ناکەن قەومیان عاقڵ بین، تاکو بە هەوەسی خۆیان وەك کەر ئیستیخدامیان بکەن.

سبحان الله ئوممەتیش کەیفی لەگەڵ ئەوانە دێت، تەبیعیون بە قیوای ماددی غەلەبەیان کرد، ڕوئەسای ئەدیان، ئەلئانیش خەریکی خەرافاتن. ئەگەر ئەوانە بۆ جەهەننەم خەلق نەکرابن بۆ وان؟ ئەو مەشاعیرو مەداریکی خودا دایتیە ئەفلاتوون[1] و ئەرستۆ[2] و ئەدیسۆن[1] و

---

(١) ئەفلاتوون یان بە لاتینی plato ناوی ئەرستوکلیس کوڕی ئەرستونە، فەیلەسووفێکی کلاسیکی یۆنانە، هەروەها ماتماتیك زانیش بووە، دامەزرێنەری ئەکادیمیای ئەسینایە و کە یەکەم پەیمانگای باڵا بووە لە جیهانی ڕۆژئاوادا، مامۆستاکەی سوقرات و خوێندکارەکەشی ئەرستۆ بووە. لە ساڵی ٣٤٧ پ.ز کۆچی دوایی کردووە.

(٢) ئەرستۆ یان ئەرستۆتالیس یان ئەرستاتالیس (٣٨٤-٣٢٢ پ.ز)، فەیلەسووفێکی گریکی بووە و قوتابی ئەفلاتوون و مامۆستای ئەسکەندەری گەورە بووە. بە یەکێك لە بیرمەندان دادەنرێ و نووسراوەکانی لەبارەی فیزیا و میتافیزیك و شیعر و شانۆ و ←

ئەنیشتاین[٢]، دایتیە ئێمەش، فەرق بە چییە؟ بە ئیستیعماله، بە حیرفە، لما خلق لە، وە کەس ڕێی فکر و نەزەڕ و سەعی و عەمەلی لە کەس نەگرتووە. بە زەجر و نوصەح و جەزا و زەڕبەی تەئدیبی و حەیا و ویقار، ڕێی سەیئات، نەوعەن ما سەدد و بەند کراوە. کەسێ تەرکی چاکە بکا و ڕووی لە خراپە بکا، چ عوزر و بەهانەی نییە. وەکی سەعدی ئەفەرموێ:

کسانی کی بدرا پسند دید اند
ندانم زونیکی چ بد دیده اند[٣]

گەلێ جار لە وەعز عەرزی برادەران ئەکەم: وەرن بە تەجرەبە دوو ساڵان چاك بین بە ڕێکی و نێکی و پێکی بۆ مەصالیحی عامە تێکۆشین. ئەگەر تەرەقیمان کرد و حاڵمان خۆشتر حەیاتی ئیجتماعیمان بەلەزەت — فیها ونعمة- وە ئیللا ڕوو ئەکەینەوە خراپەی خۆمان، بە دوو ساڵ چاکی خراپیمان لە کیس ناچێ.

٢٨١/٣

---

مۆسیقا و لۆجیك و ڕەوانبێژی و زمانناسی و سیاسەت و ئەخلاق و زیندەزانین، هەروەها یەکێکیشە لە دامەزرێنەرانی فەلسەفەی ڕۆژئاوا.

(١) تۆماس ئەلفا ئەدیسۆن (١٨٤٧-١٩٣١ز) داهێنەرێکی ئەمریکایی بوو، گەلێك ئامێری دروستکردن، وەك گڵۆپی کارەبایی و نوێکردنەوەی ئامێری فۆتۆگراف و ئامێری وێنەگرتنی سینەمایی. بە چوارەم داهێنەر دادەنرێت لە مێژوودا. هەروەها سیستەمی بەرهەمهێنانی هێزی کارەبای دانا و دابەشی کردە سەر شوێن و کارگەکان، یەکەم وێستگەی بەرهەمهێنانی وزەش لە شاری مانهاتنی نیویۆرك بوو.

(٢) ئەلبرت ئەنیشتاین (١٨٧٩-١٩٥٥ز) زانایەکی ئەلمانی بورای فیزیا بوو، ڕەگەزنامەی سویسری و ئەمریکی هەبوو، دایبابی جوولەکە بوون، بە باوکی تیۆری تایبەتی و گشتی نسبییەت دادەنرێ، لە ساڵی ١٩٢١ خەڵاتی نۆبڵی لە بواری فیزیا وەرگرت.

(٣) ئەم بەیتە بە هەڵە لە تەفسیرەکە نووسراوە و ڕاستییەکەی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

کسانی که بد را پسندیده اند / ز نیکی ندانم چه بد دیده اند

## وەلی لەسەر بەحر ئەڕوا!

وەلیێ کە سیرڕی قەدەری بۆ هەڵماڵدرابوو، ئێوارەیێ لە ماڵێ میوان ئەبێ، ماڵەکە لە کەناری بەحر ئەبێ. پاش نان خواردن و نوێژی عیشا وەلیی موحتەڕەم بۆی کەشف ئەبێ، کە لەگەڵ ژنی خانەخوێی جەمع بێ- بەڵێ قەدەر وایە واجب الاطاعەیە- شەو بە لای ژنەکەوە ئەچێ، مێردەکەی لە خەوا ئەبێ. ژنەکە وا ئەزانێ ئەو زاتە مێردەکەیەتی بۆی ڕام ئەبێ کاری خۆی ئەکا. سبەینێ ئافرەتەکە لەسەر ئاو دێتەوە پرچ و مرچی تەڕ ئەبێ، مێردەکەی سوئالی لێ ئەکا. ئەڵێ ئەدی کارێ وامان نەکرد؟

ئەڵێ ناوەڵلا!

موحەققەق ئەوە ئیشی میوانەکە بووە. دوای ئەکەوێ، ئەبینێ ئەوا بەسەر بەحرا ئەڕوا، کابرا هاوار ئەکا ئەوە چی؟ ئەمە چی؟

وەلی ئەڵێ هذا بقضاء الله، وهذا بقدر الله. تەماشای کەشفیان کەن و گوناهیان چونکی لەسەر کەشفی قەدەرە، پێی موئاخەذە نابن، تەئسیری سووئیان تێناکا، بەڵکو زێدە مەئجوور ئەبن. خۆیان سوئال ئەکەن هەموو مسوڵمان ئەزانن ئەوەی ببێ، بە قەزار و قەدەری خوایە، بۆ گوناه تەئسیریان تێ ئەکان و پێ موئاخەذە ئەبن؟ جواب ئەدەنەوە، چونکی ئەو ئیمانە لە دەلیل و نەظەر و بورهانە، لە کەشف و عەیان نییە، بەڵێ عیلمی کەشف خۆیەتی! عیلمی نەظەری چ نییە! ئەوە خۆیەتی! وە مسوڵمانان بە تەواوی ملیان بۆ ڕائەکێشن بەو جۆرە کەشفییاتە ڕاضین- نعوذ بالله من الخذلان والعار- کشاف الغیوبەکان ئەرزی سمسمە کەشف ئەکەن، ئەرزێ وەکی ئەرزی ئێمە لەناو قەپێلکە کونجیدا دەبینن، خەریتەی جابولقا و جابرسامان بۆ ئەکێشن. تەبیعیوونەکان بێ ئیددیعای عیلمی غەیب و کەشفی سرڕی قەدەر، تەییارە دروست ئەکەن، ڕادیۆ بەدەرئەخەن، قیتعەی ئەمریکا بەدەرئەخەن، بە ئەشیعەی ڕونتکین دەروونی ئینسان تەماشا ئەکەن، ئەمراضی دەروونی پێ دەرئەخەن، بە

کەهرەبا شەو ئەکەنە ڕۆژ. هەزار ئیختیراعاتی وا ئەکەن بە خەیاڵی باوك و دایکی کشاف الغیبوەکانی ئێمەدا نەهاتووە. ئەگەر کەشفیان ڕاستبا ئەبایە شتێ وا دروست کەن کەڵکی ئوممەت بگرێ، عیززی دین و دونیای پێ مەحفووز بێ. خۆزیا یەکێ لەوانە کە ئەوەی لە (لوح المحفوظ) دا نووسراوە ئەیخوێنێتەوە، تەماشای لەوحەی (گرامەفون)ی کردبا ئەو حروفاتی بە نووکی دەرزیلە- علی وجه الطبیعە- تیای نووسراوە چۆنی ئەخوێنێتەوە؟ بەڵێ شتێ کە لە پەردەی غەیبدا بێ هەزار هەزار درۆ و دەلەسە هەڵئەگرێ! ئیتر ئەوەندە بەسیە بۆ جەهالەتی ئوممەت!

بۆچی تەماشای قورئان، مەلەکووتی ئەرز و ئاسمان، موهیمماتی ئەکوان، ئاثاری تەبیعەت و عولەمای تەبیعەت ناکەن؟ لە عالەمی شەهادەت مەحرووم بوون، نەگەیشتن بە عالەمی غەیب، دوای خەیالات کەوتن، تاکوو لە پورووو کەوتن، تا ئەوان لە مەساحەی ئەرزی سمسمی بوونەوە، ئەجانیب لە سایەی عیلمی تەبیعەت و کیمیا و هەندەسە ئیستیلایان کرد، ئەم ئەرزە واسیعە لە ئێمە بووە قەپێلکە کونجی.

٢٩١/٣

## موەحییدەکان دەبێ عەزیزولنەفس بن!

کەسێ مووەحید بێ، ئەبێ زۆر بەرزو عەزیزولنەفس بێ، غەیری خوداوەندی ئەنام کەس لە ژووری خۆی نەبینێ کە بیپەرستێ. لەو مەقامە خۆی لە ڕیژەی جبریل و سید الکونین حیساب بکا. حەققەن شیرك بە هەموو صورەتێ بێ، زیللەتە، دەنائەتە، خوارییە:

لەبەر دەستی کەسێ گەر ڕائەوەستێ
ئەوەش ڕەسمێکە لە ڕەسمی بوتپەرستی

٢٩٨/٣

## بە دەنگی ناخۆشی موسوڵمان بوو!

شەخسێ لە عولەمای نەصارا، لەگەڵ عەلـلامەی قۆشـەجی مـوددەیێ مونـازەڕەی کـرد، سـبەینێ چـووە لای مەلا عەلـی قۆشـەجی[1]، دیتـی قورئانی ئەخوێند، مەلاش دەنگی زۆر ناخۆش بوو- عالیمەکەی مەسیحی گـوێی لـێ ڕاگـرت، کە مەلا لەخۆبـۆوە، عـالیمەکەی مەسـیحی گـوتی مسوڵمان ئەبم، اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله.

مەلا فەرمـووی عەجایـب؟ چەنـد ڕۆژە مونـازەڕە ئەکەی مـولزەم نەبووی ئێستا چۆن مسوڵمان بووی؟

گوتی مەلا بەو دەنگی ناخۆش قورئانت ئەخوێند تەئسیرێکی غەریبی لێکـردم، زانانـدم ئەوە مەحـض لە تەڕەف خـوایە، ئیمـانم هێنـا. کەسـێ گوێی لەو ئـایەتە ڕاگـرێ (وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ)، وە مەقامی بزانێ، ئەزانـێ ئێـرە جێـی قیرائەتـی نـوێژو ئیمـام و مەئمـومی و جـومعە و خـوتبە نیـیە. تەفسـیلاتی ئەو ئەحکـامە ئەبـێ لە ساحێبی شەریعەت وەرگیرێ.

٣٠٠/٣

---

(١) ناوی عەلائەدین عەلی کوڕی محەمەد ئەلقۆشـەجی سـەمەرقەندیی (؟-١٤٧٤ز)یە، فەلەکنـاس و ماتمـاتیکزان و شـەرعزانێکی حەنەفـی بـووە، لە بنەڕەتـدا خەڵکـی سەمەرقەند بووە. بە عەلی کوشجۆش ناسراوە. بە داوەتێکی ڕەسـمی لەلایەن سـوڵتان مـحەمەدی فـاتح دەچێـتە ئەسـتەنبوڵ و لە مزگەوتـی ئایاصـوفیا دەبێـتە وانەبێـژ. لە داهێنانەکانی وێـنەی مانـگ، پێـوەری هێڵـی پـانی ئەسـتەنبوڵ و دروسـتکردنی چەنـد سعاتێك. ناوبراو چەند بەرهەمێکی گرنگی لەبواری فەلەك و ماتماتیك لەدوای خۆی جێهێشتووە.

## ئەوانە حاشا ئوممەتی پێغەمبەر نین، ئوممەتی ئەشعەرین!

دەفعەیێ وتم: سبەینان کە ئینسان هەستا لە خەو، بەدەنی گرانبوو، نەیدەتوانی هەستێ بۆ نوێژ، مولاحەزەی قووەتی ئیمان و گرانی خەو بکا، ئەگەر قووەتی ئیمان زیاد بێ، گرانی خەو لائەدا. بە ڕەحمەتی خوا شاد بێ مەلا عیززەتی ئامۆزام ئەیگوت: هەموو سبەینان کە هەڵدەستم کە مولاحەزەی ئەو قسەی تۆ ئەکەم، لەسەر بەدەن گرانی خۆم، بە سووکی هەڵدەستم بۆ نوێژ ئەچم.

عەمەل گەرچی داخیلی حەقیقەتی ئیمان نییە. ئەمما لازمیەتی. کەسێ بڵێ ئیمانم بە خوا هەیە، چۆن ئەبێ سوێندی بە درۆ بە زات و سیفاتی خوا بخوا؟ بە سەری ئاغای بە گۆڕی شێخی، نەتوانی بە درۆ سوێند بخوا! کاکی ئەشعەری چی ئەفەرموێ؟ قوربان لە میصر تا کۆیە دونیا ماله ماڵ لەو نەوعە ئیماندارانە. ئەوانە حاشا ئوممەتی پێغەمبەر نین، ئوممەتی ئەشعەرین، موئمین، موئمینێ بە گوللەی تفەنگ بکوژێ، بڵێ کەیفم لە لینگە فرتەنەی دێ، ئەبێ ئەوە چ ئیمانێك بێ؟

شیددەت و زەعفی ئیمان حەق نییە ئینکار بکرێ، مەنبەعی ئیمان دڵە. دڵ کە لە ئیمان پڕ بوو، لەسەر هەموو ئەعزای غەلەبە ئەکا. تەفاوتی ئیمان بە ئایات و ئەحادیس و ئاسار و ویجدانەن سابیتە. هەرچەن ئەفرادی ئینسان کە شەریکن لە ماهیەتی ئینسانی، ئەمما تەفاوتیان زۆرە لە لەوازیم و مەئاثیری ئینسانی.

٣٠٥/٣

## مەلا بە نووکی قەڵەم ئەرز و ئاسمان تێك ئەدا، بەڵام ئیدارەی دوو پیرێژنی پێناکرێ!

ئەوانەی شەڕیان نەدیبێ، هەرچەند بە شوجاعەتیش بن، کە واقیعەیان دیت، ترس و دەهشەت غەلەبەیان لێ ئەکا. گەلێ سەر سپی و شێخ چوونە پێش ڕووس، لە جیهەتی ڕەواندز، هەر چەندە بوو تەقەی تۆپیان گوێ لێبوو، شرقەی دانا لە حینی تەقینەوە، ئیتر هەڵێ پەنا بەخوا.

مامۆستا هەڵمەیێ چ نییە تۆ دەڵێی ئەجەل یەکە و دوو نییە، ئەگەر ئەجەلت نەهاتبێ قەیدی ناکا. نەخێر چ گوێی ئەداتێ چارەسەرە.

خاسەتەن بۆ حەربی ئەیامی ئێمە، ئالات و ئەدەواتی حەدیثە و مەهارەتی ئیستیعمالی، موقابەلەی شەست تیر بە تفەنگە شینکە ناکرێ! حوشتر و سەییارە وە بارگیر و تەیارەیان نەگۆتیە! شیر و تیر و گورز و گۆپاڵ کەڵك ناگرێ. ئەمرۆ دوعا بەکارنایێ، خوا، خۆت، عیلمی حەرب، قائیدی چاك بە دیققەتێ تەواو ئیدارەی عەسکەر بکا. ئەوەی بە تەمای مەلائیکەت بێ قوڕبەسەر و ماڵ وێران ئەبێ.

بەڵێ حەرب قووەتی ئەوێ، حیکمەتی ئەوێ، تەرتیبی ئەوێ، هەر کەس مەوقیعی خۆی بدرێتێ بە گوێرەی لیاقەت کاری پێ بسپێردرێ. کەسێ ناشێ بکرێتە بینباشی[1] بە هەزاران سەر بێ کڵاو ئەبێ. مەلا ئەتوانێ بە نووکی قەلەم ئەرز و ئاسمان تێك دا، کوللی ئانێ ئەو عالەمە عەزیمە بباتە فەنا. عالەمێ میسلی ئەو عالەمە بێنێتە وجود، ئەمما ئیدارەی دوو پیرێژنی پێ ناکرێ.

٣١٠/٣

(١) بینباش: ئەفسەرێکە سەرپەرشتی هەزار سەرباز دەکات.

## ئینسان لە مەلەك چاکترە!

گەلێ جارم گوتیە ئینسانی تێگەیشتوو و چاك لە هەموو شت حەتتا لە مەلەك چاکترە. ئەوانە نەفعی مەحزن، خێری موجەڕەدن. ئینسانی کەری بەدڕەوشت لە هەموو شت خراپترە، حەتتا لە شەیتان. ئەوانە زەرەری مەحزن، شەڕی موجەڕەدن. خوا ئەزانێ ئەمڕۆ بەناو مسوڵمان هەن، بۆ مسوڵمانان لە کافری حەربی بەدترن، تەنها ناوەکەی هەیە مسوڵمانە، ئەوەی تاعەت و عیبادەت بی نییەتی. ئەوەی گوناھ و عیسیان بێ ئەیکا، باوەڕ ناکەم هیچ کافری بەد سیەر لەناو قەومی خۆی وا خراپ بێ، کەس خێری لێ نابینی- وەك مەسیحیان کەفارەتی زنوبیشی نییە-.

٣١٧/٣

## تەرکی قەواعید، دوای شاز ئەکەوین!

سبحان الله ئێمە بە منداڵی تەصریفی زنجانی ئەخوێنین، پێمان ئەڵێن: أبی یأبی شاذە، شاذ خەرمی قاعیدە ناکا، لەوە بە منداڵی تێی ناگەین، ناشکوری نەبێ بە گەورەیش تێی ناگەین! لای خۆمان مەلایین! تەرکی هەموو قەواعید ئەکەین، دوای شواذ ئەکەوین، بۆ هەموو شتێ دین و دونیای ئیعتیماد ئەدەینە سەر کەرامەت، مع الاسف بێ کەشف و کەرامەت ماین!

٣١٩/٣

## شێخۆکە و شەیتانۆکە!

تا ئێستا چابوو هەر نەیسە[1] خوا حائیل بوو ڕووێکمان لە خوا بوو، وەلەو من زۆر لە مەسئولییەتی ڕۆژی جەزا ئەترسم. ئومێدی نەجات بوو، ئێستا شێخۆکە و شەیتانۆکە جنۆکە بووینە حائیل لە بەینی ئێمە و خوا و ئێمە و دڵ. ئەوە زۆر پیسە موجیبی مەترووودی دونیا و ئاخیرەتە.
٣٢٠/٣

## ڕابردوو لەبیر مەکەن!

لە زەمانی غەلەبە و قووەت زۆریش، ئەو حالی ماضی لە فکر مەکەن، دائیما یادی بکەن. ئینسانێ ئینسان بێ بەدئەصل و بەد نیهاد نەبێ، ئەیامی فەقر و فاقەو زیللەت و مەسکەنەتی لە فیکر ناچێ، تاکو لە حیفزی حال و ئیستیقبال غافڵ نەبێ، لە قەحط و غەلای سەنەی ١٣٣٦ی هیجری گەلێ کەس سواڵیان ئەکرد لەبەر دەرکان ئەخولانەوە گوێچکە نانێکیان دابانێ هەزار دوعایان ئەکرد، بە سەد حاڵ تا قورتار بوون. دوایێ دیتمانەوە ئەو ڕابردووانەیان لە فکر نەمابوو، دەعیەو فیزێکی تر شیوی ساواریان نەدەخوارد، کەی ئەو پیاوانە سواڵیان کردووە، بۆ چینکە نانێ گەڕاون؟

ئومەمی ئیسلامییە خاسەتەن قەومی کورد لەبەر بێ تەزەککوری ماضی، لە سەعادەتی ئیستیقبال مەحروون بووین.
٣٢٢/٣

---

(١) هەر نەیسە، نەیسە پەیڤێکی تورکییە واتە بە هەر حاڵ.

## تەقوا!

لە هەر کار و سنعەتێ هەبێ، ئەگەر ئینسان تیایا نەبێ بە ساحێبی فکر و بەسیرەت، تەرەققی ناکا، ناقیس ئەمێنێ. حەتتا مەلا ئەگەر چاوی لە نووسراوە بێ، خۆی نەبێتە ساحێبی قووەی نەزەری و ئیستینباتی. لە زۆر جێ دادەمێنێ، لەسەر دەرس فەقێ سوئالێکی لێبکا، ئەگەر لە قوونە قەیدی حاشیەدا نەیبینێ، ناتوانێ لە بەسیرەتی خۆی جوابی داتەوە. بۆیە موقەللید هەرچەند زۆر مەلا بێ، ئەنواعی عولوم بزانێ، ناگا بە فەقیهـ ئەگەر هەموو شت لە تەرەف خوا بە مسوڵمانان بگوترێ، وەك جولەکەکان بێ بەسیرەت و فکر ئەبن. جەنابی حەق[1] قاعیدە بۆ مسوڵمانان دائەنێ، بە واسیتەی وی بەیانکا، بە ئەهلی فکر و نەزەری صائیب بە حەقایق و دەقایقی ئوموور بگەن. ئەو ئوموورە چ دینی، چ دنیەوی، چ عیلمی، چ عەمەلی، چ حەربی چ سیلمی، چ فەردی، چ ئیجتماعی، ئەوەش چییە؟ تەقوایە! خۆپاراستنە لە مەیلی فەساد!

٣٢٤/٣

## بێ دینی ئێمە بۆ ئەوان باشە!

سەوادی ئەعزەم مەیلی لادینی ئەکەن، تا مەعاریف زیاد ئەکا، دین کەم ئەکا! پیرەژنێ جوولەکە دە هەزار لیرە ئەدا بۆ بینای مەکتەبێ، یەك شەخس چارسەد هەزار لیرە ئەدا مەوقیعێ دروست ئەکا بۆ لاوانی مەسیحی. ئەوان ئەزانن بێ دینی ئێمە بۆ ئەوان باشە! أما في الحقيقة بێ دینی بۆ مسوڵمانان خراپە!

دینی ئیسلام جەیاتی حەقیقییە بۆ هەیکەلی ئیجتماعی، بەو شەرتە دینە بەڕاستییەکەی کە پێغەمبەر و یارانی نێزیکی لەسەری بووین، بکرێ!

(١) جەنابی حەق مەبەست لێی خودایە.

دینی خەفیف و نەشاط و عەمەلە! عەمەلی چاك و بگونجێ، بۆ صەلاحی دونیا و قیامەت! دینێ بێ بوغز و قین و حیقد و حەسەد و غەش و خیانەتە! دینی حوبب و وەلا و تەفرەقەیە!

٣٣٠/٣

## سەردابی سامەڕا و مەهدی!

ئەمڕۆ ناشکوری نەبێ کوا غەنیمەت؟ هەر سەر و ماڵ و مولکی مسوڵمانانە بە تاڵان ئەڕوا! ئەوە سەیرە ئیمامییە ئەیکەن بە شەش تەقسیم، سەهمی خواو سەهمی پێغەمبەر و سەهمی زەویلقوربا، ئەدرێتە ئیمامی قائیمقامی ڕەسوول! سێیەکەی تریش بۆ ئەیتام و مەساکین و ئیبنی سەبیل و ئالی موحەممەد! (بناء علی هذا) سێ سەهمی ئیمام پاش غەیبەتی ئیمامی دوازدەمین وەك سەییدی ئالووسی ئەفەرموێ ئەبێ لە سەردابی سامەڕا دابندرێ، تا تەشریفی موشەڕڕەفی لە بیر دێتە دەر!
ئەگەر وایان کردبێ ئیمامی مونتەزەڕ ماڵی بۆ کۆبۆتەوە ئەتوانێ حەڕبی پێ لەگەڵ ئەوروپا بکا! وابزانم جەعفەرییە غەنیمەت عام ئەکەن، هەرچی بەدەست کەوێ، بە حەڕب یا بە کەسابەت، ئەو خوموسە[1] ئەدرێ بە وەکیلی ئیمامی غائیبی مونتەزەڕ (عجل الله فرجه).

٥/٤

## هەزاری بۆ ئێمە چوار هەزاریش ببە بۆ حەج!

ئەو ساڵەی لە بەغدا بووم (١٩٢٣)ی میلادی، شەخسێ حاجی عەلی ناو، لە ئەبنای جەعفەری ئەیگوت پار چوومە لای موجتەهید، ڕوخسەتم لێخواست بۆ حەج، وتی چەند ئەبەی بۆ مەسرەف؟

وتم پێنج هەزار ڕوپیە.

وتی: هەزاری بۆ ئێمە چوار هەزاریش ببە بۆ حەج.

---

(١) خوموس: پێنج یەك

لە نەشئەی قسەیدا بە دەرئەکەوت ئومێدی قیامەتی بە هەزار ڕوپیەکە زیاتر بوو لە چوار هەزارەکە! تەئویلی غەنیمەت لە ئیبن عەبباس نەقل ئەکەن، حەتتا ئیمامی عومەر پێی ئەفەرموو ئەگەر لەبەر ئەو تەئویلە نەبایە ئەمکردی بە والی.

هەزار هەزار ڕیزوانی خوا لە ئیمامی عومەر چەند زانا و تێگەیشتوو بووە! لە سایەی ئیبن عەبباس عولەمای جەعفەری شاهانە ئەژین! مەلای سوننی علی الاکثر ئەوا لە برسان ئەناڵێن.

٦/٤

## شێخ نیعمە و مەلا محەممەدی دێرەبڕووشە!

حیکایەتێکم بیست لە عالیمێ شەهیر سەماحەت مەئاب مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی هەولێری –خودا دەوامی بدا- ئەیفەرموو: شێخ نیعمە مەلایێ بوو لە خانەدانی شێخ قادری سنەیی، شاریحی تەهذیب، معاشێکیان بۆ تەخصیص کردبوو، معاشەکەی حەواڵەی سندووقی هەولێر کرابوو. ڕۆژێ لەگەڵ جەمعێ لام بوون، یەکێ لەوان مەلا محەممەدی دێرەبڕووشە بوو، لەو ئەسنایەدا قسە لە مەسئەلەیێ شەرع کرا، ئیجابی کرد کتێبیان هێنا، شێخ نیعمە بە مەلای دێرەبڕووشەی وت:

تۆ فەهرەستی جێگایەکە بدۆزەوە، ئەمما بیدەرە من بیخوێنمەوە.

مەلای دێرەبڕووشە لە شەرع زۆر شارەزا بوو، ئەمما قووەی عیلمی نەبوو، ئەغلەب عیبارەتی ناموافق ئەخوێندەوە، تەبیعی ئەو قسە لە دڵی دێرەبڕووشەیی گران هات! دوایێ بالمناسبە عەرزی شێخی کرد معاشەکەت چەندە؟

وتی سێ سەد قرووشە.

مەلا وتی سبحان الله ڕۆژێ جەننەت مەکانی سوڵتان عەبدولعەزیز خانی عوسمانی بێ لەناو کشتوکێڵ چاوی بە کەرێ گرێ و بریندار ئەکەوێ، ئەڵێ ئەوە چییە؟

عەرزی ئەکەن ئەوە کەرە کەلکی لێ بڕاوە، ساحێبی بەرەڵڵای کردیە.

سوڵتان زگی پێ ئەسووتێ. ئەمر ئەکا سێ سەد قرووش معاشی بۆ

ئەبڕێتەوە، تا ئەمرێ پێـی بەخێـو کەن! پاشـان مەلایەکـانی ئیسـلام بە دڵ دوعایـان ئەکـرد کەرەکە بمـرێ بەڵکـو معاشـەکەی بەسـەر معاشـی مەلایەکان دارەبەش کرێ!

فەرمووی: شێخ نیعمە بە مەخجوولی تەشریفی هەستا ڕۆیی.

ئیتر بزانن حاڵی مەلایانی سوننی چۆنە! ئەوێ ڕۆژێ وابوو ئەمڕۆ ئەبێ کوو بێ!؟

٦/٤

## لە زەمانێ بێدەسەڵاتی دوعا قبووڵ ئەبێ!

ئەبـێ ئینسـان تەماشـای موعـامەلەی جەنـابی حەق کـا، کـاری خـوا دەربارەی عیباد بەڵکو حەیوانات بە وەقتی زوعـف و قـووەت ئەگـۆڕێ. ڕۆژێ بە تەیـرۆکە (طَيْرًا أَبَابِيلَ) موحـافەزەی بەیتـی ئەکـرد. ڕۆژێ بە مەنجەنیق دیواری بەیتیان ئەڕوخاند، بە جـواب نەدەهـات! لە ڕۆژی بەدر ئەوەی کردی کردی، لە حەڕبی ئوحود وانەبوو!

ئەوێ ڕۆژێ مسوڵمانان بە قـووەت بـوون! لە زەمـانێ بـێ دەسـەڵاتی دوعا قبوڵ ئەبێ، پاش ئەوەی مسـوڵمان لە سـێ سـەد ملیـۆن تەجاوزیـان کرد، خوا بە دوعا ئیشیان بۆ ناکا! مریشـك و سـائیری تەیـری تـر چـۆن موسەخخەر ئەکا بۆ بەخێوکردنی فەرخەیان، کە پەرەوازە بوون چـۆن لە خۆیـان ئەکەنەوە؟ فەرخەی ئینسـان بە دوو سـاڵ بەسـەر پـێ ئەکەوێ، فەرخەی چار پایان بە چارەگێك! ئەو مـوعینی هەیە، ئەم نـا! ئیتـر واجـبە ئینسان مولاحەزە کار بێ! خوا نەکاتە حائیل لە بەینی خۆ و قەلبی.

٨/٤

## فسۆس پاڵەوان!

گەلـێ کەس بە لاف و گەزاف و ئەشـتولوم خـۆی بە ڕۆسـتەمی داستان ئەنوێنێ، ئەمما لە هەنگامی موصادەمە لە فسۆس پـاڵەوان پـووچتر دەردەچێ!

٩/٤

## درۆزن خەونیشی درۆیە!

دیومە ئینسانی عادی خەونی دیوە بۆمی گێڕایەتەوە تەبقەن دەرچووە! بڵێ ئینسانی درۆزن خەونیشی درۆیە! شێخ ئەبو عەلی ئەفەرموێ: عەهـدم کردیە بە خەیاڵیش درۆ نەکەم، تاکو خەونیشم ڕاست بێ!

دەك بەڵا لە درۆیان دا، خەون و یەقزەت تێك ئەدا! ١٠/٤

## حەربی چەنە قەلعە[1]!

شەخسێ کۆیی لە حەربـی چەنـا قەلـعەی هـاتەوە، بـاس و خـواسـی حەربی ئەگێـڕاوە، وتـی: جـارێ قومانـدانی ئـێمە ئەمـری کـرد بچـن بـۆ مەوقیعێ گردەڵۆکەیێ بووە، ئێمە چووین نێزیك بوو بیگەینێ، غایەت بە شـیددەت ئەمـری ڕەجعەتـی دا. گەڕایـنەوە چەنـد ختـوەیێ پـاش چەنـد ختـوەیێ مەوقـیعەکە شـەق بـوو، ئەگەر ئـێمە لەسـەری بـاین، هەلا هەلا ئەبـووین. تـو مەزانە دوشـمن لـوغمی لـێ دانـابوو، بە بـاروود و سـاچمە ئاخین بووین، کە ئێمە نێزیکی بووینەوە، ئـاگری دا، قومانـدان حیسـی ئەکا، ئەمری ڕەجعەت ئەدا.

١١/٤

## مسوڵمان چەن بێ گوێ بوون و چیان بەسەر هات!؟

سبحان الله مسـوڵمان چەن بـێ گـوێ بـوون و چیـان بەسـەر هـات! حالاش لە مونازەعەیان دانەناوە! حەتتـا لەو دوو سـێ سـاڵانە حکـومەتی

---

(١) شەڕێکی گەورە بووە، بەریتانییەکـان بە هاوکـاری وڵاتـانی هاوپەیمـان بە نیـازی گرتنی ئیستەنبوڵ لە ساڵی ١٩١٥ز هێرشێکی گەورەیان هێنا سەر دەوڵەتی عوسمانی و لەو هێرشـەدا زیـاتر لە ٥٥ هەزار لە سـەربازانی هاوپەیمـان کـوژران و بە سـەدان هەزاریش لە هەردوو لا بریندار بوون.

مەراکیش لەبەر مونازەعەی خۆ بە خۆیی، کەوتە ژێر حیمایەی فەڕەنسا، ئیستیقلالیەتیان نەما!

١١/٤

## لەبەر ڕەقابەتی خۆیان نەبا، بستە عاردێ بە دەست مسوڵمانانەوە نەدەما!

مع الاسف مسوڵمانان گەلێ لە ئوممەمی دی خراپتر بوون، نەك لە حەق دوشمنی دین، لە حەق خۆشیان! تاکو هەموویان ماڵیان وێران بوو. پاش وەقەعەی جەنگیز[1] و هۆلاکۆ[2] لە سایەی دەوڵەتی عوسمانی، مسوڵمان زیندوو بوونەوە، ئەوروپایان لەرزاند. گەلێ دوەلی ئیسلامیو مەسیحیان تێکدا، مولکیان زۆر واسیع کرد. ئاخیری لەبەر تەمەعی ئیستیلا و بێ سیاسەتی مەلایان لەگەڵ دەوڵەتی ئێران بەگژ یەکا چوون. حەڕب درێژەی دایێ، بەینە بەینە صولحیان ئەبوو، زوو بە زوو تێك ئەچوونەوە، شەڕیان ئەکردەوە! تاکو تەڕەفەین بێ هێز بوون. دەوڵەتی عوسمانی ئاگای لە ئەوروپای نەما، ئەوروپا خۆی خڕ کردەوە، مەحکەم بوو، عاقیبەت ئاسیایان ئیستیلا کرد! لەبەر ڕەقابەتی خۆیان نەبا، بستە عاردێ بە دەست مسوڵمانانەوە نەدەما!

١٢/٤

## شەیتان عاجز و مەخجوول و مەلوولە!

ئەمن ناڵێم شەیتان کوژراوە، ئەمما لەم عەسرە، لە چەنگ جەهەلی

---

(١) جەنگیز خان (١١٦٥-١٢٢٧ز)، دامەزرێنەر و ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەتی مەغۆلیە، کە بە مەزنترین ئیمپراتۆریەت لە مێژوو دادەنرێ، کەسێکی خوێنڕێژ بووە و زۆر خەڵکی مسوڵمانی کوشتووە و تاوانی مەزنی بەرامبەر کردوون.

(٢) هۆلاکۆ خان کوڕی ئیمپراتۆر تۆلۆی کوڕی ئیمپراتۆر جەنگیز خانە (١٢١٧-١٢٦٥ز) فەرمانڕەوایەکی مەنغۆلی بووە و زۆربەی زۆری وڵاتانی باشووری ڕۆژئاوای ئاسیای داگیرکردووە، لە ساڵی ١٢٥٨ بەغدای داگیر کردووە.

تەریقەت و مەهەرەی سیاسەت، مەرگـی خـۆی بە ئـاوات ئەخـوازێ. لە سـەفالەت و سـەفاهەتی ئەوان مەخجـووله، لە مەکـر و کەیـدی ئەمـان مەلووله، عاجزە، نایانگاتێ. وەك کوردی ئەڵێ: سەد فرتی بە فرتێکمان.

ڕەنگە ئینسانێ وەك مۆسۆلینی کە ببینێ هەزار چەمەلۆك لە خۆی بکا و بڵێ: دەك عەمرت نەمێنێ لای خۆت تۆش ئیبلیسی!

/٤
١٥

## ئەو زوڵمی ئێستا ئەکرێ لە ئەییامی فەراعینان نەبووە!

ئیلاهی بە فەریادی مەزڵومان بگەی! زەڕبەیێ لەم عاصیانەی ئەییامی ئێمە بدەی! مەزڵووم و زاڵم هەر یەك بە حەقی خۆیان بگەن! (وَكُلٌّ كَانُوا ظَالِمِينَ ) باریا! ئیلاها! خۆت ئەزانی ئەو زوڵمی ئێستا ئەکـرێ لە ئەییـامی فەراعینان نەبووە! فەللاحی بێ دەسەڵات بە سەد خوێنی جگەر دەغـڵ و دانـی خـۆی بەنـاو دێنـی ئەیکـا بە خەرمـان، کەسـێ لە کـافر خراپتـر کبریتێکی لێ دەدا ئەیسـووتێنێ، مـاڵی هەزار کەس وێـران ئەکـا! چەنـد ساڵە ئەو حاڵە دەوام ئەکا! ڕەببی! ئیلاهی! ڕەحمێ بە زوعەفا بکە! خۆت مـدبر الامـوری! ئەزانـی ئەتـوانی بە ئاسـانی ئەو نەوعە کەسـانە لە کـۆڵ کەیەوە!

یەك دوو سـاڵ حوککـامی ئینگلیـزی لە وڵاتـی ئـێمە بـوون، کەس کەسی نەکوشت، خەرمان و پاوان و خانوو نەسووتا، حەتتا لە بیتـوێن بە سەلامەت دەرچوو، گیسکێ نەدزرا، دیوارێ نەبڕدرا، ڕێـێ نەگیـرا! کە ئەوان ڕۆیشـتن ئـاگری فیتـنە هەڵایسـا، دونیـا تێکچـوو، بـووە هەرەج و مەرەج، توخوا مسوڵمانی وایە؟ موئمین ئەبێ وابێ؟ خوداوەنـدا! ڕەئیسـی ئیعتیقادیاتی ئەمانە، لەگەڵ ئەو ناموئمینانە، حەشر کرێ!

مەعەری ئەڵێ:

**واذا تساوت فی القبح أفعالنا**
**فمن التقی؟ وأی هذا الاشرار[1]؟**

هـایهوو! تەسـاوی چـی؟ قەبـایحی مسـوڵمانان لە میزانـی تەسـاوی دەرچوو! ١٨/٤

## کارت پێك بێ، ناموست لەژێر پێ دانێ!

سیاسیونی غەرب ئەڵێن: کارت پێك بێ، بۆ نەیلـی مەرام، شـەڕەف و ویقار و دۆستی عەهد و پەیام و ناموس، لەژێر پێت دانێ!
١٩/٤

## فەڕەنگ بە تۆپی سەحرا و لالۆ بە تۆپە قیڕپینە!

بە زەفەری بەدر مەفریـوێن! عـادەتەن خـاریقەیێ بـوو هـات و چـوو! القوة القوة ماددی و مەعـنەوی، ئـالات و ئەدەواتـی حەڕب لەگەڵ مەهـارەتی ئیسـتیعمالی ئـالات و ئەدەواتــی حەڕب لەگەڵ مەهــارەتی ئیستیعمال. وە ئـیللا ئـالەت و ئەدەوات بە قـووەت حیسـاب نیـیە! وەکـی تۆپی کەلـلە، بۆ خۆی شـەڕ ناکـا! وای لە جەهلـی مسـوڵمانان بە ئایـاتی قورئان بە ئایاتی ئەکوان!

قـووەت بە گـوێرەی زەمـان ئەگـۆڕێ! لە زەمـانی سـەعادەت بـا تیـر بووبێ، لە زەمانی ئەسلەحەی نارییە، تیر لە کلکـی تەشـی تەشیڕێسـان لە تیرۆکـی نـانکەران بـێ قیمەتـرە! تیـرو کەوانە لەگەڵ شەسـتیر چـی پـێ ئەکرێ؟ مسوڵمانان حەڕبی بە تیر و شیر و ڕمیان کردە سوننەتی نەبەوی. جنـود و لەشـکری ئیسـلامیان بەو سـوننەتە مـوقەیەد کـرد، بەسـتەوە.

---

(١) لە ڕاستیدا شیعرەکەی مەعەری بەم جۆرەیە:
وإذا تَساوى، في القبيحِ، فعالُنا، فمنِ التقيُّ، وأيُّنا الكَفّار؟

فەڕەنگ بە تۆپی سەحڕایی بە قەنابیلی تەیارە، لالۆ بە تۆپە قیڕینەی شرینی موقابەلەی ئەکرد! ئەوان بە سەیارە و تەیارە و شەمەندوفەر و پاپۆڕ و سەفینەی هەوایی نەقلیاتیان ئەکرد، مامم بە کەرێ شین و حوشتری ناهەموار... اشهد بالله دینی ئیسلام مانیعی تەعالی و بەرزبوونی نییە! ئەمما گەلێ لە ڕوئەساکان بوونە مانیعی تەرەققی بەرزی، بەڵکو سەبەبی تەدەنی و ژێرکەوتن!

ئەگەر ئەوانە بە هۆش بان، مەقسەدیان حیفزی نەبزی ئیسلام بایە، ئەبا تەرغیبی مسوڵمانان بدەن بۆ ئیختیراعی ئەسلیحەی چاکتر لە ئەسلیحەی فەڕەنگ.

٢٠/٤

## میللەت دەوڵەمەند نەبێ هیچی پێ ناکرێ!

بۆ حەرب، ماڵ لە ئەعزەمی قیوایە، هەموو قووەت لایەکە، ماڵ لایەکە! چ پارچە ئەرزاق، چ ئەلبیسە. ئەگەر میللەت دەوڵەمەند و جەوادی فی سبیل اللە نەبێ، هیچی پێ ناکرێ! خصوصەن لەم عەسرانەدا، حەرب زۆر گران بووە، تەحەمولی قووەتی فوق الغایەی ئەوێ! ئەتوانم بڵێم هەموو مەساریفی حروبی زەمانی ڕیسالەت پەنا ناگاتە قیمەتی زەڕڕە و نیوەی تاقمێکی حەربی ئێستا! تەدارەکی ئەو ئەسباب و موهیمماتی حەربییە بە قەومی دەروێش و سۆفی و سەلەفی و زاهید، تارك الدنیا، بەرماڵ بە کۆڵ، چاو بە کل، سیواك لەبەر پشت، ڕیش درێژ، سمێر هەڵپاچراو، دەردەدار، لەڕی لاواز، چۆن ئەکرێ؟

قەومی ئەمڕۆ بە ئاداب و ڕەوشتی هەزار و سێسەد و پەنجا و پێنج ساڵ زیاتر موقەییەد بن، ئەمڕۆ هەنگاو بۆ کێندەرێ ئەهاون؟

٢٢/٤

## برایەتی لە تەنی جارجارۆکە سسترە!

هەموو دونیا، ارض السلام، دار الایمان، خۆ بەخۆیی تێك ئەنگڕێن،

خـوێن ڕژان، یەغمـاگەری، تەکفیـری یەکـدی، عەداوەتـی ئەبەدی مـع الاسف هەمـووی لەبەر بـێ ئیسـلامەتی تێـك چـوو. ڕابیـتەی ئوخـووەتی ئیمان ئەمڕۆ لە تەنی جارجارۆکە سستترە، ئیعتیمـادی مسـوڵمانان بە قەول و قەراری ئەجانیب بە قووەتترە.

لە ئەواخیری حەربی عمومی، زاتـێ ئەحـمەد نەزمـی نـاو، قومانـدانی تابووری نیشانچی بە گریانەوە بە منـی وت: ئێـمە خـرابین، چ ئەڵمـان چ ئینگلیز، ئەڵمان غالب بێ بە دۆستایەتی ئەمانخوا، ئینگلیز بەسـەرکەوێ بە دوشمنایەتی ئەمانخوا!

٣١/٤

## ئەو نەوعە مەلایانە زۆر کەمن!

چەند موخلیصی ئەو زاتانەم، شتێکی کە بە تەواوی نەیزانن، بفەرمووم نایزانین. بەڵام ئەو نەوعە مەلایانە زۆر کەمن! بەڵێ ئەوانە پەترۆسی ناسك و ئەمسـالی ویـن کە ئـاگری حڕوبـی صـەلیبیان هەڵکـرد! تەصـویری حەزرەتی خیرالخلایقیان، بە صورەتی ئەفسەق الانام کرد! دەڵێن پەترۆس و ئەمسـالی وی لە مولـوك و ڕوئەسـای سیاسـییون، کە کـرانە ئـومەڕا، عەهدیان کرد و عەهدیان شکاند! ئەوانە لەمێـژە لە ئەورووپـا پەیـدابووین، فکریان، مەحوی دینی ئیسلامە! لە تەهیجی ئەفکـار (اناء اللیـل واطـراف النهار) سەعی ئەکەن -من کل الوجوە- خەریکن بۆ هەڵگرتنی مەئاسیر و مەفاخیری دینی (خاتم الانبیاء)! یەعنی بۆ مەحوی شەڕەفی بەشەرییەت!

مسوڵمانان خۆبەخۆیی خەریك بوون، جسمانی و ڕوحـانی، بەگژیەکـا چوون، ئاگایان لە کەیدی دوشمن نەما، تا سەرنگون بوون! ئەلئـان کـان کما کـان! ناشـکوری نەبـێ مەلایـانی سـوننی لەبەر شـەڕی مـوعتەزیلان ئاگایان لە شەڕی ڕوئەسای مەسیحی و ئیسرائیلی نەماوە، یا نییە..

مەرحـووم شـەریف حوسـێن بـن عەلـی، ئەو موعـاهەداتی ئینگلیـز و خولەفا لەگەڵیان کردبوو، پاش عەهدشکاندنیان، نەشری کرد بە جەرائیـد و فەرمووی:

**نەمزانی ئەوانە وا بێ عەهد و پەیمان و وەفان.**

من وتم: سبحان الله شەریفی موحتەرەم هەروەك لە سیاسەت غافڵ بووە، دیارە لە قورئانیش غافڵ بووە! خوا شاهیدە ئەوانە ئیمان و عەهدیان نییە!

سەیری ئەو سەیرە لەسەر ئەو هەموو بێ شەرەفییە کە شەرق و غەرب ئەیزانێ: ئێستا سوێند بە شەرەف ئەخۆن. سبحان اللە لەو قورئانە! قسە لێرە لە ئەئیمەی کوفرە، مونازەعەی ئەئیمەی ئێمە لە یەمینی کافر بێ جێیە! حەق وابوو هەموو مسوڵمانان موقابەلەیان بکەن! وە حەتتا ئەوڕۆ با وجودی زوعفی مسوڵمانان، ئەگەر بە عمومی ئیتیفاق بکەن، ئەو ئەئیمەی کوفر ئەگەڕێنەوە، ناتوانن تەعن لە دین بدەن، ئەوەندە بێ مروەتی لە حەق ئیسلام بکەن! بەڵام ئەمە مەحاڵە! ئێستا سەوادی ئەعزەم لە مسوڵمانانی تازە (ڕەسیدە). ئەوانە یان لە قەوم و ئابائو ئەجدادی خۆیان خۆشتر ئەوێ! موحیببەت و لایەنی ئەوان، سەرزارەکییە! هی ئێمە لە عومقی دڵە، پڕ بە دڵە!

٣٩/٤

## بە دوو ڕەکعەتی نوێژی کلۆر، هەزار نازو نووز لەسەر خوا ئەکەن!

سبحان الله العظیم، قورئان و ئامالی مسوڵمانان زۆر لێك دوورن! بە دوو ڕەکعەتی نوێژی کلۆر، هەزار ناز و نووز لەسەر خوا ئەکەن، ئەبێ بە شەریك و ئامری خوا، عەهد و میساق لەگەڵ قاتیل و ڕێگر و زاڵمان و غەدداران ئەکەن! بێ وان، نەچنە بەهەشت! یەعنی بە قەتعی بیانبەنە جەننەت! حاشا عەهدی وان لای خوا و ڕەسوولی خوا ئیعتیباری نییە!

لە ساڵی ١٩١٩ میلادی، ئەووەل نوێژی جەژنی زەمانی ئیستیلای ئینگلیزمان کرد، کە لە میحراب هاتمە دەر بەزەییم بە خۆمان داهات، گریان غەلەبەی لێکردم و وتم: ئەوا نەمردین نوێژی جوولەکانیمان کرد!

ئەوانەی ئاگایان لێبوو ئەوانیش گریان. حەققەن عیبادەتی زەمانی ئیستیقلالییەت و زەمانی ژێردەستی فەرقیان زۆرە! وە دینی ئیسلام بە

زیللەت ناژێ یا عەزیز و یا قەوی! عیززەتێ! قووەتێ!

٤٣/٤

## حوببی ژن!

فی الحقیقە، حوببی ژن مانیعێ بەقووەتە لە قبوڵی دین! حەتتا ئەمڕۆ گەلێ لە عوقەلای ئەجانیب، قەلبەن مەیلی ئیسلامەتیان هەیە، ئارەزوو ئەکەن مسوڵمان بین، ژنەکانیان مومانەعەت ئەکەن. چونکی سەبەب بە بێ موبالاتی مسوڵمانان لەگەڵ ژن، وە بێ حورمەتیان، ڕوئەسای دینیان وا تێگەیاندوونە، ئەو بەدکارییە، موقتەزای دینی ئیسلامە! خاسەتەن تەعەدودی زەوجات لەگەڵ بێ عەدالەتی، ژنانی ئەجانیبی زۆر موتەنەفیر کردییە لە دینی ئیسلام!

٤٤/٤

## نووری خوا بە عەقڵی ئێوە ناکوژێتەوە!

عەقڵی ئەووەل نێزیکتر نییە لە مەقامی ربوبییەت! لە بوتێ تا شەڕابێ لە داری هیشك! ئەوانەی بحاثن عەرد ئەکۆڵن، بۆ ئاساری ڕابردووان لە (خەریبەزاری) بابل و هیند و سائیرە، بەعزە لەوحەیەکیان بەدەست کەوتووە، ئەوەی لێی نووسرابوو لێکیان داوەتەوە. لەگەڵ ئەقوالی مەسیحیان، چ فەرقێکی نییە! ئیلی بە تەبدیلی ئەسما نەبێ! ئەوان ئەڵێن بوزا، بابلو، ئەمان ئەڵێن مەسیح!

ئەو ڕوئەسایانە، قەصد ئەکەن نووری خوا، حوججەت و دەلیلی وەحدانیەتی ئیلاهی، قورئانی عەزیم، نوبووەتی خاتم الانبیاء، بکوژێننەوە! منیش عەرزیان ئەکەم زاتەن تا عەقڵ نەکوژێننەوە، بێ هێزی نەکەن، ناتوانن ئەو خورافاتانە ئیزهار بکەن. کە عەقڵیان چارەکرد، ئەوجا ئەوی ئارەزوو بکەن بە سووك و ئاسانی بە دەماغیانەوە ئەچەسپێنن! مولاحەدە، جەهلەی سۆفییەی ئێمە، پاپیوون، سەعی بەلیغ ئەکەن بۆ ئیزالەی عەقڵ!

سۆفییەی ئێمە ئەڵێن: عەقڵ هیچ نییە، کەشف حیسابە.

ئەشاعیرەش لە بەعزێ مەقام زۆر ئیهانەی عەقڵ ئەکەن، ئەمما لە گەلەك جێ ئیعتیمادی ئەدەنە سەر! قەومێ ئیفراتیان کردیە ئیعتیبار هەر بە عەقڵ ئەکەن و ئەڵێن: ئیحتیاجی بە نبووەت نییە! موعتەزیلیش لەگەڵ ئەم گروهە کەمێ موناسەبەیان هەیە، ئەمما ناڵێن موغنیە لە نبووەت!

ئەمما ئەمن زۆر موتەعەجیبم لە عەقڵ، زوو تابیعی مەیل ئەبێ. تەماشا ئەکەی بەو قووەتی خۆی، لە علیە خۆی، لە مەحوو نابوودی خۆی ئەدوێ، (فعلی هذا) ئیعتیماد لەسەر عەقڵ بالکلیة، خطأ! ئەبێ تەوفیقی بکەی لەگەڵ شەرعی صەحیح. عەقڵی چاك شەرعی پاك، زۆر موافقن!

فی الحقیقە عەقڵی بەشەری لە بەدئی زەمانی خاتم الرسول، دەستی کرد بە قووەت بوون و تەعەممووم! ئەمڕۆ عەقڵ لە غایەتی قووەت دایە، ئەمما مع الاسف میول لێی ناگەڕێ موقتەزای عەقڵ دەرکەوێ! ئەوەی ئەهلی ئینساف و مرووەت بێ، حەز ئەکا میللەتی عاقڵ بێ. ئەمما ئەوانەی مەیلی ناڕاستی و ئیستیلایان هەیە، زۆریان پێ ناخۆشە تا عەوام کەم عەقڵتر بن کەیفیان زیاتر پێ دێ!

ئومێد ئەکەین، خوا (نوری) خۆی، چ حوججەت و بورهان، چ دین و ئیمان، چ قورئانی عەزیمولشەئن، چ نبووەتی پێغەمبەری ئاخیر زەمان، چ عەقڵی شەریفی مومەیزی ئینسان، بێ، بە قووەتی بکا. وەلەو پێیان ناخۆش بێ، خوا نووری خۆی هەر ئیکمال ئەکا، بە ئیرسال و تەئیدی خاتم الرسول. نووری ئیمان، نووری عەقڵ، دونیا ڕووناك ئەکا! گەلێ کەس لە تاریکی کوفر و جەهل نەجاتی ئەبێ!

وای چەند خۆش بوو ئەگەر دوعاتی بیدعەت لە میللەتی ئیسلام سەعیان نەکردبا بۆ کوژاندنەوەی ئەو دوو نوورە! بەڵام مع الاسف ئیمان و عەقڵ لە بەعزە دڵ و دەماغاندا کەمێ وەك گوڵە ئەستێرەی ئاخیری بەهاران ئەدرەوشێتەوە. باقی هیچ!

٥١/٤

## زۆربەی لە فەقیریی بوو!

ئەوەی بە سەر مسوڵمانان هات، ئەکسەری لە فەقیریی بوو! گەلێ جار لە وەعزدا ئەڵێم: لازمە ئەوەی دەستتان ئەکەوێ بیکەنە سێ قسم، یەکێ (کان لم یکن)، دەستی لێمەدەن بۆ وەقایعی عەزیمی دانێن! یەکێ بۆ لێقەومانی خصوصی. یەکێ سەرفکەن لە حەوائیج و زەروورریات! لە ڕێی هەوا و هەوەس قەتعەن ماڵ سەرف مەکەن! بەڵام مع الاسف بێ تەئسیر ئەڕوا.

لە زەمانی عوسمانی، ئەورووپایی کەوتنە ئەندێشە، وایان خەیاڵ ئەکرد، لە ئەووەلی ئیسلام تا ئەمڕۆ حوجاجی بیت الحرام هەر یەك بەگوێرەی سەروەت، شتێکی داناوە لە سندوقی عمومی بۆ حەربی عمومی. وە تا ئێستا ئەبێ ئەو ماڵە لە ملیارات تەجاوزی کردبێ، ئەگەر وابێ، لاشەك ئەورووپایی مەغلوب ئەکەن! بۆ کەشفی عەتا بەعزێ لە ڕووس زاهیرەن مسوڵمان بوون، ناوی خۆیان گۆڕی، حەتتا خەتەنەکران. هاتن بۆ حەج، تەماشایان کرد، مسوڵمانان لەو خەیاڵەدا نین! ماڵێ زۆر، بێ هوودە سەرف ئەبێ، خاسەتەن قوربانی و دیمای نوسوك! ئایا ئینفاقی فی سبیل الله بێ ماڵ ئەکرێ؟

٥٥/٤

## ئەمساڵ دۆڵ حەرامە، لێی مەدەن!

ئەوێ ساڵێ (١٩٢٣)ی میلادی، کە لە بەغدا بووم لە لەیلی ماتەمی شیعەکان، گاز مەعروفیان لێ ئەدا، بێ تەپڵ و دۆڵ، ئەیانگوت موجتەهید فەرموویەتی: ئەمساڵ دۆڵ حەرامە، لێی مەدەن.

ئەمما پار حەلاڵ بوو.

٥٧/٤

## قیمەتی ئەو دوو کەلیمەش نەمایە!

مەشهوور بوو، وەقتێ بەعزە قووادی غەڕب ئەیانوت: دوو کەلیمە هەیە قووادی عەساکیری عوسمانی تەرغیبی نەفراتی پێ ئەدەن بۆ جیهاد، ئەڵێن: بڕۆن بۆ حەڕب، ئەگەر مان غازین، ئەگەر نەمان شەهیدن!

ئەگەر وەك ئەو دوو کەلیمەیە شتی تریشیان هەبایە، ئەبوونە جیهانگیر! ناشکوری نەبێ ئەمڕۆ قیمەتی ئەو دوو کەلیمەش نەماوە دەوڵەتی عوسمانیش ئینقیرازی بوو!

٦٦/٤

## ئەمەلم وایە سەعلەبە بە ئیمانێ کامڵ لە دونیا چووبێتە دەر!

سەبەبی عولەمای دین بۆ فەقر و زوهد، ئیستیلای ڕەهبانییەت! لایان وایە دەوڵەمەندی موجیبی غەزەبی خوایە، عاقیبەتی و خەیمە، سەرئەکێشێتە کوفر و نیفاق، بەڵام لەو فکرە ئیصابەیان نەکردووە، دینی ئیسلام لەگەڵ فەقر ناژی! وە نەژی! تاکو دەوڵەمەندێ بە هیلاك ئەچێ، سەد هەزار فەقیر خانە وێران ئەبێ! خاسەتەن ئەمڕۆ میللەتی فەقیر چی پێ ئەکرێ؟ ئیقتیداری نەبێ پاپۆڕێ بکڕێ، مەسەلەن! ڕاستی ئەمڕۆ قەومێ میللەتێ دینی ئەژێ، لەسەر دەوڵەمەندی موختەریعیش بێ! سەروەتی لەناو خۆی بێ، تا مومکین بێ نەچێتە دەر! ئیتر ئەمەلم وایە سەعلەبە (1) بە ئیمانێ کامڵ لە دونیا چووبێتە دەر. وە واعیزان زوبان دەرحەقی درێژ نەکەن! وە زەمی دەوڵەمەندی و مەدحی فەقیری، تەی نەکەن!

٧٨/٤

---

(1) سەعلەبە (ثعلبة) هاوەڵێکی پێغەمبەر (د.خ) بووە و چیرۆکی لەبارەوە دەگێڕنەوە کە سەرەتا هەژار بووە و پاشان پێغەمبەر دوعای بۆ کردووە و دەوڵەمەند بووە و لە نوێژە بە کۆمەڵەکان و هاتوچۆی مزگەوت کەمتەرخەم بووە بەهۆی دەوڵەمەندی و سەرقاڵییەوە، گوایە لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوبەکریش زەکاتی نەداوە.

## فەقیرییە ئینسانی لە هەموو خێران مەحرووم ئەکا!

ئەو ساڵەی کە ڕووس هاتە ڕواندز لە وەختی شەڕی عالەمی یەکەم، جەماعەتێ لە ژاندرمانمان بە ڕێ کرد، دوعامان بۆ خوێندن، قائیمقام ئەحمەد حیلمی رحمە اللە علیە، وتی: بابت، باپیرت چووینە غەزا، تۆ نەچووی! ئەوا غەزا هاتە ڕواندز!

وتم: ئەوان نەختێ ماڵیان هەبوو، ئەمما لە سایەی ئیستیلای حکومەت، ئێمە چمان نەما! ئەلئان خوا ئەزانێ لە یەك مەتاڵیکیی دە پارەی سکەی شك نابەم لە عەرز و ئاسمان! لەسەر ئەو هەموو مەسرەفی عائیلە و مەدرەسە، چۆن بچمە غەزا؟

ئەمڕۆش ناشکوری نەبێ ئەو فەقرە دەوام ئەکا! ئەو زەواتانە کە پێیان ئەڵێن (بکائون)، حەوت نەفەر بوون! (سالم بن عمیر، علی بن زید، عبدالرحمن بن کعب، عمرو بن الحمام، عبداللە بن معقل، هرمی بن عبداللە، عریاض بن ساریە) ڕەزای خوایان لێ بێ. وا دەر ئەکەوێ مەعزیرەتی ئەوانەی ئەیانوت: ئەگەر ئێمە بێین بۆ غەزا دوشمن بەسەر ئەهل و عەیالمان دەدەدا.

قبووڵ نەبوو!

٨٤/٤

## بەهەشت ئەهاوێینە موناقەصە!

حەیاتێ بە سەعادەت، لەگەڵ سەروەت و سامانێ لاینقطع ولایتناها! ئەگەر بە حەقیقەت تەماشاکەن قازانجی ئەهلی ئیمانە یەك بە ملیۆن بەڵکو زیاتر! ماڵی کەم و هیچ و چلکی دەستێ زوو خەلاس ئەبێ، ئەڕوا و، ئەچێتە دەستی تر، ئەفەوتێ! حەیاتێ مەحدوود، پڕ لە ئەلەم و کەدەر، خاصەتەن لەو ئەییامە حەیات دەردێکە بۆ موئمین، مەرگ دەوایەتی!

(پاپیون) تەبعەن ئیمانیان بەو بەیع و شەرایە نییە! ئەمما موتەشەییخەکانی ئێمە ئەڵێن: چت لەسەر بەیع و شەڕای ئیلاهییە؟

بەهەشت ئەهاوێنە موناقەصە، ئەمما چ موناقەصە؟ ڕەزیلانە، بێ تام و تافەو بێ قیمەت!

وە بەعزێ سۆفییەی ڕاستی، لەوانە عەجایبترن، لووت بە بەهەشتدا نایێنن، بەس لیقایان ئەوێ! مع أنە ئەعزەمیان بەقەدەر ئەدنای صەحابان خزمەتی دینیان نەکردیە!

٩٤/٤

## سەوادی ئەعزەم موافیقی مونافیقەکانە!

ئەو مسوڵمانانەی کە پێیان ناکرێ تەحصیلی عیلمی دینی بکەن، بە ئیرشاد و تەعلیمی فوقەهاکانیان، دینی خۆیان بێ غەل و غەش بزانن! خۆیان بپارێزن لە سوئی دونیا و قیامەت. ئەوەی دینی خۆی ئەزانێ، تەبیعی نازانێ خۆی بپارێزێ لە نەکردنی مەئمور بیهی و کردنی منهی عەنهو! ئەوانەی قابیلەتیان هەیە بۆ مەلایەتی لازمە تەحصیلی علومی دینی بکەن! ببن بە ڕیجالی دین! سیاسی دینی! مەقسوودیان حەقیقەتی دین بێ! نەك مەزهەب و تەریق تەفەققوهـ بکەن و بەس!

ئەووەلەن مەلایەکان لەگەڵ یەك دوشمنایەتی نەکەن، خۆیان و ئەتباعیان بە دەقایق و ڕەقایقی مەسائیلی موخەییەلە مەشغوڵ نەکەن! بەڵکو بە دینێ سەهل، ڕووحێ لەتیف و نەشیت، سایقی الی العمل، جالبی نەفع، دافعی زەرەر مەشغول بکەن! تەڵەبی عیلم مەعزیرەتە بۆ نەچوونە جیهاد، لەبەر فەزڵی لە مەیانی مەعازیری سابقە، زیکری نەکردا! ئەمما بۆ نائەهلان، نا! وەك زەمانی سابق لە وەختی حکومەتی عوسمانی، گەلێ نانەوا و ئەمسالیان لە دەفتەری تەڵەبە موقەیەد بوون، ئیمتیحانیش نەبوو، بە فرۆفێڵ دەردەچوون لە عەسکەری! گەلی ئەهلی عیلمیش لە بن باری عەسکەری دا، ئەمردن! گوایا لە وەقتی خۆی لە دەفتەری ڕەدیفی ناویان بە تەڵەبەی قەید نەکرایە! بەڵێ، (قبل کل شيء کونوا مع الصادقين!) ئەبایە مسوڵمانان زۆر بەر حەزەر بن لەوانەی تەرەئەس فی الدین ئەکەن، مەقاصید و مونەویاتیان بزانن. بەڵام سەوادی ئەعزەم موافیقی مونافیقەکانە، بە قسەیان هەڵئەخەڵەتێن، ڕوحیان لە ڕێیاندا

دائەنێن، لەبەرئەوە تەفرەقە و فەسادی دین زۆربوو، بەناوی دین ئەحزاب زۆر بوون، بوون بە دوشمنی دین، ئاگایان لە دینو دوشمنی دین نەما!
١٠٢/٤

## من غیلظەتم لەگەڵ غەیرە دینی ناو خۆمان، لا خۆش نییە!

هەر شتێ حەددێکی هەیە، لە ئیفرات و تەفریتی، خۆپاراستن لازمە! ئەمر بە غلظەت لە حاڵی حەرب، خاصەتەن بۆ قەومی عەرەب لەو عەصرەدا. چونکی لە نەزەر هەموو ئوممەم و هەم جیواریان، ڕۆم و عەجەم، بێ حورمەت و قیمەت بوون، بەڵکو موحقیر موهان بوون، نەرمی بۆ وان، حەمل نەدەکرا سەر حوسنی سیرەت و خولق. حەمل ئەکرا سەر بێ مایەی و بێ قەدری، بەڵام پاشی ئیستیلایان تەبعەن ئەوە نامێنێ!

تەماشاکەن شدید البطشێ وەك عومەری فارووق، معامەلەی چۆن بوو لەگەڵ ئەهلی شام و قودس، چەند نەرم بوو، چەند ڕەفیقانە بوو! من غیلظەتم لەگەڵ غەیرە دینی ناو خۆمان، لا خۆش نییە! ئیحتیرامی ئەجانیبم، لەگەڵ دەسەڵاتا لا قیمەتدارە! لە بێ دەسەڵاتی پێی نالێن ئیحتیرام! ئینسان چاوی لە لوتفی وانە!

لە حەربی عمومی کە قائیدی فەرەنسی داخلی شام بوو وتی: معامەلەی فارووق و صەلاحەددینی ئەیوبی دەرحەق بە ئەجانیب چۆن بووە، ئەمرۆ لە پاداشی چاکەی وان، معامەلەی ئێمەش لە حەق مسوڵمانان، وا ئەبێ!

بەڵێ قوڕەی دەعیە دەماغ وشکیش خراپەی تەواویان دا، بۆ دارو دیاری ئیسلام!

١٠٣/٤

## عەرەب حیفزی عەرشیان نەکرد!

خوداوەنـــدێ گەورە، ســـاحێبی ســـەریر و ئەریـــکە، لە مولـــك و حوکمـداری بـێ شـەریکە، ئـێمە لە زیللەتـدا نـاهێڵێ. گەورەمـان ئەکـا، ئەمانکـــاتە ســـاحێبی عەرش، ئەو عەرش و تەختـــی فـــارس و ڕۆم و ئەمسالیان ئەداتە ئێمە! وەعدەی ئیلاهی هاتە جێ، بەڵام عەرەب حیفـزی ئەو عەرشەیان نەکرد! جەنابی حەق، بە کەرەمی خۆی، ئیعادەی مەجد و عیززی ئیسلام بکاتەوە!

١٠٦/٤

## کۆنە مەسیحی کۆنە وەثنین[1]!

مـــن ئەوەنـــدەتان عەرز ئەکەم: موستەشـــریقینی ئەورووپـــی نەزەر بە قدیس و قسسیسەکان باشن، زۆر تاریخ تێك نادەن. نەوعەن ما مونصیفانە قسە ئەکەن، وە فائیدەشیان بـووە. سـوئی ئەدەبیـان دەربـارەی سـەروەری کائینـات ئەهـوەن کـرد، گەلـێ درۆ و ئیفتیـڕای نـامەعقولی قسـانیان بـۆ میللەت دەرخسـت. بەڵام ڕەگەشـینکەیان نـامرێ، کـۆنە مەسـیحی کـۆنە وەثنین، دڵیان دەربـارەی ڕەسـوولی ئەکـرەم بە تەواوی خـاوێن نـابێتەوە، خۆیان تەجرید ناکەن لە نیزاعات، ئەممـا درۆیـان ئەکەن هەڵئەخەڵەتێـنن. وە ئەوانەی ئینکاری نبووەتی محمد (صلی الله علیـه وسـلم) ئەکەن بەو مەعنایەی کە لە نەبی ئەدەنەوە، ڕاستە! ئەسڵەن محمد موتڕیب و ڕەقاص و سازندە و نەوازندە نەبووە! وە بە موزەخرەفی هیدایەتی خەڵکی نەداوە! بە ڕاسـت و ڕەوان، ئەمە چـاکە، ئەوە خـراپە، هیـدایەتی داوە! وبـالجملە

(١) کۆنە وەثنی: کۆنە بتپەرست

ئەورووپییون علی الاطلاق لە دژی دینی حەق و ئەخلاقی فازڵی بەشەرین! وە مەیلی سەوادی ئەعزەم لە ئەولادی ئادەم، موافقیانە! بۆیە ئەتوانن دانسیان لێ بکەنە فەننێ لە فنونی جەمیلە!

١٠٩/٤

## عولەما لەگەڵ حوکەما بە ئینساف نین!

ئەهلی عیلم خەبەر لە بوون و نەبوونی کسوف و خسوف ئەدەن، لای خۆمان یا لای ئەمریکا یعنی تحت الارض وبعبارة اخری لە شەرق و غەرب پار ڕۆژ کەمێ گیرا، وە تەقویمی ئێران ئەیگوت نحوستی تا بیست مانگی تر دەوام ئەکا.

وتم مادام وابێ ئەبێ ساڵی ئاتی ڕۆژ نەگیرێ. ئەمساڵ لە تەقویمی نوێ وتی لە جیهەتی ئێمە یەعنی فەوقانی ڕۆژ و مانگیش ناگیرێ. من بڕوا ناکەم بە سەعد و نەحسی کەواکیب و ئەحواڵاتیان بۆ ئیدارەی مەعنەوی عالەمی ئەرزی، وە زۆر بەبێ مەعنای ئەزانم! بەڵێ ئەگەر بڵێم نەحس هەیە نحس النحوس انحس الکائنات کوررەی ئەرزی خۆمانە! سەیید ئالووسی موناقەشات و موجادەلاتێ زۆر ئیراد ئەکا، ئەمما مەقسەدی بەس ئیزهاری قووەتی ئیمان و ئیعتیقادە! بەڵام دوایێ کەمێ ئەهوەنی ئەکا!

خولاسە کەمم دیوە لە عولەمای دین، وەلەو زۆریش موتەبەحیر و موتەفەنین بووبێ بە ئینساف لەگەڵ حوکەمایان قسەی کردبێ. وعلی الاغلب بە سیلاحێ کە لەوانیان وەرگرتییە، شەڕیان لەگەڵ ئەکەن!

١١٢/٤

## فلان بە ڕۆژی وت ڕاوەستە، ڕاوەستا! مەبادا بە تاریکی شێخ حەزرەتی بچێتەوە شار!

خۆیان بپارێزن لە مەیلی فاسید و ئەحمەقانە، بارێ هیچ نەبێ وەك نەمروود بن، بهت حاصل کەن! بە ئیددیعای کازیب و لاف و گەزاف فسۆس پاڵەوانانە قسە نەکەن، بە ناوی کەرامەت و تقربی الی اللە ی

ویلایەت، دین بە فەساد نەبەین! خۆیان بپارێزن لە شیرك و ضلال، بۆ خەڵكی خۆیان کەر و کافر نەکەن! ئەڵێن عیسا خالقی سەماوات و ئەرزە، یاخود عەلی موکەویری لەیل و نەهارە! هەموو کەشفی تەریق خوا بە قوربانی عیلمی هەیئەتی کا! هەر عیلم خۆیەتی! (الارض ارضی والسماء سمائی). نازانم بڵێم چییە؟ قسەیێ چەپانەیە! بە هیچ زوبانێ نازانم تەعبیری بدەمەوە! فلان بە ڕۆژی وت ڕاوەستە، ڕاوەستا! مەبادا بە تاریکی شێخ حەزرەتی بچێتەوە شار!

وتی: ئاوابە! ئانەن ئاوا بوو، بووە تاریکی! ئایا شێخ سعات لە یەکی شەو چووبا ناو شار چ دەقەوما، تا خوا نیزامی عالەمی بۆ تێکدا؟ سەیر ئەمەیە ئیمانیان بە سیعەتی قودرەتی ئیلاهی زۆر واسیعە! بەڵام بۆ حەق و حەقیقەت نییە! بۆیێ بە ئیستیخدامی کەن بۆ عەجایبان و غەرایباتی شێخان. بەعزە مەلا سەبەب بە تەربییەی منداڵی، بە گەورەیش، ئەم خەرافاتانەیان لە دەماغ دەرناچێ! بەڵکو پفیان کردە کەرەنا مێشکی گەلێ کەسیان بردو تێك دا.

ئەوەی بە حەق ئیمانی بە قورئان هەبێ، ئەزانێ نە لە خەلق نە لە تەدبیر شەریکی نییە، بەس عایدی خوایە، وە هیچ کەس لە شانی ئیلاهی سەهمی نییە! وە ئەمەشتان عەرز دەکەم هەرچەند کەشف و کەرامەتی ئەولیایانی ئێمە هەیە، ناگاتە کەشفی کەهرەبا و ڕادیۆ، وە هیچی بۆ ئەمڕۆی ئوممەتە، کەڵکی نەبوو! بیلەکس موزیڕ بوو، والسلام علی من اتبع الهدی، هەرچی ئەڵێن با بڵێن!

١١٤/٤

## زۆر بارانی!

زۆر بارانی پار هەموو دەغڵ و دانی شکاند، ژەنگی لێدا بێ کەڵکی کرد، گاهە گاهە وەك ئەمساڵ کەم بباریێ مارتمان لێ بووە هاوین. وەخت بوو دەغڵ و دان هەمووی هیشك بێ، دار و درەخت بە زۆری بەری فڕێدا دەردەدار بوو. ئەو باغاتی وا جوان و خۆش و بێ ئافاتە، پاداشی ئیمان و عەمەلی صالیحە! لە نەزەڕ حەقیر هەر ئیمان زۆر بە

قیمەتە، بەڵام مەقسەد بۆ ئینتیزام و حوسنی مەعیشەت و تەرەقی، عەمەلی صالح غایەتی لازمە! وە حەقیقەتەن ئەگەر تەماشاکەین عەمەلی صالح، موقتەزای ئیمانی بێ غەشە.

١١٤/٤

## ئینسان زۆر سەیرە!

ئینسان زۆر سەیرە! لە عەجایباتی مەخلوقاتە! بە لاف و گەزافە، بێ صەبر و تەحەمولە، ماضی خۆی لەفکر ئەکا، ئەیامی زیلـلەت نـاهێتە بەر چاو، عیبرەت ناکا.

ڕۆژێ لە ئەتواری بەعزێ کەس دڵم زۆر تەنگ بوو، وتـم: خـوایە! ئەوا لە دونیا عـیلاج ئەکرێ بە مـردن، لە صـوحبەتی بەشـەر نەجاتمـان ئەبێ، ئەمما لە ئاخیرەت چیبکەم؟ بچمە بەهەشـت هەر ئینسـانی تیـایە، بچمە جەهەننەم –العیاذ بالله- پڕە لە ئینسان، ئەوجا چیبکەم؟

وە گەلێ جار ئەڵێم: حەققەن ئینسانی چاك لە هەموو کائینـات زێتـرە، ئینسانی خراپ لە هەموو حەیوانات خراپترە، کمترە!

خوای تەعالان بە حورمەتی ئەشرەفی کائینات ڕەحمێکمان پێ بکا!
لام وایە بەشەر قەت وەك ئەو عەصرە تێك نەچووە.

١١٧/٤

## بەشەر و بیری وەحدەت!

عەرەب یا بەشـەر، وەحـدەتێ فیتـری عەیشـی سـاذج بـێ تەمەع و شیقاق. وە هەروەها هەموو ئوممەتی لە ئەووەلی نەشئەتیان وابوون، حەتتا حەیـوان! تەماشـای جـوجیلان کەن تـا فەراقە ئەبـن، چەنـد لەگەڵ یەك یەکن! دوایێ چۆن بەگژ یەکا ئەچن، دەست هەڵناگرن، تا یەکێ یەکـێ ئەبەزێنێ بە سەریا غالب ئەبێ!

تەماشـای حـاڵی عەرەبـان کەن! بـێ شـك حەزرەتـی محەمـەد نەبـا، لەمێژبـوو سـەبەب بە خـیلاف و شـیقاق و قەتـل و سـەلب و نەهەب و غـارەتگەری یەك، مەحـوو ئەبـوون! لەنـاو مـافیە الاخـتلاف، بە هـیلاك

ئەچوون! ئیختیلافیان نەئەبڕاوە، تا ئەفەوتان! بینائەن عەلەیهی عەرەب ئەگەر حسییاتیان هەبا، لە زیللەتی ئیستیعباد و موصیبەتی ئیستیئصال بترساban، موسارەعەیان ئەکرد بۆ ژێر لیوای محەممەدی، بە کەمالی ئیفتخار و سەربڵندی، بە گوێرەی مراد و ئارەزووی وان!

١٢٠/٤

## یەکتاپەرستانی ئێستا ناوی خوایان بۆ سوێندی بە درۆ نەبێ، لا نییە!

حەقیقەتەن گەلێ کەس پاش نەجات بوون لە فەلاکەت و هیلاکەت، خراپتر ئەبن! من پاش قەحط (گرانی) و غەلای عام دیمن! وە کەسێ تەماشای حاڵی موشریکینی ڕابردوو بکا وە لەگەڵ حاڵی مووەحیدینی ئێستا لێکی داتەوە، فەرق زۆرە لەو نەوعە هەنگامە! وە لە مەقامی مونازەرە لە شوئونی ئولوهییەت نەختێ فەرق ئەگەیەنێ! نەتدیوە لەو هەنگامە ئەوان هاواریان ئەکردە خوا، ڕائەوەستان، لە ئیددیعا ئەکەوتن. لاکین مووەحیدین لە هیچ حاڵێ ڕاناوەستن! ناوی خوایان بۆ سوێندی بە درۆ نەبێ، لا نییە! هاوارکەنە بەرخوا؟ حاشا!

١٢٣/٤

## هەزار عیبرەتمان دیتیە، گوێش نادەینێ!

مسوڵمانی کاملی خالصی موجاهیدی غازی شەهیدی ئێمە، هەزار عیبرەتمان دیتیە، گوێش نادەینێ! وە حالەن ئەوانەی لە بەحر بە پاپۆڕی بوخاری حەربی و تیجاری سەیری سەفەر ئەکەن، ئەو فەرتەنەیە بە ئوموری تەبیعی ئەزانن، تەعبیری ئەدەنەوە بە غضب الطبیعة.

خولاسە بەشەر زۆر گۆڕاوە، سەوادی ئەعزەم لە مووەحید و موشریك، ڕوویان لە خوا نییە، بۆیە بەشەر لە حاڵێ دایە ڕۆژی ڕووناکی لێ بویتە شەو، لە هەموو ئەتراف ئەمواجی شەڕ و دەرد و بەڵا ڕووی تێ کردووە و موحاتە، وە ئەسڵەن بۆ ئیصلاحی حاڵ، خوای بە دڵا نایێ!

١٢٤/٤

## سوڵتانی فاس دەخالەتی بە فەڕەنسە کردا

ئەمڕۆ سبەی عیقابی ئیلاهی بەسەر فەرەنسە و ئینگلیز دادێ، چونکی بەغیی ئەوانە بەسەر عالەمی ئیسلامییەت لە ئەندازە بەدەرە! ئایا تەماشاکەن بەغی مسوڵمانان خۆبەخۆیی حەتتا لەو مەزەلـلەتەدا لە بەغی وان خراپتر نییە؟ خۆیان ئەبنە باعث، بەڵکو ئیلتجایان پێئەکەن، کە تەداخول بە ئیش و کاریان بکەن. زۆر لەمێژ نییە سەبەب بە عەداوەتی خۆبەخۆیی، سوڵتانی فاس دەخالەتی بە فەڕەنسە کرد وە کەوتە حیمایەتی ئەو! لەبۆ ئیدارەی مولك، لەناو گەڕێن! مسوڵمانان چ کەڵکیان پێوە هەیە؟ حاصلی ئمڕۆ ئێمە کەوتووینە ڕۆژی جەزا، وە دەست هەڵناگرین لە ئیشی ناسەزا!

١٢٥/٤

## باران و گیا وگۆڵ!

باران بە ئینتیزام بێ، لە وەقتی حاجەت و بە قەدەر حاجەت، گیا وگۆڵ زۆر عەجایب هەڵدەستێ. خوررەم و شادان ئەبێ، بە مل یەکا ئەچێ، تێکەڵاو ئەبێ! ڕێواس، دۆریە، خەرتەلە، چاوبازە، ترشۆکە، بن بەردەقە، شنگ، ئەندرێشە. وە غەیری تر کە ناژمێردرێ کە بە خاوی ئینسان ئەیخوا یا ئەیبرژێنێ، بێجگە لە حبوبات و ئەقواتی بەشەری.

١٢٥/٤

## حەوادیساتی دەهرا

غافڵ لە حەوادیساتی دەهر چییان بەسەر دێنێ! ئەمری خوای بەسەر ئەو باغ و داغ و مێرگ و مێرخوزارە داهات. ئەو ئەمرە موهلیکە وەك کلۆی مەراکیشی و نەجدی وەك تەرزە تەرزەی ڕۆژی دووشەموو

شەشی مانگی مەولود ٤ی مایسی ڕۆمی، ئێمە لە هەولێر بووین، دونیایەکی وێران کرد. وەك ژەنگی ئەوساڵ دونیای بەربادداد.

لە ساڵی پار، پارچە گەنمەکی بەهاریم هەبوو لە (یێازۆك، زۆر مەدحیان ئەکرد، حەتتا سەپان خۆیان ئەهاتن ئەپاڕانەوە، بیانگرین بە سەپانی ئەو پارچە دەغڵە. وتیان کلۆ گەیشتە داردێدەوان.

وتم وەڵڵا لەوێ بفڕێ یەکسەر ئۆتراغی لەناو دەغڵەکەی من ئەکا، گەرچی مابەینی دوورە، ئەمما شینایی تیا نەمابوو، ئەمزانی تەبعەن ڕوو ئەکاتە جیهەتی ئەو سەبزەزارە. نورەددینی برام لەوێ بوو، وتی:

پاش عەسر ڕۆژێ چوومە تەماشای دەغڵەکە؛ بەخ بەخ چاوی پێ ڕووناك ئەبوو. لەو ئانە کلۆ هات لێی نیشت، سبەی چوومەوە تەماشای، دیم بە نەوعێ، سوێندت خواردبا کە دوێنێ یا ساتێ پێش خورانیی کەلە گیایەکی تیا نەبووە سوێندت لێ نەدەکەوت.

١٢٦/٤

## خەڵك مەلای باشی ناوێ!

حەققەن ڕوئەسای دین خۆیان موحتاجی هیدایەتن، وە هیدایەتیان موشکیلەیە! خۆیان بە شتێکی دی تێئەگەن، خۆیان ئەپەرستن! خوا و عالەمیان بۆ خۆیان ئەوێ! تەماشای عاقیبەتی ئوممەت ناکەن! خۆیان موعەزەز ئەبن، هەرچی بادا بادا! –سبحان الله- ئوممەتیش تابیعی ئەو نەوعە موفسیدانەن! مەلایێ ڕاست بێ، ڕاستیان بەڕاستی نیشان دا، عەقڵیان زیندووکاتەوە، نایانەوێ، سەبەبی چییە، چۆن مەیلتان بێ، وا حوکم ئەکەن؟ بێ تەدەبور و تەفەکور و تەئەمول! بێ دەلیل و بورهان، ئیعتیقاد بەو جەماداتە بەو موفسیدانە ئەکەن؟! موجەڕەدی موحەبەت و مەیل و تەقلید، سەوقتان ئەکا بۆ ئەتباعی ئەوانە، بڕوایان پێ ئەکەن! لە مەصالیح و مەفاسید نافکرن! ئەو ڕوئەسایانە. زەننێ واهی - مع هوی النفس- کە ئەوە حالی مەتبوع بێ، فکیف حالی تابع؟

من گەلێ جار بە فەقێیانی خۆم ئەڵێم: پێش هەموو شت لە مامۆستای

خۆتان ئەمین مەبن، مەبادا میزاجی سەفسەتی غالب بووبێ، وە یاخود تەقلیدی کۆری کردبێ!
وە ئەکسەری ئەمڕۆ، وایە!

١٣٣/٤

## جیهانی کەڕان!

گەلێ کەڕ هەن بە هۆشن عاقلن، بە ئیشارە زۆر چاك تێئەگەن، حەتتا بەعزە شتێ وا ئەزانن ئینسان تەعەجوب ئەکا، چۆنی تێگەیشتوونە؟ تەماشات ئەکا ئەتبینێ، ئەمما لە دیتنی مەئاسیرت کوێرە! حەقیقەتەن موجەڕەدەن بیستن و دیتن، چ نییە! کەر و ئینسان وەك یەکن! هونەر ئیدراکی حەقایق و دەقایقی مەسموعات و موبصیراتە! بۆیە جەنابی حەق بە سەمیع و بەصیری، منەت لەسەر ئینسان ئەکا! نە تەنها بە گوێداری و چاوداری!

بنۆڕنە تەها حوسێنی[١]میصری! تەماشای عوسمانەفەندی بەصیری موصڵی[٢]کەن. حەسەن دیتم داعیێ مەشهوورە! العیاذ باللە ئەوانەی بە

---

[١] تەها حوسێن کوڕی عەلی کوڕی سەلامە (١٨٨٩-١٩٧٣ز) ئەدیب و ڕەخنەگرێکی میسری بووە. بە عەمیدی ئەدەبی عەرەبی ناسراوە. لە هەرە دیارترین کەسایەتییەکانی ناو بزاڤی ئەدەبی هاوچەرخی عەرەبییە. کۆمەڵێك بەرهەمی بە زمانی عەرەبی نووسیوە.
[٢] عوسمان موصلی لە ساڵی ١٨٥٤ لەدایك بووە، لە حەوت ساڵی باوکی مردووە و بەهۆی نەخۆشییەکەوە چاوەکانی لەدەست داوە، دواتر قورئانی پیرۆز لەبەردەکات و ئەنجا زانستی ئاواز و مۆسیقا فێردەبێ و شیعر و قەسیدەی زۆر لەبەربوونە. لە سییەکانی تەمەنیدا دەچێتە بەغدا و لە زانستی قیرائاتیش شارەزا دەبێ و لە ئەستەنبوڵیش لەوبارەوە ئیجازە وەردەگرێ و لە مزگەوتی ئایا صۆفیا قورئان دەخوێنێ و دەبێتە جێی سەرنجی خەڵکی و لە حەجیشدا بە نوێنەرایەتی سوڵتان وتاری خوێندۆتەوە. پەرتووکێکی لە پەسنی پێغەمبەر(د.خ) نووسیوە. بڕوانە: الملا عثمان الموصلي الموسیقار والشاعر المتصوف ، ١٩٦٦م ، وکتاب موسوعة الموصل الثقافية ، عثمان الموصلي ، ١٩٩٢م ، عادل البكري.

گەورەیی کوێر ئەبن، زۆر کۆڵن کۆڵەوارن! ئەوانەش لە دیتنی حەزرەتی محەمەد، بە گەورەیی کوێر بوون -کما هو هو- نایبینن!

١٣٧/٤

## ئینسان زاڵمە، کەچی لە ئەساسا جەوهەرێ قودسیە!

ئەوەندەی نەرمن بۆ قبوڵی ناحەق، عشری مەعاشری، کافیە بۆ هیدایەت و ئیتاعەی خوا و ڕەسووڵی خوا! بەو هضوع و خشوع و خەوف و ئیجلالە کە لەبەر دەست بوتێ یا شێخێ ڕاوەستن، بەسیە! بێ (لم)ە، ئەو هەموو خەرافات و جەهالەتەی ئەچێتە دڵی، نە دەلیل، نە بورهان، نە ئایەت، نە ڕەسوول، نە شەبیە! بە هەزار ئایەت و ڕوسول حەقێکی ناچێتە زیهن! بۆ؟ حەقیقەتەن ئینسان زاڵمە، هەر زوڵمێ بیکا لە نەفسی خۆی ئەکا! ڕەزیل و سەفیل و مودنیسی ئەکا، گەرچی لە ئەساسا جەوهەرێ قودسیە!

١٣٧/٤

## حەیات خەسارەتمەندییە!

حەیاتی دونیا هەرچەند درێژە، کورتە! چونکی ئەبڕێتەوە! ئەگەر هەموو عەسر، وەك عەسری ئێمە بووبێ، حەیات چۆن ناخۆشە وایە! لەزەتی، لە بەلاهەت، یا لە غەفڵەتە! بۆ ئەو حەیاتە، خۆ مەحرووم‌کردن لە حەیاتێ لەزیزی ئەبەدیی، خەسارەتمەندییە!

١٣٨/٤

## گلەیی!

من گەلێ جار لەسەر دەرسی فەقێیان گلەیی لە بەعزە نەظارێ ئەکەم، کە خەریك ئەبن هەرچی کەوتە بەر نەزەریان، بە قیاسێ قەتعی ئیسباتی بکەن! با وجودی لە گەلێ جێ، ناچێتە سەر!

١٤٠/٤

## باسی ئەولیا بووە ژەهر بۆ ئیسلام!

باسی ئەولیائوڵلا و کەڕامەتی اولیاء الله و حیکایەتی اولیاء الله بووە ژەهری هەلاهل، بۆ هەیکەلی ئیسلام، بۆ زیادە ئیتیحادی موئمینین، بۆ سەعی و تێکۆشینی لە ئەسبابی ماددی ئیعتیمادیان دا سەر ئەولیا و سەر کەڕامەت، ڕوویان لە مادییات وەرگێڕا. وە مەلایانیش خۆبەخۆ بوونە عەدووی یەك، تەکفیر و لەعینی یەك ئەکەن. ئیبن تەیمیە و ئەشیاعی تەعن ئەدەن لە ئەوانەی وەك شێخی عەرەبی و ئیبن فاریض[1] وە ئیتر، کە بەعزە ئەقوالی نامەعقولیان لێ نەقل کراوە! حەتتا شێخی ئیبن تەیمیە لە حەق شێخ محیەددینی عەرەبی ئەڵێ: تاغووت! تەرەفدارانی سۆفیە تەزلیلی تەیمییون ئەکەن! ئەو خیلافە، ئەو ئیعتیمادە، عاقیبەتی زۆر خراپ بوو! ئۆباڵێ زۆری، لە ئەستۆی شێخی ئیبنولحەجەر و شێخی شەعرانە یە! ئەوان بە جارێ دوای خەیاڵات کەوتونە، لە وادی کەڕامەت، گوم بووین! کەڕامەت ئەگەر لە ئەوەندەش ڕاوەستابا، باش بوو! لاکین تەجاوزی لە حەدد و حودود کردووە! موستەبعید، هیچ! موستەحلیش بە کەرامەت ئەبێ!

سبحان الله ئەوەی مومکین نەبێ، هەر مەقدوور نییە! چۆن ئەبێ؟! کە مەحاڵ، واقیعی بێلای، نە دین دەمێنێ، نە عەلی، نە وەلی! ئەگەر تەسەووف وابێ، لەگەڵ ڕوحی ئیسلامیەت، موافیق نابێ! و ڕوو لە دونیا وەرگێڕان، بە ڕیازەت مەشغوول بوون، بۆ شەل و کوێر و سەقەت و بێ هێزو قودرەتان، باش بوو وەك ئەصحابی صوففە! بۆ ئەوانی تر نابێ!

ئێمە لە عالەمی مادیاتین، (با شێر بە شمشێر سخن باید گفت)، بە

(١) ئیبنولفارز ناوی أبو حفص شرف الدین عومەر کوڕی عەلی کوڕی مرشد الحموی (١١٨١-١٢٣٥ز) شاعیرێکی ناودارو هەروەها سۆفییەکی دیاری سەردەمی خۆی بووە، شیعرەکانی زیاتر لەبارەی عیشقی خوداییە و بۆیەشە بە سوڵتانی عاشقان ناسراوە، لە میصر لەدایك بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.

خوە ئاسنی سارد نەرم نابێ! بە ئیشارەی عەمر و زەید تەیارە سقوت ناکا! دانەی تۆپی شەرابنێل بە دەست ناگیرێتەوە! بیلاد بە هیممەت و میممەت، موحافەزە ناکرێ! ئەمڕۆ ئێمە ئیحتیاجمان بە کەرامەتی ئیختیراعات هەیە، ئیختیراعاتێ، فەوقی ئیختیراعاتی ئەجانیب، بۆ خاتری لەژێر دەستی دەرچین و سەرکەوینەوە! نازانم بۆ ئەولیائوللای ئێمە، کەشفی ئەرزی سەممیان کرد، بۆ کەشفی ئەمریکایان نەکرد؟ تا ئەو حورمەت و ئیحتیرامە بۆ ئێمە ببێ! وە هەم ئەولیائوللایان لەو مەقامە تەقسیم کردووە بە پێنج تەقسیم: ١- ئەقتاب. ٢- ئەوتاد. ٣- ئەبدال. ٤- نوقەبا. ٥- نوجەبا.

لێرە سەیدی ئالووسی تەئیدی بوونی ئەوانە ئەکا، بە حەدیسی مەرفوع و مەوقوف و مورسەل و ئاساری تابعین و من بعدهم! با وجودی گروهێ لە عولەما ئەڵێن: حەدیسی موعتەبەر، دائیر بە بوونی ئەوانە، نییە! وە نین! وە ئالووسی خۆشی ئەووەڵەن لەم گروهە بووە، دوایێ پەشیمان بۆتەوە، وە تەئیدی بوونی کردوون!

لە بەغدا سوئالم لە جەنەت مەکان، حەفیدی ئالووسی، شوکری ئەفەندی[1] کرد: باپیرت بۆ لە قەولی سابیقی پەشیمان بۆوە؟

فەرمووی: من ڕاست ئەڵێم، ئەو قەولەی دوایی بە دڵی نەبوو، ئەمما عوزەمای ڕیجالی عوسمانی ئیعتیقادیان بە سۆفییان زۆربوو، ئینکاری ئەوانەیان لا خۆش نەبوو، بۆ خاتری نەفرەت نەکەن لە تەفسیرەکەی، گەڕایەوە!

مـن کە ئەو قسانەت عەرز ئەکەم، مەعنای وا نییە ئیعتیقادم بە

(١) مەحمود شوکری کوڕی عەبدوڵلا کوڕی ئالووسی گەورە، ئەدیب و مێژوونووسێکی عێراقییە و لە زانایانی ئەهلی سونەی عێراق بووە و کەسایەتییەکی دیاری جیهانی ئیسلامی بووە. لە ساڵی ١٨٥٦ لە بەغدا لەدایك بووە ورۆژنامەی الزوراء ی لە بەغدا دەرکردووە. لە سەردەمی هاتنی ئینگلیزەکان ڕەتیکردۆتەوە موفتییایەتی بکات، وەك باب و باپیریشی خۆشنووس بووە و دەیان بەرهەمی چاپکرا و و دەستنووسی لە بوارەکانی زمانناسی و مێژوو و ئایینی و ئەدەبی لەپاش بەجێماوە. لە ساڵی ١٩٢٤ کۆچی دوایی کردووە.

کەڕامەت نییە، من ئیمانم بە کەڕامەت هەیە، ئەمما بە ئەندازە، بۆ خزمەتی دین! وەك نیدای حەزرەتی عومەر بۆ ساریە، وە هەم ئەڵێم: با وەلی ئەقسامی هەبێ، بەڵام ئەو وەزیفانەی کە بۆیان موقەرریر ئەکەن، خۆی نییە! عەزیزانم تێبگەن، تێبفکرن! بە ئیشی بێ ئیستیفادە، بە قسە و قسەڕۆکی نامەعقول، خۆتان مەشغول مەکەن! تێکۆشن! بزانن کە ئەمڕۆ دەردتان چییە؟ دەرمانی بە چی ئەکرێ؟ تەماشای صونعی بەشەر کەن! چییان کرد؟ چیی ئەکەن؟ بەچی بەسەر ئێمەدا غالب بوون؟!

١٤٦/٤

## لافوگەزافی نەسەب!

وەك کوردی ئێستا، خۆ بە خۆڕایی مەفەوتێنن، بە لاف و گەزاف و غروری نەسەب هەڵخەڵەتێن.

١٥٥/٤

## کلیلی هەڕەمەکانی میصر!

لەو ساڵانە میفتاحی ئەهرامیان دۆزیەوە، هەیاکلی فەراعینەیان هێنادەر و بردیانن بۆ شار. ئەهلی شاری قاهیرە و ئەوانەی ئەخصائی بوون لە ڕەسم و وێنە، کەلەشی فیرعەونی موسایان ناسییەوە! حەقەن ئایەتێ عەزیمە! ماشائەڵلا قەومێ لە بینای ئەهرام بەو مەهارەتە، وە بۆ مۆمیای هەیکەلی ئینسان، بەو عیلم و صەنعەتە دەقیق کە ئەمڕۆ حوکەمای ئەوروپایی ڕێی پێ نابەن! لە ئیعتیقادیانیش وا چرووك! حەتتا وەقتێ تەقدیسی پشیلەیان ئەکرد!

١٥٦/٤

## نانیش بۆ مەلایان وەك گۆزەی لێهاتووە!

لە تاریخی خزمەتی مەلایان ئەکرا، بێ سەعی و کۆشش، سفرەیان ئەهاتە بەردەم، لەو وەقتەدا، وایان تەعریف کرد[1] ئەگەر ئێستا مابان، ئەلبەتە تەعریفیان ئەگۆڕی، زێرا دەور گۆڕا! نانیش بۆ مەلایان وەك گۆزەی لێهاتووە، ئەبێ ئاگاداری بکرێ! .

ئەگەر گوێ بگریە نەغماتی سۆفییە، ئەبێ دانیشی هیچ نەکەی، ئەڵێن: حەرەکە و سکون فەرقی نییە، ئەوەی لەناو زگی داك دا، ڕزقی جنین ئەدا، لە دونیاش ڕزقی ئەدا. سبحان الله لەو جەهالەتە! ئەگەر تەماشای مریشکیان کردبا، ئەو قسانەیان نەئەکرد! تا فەرخۆڵەی بێ دەسەڵاتە، چۆنی بەخێو ئەکا، کە پەرەوازە بوو، توانی ڕزقێ پەیاکا، لەخۆی ئەکاتەوە! حەتتا ئەبێ بە دوشمنیان لێیان ئەدا! کۆتر دەندوکی فەرخەکەی ئەهاوێتە ناو دەندوکی خۆی، ئەوەی بۆی هێنایەتەوە لە دەروونیا بە ئەمانەت داینا‌وە، وردە وردە قووەت ئەکا، ئەیخاتە ناو دەندوکی فەرخەی، کە گەورە بوو وازی لێ دێنێ، خۆی ئیدارەی خۆی ئەکا!

١٦٧/٤

## گەلێ ئیختیراع لە گەلێ عیبادەت خێرترە!

لام وایە گەلێ ئیختیراع هەیە، ئەگەر لە تەڕەف حەکیمی مسوڵمانان با، قەت خێری تەواو نەدەبوو. مەسەلەن حەبی ئەسپرین دەفعی سەرئێشە ئەکا، سلفاتۆ (تا) ئەبا! تەسکینی ئەلەمێ لە کەسێ، لە گەلێ عیبادەت خێرترە! ئیختیراعێ حیفزی دین و دەوڵەتی پێکرابا، حیسابی جەزای خێری نەدەکرا! بەڵام لەو جیهەتە (ملیون) غایەت موقەصیر بوون، ئەو موحسەناتە بە نەسیبی تەبیعیونان بوو!

١٧٠/٤

---

(١) مەبەستی تەفسیری ئایەتێکە.

## بۆ میللەت و وەتەنی خۆیان قسور ناکەن!

ئەو کەسەی ئیرادە و ئارەزووی حەیاتی دونیا و زینەتی بکا، خوا بە تەواوی ئارەزووی پێك دێنێ، خۆ ئەمەش دیارە وا نییە! بەعزێ بە نەسخ، بەعزێ بە تەعلیق بە مەشیئەتی ئیلاهی، لە سوئال دەرئەچێ. بەڵام ئەوەی ئیرادەی حەیاتی دونیا بکا بە شەوق و زەوق، بۆ تەحصیلی تێئەکۆشێ، تەبزیر ناکا. بەڵکو بێهوودە پوولێ صەرف ناکا، وەك دونیاپەرستانی غەڕبی! لاشەك ئەوانە فوق الامل دەوڵەتی دونیایان بۆ کۆئەبێتەوە! تەماشای سەعیان بکە نەفتی باباگوڕگوڕ بە بۆڕیە بردیان بۆ حەیفا ساحیلی بەحری سپی ناوەڕاست، چیایان ئەکۆڵن، مەعادن دەردەخەن، بۆ میللەت و وەتەنی خۆیان قسور ناکەن!

١٧٣/٤

## لافاو و جوولەکە!

جامی[1] م ئەخوێند، بەهار بوو، ڕۆژێ خۆش بوو، چوومە دەم ڕووبار بۆ دەورکردنەوە، لەپشت کانیلە خەریکی بووم. جوولەکەکانی خمخانەچی، گەلێ پەڕە سیپاریان هێنابووە ڕووبار ئەیانشوشت. لەو هەنگامە لە لای چیای غەڕبی شیمالی، بارانێ زۆر باری، چ ئاگایان لە خۆیان نەبوو، لافاو هات، شرت و پرتەکانی بردن. ها لێرە ها لەوێ. جوولەکەکان کەوتنە دوایان، لەوێ ئەکەوتن، لەوێ ڕادەقەنان، خۆیان بە داران ئەگرتەوە، لام زۆر سەیر بوو! گەلێ پێکەنیم، ئاگام لە دەور و مەور نەما.

١٨٣/٤

---

(١) کتێبێکی بواری ڕستەسازی (النحو)ی عەرەبییە، لە دانراوی عبدالرحمن جامی یە و فەقێی کورد زۆر گرنگی بەم کتێبەداوە.

## بەو قسانە هەڵخەڵەتان!

شێخ عەلی ئەفەندی، ڕۆژێ زۆر مەدحی ئالی نەبەوی کرد: گەورەی ئێمەن، درة التاجی ئیفتیخارمانن!

ڕووی لە من کرد فەرمووی: وانییە؟

وتم: چت عەرزکەم؟

فەرمووی چۆن؟

وتم: قوربان ئێستا سەییدێ لە نوقەبای بەغدا، یا گەورەیێ لە ئەحفادی کاکە ئەحمەد، بێن ئیستیقبالیان ئەکەین و دەستیان ماچ ئەکەین. ئەمما سەییدێ فەقیر بۆ سوئال بێ، بە ناعیلاجی ڕائەوەستێ بە کەمالی زیللەت، مەرحەباشی لێ ناکەین. مع أنه ئەویش وەکو وان سەییدە! ذرة التاج ئیفتیخارە! لام وایە ئەم قسانە، غەدرن لە ئەهل و بەیت! بەو قسانە هەڵخەڵەتان! نیهایەت لە سیادەتی دارەین مەحرووم بوون! من دۆستیانم! بەڵام حەق و حەقیقەتیان پێ ئەڵێم، وەلەو بە دۆستم نەزانن! ڕەحمەت لە شێخی ئیبن حەجەر بێ، گەلێ لە مونتەسیبینی ئال و بەیت، فاسق و بێ دین و بێ ماڵی دونیا و ڕەزیل و سەفیل بوون، بە صەواعیقی وی سوتان! ١٨٨/٤

## غرووری جەهل!

(مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي أَكُن مِّنَ الْخَاسِرِينَ)[1]، حەققەن ئەوە وەعزێ عەزیمە بۆ مەلایان، بۆ ئەولیایان، بۆ سادات و مەشایخان! بەڵام غرووری جەهل گوێی ئیستیماع و چاوی ئیعتیباریانی، کەڕ و کوێر کردووە! لە مامۆستا مەلا ئەحمەدم بیست: مەولەوی مەلا

---

(١) سورەتی هود/٤٧

عەبدولرەحیمی مەریـوانی دێتە سلێمانی. شـەوێ جەمعێ لە سـادات لە خزمەتی دەڵێن: ئەوەی سەیید بیکا، مەعفووە!

مەلا ئەفەرموێ: ئەمە، هەر بۆ نێرانە؟ یا بۆ نێرو مێ، هەر وایە؟

زۆر مونفەعیل ئەبن. دوایێ حەزرەتی کاك ئەحمەد زۆر خۆیـان لـێ توورە ئەکا و نەهیان لێ ئەکا لەو نەوعە گفتوگۆیە!

١٨٩/٤

## ئیمان بە خزمی خۆیان ناهێنن!

وەلەو هەزار ئایەت بێنی! موتەکەبیرینی قەوم، ئیمان بە خزمی خۆیـان نانێن! تەماشای ڕەوشتی ئەقوام کەن! حاجی قادر ئەڵێ:

بۆ ئەمیرانی غەیرە دەبنە گزیر
نەك لە خۆیان یەکێك ببێتە ئەمیر[1].

١٩١/٤

## فکرەی پاپا و شێخ!

سبحان الله ئەو فکرەیەی ماوە بۆ پاپیان، هات بۆ شێخەکانی ئـێمەش! کەسێ عبودەتیان نەکا، گەر بەڵایەکی هاتە سەرێ، ئەڵێن ئەمە هیممەتـی حەزرەتی شێخە! ئەگەر ئەوان بەڵایان بێتە سـەرێ وەك هەیکەلانـی پیـر، ئەڵێن: ئەوە تەقدیری خۆمانە! جوهەلا لە هەڕەشە و گوڕەشەیان ئەترسێن، ئیمانیان پێ دێنن.

١٩٢/٤

---

(١) لە دیوانی حاجی قادردا بەم شێوەیە هاتووە:
بۆ ئەمیرانی غەیرە دەبنە گزیر
نەك لە خۆیان یەکێکی بێتە ئەمیر: دیوان/٢٣٤

## دەنگی بۆمبا!

دەنگی گەورە بە شیددەت، هائیل وەك دەنگی تەقەی نەڕڕەی بۆمبای تەیارە! کە بۆ مەبایانی فڕێ ئەدا، وە بە جێگای ڕەق ئەکەوتن، حەقیقەتەن نێزیك بوو ئینسان ڕوح بدا! لە هەژمەتان گەلێ شێخ لەوانەی کە ئوممەت بە تەما بوون لە تەق و هۆڕی ڕۆژی قیامەت نەجاتیان بدا، هەڵئەهاتن ئەچوونە کونان خۆیان ئەشاردەوە! وە گەلێ جار لە هەور شەققەیێ وا دێت لەرزەی پێ ئەخات، زۆر مودهیشە!

١٩٥/٤

## خەرافاتی کیتابی موقەددەس!

ئەوجا وەرە ئیمانت بەو خەرافاتە هەبێ! وای وای لەو حەیایە! ئەمڕۆ ئەو کۆنە ئەفسانانە، خەرافاتانە، بە ئەلسینەی موختەلیفە حەتتا بە کوردی تەرجەمەی ئەکەن، وە بەناوی کیتابی موقەددەس بڵاوی ئەکەنەوە!

١٩٧/٤

## وتەیەکی حەماغای کۆیە!

بە ڕەحمەت بی حەماغا[1] ئەیفەرموو: تا ئینسان بولی کەف بکا، لە

(١) مامۆستا مەسعوود محەمەد لە کتێبی حەماغای گەورەدا چەند بیرەوەرییەکی حەماغا و مەلای گەورەی باوکی دەگێڕێتەوە، بە پێویستمان زانی چەردەیەکی لێرە دابنێین:
یەکەم: باوکم دەیگوت حەماغا نەوسن نەبوو، بەڵام حەزی لە خواردنی چەور دەکرد. وەها دەبوو کە بەیەکەوە نانمان بخواردایە دەمدیت بێپەروا کوتە گۆشتی قەڵەو بە بەزەوە دەکاتە پاروو، منیش دەمگوت ئاغا بۆت باش نییە. دەیگوت لێم
←

تۆو ناکەویێ، وەلەدی لێ ئەبێ!

١٩٧/٤

---

گەڕێ خوا چی کردبێ هەر ئەوە دەبێ. بابم بۆ خۆی لە دوای زەدەبوونی میعدەی لە جحێڵییەوە پارێزی لە خواردنی چەور دەکرد، حەماغا بەساڵدا چووبوو بۆیە لێی بەپەرۆش بوو. هەروەها لە موناسەبەی خواردن و پارێزدا بەبیرم دێتەوە باوکم دەیگوت لە داوەت و لە سفرەی تازیان کە لەگەڵ حەماغا بەیەکەوە باینایە هەتا دەستی لە خواردن هەڵنەگرتبایە سفرەم بەجێ نەدەهێشت پێی دەگوتم، ئەگەر لەگەڵ تۆدا نان بخۆم تێر دەبم دەنا ئەو منداڵ و پاڵانە وەها زوو دەست هەڵدەگرن پیاو شەرمی بەخۆیدا دێتەوە، دواییش کە دەچنەوە ماڵێ پێدا دێنەوە.

دووەم: باوکم گوتی لە دەمی جەنگدا پۆلیسان دوو تفەنگیان بە نامەی بێ ئیجازەیی لە پیاوی حەماغا ستاندبوو چەندێکی خێرخوایان تکا و موراجەعەیان کرد بێسوود بوو گوتی ڕۆژێکی جومعە (هەینی) کە حەماغا و مەزنە پیاوەکان دەهاتنە ژوورەکەی من و هەر لەوێش نوێژی جومعەیان دەکرد، پێم گوت ئاغا وابزانم ئەو ئیشە هەر بە خاتوو فڵان و فڵان (دوو ئافرەتی بێپەردە بوون و زۆری مەئموووران دۆستیان بوون) ڕادەپەڕێ واباشە ئەوان هیممەتێک بکەن. حەماغا چ دەنگی نەکرد. حەفتە وەرسووڕاوە لە ڕۆژی جومعەی ئایندەدا (داهاتوودا) کە جەماعەت هاتنە لام حەماغا گوتی خۆ وەکوو فەرمووت وەها دەرچوو، جومعەی پێشوو قسەکەتم زۆر لێگران هات ئەمما ئەو ڕووسوورانە لەخۆوە بە قسەکەیان زانیبوو چووبوونە سەر دایەرەی پۆلیس تێرجنێویان کردبوون و هەر دوو تفەنگیشیان لێوەرگرتنەوە و بۆ پیاوەکانیان هەناردبوونەوە.

سێیەم: ڕۆژێکی هەینی باپیرم، مامم و بابمی لەخزمەتدا دەبن بەعادەتی خۆی دەچێتە دیوەخانی حەماغا. بابم و مامم دەیانگێڕایەوە ئەو ڕۆژە ڕەشیداغای حەوێزی، خاڵی باوکم بوو، مەلا لامیع کە پیاوێکی قسەزان و نوکتەباز بووە هەردووکیان لای حەماغا بوون، خەڵقی دیکەش بەزۆری. ئەحمەد عیززەتێکی ئیمامی تابوور (طابوور)یش ئەو ڕۆژە لە دیوەخانە بووە. مەلا لامیع و ئەحمەد عیززەت هەردووکیان حەزیان لە قسە دەکرد، بەڵام ئەحمەد عیززەت ڕێی مەلا لامیع نادا قسان بکات. مەلا لامیع دەقرقرێ و مەفەرێشی نییە قسە بکات. حاجی مەلا عەبدوڵڵا دەزانێ مەلا لامیع پڕی زگی قسەیە و سەغڵەت بووە و بێچارەیشە، لێی دەپرسێ تۆ لەو بەینە لە کەرکووک هاتیتەوە ئایا فڵانە ئاش ئێستا دەگەڕێ؟ ڕەشیداغاش کە پیاوێکی زۆر زیرەک و هوشیار و قسەزان بووە تێدەگا حاجی مەلا عەبدوڵڵا مەبەستی چییە، لەجیاتی مەلا لامیع بەدەنگ دێ دەڵێ، ئەگەر ئاشەکە تێچینە باراشی بەربکەوێ بۆ ناگەڕێ. مەلا لامیع لە مەبەستیان دەگات و ڕوو دەکاتە ئەحمەد عیززەت و پێی دەڵێ، هەناسەت بڕیم هەی هەناسەت بڕێ، تێچینە باراشەکم دەیێ هەی تێچینت بڕێ. ئنجا خوێنەر بۆ خۆی بزانێ چلۆن قاقای پێکەنین لەو مەجلیسە هەڵستاوە.

## ئەوانی فاسقن لە کەمالی ڕەفاهییەت دان!

ئەمــڕۆ وایە، ئەوەی پــارەی زۆرە، لە نــیعمەت دایە، خەریکــی بەجێهێنانی شەهەواتی خۆیەتی، دوشمنی ئەوانەن کە ئەمر بە مەعرووف و نەهـی لە فەسـاد ئەکەن! ئەوی خەریکـی ئیصـلاحە، ناصـیحە، پەکـی لەسەر دوو فلوس کەوتووە بیدا بە کولێرە، بۆ بەربانـگ! یـاخود ئەوانەی فاسـق و فـاجرن لە کەمـالی ڕەفـاهییەت دان، ئەوانـی دیـش موحتـاجی سەددی ڕەمەقن!

٢١٤/٤

## مستەفا پاشا یا مستەفا نەمروود؟!

بە ڕەحمەت بن مستەفا پاشـا کە لەنـاو تورکـان بە مسـتەفا نەمـروود مەشـهوور بـوو، شێخولئیسـلام ئیبـراهیم حەیـدەری[1] تەصـدیقی فەرمـوو سەبەبی ئەو ناوەم لێ پرسی.

پاش جەوابی وتی: لە ئەسنای موحاکەمەی عەسـکەری کە خەریـك بوون قەراری ئیعدامم بدەن، هاتە دڵم وتـم ئەی خورشـید پاشـا ڕەئـیس موحەقەق بزانە هەفتەیـێ تـر مـن لەسـەر ئەو کورسـییەی دادەنیشـم ئێـوە موحـاکەمە دەکەم. صـەنادیدی ئیتتیحـاد و تەرەقـی هەردەئاوەسـم. فـی الحقیقە وەها دەرچوو.

٢٢٨/٤

---

(١) ناوی ئیبراهیم کوڕی عاصم کوڕی ئیبراهیم کوڕی صیبغەتوڵلایە، لە ساڵی ١٨٦٥ لە هەولێـر لەدایـك بـووە، زانـایەکی زیـرەك و لێهـاتوو بـووە، شـیعری بە تـورکی و کـوردی و عەرەبـی هەیە، نازنـاوی شـیعری (حەقـی)یە، مـاوەیەك قـازیی بەغـدابووە، پاشان کراوەتە سەرۆك لیژنەی دارالخیری پاشـایی لە ئەسـتەنبوڵ، پاشـان بـۆتە قـازیی ناوچەی دیاربەکر. لە ساڵی ١٩١٥ کرایە شێخ الاسـلام، دەگـوترێ زۆر جـار حـاجی قادری کۆیی میوانی بووە. لە ساڵی ١٩٢٣ کە حکومەتی عێراقی دامەزرا دەگەڕێتەوە بەغدا و بووە یەکەم وەزیری ئەوقاف. لە سـاڵی ١٩٣١ کـۆچی دوایـی کـردووە و لە گۆڕستانی گەیلانی لە بەغدا نێژراوە.

## عولەما و سیاسەتی ڕاست!

یوسف[١] ئەگەر لە ماڵی وەزیری گەورە نەبا، تەدبیری مولکی بۆ مویەسسەر نەدەبوو. لەلای باوکی با، موحیببەتی باوکی، ئەیکردە عەتەڵە و بێ عەمەل، لەلای کاروانچیان با بالکلی زایع دەبوو. مەوهوبی موکتەسەبی ڕێك نەدەکەوت. سبحان الله حەتتا لە عولەمایانی ئێمەش ئەو تەماسی لەگەڵ سیاسەتی ڕاست و ئیدارەی دەوڵەت بووبێ، گەلێ فەرقی هەیە لەگەڵ ئەوانی دووربووین، خصوص گۆشەنشینی لادێیان. کەسێ تەئویلی واقیعی بە خەبەری نەزانێ، تەعبیری حەوادیسی خەونیش نازانێ.

موسا ئەگەر لە ماڵی فیرعەونی بەخێو نەکرابا، نەدەبووە ئەو مەردە جەبباره، قوی الجنان، شدید القوی. .. بەڵێ ئەمری ئەو (کن فیکون)ە، ئەمما کاری بە تەدبیر و تەیسیری ئەسبابە، وە ئەمری یوسفیش ئەمرێکە، کارێکە لە کارەکانی ئەو. تەماشاکەن یوسفی لەناو بیر و چاڵ هێنایە سەر کورسی ئیدارەی میصر. ناپلیۆن چ بوو؟ بووە چی؟ چۆن بووێ؟ تەماشای تەئریخی بکەن، ئینسان دەهشەت ئەگرێ! وە هەروەها مستەفا کەمال ئەتاتورك و ڕەزا شای پەهلەوی[٢].

٢٣٠/٤

## ڕەفیق!

بەندەی حەقیر لەیادمە پێش دە ساڵی لەناو منداڵان خۆم ئەگرت بە بەعزێ حەڕەکاتی ناموناسیب بە خۆم ئەگوت: من وەکی وانە نیم،

---

(١) مەبەست یوسف پێغەمبەرە.

(٢) ڕەزا شای پەهلەوی کوڕی عەباس عەلی خان (١٨٧٨-١٩٤٤ز) دامەزرێنەری دەوڵەتی پەهلەوی بووە و شیعەیەکی دوازدەئیمامی بووە، لەنێوان ساڵانی ١٩٢٥ تا ١٩٤١ حوکمی کردووە و دوایین شای قاجاری لە دیسەمبەری ١٩٢٥ لەسەر دەستەڵات لاداوە و خۆی جێگای گرتوونەوە.

کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵلام، نەتەوەی مەلا عەبدولرەحمان جەلیم، ئەوانە لەمن ناوەشێتەوە. لە دەیە بەو لایەوە گەلێ کارم تەرك ئەکرد ئەمگوت: ئینشائەڵلا کە بوومە مەلا خوتبەم بۆ مسوڵمانان خوێندەوە، وەعزم بۆ دان، ئەو وەقتە ئەبێ چیم پێ بڵێن؟ خۆ لە فکری نەمایە خۆی چیکرد، وە ئێستاش چی ئەڵێ! ئاوا بووین لە ئەووەڵی نەشئەت، بەڵام جەڕڕی جیوار تێکی دا، ڕەفیقی سوئ گەلێ خراپە! تەماشای خاتم الرسل بکەن لە ئاخیر نەفەسی ئەیفەرموو: (الرفیق الاعلی الرفیق الاعلی).
٢٣٣/٤

## مەکری ژنان!

لە فاکهة الخلفاء[1] حیکایەتێ ئەکا دائیر بە مەکری ژنان. خولاصە:

زاتێ ئەدیب و لەبیب خەریك ئەبێ شار بە شار، دێ بە دێ، ئەگەڕێ مەکری ژنان ئەنوسێتەوە. ڕۆێ لە ڕۆژان ئێوارە، ڕۆژ لە زەردان لە پەلەکۆیان ڕێی ئەکەوێتە ماڵی کوێخوای. خاوەنی ماڵ لەوێ نابێ، ژنەکەی زۆری چاك بەخێر ئەهێنێ، تەعامی باشی بۆ دروست ئەکا. پاش نوێژی عیشا، میرزا کتێبی لە جەلبەندی دێنێتە دەر تەماشای ئەکا.

خانم ئەڵێ: قوربان ئەمە چییە؟

ئەڵێ کتێبێکە لە مەکری ژنان عومرێکە خەریکم گەلێکم لە مەکریان کۆکردیتەوە.

خانم ئەڵێ: کاکە لەوەگەڕێ زل زلەکانی هەڵبژمێردرێ! قەترە لە بەحر ناژمێردردێ؟!

ئەڵێ: خێر تا نیهایەتی عومرم دەستی لێ هەڵناگرم!

ژنەکە سکوت ئەکا، دوای چەند دەقیقە خانم دەست ئەکا بە گرشمە

---

[1] ناوی کتێبەکە (فاکهة الخلفاء ومفاکهة الظرفاء)، کتێبێکە لە شێوەی کلیلە و دمنەیە بەڵام سەجعئامێزە و دانراوی ئیبن عەرەبشا (١٣٨٩-١٤٥٠ز)یە کە ئەدیب و مێژوونووس و گەریدەیەکی مسوڵمانە.

و غەنج و دەلال و قسەی بەناز و نووز و ناسك و دڵروبا پەلاران بۆ مەلا، بۆ کاتب، بۆ ئەفەندی ئەهاوێ نەزەری جەلب ئەکا دڵی ئەڕفێنێ. ئەویش بالمقابلە ئەشعاری غەرامی ئەخوێنێتەوە. نیهایەت ئیش لە کینایەت دەرئەچێ ئەکەوێتە بابی صەراحەت، بەڵێ ئەمشەو تا سەحەر بە عەیش و نۆش و مەیل و هەوەس بەسەری ئەبەین! خانم ئەفەندی ئەهێنێتە سەما. لەو وەقتەدا تەق یەکێ لە دەرگە ئەدا، ئامان ئەوە کێیە؟ لاشەك مێردی ئەو ئافرەتەیە.

ئەفەندی مشەووەش ئەبێ چیبکەم؟

سندوقێ لەوێ ئەبێ ئەیخاتە ناو سندوقەکە، دەرگەی قفڵ ئەدا ئەچێ دەرکە لە مێردی ئەکاتەوە دەست لە ملانی ئەبێ، ئامان بۆ وا درەنگ هاتیەوە؟ ئاه ئەگەر ئێستا نەهاتبایەوە عوشرەتێ خۆشم ئەکرد بە کەیف ئەمشەو ڕامئەبوارد!

- مێردە گوتی لەگەڵ کێ؟
- وتی: لەگەڵ مێوانێکی ئەدیب و مەحبوب و لەبیب و شیرین و ناسك و نازدار خەریکی دەستەملان بووین، تۆ لە دەرکەت دا، ئامان کوو وا ئەبێ؟
- ئاگری غەزەبی هاتە جۆش، چی لێهات ئەو میوانە خائینە، بێ ئەمەکە، بۆ کوێ چوو؟
- وتی ئەوا لەناو سندوق دایە. سندوقەکەم لەسەر کلیل دایە.
- کوا کلیل؟
- ئەوەتە.
- ئابدە!
- ها وەربگرە!

مەلا ئەوا ئەلەرزێ دڵەکوتکەی لێیە لە ترسان وەقتە بە خۆی دابمیزێ. پیاوەکە کلیلی لێ وەرئەگرێ، ژنەکە لە هەراو چەپڵە ئەدا: دۆڕاندت، خەی خەی دۆڕاندت، نەتگوت لەبیرمە!

پیاوە سست بوو کلیلی بە عاردیدا دا وتی: دەك بەڵات لێدا لە خۆت و لە مەکرت!

تومەزانە چەڵەمە شکاندیان کردبوو. شتاقیان نەیدۆڕاندبوو. ئەنەهو بەو درۆیە بە نەوعێ ڕقی مێردی هێنایە جۆش، هۆش و گۆشی نەما لە خۆی بێ ئاگاو خەبەر بوو گرەوی لە فکر نەما، کلیلی وەرگرت، نەیگوت لەبیرمە، ژنەکە بە قاقا پێکەنی. ئەفەندی ناو سندوق کەوتە بەحری حیرەت ئەمە چ حیلەیێ بوو؟ ئەمە چ مەکرێ بوو؟

- مێردەکە جلکی گۆڕی چوو بۆ لای قەدەمخانە.

خانم میرزای هێنایەدەر وتی: ئەی سەیدی سەروەر، ئەو مەکرەش بنووسە لەناو دەفتەر.

- وتی: تۆبە حاشا، قەلەم و دەوات ئەشکێنم، کتێبەکە ئەسووتێنم..

فی الحقیقە کەیدی شەیتان نەزەر بە کەیدی ژنان بێ هێزە! ئەگەر نەفسی سوئو ژن نەبا، شەیتان چی پێ ناکرێ، بۆیە کە مەئیوس بوو، دەست بە دامەنی ژنانەوە ئەگرێ.

٢٣٧/٤

## خاکی میصر!

من ئەڵێم خاکی میصر بۆ تۆی لایدە زۆر بە قووەتە، زۆر مونبیتە، کورد و تورك و عەرەب کە لە لاڕا چووینە وێ، چاك هەڵکەوتینە. بووینە ڕیجالێ زۆر عەزیم و ناودارو قیمەتدار. شێری شێران، شێری مەیدان برزو لەبەر ئەو خەفاو و سەرگەردان صلاح الدین ئەیوبی لە نەتەوەی کوردان تیای ژیاوە. حەیاتی ئیسلام و ئیسلامیانی موحافەزە کردیە. فی الحقیقە شێری حەدایقی عیلم شێخ محەمەد عەبدە[1]، بە بڕی

(١) محەمەد عەبدە کوڕی حەسەن کوڕی خەیروڵلا (١٨٤٩-١٩٠٥ز) زانایەکی ئایینی و شەرعزان و موجەددیدێکی میسری بووە و یەکێك لە ڕەمزەکانی بیری نوێکاری فیقهی ئیسلامیە و لە بانگەشەکەرانی چاکسازییە لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا. دوای دیداری لەگەڵ جەمالەددینی ئەفغانی بزوتنەوەیەکی هزریی ئیسلامی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم دامەزراند، بە ئامانجی بووژاندنەوەی ئوممەتی ئیسلامی بە گوێرەی پێویستییەکانی سەردەم. دامەزرێنەری

←

غابە و جەنگلستانی سیاسەت سەعد زەغلول[1] عەیبی یان لە خاکی میصردا ئیزالە کرد.

٢٣٩/٤

## نوشوستی ئیسلام، بەدئەخلاقی بەشەر، زللەتی عیلم و عولەما!

من هەرچەند سەعی دەکەم ببمە موتەفائیل، بەڵام تەوالی ئالام لێم ناگەڕێ. خێرا بۆ لای تەشائومم دەبا لە هەمووی ناخۆشتر وەك برینی کول، بە شتێ کەم زۆر موتەئەسیر دەبم، وە درەنگ زەوالی دەبێ. نوشوستی ئیسلام و بەدئەخلاقی بەشەریش عەلاوە. زللەتی عیلم و عولەما عەلاوەی فەوقەلعەلاوە. ئیتر پەنا بە لای خوای کەریم لە لەزەتی ئاخیرەت مەحرووم نەبین.

٢٤٣/٤

## هەرچەند بە ناو مووەحیدن!

ڕیسالەت بۆ بەشەر پێویستە، بێ ڕەسوولی ئیلاهی، هیدایەتی ڕاستی مومکین نییە. دواکەوتنیان مایەی سەعادەتە. چونکە ئەوی چاك بێ ئەمرمان پێ دەکەن، ئەوی خراپ بێ نەهیمان لێ دەکەن. چونکی بێ مەیل و بێ موحابێتن، خراپە بە چاکە، لێیان ناگۆڕێ. دین بۆ ئینسان وەکو ئەوان دەیڵێن، بووین بالطبع زۆر لازمە. ڕوحی حەیاتی ئیجتماعیە،

---

ڕۆژنامەی العروة الوثقی بووە و دوایی گەڕانەوەی لە پاریس چۆتە بەیرووت و بە نهێنی کۆمەڵەیەکی بە هەمان ناوی ڕۆژنامەکە دامەزراندووە.

(١) سەعد زەغلوول (١٨٥٨-١٩٢٧ز) سەرکردەیەکی میصری و فەرماندەی شۆڕشی ١٩١٩ بووە لە میصر و یەکێك بووە لە سەرکردە مێژووییەکانی ئەو وڵاتە. ماوەیەك سەرۆك وەزیران و ماوەیەکیش سەرۆکی مەجلیسی ئوممە بووە. لەسەر دەستی جەماڵەددینی ئەفغانی و محەمەد عەبدە پێگەیشتووە.

خاصەتەن بێ ڕوو و ڕیا و مەیلی میللی. دینی ئیسلام ئەوەی لە ڕەسوول و کیتابی وەرگیرایە خالص و بێ غەل و غەشە.

لە جیبالی کوردستان سەد هەزار باغ هەبوو، خۆیان و ساحێبیان لە سایەی دین دەژیان. دین سست بوو ئەساری ئیمان بێ هێز بوو، هەموو باغەکان بەرەڵلا بوون، گەلێ ساحێبیان کوژران. ئەوەی دەڵێ عەقل موغنیە لە بەعسەتی ڕوسول، یان زۆر بێ عەقڵە یان زۆر موفسیدە. کوا ئەو عەقڵە عەوام الناس عیقال بکا بیانبەستێتەوە؟ فی الحقیقة دین نیعمەتێکی گەورەیە. بەڵام ئەوەی مەیلی شەقاوەت و فەسادی بێ، یا سیاسیێ مائیلی ئیستیلا بێ، دین بە بەڵا و موصیبەت و نیقمەت دەزانێ. دین سەددی هەوا و هەوەس دەکا.

دەڵێن مانیعی حوڕییەتە! بەڵێ ڕوئەسای ئەدیان دینیان تێکدا، جیهەتی وەحدەتیان کردە مایەی تەفرەقە، ڕێی علومی تەبیعیان بەست، دەرگەی کەرامەتیان کردەوە، هێزیان لە ئوممەت بڕی، دینیان کردە مانعی تەرەقی عیلم. علی الاکثر ڕابیتەیان لە بەینی کائیناتدا پساند، مللیون بوونە دوشمنی دینی و خوونی. هەرچەند بەناو مووەحیدن، ئەمما ئیلاهیان لە حەدد و وەعد بەدەرە.

٢٤٦/٤

## حاکمی سیاسی بەریتانی و من و حەماغا!

دیتمان گرانی قەحطێ هائیل قاتی ئەرزاق چووە دەرەجەیێ نەبیستراو لە سالف الایام. ساڵێ دواییێ بارانی متەوالی بەجێ، دەغل و دانەوێرە زۆر عەجایب هات. ئەوەی بە گوشری و نەگوشری، زۆر چاك و بە بەرەکەت بوو. حەتتا لە مانگی شوبات لە خزمەت مەرحووم حەماغای

گەورە بریانی بەرخمان لەگەڵ حاکمی سیاسی بەریتانی خوارد[1]، لەو جیهەت سالێ گەلێ بە فەیز و ڕیژەو بووا!

٢٥٣/٤

## نەفس!

نەفس دائیما سەوقی ئینسان دەکا، مەیل و حەرەکەی پێ دەدا، سیەما لەو حاڵە و لەو عومر و شەبابە! ئەمری، ئەننەهو ئەمری تەکوینە. ساحێبی تووشی سەییئات دەکا. ئیللا ئەو کەسەی خوا ڕەحمی پێ بکا بەسەر قووەتی قەهری ئەمری تەکوینی جەبری نەفسی خۆی غالب بکات. بە بورهانێ ئیلاهی عیلمی ئەقوا بە عەقڵی مەتین، کونی بکات.

خوای تەعالا غەفوور و ڕەحیمە ئاگای لە فیترەتی عەبد هەیە چ قیوای تێدا داناوە موقتەزایان چییە، لە هەموو کەس چاکتر دەزانێ عوزری عەبد، ئی ئەو لە هەموو کەس زیاتر مەعلومە! ئەحکامی بە لاف و گەزاف نییە، مەگەر خانم لەو بەینە وەك (بنت السماکی بەغدادی) لەسەر دەستی زاتێ وەك شێخ عەلائەدین تۆبەی کردبێ، وە بوویێتە ساحێبی ئەو ئیمانە، وە ئاگاداری لە حاڵی نەفسی ئەممارەی بالسوء پەیدا کردبێ.

٥/٥

---

(١) مەسعوود محەممەدی کوڕی مەلای گەورە لە کتێبی حەمەئاغای گەورەدا دەنووسێ: باوکم دەیگوت حەماغا نەوسن نەبوو، بەڵام حەزی لە خواردنی چەور دەکرد. وەها دەبوو کە بەیەکەوە نانمان بخواردایە دەمدیت بێپەروا کوتە گۆشتی قەڵەو بە بەزەوە دەکاتە پاروو، منیش دەمگوت ئاغا بۆت باش نییە. دەیگوت لێم گەڕێ خوا چی کردبێ هەر ئەوە دەبێ. بابم بۆ خۆی لە دوای زەدەبوونی میعدەی لە جحێلیەوە پارێزی لە خواردنی چەوەر دەکرد، حەماغا بەساڵدا چووبوو بۆیە لێی بەپەرۆش بوو. باوکم دەیگوت لە داوەت و لە سفرەی تازیان کە لەگەڵ حەماغا بەیەکەوە باینایە هەتا دەستی لە خواردن هەڵنەگرتبایە سفرەم بەجێ نەدەهێشت پێی دەگوتم، ئەگەر لەگەڵ تۆدا نان بخۆم تێر دەبم دەنا ئەو منداڵ و پاڵانە وەها زوو دەست هەڵدەگرن پیاو شەرمی بەخۆیدا دێتەوە، دوایش کە دەچنەوە ماڵێ پێدا دێنەوە.

## نەفسی ئینسان!

من گەلێ جار دەڵێم نەفسی ئینسانی بە تەواوی چاك نابێ، ئەمما ئەوەی موەفەق بێ، دەتوانێ کزی بکا. موقابلی عەزم و جەزم بە مەردانەیی بێ دەسەڵات بێ.

٦/٥

## من و مەلا عەبدوڵڵای هەولێری!

فەقێیێ مەلا عەبدوڵڵا ناو هەولێری لە کۆیە دەیخوێند لە تەئریخی (١٣٠٩) هیجری. من منداڵ بووم، مەلا بزر بوو، نەمدیتەوە، تاکو ١٣٥٣ی هیجری کەوتبووە ئەستەمبووڵ لەو تەئریخە هاتەوە کۆیە. هاتە مەدرەسەی من، بە ئەووەل نەزەر ناسیمەوە، ئەو تەعەججوبی لە گۆڕانی من کرد، ئەو وەقتە چۆن بووی؟! ئێستا چۆنی؟! ئەگەر بە خصوصی بۆ زیارەتم نەهاتبایە مەدرەسەی من لە مەقامی خۆم نەمدیبا نەمدەناسیەوە.
دیارە فەرقی هەیە ناسینەوەی منداڵ ئی گەورە، لەگەڵ ناسینەوەی گەورە بۆ منداڵ کە گەورە بووبێ.

٨/٥

## شێخ مەعرووفی هەڵەجە!

شێخ مەعرووفی هەڵەجە هەزار ڕەحمەتی لێ بێ، ساڵی گرانی باراشهێڕ دەچوونە ئاشی وی لە هەڵەجە، ئاوی ئاشەکەی کەم بوو، باراش درەنگ خەلاس دەبوو. ساحێب باراشەکانی بە نان و شیو بەخێو دەکرد تا دەڕۆیشتن، گەلێ لە مزەکەی زیاتر لێ سەرف دەکردن.

٩/٥

## بەهاری ساڵی گرانی!

بەهاری ساڵی گرانی هەزارو سێسەد و سی و شەش (١٣٣٦هـ) بەهاریێ بوو خوڕەم و دلگوشاد، بەهاریێ وا کە لە کۆیە مەشهوورە. بەهاری وا خۆش کەم بووە! کەس تەماشای باغ و داغ و کێو و کەژ و سەر و سەمەن و یاسەمەن و عەرعەر و شمشاد و گوڵ و ڕەیحان بنەفشە و لال و عەباس و سونبول و نێرگز و خاو و گیابەندی نەدەکرد! وەك شانە مێروو بە ڕێی هەیبەسوڵتان و چنارۆك و میرسەید دا دەچوونە ئەودیو بۆ کەنگر. گولە کەنگریێ لە نەزەڕی پاك و پیس هەزار دەستە گوڵی دەهێنا! چاوەزاری چی برای بابم؟! گەلیێ جار ئەموت لە مەولا لە باتی وردە پەرچەم و زوڵفی بەلول، کولمەی ئاڵ و گەردەنی زەردی بە وردە خاڵ، حەیرانان بە کەنگری هەلبلێن، چاکە! لە وەقتی گرانی کیێ بە کیێ هەڵئەکالیێ؟ وابزانم مەقسەدی عالی ئەمە بووە تووشی شەڕ نەبن! میصری بیێ صیحەت و بەرچاوتەنگ بە ڕزق چوونە دەر، تەبیعی دڵ تەنگ دەبوون، خصوص کاروانێك لەسەر یەك دوو جار بیێ و بچیێ لایان زێدە گران بوو! وە بیاندیبان قسەی درشتیان دەکرد، ئەوانیش قبوڵیان نەدەکرد! ئیش تێك دەچوو! ئەولادی یەعقوب نەوەی ئیسحاق و ئیبراهیمی قسەی درشت و سوك قبوڵ ناکەن!

١٣/٥

## هەرچی هەیە بە قەزا و قەدەر عیلاج ناکریێ!

هەرچی هەیە بە قەزا و قەدەر عیلاج ناکریێ! بەلیێ وایە، بەلام تەماشای ئەحواڵی عالەم بکە! ئینگلیز هاتە ولات، تا حوککامی ئینگلیزی لە ولات بوون، کەس کەسی نەدەکوشت، ڕێگری و دزی و سوتان و ژن هەلگرتن نەما! کە ئەوان ڕۆیشتن دەرکەی سەییئات کراوە، پف لە شەمع، بووە شەوەڕەشکە! وای لێهات برا برای خۆی کوشت لەسەر کۆتکە جۆییێ!

بۆیە ئەگەر حکومەت بە شیددەت بوو لەسەر ئەشقیا، شەقاوەت نامێنێ! خواش ئیرادەی سەییئات ناکا. لەو چەندانە ئەتڕافی مەملەکەت وایلێهات کەس لە خۆی ئەمین نەبوو تاکو زاتێ والای خانەدانی عالی نەژاد یەحیا بەگ نەجلی عەبدوڵلا بەگ لە سولالەی ڕەسوول پاشای مامی محەمەد پاشای ڕواندزی[1] مەشهووری ئافاق بە عەدل و داد و حوببی عیلم و تەرویجی عولەما. بە قائیمقامی هاتە کۆیە، چەند کەسێکی بەناوی حوسنی سلوك حەپس کرد و ڕەوانەی لیوای کردن، دونیا ڕاحەت بوو، دزی نەما، ڕێگری فەوتا. ئینشائەڵلا بە دەوامی حوسنی ئیداری، خەرمان و خانوو و پاوان و غابات سووتانیش ئەوساڵ نابێ! دەڵێن چی؟ تەماشای سەیری عالەم بکەن؟ بەڵێ مەلا دەڵێ: هەرچی خوا نەیکا نابێ! ئەمما کە دانەیێ تۆپی ڕووس لە جیبالی ڕەواندز هات و لە شاخی داو تەقیەوە، چەند ئەشخاسی بە گوللە و ساچمە کەرت و پەرت کرد، مەلا هەڵدێ بۆ قوژبنێکی قوول! خوای چی و قەزا و قەدەری چی؟!

١٣/٥

(١) محەممەد پاشا کوڕی مستەفا بەگ کوڕی ئۆغز بەگی گچکە کوڕی ئەحمەد بەگ کوڕی ئۆغز بەگی گەورە کوڕی عەلی بەگ کوڕی سلێمان بەگ کوڕی شاقولی بەگ. لە ساڵی ١١٩٨ك/ ١٧٨٣ز لە ڕواندز لە دایك بووە، دایکی ناوی شازەمان بووە. سەرەتا لە گوندی جۆلەمێرگی دۆڵی ئالانە بوو، دواتر لە ساڵی ١٢٢٩/١٨١٣ز کاروباری میرەتی لە باوکی وەرگرت، لە سەردەمی حوکمداری ئەودا سنووری میرنشینی سۆران زۆر فراوان بوو، بایەخێکی زۆری بە زانست و زانیاری و زانایان دەدا، کارخانەی چەکی دامەزراند و لە ساڵی ١٨١٨ز بانگی سەربەخۆیی میرنشینی سۆرانی ڕاگەیاند و ناوی خۆی نا میری مەنصوور میری سۆران، دواتر هەرێمەکانی هەولێر و دەوروبەی گرت و بابانییەکانی لە کۆیە و ڕانیە دەرکردو هێرشی بۆ سەر میرنشینی بادینان و داسنی و نزیك جەزیرەش برد. دەوڵەتی عوسمانی کە زانی دەسەڵاتەکەی فراوان دەبێ، هەوڵی بێهێزکردنی ئەم میرنشینەی داو سەرەنجام بە چەند هۆکار و فێڵ و تەڵەکەبازییەك میر بانگهێشتی ئەستەنبوڵ دەکرێ و لە گەڕانەوەیدا لە ساڵی ١٢٥٢ك/١٨٣٦ز، لەگەڵ چوار هاوەڵی لە ناوچەی تەڕابزۆن بزرکرا، کەس نازانێ خنکێنراون، یان کوژراون.

## مەحرووم بووین لە قیوای ماددی!

مـوئمینی ڕاسـتی ئەوەتە موتەوەسـیل و موتەوەکیـل بـێ! بنـۆڕیتە قەواعیدی موقەڕەبەی فاطیر، بە شزوز نەخەڵەتێ. ماددیات و مەعنەویات بۆ میللەت بە مەنزیلەی جەسەد و ڕۆح وایە! هەرچەند قووت و ئالات و ئەدەواتی جەبرییەت هەبێ، کە ڕابیتەی ڕوحیە قووەتی مەعنەوییە نەبوو، ئالات چ دەکا؟ بەڵکو دەبێ بە قەزا و بەڵا. یا با قووەتی ئیمان و قەومی هەبێ، بێ ئالات و ئەدەواتی موافیقی وەقت چیت لە دەست دێت؟ بەڵام لە ئێمەیـان گـۆڕی مەحـرووم بـووین لە قیـوای مـاددی، مـع الاسـف مەعنەویاتیشمان چوو! سبحان الله چمان لێ قەومـا؟! چ قەومـێ وای لـێ نەقەومـا! مەغـرووی تەبـیعەت بـووین، کردینیـانە غەلەبەی صـەلیبی، رأی العین غەلەتمان دەردەکەوێ دەست لە غەڵەت هەڵناگرین. ئەوەی دەزانێ بە سەفاهەت مەشغوڵە، ئەوی تر لەسەر حەماقەت مایتەوە.

## چاوپیسی

ئەوجا با بێینە سەر باسی چاوپیسی. ئیصابەتی بالعین، ئینکـاری غەیـرە قابیلە! بوویتە مەشهوورات. چاوپیسـی وا هەیە وەك (سـم السـاعة) بەڵکـو (سم الآنیة) دەیئەنگوێ! ئینسانی مەحبوب یا وڵاغی چاك بە یەك نەزەڕ بە یەك حەڕەکە سەرئەنگرێی دەکـا، ئەگەر نەیکـوژێ، لە مردیـانی ڕاسـت دەکاتەوە.

شەخسێك هەبوو خـوا عـافوی کـا، نەمـاوە گەلـێ کەسـی داغ کـرد. تەعریفـــی شـــتێکی بیســـتبا دوای دەکەوت، تـــا دەیـــدیت، بە تیـــرێ دەیئەنگاوت، وڵاغی چاکی زۆر کوشت، بەعەلەنی پێیان دەگوت، عاری نەدێنا، حەتتا بە بێ عاری خۆی کردە سەیید!

١٦/٥

## مچەی یاقووبی و نان و لۆبیا!

شەخسێ دەنگ گەورە وەك مچەی یاقوبی بە ڕەحمەت بێ، لە کۆلانی کۆیە بانگی دەکرد نان و لۆبیا، لە چیای هەیبە سوڵتانی گوێیان لێبوو.

١٩/٥

## بە منیان دەگوت کاکە!

ئەحفادیش لە زەمانی بابیان وەك بابیان بە باپیری دەڵێن بابە! حەتتا ئەکثەر لە زاری مێیان وەردەگرن بە بابیان دەڵێن کاکە! ئێمە وابووین! ئەوانی لە زەمانی باپیرمان بە وەلەد بووبوون بە حاجی کاکە ئەسعەدیان دەگوت: بابە! بە بابەکانیان دەگوت: کاکە!

ئەو قسمی دوای وەفاتی باپیرم بە وەلەد بووبوون لە زوبانی ئەوانی گەورەوە بە بابیان دەگوت: کاکە! من یەکێ بووم لەوان.

٢٨/٥

## هیچ فرقە نییە خاڵی بێ لە شیرك!

لە بەعزە ڕەسائیلی خۆم عەرزم کردینە، کە هیچ فرقە نییە خاڵی بێ لە شیرك، یا بەعزە مومکیناتێکیان بردینە دەرەجەی واجب الوجود، یا واجب الوجودی دەبەنە ڕێزی بەعزە مومکیناتێك. حەتتا کەم یا زۆر لە فیرەقی ئیسلامیش، لە هەمووی خراپتر موتەصەوویفە و موتەشەییعین.

٣٥/٥

## ڕۆژێ دێ ڕۆژ قووەتی نامێنێ!

ڕۆژ هەرچەند دەوام کا، ڕۆژێ دێ قووەتی نامێنێ، ئەکوژێتەوە، مەنزومەی تێك ئەچێ. حەتتا تا ڕادیۆم کەشف نەکرابوو، گەلێ لە

عولەمای تەبیعەت خەوفیان بوو، لەو نێزیکە ڕۆژ بکوژێتەوە، دنیا تێك بچێ. لاکین بە ڕادیۆم قووەتیان زیاد بوو، مەنزومە دەها دەوام ئەکا.
٤٣/٥

## قوماندان دووبارە لەسەر دەستم مسوڵمان بۆوە!

حەز ئەکەم حیکایەتێ لەو زەمانی کە عەلی حەیدەر والی موصل بووە، عەرزتان بکەم. غروب پاشا قوماندانی جەبهەی ڕەواندز لە حەڕبی عوزما تەشریفی هاتە کۆیە، من ڕەئسەن نەچوومە لای، تا خۆی تەڵەبی کرد چووم. تۆ خۆش و من خۆش، سوئالی کرد، ئوصولی تەدریستان چۆنە؟ وە چ علمێکی ئەخوێنن؟

وتم: ئوصولمان ئینفرادە فەقێ چۆك دائەدا کتێب دادەنێ، بە موحاکەمە دەرس ئەخوێنێ، بە حەلقە نییە.

وتی: ئەمە زۆرباشە، بۆ ئیفادە و ئیستیفادە ئەنفەعە. گەلێ علوم ئەخوێنن صەرف، دووەم نەحوو، سێیەم مەنتیق، چارەم بەلاغە، پێنجەم عەقائید، بەعدەهو قوزموغرافیا، یەعنی عیلمی هەیئەت.

وتی کیهە عیلمی هەیئەت؟

وتم: عیلمی هەیئەت یەك عیلمە، دوو عیلم نییە.

وتی: جانم دووە، یەکی ئیسلامی، یەکی یۆنانی.

وتم: نەخێر، حاشا وا نییە.

وتی: عەرایزم، مەلای ئێمە وا دەڵێن ئەو ئەرزە لەسەر شانی مەلائیکەتێکە، مەلائیکەتەکە، لەسەر بەردێکە، بەردەکە لەسەر گاجوتێکە، گاجوت لەسەر ماسییە.

وتم: حاشا..حاشا، ئەوە قسەی رسول اللە نییە، لە تەرەف کعب الاحبار[1] و (وهب[1]) و سائیری عولەمای ئیسرائیلی، ئەو موزەخرەفاتە،

---

(١) کعب الاحبار لە بنەڕەتدا جوولەکە بووە و پاشان بۆتە مسوڵمان، هەندێکیش دەڵێن کەسایەتییەکی خەیاڵی بووە، ئەوانەی پێیان وایە راستەقینە بووە گوایە شارەزای
←

لەناو عالەمی ئیسلامی پەیا بووە، بە حورمەت بوون، قسەیان موعتەبەر بوو، دوایێ کەلامی وان شکلی حەدیسی نەبەوی وەرگرت، نەختێ بەیانی ئەقسامی حەدیسم بۆ کرد.

وتی: بە شاهید بن، ڕووی کردە قائیمقامی مەرحووم ئەحمەد حلمی ئەمن ئەلئان لەسەر دەستی فلان مسوڵمان بووم. واللە تا حال قەلبەن مسوڵمان نەبووبووم. ئەموت: ئەو قسانە بێ ئەسڵن، دیارە محەمەد چی نەزانیە.

دوایێ وتی: لە حەق قصص الانبیاء، دەڵێی چی؟

وتم: کتێبێکە سەراپا خەرافاتە.

وتی: الله راضی اولسن[۲] محەمەد ئەفەندی. من لە حدودی ئێرانی یەعنی سەردەشت، قصص الانبیاء ناو کتێبێکم دەست کەوت، تەماشام کرد تەحەییور مام، ئان زیادە لە حیکایەتی سلێمان، نەزەرمی جەلب ئەکرد: سولەیمان هەزار ژنی هەبووە، هەموو شەوێ لەگەڵ ئەو هەزار ژنەی جیماعی کردیە، عەجایب ئەمە کوو ئەبی؟ ئەو عەمەلیاتە علی الاقل پێنج دەقیقەی پێ دەوێ، موددە ئەکا پێنج هەزار دەقیقە، شەو و ڕۆژ هەندە نابی، کەوابێ وام تەصویری سولەیمانی ئەکرد، ئالەتی بە دەست گرتیە، لەو کونی دەنێ دەیهێنیتەدەر، لەو کونی دەنێ دەیهێنیتەدەر، (سوخر چقرر، سوخر چقرر).

وتم: ئەوە درۆیە ئیفتیرایە، ئایا ئەو ئیختیلاقە تۆ دەیکەی؟

وتی: چۆن؟

وتم: ئەلئان، لە جەبهەیەکی گچکە قوماندانی، خەیاڵی چشتی وات

---

کتێبی جوولەکان بووە و پاشان بۆتە سەرچاوەیەك بۆ گوتەی ناڕاست و ئیسرائیلییات لەناو مسوڵماناندا.

(۱) وهب کوڕی منبە کوڕی کامل (٦٥٥-٧٣٨ز) یەکێك بووە لە شوێنکەوتووان (تابعین)، بە یەکێك لەو نووسەرە دێرینانە دادەنرێت کە لەبارەی ئیسلامەوە نووسیویانە. زۆر چیرۆکی خەیاڵی و هەڵبەستراوی دەدەنە پاڵ و گوایە شارەزای لە کتێب و نووسراو و زانستی ئەهلی کیتاب و چیرۆك و بەسەرهاتی ئیسرائیلی و هەڵبەستراو هەبووە.

(۲) الله راضی اولسن، دەربڕینێکی تورکییە واتە خودا لێت ڕازی بێ.

دێتە دڵ؟

وتی حاشا حاشا، موستەغرەقی خەیاڵاتی حەڕیم، نازانم عاقیبەتمان چی دەبێ، لە تەهلوکە داین.

وتم: سولەیمان لای ئێمە، هەم ڕەسووڵە، هەم پادشا بووە، قووەی تەشریعی، قووەی ئیجرائی عایدی ئەو بووە. لایە مونتەزیری وەحی، لایە نیگەهداری مولك، لایە ئیجرای ئەحکام، خاصەتەن لە ئیبتیدا و ئەوائیلی تەشکیلی سەڵتەنەتی ئیسرائیلی بووە، دوژمنی زۆر بووە. سولەیمان ئاگای لەو نەوعە عەمەلیاتانەیە؟ زۆر دوورە، درۆیە ئاشکرایە.

وتی: بەڵێ ئەگەر منیش قووەی ئەو نەوعە موحاکەمەم هەبایە، ئەبوومە مەلا محەمەد ئەفەندی. ئەگەر سەفینەی دەوڵەت بگاتە ساحەیێ سەلامەت، ئەمن ئیشم بە توو زۆرە. مع الاسف دەوڵەتی عوسمانی تێك چوو.

ئەوجا بزانین بێ ئیعتیقادی تەبەقەی ڕاقیە، باعیسی مەلای نەزان و جولفە، هەتا کوێ ئەڕوا؟!

٤٤/٥

## قیل و قال!

ئێمە ناشکوری نەبێ، لە مەخلووقاتی ئیلاهی چ ئیستیفادەمان نەکرد. حەتتا بەعزە کتێبی حیکمەتی تەبیعی ئەخوێنین، لە نەزەرییات بەولاوە، ئەویش ئەگەر قیل قیل لێگەڕێ، نەفعی لێ نابینین، لە ترسی کافربوون، ئەوانی لە تەبیعەت نازانن علومی تەبیعەیان حەرام کردبوو. حەتتا لە ئەوائیلی تەحصیلم، زۆر تەنفیریان ئەکردین لە عیلمی هەیئەت و تەبیعەت، لە بەعزە ئەشعاری کوردی خۆم وتیتم:

**مەلای نادان بە عینوانی شەریعەت**

**حەرامی کرد لە تۆ عیلمی تەبیعەت**

**لەبۆیێ هەر لە ئەو عەردە بەدەر کەوت**

**لە زێڕ و زیـو و پـۆلا و پاقـل و نەوت**
**بە کوللی کەوتە ژێر دەسـتی فەرەنگـان**
**چیـا و چـۆلان دەنـۆڕن وەك پلنگـان**
**بیـــانتۆڕێ، چیایـــان چـــۆن ئەکـــۆلّن**
**هەتـا کەی ئێـوە هەر بەمـاڵ بەکـۆلّن؟**

بەڵێ وا هات، وا ڕۆیی، وا دەڕوا، نوری عیلم دونیای ڕووناك کـرد، ئەمما دڵ، دڵی مللیونان لە زوڵومـات و خورافـات و ئیعتیقـاداتی بـاتیڵەدا ماوە. بە (ڕۆنتکین)یش ڕووناك نابێ.

٤٦/٥

## لە ئەحکامی شەرعییە و کەون موتەوەقیفم!

لە ئەزمانی سابیقە بەشەر ئەوەندە مەعلوماتی بە ئەحوالی ئەرز نەبووە. ئەمڕۆ کوڕەی ئەرزی لە دەستی بەححاسان وەکی پرتەقاڵێکە، هەڵیئەدا و ئەیگرێتەوە. ڕسالەت پەنا، سید الکونین، صاحیبی کەوسـەر و سەلسـەبیل، قسەی خیلافی حەق ناکا، قاعیدەیێ ئوصـولییە هەرچـی بەدەرکەوت کە درۆیە، بێ ئەصلە، حەدیسی رسول الله (صلی الله علیـه وسـلم) نیـیە، .... من بڕواییم هەیە بە بوخاری و موسلیم، ئەمما لە ئەحکـامی شـەرعییە، لە ئەحکامی کەون و ئیجاد موتەوەقیفم، علی الاقل ئەبێ تەئویل بکرێ.

٤٧/٥

## ئەگەر بێناموسی ئەوروپایی لێمان گەڕێ!

تەبیعیونی پێشی نازانم، ئەممـا تەبیعیـونی ئەمـڕۆ تەماشـای ئەعمـالی تەبـیعەت ئەکەن، تـا ئیسـتیفادەی لـێ بـکەن، قـووای تەبیعـیە ئەخەنە ژێردەست، بۆیە نییە بە خواو موعینی لە خوای بـزانن. تەماشـای سـەعیان کە، لە ئیصلاحی حەیوانات، نەباتـات، ئەمەرات، بنـۆڕە سێوی ئەمریکـا،

ئەلئان ڕۆژی چوارشەموو ۲۰ی زیلحیججە، ۲۷ی کانونی سانی ڕۆمی، دوودانەم لایە، مانگێ زیاترە لەناو پەنجەرەم دانایە، بۆنی دێ وەك عەتر و عەبیر، هیچ قەیدی نەکردیە، تەعەججوب لە گەورەیی، لە ڕەنگی، لە ساغڵەمی، لە بێ عەیبی ئەکرێ، هەمووی نەتیجەی عیلم و سەعیانە.

دیققەت کە، مەسەلەن لە موتوربە، لە باغێ بە عیلم و عەقڵ بەخێو کرێ چەند فەرقی هەیە؟ حەتتا ئەو دار مێوەی ڕەزبڕی چاك ببڕێ میوەی زۆر باشترە، لەو ڕەزەی ڕەزبڕی ناتەواو تەلقیحی کا. کەسیش ئینکاری خوا ناکا، لاشەك حوکەمای تەبیعەت تا دێ لە دەقایق و ئەسراری تەبیعەت ئاگادارتر ئەبن، وە ئیختیراعاتی چاتر و عەجایبتر ئەکەن. ئەوانە بکەین بە خەصمی قورئان تێئەشکێن، وەکی حەممالی تەورات زاتەن تێشکاین، تێچووین، بەڵێ ئێمە ئەڵێین: ئەو عالەمەی ئەیبینی، مەعمەلە، کارخانەیە، فابریقەیە، تەبیعەت قیوای موسەخەرن، موستەخدەمن، مورەتیب و مودەببیری فابریقە خوایە، (وحدە لا شریك لە)، نە جن، نە مەلیك، نە ئینس، نە عەلی و وەلی، موداخەلەیان نییە.

ئینسانی موتەفەکیر و عاقڵ، ئیستیفادە لە صونعی صەنایعی خۆی ئەکا، ئەو حەشەراتە بۆ ئەشجار و ئەمەرات خراپ بێ، ئەیفەوتێنێ، داری نەخۆشت بۆ تەداوی ئەکا، ئەوا شوبات نێزیکە مێوی سەر داران مەسەلەن لە کۆنە کەڵان پاکژ ئەکاتەوە، تا نوێیە کەڵان دەرکا بەری زۆر باش بێ، خوداش هەر خوایە.

نازانم بۆ تەماشای حەدیسی (لقاح) ی نەخل ناکەن، دەرسێ زۆر باشە بۆ ئێمە، مەهبەتی قورئان، ساحێبی وەحی، ئەفەرموێ (أنتم أعلم بأمور دنیاکم) تەمامی جەوازاتی ئەشعەری با هەر لە جێی خۆی بێ، هەر کەسێ ئەدنا عەقڵی هەبێ فەرقی ئەسەری عیلم و قودرەت ئەکا. کاری موحکەم و مونتەزەم بە دیققەت، بێ عیلمی تام و قودرەتی کامڵ، نابێ.

ئەوی بۆ ئێمە لازم بی، بە کەڵکمان بشێ خوایە، شەریعەتە، تەبیعەتە، بە ئیمان بە وەحدانیەتی خوا، لە ئەسارەتی موتڵەق نەجاتمان دەبێ، بە ئیتباعی شەریعەتی خالص و موتەهەڕە، نیزامی حەیاتمان چاك ئەبێ، بە ئیستیخدامی تەبیعەت، نەفعی زۆر لە مەخلوقاتی خوا ئەبینین، ئەسرار دەردەخەین ئیختیراع زۆر دەکەین. بە سەییارە و تەییارە ئەچین بۆ حەج،

بۆ زیارەتی ڕەسوولی کیبریا، لە کۆڵ حندلحۆی حوشتر ئەبینەوە. حاصڵی بە عیلم و عەمەل تەرەقی ئەکەین، ئەگەر بێ ناموسی ئەوروپایی لێمان گەڕێ، بە شەڕەف ئەژین، بە شەڕەف ئەمرین، بە شەڕەف زیندی ئەبینەوە، والسلام.

٥٠/٥

## مەلای مەشهوور!

مەلای مەشهوور چووە باغێ میوەی خوارد، بەعزێکی کردە باغەڵی، باغەوان هاتەوە وتی: مەلا بۆ هاتیە ناو باغی من؟

وتی: با هێنامی.

وتی: ئەدی ئەو میوە چییە لە باغەڵت؟

وتی: نازانم، منیش موتەحەییرم، کوو کەوتیە ناو باغەڵم؟

کەسێ خۆی گەوج نەکا، دیارە. ئینسان خۆی ئایەتێکە لە فەوقی هەموو ئایات، نازانم خۆی بۆ وا سووك و چرووك کرد؟ سوجدە بۆ کەر ئەبا، سەرامەدی عیلمی تەبیعەت بۆ جغارەیێ سەد تەمەننا ئەکێشی. عولەمای تەبیعی و ئیلاهی زۆر نادیرە، یا لەبەر ئیلاهـ ئینکاری تەبیعەت، یا لەبەر تەبیعەت ئینکاری خوا ئەکا، حەق وایە کە عەرز ئەکەم صانع بێ تەبیعەت چی پێ ناکرێ، تەبیعەت بێ صانع وجودی نابێ چی لێ دروست ناکرێ، وە غەیری زاتی ئەقدەسی واجب الوجود هیچ مەوجودێ لە قەواعیدی تەبیعەت دەرناچێ. داخلی تەبیعیاتە، مافوق الطبیعەت بەس خوایە ئیشی خواش بە قودرەتێکی لەژێر ئیدارەی عیلمێ عەمەلی موحیت بە وردو درشت، مەصنوعاتی کاری خوای نەتیجەیە کەیفی نییە.

٥٤/٥

## پزیشکی!

ئەلئان حوکەمای عەصر خەریکی طبی واقین، ئەویان لا باشترە، ئەگەر تۆی پێشکە و مێش و کێژ و ئەسپ و مشك نەمێنێ، ئینسان لە گەلێ ئەمرازی فاتیکە حیفز ئەبێ. وە هەروەها دکتۆر میقرۆبی وەبا و تاعوون زۆرن، عبادالله لەو بەڵایانەش مەحفوز دەبن. ڕۆژێ لە بەغدا، فەقێ عەبدوڵلا و تاهیری موعتەمەدم بردنە لای شوکری محەمەد موعایەنەی کردین، وتی: زۆر موصیب بووی، ئەمڕۆ ئەوانەت هێنا، ئا یەك دوو خوطوەیان مابوو (معاذ الله) تووشی عیللەتی خراپ بن.

تەرتیبێکی بۆ دانان، (له الحمد) تەحەسسونی حاڵیان بوو. ئەگەر چەند قرنێ پێش ئێستا بەشەر ئینتیباهی ئێستای هەبا، گەلێ فەرقی ئەکرد. ئەمما سەبەب بە ئیعتیقاداتی فاسیدە، عیلەل و ئەمراض ئەوەندە زۆر بووە تەعەمومی کردیە، بەسەر یەکدا هاتینە، چارەی زۆر موشکیل بووە.

٥٥/٥

## غۆستاف لۆبۆن!

غۆستاف لۆبۆن ی فەیلەسوفی فەڕەنسی، تەئلیفێکی هەیە (سر تطور الامم) کەسێ تەماشای کا ئەڵێ ئەو کتێبە تەفسیری ئەو ئایەتەیە، بەڵکو تەئریخی تەشەکولی ئەقوام، چ قەبائیل، چ دوەل، بە نەشئەتیان و نمایان و تەوقیفیان و انحطاط و ئینقرازیان شەرح و ئیزاحی ئەو ئایەتەیە. یاخود ئەو ئایەتە، موجمەلی ئەو تەفصیلاتەیە. سبحان الله مسوڵمانان بۆ ئیهمالی ئەو ئایەتە عەزیمەیان کرد؟ بۆ ئەمڕۆ لە حاڵی خۆیان نافکرن؟ پاش ئەو تەعالییە، ئەسبابی ئەو ئینحیتاتە چییە؟ قەتعی عەلایق لە بەینی کائیناتی (ئەشاعیران) تەقیید بە سوننەتی سەلەفیان ئیجابی اصلح علی اللە موعتەزیلییان، لاف و گەزافی سۆفییان، سەلبی قودرەت و قووەتی لێ کردین، دەست و پا بەستراو بووین، بە ئومێدی کەڕامەتی قووەی قودسی اولیاء الله یان لە ئەوجی عیزەت، کەوتینە حضیضی زیللەت. قووەیی عەقڵمان کەم بوو، وە تا عەقل زەعیفتر بێ، درۆی زلتر و موعزەمتر ئەکا، عەکسی مەعیدە.

موخالەفەی هەر چوار ئایەتی خوامان کرد، بە ئیعتیماد لەسەر ئەم و ئەو، ئیتیکال لەسەر نەسەب، گێڕانی خوا بە حائل، لە بەینی خۆمان و دڵمان ڕسوخی ئیعتیقاداتی باتیڵە، ئیستیحکامی ئەخلاقی ڕەزیلە ئێمەی خستە هاویە. هەر کەس هەر فیرقە، دوای ئیمامێ کەوتینە، تەمەسسوکیان بە دامێنی وەلییەکی کردیە، خۆیان لەسەر حەقن، ئیتر لەسەر باتیڵن، گشتی (فی النار)ن.

خولاسە ئوممەت وا بڵاوبوویتەوە، قابیلیەتی گردبوونەوەی نەمایە، ئەفکار و ئامال و مەشاریب و مەزاهیب و مەبادیئو مەسالیك سەراپا، موختەلیف و ناڕێك و نالێك، عەداوەتی یەك، دینی و دونیەوی، خەصامی ئەجانیبی لە فکر بردینەوە. ئێستاش ئەڵێن (إختلاف أمتی رحمة)؟

یەکێ لە سەرامەندانی دزەیی لێمی پرسی: ئێمە لەم زیللەتە نەجاتمان ئەبێ؟

وتم: بەڵێ، ئەمما بە شەرت:

ئەووەلەن: جەمعێ لە ڕیجالی سیاسیی (تام السیاسة).

ثانیەن: جەمعێ لە مەلایانی حوففازی ڕوحی ئیسلامەتی پاش تەصفیە لە ئەخلات و مەوادی ڕیدیە.

سالیسەن: جەمعێ موختەریع، خاصەتەن لە ئەسلەحەدا، جەمعێ دەست لەو ئەرزە گیرکەن، مەحصولی نەباتی و مەعدەنی بەدەست خەن، ئەو خەزائینە ئەو دەفائینە تەبیعیە بە خۆڕایی نەڕوا، نەکەوێتە دەست ئەجانیب، وە ئیللا دەها تەدەننی ئەکەین.

وتی: فی الحقیقە وایە، ئەمما ئەو شەرتە بە ئێمە ناکرێ. یەعنی نایکەین.

خوایە ئەمە چی بوو؟ ئوممەت ساحێبی ئەو ئایاتە بن، چۆن وا سەرەو بن ئەبن؟ لە هەمووی بەلاتر، تەعمیمی ئیرادەیە (من حیث لا یتغیر)، وەك ئایەتی (واذا اراد اللە بقوم سوءا) عامەمە وەك زیللەتی ئەسارەتی ئیستیعماری، وە بەردەستی ئەجانیب، کە لەو وەقتیشدا عەرەب گوفتاری بوون، قسمێ ژێر دەستی، قسمێ ژێر چەپەڵۆکی ئێران، بۆیە (سوئی) فەرمووە، تەخصیص نییە، حاجەت بە تەقدیری موقابیلی نییە، وە موراد لە

(سوئـ) گوناهـ ئیە، تا بڵێین ئەویش بە خەلقی خوایە مەڕەددی نییە.

بۆ قەومی ئیش تێکـدەر (فـلا مـرد لە) چـونکی ڕاددی نیـیە، تـا ڕەد کریێ. ئەوەی ئەو قەومە ئومێدیان پێیەتی هیچە، (مەدەد یا فلان السنوسی، یا گەیلانی، یا تۆپی کەلە، یا گەنجی عوسمان) فەریادرەس نییە، لات و عوززا و مەنات و ئەساف و نائیلە و مەروە و صەفا؟ (وما لهـم مـن دونه مـن وال) غەیـری ئەو کەس نیـیە دەفعـی ئەو خراپەیـان لەسـەر بکـات، ئەویش بەیانی فەرمووە، بە تەغییری فی الانفس نەبێ چارە ناکرێ.

قەومـی بولغـار و صـرب و قەرەداغ، ڕۆمانیـا، یۆنـان، چەنـد مـوددە کەوتنە ژێر دەستی حکومەتی عوسمانی، دوایە وردە وردە سەعیان کرد، پیاویان لێ هەڵکەوت، ئیتیفاقیان ئیستیقلالیەتیان ئیعادە کـردەوە، ئـاخیری وای لێهـات حکـومەتی عوسـمانیان مەغلـووب کـرد. ڕووس بـووە ئەو ڕووسە کە زەلزەلەی خستە ئەرز، مەشـریق و مەغریـب لێـی ئەترسـا، وە لێی ئەترسـێ، جـزیەی ئەدا بە حکـومەتی عوسـمانی، بە واسـیتەی خـانی تاتــار ئەگەیشــتە خەزێــنەی دەوڵەت. کەس لە زادەکــانی خــانەدانی حوکمداری، موشەڕڕەف بووبا بە عینوانی غـولامی خـان لەسـەر هەمـوو عروسسیات ئیفتیخـاری ئەکـرد تەدابیـری شـێتە، کە پێـی ئەڵـێن ( دەللـی بەترۆس) ڕووسی گەیاندە چ دەرەجەیەك، کە تاتار و عوسـمانی هێنـا چ دەرکەیێ؟

عەرزم کردن سەیری عالەم تەفسیری ئەو نەوعە ئایەتە، خوا ئەزانی بە غەیری تەدبیری ئیلاهی، کەوا بۆی بەیـان کـردینە، چـارەیێ نیـیە. دڵ لە غەلل و غەش پـاك کەن، غـایەیەك بـێ، تەشـەببوس بە ئەسـباب بکـرێ، ئەمڕۆ نا سبەی بە تەواوی بەسەر ئەکەون.

ئەمڕۆ لەسەر ئەو هەموو حاڵە، شـیعە هەیە شیعەیە، خەریکـی عەزای حوسـێن و زیـارەتی مەراقیــدە، وەهــابی هەر وەهــابییە، بە سـوننەت و بیدعەت، دەست و پای مسوڵمانان ئەبەستێ، سۆفییە هەر سۆفیە، شـێخ وا و کەرامەت وا، قوتبی فەرد هەر نـازانم چـی؟ لەوحەی مەحفـوز ئەوەی تیایە، ئەمەی تیایە، شێخ تەمامی ئەزانی، ماشاء الله مـوقەددەراتی ئیلاهـی لە لەوح ئەبینی، هەردوو چاویان کوێر بێ، شتێکی وایان نەدی، بۆ ئـێمە باش بێ، ئیسلامەتی خێری لێ ببینیێ. ئەو هەموو ئەسبابە ئەبینن، ئینکاری

ئەسباب ئەکەن، تا ئەو چەندە بە سواری حوشتر ئەچوونە حەج، بە چ مەرارەتێ، ئێستا بە سەییارە ئەچن، لە بەغدا تا مەدینە بە شەش ڕۆژ.

باری ئیلاهی! بە تۆپ و تەییارە شتی حەقیان ناچێتە دەماغ، بە سووك و ئاسانی ئەو هەموو خورافاتە چۆن بە دەماغیانەوە ئەنووسێ؟ لێی نابێتەوە. ڕەببی توویان کردە حائیل لە بەینی خۆ و قەلبیان، ئەولیایان کردە حائیل لە بەینی توو و خۆیان. بۆ هەوا و هەوەس ئەسڵەن ئاگایان لە باسی ئیرادە نییە، بۆ ئیشی چاکە، ئەبێ خوا ئیرادە بکا بە نەسیبمان بێ، ئەوی خوا حەزنەکا نابێ. ئەبێ ئەمڕۆ خوا حەزکا بە ئیستیعلای کوفر و زەڵاڵ لەسەر ئیمان و هیدایەت؟!

٥٦/٥

## فەرقی نظاران لەگەڵ نوققالان!

وەرن بۆ خاتری خوا، شتەکتان عەرز ئەکەم، گوێی دەنێ تا بزانن، فەرقی نظاران لەگەڵ نوققالان چەند زۆرە. ئەو برووسکە چییە [1]؟ لە چییە؟ ئیرائەی بۆ ئێمە چ فائیدەی هەیە؟ خوا ئەزانێ چەند هەزار ساڵە خوا ئەو برووسکەیە نیشانی ئینسان ئەدا، لەبەر ئەوهام و خەیاڵ و نەقلی نوققالان، ئێمە ڕێمان پێ نەبرد، لەبەر نەڕەنەڕی زەنگەسوورە و ئیمامی عەلی گوێیان لە هیچ نەبوو. حوکەمای قەدیم لەبەر زەیقی عەناصیر ڕێیان دەرنەکرد، لە بەینی دوخان و بوخار مانەوە، تەمیان بەسەردا هات! تا حوکەمای جەدید خۆفیان پەیا بوو، بە سوپەری صاعیقە مودافەعەیان کرد، ئومێدیان پێ بوو، بە ماکینەی (ئەرتریك) ئیستیفادەیان لێ کرد. بە ئیستیخدامی زیای کەهرەبائی یەدی بەیزای خۆیان نواند، شەویان ڕووناك کرد. ئیتر نازانم موفەسسیرەکانی پێشی چی ئەڵێن؟ قورئان لە هەموو ئەعصار ئەخوێندرێتەوە بۆ هەموومان موعجیزەیە، حەصری نەزەر لە قیل و قال مەحروممان ئەکا لە ئایەتی قورئان و ئایەتی ئەکوان..

٥٩/٥

---

(١) مەبەستی ئایەتی (هو الذي يريكم البرق خوفا وطمعا/ الرعد)

## شێخ وتی: بباری، باری!

حەقــقەن تەبــیعەت بــۆ کەس ڕام نــابێ، موختەریعەکــان لەلایە سەرئەکەون، لە گەلێ لا ئەکەونە ژێـر تەبیعەت. صـاعیقەی تەبـیعەت لە غەفڵەتا لێیان ئەدا، ئەیانسووتێنی، مەحوویان ئەکاتەوە. شێخ وتـی: ببـارێ! باری. مەبارە! نەباری. هەورەکە بە ئەمری پارچە پارچە ئەبێ.

بـا وجـودی نـازانن ئینشـای سـەحب و بـاران و بروسـکە و ڕەعـد و صاعیقە، چ تێکە و لێکە و قووەت و قـودرەت و عـیلم و دیققەتـی پـێ ئەوێ! خودایە قووەت و قودرەت و عیلم و حیلەیی عیلمی خۆی ئەزانێ چی ئەکا. ئەمما قسەی سەر زوبانی بالطبع لای ئێمە زۆر سەهلە. ئەمـری (کن فکان)ی کە شەئنێکە لە شـئونی ڕەببـانی نـابێتە ئـی کەس، نـادرێتە کەس، بە کەس نادرێ. ئەی واهـ چ بلێم لە حەق ئەوانەی نافذ الکلمەن، مسوڵمانیان پێ هەڵخەڵەتان، سیعەتی قـودرەتی ئیلاهیـان کـردە مـوجیبی جەهل و زەلال.

زسـتانی پـێش ئیعلانـی حەڕبـی عـالەمی لە موصـل بـووم، ڕۆژێ لە خزمەت جەننەت مەکان شـێخ سـەلیمی بـامەڕنی چـووینە گەڕان، لەلای بـاب السـنجار تووشـی دەبـۆی میـری بـووین، دارێ بلـند لەسـەر بـانی چەقانـدرابوو، شـتێکی لەسـەر بـوو، ئەدرەوشـایەوە، وەك ئەڵمـاس، شـێخ فەرمووی: بابۆ ئەوە چییە؟

وتم: سۆپەری صاعیقەیە.

وتی: بابۆ ئەوە چەوا دەبێ؟

وتم: لە باروتخانەی دەوڵەتان، مەوادی نارییە زۆرە، ئەگەر بروسکە لێیدا، مەملەکەت وێـران ئەبـێ، ئەو مـاددەیە بروسـکە جەلـب ئەکـا، بەو تێلانە ئەچێـتە خـوار، ئەکەونە نـاو بیرەکـانی، کە سـەری تیلەکـانی تیـایە ئاگرەکە ئەکوژێنیتەوە.

فەرمووی: بابۆ ئەمە شتی زۆرباشە، ژ بۆ لنك مە نییە؟

وتم: خەتای ئێوەیە، ئێوە خەتمە ئەکەن، ئەفەرموون: چاوان بچـوقێنن،

(ألم نشرح لك)ەی شەریف و سووڕەی ئیخلاص بخوێنن، صەلاواتان لێ بدەن، کافییە.

بەو حالەش ئەو نەوعە بەدائیعە ئیختیراع ناکرێ.

٦١/٥

## حاجی و کۆیە!

سبەینان سێبەر درێژە، وردە وردە کورت ئەبێ، تا وەقتی ئیستیوا، دوایی وردە وردە درێژ ئەبێتەوە خۆشی وەقت، بەینی مەغریب و عەسرە، خاسەتەن ئێوارەی چنارۆك لە هاوین. حەققەن نەشئەی هەیە، حاجی قادر لە حەققی کۆیە ئەڵێ:

**لە بەینـــی بـــاواجی و هەیبەســـوڵتان**
**نســـێی ئێـــوارە و ســـایەی ســـبەینان**
**لەلام ضلی هومایە و چەتری سەنجەر**
**چ جایە سایەیی سەروی سنەوبەر**[1]

٦٣/٥

## میفتاحی ئەوانەش نازانم چییە؟!

سبحان الله لەو وڵاتی ترێ ئەگوشـن، ئاوەکەی لە مەنـجەڵ ئەکەن، ئاگری ئەدەنە بەر، جۆش ئەخوا و، گڵێکی سپیان دۆزیوەتەوە، نەختەکی ئەخەنە ناو مانجەڵەکە، کەفـی زفـر هەڵـئەدا. هەرچەنـد خلـت و مەوادی غەیـرە سـوککەری هەیە، فڕێـی ئەدا، ئەو زفـرە بە ئەتڕافـی مەنـجەڵەکە

(١) -لە دیوانی حاجی قادردا بەم شێوەیە هاتووە:
لە مابەینی کەکۆن و هەیبەسوڵتان
نسێی ئێوارە و سایەی سبەینان
لەلام ضیللی هومایە چەتری سەنبەر
چ جایێ سێبەری سەر و سنەوبەر.
دیوان/٢٤٧

ئەنووسێ، ڕەق ئەبێ وەك تەختە ئاسنێ تەنك، دوایێ مەنجەڵەکە دائەگرن، ئەنیشێ، صاف ئەبێ، پێی ئەڵێن زێراو. باز ئەیکوڵێنن، تا دێتە قیوام، ئەبێتە دۆشاو. هەرچەند خەیاڵ ئەکەم میفتاحێ نادۆزمەوەوە، شیلاوکی ترێ لەگەڵ ئەو گڵە و سپییە چۆن مولاقاتیان بووە، ئەو ئەسەرەیان لێ دیتییە؟! وە کەذا کاردی گیایەکە، کە هیچ زیروح نایخوا، ئینسان بیهاوێتە ناو زاری ئاگری تێ بەرئەدا، کوویان زانیە، بە سماق بیکوژن، شیوی پێ لێنێن؟ هەروەها پنجی لۆکە و ماست و ئەسپۆن، ئەکوتن، ئێکتر ئەکوژن، یەك ئەگرن، جەرکە و کوپەی پێ پنج ئەکەن، زۆر عەجایب ئەیگرێ میفتاحی ئەوانەش نازانم چییە؟!

٦٦/٥

## عالەمی حەیات زۆر لە ئیزتیراب دایە!

تەماشای حەیوانات ئەکەی، مەڕ و بزن و مریشك و سائیری حەیواناتی نافیعە، با وجودی، ڕۆژێ بە ملیۆن لێی ئەفەوتێ، هەر زیاد ئەکا. گورگ و بەراز لە وڵاتی ئێمە پڵنگ‌و باز و صەقەر و سائیری حەیواناتی موضیرە، با وجودی ناخورێن، هەر کەم ئەبن. ئەمما ئەشجار و نەباتات وا نییە، دارو باری بە چقڵ و درك و بێ بەری نافیع، گیا و گۆڵی بێ کەڵك دائیما تۆغیان ئەکەن. لەسەر دار و گیای چاك. داری نافیعیش خزمەتی نەکەی بەری باشی نابێ، مێوێ لێی گەڕێی بەری قڵپۆك ئەبێ. لە ئەکسەری شت، تەبیعەت لە چاکی نافکرێ، زۆر و بۆر.

لە دوو بست عارد دار و بەڕوو، هەنجیرە سوورکە و قەسقان و بەڵالوك، لە کۆنە ڕەزی من شین بوون، مێوێکیش چوویتە سەریان. هەنار و هەنجیر و سێو و قەیسی، وردە وردە بەرەکانیان لە عاردی وەرئەکەن. دارێ کە ئەبێتە گەبڵە (گەبەڵ)ەکانی نەبڕی باش نابێ، بە هیچ دەرئەچێ. حاصڵی تێکرا بۆ بەقائی نەوع تێئەکۆشن، بەقائی شەخس و جەودەتی بەر و، زێدە نەفعی تەماشا ناکەن. نازانم بۆ وایە حەشەراتی هیچ و پووچ لەسەر دار و حەیوانات و ئینسان موسەلەتن؟ ئەنواعی میقرۆبی چ ئەکا، چ ئافاتێکە، بۆ ئینسان وما ینفع الانسان؟

عالەمی حەیات زۆر لە ئیزتیراب دایە. جەنابی حەق، کەرەم ئەکا، ئەوەی ئەنفەعە بمێنێ، ئەوەی موزیرڕی لا یصلحە بفەوتێ، مع هذا ئینسانیش ئەبێ سەعی بکا.

ئینسان بۆ ئیصلاحی حەیات موتەممیمە، لە زەمانی ڕەسوول حەق غەلەبەی کرد، باتیڵ زهووقی بوو، نەقد و زیف بە دەرکەوت، لاکین بە مرووری ئەییام ئیش تێك چوو، عالەم وا قەلب بوو، هەزار جار جۆش دەی لە خڵت و غەش بەو لاوە چی تر نییە. پاش دەعوەتی بەهائی و قادیانی بە جارێ دینی حەق نشوستی کرد، نەقد نەما ڕەواج لەسەر (نۆت)، سککەی مەغشوش و پاقڵ و نیکلە.

٦٦/٥

## دوعای ژنە کۆییان!

ژنە کۆیی حەقیقەتەن، دوعایە زۆر چاك بۆ خۆیان ئەکەن : یاخوا ئاخیرت خێر بێ.

٦٩/٥

## مەلیك حوسێن!

ئەوی عەهدی خوای بشکێنێ، عەهدی بەشەری چۆن بەجێ دێنێ؟ ئەئیممەتولکوفر و عەهد؟ تەماشای سیاسیونی عەصر کەن، بە فەخرەوە ئەڵێن رەجولی سیاسی لدی الایجاب عهد و میثاق، سوێند و ناموس و شەرەف و وەفا و دۆستی ئەهاوێتە ژێر پای.

واقیعەن وان. لەو جیهەتە مسوڵمانان زۆر زەرەریان لێ دیتن. ئەمما ئاگایان لە قورئان نەبووە. حەتتا مەلیك حوسێن بە ڕەحمەتی لە بەعزە ئیعاناتی وا بەدەر ئەکەوت کە ئاگای لە ئایەتی (قاتلوا ائمة الکفار) نەبووە.

٦٩/٥

## زەمانی جاهیلییەت نسبەت بە ئێستا زەمانی سەعادەت حیسابە!

کەسێ تەماشای عالەم کا، لە هیچ قەرنێ بەشەر وا بێ ئەخلاق و تەربییە نەبووە، زەمانی جاهیلییەت نسبەت بە ئێستا زەمانی سەعادەت حیسابە، عالەمی ئیسلامییەت حالاش بە عەهد و پەیمانی ئەوروپاییان هەڵئەخەڵەتێن، بە ئیفسادیان عەداوەتی یەك ئەکەن، یا گەلێکیان ڕوویان لە دین پێ وەرگێڕاین، سەییداتی عاهیرات، ڕاقیصاتی دانیساتی، قومار و موسکیرات، شەرەفی دین و دونیای بردین. حاصڵی وەکی لە وەقتی خۆی **مەعەڕی** وتیتی ئێستا بەڕاستی وایە ئینسان دوو فرقەیە: عاقڵی زەندیق، موتەدەیینی ئەحمەق. کە نەختێ عیلمیان خوێند لە مەکاتبی ڕەسمییە، ئەبن بە **داروین** دیانەت و شەریعەت لایان نامێنێ. ئەگەر ماقووڵ بوون و بوون بە وەزیفەدار، ئەبن بە ئەتباعی هەواو هەوەس، ئەوانەی ئەهێنینەوە، علی الاکثر بەناوی (طریق) لە ئیسلامییەت دەرئەچن، سەد خۆزی بەوانی دی. لەسەر ئەو هەموو ڕەزالەتە، حالەن نیزاعی سوننی و شیعە، سوننی و موعتەزیلە، سەلەفی و خەلەفی، حوکم فەرمایە. قیودی سوننەتی ئیخوانیش نازانم چی لێ دێ؟ ئەزانم ئەشکێ ئەگەر مەلایانی بە حیکمەت و بەهێزەکان، نەکەونە فرقەیی سیاسەت و ئیدارەی مولك و سەڵتەنەت و عیبادات نەکەن ئوممەت خۆی قیودەکە ئەشکێنێ وە زۆر خراپ ئەبێ.

مەداری ئەو هەموو سەییئاتە ئەمڕۆ، ئەگەر تێفکری، تەبەسسوطی فی المعیشەتە، وا ئەزانن وەك ئەوانی پێشی ئەگەر لەسەر قاعیدەی دین بمێنن، بێ ڕزق ئەبن، مع أنە ئەو فکرە زۆر غەڵەتە.

٧٠/٥

## وەیل بۆ ڕوئەسایانە!

بەڵێ (الويل كل الويل) بۆ ڕوئەسایانە، ئەگەر عولەمای مەزاهیب و طوروق لێرە بفکرن، ئەبێ زۆر بترسن، خاصەتەن ئەوانەی ڕابیتەی ئوخووەتی ئیسلامیان پساند. ئەگەر تەماشای فەصل و وەصلی بەعزێ ڕوئەسای کەی، سەرسام ئەبێ، تەئسیری قودرەتی عەبد ئینکار ئەکەن وە ئەڵێن: ئەجینە قادرن، خۆیان متشکل ئەکەن بە ئەشکالی موختەلیفە، قەتعی عەلاقە لە بەینی کائینات چۆن ئەکرێ؟ ئیختیلاف کوو ئەبێتە ڕەحمەت؟ ئەگەر وابێ، ئەبێ ئیتیفاقی ئوممەت نیقمەت و غەلەت بێ.

فەصل و وەصلی عیلمی بەلاغە. فەصل وەصل لە بەعزە مەقامی عیلمی و مەعانی وەك (سعد) ئەفەرموێ (يسكب له العبرات) لە مەقامی ئیشتیباهی فەصل و وەصل لە بەعزە کاتدا، ئەبێ ئینسان نووری چاوی بۆ داڕژێنێ. ئەی هاوار تەماشای فەصڵی ئێمە کە، چۆن مەفاصیلی لەبار یەك هێنانە دەر، تەماشای وەصڵی خەلق کە، قەتەعاتی ئەرزیان پێکەوە نووساند بە کەهرەبا و ڕادیۆ.

لە هەولێر گوێم لە قیرائەتی میصری ئەگرت، ئەووەل کەلامێ هاتە گوێم (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ)، وتم: وەڵڵا وایە، ئەمما ئەهلی غەی نایەن بۆ ڕوشد، غەی بە لیباسی ڕوشد تەلبیس کرا، ئیتر چارە نەما.

٧٢/٥

## حوسنی موعاشەرە!

لە ماڵێ کە لەزەتی دونیا ئەگەر ببێ، لەناو چوار دیواری خۆتە بە نیزامێ جوان، ئەدەبی شیرین، ژن و مێرد لای یەك خۆشەویست و موحتەڕەم، ئەولاد بە تەربییە، کچەکە بە ئەدەب کوڕەکە بە مەرحەمەت

و لوتف لەسەر سینی مێزی سفرە، بە نوکتە و لەتائیف و قسەی فەرەح ئامێز، گردبنەوە. خورشی موتەوەسیت عافیەت کەن لە بەینی ئیسراف و تەبذیر ڕابوێرن. ئەو عەیشە لای بێ دین، لای فاسق، لای بێ تەربیەت، سیء الخلق بەدموعاشەرە نیە. گەلێ کەس مەلان، شێخن، بە عیبادەتن، حوسنی موعاشەرەیان نیە، ئیمراری حەیات بە مەرارەت ئەکەن، لەززەت نابینن، ئەوی تووڕە بێ، هەر باسی مەکە، لە خۆشی وەڕزە. بەهەشت و سایەیی سەروو، سنۆبەر و شمشاد و عەرعەر لەگەڵ عەیشی خۆش خۆشە.

٧٣/٥

## نسبەت بۆ جەنابی حەق!

عەرزی جەننەت مەکان شێخ عەلی ئەفەندیم کرد: ئێوە لە خولفی فی الوعید چی ئەفەرموون؟ شێخی عەرەبی تەجویزی ئەکا.

فەرمووی: سبحان اللە کەسێ دەعوای عبودیەت و ئەدەب بکا مەسئەلەیە عینوانی خولوف بی، کوو نسبەتی بۆ جەنابی حەق ئەدا؟!

٧٦/٥

## ئەگەر شێخ شێت بوو بچێتە کوێ؟

(فما له من هاد) بە کوردی ئەڵێ: خەڵکی شێت بن، ئەیانبەنە ماڵی شێخان، ئەگەر شێخ شێت بوون، ئەیانبەنە کێ؟!

گەلێ قسەی پروپووچ هەیە عالەمێکی پێ وەرئەگەڕێ.

٧٧/٥

## دەست و پێی ئوممەتیان بەست!

مع الاسف پاش زەمانی ڕیسالەت بە کەمێ، ئوممەت ڕوویان کردە غەیبیات، مەیلیان دا بە خەواریق، لە هەموو لایە فێریان کردێ، ڕاست و درۆ تێکەڵاو بوو، دەستیان لە نەزەڕ عەمەل هەڵگرت، گاهێ بە ناوی قەرابەت قیودیان شکاند، دەمێ بە ناوی سوننەت، دەست و پای ئوممەتیان بەست، نە گوێیان لە ئایاتی قورئانی بوو، نە چاویان لە ئایاتی ئەکوانی، تێك بەربوون، ئەجانیب فرسەتیان دەست کەوت، لە ئایاتی خەلق و ئیجاد کراوە، چیایان کۆڵی، کردیانە جادە، لە ئەعماقی ئەرز مەعادین و غازات و ئەنهاریان هێنادەر، جەهەننەمێ وەك ئەوروپایان کردە بەهەشت، جەلبی ئەرواحیان کرد، ئەوا لەگەڵ (ئەموات) قسە دەکەن، تەماشای تەفسیری (تەنتاوی) کە....

جا مع الاسف ئێمە بێ خودان ماینەوە، بێ وەلی و بێ واقی، هاوار بانی مارانی! فەریاد کەڵکە سماقی! پاش تەعن لە ئایەتی، تەعن بۆ زاتی هومایون ڕیسالەت پەنا، لاکین تەعنی بێ وەجە.

٧٩/٥

## چەند ژنی!

تەعەددودی خێزان، تەلەزوز بەوان چ مونافاتی هەیە، لەگەڵ ڕیسالەت و نبووەت؟ ئەگەر عیسا و یەحیا بێ ژن بوون، موسا و ئیبراهیم ساحێبی عائیلە بوون، مع أنە بێ مەیلی عیسا و یەحیا لە موجیباتی تەبعی بووە، یەکێ نیوە بەشەر، یەکێ مەحصولی پیری، قیاسی زەکەریا و ئیبراهیم نەزەڕ بە زەمان لێك ناکرێ.

لە بەعزێ نقول دەرئەکەوێ، عومری ئیبراهیم ڕۆژی خەتەنی بە قەدەری عومری زەکەریا بووە، لە ڕۆژی دوعا، بۆ وەلەد بوون، کەوابێ یەحیا نابێ بە ئیسحاق وە ئیسحاقیش موتەزەویج و ئەولادی و ئەعقابی

زۆر بووە. ئەو ئایەتە لە مەدەنی ئەکا، ئیلقائاتی ئیسرائیلییەکانە. دەرزی لە چاوی خەڵك ئەبینن، گاسنی لە چاوی خۆیاندا نابینن! مەسئەلە مەسئەلەیە فیترییە، تەعەددود دەخلی بە حیلل و حورمەت نییە، مەدار موراعاتی مەصلەحەتە. سەییدی ئالووسی قسەیەکی هەیە، ئەگەر ئی خۆی بێ، هەزار ئافەرینی لێ بێ.

فی الحقیقە تەعەددودی زەوجات، زێدە "سیبات" حاڵی ئینسان، موخالیفی سیرڕ و عەلەنی دەردەخات، لەو تەعەددود و ئەحواڵی أمهات المؤمنین دەرئەکەوێ. جەنابی ڕیسالەت پەناهــ، کوو لە دەرەوە ڕەسول بووە، لە ماڵیش ڕەسوول بووە، ئادابی موحەسسەنی سیرو عەلەنی یەك بووە، معاذ اللە زەرڕە شتێکیان لێ دیبا، لێیان لە هەرا ئەدا- ئەلئانیش ئەورووپایی لەو وادییە هەزەیان ئەکەن، بەعزێ لە موستەشریقەکانی بە ئینساف جوابێ مەعقوڵیان ئەدەنەوە. حەتتا بە جەوازی تەعەددودی زەوجات، زۆر قەدەحیان لە دینی ئیسلام ئەدا. ئەمما بعد الحرب العظمی زوبانیان کورت بۆوە، میللەتی موحاریب و موستەعلی ئیحتیاجی بە تەعەددودی زەوجات هەیە. لام وایە تەعەددودی زەوجات بە حەق ڕیعایەت کرابا، قەحپەخانە کەسی تیا نەئەبوو.

٨٠/٥

## هەر زەمانە نەوعە حوکمێکی هەیە!

خوا بە گوێرەی تەبائیعی ئومەم ئایاتی کەونیان پێ ئەدا، بەعدەهو ئایاتی حوکمی ئەنێرێ (لکل اجل) وەقت و موددە لە ئەعماری ئومەم حوکمێکی هەیە، لە ئەجلی قەومی تر ناوەشێتەوە، وەك ئەڵێ (لکل زمان دولة ورجال) تەتەبوعی ئەحواڵی حەیوانات کەن. دائیر بە بەخێوکردنی فەرخۆڵە، بنۆڕنە ئەحواڵی ئەرز و ئیختیلافی ئەقالیم و قەتەعاتی و تەفاوتی لەیل و نەهار و مەناخی تەبەددولی فصولی شەرعی، لە میصر داندرابێ، زستانێ لە کۆیە کوو تەتبیق ئەکرێ؟

حەقــقەن هەر زەمانە نەوعە حوکمێکی هەیە، هەر حوکمە نەوعە

زەمانێکی هەیە. بەلاغەتی کەلامی، ڕیعایەتی موقتەزای حالی بۆ لازمە، بەلاغەتی تەشریعی و وەزعی ئەحکام و قەواعید و ئیصلاح و تەربیە، موقتەزای حاڵ و مەقامی گەرەك نییە؟ حاشا لازمترە. شەریعەت بێ تەتبیقی فیترەت و تەبیعەت نابێ.

٨١/٥

## ئەمڕۆ ئەحکامی تەورات کوو تەتبیق ئەکرێ!

ئێوە ئەی صەنادیدی قورەیش، ئەی سەرامەدانی عەرەب، ئەی ڕوئەسای ئیسرائیل، تەڵەبی خەواریق مەکەن، ڕوو لە ئایاتی عیلم و عەمەل و تەوسیعی علوم و مەعاریف بدەن. زەمانی ئەوهام و خەیاڵات تێپەڕی، دەوری عەقڵ و عیلم و فکرە، دەوری تەرەقی بەشەرە، دەوری (حەدەس)ـە، زەمانی ئینتیباهە، جا بەرق بکەنە نبراس، دەرکی کەن، بەدەستی خەن. یەدی بەیزا بنوێنن، لە ئەعماقی ئەرز ئاو دەرێنن، جۆگا لە ئەنهار هەڵبەستن، لە چیاو کێوان مەعادن دەرخەن، پردان دروست کەن لەسەر بەحران، ئینساف بکەن ئەمڕۆ ئەحکامی تەورات و ئەحکامی بەرحی کوو تەتبیق ئەکرێ؟

ئەوی عیلمی بە حیکمەتی خوا بێ، ئەزانێ قانوونی بەرحی قانونی ئیلاهی نییە، ئەی سەلەفی تۆ چۆن لە ئیدارەیی مولك و سەڵتەنەت و تەدبیری ئومور و تەدویری حەرب، ئوممەت موقەییەد ئەکەی بە سوننەت؟ بەڵێ سوننەتی نەبەوی هەیە کە لا یتغیر و موقەییەد ئەکەی بە سوننەت؟ بەڵێ سوننەتی نەبەوی هەیە کە لا یتغیر و موقەییەد بۆ نایکەن؟ بە کەڵەك و سەفینەی شورراعی، موقابەلەی ئستوڵ ئەکرێ؟! بە حوشتر بەرابەری سەیارە و قیتاڕ ئەبێ؟ بە نێزە و مطوار و شیر، پەنجە بازی ئەبێ لەگەڵ تۆپ و شەرابنێل و غازی موخنیق؟ ئەگەر ئەمەلی نەجاتتان هەیە، تەماشای حاڵ بکەن. ماضی چوو، ئەمڕۆ بۆ ئیستیقبال، بۆ ئیستیقلال تێکۆشن، بنۆڕنە سوننەتی خوا، تەتەووراتی ئومەم، ئیجاباتی زەمان بە قوەتی ڕوحانی و جسمانی، ماددی و مەعنەوی بڵند بن، گوێ لە ئایەتی قورئان گرن (لوح المحفوظ) چییە؟ چیتان لێ دیتیە؟

ئێمە لە تەدەننی ئەجنەبی لە تەرەققی، ئێمە بۆ مەحوو و ئەوان بۆ زێدە ثبوت ئەچن! ئیتر چیتان ئەوێ؟ بە مەحزی ئیرادە، یا بە عیلم و سەعی و عەمەل شکاندنی ئەغلالە؟ مەحوو ئیسبات لە عالەمی خۆمان نابینین؟ وەجهی نازانین؟ تا بڕۆین بۆ لەوح، قەوی زەعیف ئەخوا، لەیلەی نیصفی شەعبان و ئاجالی بەنی ئادەم، لێرە دەخلی نییە. بەڵێ بەحس لە ئاجالی زاهیرییە، بۆچ لادەدەن؟ بۆ ڕوو لە ئیختیراعات ناکەن، بە حیکایاتی کەرامات و شەواز هەڵ ئەخەڵەتێن. لە جادە بۆ ڕێی پێچووکە و خوارەکە ئەچن، لأی سبب؟ ئایەتێکی ڕوحی تیا بێ، بۆ حەیاتی ئیجتیماعی و شەرەفی زیندەگانی کەڵکی هەبێ، بە مەعنای هیچ و پووچ مەحووی ئەکەن. جا چارە ئیتتیحادە، قووەتە، دڵ لە موزەخفەرات پاك کردنەوەیە، سەعی حاڵ، ئیحتیراس بۆ ئیستیقبال.

٨٢/٥

## دەعوەتی پیرێژنانە!

شاهێدی ئەدەم، زەمانی ڕیسالەت و نبووەت، تەشریعی لەسەر ئەو خەتمە، پێغەمبەری ئاخری زەمانی ڕسالەتە. زەمانی وی زەمانی تەرەققی عومومییە، زەمانی ئیدراکی قەواعیدە، زەمانی دیققەتە لە ئوموری موعتادە، غایەت بە ئیفادە، زەمانی سقوتی خەواریق و خورافاتە.

هەر جەنابی موحەممەد (صلی اللە علیە وسلم) بوو، یەکە و تەنها موقابیلی عالەم ڕاوەستا، کوڕڕەیی ئەرزی دوژمن بوو، دەوامی کرد، صەبری نواند، موەفەق بوو. ئەوانی دوای ئەو ئیدیعای پێغەمبەریان کرد، چیان کرد؟ غەیری دەعوەتی پیرێژنانە ئەمەش ئیشێکە، ئیشێ نامەردانە! لە بەینی (سجاع) و (کەززاب) ئاشکرایە لەو مەیانە، ئەمثالی بەهافەندی، ڕەسوولی سەلامن؟ وەی موبارەك نەبێ، لەوەتی تەشریفی ناموبارەکیان پەیا بووە، بە جارێ فیتنە و فەساد و خیلاف بەرپا بووە! بەڕاستی ئەمانە بەناوی سەلام، دوژمنی سەلامن. سەلام سەلامی خوایە، حەزرەتی موحەممەد (صلی اللە علیە وسلم) بەشارەتی پێدایە (السلام علینا وعلی عباد اللە الصالحین) لە تەڕەف ئەو ئیعلان کرایە. مەرد بن، ببن بە

عیبادی صالح، صالحی دونیا و قیامەت، ئەمە خۆیەتی باقی هەمووی هاش و هووش و هەبایە، والسلام علیکم!

و بعد کل الشهادة، شاهیدی ئەدەم، حەزرەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) زینەت و شکۆهـ و جەلال و عەزەمەتی دا بە ڕیسالەت. حەقە ڕیسالەت فەخر بە حەزرەتی موحەممەد المصطفی (صلی الله علیه وسلم) بکا، ئیلاهی شەهادەتم قبوڵ کەی.

٨٤/٥

## کورد قەومێکن وەحشی، ئادەم خۆر، گورگی هار!

لە وەقتی ئیستیلای ئینگلیز، حاکمی سیاسی کۆیە ڕەندیل ناو، تەماشای ئێمەی ئەکرد، لە قیام و قعود و ئاداب و خواردن و لیباسی ئادەمیانە تەعەججوبی ئەکرد، ئەیوت: لە مەکتەب ئێمەیان دەرس ئەدا، کورد قەومێکن، وەحشی، ئادەم خۆر، وەك گورگی هار! ئەمانەش ڕوئەسای دینی عیساییان، ڕەسوولی سەلام!

٨٦/٥

## ئەییامی میحنەتیان لە فکر نامێنێ!

گەلێ کەس، گەلێ قەوم، ئەییامی میحنەتیان لە فکر نامێنێ، مەغروور ئەبن، ئەکەونە ناو بەحری شەهەوات. دوایە خراپتریان بەسەر دێ، کەم کەسێ، کەم قەومێ، قەومێ بە طالیع و بەخت و شانس و عەقڵ، ئەییامی سابیقەیان لەیاد ناچێ، دائیم الاحتراس ئەبن، لە مەنکوبی و مەغلوبی، غایەت ئەترسن. ئەمڕۆ غەمی پاش هەزار ساڵ ئەخۆن.

٨٧/٥

## تا خوا کێوان نەبینێ بەفریان ناوێتێ!

کوردی ئەڵێ: تا خوا کێوان نەبینێ بەفریان ناوێتێ. سبحان اللە بەشەر لەگەڵ بەشەر چەند خراپە، بەشەر چەند چاو لەدەرە، چەند لە چاکەی یەکدی بێ خەبەرە! مع أنە ئینسان بۆ ئینسان ڕوحە، ئەعزایە، بۆ دەردی دەرمانە، بۆ نەخۆشی تەبیبە، بۆ فەقیری دەوڵەتە، بۆ بێ دەسەلاتی قووەتە، بۆ بێ کەسی کەسە، بۆ هاوارکەری فریادرەسە، یارە، یاوەرە، غەم خۆرە، غەم بەرە، وەك سەعدی ئەڵێ: بنی ادم اعضایی یەکدیگرند.. منداڵێ بگریە، بەکێ ژێر دەبێ؟ بە کێ دەسرەوێ؟

خولاسە بەشەر بێ بەشەر چی پێ ناکرێ. وەقتی درەو بێ سەپان دروونە ئەبێ؟ مع هذا دائیم لەگەڵ یەك عەدون، چاوەنۆڕی مەلائیکە و جنۆکانن، منەتی یەکدی نازانن. حەقیقەتەن ئینسانێ چاك لە هەموو عالەم بۆ ئینسان چاکترە. ئینسانی خراپ بۆ ئینسانی لە هەموو شتێ خراپترە. ئەگەر ڕوئەسای ئەدیان و ئەقوام نەختێ باشبان، قەت ئینسان لەگەڵ یەك وا بەد ڕەوشت نەدەبوون. هەریەك بەناوی شەخصی، بوون بە دوژمنی یەك، بێ عەهد و وەفا و نمەك!

٩٠/٥

## ئیبلیس فووی تێکا، دەماری ناجووڵێتەوە!

حەقیقەتەن (أعدی عدوك نفسك التی بین جنبیك) کەسێ بە حس بێ، لە خۆی فکرێ ئەزانێ شتێ هەیە، لە ئەندەروونی ناسەکنێ، علی الدوام تەحریکی ئینسان ئەدا بۆ خراپە. ئەسڵەن ڕێی چاکەت نیشان نادا، بە خەیاڵیش. بۆ سەییئاتت ئەبا، ئەگەر ئەوە نەبێ شەیتان چی پێ ناکرێ. قیوای نەفس، کە زەعیف بوو، هەزار جار ئیبلیس فووی تێکا، دەماری ناجولێتەوە، ئەو قیوا و لەزائیز و شەهوانیەیە ئینسانی مەغلووب ئەکا. لە داخلی ئەگەر ئەمین بێ، دوشمنی خاریجی چی پێ ناکرێ. دز بە شارەزایێ ماڵت، ئەتوانێ دزیت لێ بکات. حەقەقەن ئەگەر بەو

جەندرمەیەی داخلیە نەبێ، کەیدی شەیتان زۆر واهیە، سوڵتان و جەبری نییە. ئەبێ ئینسان ئاگاداری نەفسی خۆی بێ، ئەمما خەیاڵییون، بە خەیاڵی واهی خۆیان قووەت و قودرەتی عەجیبیان دایتە شەیتان.

خۆی ئەکاتە مومەثیلی خوا، عەرشێ (بين السماء والارض) بینا ئەکا، مەلائیکەت لە دەوری ڕادەوەستن، حەول ئەدات، بەو نەوعە، صدیقان ئیغوا ئەکا. حاشا ثم حاشا، هەمووی خەیاڵاتی خۆیانە، ئەگەر ئەو صدیقانە لایان وانەبێ، خوا تەمەثول ئەکا، وە خۆیان دائیمەن خەریکی تەمثیلی خوا ئەبن، شەیتان ئەو تەلبیسەی پێ ناکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا تەلبیسی خۆیان، قووەیی تەمثیلیان تەواوە لەبەر سهولەت وا ئەزانن، شت بۆیان تەمەثول ئەکا.

ئەوەش سەبەبی چاو قوچاندن و خەیاڵ لە عالەمی نوورانیە، بەعزێ ئەڵێن (پێغەمبەری دەدزن، شێخی دەدزن) خۆت ئەزانی خوایە ئەمە چۆن ئەبێ؟ تەماشای مەلەکوتی سەماواتی ئەرز کەن، لە ئایاتی خوا ئیستیفادە بکەن، موحەقەق بزانن ئەوانە بە فریادی ئێوە نایەن، وەك شەیتان بە فریادی ئەهلی جەحیم نایەن.

٩٥/٥

## شەیاتینی ئینس خراپترن لە شەیاتینی جن!

توخوا بنۆڕن بەعزە نەققال ئەڵێن: شەیتان لە بەینی دوو لێوی پێغەمبەری چەند فەقەرەیەکی خوێندیە، هەموو بە قورئانی تێگەیشتینە، پێغەمبەر چ ئاگای لێ نەبووە، حەتتا نەیبیستیە، جا لە بەینی ئێوە و شەیتانی لە ڕۆژی خۆی بە چاوتان دائەداتەوە: کەی من ئەو تاوانەیەم بووە، وەقتی حەبیبی ئەکرەم، قورئان بەسەر عیبادا بخوێنێتەوە، من لە بەینی دوو لێوی موبارەکی ئەو قس بکەم؟!.

وەی، وەی برادەرە بە تەواوی گوێ بگرنە ئەو قیصصەیە، وا خەیاڵ کەن حازری ئەو وەقتن. دیقەقەت لە ئیمان و عەمەلی خۆتان کەن، جەنابی حەق واقعیە، پاش چەند هەزار ساڵ واقیع ئەبێ، بۆتان بەیان ئەفەرموێ، تا تووشی حەسرەت و نەدامەتی ئەوێ ڕۆژێ نەبن. بە

جەدەلی ئەشاعیرە و موعتەزیلە خۆتان مەحرووم مەکەن، بە قسەی غەزالی و ئەمثالی وەلەو کە زەواتێ زۆر گەورە بن، دائیر بە قووەت و قودرەت و خاریقی شەیتانی و تەمثیل و تەمەثول، لە ڕێی خوا خۆتان ماڵ وێران مەکەن. لە شەیتان ئەمین مەبن، بەسەر خۆتانی غالب مەکەن، وە بزانن خوطەیی شەیتان و جەوابی ڕەئیسەکان ئەمما ئەوا لە شەیتان خراپترن ئەو ئیعتیرافی شەیتان ئەیکات، ئەوان نایکەن. وە دیقەت کەن، لە نەزمی قورئان، چ جوانە، چ مومتازە!

ئەگەر خۆمان لە خوا نەکەین، ئیمانی بێ عەمەل و چاکە، چ قیمەتی نییە، بۆ دونیاو قیامەت، بێ وەزنە، ئەگەر ئومنییات لێگەڕێ، ئیمان قووەت ئەستێنی، بەسەر هەواو هەوەس ئەکەوێ، تەجەبور و تەکەببور و عیناد و تەلەببوس، نایەڵێ.

یەکێ لە شوعەرای عەصر بیستم لە دۆستێکی خۆم کە پێی ئەگوت: حەزرەتی محمد (صلی الله علیه وسلم) چونکە لە بیلادی حارڕە دابووە، بیلادی گەرم، بێ باغ و داغ و جۆو جۆبار. لە دەست گەرما عاجز بووە، بۆیە ئەوەندە (کرارا)، (مرارا) وەعدە ئەدا لەگەڵ خەڵکی بە بەهەشت و قصور و ئەنهار، ئەگەر لە بیلادی باریدە بایە، موژدەی ئەدانێ بە مەواقیعی گەرم.

خوا ئەزانێ باغی سەبز و خوڕەم و پایەدار بە کۆشك و سەرا و ئەنهار، ئاوی صاف و زوڵاڵ خۆشگوار، چلەی زستانێ لە سیبیریا یەدا، خۆشە، بە تەماشای دڵ ئەگەشێتەوە؟ ئیتر بنواڕە قسەی ئەهلی عەصر و وەسوەسەی ئیبلیس فەرقیان زۆرە، بەڵێ لاشەك شەیاتینی ئینس لە شەیاتینی جن بۆ ئینسان خراپترن.

٩٦/٥

## سوئی خاتیمە!

ئەوەی راسخ الایمان بێ، ئیمان چوویێتە ناو دڵی، تیای قەرار گرتبێ، سوئی خاتیمەی نابێ. ئەوەی بە بێ ئیمانی لە دونیا ئەچێتە دەر، لە حەیاتی دونیا، ئیمانی نەبووە بەراستی وە بە قووەت نەچوویتە دڵی، چ

حاجەت بە سەرەمەرگ، لە صیحەت و عافیەت، ناخۆشیەکی بێتە بەر، هەزار کەلیمەی کوفری لە دەم دێتە دەر.

گەلێ موتەصەوویفە هەن، خوایان ئەوێ بە ئەمر بەر، ئەگەر شەخسێ خیلافی مەشرەبیان شتێ بکا، هجومی ئەکەنە سەر، لە دین و ئیمان دەچێتە دەر. ئەو نەوعە (العیاذ باللە) حەقیقەتەن موئمین نین، چ جایە سوئی خاتیمە! ئەگەر خۆیان تەمثیلی خوا نەکەن، بە تەمثیلی شەیتان وەرناگەڕێن، ئەگەر خۆیان قودرەت و قووەتی سولتانی شەیتان وا تەوسیع نەدەن، بەو نەوعە شەیتان غالب نابێ، ئەگەرچی زاتێ وەکی غەزالی مەقسەدی ئیعلامی عیبادە، بۆ موهەییا بوون و ئیستیعداد و موقابەلەی. ئەمما سولتانێ وا بە سەتوەت و هەیبەت و حیشمەت و قودرەت، ئینسان خەوفی ئیستیلای لێ ئەکا، هێز لە ئینسان نایەڵێ، بە غەیری ئینقیاد چارەیە نابینێ.

ئێوە و خودا کەسێ ئەمرکاتە چیایان شەڕە بەرانی بکەن، داك و بابت زیندی کاتەوە، پێت بڵێن: ڕۆڵە ئیمانی پێ بێنە، ئەوە خوایە!

کێ موقابیلی ئەو موعجیزە خۆی ڕائەگرێ؟! ئیتر ئینسان لازمە لە عەدوو بترسێ، ئەمما نابێ وای خەساڵ کا، کە (بوجە من الوجوە) لەبەر عەزەمەت و کیبریائی موعارەزەی پێ ناکرێ. خولاسە ترسی (احتراس) نە ترسی (یأس).

۹۹/۵

## هەر کەس لە دائیرەی خۆی فکری خۆی جەولان پێ ئەدا!

زۆر جار تەفەککور ئەکەم، ضەلالی عەوام خەتای خەواصە، یا خەتای خۆیانە؟ لە گەلێ شت بە حاڵی حاضرە، وا دەرئەکەوێ خەتای عەوامە، ڕوویان لە حەققی خالیص نیيە، ئینسانی بێ غەل و غەشیان خۆش ناوێ، وا ئەبێ بە گەلە ئەڕۆن بۆ خەرافات و ئوموری سەخیفە و کەرانە، بە هەزار دەلیل و بورهان و ظهوری سوئی عاقیبەت، یەکت پێ ناگەڕێتەوە، لەبەرئەوە وابزانم ئەڕبابی حیەل بە گوێرەی مەیلیان، جەلبیان ئەکەن، بارێ چ نەبێ وەك بەهائیم ئیستیفادەیان لێ ئەکەن. حەققەن

ئەوانەی لەگەڵ میللەت و ئوممەتی خۆیان ساغن وەکی غەزالی، شێخی عەرەبی، فەخری ڕازی، شێخی ئیبن حەجەر، شێخی شەعرانی، زەواتی نوافذ الکلمة ئەبا لە قسەی خۆیان بفکرن، ئوممەت ئیستیفادەی لێ ئەکا، یا زەرەر؟ بۆ عەدەمی ئەبا یا بۆ وجود بڵندی ئەکا؟ یا نیوەی قودرەتی ئینسانی تەئسیری نییە؟ ئەمما (جن) قودرەتیان هەیە، خۆیان تەشەککول ئەکەن بە ئەشکالی موختەلیفە.

توخوا تێفکرە، چەند کەلیمەیە بێ مەعنایە، کەلیمەی طەیببە لای خوا خۆش ئەوەیە: ئینسان بەرزکا، بە قووەت و سەمەرەیە، زۆر باش بیکا بە شەجەرەی طەییبە. لاکین مع الاسف هەر کەس لە دائیرەی خۆی لە فەزایە غەیرە مەحدود، خەیاڵ و فکری جەوەلان پێ ئەدا! مع الاسف مسوڵمان بە ئیتیباعی مویول، بێ موراعاتی عەقڵی واعی کەوتوونە (دار البوار)، ئەگەر معاذ الله لەو ئەفکارەدا بمێنن، نایەنە دەر (إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ) صدق الله وکذب المنجمون.

١٠٠/٥

## حەزرەتی شێخ!

لە ڕۆژی جەزا بەیع نییە، فیدیە نییە حاشا، دۆست دۆستی نییە، شەریك تکاکار نییە هەمووی هەبایە، ئەو خەلیلانەی خەڵکیان ئیغرا کردیە، ئۆباڵ بە ملی من، ئەدی حەزرەتی شێخ ناڵێ: ئەوی بە بەر دەرکی تەکیەدا بڕوا، مەغفورە!

تەیمور مرد ئیمانی برد، چونکی تۆزی خانەقای بەسەردا چوو، ڕوویێ تۆزی لێ نیشت، ئیتر قەید و بەند ئەمێنێ؟

حاصڵی ئیمانی خالص بەقیمەتە، موجیبی نەجاتە سەعی بۆ بکەن، ئیعتیماد لەسەر ئەم و ئەو پەکتان ئەخات، بۆ دونیا و ئوخرا، دەستەپاچە ئەبن. حاجی قادری کۆیی ئەڵێ:

که دەیگوت شێخی من، من دەستەگیرم
لەلام وابوو لەبەر جەهل و جەوانی
که پیربووم تێگەیشتم دەستی گرتم

لە کار و کەسب و تەحصیلی مەعانی[1]

یا محەمەد (صلی الله علیە وسلم) توو ڕێ مەگۆڕە، ڕێی ڕاست نیشاندە، حەق و حەقیقەت ئیعلان کە، عالەم دەعوەت کە، بۆ خوا، ئیلاهی واحیدی بێ هەمتا، ئاگاداری سیرر و ئاشکرا، مالکی ڕۆژی جەزا، وە هەرچی موحەممەدی بێ، حەقە بەو مەسلەکەدا بڕوا. خوایە خۆت ئەزانی، وەقتی فروفێڵ نەما. ئەمڕۆ کەلیمەی نافذ شێخی طەریق و مەلای وەهابیان و موجتەهیدی جەعفەریانن، عنداللە مەسئولن، ئەگەر موداخەلە بکەن، موناڧیق ئەبن، ئوممەت ئیصلاح ئەکەن، وە لە دار البوار ی دونیا ئەیانهێننە دەر.

١٠١/٥

## ناوی کەچەڵانیان ئەنووسی!

ئەوساڵ (١٣٥٦هـ)[2] لە وڵاتی ئێمە زۆر باران ئەباری، حەتتا لە ئەووەڵی کانونی سانی ڕۆمی تا ئەمڕۆکە ئەواسیتی شوباتە علی الدوام باران بە ڕێژنە و نەرمە نەرمە دێتە خوار. ئەییامێ بارانی نەبووبێ زۆر کەمە، خوا ڕەحم کا، (اللهم حوالینا ولا علینا) وە لە پایزیش پەڵەی زوو دا، موتەوالیەن باران هات، خەسارە زۆر بوو، ماش و برنج و توتن و کونجی گەلێ فەوتان، جاران ئەگەر باران زۆر بباریبا، ناوی کەچەڵانیان ئەنووسی، چل ناو ئەیاندا بەر باران، کە حەك ئەبۆوە، بارانەکە خۆشی ئەکرد، یەعنی وا دەبوو. ئێستا کەچەڵ لام وایە، زۆر کەم بووین، زەحمەت چل کەچەڵی کە ناویان یەك نەبێ، بدۆزرێتەوە!

---

(١)لە دیوانی حاجی قادردا بەم شێوەیە هاتووە:

کە دەیگوت شێخی مِن، مِن دەستگیرم
لەلام وابوو لەبەر جەهل و جوانی
کە پیربووم تێگەیشتم دەستی گرتم
لە کەسب و کاری تەحصیلی مەعانی

دیوان/١٥٣

(٢)دەکاتە ساڵی ١٩٣٧ز

١٠٢/٥

## کۆیە خۆشترە یا لۆندەرە؟!

سبحان الله ئەوەی موعتاد بێ ئینسان ئیلتیفاتی ناکاتێ، بە نیعمەتی نازانێ، زۆر دێ و دەڕوا. ئێمە نازانین چ نیعمەتێکە! لە بەعزە بەریتانیانم ئەپرسی: کۆیە خۆشترە یا لۆندەرە؟

ئەیانگوت: کۆیە.

چۆن وا ئەبێ؟

بەڵێ ئێرە ڕۆژی هەیە، وڵاتی نوورە، لە لۆندەرە لەبەر بوخار و دووکەڵ کەم ڕۆژ ئەبینین.

حەتتا لەو ساڵانە لە مەشریق و مەغریب ئیعلانیان کرد، ئەمڕۆ هەشت سعات ڕۆژ لە لۆندەرە بەدەرکەفتیە، لە نووری ئیستیفادەیان کردیە، تەئریخ ڕۆژی وای کەم دیوە، ئەمما ئەو ساڵ حەقیقەتەن ئێمەش حەزمان لێیە ڕۆژ ببینین.

١٠٣/٥

## ئینسان بێ نمەکە!

ئینسان زۆر زاڵمە موتەجاویز لە حەددە، ناشکورە، بێ نمەکە، ئینکاری نیعمەت ئەکا، فی الحقیقە ئینسان زاڵمە، زۆر، گەلێ، خەیلێ، لام وایە (اذا خلی وطبعە) زاڵمە، بێ عەدالەتە، لەم سەرو لەوسەر، بە ئیفرات و تەفریتە، زوڵم لە خۆی لە ئەبنای نەوعی، لە حەیوان، لە جەماد -العیاذ باللە- لە خوا ئەکا، لە مەقام تەجاوز ئەکا، لە حدودی مەحدودی خۆی تێدەپەڕێ، یا تەکەببوڕ ئەکا، تەنەزول ناکا، ئیمان بە زاتێ وەکی خۆی بێنێ کە ڕەسوولە. یا تەدەننی ئەکا، بۆ سەگ، بۆ گا، ئەکەوێتە سەر خاکی مەذەللەت، (اباطیل) بێ بورهان و شوبهە و دەلیل قبوڵ ئەکا، بۆ حەق حوججەتی قاتعی ئەوێ، یەعنی مولجیئ، زوڵم لە حوسن و جەمالی ئەکا، ڕوویی پڕ مەحاسینی بە ڕیخی گاجووت موشەووەهو بێگەنی ئەکا. بۆ ئیستیخدام عالەمێ ئەکا بە کەر، ئەوەی تێفکرێ، حیرەت ئەیگرێ.

ئەگەر بەیانی مەزاڵیمی بەشەر بکەم، ئەبێ دەفتەرێ بنووسم. بێ ئەمە کە هەزار ئینعامی لەگەڵ کەی، ئەدنا شتەکی نەگاتە دڵی، هەمووی بە هەبا ئەڕوا. یەکێ ئەکەوێتە قوڕ، مسوڵمانێ بە خێری خۆی نەجاتی ئەدا، ئەیکاتە مەرحەمەتی شێخ. لەگەڵ ئەوەشدا حەزرەتی شێخ چ ئاگای لێ نییە، وە پێشی ناکرێ قورتاری کا.

لە زەمانی حەڕب، حاجی سمایلی تەکەلتوویان، هەڵپێچابوو، بۆ هێستری. تەصادوف چوومە سەرا، مەرحووم صولحی بەگ ئەحواڵی مالیەی لەمن پرسی.

وتم: فەقیرە کەڵکی هیچی پێوە نییە.

لەسەر قسەی من عەفوی کرد. دەرحاڵ بە غار چوو بۆ دیوەخانی حەماغا دەستی ماچ کرد: ئاغا لە سایەی تۆ عەفوو کرام.

دەربارەی (باری) قسەی لێ ناکرێ، حەققەن زۆر ناشوکرن، مەگەر موئمینی راسخ الایمان، بێ تەمەع و ئەمەل، بەس حەقی بۆ حەق بوێ، ئیمان نەکاتە جالبی نەقصی دنیا. زوڵمی مەلایان وەکی کەس نییە، کائینات ئەکەنە تابیعی ئیعتیقادی خۆیان، ئەرز و ئاسمان تێك ئەدەن، سەماوات و ئەرز کە خوا ئەفەرموێ: بە شەش ڕۆژ خەلقم کردیە. خۆی ئەزانێ هەر ڕۆژی موددەی چەندە؟! مەلایە بە نووکی قەڵەم، ئەو عالمە عەزیمە، ئەباتە عەدەم! ئانەن عالەمی میسلی ئەو عالەمە ئەهێنێتە وجود بۆ خاتری وەهمە غەلەتەکەی خۆی، ئەمما باریشی هەر گرانە.

١٠٣/٥

## مادام لە قورئاندا نییە، گوێی مەدەرێ!

خوایە ناشکوری نەبێ چ خورافاتێ کەوتە فکری موفەسیران؟ نەقڤال و مەقڤالان! پێش حەربی عوزما، مەککەیی ئەیانفەرموو: بێ منەت بن مسوڵمانینە، ئەگەر ئێوەش نەیەن بۆ حەج، مەلائیکەت دێن.

لە کوتوبی قصاصان دەڵێ: مەلائیکەت لەودیوی چیای بەردیان بار ئەکرد لە حوشتران، ئەبووە گندۆرە و شفتی، ئەیانهێنا مەککە!

کە حەڕب داهات ڕێ گیرا، ئەوجا تێگەیشتن قسەکان بۆفن! ئەی

موستەکبرین و زوعەفا و نـوتقی شـەیتان، کە خـوا خـۆی ئەزانـێ کەی ئەبێ، لە چ مەوقیعێکی ئیراد ئەکا؟ دوعای ئیبراهیم کە چەند لەمەوپێش بـووە بە چ موناسـەبەیێ دوایـێ زیکـری ئەکـا. ئەمە کـاری وەحیـیە، بە خەیاڵی کاتبان ڕێك ناکەوێ!

ئەو حیکـایەتی ئەیـکەن، بـۆ هێنـانی ئیسـماعیل و والیـدەی وە بەجێهێشتنیان، لەو مەقامە مـوهلیکە، قورئـان ڕەمزیشـی بـۆ ناکـا. بەڵێ لە تەوراتدا هەیە، نەققالان دوور نییە، کردبێتیانە حەدیس، مادام لە قورئانـدا نییە، گوێی مەدەرێ! دوعا بکە لە عیبـادەتی ئەصـنامی نـاتیقە دوور بـین، ئەمەراتی قورئانمان بە ڕزق کا.

١٠٥/٥

لووتی مەغروران لە ئاسمانە!

گەلـێ مەغـروران ئەبینـین لوتیـان لە ئاسـمانە بە هەزار نەصـیحەت ناگەڕێنەوە، دەزەڕن، ئەنەڕن، ئەوەڕن، نەعـرەتە لێئەدەن، وجـودی کەس نازانن، شای بە سـەپانی خۆیـان نـاگرن. ناگەهـا، زلـلەیەکیان لە تەختـی شەویلاکي ئەدەن، ترس غەلەبەیان لێ ئەکات، لووتیان شۆڕ ئەبـێ، لاف و گەزاف بەرتەرەف ئەبێ، ئەکەونە پاڕانەوە.

١٠٧/٥

## بێدەرپێی عەرەبان!

خواردن و خواردنەوە و ڕەقص و دانس و تێکەڵاوی ژن و پیـاوان، بێ دەرپێی عەرەبان، نەفسی خۆیان بەرەڵلا کـردیە، زینـا لە قەحپەخانـان، قومار و موسەککەرات ئەڵێن: دین مانیعی حورریەتە، دونیا ئەمڕۆ و بەس، قیامەت و حیساب و کیتاب نییە.

لەبەرئەوە مسوڵمان نابن. مع الاسف ئەمڕۆ مسوڵمانەکانیش، سەبەب بە لەزائیزی حەیوانی لە دین دەردەچن.

١١١/٥

## هەرچی و پەرچی!

ئەوجا تەماشای بەعزێ لە جەهەلەی سۆفییە کە، چ بە یەقین ئەکەن، ئەوان یەقینیان هەیە، حاجەتیان بە عیبادەت نییە، حەتتا بۆ ئینتیهای غایەتە. حەققەن ئەوە قەولێ زۆر بە حەماقەتە، گۆیا ئەو وەقتە جەنابی ڕیسالەت پەناهـ، یەقینی نەبووە، وە تا چوویتە ڕەحمەتی خوای، موازەبەی لەسەر عیبادەتی خوای کردیە، ئەبێ تا مردبێ یەقینی بۆ حاصڵ نەبووبێ... کەسێ (ذی شأن)، فیترەت خاوێن، بە ئیستیعداد و قابلییەتێ تەواو، لە عومری خۆی بە خەیاڵیدا نەهاتبی ببێتە ڕەسوول، واقیعەن ڕیسالەت و نبووەت کەسبی نییە کەسێ بە تەمای بێ، بۆی نابێ. ئەمما ئەو مەنقەبە نادرێتە هەرچی و پەرچییان، ئەدرێتە زوبد و خولاصەیی ئینسان.

١٢٩/٥

## ئەوان جاشکن!

ئەوانەی ئەمڕۆ دەڵێن پێغەمبەرین. وەك بەهائی و قادیانی، ئەگەر ئینسافیان هەبێ، نەزەر بەوان، خۆیان بە ئینسان نازانن، چ جایە، عالیمێ، چ جایە ڕەسوول؟ لەسەر ئینتیشاری عیلم و عیرفان سواد البشر، ئەلئانیش جاشکن، کەرپەرستن لاحول ولا قوة الا باللە.. خۆزی لە خۆیان وە لە (الانعام) فکریان تەفەووقی حەیوان لە جەماد وە لە ئینسان لە حەیوانیان بزانیبا!

١٣١/٥

## هەوێن دروستکردن!

فی الحقیقە لە وەختی خۆی وڵاتی ئێمە عیلمی تیا بووە، هەوێنیان دروست کردیە، بەو هەوێنە ئەو تەحەوولاتە بە شیر ئەکەن، ئەی عیلم بۆ کوێ چووی؟! کابان هەڵئەستێ، ئەوی شیری هەبێ ئەیدۆشی، وردە

وردە بەخێر ئەگەڕێتەوە. گاوان بانگ ئەکا، شوان ئەقوولێنێ، بۆڕەیی چێڵ، نقەیی گامێش، باڕەباڕی مەڕ و بزن.

١٣١/٥

## حاجیانی کۆیە!

ئەمڕۆ لا شەك ئەرئەف و ئەرحەمە، بە قیتار بە سەیارە، بە سووکی بە خۆش و ئاسانی، لەو سەری دونیا ئەچنە ئەمسەری دونیا. وەکەذا بە تەیارە. ئەمساڵ حاجیی کۆیە لە بەغدا بە شەش ڕۆژ گەیشتنە مەدینەی نەبەوی، جاران بە چل ڕۆژی بەو عەزابی کە لە سواری حوشتر ئەیاندیت، لە شام ئەچوونە مەدینە.

١٣٢/٥

## بزنی کێوی!

زاهیر وایە لە حەیواناتی سەر ئەرزی بێ، گەلێ نەوع هەیە تازە دۆزراوەتەوە. دیم بزنی کۆیە، لە نێریە کێوی فەرخەی هێنابوو، جوان!

١٣٢/٥

## باباگوڕگوڕ چی وت؟!

ئەو هەموو مەعادینە بە خۆڕایی چوو، ئەجانیب دەریانخست، بۆ ئێوە لێی مەحرووممن؟ بوتپەرست بێ نەزەر و تەزەککورە، لێك ناداتەوە، ئەهلی ئیمان بۆ نەفتی باباگوڕگوڕی، بە لیسانی ئاگرینی نیدای ئەکردنێ:

دەروونم پڕە لە نەوت، هاوار دەریخەن، نەفعی لێ ببینن.

گوێتان نەبوو، کردتانە زیارەتگا! ئەمما مع الاسف ئیستیفادە لە کائینات، تەفەککور و تەفەففول و تەذەمموری پێ ئەوێ. عەقائیدی باتیڵە مانیعە لە هەمووی، بۆیە موختەریعەکان ئەڵێن: دین مانیعی تەرەقییە!

قەیدی نییە موختەریعەکانی ئاوروپایی وا بڵێن، ئەمما ئەوانی ئێمە (کمال فره)کان بۆ وا ئەڵێن؟ ڕقیان لە ڕوئەسای دین ئەبێتەوە. کەی دین،

مەلای دینی ئەوانـی لە علـوم و مەعـاریف و حـوکم و ئیختیـراع، مەنـع کردینە؟ گەرچی مەعادین موتەمەئیلە لەسەر ئایات، ئەمما ئێمە چمان لێ نەزانی، تا ئایاتی لێ وەرگرین.

١٣٥/٥

## خوزەعبەلات!

ئەمـڕۆ کەسـێ تەماشـای بەحـر و مەنـافیعی بەحـر کـا، زۆر موتەئەسسیف ئەبێ لە مەحرومی، لە هەمـوو مەکاتیـب ئەخـونن ***هنری الملاح***[1] لە بـۆ غـازی (جبـل الطـارق) کـوو هـاتە ئەم تەڕەفە؟ چۆن جەزائیری کەشف کرد، ***خروستوف کۆلمبوس*** بە چ ئەمەلێ ئەمریکـای بـۆ کەشف بـوو؟ ئەمریکـۆی تیجارییـان لە دەسـت مسـوڵمانان سـاند؟ ڕێـی تیجارەتی بەڕییان کە بەسەر عێراقـدا دەهـات، ئەچـووە سـوریە، ئەچـووە ئەوروپا کـوو بەسـت؟ سـەفینە گـۆڕا بـووە پـاپۆڕ، بـۆ حەرپـی تیجـاری (غانبوە) غەوواصە دروسـت کـرا، قەعـری بەحـری پـێ کەشـف ئەکەن! لەگەڵ ئەوەشدا بە غەیـری حیکـایەت چیتـر نـابینی، حەرەکەی ئیصـلاح نیـیە. موصـلیحان لە عـالەمی حەیوانـات لە بەڕڕی و بەحـری زێـدە لە خـواردن فەوائیـدی عیلمـیە وەرئەگـرن. میللەتـی خۆیـان بە ئەنـواعی ئیختیراعات بڵند ئەکەن.

قسمێ ئەعزەم لە ئێمە ئەمڕۆ جومعەیە ١٣٥٧یا محول الاحوال، حـول حالنا الی احسن الحال، کە ئەووەلی مـوحەڕەم ئەکەونە عەزای حوسـێن، شین و شەپۆڕ و سینگ کوتان، ئەڵێـی هەزار شۆڕەسـواریان لـێ مـردیە! بەعدەهو زیـاراتی عەتەبـات، مەئـاتیمی ئەئیمە، تەوافـی چاڵی سـامەڕا، ئەوانی تریش (اجعل الها کما لهم الهە) ئەوا خەریکن خـوزەعبەلات بـۆ خوا پەیدا ئەکەن، بە ئوموری بێ مەعنا، بێ فائیدە خەریکن. ئودەبا هاوار

---

(١) هنری مەلاح (١٣٩٤-١٤٦٠ز) میرێکی پورتوگالی بووە و دامەزرێنەری ماڵبـاتی ئەفیز بووە. ئەم ناوەی بۆیە پێبڕاوە چونکە گەڕیدە بووە و زۆر شوێنی دۆزیـوەتەوە و یەکەم کەس بووە کە چیای (جبل طارق)ی بڕیوە لە ساڵی ١٤١٤ز.

ئەکەن (جەهل خیومی هەڵدایە) لەسەر وڵات، ئەو جەهلە چییە؟ بۆچی لێرە هەڵدرایە؟ چاری چییە لاکەوێ؟ قسەیە ناکەن، بە قومار و بادەگوشایی تەداوی ئالام ئەکەن. نەغمەیی دەعوەتی موبەشیرانی تازە، ڕوسولەکانیش لەوێ ڕاوەستی. خوا ئەزانی یەکی وەك ***هنری***، وەك ***ئەدیسۆن*** بۆ ئێمە، ملیۆنێ بەهائی ئێرانی و قادیانی ئێنی! چارەی ئێمە بەو جۆرە ڕەسوولانە ناکرێ. بە ڕوسولی سیاسەت بە ڕوسولی تەبیعەت ئەکرێ. کەسەکمان ئەوێ ڕوحێ باوێتە بەر هەیکەلی ئیجتیماعی، زیندویان کاتەوە، سەوقیان کا، بۆ ئیستیفادە لە ئالیاتی ئیلاهی صانیعی، پاکیان کاتەوە لە زەیغی ئەمنیات و ئیعتیقادیات و مویولی فاسیدە. موحەقیق بزانن (ان الله لا یغیر ما بقوم حتی یغیر ما بانفسهم) لە هەمووی لازمتر ئیعادەی قووەت و ئیرادە، شکاندنی قەیدی سوننەت لە ئیدارەی میللەت و دەوڵەت و موحافەزەی مەملەکەت.

١٣٧/٥

## بۆنی خۆڵ!

حیکایەت کراوە، بەعزێ بە بێنی خۆڵ دەیزانێ ئەو ڕێیە جادەیە، یا کۆرە ڕێیە! ئەمە دوور نییە بەڵام لە نەوادیرە، وە وەکی ئیمام دەفەرموێ: من جەماعەتەکم دیت بە بێنی خۆڵ ڕێیان دەردەکرد.

ئەمما من شەخسەکم دیت خۆڵی تام دەکرد، دەیزانی بۆ چ نەوعە جبوباتێ چاکە لێی بچێنن.

١٣٩/٥

## حەج!

میللەتی بێ عیلم و ئیختیراع، کەی موقەللید دەکاتە موجتەهید؟ نالێم ئینسان خالیقە! ئەمما صانیعە موختەریعە! ئەوا دەبینن چ حاجەت بە بەیان! عالەمی ئیسلامییەت بەچی مەغلوب بوو؟ ئەمساڵ دەڵێن قەریبی سێ سەد هەزار کەس چوونە حەج، لەوێ چییان دیت؟ چییان بیست لە کێوی عەرەفات، خەتیب خوتبەی خوێند چی فەرموو؟ چییان گوێ لێبوو؟ دەبا

میکرۆفۆن مسوڵمان ئیختیراعی کردبا! زاتێ وەك مەلیکی سعودی نوتقێ بدا بە ئالەت سێ سەد هەزار مسوڵمان گوێیان لێ بێت بەو شەرتە بزانن تێی بگەن چی دەڵێ! ئەویش بە گوێڕەی زەمان نوتق بدا. هەر باسی بەرد هەڵگرتنەوە و گۆشتی حوشتر و پێستی قوربانی نەکا. هەرچەند عولەمایێ هەیە هەمووی خەریکن بە دەلیل و ئایەت و حەدیس، سەلبی قودرەت و ئیرادە بکەن لە ئینسان لە مسوڵمان، وە کردیان! ئەوجا چۆن مەغلوب نابین؟ چۆن سەردەکەوین؟ وەڵلاهی ئەقرەبی عیباد لە صانیعی سەماوات و ئەرز، موختەرەعەکانن! کوا مسوڵمانی موختەریع و صانیع خەلیفەی صانیعە؟ خەلافەتی ئەرز بە سەبحە و ڕشتە نابێ!

نازانم چ بنووسم وەقتە دڵم تەق کا بۆ ئیسلامەتی بۆ قورئان! تەماشای ئایاتێ کە بۆ مسوڵمانان بۆ قەومی خۆم کوردی ماڵوێران، دواکەوتووی هەموو میللەتان، بێ عیلم و صەنعەت دوای شێخان کەوتین لە زومرەی ئینسان کەوتین. بارێ چ نەبێ ئینسان تەماشای خۆت و گاجووت و هەیاکیل و ئەصنام کە چەند هەزار دەرەجە لە فەوقی وانی! چییە ئەم زیللەتە؟ چییە ئەو شیرکە؟ چییە ئەم جەهالەت؟

١٤٠/٥

## هەوێنی ماست و پەنیریان بۆ کورد پەیدا کرد!

گەلێ جار دەڵێم ئیلاهی ئەو ئەولیایەکانی کە هیچیان بۆمان دروست نەکردیە، لای ئوممەت وا مەقامیان بڵندە، ئەگەر شتێکیان پەیداکردبا، ئیعتیقادیان لە حەقیان چۆن با؟ وە بۆ قیامەت ئەوان لە هەلاکەت نێزیکترن. کوردەکان خوا بە قوربانی ئەو کەسەیان کا، کە هەوێنی ماست و پەنیری بۆ پەیاکردن، وە ئیللا ئەمڕۆ لە فەوائیدی شیر مەحرووم دەبوون!

١٤١/٥

## مەلا و قانوونی مەدەنی!

دینی ئیسلام دینێ فیترییە بۆ تەعدیلی تەبیعەت داندرایە، بە ئوصول و قەواعیدە، طورقی ئیستیدال و ئیستنباطی موحەریر و موهەززەبە، قابیلی زێدە و نەقص نییە، بەس تەعەصصوبی عولەمای موقەللید ڕەخنەیەکی دی تێدا نییە. شەریعەتی ئیسلامییە دەبا مەلایانی شەرعی کۆبووبان لە هەموو مەزاهیبان قانونێکی مەدەنیان تەدوین کردبا بێ تەفریقی مەزهەب، ئەوەی ئەوفەق و ئەرفەقە بە نیزامی ئەنام قبوڵیان کردبا. ئەوسا کەس نەیدەتوانی بڵێ شەریعەتی ئیسلامی ناقیصە. بەڵێ مەزهەبێ بە تەنێ بۆ عالەمی شەرق و غەرب و شیمال و جنوب ناقیصە! ئەو فکرە من ئیزهارم کرد بۆ بەعزێ پیاوی گەورەی تورکان وەك ***عەلی شەوکەتی*** موفەتیشی مەعاریفی ویلایەتی موصڵ و **عبدالله الکاظمی** موتەصەریفی لیوای کەرکووك و سلێمان نظیف والی ویلایەتی موصل، زۆر ئیستیحسانیان کرد. زۆر نەچوو مەشیخەتی ئیسلام بە هیممەتی عەلی حەیدەر (فتوی النبی) بە موساعەدەی شێخ الاسلام خیر الدین بەگ ئەثەری ئەو فکرە بەدەرکەوت، ئەگەر بمابان بە تەواوی دەهاتە جێ. لازم بوو فیرقەیێ هەبا مەلای مسوڵمانان بن عەرزی ئەوانە.

١٤٢/٥

## داکێ! گرانی ژن نییە!

بێ باوەڕەکان وەختێ کە ژنیان لەسەر زان بێ زۆریان لا ناخۆشە، ناشکوری نەبێ یەکێ وەك شێخ حوسامەددینی ئێمەیان نەبووە لەناو زگی داکیانا، هێنیەکی پێوە بچەسپێنێ، دەست خۆش یا شێخ-! جا موتەحەییرە نازانێ چی لێ بکا....

بەشەر مەحوو دەبێتەوە، مێ نەما! نێر لە کێ دەبێ؟ نێری و مێیی لە عالەمی حەیات، نەبات تا ئینسان هەیە! ئافرەتی کوردی دەڵێ :داکێ! گرانی ژن نییە! بۆ کچی خەڵکی ببێتە ژنی وی؟ ئەو کچی نەبێ، نەك ببێتە ژنی کەسێ! ئەمە تەکەببورە، زوڵمە، ئیستیحقاری غەیرە، خوتتەی

شەیتانییە! ئەوانە بڕوایـان بە ڕۆژی مەن دۆقـی مـن دۆقـی – لام وایە لە (من دق دق)یان وەرگرتییە- نییە.
١٥٣/٥

## میزی حوشتر دەخواتەوە!

حالەن عەرەبی قوڕبەسەری بادیە نوشین بە تەقـدیری ئیمـامی مالیـك، میزی حوشتری دەخواتەوە، خۆی پێ دەشوا، ئیستیحمامی پـێ دەكـا. تـا ئێستا وامان دەزانی ئەو حەیوانی بزێ، فەرخە بەشـیر بەخێـو دەكـا. ئێسـتا حەیوانێكیان كەشف كردیە هێلكە دەكا و فەرخەی بە شیر ئیدارە دەدا.
١٥٧/٥

## ئاژەڵە حەرام و حەڵاڵەكان!

ئەوی حەرامە وەكی حەلال ئایەتە! بە ئیعتیباری شەرعی، لە حەقیقەتی خۆی ناگۆڕێ! صە گڵاوە، بەراز حەرامە، بزن حەلالە، لە ئایەت یەكـن! بەدایعـی بەراز لە بـزن زیـاترە، دوو سـمە، دەم بـاریكە، ئـاو بە گـوم دەخواتەوە، وەك صەی مەمكـی دوو ڕیـزەیە، بە شـولفەیە، ملی كـورتە وەكی فیلی، سەری وەكی گاجووتانە، كلكی قوڕەیە وەك مامز و كێوی، شولفە لێدانی، مان گرتنی عەجایبە. زەهر ئایەتە قەتتالە!

ئەمـــڕۆ لە خەســـتەخانان ئەكـــثەری تەداوی بە مەوادی ســـومییەیە! دیققەت لە موخەددەرات كە بۆ جەراحی چەند بە خێرە! وە حاجەت بە شێخ نیـیە! مەلایـانی فیقـه، وەك مەلایـانی كەلام لەسـەر فیكـری خۆیـان تەفسیر دەكەن. هەر كەس بـۆ ڕیعـایەتی مەزهەبـی خـۆی ئـایەت بەلای خۆیدا دەكێشـێ، حەقـیقەتەن ئەوەش جـای عیبـڕەتە! قسـە لە موسـكیرە، بەڵێ هەمـوو ئـایەتی خـوا، موحەییرولعقـولن، ئانزیـادە خەمـر، بە جـارێ عەقڵ تێكدەدا!

(ففی كل شیء ایة تدل علی انه واحـد) تەماشـای **روح المعانی** بـكە بزانە كوو سەرخۆش دەبێ! پاش ئیختیلافی مەلایان لە تەركیبـی ئـایەت، بنۆڕە ئەو ڕزقە حەسەنەی كە قەسپ و ترێ ئیتتیخـاز دەكـرێ، مـوجیبی

حیرەتە، وەك عەرز کراوە دۆشاو بە خۆڵی سپی دەکرێ ئەو خۆڵ و شیلاوکەی ترێ کوو گەیشتنە یەك؟ بە چ میفتاحێ بۆی چوون؟ نازانم! سجووق و باسووقی سولەیمانییش ڕزقێ حەسەنە لەزیزە.

ئەکثەری ئەشیا مەوادی ئیبتیدائی لە تەرەف خوایە، فروعی بە صنعی بەشەرە.

١٥٨/٥

## داك و باب!

باپیر مەلا عەبدولرەحمانم لە ڕیسالەی ئیثباتی واجب ئەفەرموێ: لە هەموو کەس نزیکتر لە خەلقی ئێمە، داك و بابە. لێیان ئەپرسم، قەتعیەن ئاگایان لە خەلقی ئێمە نەبووە، نە قودرەتیان نە عیلمیان نە ئیرادەیان موداخەلەی نییە.

من ئەڵێم ئەگەر بە دیدەی عیلم بنۆڕینە خۆمان، خالیقی ئێمە یا تەبیعەت یا خوایە، تەبیعەتی بێ شعوور و ئیدراك ئەو صونعە بەدیعەی لە چنگ نای، خصوص عەقل و قیوای مودریکەی لەگەڵ بێ، ئیدراکی چ نیسبەتی هەیە؟! ئەمینیتەوە خوا. مەلەك و جنۆکە پاش ئیمان بە ڕەسوول لامان مەوجودن.

١٦٣/٥

## کوفرانی نیعمەت بوویتە دینی بەشەر!

ئەسبابی چییە عالەم نەفرەت لە خوا دەکا، کەس خوای بە ڕاستی و خزمەتی بە ڕاستی ناوێ؟ حەققەن ئەمڕۆ موئمین و کافر، تا مومکینیان بێ خۆیان لە خوا دوور دەکەنەوە، چ نەبێ بە عیسایێ، بە مەلەکی تاووس بە شێخێ، بە وەلیێ، ئینکاری نیعمەتی ئیلاهی دەکەن. هەر نەئیسە، ئەوانەی سەعی دەکەن لە ئەندرۆنی ئەرزی نەوت دەردێنن، چیایان دەکۆڵن، مەعادین بەدەست دەخەن، قسەیەکی بکەن! ئەمما ئەوانە بۆ؟ بۆ ئەو حەیاتی حاضرە شەمس چ نیسبەتی هەیە لەگەڵ عیسا، لەگەڵ شەیتان، لەگەڵ شێخ؟

سبحان الله کوفرانی نیعمەت بوویتە دینی بەشەر! ئینسانێ لە قوڕێ دێنیتە دەر، دەڵێ بەقوربانت بم شێخ عومەر، یا عەلی، یاحەیدەر!

١٦٥/٥

## ئەستێوبەردا!

کابرایە ئەستێوبەردی لێکدا، قاوەکەی هەڵبوو، وتی: بە سەری میری، حەزم لێیا زووترم هەڵدەکرد.

وتیان: چۆن ئەبێ؟

وتی: دەستم بڵند نەدەکرد، ئەستێم لە بەردەکە ئەخشاند و هەڵئەبوو!

١٦٦/٥

## لەم وڵاتە بە پف و تف تەوەسسول ئەکرێ!

خوا قانوونەکی دانایە، مەوادی موهەییا کردیە بۆ تەوسیع و تەسهیلی هاتنەدەری منداڵ لەو (مضیق)ە! موراجیعەی کتابی قانون الزواج کەن، چ ئەبێ؟ تا ئەو منداڵە ئەبێ! ئەگەر کەوتە تەنگانە، ئەوجا بە ئیمدادی ئیلاهی حەکیمی ماهیر، ئالەت و ئەدەواتی باشی عەصری بۆ هێنانەدەری منداڵ بە ساغی- گەر مومکین نەبوو- بە مردی ئەهێنێ. گەلێ ئەبێ خوا ڕەحم کا، بێ دقتۆر خۆی فڕێی ئەدا بە سەلامەت.

لە وڵاتی ئێمە ئەوە حالەن نییە، بە دوعا و دادی قروسمین، دۆخینی کەسێ زینای نەکردبی، لەو عوسرە نەجاتیان ئەدەین! (قابلە)ی باشیشمان نەما ئەگەر قطری سەر گەورەتر لە قطری مەخرەج نایەتە دەر، غەیری ئێمە عالەمی مەدەنی زۆر ئیعتینایان بە مەسئەلەی تەولید کردیە. لەو ڕێگەدا خاریقە ئەنوێنن، حالەن وەکی گوتمان بە موزەخرەفاتی قەدیم پف و تف تەوەسسول ئەکرێ لەم وڵاتە.

١٦٧/٥

## ئینسان چییە؟

ئینسان حەیوانێ (بادی البشرة) یە، یەعنی پێستی بەدەرەوەیە. وەك مەڕ و بزن، خوری و مووی نییە، ناسکە، بەری سەرما و گەرمای ناگرێ. خاصەتەن لە بیلادی حارە کە بای سەمومی زۆرە، ئینسان بە ئەکثەری حەوائیجی تەبیعی ناچاری کرد، خانوو بکا، ساکین بێ وەك مار و قومقوم و کیسەڵ لەناو ئەرزا بژیە. بۆ حەیوان لەوەڕاندن ئیحتیاجی بوو بە نەقل، خێمەی دروست کرد، لیباسی پەیاکرد، حەتتا ئەلجائاتی گرانی، چەند نەباتاتی دەرخست کە بۆ بەشەر باشە، ئیدامەی حەیاتی پێ ئەکا، وە چەندی موزیرڕە پێی ئەمرێ.

١٧٠/٥

## ئینکاری نیعمەت!

ئینکاری نیعمەتی ئیلاهی ئەمڕۆ زۆر ئاسانە، بەناوی دین و ئیعتیقاد، بە کوللی ئیسنادی بۆ غەیری دەدەن. شێخ ناردی، لە سایەی سەری ئاغای، چ ئاگاشیان لێ نییە! ڕەنگە ئاغا ئیعتیراف، بەڵام شێخ، نا!

١٧١/٥

## زەردەشت ڕەسووڵی خوایە!

ئەمڕۆ ئەکثەری دانایانی کورد دەڵێن: زەرادوشت ڕەسوولی کوردان بووە. حەقیقەتەن گەلێ لە عولەمای عظام حسب التتبع، تەصدیقی ڕیسالەتی زەردەشتیان کردیە، ڕەسوولێ بە حەق بووە. لام وایە ئەم سەردەشتی مەشهوور، ئەسڵەن بە ناوی وی بووە، تەحریف کرایە. تەئریخی مەعلومە لە ئازەربایجان بووە، موعجیزەی نوور بووە. لە ئیبنولحەجەر وەردەگیرێ مەجووس تەحریفی کتابیان کردیە، ئێستا دەڵێن بەعزە ئاثاری لە کتابی دەرکەوتووە، ئەحکامی مەعقولی تیایە. ئەمما نابێ کورد بەو قسە لە دین دەرچن، زەردەشت ڕەسوولی خوایە، مع الاسف

ئەساسی دین و ئایینی مەجهووله. کتابیەکان هەموومان ئیمانمان بە خاتم الرسل سید الکل محمد المصطفی یە! وەلەو حوکمە دەبێ عالەم مەمنوونی حەزرەتی محەمەد بێ، کە ڕیسالەت دەدەنە شەعبی خۆیان و بەس.

١٧٣/٥

## بێحەیاییش بەو دەرەجەیە!

بوشرا بە قورئان، نە بوشرا بە عیسا، خوای موتەحەوویل و موتەتەوویر، نە بە قادیانی بە خۆ و تەئیدی مەسیحییەتی. نە بە بەها، نە بە ڕیسالەتی موسەیلەمە و سەلما!

خۆزی مسوڵمانان ئیستیفادەیان لە **ما فی القرآن کردبا**، ئەوەی بە تەصریح بۆیان بەیان کرایە، لەو هەای و هەوویە گەڕابان، کەهرەبا ئیختیراع کرایە؟ بەڵێ فلان ئایەت دەلالەتی لێ دەکا! وە هاکەذا تەیارە و سەیارە و تەلەفۆن و تەلەفزیۆن و میکرۆفۆن و مسطاط، لە قورئان وەرگیرایە؟! دەوڵەتی عوسمانی تا مەهدی پایەدارە، کە مەهدی وەفاتی کرد، باز خەلافەت بۆ ئالی عوسمانە؟! بە قورئان ڕازی نین، ئەننەهو عیلمی زیاتریان دەوێ، دەچن بۆ ***لوح المحفوظ*** چی تیایە؟!

بۆ ئێمە ناشکوری نەبێ لە قورئان، لە لەوح، لە ئەرزی سەمسەمە چییان دۆزییەوە، ئەمڕۆ بۆ ئوممەت بەکاربێ؟ ئەجانیب بە عیلمی تەبیعی کیمیا و میکانیکی، بە مەقسەد گەیشتن لەسەر ئێمە غالب بوون. حالەن مسوڵمانان خاصەتەن ڕووحانیەکان دەست لە ئوشتلومو لاف و گەزاف هەڵناگرن - وا غربة الاسلام وقلة الحياء- ؟! أشهد بالله ئەمڕۆ وایە ئیسلام لەو غوربەتە لەو کوربەتە لەو زیلـلەتە، بێحەیاییش بەو دەرەجەیە! لە ولایەت صەرفی نەزەر، بۆ ڕیسالەت دەڕۆن!

برادەران ئێوە بە هۆش بن بنواڕن لە ئایەتی قورئان، بە عیلم و عەمەل ئیستیفادە کەن، لە ئەمەرات و مەنافیعی خۆ مەحروم مەکەن! ئیصلاحی دونیا بکەن بۆ خزمەتی دین! دونیا بۆ دین پەرژینە! دینی بێ حورمەت، ژینە؟

١٧٤/٥

## سەر بن، کلك مەبن!

کەسێ لە ئەهلی ویجدان بێ، حەزی لە مەکاریم بێ، ئەخلاقی موتەنەففیر لە سەییئات بێ وەکی ئەکتەمی صەفی ئەو ئایەتەی (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ) کافیە بە قەومی خۆی فەرمووە: لەو ئەمرە سەر بن، کلك مەبن!

یەعنی زوو مسوڵمان بن، تەئخیر مەبن وەك کلك! ڕەحمەتی خوای لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز [1] بێ، کە ئەو ئایەتەی هاویشتە خوتبەی جومعە.

سەیری قەومێ ئەوە ئایەتی بێ، ***بعد الاسلام*** لەسەر مەنابیر لەعنی یەك کەن!

١٧٥/٥

## ئەوەی پیاو بێ، سوێندی پێ ناوێ!

ئیتاڵیا حەلیفی ئەڵمانیا بوو، لە سایەی ئەو خۆی گرت، لە حەڕبی عومومی نوێ، لەبەر جەلوای حەڕب چووە لای ئینگلیز و فرەنسە. خۆزی کتابی اختلالی توازن کە ئەسڵەن تەئلیفی غۆستاف لۆبۆنی فرەنسیە یاری وەفادار دقتۆر صەلاحەدین وەصفی تەرجەمەی کردیە لام با، بەعزە

---

(١) عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی مەروان کوڕی حەکەمی ئومەوی قورەیشییە (٦٨١-٧٢١ز) هەشتەمین خەلیفەی ئومەوییەکانە و لە مەدینە لەدایك بووە و لەلای ماڵباتی خاڵوانی کە ماڵباتی عومەری کوڕی خەتتابن گەورە بووە. لە سەردەمی خەلیفە وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك دەکرێتە والی لەسەر مەدینەی پیرۆز. پاشان دەبێتە والی هەموو حیجاز و دواتر دەچێتە دیمەشق و دوای مردنی سلێمانی کوڕی عەبدولمەلیك، ناوبراو لە ساڵی ٩٩ دەبێتە خەلیفە. عومەر بە دادپەروەری و دڵسۆزی لە کارەکەی ناسرابوو. زۆر لە والییە زۆردارەکانی لەسەر کار لادا و کاری بە ڕاوێژ کرد و گرنگی بە زانستەکانی شەریعەت دەدا و فەرمانی نووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری دا.

فەقەراتی دائیر بە عهود و ئیمانی دوەلم نەقل کردبا.

خوا بە سوێند ئیمتیحانتان ئەکا، موحافەزەی ئەکەن، یا ئەیشکێنن؟ ئەوەی پیاو بێ، سوێندی پێ ناوێ گوفتایی (عەهد) سووندە، ئەوانەی نامەرد بن زنجیر ئەپسێنن، چ جایە عەهد و سووند! کوردی ساحێبی عەهد و سووند ئەڵێ: ئینسان بە زوبانی دەبەسترێتەوە، کە گوتی، کافیە.

١٧٦/٥

## ئیلاهی وەختە شێت بم!

من تەصەوور دەکەم و میزاج و مەشرەبی ئەنام تەماشا دەکەم، شك نابەم کەس لەسەر ئەرزی هەبێ، بە هەموو ئەحکامی شەرعی ڕازی بێ! ئەوەی موافیقی مەیل و مەشرەبی بێ، لای چاکە، وەئیللا لا!. دیومە یەك شەخس دەعوای بووە هاتیتە لای مەلا شەرعی بەدوایا چووە: ئەدی بابم برام ئێمە بەچی مسوڵمانین؟! دەستەکی شەرع بیبڕێ خوونی لێ نایێ! جارێکی دی شەرعی دۆڕاندیە ئەسڵەن ڕازی نەبووە: شەرعی چی؟ ئەوە کوو وا دەبی؟ دەچمە مەحکەمە بە قانوون دەیکەم بە تیجارەت! مەلا ئەوە قسە نییە ئەتو دەیکەی!

لازمە ئینسان تەماشای ئەحواڵاتی نەفسیە بکات، ئیختیاری ئینسان، قودرەتی! تەئثیری قودرەتی و عیلمی و عەمەلی و سەعی دائیمی گەیشتیتە دەرەجەیێ، بە شێخی ئەشعەری و ئیمامی باقلانی و ئیمامی ڕازی و ئیبنولمونیر و عەمرو زەید ئینکار ناکرێ! دەزانم ئەگەر ئەوانە زیندی بان لە فکری خۆیان دەگەڕانەوە. ئەمما موقەللیدەکان لەبەر جەهالەتی تەقلید دەست لە موزەخرەفاتی ئیعتیقادی هەڵناگرن، وە لەناوی موعتەزیلی دەترسن، موقارەنەی فیعل لەگەڵ قودرەت کە نەبێتە ئەثەری، چ قیمەتێکی هەیە؟ وە چ ئیمتیازێکی پێ دەدا؟ مەولانا خالید بۆ ئەو ئیمتیازە ڕیسالەکی داناوە، ئەممەنە مومتازە!

یاڕەببی ئەوانەی سەلبی قودرەت و ئیختیارو سەعی و کۆششیان کرد لە مسوڵمانان تا بێ هێزبوون لە قووەتی توو مەحروم کران، بوونە زەلیلی

دەستی ئەجانیب، دەبێ سوئال و جوابیان چۆن بێ؟ ئیلاهـی وە سـەییدی بە مەحزی خەلقی تۆ، موجەڕەدی ئیرادەی کیبریائی، بە عادەتی ئیلاهی، عالەمیـان تۆقانـد! نـاوێرن موقـابیلی خەلـق و ئیـرادە و قـودرەتی تـوو، ڕاوەسـتن! سسـت دەبـن دەسـتەپاچە دەکەونە گـۆڕێ، تـا دوشـمن بەسـەریاندادێ، وەك کەر ئیستیخدامیان دەکـا... لاقتـان دەزەلـێ لەپـاش ثبوت و ڕسوخ، لەگەڵ حەریفی خۆتان، حەلیفـی نوێتـان چەپەڵۆکەکی لەوان دەدا، دوایێ ئێوەش دەهاوێتە سەر خاکی مەزەلـلە، تەپڵەقوچانێتـان پێ دەکەن! مسوڵمانان پاش قـووەت و شـەوکەت زۆریـان واکـرد، لەبەر ئیختیلافی خۆیان تەفرەقەیان دەکرد، لایـێ دەبـووە حەلیفـی قەومـێ تـر، ئاخیری هەردوولا دەفەوتان.

لە زەوالـی شـەوکەوتی ئەنـدەلوس تـا ئێسـتا بەو جـۆرە لەگەڵ یەك سـلوکیان کـرد. ئیلاهـی وەختـە شـێت بـم! ئەو ئـوممەتە بە کـوللی، ئەو قورئانە، دەڵێی نەیانبیستووە!

١٧٧/٥

## حەیاتی خۆش!

لە دونیا حەیاتی تەییب و خۆش تەصەوور ئەکرێ، بەو وەجهەی کە قورئان ئیشارەی بۆ ئەکا. قەومـێ نێـر و مێـیـان مەشـغول بـن بە ئەخلاقـی حەسەنە، بۆ ئیدارەیی دونیا سەعی کەن، کەسابەت، تیجـارەت، زراعەت، صناعەت، بە قانونی عادیلانە بەجێ بێنن، عەمەلـی فەردی ئەهلـی مەنـزل ئەهلی مەدینە خصوصی و عمومی موافیق بـێ وە ئیمانیـان هەبـێ؛ ڕۆژێ دێ ئینسان بە جەزای چاکەی خۆی بگـا. ئەمەش بە ئیمـان بە خـوا و بە ڕەسوول ئەبێ.

بەعث و جەزا لە ئوموری سـەمعیەیە، بەراسـتی لە ڕەسـوولێ بە حەق نەبێ نازاندرێ. ئەو قەومە فەردی و جەمعـی حەیـاتێ خـۆش ڕائەبـوێرن. ئەگەر تەبـابەتێ باشـیان هەبـێ، نەساغیشـیان کەم ئەبـێ، ئەوانە یەکـدی نـاکوژن، ئـاگر لە پـاوان و خـانوو خەرمـان بەرنـادەن، دزی و ڕێگـری

ناکەن، عەتاڵەت نییە، فەقیری نییە، فەقیری نا، سوئال یۆك، دەرویش و سۆفی خێر، فەقێی زۆر و بۆر لا. قەحپەخانە، سوهرەیی شەرابخانە ڕەقص و سەما و دانس و چاوەشی و گەووادی و دەویتی و دووزبانی، و تەکەببور و عیناد و ئیستیحقار هەر نا. حاصیلی ئەوی موخیللی ئینسانیش بێ یا نییە، یا لە سایەی حکومەتێکی مسوڵمانی عادیل کەمە. ئەو حەیاتە فەردی و ئیجتماعییە ئەوەندە پاکە، خۆشە، کە حەیاتی جاویدانی بە سایەی ئەو حەیاتە تەواو خۆش ئەبێ.

١٧٩/٥

## مەلا و ئەحواڵی نەفس!

کەسێ بتوانێ لە ئانێ، وەسوەسە باوێتە دڵی ملیارێ بەشەر، بە طرفەیێ مەشریق و مەغریب تەی کا، لەناو جێ، نە لە سەر و مینبەر لێت غافڵ نەبێ، ئەدی ئەوە شەریکی خوای نییە، چییە؟
وەهم و خەیاڵ زۆری بۆ هەیە، ئەڵێن: شەخسێ لە چیا پڵنگێکی دووچار بوو، نەیزانیە پڵنگە، لێی نەترسایە، عەمبازی بۆ بردیە. پیاوەکە دەستی لە قورقوڕاگەی نایە خنکاندیتی، بەو هەیئەتە هەر دوو دەستی پڵنگ لەسەر شان، بردیتیەوە بۆ ماڵێ، خەڵکی تووشی ئەبن، ئەترسن، ئەڵێن: ماڵ خراپ ئەوە نازانی ئەوە پڵنگە؟
خانە خشتوور! بەسەزمانە ترسی لێ غالب ئەبێ ئەلەرزێ، ئەکەوێتە ئەرز و ئەمرێ!
بەڵێ ئەوە ڕاستە، ئەو هاو و باو و بوویەی سۆفییانی نەقشی هەمووی ترسی خەیاڵییە، چاو ئەچوقێنن، قجج و بجج دەهێننە بەر خەیاڵی خۆیان، ئەشکالی موهیب و عەجائیب و غەرائیب دێتە بەر وەهمیان ئەتۆقن، ئەهاڕێنن، وا ئەزانن ئەو حاڵەتە ئیلاهییە.
خۆزی مەلایان شتێکیان لە ئەحواڵی نەفس خوێندبا تا نەخەڵەتابان.

١٨٠/٥

## ئەحکام دەگۆڕێ!

ئینسان لە دەوری منداڵی تا دەگاتە کەماڵ، چەند ئەتواری دەگۆڕێ! ئەحکامیشی بەو گوێرەیە دەگۆڕێ! ئەگەر بە گوێرەی حەرەکاتی منداڵی بکا زۆر ناشیرینە لۆمەی دەکرێ! فوصول تەبەددول ئەکا، حوکم چۆن تەبەددول ناکا؟ ئیقلیم موختەلیفن، ئەحکامی هەمووان چۆن وەك یەك دەبێ؟ ئەوائیلی تەعلیم و ئەواسطی و ئەواخیری چۆن وەك یەك دەبن؟

زستانی کۆیێ و میصرێ فەرقیان زۆرە! هەر حوکمێ نەسخ بکرێ، تەبعەن مەنسوخ دەبێ! ئەوجا شەرعەن نەسخ دێتە سەر ئەوامیری زەمانی زوعف و ئەوائیلی نەئشەت، نایەتە سەر ئەوامیری ئەییامی قووەت و ئەواسطی شەوکەت و سەطوەت! شەڕ بە گورز و کەمەند و ڕمب و شیر و تیر، موقابیلی ئەسلەحەی نارییەی عەصرییە، چۆن نەسخ نابێتەوە، نەسخ ناکرێتەوە؟ وە ئیللا قەومەکە خۆی مەنسوخ دەبێ لە کیتابی وجود مەحوو نابووت دەبێ!

وە نەسخ و موتەشابیهاتی کیتابی قەولی، تابیعی نەسخ و موتەشابیهاتی کتابی فعلییە! نەزانینی وەثنیان بەرجا، نا بەجا نەزانینی ئەهلی کیتابە! تا شەمس بڵندتر بێ سێبەر کورت دەبێ، نابێ! چ دەکا؟ چارەی چییە؟ حاصلی جەهل و تەعەصصوب باعیثە بۆ ئینکاری نەسخ.

١٨١/٥

## بەراز!

بەراز دەعبایێ سەیرە، بە سم و سەر لە مەقولەی ئەورە، بە شلفە و بێ ملی و کلك کورتی فیلە، بە گووان و دەم باریکی ئەمما لووت زوڕنایيە لە نەوعی سەگە! لووتی لەسەری لمووزییە. دەڵێن دەم لە ئاو ڕادەکا دەیخواتەوە.

١٨٦/٥

## لێرەش ئەوا دەستیان کردیە بە ڕیش تراشین!

تەورات ئەڵێ: خوا ئەمری کردنێ بە تەعزیمی شەموو، ئیش و کار نەکەن، هەتا شوان و گاوان دانیشن.
ئەبێ ئەو ڕۆژە حەیواناتیان چی کردبێ؟ وە سێ شەمموی دیشیان هەیە، ئەسابیعی لە حەوت حەفتە، حەفتەیە، شهوری لە حەفت مانگ مانگێ، ئەعوامی لە حەفتا ساڵ ساڵێ، باغ و زراعەتی دی موشتەرەك بێ، هەر کەس بیخوا، ئیدخار نەکەن.
ساحێبیان ئەوانەیان نەکرد، بەس شەموویان گرت، ئەمما ئێستا لە وڵاتی مونەووەرانە کەمیان ڕیعایەتی ئەکەن، لە وڵاتی ئێمە ماوە. لێرەش ئەوا دەستیان کردیە بە ڕیش تراشین. ئەهلی سیاسەت ئەگەر بۆیان ڕێك کەوی، ئیجاب ئەکا، ئەو قیودانە بشکێنن، وەکەذا وەهابی ئەبێ قیودی بیدعەت و سوننەت هەڵگرن لە ئیدارەی مولك و سیاسەت. با بۆ عیبادەت بە شەرتێ بێ، تەعەصصوب لە جێی خۆی بێ.

١٨٩/٥

## وەعزی ئێرە بە هەدەر چوو!

دیققەت کەن، نوققالان مەشغول دەبن بە باسی مەلائیکەتێ دەڵێن: ماشاء الله زەلامە! چەند هەزار سەری هەیە، هەر سەرە چەند هەزار ڕووی هەیە، هەر ڕوویە چەند هەزار زاری هەیە، هەر زارە چەند هەزار زوبانی تیایە. بە هەر زوبانێ چەند لوغەت دەزانێ، بەو لوغەتانە ثەنای خوای دەکا!
ئەم باس و خواسە لە قورئاندا نییە! ئەمما ژنێ حەتتا مێرووێ قسەکی عاقڵانەی حیکمەت ئامێزی بە نەفع بۆ ئوممەتی کردبێ، جەنابی حەق بۆ ڕەسوولی خۆی، وەحیەن دەینێرێ! لە کیتابی موقەددەس دەرج دەکرێ! ئا ئاوا بە ملیۆن درۆیان دەکەن بۆ تەرغیبی قەلبی حەقائق. وە ئایاتی قورئانی نەقل دەکەن بۆ مەواقیعی عەقیدە و فیکری خۆیان، قسە دەهاوێن

تێنافکرن زەرەری بۆ ئوممەت چییە؟ لەگەڵ قەواعیدی ئیسلام چۆن موافەقەت دەکا؟! بە هەزاران ڕەمەزان ڕۆیی، وەعز کە عادەت بوو لە ڕەمەزانان بخوێندرێ بۆ مسوڵمانان هەر عیبارەت بوو لە حیکایەتی **سهل بن عبدالله**[1] و حوشتری و رابیعەی عەدەوی، **من أوله الی أخره**، کەراماتی بێ هوودە، ئەشعاری غەرامی باسی لەوح و قەلەم و مەساحەی جەحیم و جەننەت، لە هەموو ئایات و عیبەر غافڵ بوون!

لە واعیزان، بەراستی دوو واعیزم دیت بە حەق وەصفی ئەوەی بکەن بە کەڵکی ئوممەت بشێ، بە موناسەباتێ زۆر جوان بۆیان بەیان بکەن، یەکێ؛ نعمان الاعظمی لە بەغدا ڕەحمەتی خوای لێ بێ. دووەم دوعاگۆتان لە کۆیە. ئەمما وەعزی ئێرە بە هەدەر چوو، دەماغێ نەبوو قسەکان بگرێ. ئەگەر لە گوێیێ چووبا ژۆر، لە گوێیێ دی دەچووە دەر!

١٩٠/٥

## ئەساتیذەی سەر کاغەز کەڵك ناگرێ!

ڕەسوولی ساحێب دەعوەت، مەلای ناصیح، مورشیدی ناصیحی بێ درۆ و دەلەسە، دەبێ میزاج بناسێ! حەتتا ئەوانەی وەضعی قانون دەکەن، دەبێ وا بن، موطەلیعی ئەحوالاتی ڕوحییەی قەوم بن، لە ئەهلی تەجرەبە بن! گۆستاف لۆبۆن گەلێ لەومی رەئیس ولسن دەکا: کە بەعزێ ئەساتیذەی جامیعاتی هێنایە، بنودی موعاهەدەی صولحی پێ تەحریر کردینە. دەڵێ: ئەساتیذەی سەر کاغەز کەڵك ناگرێ! ئینسانی تەجرەبە دیدە ئاگاداری ئەحوالی ڕوحییەی بەشەرە، خاسەتەن ئی مسوڵمانان، بزانێ دەرەجەی قووەتی ئیمانیان چەندە. وەلەو بە ظاهیری

---

(١) سەهل کوڕی عەبدوڵلا کوڕی یونس ئەلتوستوری (٢٠٠-٢٨٣ك)، یەکێك لە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و ڕابەریکی ئەهلی تەسەووفیشە لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا. لە بنەڕەتدا خەڵکی توستورە کە ناوچەیەکە لە پارێزگای خوزستانی ئیران. لە بەسرە نیشتەجێ بووە و هەر لەوێش وەفاتی کردووە.

مەغلـوب بـووین، ئایـا مەعنەویاتیـان قـووەتی چیـیە؟ حەقـقەن ئەساسـی ئیسلامەتی بە ئەفکاری ئەو نەوعە کەسانە تێك چوو، بێ خەبەر لە هەموو شت، حوکم لەسـەر هەمـوو شـت دەکـا بە نەبـوو! بە نـووکی قەلەم ئەو عالەمە عەزیمە بە ئانێ دەباتە عەدەم، میثلی دیتێتـە وجود! بەعزێ سـەلبی قـووەت لە کائینـات دەکەن، موناسـەبە لە بەینـی مەوجـودات نـاهێڵن، حەواســیان عەقڵیــان دەگــۆڕن! جــا ئــوممەت لەوانە بە غەیــری خەسارەتمەندی چ قازانجیان لێ ناکا!

١٩١/٥

## خۆت ماندی مەکە!

دیـقەت لە حـاڵی مسـوڵمانان کە، ئەمـڕۆ لە چ عەزەمەت هـاتنە چ زیلـلەت؟! ئەلئـانیش وەکـی جـاران ئیختیلافـی مەزاهیـب و ئیختیلافـی طەرائیق؟ هەتـا مەشـایخانی کەرامـات و ئەئیمـمانی شیعە ئەڵـێن: ئەمـڕۆ سبەی مەهدی دێ، عیسـا لە ئاسـمان دێـتە خـوار، کاروبارمـان بـۆ چـاك ئەکەن، دنیا ئەبێتە ئی خۆمان. دووکەڵێ دێ بۆ مسوڵمانان زوکـامی ئەدا، کافر پێی هەڵئەپەندێن، شەق ئەبەن، تەق ئەکەن!

ئەمـڕۆ کافرەکـان ئەتـوانن، بە غـازی موخنیـق هەمـوو مسـوڵمانان بخنکێنن.

ئەمڕۆ سبەی دونیا وێران ئەبـێ، دانیشـە، خـۆت مانـدی مەکە، تەمەع چاك نییە خوا ڕەززاقی ڕزقە.

٢٠٠/٥

## هەزار ساڵ ئەکا دە سەعات!

ئێمە بە ڕیوایاتی سیوطی و ئەمثـالی چاومـان لە قیـامەت بـوو، ئەمـڕۆ سبەی ڕائەبـێ! ئەجنەبـی چاویـان لە هەزار سـاڵ لەمەودوا بـوو، ئەمـڕۆ تەدابیریان بـۆ ئیتیخـاذ ئەکـرد، بـۆیە نەوتـی باباگوڕگوڕیـان دەرخسـت، حەربی عوزمایان لەسەر کرد. **لۆرد اڤبری** ئەڵـێ: سـەد سـاڵ بـۆ عـومری ئوممەت، وەك سەعاتێکە بۆ عومری شەخسێ، بەو سەعاتەی کوو سەعی

ئەکەی؟ بۆ سەد ساڵ عومری ئوممەت ئەبێ وا سەعی بکەی!
کەوا بێ هەزار ساڵ ئەکا دە سەعات.

٢٠٠/٥

## ڕۆژگیران و ئەهلی تەقویم!

پار هاوینێ ڕۆژ گیرا کەمێ لە تەقویمی ئێران دەیوت: نحوسەتی تا بیست مانگ باقیە!
بە نوورەددینی برام گوت: لەو قسە وا دەردەکەوێ ئەو ساڵ ڕۆژ ناگیرێ! حەقیقەتەن وا دەرکەوت نەگیرا! وە ئەمساڵیش ناگیرێ، لە ڕەمەزان مانگ گیرا! حیسابی ئەهلی تەقویم ڕێی ئیحتیمالات نادەن، ئەم ئیحتیمالاتی بە دڵی ئیمام و ئامووددی و عضدی دادێ، ئەهلی تەقویم چوزانن، خوا وادەکا یان ناکا!
حاصلی ئەو مەلایانەی زۆر مەلان دەزانن، بەڵام بەناوی دین- حسب ما فهموە- ئەو قسانە دەفەرموون لایان وا باشە، من لام وا نییە!
٢٠١/٥

## چۆن سەعی دەکەن؟!

گەلێ کەس بە شەو ڕزقی خۆی تەئمین دەکا. حەققەن گەلێ مەلایانی قەدیم ئیمانیان زۆر بەقووەت بووە، لەبەر قووەتی ئیمانیان بە قودرەتی خوا، ئیعتیبار بە قسەی خوا ناکەن دەڵێن: سەعی بەشەر بۆ تەحصیلی ڕزق تەئسیری نییە. شاعیریان دەڵێ: ئەوەی ڕزقی من بێ، بۆم دێت، سەعی بۆ دەکەم، ماندی دەبم، دەستم ناکەوێ! ئەگەر دانیشم بە ئاسانی بۆم دێت!
ئەوجا قەومێ تەنبەڵ قودرەت و قووەتی لێ سەلب کەن، حەتتا وەك ئایەتی لەیل مەحوو بن، ئەو قسانە بەڵکو ئەو ئەفسانە لەو ئەکابیرانە ببەن، چۆن سەعی دەکەن؟

٢٠١/٥

## ئێمەی وەك کتکەقەڕی هاویشتیتە دەم!

کەسێ ئەدنا هۆشێکی هەبێ، لە گەلێ شت حەق و باتیڵ ڕاست و درۆ بەخێر و بێ بێر دەزانێ! فەرقی دەکا. کەسێ ویجدانی هەبێ موشاهەدە بکا نازانێ ئینسان عیلم و قودرەت و ئیرادەی هەیە؟ بەو پێیە ئیش دەکا؟ ئاساری قودرەتی دونیای پڕکردیە، ئێمەی وەك کتکەقەڕی هاویشتیتە دەم! ئەگەر دانان بە ئەفسانەی ئەم و ئەو، بۆ فیترەتی خۆتان تێك دەدەن؟ فەرقی حەڕەکەو سکون ناکەن؟ وەك سەعدی دەڵێ:

**ابرو بادومه و خورشید و فلك درکارند**

**تا چنانی بکفاری و بغفلت نخوری**(۱)

ملیۆنەك بەشەر ماندی دەبێ تا ئیستیکانی چایە دێتە بەر دەست! گەلێ کەس فیترەتەن بۆچی دەست دەدا، مەیلی فیترِی بۆچی سەوق دەکا، لە ئەربابی نەزەڕ بزر نییە! سەعد و نەحسی نجوم چییە؟ بۆچی لەو هەموو ئیجرامی علوییە ستارەیێ نەبوو لە سەعدی ئیسلام بدرەوشێ؟ سەراسەر ئەدواری فەلەك لە ئێمە بووبوو بە نەحس؟ لە بێ ئیمانان بووە سەعد؟ بۆچی خوا ئیرادە دەکا ئوممەتی موحەممەد پاش ئەو عەزەمەتە بکەونە ئەو زیللەتە و لێی قورتار نەبن؟ ئەقوامی دی بە ژێر کەوتن، بۆ خوا ئیرادەی کرد دووبارە بەسەرکەونەوە؟ ئێمە هەر دەبێ بە قوڕا بچینە خوارێ؟

ئۆباڵی ئەو دینە ئەو میللەتە بە ملیان بێ، ئەوانەی لێیان تێکدان، ئایاتی قورئانی ئەکوانیان لێ گۆڕین، تەوقی زیللەت و ئەسارەتیان هاویشتنە گەردەنێ!

۲۰۲/۵

---

(۱) لە ڕاستیدا دێڕەکە ئاوایە:

ابر و باد و مه و خورشید و فلك در کارند

تا تو نانی بکف اری و بغفلت نخوری

## مەلایان دینی ئیسلامیان تەنگ کردا!

ئێمە (معاشر المسلمین) تا ئەمڕۆ بێ لە شەڕ و شۆڕی داخلی، دوو زەڕبەمان لێدراوە، نێزیك بووە عالەمی ئیسلامیەت مەحوو بێتەوە. ئەووەلی زەڕبەی جەنگیزخان وە وەلدی هۆلاکۆ سەبەب بە سوئی موعامەلەی خوارەزم شای دەربارەی توجارانی ئوردوەکانی جەنگیز هەڵڕژانە مەمالیکی ئیسلامیە. هەر شار و مەملەکەتێ کەوتە بەردەستی وێرانی کرد، خەلافەتی عەبباسیان لە عێراق بەڵکو لە دونیای ئیسلامیەت ئینقرازی پێدرا. ئەوەی کە هۆلاکۆ و جەیشی بە بەغدا و خەلیفەیان کرد، ناتوانێ ئینسان خەیاڵی لێ بکا. نیهایەت حکومەتی عوسمانی تەشەککولی کرد لە جیهەتی غەرب تەوسیعی پەیا کرد، ئیعتیلای شەئن و شەوکەتی بۆ مسوڵمانان بوو، ئیعادەی حەیاتیانی کردەوە. میصریش لە مودافەعەی تاتار بێ قصور بوو. ئەوجا حەربی سوننی و شیعی دامەزراو دەوامی کرد، هەردوولا زەعیف بوون، ئەورووپا هەناسەی هەڵکێشا و خۆی قایم کرد بە ئیختیراعاتی نوێ هاتە مەیدان، وردە وردە مەمالیکی ئیسلامەتی ئیستیلا کرد، تا هاتە زەمانی حەربی عمومی، ئەوجارە دوور نەبوو بالمرة مولك لە دەستی مسوڵمانان بڕوا، بەڵام ڕەقابەتی دەولی مانیع بوو.

عێراق حکومەتێکی تەشکیل کرد، میصر موستەقیل بوو، یەمەن حکومەتێ ئیمامی بوو، نەجد و حیجاز بووە ئی ئیبن سعوود. تورکیا بووە جمهورییەت، ئێران و ئەفغان حکومەتێ موستەقیلن لە جیهەتی غەرب بە مەحوو حیسابن، ئەوانیش نازانم چییان بەسەر دێت؟! ئەوەندە دەزانم فیسق و فجور ڕۆژ ئەفزونە، حکومەتی سعوودی باشە، ئەگەر قەیدی سوننەت و بیدعەت لە ئیدارەی مولك گەڕێ جێی ئومێدە تەوەسسوع دەکا، وە ئیللا کار دژوارە!

مەلایان دینی ئیسلامیان وا تەنگ کرد، ئەوەی ئارەزووی تەرەقی کا، لای وایە دەبێ لە دین دەرچێ، غەلل و زنجیری پارچە پارچە کا، ئەوجا دەتوانێ شەقاو باوێ! واقیعەن بە گوێرەی تێگەیشتنیان وایە! بەڵام

فی الحقیقه غه‌له‌ته! دینی ئیسلام ڕووحه، ڕووح مایه‌ی حه‌یاته، علوییه بۆ علـو ده‌ڕوا. ئیمـانی ڕاسـت قـووه‌تێكه فـوق القـوی! لای ئه‌وانه‌ی به ئیعتیقادات سه‌لبی قودره‌ت و قووه‌تیان لێ كـردین، لای دوشـمنێ قه‌وی موهه‌ییه‌ئ به‌ ته‌مامی قووه‌تی ته‌بیعی، عاقیبه‌ت دیاره چییه! چاره ته‌غیـری مـافی الانفسـه، ته‌صـفیه‌یێ ئه‌نفوسـه له‌ غه‌ش و ئیعتیقادیـات، ئیتیحـادی فیكر، ئیتیحادی غایه، ئیتیحادی قووه‌ت!

ئه‌گه‌ر له‌ ئه‌ووه‌له‌وه فتوحـات زۆر نه‌بـا، مـولكی ئیسـلام و نفوسـی ته‌وه‌سسـوع و ته‌كه‌ثـوری نه‌كردبـا، ئـوممه‌ت به‌ری ئه‌وه‌نـده سـه‌ده‌ماتی نه‌ده‌گرت! له‌مێژبـوو له‌ به‌نـی ئیسـرائیلیان خراپتـری به‌سـه‌ر هـاتبوو! ئیتـر مه‌لجه‌ئ خوایه! خوایه ته‌وفیق!

٢٠٥/٥

## موسته‌حه‌قی زه‌كات!

مه‌لای ئێمه ده‌ڵێن: زاڵمی شه‌قی، دز، ڕێگـر، مـاڵ زۆر، زه‌كـاتی پـێ ده‌شێ! چونكی فه‌قیره ماڵی حه‌لاڵی نییه! فه‌قیری قیامه‌ته!

توخوا، خوا، قورئان، رسول الله، شه‌ریعه‌تی ئیسلام، ئه‌و نه‌وعه كه‌سه ده‌كاته موسته‌حه‌قی زه‌كات؟ حه‌قی ئه‌وانه دیاره چییه؟!

٢١٠/٥

## موسته‌قبه‌ل!

ئینسان خصوص به‌نـاوی دیـن، گه‌لـێ جـار عـاقیبه‌ت لێـك نـاداته‌وه، هه‌زارمان دیتـیه ئه‌مـڕۆ بـێ موبالاتـانه سـه‌رف ئه‌كـا، سـبه‌ی بـۆ فلسـێك موعه‌تته‌ڵه، حه‌ققه‌ن ئینسان بـێ به‌صـیره‌ته، له‌گه‌ڵ مه‌یلـی بـێ ده‌سـه‌ڵاته، به‌نـاوی دیـن، به‌ جـارێ له‌ عه‌داله‌ت ده‌رئه‌چـێ! لای وایه ته‌ماشـای موسته‌قبه‌ل موناڧی ئیمان و ته‌وه‌كوله موخالیفی ئیعتیماده له‌سـه‌ر وه‌عـدی ئیلاهی، ئیلاهی و سـه‌ییدی ئه‌و قورئـانه كه‌لامـی تـووه، بـۆ خـاتری ئه‌و قورئانه، ڕیعایه‌تی قورئان بكه ئیتر خۆت ئه‌زانی چی عه‌رز ئه‌كه‌م!

٢١١/٥

## کەسابەت!

گوێ مەدەرە قسان و فسانی سەر کاغەز، بنۆڕە خاریج. بەڵێ جەنابی حەق هەرچی هەیە، خەڵقی ئەکا، تۆش بە تەریقێ موناسیب و موافیق پەیای کە، خۆتان کەسابەت بکەن، منداڵتان فێری کەسابەت بکەن، بە زەریفی ئەژین، (العمر علی الله، والعیش علی العباد).

نابێ مەلازادە هۆی، ئەبێ بخوونی، شێخزادە ئەبێ پۆست نوشین بی، ئاغازادە ئەبێ لە دیوەخان پاڵداتەوە، ئەدی ڕزق خوا ئەینێرێ، کووا؟ ئەوا هەموو دادەفەتێن! کەسابەتێ پاك و خاوێن بە شەڕەف ناکەن، ئەبنە کەنناف و کەنناس و فەڕاش و واژەری حکومەت! لە عیبەری کائینات ئەمڕۆ یەکێ لە خانەدانی ئالی عوسمان، ئاورخان ناو، بە شۆفێری گوزەران ئەکا!

٢١١/٥

## خەڵکی بەغدا چ ڕزقێك ئەخۆن؟!

بۆ میللەتی ئیسلام و هەر میللەتێ ئارەزوو کا، بە مەردی بژیە، مەنعی زینا و ئیصلاحی زەواج لازمە، ئان زیادە دەولەتەکان، لەبەر واریداتی عومخانە مەنعی ناکەن.

بە یەکێ لە ئینگلیزانم وت: ئێوە میللەتێ بە شەڕەفن، نەئەبا قەحپە بێڵن لەناو خۆتان.

وتی: تەمام. ئەمما ئەگەر سەدکرێن، واریداتێ زۆر لەقیس حکومەت ئەچێ!

لە بەغدا قسمێ ئەعزەم لە دوکانداران، پارەی لە قەحپان بە فائیز وەرئەگرن، کەسابەتی پێوە ئەکەن، خەلقیش ئەو ڕزقە پاکە ئەخوا.

٢١٢/٥

## مەڕۆکەنە و بەسەر عەردی دا ئەڕۆن!

سبحان اللە ئەوانەی ئەمڕۆ عاردی ئەکوڵن، ئەنەدەروونی لێك ئەکەنەوە، ئەوەی تیای بێ لە دەفائین دەری ئەخەن بە بن چیایان ڕێی شەمەندەفەر دەرئەکەن، بەرد ئەتاوێننەوە، وەك هەویر ئاسن نەرم ئەکەن. نازانن دەعیە چییە؟ وەکی مەڕۆکان بەسەر عەردی دا دەڕۆن!

٢١٥/٥

## تیکرار!

گەلێ لە حوکەمای نەفس وەکی **غۆستاف لۆبۆن** دەڵێن: تیکرار، زۆر بە فائیدەیە!

خۆی بەعزە مەقاصیدێ هەیە لە ئەکثەری تەئلیفاتی خۆی بە عیباراتی موختەلیفە زیکری دەکا، بۆ خاتری بە عمومی وەرگیرێ، لەو تەئلیفە نا لەو تەئلیفە. بێ شك ئەو ئسلوبەی لە قورئان وەرگرتیە.

ئەهلی تەریق ئیسمی جەلالە تیکرار دەکەن لە دڵیان ڕوودەچێ زۆر بۆیان بە فائیدەیە، حەتتا بوتپەرست بە خضوع و خشوع با صەنەم تیکرار دەکا، حاڵێ عەجیبی دەربارەی بوتی خۆی بۆ پەیا دەبێ. ئەمما ئەوەندە دووره لە ئیمان بە وەحدانییەتی مەبدەئی وجود، بە هیچ وەجهێ ڕام نابن نەفرەت زیاد ئەکەن، شلتر دەبن!

٢١٦/٥

## یاهوو یاهوو!

باپیرە گەورەم مەلا عەبدوڵلای ئیبن و جەلی خەلیفەی خامسی مەولانا خالید لەو مەقامە لەسەر ئینسان العیون نوسیویەتی: دیمان لە بەغدا تەیرێ پێی ئەڵێن قومری، بە فەصیحی ئەیوت: حەقی تو. لە شامێ ئەڵێ: حەقی! حەقی! نەوعێ تر ئەڵێ یا کەریم یاکەریم! بەعزێ لە کۆترە ئەڵێ

یاهوو، یاهوو موکەرەرەن. پاشان بە نەفسی ئەڵێ هوو، هـووا لە نیهـایەتی ئەفەرمویٚ **هذا ما وجدناه وفهمناه**.

وەکو عەرزی ئەکەم وایە، لە کەرکـووکێ تەیـرەك هەیە کوردەکـان دەلێن: دەڵـێ یـا باسـط! تورکەکـان پێـی ئەڵـێن بیبـی سـووا هەر نەئیسـە ئەوانەی زوبـانی تەیــر و حەیوانــات و جەمــادات ئەزانــن، تەحقیــری پێغەمبەرەکان نەکەن، ئیتر کەیفی خۆیانە.

۲۱۹/۵

## پڕی دونیا شێخن چییان لێ بکەین؟ چیمان بۆ دەکەن؟!

(أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ) ئەزانن صالح چییە؟ مەخەڵەتـێن صـەلاحی ئیـدارە و مولکـدارییە جـوایەزە لەگەڵ صـەلاحی سـۆفیلکە و موفیلکان، وە لەگەڵ صەلاحی مەلایان.

بنۆڕنە تەئـریخ، (دلـی بەتـرۆس) چـی کـرد بـۆ ڕووس؟ بسـمارك بـۆ ئەڵمان؟ حالەن هیتلەر بـۆ ئەڵمـان؟ مۆسـۆلینی بـۆ ئیتالْیـا؟ لە زەرفـی ئەو چەند ساڵە ئیتاڵیای گەیاندە چ دەرەجەیە؟ ناشـکوری نەبـێ ئـێمە کێمـان هەیە؟ پڕی دونیا شێخن چییان لێ بکەین؟ چیمان بۆ دەکەن؟ خـۆزی لە جیاتی ئەو ملیـۆن ئەولیایـانە چـوار پێـنج کەسـی وەك مەرحـووم مەلیـك فەیسەڵ و سەعد زەغلولمان هەبا.

۲۲۳/۵

## ئاگامان لە خۆ بێ! ئاگاو لەخۆ بێ!

وەسیلە غەیری ئیمان و عەمەلی چاکە، نییە! بەڵام لێرە[1] سۆفییە فێڵـێ ئەکەن خەڵکی ئەخەڵەتێنن، ئاگامان لە خۆ بێ! ئاگاو لەخۆ بێ! وە نەبێ،

---

[1] مەبەستی ئایەتی (اولئك الذين يدعون يبتغون الى ربهم الوسيلة)یە.

کاری خۆیان کرد، بۆیان چەسپا، بوونە وەسائیل! سەعی و وەسائیلیان کردە سەلاسیل! بە ئەدوار زیاد دەکا، ئەمما لە حەقیقەتدا، وەکی ئیلاهی ئەوانە، بۆفن! ئەمما وەکی هەیکەلانی پیر کە لە حیکایەتی ئەسکەندەر باسی دەکەن، ئەوەی بیێ نێك و بەد دەربارەی خۆی یا دوژمنی، دەڵێ:
ئەوە خۆم تەقدیرم کردبوو، ئیللا ڕیش تاشینی (نەسیمی عەییار)!

٢٢٤/٥

## لە شەڕی چاوشینان مەحفوز دەبن!

شام حالەن لەبەر حوکمی فەرەنسەیە، مەهدی ناوێرێ بچێتە وێ، تا موخلیصەکانی مەدینە بچنە لای، مونافیقەکان بە بەر جەفا بکەون! مع انه بعد الاسلام-یعنی تقرری- مونافیق لە مەدینە نەما!

لەو بەینە ئیتاڵیا ئیستیلای حەبەشەی کرد، ئیتر وا زوو حەبەشە ناتوانێ بۆ سەر مەککە بێ! ئەو حەبەشەی احمر الساقین ارزق العینین افطس الانف کبیر البطن کەپوو داتسای زگ گەورە ورگ ئەستوور، خوا دەرفەتیان نادا، کەعبە بڕوخێنن! خصوص ئەمڕۆ مەککە و مەدینە لەژێر ئیدارەی مەلیك ئیبن سعوودن، بحول الله لە شەڕی هەموو چاوشینان[1] مەحفوز دەبن!

٢٢٥/٥

## تەماشای ئاثار و سیەر کەن!

ئەوەی لە ئاثاری بفکرێ، ئەیخوێنێتەوە و وە فائیدەشی لێ چنگ دەکەوێ. تەماشا چ خەزائینیان لە خەراباتی بابل و ئاشووری دەرخست! لە سەیری ئەنام ئەزانین، ئەوەی مەدەنییەتی فازیلەی هەبێ، پایەدار ئەبێ! مەدەنییەتی فاجیرە وەك سابیقەن ئیشارەمان بۆ کرد ئەوەی قانوونێ باشی بێ، وە میللەت هەمووی عەمەلی پێ نەکا، ئەویش داخلی فاجرەیە مەحکومی زەواڵە!

---

[1] چاوشین مەبەستی ڕۆژئاواییەکانن.

با ئەوانــی دی تەماشـای لــوح المحفــوظ کەن! ئەممـا ئێـوە تەماشـای ئاثارو سیەر کەن!

٢٢٥/٥

## بە فیکە فیکی شەیتان لە جێی خۆیان دەرناچن!

شـەیتان، ئەوانەی زەعـیفن بە مەیلـی سـوئی شـەهوانی و حەیـوانی، دەیانتوانی دایان بـڕێ، ئەوانە بانگیـان کەی، بە دووت دەکەون! ئەوانەی بە مەزایای ئینسانی موحەللان، میولی حەیوانیان بێ هێز کردیە، ڕەزین و ڕەصین و گران و قوڕن، بە فیکە فیکی شەیتان بە قانـك و صـەواعیق لە جێـی خۆیـان دەرنـاچن. لە بەعـزە تەئریخـێ ئەڵـێ: نـاپلیۆن لە مەوقیعـێ ڕاوەستابوو ئەمری ئەنووسی بۆ قائیدەکانی، لەو وەقتی گولـلە تۆپێ هات لە نێزیکی کەوت، کردی بە تۆزو گەرد. ئەسڵەن ناپلیۆن نەجوولایەوە و نەخەجلا.

وتــی چـابوو زاتەن خـۆڵم پـێ ئەویسـت کـاغەزەکەی پـێ هیشـك کەمەوە، ئەو گولـلە یاریدەمی کرد خۆڵی بەسەرا ڕژاند.

٢٢٦/٥

## ئینسان لە مەلەك زێترە!

ئەوەندە ئەڵێم (من کل الوجوه) ئینسـان لە مەلەك زێتـرە، لە صـونع و ئیجـاد بە هەزار دەرەجە لە فەوقـی مەلەکە، خـۆزی زەمەخشـەری ئەوڕۆ ئینسانی بدیبا، چۆن بە ئاسماندا ئەفڕێ؟ کـوو قەعـری بیحـار ئەپشـکنی؟ چۆن چیایان دەکۆڵێ؟ چۆن ئەمڕۆ، ئاوا لەم سەری دونیا بە تەلەفزیۆن و تەلەفـۆن و ڕادیـۆ یەکتـر ئەبیـنن، گوێیـان لێـك ئەبـێ؟! ئەم سـەعی و کۆششەیان کرد، لەگەڵ ئەوەشـدا هەروەکـوو مەعایشـی دونیـا عـائیقە لە عیبادەت هەموو ئەدیان مانیع بوون لەم ئیکتیشافاتە!

زەمەخشەری بنۆڕێ بە دەنەمێتێ شارێ بەربا ئەدەن! ژێربەرەو ژووری ئەکەن، بە کەمێ غازی موخنیق عالەمێ ئەخنکێنن!

سەیری بەدبەختی بەشەر، دوو فرقەی مەلایان یەك نەوع یەك دین لەسەر مەلائیکەت بووینە دوژمنی یەك؟ قسەی ناشیرین لە تەفسیر دەربارەی یەك ئەکەن!

۲۳۰/۵

## کێ بە ڕیجال حیسابە؟!

جەنابی ڕسالەت پەنا دیقەت کەن، لە حاڵێ یەکی و تەنهایی، داعی الی اللە بوو، خزم و بێگانە، عەرەب و عەجەم، ڕوئەسای ئەدیانی و دوەل، دوشمنی بوو بێ کەس و یارو یاوەر. موقابەلەی کوڕڕەی ئەرزی ڕاوەستا، سەبری گرت، تێکۆشی، تەحەمولی ئەو هەموو مەشاقەی کرد، سست نەبوو، موەفەق بوو. تەئسیسی دین و خلافەت و مولك و سەڵتەنەتی کرد. ئەمە چ ڕوحێکە! ئەو ڕوحە چییە؟ ئەو زاتە بەو نەوعە ئیدارە ئەکا.

بنۆڕە موسا موقابەلەی کێ ڕاوەستا؟ بەرابەری لەگەڵ کێ کرد؟ زاتێ بوو بە عەصا بەحری شەق ئەکرد. ئاوی لە بەرد دەردەقوڵاند. سەبر و تەحەمولی لەگەڵ قەومی بعد النجاة والهدایة نهایەت مودهیشە. ئەبوبەکر و عومەر موحەییرن، جەنگیزخان مودهیشە، ئەمیری نەوڕۆز، تەیموری لەنگ، محمد چەلەبی، مستەفا کەمال، صەلاحی ئەیوبی، سوڵتان مەحمودی سەبوکتەگین، ئەسکەندەر، ناپلیۆن، بسمارك، واشنتن حاڵی حازر، مۆسۆلینی ئیتالی، هیتلەری ئەڵمانی، کە لە کردەوەیان عەقڵ شێت ئەبێ. وەکەذا سەعد زەغلول. ئەمما غاندی کە ئەکتەری ئیعتیقاداتی قەومی مانگا بووە، لە موەفەق بوونی سەر سوڕئەمێنێ. ڕەزا شاش لە ڕیجالی نادر حیسابە، مەرحووم مەلیك فەیسەڵیش لەوانەیە.

منیش لە مەسلەکی خۆم للە الحمد بە ڕیجال حیسابم، ساحێبی جەزم و عەزمم. بێ ماڵ و صحەت و یار و یاوەر بە دڵی پڕ غەم بە ئیستیلای عەدوو، بە بێ ئینتیزامی ماڵ و بەو نەوعە مواظبەم کرد و ئەیکەم لەسەر تەدریس و وەعز و تەئلیف، تەغەییور دەبی زۆر شوکور.

کەسێ تەفصیلی حاڵم بزانێ تەحەییور ئەکا چۆن بوویمە مەلا. وە چۆن سەبرم گرت لەسەر مەلایەتی.

٢٣٧/٥

## خوا چ ئیشی بە ڕیشی ئێمە نییە!

لە بەعزە ئەشعاری کوردیم دا وتیە: خوا چ ئیشی بە ڕیشی ئێمە نییە، گەورەیە گچکەیە ڕەشە، سپییە، بە ڕدێنی درێژ و گرژ و پان خۆشەویستی خودا دەبا جوو بان. بەڵێ خەیاڵییون ئەو نافیلەشیان تێك دا و بردیانەوە ئیتیحاد و حلول، ئەقڵی میرئات و مەزهەر. بەڵێ ئەمما ئەبێ میرئات و مەزهەر بێ، سیفاتی ئیلاهی ئەثەری تیا دیار بێ.. تەماشای فەرق کە، کەشفی ئەرزی سمسە بۆ مە لەگەڵ کەشفی ئەمریکا بۆ دیانات کامیان بە نەفع بوون! حەقەقەن بە سیعەتی ئەوهام و خەیاڵ دونیامان لێ بووە ئەرزی سمسە. چارە؟ جوابی ئەو سوئالە ئەڵێی چی؟

٢٣٨/٥

## تەمایان هەیە لە فەلەستین تەشکیلی حکومەت بۆ جوولەکان بکەن!

ئالئان عالەم بە یەهوودی خەریکن لە هەموو دەوڵەتان دەریان ئەکەن. لەو ڕۆژانە هیتلەر پاش بلعی ئاوستریای، ئەمری دا بە طەردی یەهوود، سەروەت و سامانیان، میرات. غەیری ئینگلتەرە کەس موعینیان نییە. تەمای هەیە لە فەلەستین تەشکیلی حکومەتیان بۆ بکات، لەگەڵ عەرەبی مسوڵمانان شەڕ و شۆڕیانە. عاقیبەت مەجهوولە.

٢٤٦/٥

## دگوردی شێخی!

ئەڵێن قوتبی گەیلانی باسی میعراجی نەبەوی ئەکا، گۆیا موریدێکی موقەڕڕەبی نەوعە ئینکارەکی دێتە دڵی. ئەو شەخسە ڕۆژەکی جومعەی لە وەقتی موئەزین کەبار ئەکا لەسەر منارە، ئەچێتە دیجلە غوسلی جومعە بکات، دگوردی شێخی لەگەڵ خۆی ئەبا لەناو ئاو سەری سێ جارە سەری دێنێتەدەر لە وڵاتی تر، بە کەناری ئاودا دەڕوا پرسیار ئەکا: ئەڵێن تۆ غەریبی؟

بەڵێ غەریبم.

ئێرە میسرە ئەو نەهرە نیلە.

کابرا ئەچێتە شاری، لای زێڕینگرێ دادەمەزرێ کچی لێ موبارەك ئەکا. پاش موددەی حەمل و کوڕەکی ئەبێ، باز ئاوس ئەبێ کوڕەکی تری پاش ساڵێ ئەبێ باز ئاوس ئەبێ. زگی شەش مانگان ئەبێ. پیاوە ئەچێتە ڕۆخی نیل بۆ غوسلی جومعە، جاری سێیەم سەر دەردێنێ لە کێ؟ لە دیجلە. ئەبینێ ئەوا جلی خۆی و دگوردی شێخی *کما کان*

ئەچێتەوە مزگەوت، کابرای سەر منارەی یالێلی یالێلیەتی. شێخ لە مەجلیسی خۆی هەڵناستایە موریدەکە سەری سوڕئەمێنێ، ئەوە چییە؟! ئەچێ دگوردی شێخی ڕائەخا پاشی نوێژ لە هاتنەدەر کەوشی شێخی دادەنێ، شێخ گوێچکی ئەگرێ، ئەڵێ: مناڵەکانت چۆنن؟

ئەڵێ بەقوربانت بم عیلاجێ.

ئەڵێ ئیتر ئینکاری میعراجی نەبەوی مەکە..

جا بنۆڕە ئەم حیکایەتە قیاس لە میعراج ناکرێ. میعراجی نەبەوی عیبارەتە لە حەرەکەیێ زۆر لە موددەیێ کەم، ئەمما ئەوە علی الاقل نۆ سەد نەوبە شەمس دەوری داوە لە میسر، لە بەغدا وەکی خۆی بووە. تیجارەت و موعامەلاتی و حەجی میسر چۆن بووە؟ حەرەکاتی مانگ و سائیری نجوم کو بووە؟ بێ موحاکەمەیە بەناوی کەرامەت قبوڵی ئەکەن. بۆ میعراجی نەبەوی دەلیلی پێ ئەوێ؟

٢٤٩/٥

## ئەوگەجەرو گوجەرانە چییان پێ دەوێ؟!

ئەمڕۆ مەلای سوننی و شیعی ئەبێ ئاگادارو بە قووەت موتتەفیق بن، بە تەکفیر موقابەلە نەکەن، قەومی چرووك..!؟ شێخ ئەبو عەلی کافر، فارابی[1] کافر، ئیبن ڕوشد کافر، ئیبن تەیمییە طال و فطل[2]، جەمالەددین کافر، محەممەد عەبدە کافر، سەید ڕەشید کافر، تەنتاوی کافر. ئەدی کێ دەمێنێتەوە بۆ حیفزی دین، ئەو گەجەرو گوجەرانە چییان پێ دەوێ؟ وەك لە حەدیس ئەفەرموێ (نحن معاشر الانبیاء أمرنا أن نکلم الناس علی قدر عقولهم) بۆ مەلایان ئەوە دەستورێ واجب الرعایةیە.

٢٥٠/٥

## ناوی ئەسحابولکەهفیان لە نوشتە ئەنووسی!

ناوی ئەصحابولکەهف مەشهوورە: یەملیخا، مەکسیل منیا، مرنۆش، دبرنوش، شازنوش، کفش، ططیوش، ناوی سەگەکەیان قیتمیر. گەلێ جار مامۆستا مەلا ئەحمەد کوێر ئەوەی ئەنووسی لە نوشتە، لە کاك ئەحمەدی شێخی وەرگرتبوو.

٢٥٥/٥

---

(١) فارابی (ابو نصر محمد)، (؟-٩٥٠)، لە فاراب-ی تورکستان لە دایك بووە و لە دیمەشقیش مردووە، بە یەکێك لە فەیلەسوفە مەزنەکانی مسوڵمانان دادەنرێت، لە بەغدا و حەڕان خوێندویەتی، لە دوای ئەرستۆ بە مامۆستای دووەم ناسراوە، بە کتێبی (الجمع بین رأی الحکیمین)، ویستویەتی ڕایەکانی ئەفلاتون و ئەرستۆ بەیەکەوە بگونجێنێ. لە بەرهەمەکانی (رسالة فصوص الحکم، السیاسة المدنیة، اراء اهل المدینة الفاضلة، کتاب موسیقی الکبیر). المنجد، ص٥١٦.

(٢)پێدەچێ هەڵە نووسرابێتەوە و مەبەست ضال و مضل بێ.

## لە وڵاتی ئێمە عەلائیم بۆ گێژ و وێژەکانە!

تەماشای سەییدی ئالووسی کە، لە مەسئەلەی قوببە و عیبادەتی سەر قەبر و هەڵنانی قەبران چ ئەکا، بە تەفصیلی قەدەح و جەرح و تەعدیل و تەئویل، ئەننەهو لە ئەهەممی مەسائیله. لەگەڵ ئەوەشدا لەو وەقتی عیمارەت و مەبانی قەحپان تەشیید ئەکرا، مەلایان شەڕیان نەبوو، خەریکی شەڕی سەر قەبران بوون!

حالەن شەڕ نەبڕایەتەوە لە بەینی وەهابیان و مونتەسبینی تەسەووف و مەشیخەت! بەڵام حق الانصاف عەلامەتێ مومتاز بۆ زەواتی نەوابیغ زۆر لازمە مەوجیبی سەعی و تەرەققییە. ئەمما ئەوەش دەرەجەی مەعلووم بێ، هەر کەس بە هەوای خۆی، نا! جەمیل صدقی بۆ هەیکەلی بۆ بکرێ؟ وکەذا محسن السعدون؟ گەرچی زۆرم خۆش دەویست، چی کرد؟ خۆی کوشت، خراپی کرد! فەیسەڵ باشە، هونەریاتی زۆرە! قوببەی مەراقیدی ئەولیایان بخرێتە سەر ئەبتالان، ئێ وەڵلا، حەیات ئەددا.

لە وڵاتی ئێمە عەلائیم بۆ شێت و گێژو وێژەکانە زۆر خراپە مردنە گەوچییە! سەلیم بەگ یەکێ بوو لەو دوازدە سوارەی مەریوان، کە بە شەبەیخوونێ لەشکری ئێران عیبارەت لە دوازدە هەزار کەس، شکاندیان! بە ئەحمەد پاشای برازای فەرموو: ئێمە حەز ئەکەین بکوژرێین خوێنمان بڕژێتە سەر عەردی مەوتەن تاکو موحەببەتمان لە دڵی میللەتی خۆمان شین ببێ- وەی بێ مراد خۆت سەلیم بەگ! قەومت ئەو قەومە نییە! لەبەر دەروێش و سۆفیلکۆکان و دامەن نەشۆران، ئاگایان لە تو نییە. فی الحقیقة کەسێ بە ئەمەلی خزمەتی کوردان بکا، ڕەنجەڕۆیە، دەست و ئەژنۆیە، ئە ئیمدادی ناگەن!

٢٦٢/٥

## ئوممەت مرد وەك كۆنە دیانان!

من ئینکاری کەرامەت ناکەم، ئەگەر مەصلەحەتێکی دین و ئوممەتی تیا بێ! فارووق بانگی کرد: ***یا ساریة الجبل الجبل!*** ئاگات لە چیای بێ، لە اصطخر بیستی، بەخۆهاتنەوە. نێزیك بوو دوشمن پشتیان لێ بستێنن، ئەگەر تەداروکیان نەکردبا، لەشکری ئیسلام مەحوو ئەبۆوە. باشە! ئەمما نابێ عەسرێکی دی، بە تەمای **یا ساریة** بێ، ئەوجا ئیعتیماد داتە سەر کەراماتی فارووقی، لە تەحەففوز بێ موبالات بێ! بەڵکو ئەبێ زیادە تەقەییود بکا، نەك تووشی غەلطە بێ بەهیلاك بچێ! لەگەڵ ئەوەشدا مسوڵمانان تەلەفۆن و تەلەفزیۆن و میکرۆفۆنیان ئیختراع کردبا، دەها چاتر بووا بە ڕادیۆ و بەزم و دیلانێ مەشاریقی ئەرز و مەغاریبی ئەبێن!

ئەگەر مەلیکی سعوودی لە کێوی عەرەفات میکرۆفۆنی بەدەستەوە گرێ نوتقێ بدا بۆ دەریا دەریای حوججاج لە عەرەفات، هەمووی گوێی لێ بێ، چەند قازانجە بۆ ئیسلامییەت! کەرامەت بۆ مسوڵمانان، قووەتی باش و زەخیرەی تەنگانە بوو، ئەمما فەوتا. عالەم ئیعتمادیان دا سەر ئیش، تێك چوو. ئایات و عیبەری عادییەی کەونییە بۆ ئوممەت چاکترە لە کەرامات! بەنی ئیسرائیلی ئیعتیمادیان دا سەر موعجیزە، تەجاوزیان کرد لە حەد، بە هیلاك چوون! وکەذا قسمێ لەمە، ماڵ وێران بوون.

من ڕسالەکم هەیە لەباسی کەرامات ئەڵێم: کەرامەت وەك زەهر وایە، کەمێ دەرمانە شیفایە، بۆ گەلێ ئەمراض زۆری قاتیلە! خصوصی ڕەقابەتی بەینی ئەولیایان، دونیای پڕ کردیە لە درۆ، بەناوی کەڕامەت. تەبەعەم ئەوێ قووەت داتە درۆ، بۆ زێدە کەڕامەتی شێخی! مع الاسف دینی ئیسلام ئوممەتی موحەممەدی لە کەرامەت زەرەری دیت زەرەر، ئیستیفادەی نەکرد. بە ئیعتیقادیاتێ هاکەذایی، بێ هێز و ئیرادە و عەزم و جەزم و صەبر و ثەبات و ئیقدام و عیلم و بێ ئاثاری قودرەت بوو! لەبەر عەداوەتی خۆبەخۆیی، ئاگایان لە ئەعدای خاریجی نەما.

ئەڵێن وەلی مردی زیندی دەکاتەوە! ئەوا ئەبینین ئوممەت مرد وەك

کۆنە دیانان! شێخ بە هەوادا ئەفڕێ، ئوممەت بە قوڕدا دەچێتە خوارێ! تەماشای لوح المحفوظ ئەکات، قورئان مەحوو بۆوە، ئێ چی تیا ئەبینێ؟ ئەو هەموو موختەرەعاتە مومکین نەبوو فێری بێ لە لەوح وەری گرێ بە ئوممەتی بلێ، تا ئەمڕۆ لەبەر دەستی تەبیعیوونان ڕەزیل نەبن؟ تەیارە، بۆمبا، مودەمیرات ئیختیراع کرا، لە لەوحی غائیبیات دیت؟ یا لە لەوحی کائینات؟ یا لە ئەحوالاتی تەبیعییە وەرگیرا؟ ئەرزی سمسمە کەشف کرا، بۆ ئێمە چ کەڵکی بوو؟ ئەمریکا پشتی ئیسلامی شکاند، لە عالەمی حەقیقی مەحرووم بووین، لەبەر عالەمی خەیاڵ و میثال، خوا تەمەثولیان بۆ ئەکا؟ لەگەڵ قادیانی ئولفەت ئەکا؟ ئەی وای تا بنووسم دەردەم زیاد ئەکا! ٢٦٥/٥

غەمی مایینەکەم نییە چووە، ئەمما ئەوەم غەمە سەر و جڵەوی تێك ئەچێ

پیاوێ ڕووتکرابۆوە لە تەڕەف هەمەوەندان، مایینەکی بۆرەی باشی هەبوو، بردبوویان. ئەیگوت: من غەمی مایینەکەم نییە چووە، ئەمما ئەوەم غەمە سەر و جڵەوی تێك ئەچێ. یەعنی وڵاغی تەعلیم باش بوو ئەو تەعلیمەی نامێنێ!

٢٧٤/٥

## ئەمڕۆ ٢٥ی مانگی سێیە و باغ ڕووتە!

ئێمە چەند ساڵە موبتەلاین بە ئەنواعی ئافەتی ڕەز و باغ. ئینسانی فەقیری مسوڵمان باغەکی هەیە، لە ئەووەڵی شوباتەوە خزمەتی ئەکا، ئەیبڕێ، ئەیکێڵێ، پێمەڕە[1] و قونێری ئەکا، ئەگەر بەرئاو بێ، هەفتە، هەفتە، ئاوی ئەدا! لە وەقتی پێگەیشتن، ئافاتەکی بۆ دێ، یا مەحووی

(١) مامۆستا مەسعوود محەمەد لە کتێبی «بۆ ئەمیری حەسەن پوور لە هەر کوێیەك بێت» دەنووسێت: لە باوکم گێڕاومەتەوە کە دەیگوت شایی (سێپیی) کوردی لە پێمەڕەکارییەوە وەرگیراوە دواتریش خۆم بۆ ئەوە چووم کە ناوەکەی (سێ پێ یی) ش هەر لە پێمەڕەکارییەوە هاتووە، چونکە پێمەڕەکە و دوو پێی بابای پێمەڕەکەر دەبنە سێ پێ.

ئەکا، یا بێ فائیدە ئەبێ. ئەووەڵەن کلۆ زەردی نەجدی، باغاتی نەهێشت، چ جایە بەرا پێستی ئەخوا، دوایێ ئەو چوو، بە نەوعێ خەساراتی حەیوانات لە خەساراتی وی زێتر بوو. لە قەرەچووغ گەرای ناوە، باران وا نەبوو، دونیای شین کا! ژیاوە، چ نەبوو بخوا، مەڕ و مەواشی بێ حەد فەوتا، لەبەر بێ لەوەڕی. ئەوجا زەنگەسوورە، دەردەکی داینێ، نێوی خۆمانی لە فکر بردینەوە، دوایێ ژەنگ و هوڕە، گەرما لێی ئەدا، بێ کەڵك ئەبێ، ژەنگ ئەیکاتە ڕەژوو.

ئەوساڵ زستانی خۆش بوو، داروبار بروت، باوی پشکووت، لە شوبات کردیە سەرما، ئەمڕۆ کە ٢٥ی مارتە، باغ ڕووتە، تازە گڕ ئەبێ، پۆقژەی ئەدا. بارانیش موتەوالییە، نازانین عاقیبەت چۆن ئەبێ؟ ***ما شاء الله، لا قوة الا بالله.***

٢٧٥/٥

## ئەوقافی عموومیان دانا بۆ کۆیە!

حاجی عوسمان و حەمەشین قەریبی سەد ساڵ پێش ئەمڕۆ ئەوقافی عمومییان دانا، بۆ تەڵەبەی کۆیە، ئەمڕۆش دین و عیلم ئیستیفادەی لێ ئەکا. خەیرات و ئەوابیان لە زیادییە.

٢٧٦/٥

## بە کەرامەتی شێخی، حوشتر لەسەر منارە حەیرانی ئەگوت!

بە کەرامەتی شێخی، حوشتر لەسەر منارە حەیرانی ئەگوت! تەمام (کرامة الاولیاء حق والله قادر علی کل شیء) وەرە خوار، کەسێ ئیشێ غایەت ناشیرین ئەکا، ناتوانێ بڵێ: من کردم، ئەوەندەی پێ عارە. ئەڵێ: چبکەم، ئیرادەی خوای وابوو، خوا پێی کردم.

جوتیار شکارتەی خۆی زۆر چاك دی، وە بە بڕیار، ئەی ساحێبی وا نایە، بۆ؟ ئەوە کاری خوایە! نیوەکار گاجووتی توو هەموو ساڵێ ئەمرێ؟

ئەی نامرێ؟ بۆ؟ ئیرادەی خوایە، چما بە دەست منە؟ وەرە خوار منداڵێ فەراقە سبەینان درەنگ هەڵدەستێ، بەڵام وتیان: سبەی زوو ئەڕۆین بۆ سەیران، بۆ چنارۆك، پێش ئەوانی دی بە خەبەر دێ! بەعزێ ئەننەهو ئیددیعای حزوور ئەکەن، ئەمڕۆ ئەڕۆی؟ خوا ئەزانێ کەی تەشریفت دێتەوە؟ خوا ئەیزانێ. هەرچی بیڵێی ئەگەر خوا حەزکا ئەبێ.

یەکێ لەوانە زۆرم خۆش دەویست، پیاوێ باش بوو! دەفعەیە کارێکی هەبوو لە حکومەت موستەعجیل و موهیم، ئەهاتە لای من سەعی بۆ بکەم، ئەموت: ئەگەر خوا حەزکا ئەبێ، ئەگەر خوا حەزکا دەچمە سەرای، تالوکەی چ پێدەوێ؟ ئەگەر خوا حەزکا ڕێك ئەکەوێ. ئەویش سەغڵەت بوو، ئاگای لە (خوا حەزکا)ی نەمابوو.

٢٨٢/٥

## خدر و ئەلیاس بە هانایان نەهاتن!

مەلا و سۆفییان شەڕیانە لەسەر مام خدری! ئەمما ئێستا ناوی گوم بووە. لەوەتی ڕێی بەڕی و بەحری تەئمینی کرایە سەهل بووە. بە شەمەندەفەر و سەیارە و پاپۆڕ تێیای ئەڕۆن، حاجەت بە خدر و ئەلیاش نەماوە! وە ئودەبای عەصر دەعیەیان نایێنێ ئیستیفادە لە خدری بکەن...

چەندێ لەمەوپێش موحارەبەی بالقان کرا، دەوڵەت شکست، دوشمن فەزایح و فەجایعی بە مسوڵمانان و ناموسیان کردن. لە ئەدەرنە [1] وەك سائیری جێگای دی بەناوی خدر و ئەلیاس مزگەوت هەبوون، ژنان بۆ نیاز ئەچوون لە دەورێ دیواری مزگەوت دەستی بە خەنەیان پێدا دێنا خێر و خێراتیان بۆ خدر ئەکرد. مەلا عوبەیدوڵڵا ئەفغانی پاش ئیستیرداری ئەدەرنە تەئلیفێکی کردبوو، من نوسخەکم لە موصڵ

---

(١) ئەدەرنە شارێکی تورکیایە و کەوتۆتە بەشی ئەوروپا و لەسەر سنووری نێوان بولگاریا و یۆنانە. ئیمپراتۆری ڕۆمانی هادریان لە سەدەی دووەمی زایینی ئەم شارەی دامەزراندووە.

دەستکەوت. ئەگەرچی لە تەرەفی حکومەتی مەمنوع بوو، ئەمما والی سلێمان نظیف خوێندبوویەوە تەقدیری کتێبەکەی کرد، دایە من ئەمانەتەن موتالەعەم کرد. حەقیقەتەن قسەی جانسۆزی تیا بوو، ئەڵێ: ئەی خدر! جوونیشی پێ نەدا، بۆ بە فریادی ئەم مخەددەراتە نەهاتی؟ بۆ حیفزی عیصمەتی خۆیان، خۆیان نەخنکاند، خۆیان ئەهاویشتە ناو ئاو، ئەو هەموو نازو نیازە لە حەق تۆ بە هەدەر چووا زاتەن ئەوانە لە مەیدان بەکارنایەن! بۆ ناو پرو پیرێژنان، پەنا و پێچیان باشن.

مەحمەلی ئەولیا گۆیا دیویانە پێش لەشکری گاوری کە هاتیە بۆ سەر لەشکری مسوڵمانان کەوتیە تانووتی لێ داون: ایها الکفرة اقتلوا الفجرة! ئیحتیمالی هەیە ئەمڕۆ جلەوکێشی مۆسۆلینی یا هیتلەر بێ! ئەووەل و ئاخیر بۆ ئێمە فائیدەی نەدا! فی الحقیقة نەدەبا عولەما و عورەفای ئیسلامی بەو نەوعە خەرافاتە خۆیان خەریك کەن، تەفرەقە بێن، لەسەر مەجهولێ عەداوەتی یەك بکەن.

٢٨٩/٥

## جۆرەکانی عیلم!

عیلمی ئێمە دوو نەوعە: یەکێ عیلمی ظاهری، عائیدی بەدەنە. یەکێ باطنی، عائیدی نەفس و قەلبە. عیلمی باطنی دوو قسمە: نظری، کە عیلمی کەلامی بۆ داندراوە. عیلمی تهذیب ی کە علمی تهذیب الاخلاق ی بۆ تەدوین کرایە.

لەسەر ڕوئەسای ئیسلام لازم بوو، هەردوو لا ڕیعایەت کەن. ئەگەر ئەخلاق موهەذەب و قەلب صاف و نەفس پاك نەبوو، عیلمی تەصەووری و تەصدیقی چ فائیدەی هەیە؟

بۆ عیلمی باتینی دوو ڕێ هەیە: یەکی نظر و فکر. ئەمە ڕێی ئەرستۆ و موتەکەلیمینی ئێمەیە. یەکێ تەصفیە کە طەریقی ئەفلاتوون و سۆفییەی ئیسلامە. حەتتا نەظەر بە تەجریدی فیکر لە عوقەلات ئەکەنەوە، چونکی ئێمە موتەمەسیکین بە دینی ئیسلام. ئەگەر ئەعمالی ظاهرییە وە ئیعتیقادی

قەلبییە یا تەزکیيەی نەفسییە ئەبێ لە ڕیسالەت پەنا وەرگیرێ، نەك هەر کەس بە هەوەس ڕێ بگرێتە پێش، ئەمە نابێ، بۆ حوکەمای یۆنان ئان بووە ئەمما بۆ ڕوئەسای ئیسلام مومکین نییە.

لە عیلمی باطن مەقسەد عیلم بە غیوب نییە، *حاشا ثم حاشا*. ئەگەر ڕیازییەت و پاریز بوو، ئەو جۆرە ڕەوشتە بۆ ساحێبی ئەبێ، وەلەو مولحید و زەندیق بێ، ئەڵێن: مەشهوورە.

٢٩٠/٥

## لە جزیرە بێڵە قوڕاوەکی هەڵدا گەیشتە ئێرە!

باپیرە گەورەی ئێمە شێخ ئیبراهیم لە جزیرە[١] ڕۆژێ دەرس ئەڵێتەوە، یەك دوو جارە سەری پەنجەی لاقی بە حەرەکە دێخێ وە تەبەسسوم ئەکات، ناگاه دەفەرموێ: فەقێ کتێبێ لێك نێ! میقداری قوڕاو ئەکەوێتە ناو حوجرە.

فەقێ عەرزی ئەکات: ئەوە چبوو؟

فەرمووی: فەلەیێ جۆگەی هەڵدەبەست، من ئیشارەم ئەکرد، تێکم ئەدا، فەلەکە ئەیوت: کوڕۆ کڕ بە! ئاخیری تووڕەبوو، بێڵە قوڕاوەکی هەڵدا گەیشتە ئێرە.

وتی: ئەزبەنی، ئەتو قەیدی نی، مەلای وە زاتێ بە دیانەتی، ئەو بۆ؟!

فەرمووی: ئەوە عائیدی حەق و ناحەقی دین نییە، عائیدی ڕیازەت و موجاهەدەی نەفسە!

للە الحمد ئێمە ئەووەل و ئاخیر لەگەڵ خوا و ڕەسوول و دین ڕاست بووین و خیانەتمان نەبووە. جا ئەگەر بەعزە ئوموورێ لە تەڕەف خوا، بۆ بەعزە زەوات کەشف کرا، ئەگەر لە مەسلەکی عبوودییەت لای نەدا، غروری نەبوو، کردی بە خدمەتی ئوممەت و میللەت، ئەوە دیارە موقەڕڕەب، خۆشەویستە. وە ئیللا بزانێ بە ئیستیدراج، دەربارەی کراوە.

٢٩١/٥

---

(١) مەبەستی شاری جزیرەیە کە سەر بە پارێزگەی شرناخە لە تورکیا.

## ئەفلاتوون و منداڵبوون!

ئەڵێن ئەفلاتوون داینابوو منداڵی بە وەلەد بووبا، ئەتیبیا فەحسیان ئەکرد، ئەگەر بیانزانیبا ئینسانی توندو مەند و بەقووەت و چاکی لێ پەیدا نابێ، نەیاندەهێشت نوور ببینێ! داك و باوکیش لایان گران نەبوو!

٧/٦

## چ زیندی ئەکەنەوە؟ مریشك، بارگیر، کەر؟

هەرچی ببێتە موعجیزە بۆ ڕەسوول، جائیزە ببێتە کەرامەت بۆ وەلی، چونکە فارق ئیددیعایە، حەقیقەتەن ئەمەیە بە موغاڵەتە ئەچی. بەڵێ من بە ئەوەندە ڕازیم، لاکین ئەوەی لە قودرەتی ئیلاهی بەدەرە بۆ ئەبێتە کەرامەت بۆ وەلی. مەحاڵە چۆن ئەبێ؟ ئەگەر مەحاڵ ببێ، ئیشی تێك ئەچێ! ئەولیا لەناو ئێمە، وەکی ئەحیبیا و ئەبنای بەنی ئیسرائیلییە ئەوان بە مەرامی خۆ گەیشتن، بوونە سەیید و سەروەر و ڕەهبەری ئوممەت، ساحێبی قوببە و تەلا و دەوڵەت و سەروەت. مەلای ڕووت و قووت، بۆ خاتری وان لەگەڵ یەك شەڕ ئەکەن! قوڕبەسەر مەلا، حاڵت خۆشە! مردی زیندی کردنەوە بۆ وەلی لە ئاوخواردنەوە سەهلترە. ئەما مع الاسف چ زیندی ئەکەنەوە؟ مریشك، بارگیر، کەر، پیاوی زیندی ناکەنەوە، کەڵکی ئوممەت بگری، زیللەتمان نەجات دا، ئیتر بەس بێ، دڵم سەغڵەت بوو. یا وایە، یا ئەوانەی کەمێ ئەبنە مونەووەر، بە جارێ لە دین دەرئەچن، بە سەفاهەت مەشغول ئەبن.

سەد خۆزی خوندەوار نەبان، بۆ خۆشیان و بۆ ئوممەتیش قازانجتر بوو. مەلای چاکیش کەمن، یان نەمان، ئەوی هەیە لەبەر فەقیری چی پێ ناکرێ، خوا خوایەتی لوقمە نانەکی دەست کەوی، بیکا بە قووتی لایەمووت.

لە دەوری تەعالی، مەلای چاك و خانەدانی عالی نەژاد زۆر بوون. ئەیانتوانی موقابەلەی ملووك ڕاوەستن.

٩/٦

## وا نییە هەرچی فەرمووبێتیان حەق بێ!

بزانە کەس دونیای هەموو نەگرتیە، وە ناگیرێ، قابیل نییە. ناشکوری نەبێ مولکی سولەیمان ئەوەندە واسیع نەبوو بەقەدەر نیمچە دەوڵەتێ ئێستا بێ! نەمروود و بەختونەصر / نیوخذ نصر هیچ! دەوڵەتی ئاشوور و کلدان بوون کەمێ سیعەتیان ستاند، دەوڵەتی ئێران مەحووی کردن! ئەسکەندەر فتوحاتی زۆری بووە، مەعلووم نییە فتوحاتی بەقەدەر جەنگیز و تەیموور بووبێ. ئیستیشارەی سیاسی لەگەڵ ئەرستۆ بووە، ئەرستۆ و ئەفلاتوون لەوانە نین ئینسانی عالم ناویان بە سووکی بێنێ.

حەقەن چەندە حوکەمای یۆنانی بووین، محیرالعقولن! لەناو ئەو قەومە موشریکانە، چۆن هەڵکەوتینە؟! چۆن خوایان دۆزیتەوە، بە چ تەجەڕودێ، بە چ تەقەدوسێ؟! نیسبەتی کوفر بۆ ئەوانە عەینی جەهالەتە. ئەمڕۆش عالەم لە عیلمیان ئیستیفادە ئەکا، جێی فەخرن بۆ بەشەرییەت، قیاسیان لە سەندەقۆق و مەندەقۆقی ناکرێ! دونیایی بە جمهورییەتی ئەفلاتوون خەنی بووین! کە ئەسکەندەر ئێرانی گرت تەعەجوبی لە عەقڵیاتی کرد، ترسا لێیان، تەمای بوو گەورە گەورەکانیان ئیعدام کا. بۆ حەکیمی نووسی، جوابی دا مەیانکوژە ئەمما لەگەڵ یەکیان بکە بە دوژمن. دەوڵەتی گچکە گچکەیان لێ تەشکیل کە هەر خانێ بکە مەلیکی فیرقەیێ، لەبەر عەداوەتی مابەینی خۆیان هەموو لەگەڵ توو صادیق ئەمێنن! حالەن ئینگلیز تەعقیبی ئەم سیاسەتە ئەکا، عالەمی ئیسلامەتی لەبار یەك هێنادەر، لە هیندستان گەورە گچکە متەوەسیط گەلێ حکومەتی تەشکیل کردیە، لەوسایەوە ئیمپراتۆریەتی خۆی لەسەر هیند ئەکا. من وا ئەزانم ئەگەر عیلمی ئەوانە نەهاتبایە ناو ئێمە، عولەمایانی ئیسلام لە عولەمای جولەکە و دیانان زیتر نەدەبوون! وە

هەموویـان ئەبـوونە تلمیـزی کعـب الاحبـار و وهـب بـن منـبە! وە زۆر موتەئەسسیفم بۆ یۆنـان، ئەو نەوعە علومانەیـان لەقـیس خـۆدا! لە سـایەی مەئمون عیلمیان ما. ئەمڕۆ بە واسیتەی مسوڵمانان حوکەمای غەرب لێیـان ئیستیفادە ئەکەن! بەڵێ وا نییە هەرچی ئەوانە فەرموویتیان، حەق بێ! مـن لە گەڵـێ جـێ قسـەیانم ڕەد کـردیە بە وەجهـی مەعقـوول! ئەممـا حـق الانصاف مەنبەع و مەعدەنی علومی موفیدەن!

١٠/٦

## مەلای بەسیت زۆربوون!

قوربەسەر مسوڵمانان تا عیسا لە ئاسمان دێتە خـوار و مەهـدی لە بیـر دێتەوە دەر، پیستمان دەچێتە دەباخانان! حاسڵی بە قسەی پڕوپووچ عەقـڵ و عیلم و سەعی و صـەنایع و مەتـانەت و عەزم و ئیـرادە و قـودرەت و قووەتیان لێ سەلب کردن بـێ دەسـەڵات مـانەوە. حوکەمـای غەرب کە دیتیان ئیعتیقاداتیان مانیعی تەرەقییـە، بـوونە خەصـمی دیـن. هەرچەنـد لە ئەووەل ڕوئەسای دین گەلێکیان فەوتاندن، ئەمما صەبر و ثەباتیـان کـرد، ئاخیری غالب بوون، بە ئیختیراعات سەرکەوتن، وە وایان نەشر کـرد کە دین مانیعی تەرەققی عیلمە.

جوهەلایەکانی ئێمەش لەو ئیعتیقادە دان، موخاصـەمە لەگەڵ مەلایـان ئەکەن، لەگـەڵ ئەوەشـدا مەلای ئـێمە مانیعیـان نەبـووین لە علـوم و مەعاریف، غایەتی تەشـەییوع و تەسـەووف تێکیـان دا. مەلای بەسـیتیش زۆر بوون، بێ تەفەککور بە قسان هەڵخەڵەتان وە زوعەفایان هەڵخەڵەتاند! ئێمەش تووشـی زیللەتـی ئەمـڕۆ بـووین. مـع الاسـف سـەوادی ئەعـزەم نەصیحەت و قسەی چاك و ڕاستی نـاچێتە گـوێ، دەماغیـان بـۆ درۆ و دەلەسە وەرگرتن، بویتە قەوانی غەرامەفۆن.

١٩/٦

## ئەولیاکان هیچیان بۆ ئیسلام نەکردیە!

فی الحقیقة مەیلی خالص بۆ خواپەرستی، زۆر نادیارە، خوایە خۆت ئەزانی لە نەزەری گەلێ مسوڵمانان ئەولیاکانیان لە ئالیهەی موشریکان فەرق ناکرێن، بەس تەعبیر جوایەزە. بەڵکو بەعزێ نەوعە ئیعتیقادێکیان لە حەق ئەولیایان هەیە، دەربارەی خوا نییە! ئەوانی ئێمە بەناوی *أولیاء الله* سەبەقیەتیان کرد لە *احباء الله و ابناء الله*. وە هەر چەند حەق تەوزیحی ئەکا، ئەو ئەولیایانە چیان نەکردیە، بۆ ئیسلامییەت بەکاربێ. ئەکثەری ئەوهام و خەیاڵات و مەتەڵە. سەوادی ئەعزەم لەو مەیلە فاسیدە ڕۆئەچن، دەست لەو عەقائیدە زائیغە هەڵناگرن. وە ئەوە بە عەینی ئیعتیقادی خوا ئەزانن، بۆیە چارە ناکرێ، باتڵ کە بە صورەتی حەق جەلادرایە، جەلایەکە بشچێتەوە، هەر بە حەقی ئەزانن!

٢٠/٦

## مەدەدی شێخان چارەیان نەکردین!

چەند شەڕ و شۆڕمان کرد بە ئومێدی فلان و فلانی بەهیممەت، پێیان ئەگوتین: غەمتان نەبێ شێخ نایەڵێ، مەلائیکەتمان بۆ دێن، موقابیلی ئالات و ئەدەواتی حازرە. مەدەد یا شێخی سنووسی، یا شێخی شێخ موسا، فائیدەی نەبوو، شکاین! مسوڵمان خانەخۆشتر بوون وەك جوولەکان! بێ هوودەیە، خودا لێمان تووڕەیە! نا ، ئەولیایەکان لێمان عاجزن، با مەولودیان بۆ بکەین! دەفعەیێ تر دێن!

باز هاکەذا! بۆمباردومان کراین، شێخ و مەلا و سەگ وێکڕا هەر ڕایان ئەکرد بۆ کونێ خۆی تێپەستن! بە مسوڵمانانم ئەگوت: ئەوجا بزانن، بۆفە! لە قیامەت ئاوا پێش ئێوە، ئەگەر ڕێ بێ، هەر ڕائەکەن. پیاوی چاك بن! خێرەومەندەکان *کماکان* خراپتر بوون، شیرك بووە تەوحید، کوفر کرا بە ئیمان، چارەی چۆن ئەکەی؟ مەلای باشیش

ئەنانین! بەعزێ هەن، برسین، بێ ئەصڵ و فەصلن، چیان پێ ناکرێ!
مع الاسف ملیۆنێ مع الاسف، دین بێ ساحێب ماوە!
٢١/٦

## قووەی تەبیعی!

لە بەعزە ڕەسائیلی خۆم نووسیومە: ئێمە ئیمانمان بە قووەی تەبیعی نییە، یاخود تەصدیقی تەئسیری قووەت بە کوفر ئەزانین، بۆیە بە ئالاتی تەبیعی کە لە حەقیقەتدا ئاثاری ئایاتی ئیلاهییە، زەبوون بووین ژێرکەوتین. خوا ئەڵێ: قووەت ئامادەکەن، ئاگاداربن، لە ئەسلەحەتان غافڵ مەبن، *لا یغنی الحذر من القدر*.

برام من قووەت موقابیل خوای حازر ناکەم، موقابیلی دوشمنی خوایە -*ترهبون به عدو الله وعدوکم*-! بەڵێ قووت تیرە ئیشی باب و باپیرە! ئەیهوو تیری چی؟ بنۆڕە ئالاتی حاضرە، دەها ئەجانیب، سەعی لە ئەکمەلییەتی ئەکەن!

نا، چ نییە، ئەسبابی عادیە تەئثیریان نییە!

مەلا! ئەوە دونیایێ بە غاز خنکا، شارێ بە بۆمبایێ وێران کرا، دێیێ بە لوغمەیێ ئاگرین ژێر بەروژوور کرا!

نا چ نییە ئەفەندی!

چۆن چ نییە؟

بڕۆ ماڵ خراپ خۆت کافر دەکەی، ئیمامی ئەهلی سوننە ئەشعەری و ماتوریدی وا ئەڵێن!

برام وا نییە خوا ئەسبابی دانایە!

نەخێر ئەسباب نییە، هەمووی عادیە، سببیە و مسببیە، علیە ومعلولیە نییە!

نیهایەت مسوڵمان بێ چارە ژێرکەوت. بڕوا مەکە بەو حاڵە ڕاست بێتەوە!
٢١/٦

(تەواو بوو ساڵی ١٣٥٧ لە یازدەی نیسان)[1]

---

(١) دەکاتە ١٤ی نیسانی ساڵی ١٩٣٨ی میلادی.

## مەلا لە کوردستان نینە؟!

لە بەغدا بووم، زاتێ هاتە لام زۆر بێ موبالاتانە دەستی کرد بە قسەکردن. وتی: مەلا لە کوردستان نییە، کورد بێ مەلان، نە شەرع نە تەفسیر نە حەدیس نازانن، بەس خۆیان خەریك ئەکەن بە علومی یۆنانی و علومی عەقلیەی هیچ و پووچ.

وتم: مەلا ئەوەی ئارەزووکا قورئان بەڕاستی بزانی، ئەبێ زۆر ئاگاداری ئەو علومانە بێ، حەتتا علومی عەصرییە گەلێ لازمە بۆ تێگەیشتنی قورئان.

وتی وانیە. ئەگەر ڕاست ئەکەی مەعنای (کهیعص) چییە؟

وتم: زۆر مەڵێ من و تۆ ئیمانمان هەیە، ئەوە لە تەرەف خوای بۆ ڕەسوولی ئەکرەم نازل بووە، وە مەلایان قسەیان لێ کردیە. ئەمما حاڵی حازر لە بەغدا مەندووبی سامی بەریتانیا ئەنووسی: ئەما (ای ڕس جی دی ۲) ئەمە بزانە مانای چییە.

مەلا کەمێ جوڕە جوڕی کرد و دوایی هەڵات!

۲۶/٦

## ناوی ئەولادی خۆم!

ناوی ئەولادی خۆم ئەکثەر لە نەوادیرانن! ئی زۆر مەبذول و موستەعمەل، غەیری عەبدوڵلا و محەمەد و چەند ناوێ تر، گەلێ بە قیمەت نییە! خۆزیا ئەوانەش کەمتر بووبان، نەبووبانە ناوی هەرچی و پەرچییان!

گەلێ ناو نەزەر بە ئەصلی موسەممای، زۆر بە وەقع و هەیبەتە. ڕۆژێ تێفکریم گەلێ کەس ناویان عومەرە، خۆیان بێ خێرو خوێرین، وتم خۆزیا ئەو نەوعە ناوە لەوانە نەندرابا، بۆ مەردانی نامدار هەڵگیرابان! خۆ کە بانگی باخچەوان و زەبالی حەمام و عەمەلەی قوڕکاری ئەکەن بە شەمسەددین و نەجمەددین و موحیەددین، حەققەن ئەو ئەلقابە گەورە

گەورە خەیلی چووکەڵەیی ئەنوێنێ! مەقسەدمان سووکی و چرووکی ئەو زاتانە نییە، مەقسەدمان باب و داکی منداڵانە، بە گوێرەی ناویان. میهنە فێری منداڵان کەن، تا ببێتە نەقال و تەتابوق، ئەمە زۆر جوانە.

٢٨/٦

## لە خزمەت شێخ عەلی ئەفەندی!

من خوا ئەزانی کە لە خدمەت **شێخ عەلی ئەفەندی** هەڵستام، بۆ جێی خۆم ئەچوومەوە، تا قەریبی سعاتێ نەمەدەتوانی لەگەڵ کەس قسە بکەم. حەتتا خەیاڵم ئەکرد، ئێستا مەلایە بێ، قسەم لەگەڵ بکا، زۆر بە نادانم تێدەگا. چونکی قسەم لەگەڵی پێ ناکرێ.

٣٠/٦

## قەومی ژێردەست!

قەومێ کە بوونە ژێردەست، هەرچەن بۆ خەڵکی نەرم ئەبن، ئەمما دەربارەی یەك، زۆر بە ڕق و قین و تەجەببوڕ و ئەنانییەت ئەبن! قەومێ کە بکەوێتە زەمانی مەنکووبی، وایان لێ دێ وەکی حاجی قادری کۆیی دەرحەق کوردان ئەڵێ:

گزیری بۆ ئەجنەبی قبووڵ ئەکەن
نەك کەسێ لە خۆیان ببێتە ئەمیر

٣١/٦

## دەبەرت مرم ئەو خانییە چۆڵە؟

لە دەوری فەقێیەتیم ڕۆژێ لەبەر دەرکی ماڵی خۆمان ڕاوەستابووم ئیشەکم هەبوو، ژنێ بەتاڵوکە لە بازاڕ ئەهات، خانێ چۆڵ لە بەرانبەرم بوو. وتی: دەبەرت مرم ئەو خانییە چۆڵە؟

وتم: ئا!

وامزانی قەزای حاجەتی هەیە، هەندە نەچوو ژنەکە هاتە دەرێ

منداڵەکی هاویشتبووە ناو تەووری بە پشتی خۆی دادابوو، بێ ئانین و حەنینی و ئۆف و مۆف، چۆوە ماڵی خۆی لە دەشتێ، بێ عەزاب و ئەلەم و وای و ئۆی.

٣٦/٦

## مێژوونووسەکان تەبیعەتی شاعیرانیان هەیە ڕاستگۆ نین!

زۆر خۆشە ئینسان ناوی چاکەی بەڕاستی بکەوێتە ناو تەئریخ، ئەمما وەکی تێ ئەفکرین ئەکثەری موئەریخ، تەبیعەتێ شاعیرانەیان هەیە، لیسانی صیدقیان کەمە. خاصەتەن ڕوئەسای ئەدیان و مەزاهیبی خەسیسە، زوبانی صیدق ئەوەتە بێ مەیل و تەمەع بێ، ئەلئانیش ڕوئەسای ئاوروپایی لیسانی کیذبیان دەربارەی خاتم الرسل وەك ماری ڕەش جەولان ئەکا. ئەوەی عالەمی تەئریخ، بەڵکو عالەمی کەون نەیدیتیە بە ئیفتیرا دەرحەقی ئەڵێن.

دەخیل گوێ مەدەنە قسەی مەلایان دەرحەق یەك، زەمم و قەدحیان، وە سوپاس و ستایشیان مەجوبێنن، تا خۆتان لە کوتوب و ئاثاریان ئەیبینن، ئەو وەقتیش، زوبانی بەد ببەستن، ئیستیغفاریان بۆ بکەن. مەسەلەن شێخی ئیبن سینا وە شێخی ئیبن عەرەبی[1] وە شێخی ئیبن تەیمیە، وە

---

(١) ناوی ئەبو عەبدوڵلا محەمەد کوڕی عەلی کوڕی محەمەد کوڕی عەبدوڵلا ئەلعەرەبی ئەلحاتەمی ئەلتائیە. بە ئیبن عەرەبی بەناوبانگە، بەڵام لەگەڵ قازیی ئەبوبەکر ئیبن عەرەبیی مالیکی جیاوازە. لە ساڵی ٥٦٠ی کۆچی لە مەرسیەی ڕۆژهەڵاتی ئەندەلوس لەدایك بووە. لە ساڵی ٥٩٨ بەرەو حەج دەچێت و بە باکووری ئەفریقیا و میصردا تێدەپەڕێ. لە گەشتەکەی بەردەوام دەبێ و بە بەغداو موصڵ و قاهیرە و حەلەب و قۆنیە و دیمەشقدا دەڕوات و لە ساڵی ٦٢٩ تا لە ساڵی ٦٣٨ کە وەفاتی کرد، هەر لە دیمەشق مایەوە. زۆربەی کتێبەکانی لە ئەندەلوس نوسیوە. نزیکەی ٧٤ کتێبی نووسیوە و پەنجا و شەش لەو کتێبانە ڕەگەڵ کتێبی (الفتوحات المكية) خراون. وێڕای بەرهەمی ناوبراو، هەریەك لە کتێبەکانی (فصوص الحكم، كتاب التجليات، كتاب المحجه البيضاء، كتاب العبادلة، رسالة الاخلاق، رسالة الاتحاد الكوني، كتاب الخلوة...هتد) لە بەرهەمەکانی ئەون. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە پێشەکی ←

هاکەذا قسەی بەدیان دەرحەق کراوە، زەواتی زۆر گەورەن، غایەت مەلا بووین، تەماشای کتێبیان کەن، ئەوەی باشە وەریگرن، ئەوەی باش نییە، ئیقتیدارتان هەیە، باری ڕەددی کەن، ئیقتیدارتان نییە سکوت کەن. بە تەعن و لەعن ئەدای ئەو نەوعە بزورگەوارانە با نەکرێ. وهاکەذا دەرحەق خصومیان، وە بڵێن (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ) فی الحقیقە ئەو شیقاق و عەداوەتە شتێ خراپ بوو لای خۆیان بە خێریان ئەکرد، ئەمما بۆ خۆیان و بۆ ئوممەت زۆر شەڕ بوو.

٤٤/٦

## کوڕە شێخ و کوڕە مەلاکان!

کوڕە شێخ و مەلایەکان چاك ڕوویان کردیتە سەفاهەت هەر مەپرسە! ئەڵێن: بەعزێ لە وەقتی عوشرەت تەئەسسوف بۆ باوکی ئەکا، کە لەززەتی لە دونیایێ نەدیت، سەبەب بە دینداری، لە شەڕاب و مەوادی ڕوحییە مەحروم بوو. ئەمەش حق الانصاف قەباحەتی ئوممەت و حکومەتە، ئەهلی خوایان ناوێ کە بەڕاستی بۆ خوا بصولحێ ئەمین بی لەگەڵ دین و میللەت و دەوڵەت.

٤٨/٦

## حەجاج و پیرەژنێك!

ئەڵێن حەججاج سوار ئەبوو، پێی لە ڕکێفێکی نابوو پیرەژنێ دوعای لێکرد و وتی: نەبووبی هەروەکو "کلا" لە قورئانی سەرەوەدا نییە.

حەججاج تا پێی دی خستە ناو ڕکێف، هەموو قورئانی ژووروی بەسەر دڵدا هێنا، وتی: پیرەژن ڕاست ئەکا کەللای تیا نییە!

ئەمە هەر نەئیسە، ئەگەرچی نایەتە دڵ، ئەمما شەوو ڕۆژێ سێسەد

---

(الفتوحات المکیة، محی الدین بن عربی، المجلد الاول، دار صادر، بیروت، بدون سنه الطبع).

هەزار خەتمی قورئان کوو بە وەهم و خەیاڵ دادێ؟! وە هەم ئەڕێن پیرەژن بزانێ کەللا لە نیصفی ئەووەلی دا نییە، کوو حەججاج نایزانێ؟
نەخێر نابێ، حەججاج زۆر بە قورئان خەریك بووە!

٥٦/٦

## شەفاعەت!

قسە زۆر کراوە لە شەفاعەت، لای موعتەزیلیان نییە، ئیللا بۆ نەیلی دەرەجات، بۆ عەطف ی گوناهـ نییە. لای سوننیان زۆر مەبذووڵە. لای بەندەی حەقیر ئەوەی بە ئیتیکالی شەفاعەت گوناه بکا، لێی مەحرورمە. شەفاعەت بۆ ئەهلی کەبائیر وەکی صلاح الدین، سوڵتان مەحمودی سەبکتەگین، وە سوڵتان محەمەدی فاتح موقەریر ئەبێ ئەوانە بەعزە گوناهی گەورە بکەن. وە ئیللا گەلێ ئیشی گران و گەورەیان موعەتتەڵ ئەبێ، فتوحاتیان بۆ ناکرێ. حەقیقەتەن شایانە ڕەسوولی ئەکرەم بۆ ئەو زەواتی کیرام ببێتە شەفیع. ئەمما کەسێ سەرسەری، بێ خێرو بێر فاسق و فاجر، دز و ڕێگر و سەففاك و بێ باك، بە جەمیعی مەعنای کەلیمە موزیرڕ بۆ مسوڵمانان، نازانم چۆن ڕێ ئەدەن ئەو تکایەیان بۆ بکرێ؟ جەنابی ڕیسالەت پەنا کوو تکا بۆ ئەوانە ئەکا؟!

٥٨/٦

## قەرنی نوور!

ئەم قەڕنە پێی ئەڵێن قەڕنی نوور، لاکین زوڵوماتی عەقائید زێدە شیددەتی ستاندیە، ئیش لە فکرو موحاکەمەدا نەماوە، بوویتە قەومییەت و عەصەبییەت.

٥٩/٦

## عەلی کوێر بێ ئەگەر ئارەزوو بکەم کەسێك عەزاب ببینێ!

هەمەوەند عەداوەتی تاڵەبانییان ئەکرد، حەتتا لە دەورەی تەکیەی شێخ عەلی خالصی گاڕانیان بە تاڵان برد. ڕۆژێ لە خزمەتی بووم ئەو باسە کرا، وتم: خوا بیانگرێ.
فەرمووی: توخوا کاك محمد وا مەڵێ، یاخودا عەفویان کەی، بۆ منیان عەزاب نەدەی. عەلی کوێر بێ ئەگەر ئارەزوو بکەم بۆ من خوا یەکێ لە ئەفرادی ئوممەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) عەزاب بدا.

٦١/٦

## چارەی مسوڵمانان تەرکی عەداوەتە

ئەمڕۆ کە زەمانی نوشوستە، ڕابیتەی ئیمان سستە، باوەڕناکەم بە حەق دوو کەس لەبەر ئیمان بە ڕاستی یەکتریان خۆش بوێ، هەر فرقە خۆ و شێخ و ئیمامی خۆی! ڕوئەسای دین علی الدوام سەعی لە تەفرەقە ئەکەن عەقڵی مسوڵمانان ئەشێوێنن، تا ببنە موسەخخەری وان، ئەمما ئەوە زۆر غەڵەتە، ئەمڕۆ، سبەی، ئەو دار و دەستەیە نامێنێ!
چارەی مسوڵمانان تەرکی عەداوەتە، مەحەببەتی ئیمانی و ئیجتیماعی کەلیمەیە، گردبوونەوە لەژێر ڕایەتی **لا اله الا الله محمد رسول الله یە!** باقی تر لە حەقیان بڵێین (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ..)

٦١/٦

## خوا موقەددەسە لە دانیشتن و قەدەم لەسەر کورسی دانان!

ئەڵێن عەرەبێ بەدووة چاوی بە هاروونە ڕەشید کەوت، لەسەر ئوهەبی خلافەت و لەسەر سەریری مورەصصەع و مولەممەع وتی: السلام

علیك یا الله! ئەمما ئینسانی هەبوو و تێگەیشتوو ئەزانێ بڵندی شەخص، بە بڵندی جێ نییە! وە مت و مەرجان و دوڕ و ئەڵماس بازنێ زێڕ و زیو، قاتی فورمەیی و سورمەیی بۆ زاتێ کە بە حەق ئینسان بێ، مایەی زیبا و زینەت نیە. ئەمما گەلێ ملووك وەکی منداڵان ئەوەی ئەکەن، ئەوەش بۆ جەلبی نەزەری منداڵانە!

ڕیجالی ئەوروپی زۆر ستایشی عەبدولحەمید خانیان ئەکرد، زاتێ گەورەیە، سورمە و نیشان بەخۆیەوە ناکا، بەس لە ئەییامی ڕەسمییە نیشانەی خانەدانی و سەڵتەنەتی بە سینگی خۆیەوە تەعلیق ئەکرد. ئەمڕۆ زاتی ملك الملوك ساحێبی ئاورەنگی ئیمپراتۆری وسیع الملکی کە ڕۆژ لە مولکی وی ئاوا نابێ، لەسەر ئەو تەختی عالی بەختە، صەیەکی لەگەڵ دادەنیشێ، با عەرشی هاکەزایی هەبێ! ئەمما خوا موقەددەسە لە دانیشتن و قەدەم لەسەر کورسی دانان! گەر وابێ ئەویش جسمێکە جەسیم و موشەککەل وەکی ئێمە، ئەو وەقتە مەسئەلە ئەگۆڕێ، ناتوانی بڵێی جیسمی واجب الوجود، نابێ!

٦٥/٦

## ئەوروپایی بە زیکری مەولەویانیان ئەگوت: تیاتڕۆی دینی!

مەلایان خۆیان ماندی کردیە، زیکری خەفی و جەلی کامیان باشترە؟ حەق ئەمەتە، لە بەعزە حاڵ خەفی لە بەعزە حاڵ جەلی. دینی ئیسلام هەردوو لای هەیە. ئەمما ئێمە گفتوگۆ لە زیکر ئەکەین، قسە لە های و هووی، نەڕە نەڕە، لرف و هۆڕ، و گرمە گرم و زرمە زرێی دەروێش و سۆفییان ناکەین.

وام ئەبیست ئەوروپایی بە زیکری مەولەویانیان ئەگوت: تیاتڕۆی دینی. ئەوە موجیبی تەئەسسوفە کە لە دینی ئیسلامی دەزانن، وەك تقوسی سائیری میلەلی تر.

٦٨/٦

## لەبەر بێ قیمەتی کوردانە عولەما کوردی نازانن!

جمهـوری عولەمـا ماشـائەڵلا گەلەکیـان کنـز اللغـاتن، لە فارسـی، سـریانی، حەبەشـی، عیبـری، نـوبە، بەربەری، هنـدی. ئەممـا مـع الاسـف کوردیم لێ نەبیستینە، ئەوە لەبەر بێ قیمەتی کوردانە!

٧٠/٦

## صورەتی موخەییەلە!

لە زاتەکم بیست، فەرمووی: جەمعێ دانیشـتبووین شەخسـێ بەعـزە شتی وەك کۆتر و کەروێشکی نیشان ئەداین، وامـان خەیـاڵ ئەکـرد، کە ثابت و موحەقەقن. پیاوێ فۆتۆغرافی مەجلیسی کێشا، غەیری خۆمـان چ صورەتی تری تیا نەبوو! بەوە زانیمان موخەییەلە اخذ بالعیونە!

٨٨/٦

## کۆیینە پێمان مەخەڵەتێن!

ساڵێ چەنـد لەمەوپـێش جەمعـێ هـاتنە کـۆیە، هەنـدێ ئەلعـابی هاکەزاییان کرد. گەورەکەیـان ئەیـوت: کـۆیینە پێمـان مەخەڵەتێن! ئەمە هەمووی بۆفە! ئێوە ئاگاتان لەو عیلمە نییە! کەسێ ئاگـادار بووبـا، پـاقری ئێمەی دەرئەخست!

گەلێکم دوعا بۆ کردن مەمنونیان بووم. ئەگەر وەك شێخەکان فێڵاوی بان، عالەمیان ئیغوا ئەکرد.

٨٩/٦

## توخوا ئەمە عەیشە!؟

چەند ساڵێ لەمەوپێش جەرائیـد ئیعلانـی کـرد: ئەمـڕۆ ڕۆژێـکە کە تەئریخ نەیدیوە، موددەی هەشت سعات لە لۆندەرە ڕۆژ دیتراوە، نووری داوەتە دەر و دیار! توخوا ئەمە عەیشە؟

١١٠/٦

## ئینسان و مەلەك!

حەققەن عیبادەتی ئینسان قیـاس لە عیبـادەتی مەلەك نـاکرێ، چـلەی زستان، بەفر و باران، ڕەشـەبا و زریـان، مسـوڵمانێ کەم ئەوزاع، ڕووت، بێ نوینی موناسب، بە سەد فڕوفێڵ نەختێ جێی خۆی گەرم کردیە، زۆر نیە، خەوی لێ کەوتیە، مەلا بـانگی سـبەینێ ئەدا. لە خەو بەخەبەر دێ (الصلاة خیر من النوم) لە جێی خـۆی ڕائەپەڕێ. دەسـت بەجـێ دەسـت نوێژ ئەشوا، لە ئاو بە چاوداکردن، هەموو دەماری بەدەنـی وێـك دێ، بە لەرزە دەچەقێ و دوو ڕکاعەت نوێژ ئەکا. خوا ئەیزانێ ئەو نـوێژە هەزار عیبادەتی مەلەك ئێنێ.

١٢٧/٦

## خۆزی ئێمە کەسێکمان هەبا، عیلمی بەقەدەر عیلمی ئەدیسۆن با، با کەسمان نەبێ عیلمی وەك عیلمی خوای بێ!

بێینە باسی قودرەت ئەگەرچی بە بەدەن زۆر قووەتی نیـە، ئەممـا بە فیکر و عیلم و ئیختیراع بە نەوعی مەقدیرەتی بەشـەریان دەرخسـت، کە مەلائیکەت تیای حەیران بن. ئـی ئینسـان هەمـووی ظـاهیرە، بەرمەیـدانە، خەیاڵی و وەهمی نیـە، گـوێی لـێ کە، ئەم شـەو لە کـۆیە بە واسـیتەی ڕادیۆ بزانە لە لۆندەرە چ ئەڵێن؟

لاکین مع الاسف، لە ساحەی ئیختیراع و لە عورصـەی ئیکتیشـافات،

مسوڵمانەکی تیا نیـیە. بەڵکـو لە حەقیقەتـدا یەکـێ لە میللیـونی تیـا نیـیە! ئەگەر ماجەرای حەربی عمومیت بۆ باسکەن، مەدهۆش ئەبی، لە صونعی بەشەر، لە قووەتی بەشەر. ئەمڕۆ توخوا بنۆڕە هیتلەری ئەڵمانی چی ئەکا؟ بە ڕادیۆ قوماندەی ئەدا، عەسـکەری نـاردە قەتـعەی ڕایـن، موقـابیلی ئەو هەموو دەوڵەتـانەی کە ئیمزایـان بە موعاهەدەنـامەوە بـوو! دەوڵەتـێ نەمـا قووتی دا، لە هەفتەی ڕابردوو کوڕڕەی ئەرزی هێنـایە هەژان، دەوڵەتـان دڵەکوتکەیـان پێوەنووسـا، ئەکـثەری لە ترسـان، دڵیـان گەیشـتە گەروو. تاکوو مەجبوور بوون، ئەوی ئارەزووی بوو، لە حکومەتی چیکۆسلۆڤاکیا بۆیان دابڕی، دایانێ، دەوڵەتە گەورە گەورەکان تەصدیقیان کـرد. بنـۆڕە مۆسۆلینی دەوڵەتی حەبەشەی بە موددەیە کەم ئیستیلا کرد، نە ئینگلیز نە فرەنسە نەیانتوانی فزەی بکەن! ناشکوری نەبێ لەو مەیدانەشدا مسوڵمانان کەسیان نییە، ناوی بنێین. هەندەیە کە هەروا نەبییان لێ پەیا دەبـێ! ئەممـا نەبیێ هیچ و پووچ.

دیارە زیللەت تەئسـیری تێکـردینە، ئەوانـیش وەکـی بەنـی ئیسـرائیلی (لایعد) نەبییان بەدەردەخەن! مع أنە مللیونێ لەو نەوعە نەبییانە، بۆ قەومی خۆیان هێر هیتلـەریان تـێ نـابێ! ئایـاتی کەریـمەی قورئـانی نە مەدحـی مەلەك (من حیـث هـو ملـك)، نە ئینسـان (مـن حیـث هـو انسـان) ئەکـا، مەدحی قورئانی مەدحی عینوانییە، چـاکە مەدح ئەکـا، حیفـزی سـاحەیی ئولوهییەت ئەکا. حەتتا مەدحی مەریەمە، بۆ حیفزی ڕیسـالەتی ڕەسـوولی خۆیەتی. بـۆ ئیثبـاتی تەقەددوسـی مورسـەلە، جـل جـلالە. لاکـین ئەوەی جەدەلی بێ قسە ئەکا، لە ڕوحی حەقیقەت نافکرێ.

حەققەن ئەمڕۆ ئیشتیغالی مەلایـان، بەو نەوعە مونـازەعە لە سـەخافەت مەعدودە، خۆمان لەلایە، لە مەلائیکە گەورەتر حیساب ئەکەین، وە لەژێر چەپەڵۆکی ئەجانب بمێنین، عەینـی حەمـاقەتە. خـۆزی ئـێمە کەسـێکمان هەبا، عیلمی بە قەدەر عیلمی ئەدیسۆن با، با کەسـمان نەبـێ عیلمـی وەك عیلمی خوای بێ، بۆف و بێ ئەمەر! ئیتر با بەس بێ. دڵم سەخڵەت بوو.

١٢٩/٦

## ئــاو!

سبحان الله هەرچی ذی حەیات بێ ئەساسی تەشەککولی وە دەوامی حەیاتی بێ ئاو نابێ! لە عەناصری بونیە ئایدرۆجین و ئۆکسـجین ئـاو کە مورەککەبە لەوان، لە هەموویـان پتـرە! حەیـات لە ئـاو نەشـئەتی کـردیە، ئەکثەری تەبیعیون قبوڵیانە! بەعزێ نازانێ لە کێ هاتیە بۆ ئەرزی! لەلای وان ئەرز بە مـایقێکی نـاری لە ڕۆژ جـودا بـوویتەوە، لە فەزا جەولانـی کردیە، تـا گەیشـتیتە ئەو مەرکەزی حـازری، تەبەررودی کـردیە گەورە بووە. پاش چەند هەزار ساڵ حەیاتی نەبـاتی تیـا پەیـابووە. *بعد مرور من الدهور والاحقاب*، حەیوانات، ثم ئینسانی تیا ئیجاد کراوە! وە ئەڵێن مانـگ لە ئەرز جودا بوویتەوە! ئایا عەرەبـی جـاهیلییەت ئەمە ئەزانـن؟ لە کێیـان بیستیە؟ دیتیە؟

١٣١/٦

## خۆزگە موعتەزیلیەك زیندووبایە ئەمڕۆ!

خۆزی ئەمڕۆ، یەکێ لە گەورەکانی موعتەزیلی زیندی با، بینواڕیبـایە شروری عالەمی کەون و فەساد، وە حاڵێ سـەییئی مسـوڵمانان، دیـنەن و دونیـایەن. لام وایە ئەیـوت: *أسوأ و أفسد* واجبە. عەرزم کـردن مـن لەو قسـانە نـاکەم، ئەگەر بـزانین شـەڕ و خەیـری ڕاسـتی و حەقیقـی چییـە؟ ئەمانزانی نەبعانیان لەکوێوەیە، گەلێك ئیعتیبـارییە، لای ئێکـی خێـرە، لای دیگەری شەڕە. وە یەك شـت، ئەبـێ بە خەیـر و مـایەی سـەعادەت لای کەسێ، وە لای ئێکی تر ئەبێتە شەڕ و مایەی شەقاوەت و سەییئات.

حەتتا عیلم ئەگەر لەسەر ئەخلاقی حەسەنە داندرێ زۆر نـافیع ئەبـێ، ئەگەر لەسەر ئەخلاقی سەییئە داندرێ زۆر موزیرڕ ئەبێ. بەڵـێ مەبـدەئی خەیر و شەڕ- *من حیث الخلق والایجاد*- هەر خوایە.

١٣٥/٦

## جیقنەی تەیارە!

پێش بۆنبەردومانکرانمان ئەکٹەری ناس، هەتـا قسـمیٚ لە عەمـامەداران ئەیـانگوت تەیـارە چیـیە؟ فەڕەزم فەڕەزم جیقنەکـی بەرداوە، ئەوجـا چ دەبیٚ؟

که هات، هەوڵی بۆنبەردومانی دیت، لە چۆکی خۆیان دەدا.

١٣٦/٦

## دەنگی مەلایان بە کۆخەکۆخە و دەنگی موتریبان بێ گری و کۆخە!

هەندیٚ ئینسان موددەتیٚ حەیـات بەسـەریاندا درێژبـوو، چ کەنـد و کۆسپەیان نەکەوتە بەر، مەغروور بوون نە یادی خوا دەکەن لەو جیهەتە، نە ئی ئالیهەیـان. حەقـیقەتەن حـاڵ ئەمەیە ئێسـتاش وایە، فاسـق و فـاجر، شەڕابخۆر و قومارکەر بە تەمامی بە دەوڵەمەندی و خۆشی و صیحەت و عافیەت ڕایئەبوێرن. ئەگەر ناوی خوایان لەکن بێنی توورە دەبن، خـوای چی! جانم ئەمە کۆنە قسەیە؟! ئەمە قسەیە؟! ئەوی مەلایە دائیم خەریکی خزمەتی دینی خودایە یا زاتیٚ موتتەقی لەخوا ترسە، فەقیـر و نەخـۆش و دەردەدار لە هەمـوو جـیهەت حـاڵ نـاخۆش. فاسـقەکان گەمەیـان پـیٚ دەکەن، ئەنۆڕیە خەتیبی بەلیغ و فەصیح: ئـوح ئـوم و.. دائـیم ئەکـۆکیٚ، گیزە گیزی لە سینگییەوە دیٚ. دەنگی گڕ، گاهـ گاهـ ئەنووسیٚ. گویٚ لە موتریبەکان ڕاگرە دەنگ ساف و خۆش، بیٚ گریٚ و بیٚ کۆخە.

١٣٧/٦

## تەرازووی ئەعمال!

مامۆستا کوێرە فەرمووی: لە ئەوائیلی سلووکم لە سلێمانی بووم. هاتە دڵم، ئایا ئەو تەرازووەی ئەعمالی ڕوسول و ئەولیا و عولەمـای پـیٚ هەڵ ئەکێشریٚ، ئەعمالی ئێمەشـی پـیٚ وەزن ئەکـریٚ، یـا جـودایە؟ هەرچەنـد

سوئالم کرد، بە جوابێ شافی نەگەییم. دڵم گەرم بوو، حاڵم هاتە سەر، کەوتمە چۆڵ و سەحرا- زاتەن لە ئیبتیدای نەشئەتی تەریقی گەلێ جار حالاتی گەلێ عەجیبی بەسەردا دەهات- ئاخیری هاتمەوە شار بە خدمەت حەزرەتی کاك ئەحمەد گەیشتم، نازانم چۆنی زانی بوو؟

فەرمووی: ئاشەوان، زێڕ و شێلم چۆن بە یەك تەرازوو وەزن ئەکرێن؟ ئەوجا دڵم ساکین، حاڵەکەم بەسەرچوو!

١٣٨/٦

## موریدی چاو قوچای گەردەن کەچ!

موریدەکانی سۆفیان ڕادەوەستن گەردەن کەچ، دوو دەست لەسەر دەست، چاو قوچای بێ حیسس و حەرەکە. حاشا بەو نەوعە خشوع و خضوع و ئیجلال و تەعزیمە لە نوێژێ ناوەستن، ئەو ڕاوەستانە و تەمثیل و موراقەبە شتێکی ئیرثیە و ئەو عوکوفە فوق العبادة ئەفەرموێ، ئەوانە چن؟ بە چ وەجهێ ئەیانپەرستن.

١٤١/٦

## وێنەی شێخ عەلائەدین و عەشیرەتی ئاکۆ!

چەند ساڵێ پێش ئەمڕۆ حەزرەتی شێخ عەلائەدین چەند قەتعە فۆتۆغرافی خۆی ناردبووە ناو ئاکۆیان و ئەترافیان بۆ خاتری ئەوانەی بە لیقای زاتی ئەقدەس موشەڕەف نەبووین. بنۆڕنە صورەتی هومایینی، گەلێ کەس ئەچوون لە موقابەلەی ڕادەوەستان بە کەمالی تەعزیم و تەبجیل هەتا چەندێ لەسەر پێیان.

١٤١/٦

## سەییئەی کوردان نەزەر بە ئەقوامی دی ناخوێندرێتەوە!

نوقڤالان ئاگری دەکەنەوە، مەگەر بەس خەیاڵ بتوانێ، *ابن الجریر* لە موجاهیدی نەقل دەکات، ئەو ئایەتەم خوێندەوە )قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ( لەسەر عەبدوڵلای بنی عومەر. فەرمووی یا موجاهید ئەزانی کێ ئیشارەی کرد بە سوتاندنی حەزرەتی ئیبراهیم؟

وتم: نا!

وتی: پیاوێ لە ئەعرابی فارس، یەعنی لە ئەکراد. وەکەذا *ابن عطیة* جەزبی داناوە ئەفەرموێ: خوا بە ئەرزیا بردیە خوار تا قیامەت ڕووئەچێ!

—خوا ئینسانی درۆزن بە قوڕدا بدا- ناوی **لاهەیون قیل هدیر** بووە، حەققەن ئەوە لە ناوی کوردەواری نییە. با وابێ مەقسەدی چییە؟ زەمی کوردانە، بێ مەعنا. ئەو هەموو سەییئاتی لە حەقی پێغەمبەری کرا هەتا دائیر بە ناموسی مەعصومانەی لە تەڕەف کوردان بوو! یا عەرەبان! حسێنی سیبگی کێ کوشتی؟! ئەو ئەطفالە مەعصوومانە کێ هیلاکی کردن؟ کورد سەری حسێنیان بڕی؟ کورد زەکەریای بە منشار شەق کرد؟ کورد ئیشارەی کرد بۆ سەربڕینی یەحیا بۆ کەیفی فاحیشەیێ؟ کێ ئیمامی حەمزەی مەثولە کرد و جەرگی خوارد؟ سەییئەی کوردان نەزەر بە ئەقوامی دی ناخوێندرێتەوە. حق الانصاف تا ئەو تەریقەتی نەقشییان نەهاتە ناو لە هەموو عونصوران خاوێنتر بوون، ئەمما *بعد ذلك* بە ئەکثەرییەت خراپ تێك چووین، نە کەلکی دین ئەگرن، نە کەلکی دونیا. لەبەر دزی گەلێ حیز بوون، ئاگرێ وا عەزیم چۆنی بهاوێتە ناوێ بە درۆ و دەلەسە ڕێکی ئەخەن بە مەنجەنیق ئەویش کوردەکە کردی. بەڵێ با وابێ لەسەر ئەو شیددەتە ئەڵێین قومقمۆك فووی لێدەکرد، بۆق ئاوی لە کیسەی دا دەبرد ئاگرەکەی بکوژێنێتەوە. نازانم پەڕەسێلکە و فندەگولە چییان کردییە؟! قیل و قالێ تووڕەهات.

١٤٣/٦

## شێخێ بای گەرم بردبووی، گڵ و دۆی داندۆکیان لە بەدەنی دا!

کەرامەت بە کەرامەتـی زاتـی سـاحێب کەرامەت کەرامەتە. هەزار خەواریق بنوێنی دوایە دەست پان کاتەوە بۆ پارە، چەنە بتەقێنی بۆ ساوار و داندۆك، ئەو کەرامەتە چ قیمەتی هەیە؟

زاتێ لە ساداتی کیرام و مەشایخی قـادری و ئەقـاریبی خۆمـان، بـای گەرم بردبووی، گڵ و دۆی داندۆکیان لە بەدەنـی دا، هـاتە چابوونەوە. چوومە زیارەت و عیادەی، عەرزم کرد: توو ئاگر سەدئەکەی، ئەمما بای گەرم ئەتبا، دۆی دووکەندووی داندۆکمان تێهەڵسووی، تا چابوویەوە.

خولاسـە ئەمـانە گشـتی فـرت و فـێڵە، ئیتتیبـاعی سـونەتی ئیلاهـی لە هەمووی چاکترە.

١٤٥/٦

## مەرتەبەی صەلاح!

مەرتەبەی صـەلاح مەرتەبەیـێ گەورەیە، بە دەسـت هەمـوو کەسـێ ناکەوێ. گەرچی ئێستا دەربارەی کەچە شێخێ بڵێی لە صـالحانە، تـووڕە ئەبێ! وەکەذا موریدی بوغزت ئەکێشن.

١٤٦/٦

## ئاورووپایی کە دەڵێن: دین مانیعە، ڕاست دەکەن!

خۆزی سەیید ئەمڕۆ زیندی با، دیبای لە بەغدا تەیـارە چۆن دێ و دەڕوا، گوێی لە ڕادیۆی با بە تەلەفۆن موخـابەرەی کردبـا. بەڵـێ عەرزم کردن، ئیعتیقاد مانیعی تەرەقییە، ئاوروپایی کە دەڵێن: دین مانیعە، ڕاسـت دەکەن، بەو نەوعەی ڕۆئەسای دیـن تێیـان گەیانـدین، دیـارە مـانیعە، وە بەڵکو گەلێ دین بۆ سەفالەت سەوقی ئینسانی ئەکا.

١٥٠/٦

## نوقڤالانی ئێمە، بەس کەیفیان لەگەڵ ئوعجوبەی سیحر و کەرامەت و موعجیزە دێت!

لە تەئریخی عمومی ئەڵێ: میعماری لە فنیکە/ فنیقییەکانیان جەلب ئەکرد، فنیکەئی سیعەتی مولوکیان بووبوو، بووبوونە ساحێبی مەعادین و مەڕمەڕ و ئەشیای دی. مەللاحیش پیشەیان بوو، لە بەحرا بەقووەت بوون، لەوانـی ئەو لەوازمە دەرکـردیە، ئەمە خـۆیەتی. دوایـی دیـم، ڕۆژی دووشەموو، پێنجی شەووال لە موجەلەی هیلال عەدەدی خامس، شەهری یولیۆ ١٩٣٨، باسی لە ئوسـطولی مەلیـك سـلێمان ئەکـرد، زۆرم پێخـۆش بـوو، حەتتـا کە حەزرەتـی سـلێمان ئینشـای ئوسـطولی کـرد، طەریقـی تجـارەت لە بـادیە ڕووی کـردە بەحـری ئەحـمەر. سـەفائین دەهـات و دەچـوو، مەحصـولاتی شـام و یەمەن و هینـدی ئێنـا و ئەبـرد، خەزێـنەی سەبەئ چۆڵ بوو، لە مکوثی تجاری. بۆیە مەلیکەی سەبەئ مەجبوور بوو، هـاتە زیـارەتی سـلێمان. ئەممـا نوقڤـالانی ئـێمە، بەس کەیفیـان لەگەڵ ئوعجـوبەی سـیحر و کەرامەت و مـوعجیزە دێـت، گۆیـا ئیمانیـان بە ڕەسوولان بەقووەت دەبێ!

١٥١/٦

## نێزیکە بڵێم من لە ئەییوب نەساغترم!

نێزیکە بڵێم من لە ئەیـوب نەسـاغترم حـاڵم ناخۆشـترە بە بـاداری و مایەسیری موبتەلام لە ئەووەلـی عـومرەوە. فەقـر نعـوذ باللـه، قسـم الفقـر ظهری، مولك لێ غەصبکراو، مـاڵ بە تـاڵان چـوویی، کەسـێ مـوتەڵیعی حاڵم بێ تەعەجوب ئەکا، چۆن شتێ ئەزانم وە چـۆن ئەتـوانم بنووسـم؟ عەلاوەی هەمووی ئـال چـاغی ئەحمـەد دیـونی قائیمقـامی کـۆیە ١٩٣٨، حزنا علی حزن ئەدا!

١٥١/٦

## دەخیل نەکەی!

ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ڕۆژێ *یافەخرم* قورئانی دەخوێند، زۆر مواضب بوو لەسەر قورئان خوێندن کەم کەمە غەڵەتی ئەکرد. دەفعەیێ ئەو ئایەتەی خوێندەوە، بەو نەوعە (جَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا) وتم: دەخیل نەکەی! یەکێ عەقائیدی ئەهلی تەوحیدی وا پێ تێك چوو! ئەگەر دوو با! بە جارێ دونیا لە ئەهلی تەوحید وێران دەبوو..

جار جار دەڵێم: خۆزی ئەویش بە طەریقێ موعتاد بووبا تا ئەو هەذەیاتانە نەگوترابا. بەعزەن ئەڵێم ئەمە نیهانییە، هەر ئەگوترا بە تەرزێکی تر بەیانی کوفر و ظلالیان ئەکرد.

١٥٣/٦

## تا ئەوەیان بەسەرهات!

ئەڵێن ئەو وەختە کە سوڵتان مەحموود دەوری بوو، عادەت وابوو وەکەذا سوڵتان محەمەد فاتیح خەریکی فەتحی ئەستەنبۆڵ بوو، ئەهالی بەلدە و ئەرکانی حکومەت و دین دەچوونە لای بوت و هەیکەل و تیمسالی عەزرای یەسووع و دەپاڕانەوە نەجاتیان بدەن. مع الاسف ئەو سەفاهەتە هاتە ناو ئیسلامیان ئەووەڵەن ڕوحی حەیاتیان لەو نەوعە ئایەتە[1] نەزع کرد، دوایێ عەقڵ، دوایێ قووەت و ئیرادە، تا ئەوەیان بەسەرهات، کە دەبینین.

١٥٥/٦

---

[1] مەبەستی ئایەتی (إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ..الانبیاء)

## گەر بموێرابا ئەموت حەقی لەسەر خواش هەیە!

ئەی قەومـی نەجیبـی عەرەب! ئێـوە لە هەمـوو کەس ئەقرەبتـرن، خۆتان لەو ڕەحمەتە مەحرووم مەکەن، پەیڕەوی هیدایەتی ئەو ڕەحـمەتە بکەن، ئەبنە سەرتاجی ئومەم. ڕیسالەتی ڕەحمەتە بۆ ئەنام، گەرچی گەلێ کەس خۆیـان مەحـرووم کـرد، لەو ڕەحـمەتە! حەقـقەن ڕەحـمەتە بـۆ ڕەسوولان، عولـووی مەقـامی ئاشـکرا فەرمـوون، لە ئالآیشـی یەهـوودی تەنزیهی کردن، ڕەحمەتە بـۆ ڕیسـالەت، جلـوە و شەعشـەعە و جەلال و هەیبەتی دا بە ڕیسالەت، ڕەحمەتە بـۆ مەلەك و دەرەجاتیـان. عیصـمەتیان مەعلوم بوو ڕەحمەتە بۆ شەیتان، میقداری قـووەیی (کـمّ ) و (کیـف) و وەسوەسەی دەرخست. لە گەلێ توهەماتی نەجات دا. ڕەحمەتە بۆ ژنـان، لە دڕکی ڕەزالەت و زیللەتی هێنانەدەر، ڕێی هیدایەت و ضلالی بۆ ئەنام بە وازحی کردەوە، هەر کەس حەققی خۆی دایە، عەزەمەت و قودرەت و جاهـ و جەلال و تەنەززە و تەقەددوس بلّنـدی مەقـامی ئولـوهییەت وە حەقیقەتی وەحدانییەتی کیبریائی موکەممەل دەرخست.

جەنابی ڕەسـوولی ئەکـرەم حەقـی لەسـەر عـالەم هەیە، گەر بموێرابـا ئەموت حەقی لەسەر خواش هەیە. ئیتر نازانم چ بلّێم؟ بەشـەر غەدداره - خصوص ئەوروپایی- لەگەلّ ئەوەشـدا لە عوزەمـای دیـن و دونیـا کەس نایەتە تەرازووی خاتم الرسل.

١٥٩/٦

## ئەشخاصی حکومەت بە جارێ حکومەتیان سارد و سڕ کردا

تەفسـیری سـوورەتی ئەنبیـا تەواوبـوو، ئەممـا زۆر تەئخیـر بـوو، لە ئەواخیـری جەمـادی ئەووەل تـا ئەواسـیتی شـەووال چمـان نەنووسـی، موددەیە چنارۆك، دوایە لەبەر غەم و ناساغی، بێ ئیدارەیی و گـوزەران، وە ئەشخاصـی حکـومەت ئەحـمەد دیـونی، معـاون شـەمعون بە جـارێ

حکومەتیان سارد و سڕ کرد. دوو سێ ساڵە ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی موتەصەریفی لیوای هەولێرە، بە جارێ لیوا زێر و زەبەر بوو، ئیتر خوا ڕەحم کا. رب احکم بالحق، ئامین ڕۆژی چوارشەموو ئەووەلی کانون ثانی ڕۆمی، ٢١ی شەووال ١٣٥٧ی هیجری ١٩٣٨ی میلادی.

١٦٠/٦

## قسە مەکەن! نەوەك تەیارەچی گوێی لێ بێ!

ئێمە لەو ساڵەی ١٩٢٢ی زایینی زەلزەلە و شیددەتی بومبەردومانمان دیت. فی الواقع ئافرەتی شیردەر منداڵ بە باوەشەوە قەصدی ئەکرد منداڵەکەی فڕەداتە پەنای شاخێ، نەوەك تەیارەچی گوێی لە گریان بێ بە دوویان بکەوێ. بەڵێ ئەم جەهل و ذوهولە کەوتە دڵی پیاوێ زۆر گەورە لە ئەشکەوتی خۆی ئیشارەی ئەکرد بۆ ڕەفیقانی خۆی، قسە مەکەن! نەوەك تەیارەچی گوێی لێ بێ! وە گەلێ ژنی بەردار بەریان فڕێدا. ئەمە با وابێ.

## ئەبو نەواس و مەستی!

ئەڵێن ئەبو نەواس ڕۆژێ تەماشای سەرخۆشێ ئەکات، لە حەڕەکات و نوکات و ئیشاڕات و هەزەیانی پێ ئەکەنێ. تەعەجوب ئەکا، ئەیڵێنێ: تۆ چۆن تەعەجوب ئەکەی؟ بە سەرخۆش پێ ئەکەنی!

ئەڵێ: تا حاڵ من سەرخۆشم نەدیتیە.

ئەڵێن: کوو؟

ئەڵێ: کە لەگەڵ یاران بادەگوساری ئەکەم، لەپێش هەمووان مەست ئەبم، ئاگام لە خۆم نامێنێ، دوای هەمووان بە ئاگا دێمەوە!

بەڵێ ئەوانەی مەستی شەرابی بن، مەست و مەدهۆشی عەزابن.

١٦٣/٦

## دکتۆر ڕیاض حەلەبی و ئافرەتی حامیلە!

حاجەت نییە مەلائیکەت منداڵدانی لە دەرکەی لێك کێشتەوە تا منداڵەکە بێتەدەر. بەشەر ئەلئان ئالەتی وەهای پەیداکردییە، لە وەختی عوسر و شیددەت و تەنگانی دەتوانێ منداڵ و داکی قورتار بکات، مەگەر حەجمی وەلەد بالکل ناموساعید بێت.

دکتۆر ڕیاض حەلەبی وتی: ئوستازێکمان هەبوو زۆر موشفیق بوو لە فەننی تەولید زۆر ماهیر بوو. عادەتی بوو پاش دەرس لە بەعزێ مەسائیل دەدوا، هەم عیلم هەم حیکایەت. ڕۆژێ وتی شەخسێ هات بە تەهلوکە دەعوەتی کردم بۆ چارەی ئافرەتێ کەوتبووە حاڵێ ناخۆش لە وەختی زان. چووم موعایەنەم کرد! وتم قابل نییە، ئەم منداڵە نایەتەدەر، چونکە قطری سەری لەگەڵ دائیرەی مەخرەج نیسبەتی نیهایە، زۆر گەورەترە. ئەو کەللەیە بەو دەرکەدا بە سەلامەتی مومکینی خروجی نییە. وحسب القانون ئەلئان نابێ دەستی لێدەم، لە موددەی مەعهود لە دوام نەهاتن، دڵم کەوتە خرت و پرت سەبەبی چییە موراجیعەیان نەکردەوە؟ نەختێکی پێچوو زاتەکە هات. حق القدم لیرەکی بۆ هێنام، وتی ئافرەتەکە بە سەلامەتی وەزعی حەملی کرد.

دەهشەت گرتمی، مستەکم لەنێوچاوانی خۆم دا، وتم: ئەگەر وابێ من دکتۆر نیم.

کابرا ڕۆیی، کەمەکی پێچوو بە جەزع و فەزەع هاتەوە: دەخیل وەرە عیلاجمان بکە.

وتم: تۆ فەرمووت بە سەلامەتی قورتار بوو، ئێستا ئەڵێی چی؟

وتی: وەختی موناقەشە نییە.

بەناوی ئینسانییەت موافەقەم کرد و چووم. دکتۆرێ تر لەزگی بوو، ژنەکە فەریادی دەچوو بۆ ئاسمان. کابرا چارەی پێ نەدەکرا، ئالەتەکانی بێ عەمەل و کۆن. تومەز کە من دەڕۆم ئەو دکتۆر دێنن، هەم بە سەلامەتی داك و منداڵ، هەم بە قیمەتی لە ئوجرەی من کەمتر عەمەلیاتی تەولید بکات. تەرەحومم بە ژنەکە کرد، منداڵەکەمان بە مردی هێنادەر.

١٦٦/٦

## شێخی کەپووبڕای!

یەکێ هەبوو پێیان ئەگوت شێخ مستەفای وەسمانی کەپوو بڕای بەد ئەصڵ، ئینتیسابی تەریقەتی نەقشی بوو، زۆر موحتەڕەم خصوص لەلای موصل. ڕۆژێ هاتە کۆیێ درەنگ لە ماڵی جیرانی ئێمە میوان بوو، ئێوارە نیسکیان هەبوو، شێخ ئەیفەرموو: دەبێ خوا نەمابێ، دەنا ئەمن کوو نیسکی دەخۆم؟ ئەوانە ئەیانەوێ وا لە ئەمر و ئیتاعەیان دابێ. (خسر الدنیا والاخرة) هەردووکی لەکیس ئەچێ. حەقیقەتەن ئەو کابرایەش بێ حورمەت بوو بە کوشتن چوو. گەلێ جار ئەڵێم: ئەوانەی لە سەرەمەرگ ئیزهاری کوفر ئەکەن، با وجودی لە عەصری ئێمە هیچی وا نەبووە. ئەساسەن نەبووە، کوفری مەکتومیان بووە حەتتا خۆیان حیسسیان نەکردیە، بەڵکو ئی وا هەیە کە سەغڵەت بوو، کفریان ئەکا خۆی ناگرێ. ئەگەر ئیمان مەحکەم بوو، نە بە شەدائید نە لە سەرەمەرگ، وەهنی عارض نابی!

١٧١/٦

## صابئییەکان!

صابئین ئیددیعا ئەکەن لەسەر دینی ئیبراهیمین. ئالئان کەمێ لە بەغدا و میقدارێ لەلای شام هەن، خۆیان بە هادی ئەزانن. تا ئەم زەمانە لەسەر دینی تەورات ماون، حەتتا لە قەڕابینی خۆشبووی خودا ڕوونەکەنە مەوقیعێ لە چیایێ کە ئیسحاقی تیا درێژکرایە بۆ زەبح. مسوڵمان و جوو و دیانان بە کافر ئەزانن. قەومێ موتەعەصیبن، زەواج لە غەیری خۆیان لەگەڵ کەسی تر ناکەن، ڕوو لە کەمین!

١٧٣/٦

## ئەوبەر و باوەشەی کردۆتە نەسیبی سەگێك!

*فـی یومنـا هـذا*، هندۆسـی مسـوڵمان ئەکـثەری مەیلیـان لەسـەر گاجووتە، سەگ ئەوڕۆ مەعبـوودی ئەورووپیـانە. لە بەغـدا بـووین ڕۆژێ ئافرەتێ ئەورووپایی سواری سەییارەیێ بووبوو، وەك ئافتاب ئەدرەوشایەوە، سەگێ ناشیرینی لە باوەشدابوو، سەگەکە دوو دەسـتی هاویشـتبووە سـەر شانی، دەمـی لەنـاو دەمـی. شێخ سـەدرەددین گـوتی: خـوایە ئەو بەر و باوەشە ساعەتێکی هەزار لیرە ئەهێنێ، ئەوا کردیتیە نەسیبی سەگێکی.

پشیلەش وەقتێ لە میصر پەرستراوە، ئەمڕۆش بەعزە زەواتێ گەورە لە میصر زۆر مەحەببەتی پشیلەیان هەیە!

ئینسان دائیمە حازرە بۆ عیبادەتی غەیری خوا، وە ئەکثەریشی بە ناوی خوایە، ئەمە سەیرە!

١٧٥/٦

## دوو ملیار بەشەر سەجدە بۆ گا ببا، هەر گاجۆتە، سەری ببڕە بیکە بە کفتە و شفتە!

بەشـەر هەیە سـوجدە بـۆ خـوا نابـا، بـۆ کەر و گـا ئەبـا، حەقـقەن نامووس و شـەریعەتی فیطری پایەمـاڵ ئەکـا. بنـۆڕە ئەم زیلـلەتە بەشـەر ئیختیاری ئەکـا، بەرد و دار چییە؟ سـەجدەی ببـاتە بەرا! کە دار بـێ بەر بوو، بیبـڕە، بیسـوتێنە. دیـومە زاتـێ گەورە فەرمووبـووی: ئەگەر غەیـری خوا، چم بپەرستبا، ڕۆژم ئەپەرست!

ئەمما ئەمڕۆ مەعلـومە ڕۆژ لە ڕۆژی ئـێمە گەورەتـر و مـونەوویرتر زۆرن، ئەگەر ئەمەی بزانیبا، وای نەدەفەرموو. غەیری خوا کەس شایەنی عیبادەتی بەشەر نییە، بەشـەری بەڕاسـتی بەشـەر بـی، لە غەیـری خـوا لە هەمـوو شـت گەورەتـرە. لاکـین ئەوانە زوڵـم لە ئینسـانییەت و ئیهـانەی خۆیان ئەکەن (وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ) ئەوە عەجـایبە. ئەوەی لەبەر

دەستی کەرێ ڕادەوەستێ، سەجدە بۆ گاجووتێ ئەبا، خۆی بە موهان نازانێ، ئەننەهو نەوعە قودسییەتێ لەوانە خەیاڵ ئەکا، نازانم بۆ قودسییەتی خۆی حیسس ناکا؟!

سبحان الله بەشەر وای لێ دێ حیسسی حوسن و قوبح ناکا، بەڵکو قەبیح کە موعتاد بوو، بە حوسنی ئەزانێ. موئمین کە تەماشای ئەو نەوعە بەشەرە بکات، چۆن حوکم ئەکا بە غەیری ئەمە بڵێ: ئەمە بە ئیدارەی خوایە، حوکمی ئیلاهییە!

ئەدی چ بڵێ؟ زیللەت کە بووە تەبیعی چارەی ناکرێ. نەفسی لەئیم و دەننی و سەفیل بە عیززەتی نەفس موتەئەللیم ئەبی ئەوەی تەبعەن دەنی بێ، لەسەر ئاوڕەنگی شاهەنشاهی دانیشی هەر موهانە، دەنییە. فەرەزەن دوو ملیار بەشەر سەجدە بۆ گا ببا، بە خوای بزانێ، هەر گاجۆتە، نابێ بە هیچ، وەك گاجووتی دێ، سەری بڕە، بیکە بە کفتە و شفتە، *وعلى هذا فقس*

١٧٦/٦

## هەزار جەوهەری وا لە کۆیە لە کوردستان ڕۆیی!

دێتە یادم کە ڕێی شەمەندەفەر تەواو بوو لە بەینی شام و مەدینە، لە تەڕەفی مونتەسیبی ئەو ڕێیە پادشاهی ئالی عوسمان سوڵتان عەبدولحەمید خانی ثانی ئیعلانی کرد حەججاج بە قیتار بڕۆن بۆ مەدینە! خوتبەکەمان خوێند لە مەیانە ئیقتباسی ئایەتی (وَهُدُوا إِلَىٰ صِرَاطِ الْحَمِيدِ)مان خوێندەوە.

ئەحمەد ئەفەندی قوتب زادە لێرە قازی بوو، پاشی جومعە وتی: ئەفەندی ئەگەر زاتی شاهانە ئەو خوتبەی گوێ لێبا، ئالئان هەزار لیرەی پێ ئەدای، لاکین لێرە زایعە!

بەڵێ هەزار جەوهەری وا لە کۆیە لە کوردستان ڕۆیی، با بردی! مع الاسف عولەمایانی کیرام و ڕیجالی سیاسەت و حەماسەت ناویان بزر بوو!

١٧٨/٦

## مەلایە قوتەی مل نێرکە کاردی!

ئەو هەمـوو مسـوڵمانانە شـەرقی، غەربـی، جنـوبی، شـمالی لەوێ[1] گـرئەبنەوە، دەوڵەتـێ وەك ئینگلیـز بە مەسـرەفێ فـوق الطاقـة عوشـری میعشاری ئەو خەڵـکەی بـۆ خڕنـابێتەوە! ئەو ئەقـوامی مـوختەلیفە زوبـانی یەکتریان بزانیبا، چونکی زوبانی یەکـدی نـازانن، لێـك دوورن، یەکـدی ناناسن، ئەحوالی یەك ناپرسن.

لە تەڕەفی جەلالەتی ئیبن سعوود مەسەلەن، چەند زەواتێ زوبان زان، ئەو خەڵکەیان بلاواندباوە، جەلبی خاطریان کردبان، تەعاروفیـان لەبەینـدا بووبا، صاحب الجلالة ڕۆژی عەرەفات بالذات نوتقەکی مناسبی زەمین و زەمـانەی ئیرادکردبـا. میکرۆفـۆن بەدەسـت، دەنگـی شـێرانەی لە کێـو و کەژی عەرەفـات تەمەووج کردبـا، وە بە واسـیتەی ڕادیـۆ بـۆ ئەقطـاری عالەم ئیزاعە کرابا. بەڵـی ئەساسـاتی ئیسـلام زۆر عەجـایبە، لاکـین لەبەر خەیالات، یا بڵێم لەبەر خوڕافـات، مع الاسـف ئیسـتیفادەی لـێ نەکـرا، بەخۆڕایی چوو.

توخوا مەلایە قوتەی مل نێـرکە کـاردی لە کێـوی عەرەفـات خـوتبە بخوێنێ، باسی حوشتر و مانگای تیا بێ، مسوڵمانان چ خێری لێ ئەبینن؟ کێ گوێی لێیە؟ گوێیان لێ بێ، چی بە نەفعی تیایە؟ مەقسەدی عوزما لە حەج تەوحیدە، تا ئێستا موقەللیـدینی ئەئیممە وایـان ئەنوانـد، کە لەسـەر ئەدیانی موختەلیفەن، نازانم ئەمڕۆ، چۆنە؟ جەلالەتی ئیبن سعوود تەماشای لیـاقەت ئەکـا، یـا مەزهەب؟ ئەو خـیلاف و شـیقاق و تەعەصـوبەیان بە ئیلحاد نەدەزانی؟ لا والله بە (لا والله)ی یـان بە ئیلحـاد حیسـاب ئەکـرد (وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ) (آمنا بالله)

١٨١/٦

---

(١) مەبەستی حەجە

## موکەرەراتی لای من لە قەندی شەکر بەلەزەتترە!

بنۆڕنە سەیری ئەبو عەلای مەعەری، بەشار عثمان البیصری الموصلی، طه حسین المصری بەر حەیات، لە گەلێ گەلێ چاوداران لە هەموو خصوص فائیقترن! حەقەن ئینسان لە خوێندنەوەی تەحریراتی تەها حوسێنی ماندوو نابێ! موکەرەراتی لای من لە قەندی شەکر بە لەزەتترە! جەنابی حەق مینەت ئەکا بە بەصیری و سەمیعی نە تەنها بە چاوو گوێ. ئەوانەی بە منداڵی کۆر ئەبن زۆر عەجایبن، ئەڵێی خوا حاسسەی تریان ئەداتێ! ئەمما ئەوانەی بە گەورەیی کۆر ئەبن-خوا حیفزمان بکا- زۆر پەژارە و کۆرەوار ئەبن، وەکەذا ئەوانەی بە گەورەیی کۆر ئەبن زۆر سەقەتن!

١٩١/٦

## ئەمرۆ ئیلقائاتی شەیاتینی لە زیادە دایە!

ئیلقائاتی شەیاتینی، دوای جەنابی ڕیسالەت پەنا تا ئەمرۆ لە ئیزدیاد دایە و زۆر بە تەئسیرە! ئەوانەی لەسەر حەق مودافەعە ئەکەن، چ ماددی چ مەعنەوی، کەم و بێ هێزن! سەبەبی چییە؟ سەبەبی یەکانە ئیعتیمادی مسوڵمانانە لەسەر قووەتی ئوموری غەیبی مەعنەوی، دووری لە قووەتی ماددی. غەلەبەی مەعنەویات موجیبی وەهنی عەقڵە. عەقڵی زەعیف، موستەبعیدات و موستەحیلاتی بیلا موحاکەمە قبوڵ ئەکات، تا دوورتر بێ، لە وقوعی ئیمکان نێزیکتر ئەبی لە قبوڵ.خاسەتەن کە لە تەڕەفی زاتێ (موثوق بە) ئەهلی کەرامات تەلەققی کرێ، وە موزەییەن بێ بەناوی قووەتی ئیمان.

ئەساسەن ئوممەت بێ هێزە، بەسیتە، بێ موحاکەمەیە، بێ چارە موعتەمیدە لەسەر ئومەنای دین ڕوئەسای مەزهەب و طەریق. ئەوجا شەیاتینی خۆمان ئەوەی ئارەزوویان کرد، دەیکەن. ئەیهاوێنە دەماغی عەوام، خورافات، موزەخرەفات، مەوهومات، موخەییەلات! ئەساتیر و حیکایەتیان لێ ئەکەنە مەسائیل و حەقائیقی ئیعتیقادیاتی دینی. دوایە وردە وردە ئوکزوبە، موفتەریات، موخزیات، موختەلەقات بۆ کەمێ لە زەوات کەشف ئەبی. وەکی ئەڵێن: زەمانە پەردەی لەسەر لائەدا. لاکین

سـەوادی ئەعـزەم لە مەلایـان، وەکـی عەوامـی مەئلـوف ئەبـن، بەو خوزەعبەلاتە، وە یاخود لەو حاڵەی ئیستیفادە ئەکەن. بە هەمـوو قـووەتی خۆیان مودافەعە لەسەر باتڵ ئەکەن، ئەمما بەرە بەرە بۆفیـان دەرئەکەوێ سست ئەبن. زەواتی موتەقەیپەزە چونکی لە ئەساساتی دین بـێ خەبەرن، ئیلقائاتی ئیبلیسی بە حەقائیقی دینییە تێئەگەن، بالکلیة لە دیـن دەرئەچـن، ئەبنە دوشمنی دینی خۆیان.

١٩٣/٦

## مەلا خالیدی کونەفلوسی!

مەلا خالیـدی کونەفلوسـی ڕیسـالەیە جـوانی دانـاوە، حەقـقەن جێـی تەعەجوبە. لە کۆرە دێیە وەکی کونەفلووسـە [1]، مەلایە هەڵـکەوێ لەو نەوعە مەسائیلە هاممە تەئلیف بکا.

١٩٥/٦

## کلکە تەشی!

هیندی و مەندییان چاکە غاندی بە کلکە تەشی موقابیلی تەیـارات و مودەرەعــات و دەبابــات و ئوســتوڵات و موصـــەففەحاتی بەریتانیــا ڕادەوەستێ، ناشکوری نەبێ ئەوانی ئێمە ئەوەندە کلکەشیان نییە.

٢٠٠/٦

## بۆچی دۆم و قەرەج ئاوارەی جیهانن!؟

لە تەئریخی عمومی دەڵێ: بـۆچی دۆم و قەرەج ئەوانەی بە تـورکی پێیان دەڵێن چونکانە بۆچی ئاوارەیی جیهانن، بۆ مەوتیـنن، پەڕاگەنـدەن؟ حەقیقەتەن لە هەموو دونیا هەن، طیرازی مەعیشـەتیان یەکە، چ لە ئاسـیا، چ لە ئەورووپا.

---

[1] کونەفلووسە، زێدی نووسەری ئەم کتێبەیە.

الجواب: یەکێ لە ئەوائیلی ئەو صینفە، نەی لێ ئەدا، خوداش هاتبووە عەردی، وە زۆر حەزی لە دەنگی بلۆر و شمشادی ئەوانە هەیە. خوا گوێی لێ بوو، کەوتە ڕەقس و سەما، کە هاتەوە سەرخۆ، زانی شتێکی نالایقی کرد، دوعای لێکردن ئاوارە و پەڕاگەندە و بێ مەوقیع بن. وەهاکەذا حەتتا لای شوعەرای قەدیمی یۆنان و کوهنەی میصر ئەساطیر و دەساتیری قودەما پڕە لەو جۆرە خورافاتە. ست ئۆزریسی کوشت میصر کەوتە ماتەم، ژنی کە هیراسە ئەعزای خڕکردەوە و شاردیەوە، زیندووبۆوە میصر سەراسەر کەوتە ڕەقس و سەما و شادی و موزیقە و چەغلی، لە تۆڵەی ست کوژراو. وەهاکەذا ئەمانە هەر نەئیسە، مەسیحی بۆ خوا، وا مەسخ ئەکەنەوە، خوای ئەیهاوێنە ناو زگی کچەتیوی جووی ئەبێتە مەسیح، پاش ئیهانەیە زۆر صەلب ئەکرێ.

٢٠٦/٦

## سەعی بۆ عیلم لە حەجی تەتەوع خێرترە!

حسب الوقت بزانن چ خێرە، ئەئەری باشە، بۆ دین بۆ وەتەن، بۆ میللەت ئەوەی بکەن! گەلێ جار ئەڵێم ئەمما مع الاسف ناچێتە گوێیان. ئەمڕۆ بۆ دیاری ئێمە کەسێ سەعی بکا بۆ ئیدامەی عیلم، ئەئەرێ دابنێ بە نەفع، لە حەجی تەتەووع خێرترە! معاذ اللە کە عیلم نەما دینیش نامێنێ، حەج چۆن ئەکرێ؟

٢٠٧/٦

## جیهادکردن و غاردان بۆ سەر مەرقەدی فلان وەلی!

نەفسیش عەدووی گەورەیە، بەو شەرتە وەکی ئەوانەی مەشغولی زیکر و ئەوراد و خەتمە ئەبن، نەیکەنە سەدد و عائیق بۆ جیهادی عەدوو ئەوانەی ئەولیان، *لدی الأعداء، اقرب الناس*، بەینی من و ئەوان ساحەی حەربە! لە گەرمەی هاوانی تۆپی، وە تەقەی تەقینەوەی دانەی، ئەتۆقن هەڵدێن. ئەوانەی ئەڵێن ئەجەل یەکە، مەگەر مومارەسەی حەربیان نەبووبێ، دەنا لە هەنگامی قیتال و چەق و چوو، ئاگای لە ئیرادەی خوا

نامێنی، ئەوی ئیرادە بکا ئەبێ، ئەوەی ئیرادە نەکا نابێ! ئەجەل یەکە نابێتە دوو! غیرەت و صەبر و ثەبات و مەیدانداری بە خوێندنی ڕیسالەی نەسەفی پەیدا نابێ!

ئەمڕۆ ئێمە ئەگەر جیهادی مع الکفارمان ڕۆیی و لەکیس چوو، ئەمما موجاهەدەی جەهل و شیقاق ئەتوانین! جیهاد بۆ ڕەفعی موخالەفاتی مەزهەبی، تەریقەتی، قەومێ حەتتا عەشیرەتێ، حەتتا گەڕەکێ، ئەهەممی موهیمماتە! (حق جهادە) بە. لاکین لەبەر موخالەفە و موعاداتی خۆبەخۆیی ئاگامان لە دوشمنی دین و دونیامان نەماوە. لەو وەقتەی ئەو قووەت و موکنەتەی ئەمڕۆ ئەعدای قەدیمی ئیسلام هەیەتی، مسوڵمانان لە عەداوەتی یەك قصور ناکەن. خاصەتەن ڕوئەسای ئەحزاب! حەتتا مع الاسف لەم ڕۆژانە وەقعەی زۆر ناساز و نالایق لەبەینی قووەتی حکومەتی میصر و تەڵەبەی جامع الازهر بووە، مۆسۆلینی تەرابلوسی غەرب بە قەتعی ئیلحاق بە ڕۆما ئەکا. ڕافضی علی الدوام خەریکی قەرابینن، چەند ڕۆژێکی تر ماتەمی حوسێن بەرپا ئەکەن، لەبەینی چەند ڕۆژێکی حەفتەیێ عەزایێ بۆ ئیمامی حوسێن...

خودا ئەمری بە ئێمە کردیە بە جیهاد، ئێمە چی ئەکەین، وە چمان کرد؟ ئیعتیماد لەسەر کەڕامات! بە هیممەتی فڵان دینمان بۆ تەخت ئەبێ؟! بە تەمای مەهدی، بە تەمای مەسیح لە ئاسمان بێتە خوارێ! دەك خوا ڕاست و دروستی نەیەنێ! دوعا، دوعا، بەڵێ دوعا! غاردەن بۆ سەر مەرقەدی فڵان وەلی، خوایە نەسرەتمان بدەی، تەوفیقمان بدەی! دەی وەلی خوا هەستە دەفعی دوشمن بکە! خواش ئەفەرموێ (أَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ) سبحان الله تەصەروف لە استطاعە و قووەتیش ئەکەن! ئینسان ئەوەندەی خۆی تەضەییوق و گرانبار ئەکا، خوا ئەوەندەی تەکلیف لێ ناکا! دینێ سەهل و خۆش و موجبی حەیات و خیففەتی حەرەکە و نەشاط و شەطارەتی عەمەلە.

٢٠٨/٦

## نێزیکە ببێتە کوفرستان!

ئیلاهی ئیمدادی مسوڵمانان دەی، بە عمومی بەشەر لەژێر ئەسارەت قورتار بن! تۆ مەولای! لەو جەهالەتی تێیدان بە نووری عیلم دەریان خەی! لە تەفرەقە بۆ ئیتیفاق بێن، سەعی کەن بۆ ئیسلاحی شئونی دونیا تا ئیسلاحی شئونی قیامەتیان ببێ! سەییدی وە مەولای عولەمای حەقیقی لەناو بەناو مسوڵمانان، زۆر بێ قیمەت بوون، وەختە (العیاذ باللە) عیلمی دینی لەو وڵاتە ببڕێتەوە.

نعوذ بك ربی نێزیکە ببێتە کوفرستان. مەولای چارە! دونیا بێ عیلم و دین ئەمڕۆ دەوام ناکا، مەلای فەقیری بێ دەسەڵات چی پێ ناکرێ! ومن بعد بەو زیلـلەتە بەو ڕەزالەتە بەو فەقر و فاقەیە کەس خۆی هەڵناکوتێ بۆ مەلایەتی، ئیتر خۆت ئاگاداری! أنت مولانا فانصرنا علی الفاسقین والجاهلین والضالین! آمین!

٢١٠/٦

## نیکاحی موتعە!

شیعە موددەتێکە ئەڵێن: نیکاحی موتعە لە یاسانی عەرەباندا بووە! ئەووەلەن جەنابی ڕیسالەت حەڕامی کردیە، ثم ئیباحەی کردیتەوە، ثم حەرامی کردیە.

جەنابی ئیبن عەبباس ئاگای لە "ثم"ـەی دوایە نەبووە، لەسەر ئیباحە ماوە، ئەمما من ئەو قسەم ناچێتە دڵی، چونکە ئەسحابەی محەمەد (صلی اللە علیە وسلم) کە چوون بۆ حەڕب وەکی ئەڵێن: زۆر بە تەقوا و عیبادەت و موحافەزەی حقوق و ناموس بوون، شەو بە عیبادەت و ڕۆژ بە غەزا خەریك بوون. دیارە وەکی لەشکری ئێران و ڕۆما و جوملەی عەرەب نەبوون کە وڵاتی فەتح کەن، هینەزەقەیان بگاتێ، خەریکی هەڵاو تیکە بن. تاکو جەنابی ڕیسالەت پەنا، لە ترسی زینا موتعەیان بۆ حەڵال کات، دوایە لێیان حەرام کات.

لە تـوحفەی اثناعشـریە نەقـل ئەکـا، لە ئەئـیممەی شـیعان ئەحـادیثی عەجیب و غەریب دائیر بە فەزڵ و حەسەنات و خەیراتی موتعە، ئەوەندە خێـرە، ئەوەنـدە بە ئەمەرەیە بـۆ قیـامەت، ئەبـا گەورە گەورەکانیـان لە موجتەهید و ڕوئەسا جگەرگۆشـەی خۆیـان، کـچە نازدارەکانیـان بنێـرنە مەعمەل، تا نائیلی ئەو ئەجرە عەزیمە بن.

لە دەوری عوسمانی لە عێراق ڕەزیل بوون، نەیـانتوانی بە سەربەسـتی زوباندرێژی بکەن، ئەمما ئێستا تەئلیفات ئـیعلان ئەکەن، دائیـر بە مـوتعە، ئینکاری تەحریمی ئەکەن، ئەحادیـث و ڕوایـات مەپرسـە. زاتەن پەکیـان لەسەر ڕیوایەت ناکەوێ. ئەمما ئەمڕۆ ڕیوایەت زۆر ڕەواجی نییە، ئەگەر لە تەڕەف ئەوروپاییان دائیر بە حوسنی موتعە مەقالەکیان ئیستحسـانەکیان تەحصیل کردبا، لە بەینـی سـائیری مسـوڵمانان مـورەوەج ئەبـوو. چونکـە ئەمرۆ ئەوروپا ئیمامە (*مقتدی به*) یە ئەوی ئەوان لایـان بـاش بـی، باشـە. نابینی ئەوان تەقدیری عمومخانە ئەکەن، لای مسوڵمانان چەند مورەوویج و مووەجیھ بووە.

٢١٤/٦

## چاو بکەوە تێ بگە پێ بگە، قوڕ لە کێ، سەمع و بەصەر لە کێ؟!

روح و قیوای مودریکە و قووەی عاقیلە و مودەببیرە و مـوفەککیرە، تەماشاکە هەندێ هایدرۆجین ئۆکسـجین و پۆتـاس و کلـس و ئەمـانە و غەیـر خرپـووینەوە، ئەو تەتەووڕانەی بەسـەردا هـات، بـوونە سـەعدی زەغلول بووە مستەفا کەمال ئەتاتورك، بووە شاهی ئێـران ڕەزا شـا، بـووە فەیسەڵ مەلیکی عێراق، بووە ئەدیسۆن خاوەنی کەهرەبا، بووە مۆسـۆلینی زەعیمی ئیتالیا، بووە زەعیمی ئەڵمـان هیتلـەر. ئەو عەقـڵە ئەو شـەجاعەتە، ئەو سـەتوەتە، ئەو ئیقـدامە، ئەو صـەبر و ئەبـاتە، ئەو عەزم و جەزم و حەزمە ئەو فەطـانەتە ئەو ڕوح القدسـە، ئەو ئیسـتیلایە ئەو تەدبیـرە، ئەو سیاسـەتە، ئەو سـەعیە بەلـیغە ئەو موقـابەلە لەگەڵ ئەعـدا، حەقـقەن

موحەییرولعقـولە! ئەو ئەحـوال و ئەوصـافە لەکـێ؟! ئۆکسـجین و ئەو ئەدەواتە لە کێ؟!

بەڵێ! بەڵێ! خەلقی تـرە! خەلقـی تـرە! تەفـاوت زۆرە، عـالەمێ دیـیە، غەیرە ماددییە! چاو بکەوە تێ بگە پێ بگە، قوڕ لە کێ، سەمع و بەصەر لە کێ؟! ئینسان! ئینسان حەققەن! ئینسانی عەجیبە! لە ئایاتی موتەشـابیهاتە تەئـویلی موشـکیلە. ددان هـاتن و مـووی بـن هەنگـر و عـانە لێـرە ناخوێندرێتەوە!

کەڵەبابەکم هەیە بە شـەوکەت و بەغیـرەت بە شـوجاعەت، سـبەینان زوو ئەچێتە سەربان باڵان لێك ئەدا ئەڕوا بۆ مـاڵان! عەلاوەی مریشـکانی خۆی لە دوای ئیتر ئەگەڕێ نەعرەتە لـێ ئەدا ئەقـوقێنێ. تەماشـای ئەکەم موتەعەجیبـانە ئەڵـێم: ئەی کەڵەشـێر پـار ئەو وەقـتە نەبووبـوویە هـێلکە، ئەلئانیش چی؟! ئەو صونعە کەی ئەیکا تەبیعەت؟ حاشا بێ ئیدراك چۆن ئەو بەدایعە و دەقایقەی پێ ئەکرێ؟ *طوعا وطبعا وكرها* ئینسانی مونصیفی عاقڵ ئەڵێ: ئەمە صونعی زاتـی ئەقدەسـی خوداوەنـدی ئەنـامە، عەلـیم و حەکیم و قەدیر و قەوی!

٢١٦/٦

## ئەوەی خۆی بناسێ، خوای ئەناسێ!

حەقـقەن ئەوەی خـۆی بناسـێ، خـوای ئەناسـێ، نـاپلیۆن ئەتـوانی ئینکاری ئەدیان بکات، ناتوانی ئینکاری واضـعی نجـوم و موسـەخخەری ئەنام بکات.

بە موناسـەبە عەرزی زاتەکـم کـرد: ڕیجـالی مولـك و سیاسـەت- بالمجبورية- تەفزیلی ئەبوبەکر و عومەر-رضی الله عنهم- بەسەر عەلی دا ئەدەن، ئەما مومکینە ڕەجولی نەحوو و صەرف و تەسەووف، لای عەلی لەوان گەورەتـر بـێ. ئەی مسـوڵمانینە، وەرن خۆتـان بناسـن، ببـنە پیـاو، وابکەن کە فەخر بەخۆتـان بـکەن، فەخـر بە ئەم و ئەو چییـە؟ خـۆی بە

قوڕدا دەچێتە خوار، ئەڵێ: شێخم بە هەوای دا دەفڕێ، بەسەر ئاوێ دا دەڕوا!

تا وابن، بە قوڕدا دەچنە خوار، حەیفە، مخابنە. تەماشای قورئان بکەن نانۆڕیتە شبح و شەخص، ئەنۆڕیتە ئەوصاف و کەمالات، خصوصی ئەبوبەکر و عەلی لە قورئاندا نییە، نەسەب هیچ، ئەصلی فیترەت یەکە، گاوانێ لەگەڵ ئەفلاتوون لە قوای عامیلە و مودریکە شەریکە، ئەو ئایەتە بخوێنەوە (قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ) بلێ (آمنت بالله وبكتابه وأعرضت عن اللغو).

٢١٧/٦

## ناشکوری نەبێ ڕیجالی نابیغی و عەبقەری لەناو مسوڵمانان زۆر کەمن!

ڕەحمەتی خوا لە سەعد زەغلول و مەلیك فەیسەڵ بێ، ئەگەر زەعیمێ چوو بێ جێ نەبوو، ئوممەت نامرێ، وە ئیللا مەحووە. ناشکوری نەبێ، ڕیجالی نابیغی و عەبقەری لە مسوڵمانان زۆر کەمن، ئەوی چوو ئەغلەب بێ جێنشین ئەمێنی.

مەلیك غازی ئێمە هەرچەند کە بابی مرد، منداڵ بوو، للە الحمد ئەمڕۆ زۆر باشە، بە عەبقەری حیسابە. دوعای دەوامی ئەکەم، ئەگەرچی چاکەشی بۆم نەبووە.

٢١٨/٦

## پاش ساڵی گرانی!

واقیعەن ئێمە دیمان پاش ساڵی گرانی (١٣٣٦)، ئەوانەی بە حاڵە حاڵ قورتار بوون، خوا حاڵ و باڵەکی پێ کەرەم کردن، گەلێ خراپتر بوون. لە انهماکی فی اللذائذ بە دەعیە و ئەنانییەت بە کۆڵانان دا دەڕۆن،

گوایە لە عومری خۆیان، بۆ پارچە نانێ، لەبەر دوكان ڕانەوەستاین، نەنووزاینەوە! ٢٣٥/٦

## ئودەبایان ئارەزووی حەرفی لاتینی ئەكەن!

لام وایە لە مەقالەیێ تریشم وتیە: بۆ قەوم لەوە زێتر نابێ، تەصەوور ناكرێ، ڕەسوولیان لەخۆ، شەرع و قانوونیان لەخۆ، قەلەم و كیتابەتیان لەخۆ، یەعنی ساحێبی خەططی خاصن. سبحان الله ئەمڕۆش عەرەب تەقدیری ئەو شەڕەفە ناكەن، لە جیاتی تەنزیمی قانونی شەریعەت، قانونی دوەلی ئەجنەبی وەرئەگرن، دوای هەوای مەسیحی ئەكەون، حەتتا ئودەبایان ئارەزوی حەرفی لاتینی ئەكەن وە فكری لادینیان هەیە.
بەڵێ بەدبەختییە، ئاورووپا دوورن لە موتەقەدیمن، یا لە پێشیان، چونكی بۆی ئەچن.

٢٤٠/٦

## بۆچی چوار شاهید بۆ زینا داندراوە؟!

قیمەتی ئەو ئایەتە[1] ئەمڕۆ ئەزانرێ! بێ موبالاتی دونیای سەراسەر كردە كارخانەچی! لە مەداینی بە حەزارەت، زەواجی مەشرووع كەم بووە! نە نێر نە مێ، خۆیان ناهاوێتە شەڕی بار و تەكالیفی ژن و مێردایەتی، موقەییەد نابن بە حقوقی یەك، زەواج بە مونافی حورییەت ئەزانن! حەتتا بەعزە دوەل ئەترسێ، نفوسی لە تەناقوض دایە. حەقیقەن موئمین ئەبێ بەغیرەت و بە شەڕەف بێت، بە گوێرەی تەعدیلاتی شەرع، موقتەزای تەبعی بێنێتەجێ! حوڕییەتی حەسەن، بێ زەرەر و بێ وەقاحە و سوئی ئەدەب و ئەخلاق و موعاشەرە، حەقی موئمینە! ئەوی تابیعی هەوا ئەبێ، خۆی بە موتلەق ئەزانێ، نا! نا! ئەسیرە! ئەسیرێ حاڵ ناخۆش! مواردی وایە هەوای خۆی نەشكێنێ لە مەصالیح و مەعالیدا! حەربی شێخ

(١) مەبەستی ئایەتی (الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا...)

قادری تاڵەبانی ڕەحمەتی لێ بێ لە غەزەلەکی تورکی خۆی ئەفەرموێ:

**هوا و حرصی نفسه، اکله، شربه، فاکذا قلن**

**اوتان بنجه ایش تله دیمه حریتم واردر**

ئەمڕۆ مع الاسف مەیلی ئەجنەبیات لەناو شوبانی ئیسلام زۆر بووە، وە موئمینەش وای لێ دێ! بەڵام ئەجنەبییەکان مەیلیان ناکەن، ناشکوری نەبێ. کەچی ڕەسوولەکانی عەصر، خصوص ڕەسوولی سەلام، چییان نەکردا حڕوب و شەقاوەت و سەفاهە و دەنائەت و ڕەزالەت. خولاسە بەدی بە جەمیعی مەعنا، لە سایەی بابی و قادیانی لە زیادی و توغیاندایە! سەماحەتی مەسیحی قیوداتی شکاند، شەڕەفی بەشەری پامال کرد، غیرەت و ناموس مەحووا نازانم سەییدی ئالووسی بۆچی هەر ئەنوڕێتە کوتوبی قەدیمە؟ تەماشای صەفەحاتی ئەییامی نەکردیە؟ لەو زەمانیش سەفاهەت لە ظهوردا بووە! گەرچی ئێستا شەعشەعەی ئەندازەی ئافاقە! پێغەمبەرێ ئەوە کتاب و حوکمی بێ، تەصەوور ئەکرێ بە شەخصی عەرزی بکا، ژنی دەستی کەس دەرناکا. یەعنی ئەوەی ئیرادەی فجور بکا لەگەڵی، مەنعی ناکا، بفەرموێ: لای خۆت ئیمساکی کە، تەلاقی مەدە! وە تەوجیهی ئەکەن، مەبادا خۆی لەگەڵی تووشی زینا بێ! توخوا ئەمە قسەیە؟!

دەسەڵاتم هەبا ئەمووت عاممە لە موئمینە و کافرە، ئەوانیش گەلێکیان بە ناموسن! خاسەتەن ئەوانەی لە قەڵادان، قەڵای دین، قەڵای شەڕەف، قەڵای خانەدانی و ئەصلی و نەبیلی، قەڵای مەحفوزی و مەعصومی! *الله اکبر* لە جەسارەتی بەشەر. فی الحقیقە سەریعەن بۆ سوئی زەن، بۆ ئیفتیرا، قسەی ناشیرین باوێن، بۆ صەوبی ئەمانەی کە لە هەموو جیهەت بە سەد هەزار دەرەجە لەوان فائقت! لەبەر ئەو جەسارەت و سوئی ئەدەب و زەنن و خەلاعەتە نییە، جەنابی حەق بۆ ئیثباتی زینا، ئیعتیبار بە کەمتر لە چوار شاهید ناکا!

٢٤٩/٦

## بوختان!

ئیفك ئەسڵەن بە مەعنا قەلبە. حەقیقەتەن وایە، ئەوەی ئیفکی ئەکا، مەقلووبە خۆی وایە، لە جیهەت لای ئەدا، وەری ئەگێڕێ، ئەوە فەوقی ڕەمی موحصەناتە، فەوقی هەموو قەبایح و وەقایحە، درۆ و ئیفتڕایە. ئیلاهی وە سەییدی چ بڵێم؟ وە چ بنووسم؟ قەلەم موافەقە ناکا، دەستم ناڕوا، دڵم تەنگ ئەبی، سینەم وێك دێ، فکرم تێك ئەچی، تەزووم بە بەدەنی دادێ، مووچڕك لەسەر مووچڕك، وەك بروسکە بە ئەعزام دادێ و ئەڕوا. کە خەیاڵ لە مەخزوونی و مەغمومی و موکەددەری و دڵسەختی، حەزرەتی ڕەسوولی موجتەبا ئەکەم، مەدهۆش ئەبم، لەخۆ ئەچم، کە ئەنۆڕمە صددیقی ئەکبەر و حەڕەمی موحتەرەمی، لە چ ماتەمێ دان، دنیام لە نەزەر تاریك ئەبێ، بە قەدەر نووکی دەرزی ڕووناکی لە دڵم دا نامێنێ، ناتوانم گوێ لە تەغریدی صدیقە ڕاگرم. کە تك تك فرمێسکی دێتە گوێم، ئەگریم، فرمێسکان ئەڕێژم، دوێت و کاغەز و کتاب نابینم، کە تەصەووری برودەتی مسوڵمانان ئەکەم وەختە ببم بە شەختە، هەناسەم سارد ئەبی، لە عالەمی بەشەرییەت مەئیوس دەبم. ئەچم بۆ مزگەوت ئەبینم ڕەسوولی ئەکرەم لەسەر مینبەر شەکوای حاڵی خۆی لای مسوڵمانە صادیقەکان ئەکا، سەعدی بن عوبادە گوایا غیرەتی قەومی ئەیگرێ، لەسەر مەلعوون، کەززابی ئەففاکی خائین، مارقی مونافیق دێتە غیرەت و مودافیعە، لەو وەقتە مسوڵمانان تێك هەڵئەقڕێن، رسول اللە لەسەر ئەو مەئیوسییە، لێکیان ئەکاتەوە، تەسکینی هەیەجانیان ئەکا. جا بۆ بێکەسی بێ ظەهیری و بێ نەصیری پێغەمبەر، هاوار و داد و فیغان ئەکەم، لە چۆکی خۆم ئەدەم.

ئیلاهی و سەییدی: وابزانم ئەگەر ئەوانە میسقالە زەڕڕەیە خانەدانیان بووبا دەرحەق ئەو زاتە ئەقدەسە، ئەو خانەدانە عالییە، ئەو بەیتە ڕەفیعە، ئەو حیصنە حەصینە، ئەو دوڕڕە مەکنونە، مەصونە، ئەو هەذەیانانەی نەدەکرد. ئەوەی نەختێ ئیمانی بە پێغەمبەری هەبێ، چ جایە خێزانی،

خۆشەویستی، هەمخوابی، هەمدەم و هەمنۆشی، ڕەفیقی خەلوەت و حەیاتی شوشەیی ناموسی، دەربارەی جاریەیە، نە جاریەیە، ئافرەتی دون، کە گەهگاهـ بێتە ئەو بەیتە، سایەی خانوویی محەمەدی بکەوێتە سەر، قسەیە سووك ئەکا؟!

کەسێ هەندەك ئیخلاصی ببی، چ جایە ئینسانێ، کە بە بەر ئەو دەرگایەیا بڕوا و بی، سەگی ئەو بەر دەرگایەی لا بە حورمەت ئەبی:

پایی سەگ بوسید مجنون خلق گفتندرا این چی بود
گفت: این سەگ گاه گاهی کۆی لیلی رفته بود[1]

ئەلحەق ئەوەی دەربارەی زەوجاتی موحەممەد، بەناتی موحەممەد، خەدەم و حەواشی موحەممەد، زوبانی بە سووکی بیزێوی، بێ ناموسە، بێ شەڕەفە، سوك و چرووکە، جەلەفە، سەفیلە، لەئیمە، فرۆمایەیە، بەد ئەصلە، بەد گەوهەرە، پوشتە، موخەننەثە، لە سەگی گڕوێ کەمتر و گلاوترە.

وای چەند دوور بوو لە عالەمی ئیسلامییەت؟! ئەگەر دەسەلاتم هەبا، ئەو حیکایەتەم لە هەموو کوتوبی دونیا مەحو ئەکردەوە. وە تەفسیری ئەو ئایەتەم بە فەرز و تەقدیر ئەکرد، وە مەوزوعێ خەیالم بۆ ئەدۆزییەوە.
٢٥٣/٦

## بوختانیان بە مەلا عەبدولرەحمانی جەلی کردووە!

مەلا خالیدی کونەفلوسی حیکایەتێ موجمەل ئەکا لە حەق باپیرە گەورەم مەلاعەبدولرەحمانی جەلی ئیفتڕایان پێ کردیە، گۆیا شیعەیە. حەتتا قەصدی کوشتنیان کردیە، ئیختیفای فەرمووە. زۆر نەچووە ئیفتیڕای ئەعدایەکانی ظاهیر بووە، خوا ئینتیقامی لێ ساندینە. خصوص

---

(١) لە ڕاستیدا دێرە شیعرەکە گوایە لە "لەیلا و مەجنون"ی نیزامی گەنجەوی وەرگیراوە، بەم شێوەیەیە:

پای سگ بوسید مجنون خلق گفتندش چه بود؟
گفت این سگ گاه گاهی کوی لیلی رفته بود

یەکێ لەوانە کە تلمیذی خۆی بووە بە دەردێ خراپ چووە! ئەمما نـالّێ کێیە و کێن! حەقیقەتەن ئەوە ئیفکە، موصیبەتێ عەزیمی بـۆ ئیسـلامەتی، شەڕێ گەورەی بۆ ئوممەت بوو.

باوەڕ ناکەم هیچ پێغەمبەرێ ئەو تەرزە جەفـایەی لە چنـگ ئـوممەتی خۆی دیتبێ! ئەتوانم بلّێم عـویەینە وەلیـدی بـن مـوغەیرە، ئەبـو جەهـل سائیری صەنادیدی قورەیش، هەزار هێنـدە لەگەڵ حەزرەتـی مـحەمەدی دوشمن بان، دائیر بە عەرض و ناموسی، هەذەیانیان نەئەکرد. ئەبو سوفیان کە خەبەریـان دایـێ مـحەمەد ئوممـو حەبیـبەی مـارەکردیە، لەسـەر ئەو عەداوەتە فەخری پێ کرد.

٢٥٥/٦

## تف لە ئینسانی نانەجیب!

قەومـێ هەن ژن ئەپەرسـتن، ئەممـا کـێ هەیە کچـی بە حوسـن و جەمال مونتەخەب و مومتازە، ئەڵێن: ئەوە ئیلاهی حوسنی بۆ خۆی خەلق کردیە، بەو زەن و تەخمینە هەیبەتی ئەو ئافرەتە، وە ئیقرار گیر ئەبـی. لە دڵـی قەومەکە کەس بە خەیـاڵی دا نـایە، بە گۆشـەی چـاوی خیـانەت تەماشای کا، بەڵکو عیبادەتی ئەکەن، وە خۆشی بە دڵیا نایە، بۆ بەشـەرێ تەنەززول بکا، خۆی بە دەسـتگیرانی خـوای حوسـن و جەمـال حیسـاب ئەکا، ئەحەدێکی لە بەشەر نایەتە بەر نەزەر. ئایا حورمەتی رسـول اللـه و عائیلەی رسول الله ئەوەندە لە دڵان جاگیر نەبـوو؟ کە موسـارەعە بـکەن بۆ مودافەعە.

حیجابێ هەیە لە بەینی نێـر و مـێ، وەلەو لە تەبەقـاتێ عـالیەش نەبـن. ئینسان حەتتا لە عائیلەی خۆی شەرم ئەکا، بـێ موقەددیمـات هەڵیکـوتێتە سەر. لەگەڵ یەکی ئەجنەبی خاصەتەن سـاحێبی سـەطوەت و هەیـبەت و عەزەمەت -ماددی و مەعنەوی- چۆن جەسارەت ئەکا؟ چۆن بە وەهم و خەیاڵی دادێ؟ الله ئەمە چی بوو؟ خوایە خـۆت ئەزانـی، ئەو عوصـبە لە هەمـوو مەزایـا ڕووتـن، چ جـایە ئیمـان، ئەئەرێکیـان لە نەجـابەت و شەهامەت و بوشرا نەبووە، تف لە ئینسانی نا نەجیب.

یوسف علیه السلام خانەدان بوو، لەو مەوقیعە لەو خەلاعەتە کە (امرأة العزیز) نواندی، وتی: إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوايَ!

چۆن شەرەفی سەیدی خۆی ساحێبی چاکەی موحافەزە کرد؟ سیادەتی ڕەسوول نیعمەت و چاکەی ڕسول الله لەسەر موئمینان بە هەزار دەرەجە لە فەوقی سیادەت و چاکەی عەزیز بوو. ڕیعایەتی ئەو سیادەت و نیعمەتەیان کرد. بە بوختانی وا عەزیم و ناشیرین و بێ مەعنا، ئەو ڕەزیل و دەنی و سەفیلانە موقابەلەیان کرد. جا ئینسان چۆن ئومێدی بە ئیصلاحی بەشەر ئەبێ؟!

٢٥٦/٦

## موجادەلەی بەینی مەلا و ئودەبای مسوڵمانان!

قسمێ هەن عمومی ئەورووپایی وان، خۆیان سەیئات و فەحشیات ئەکەن، تا مسوڵمانان چاویان لێ کەن. ئالئان موجادەلە دەوام ئەکا لە بەینی مەلا و ئودەبای مسوڵمانان لەسەر ئیخفای ژنان و سفوور. بەڵێ سفور و تێکەڵاوی نێر و مێ، حەتتا تەعلیمی موختەلەط زۆرە! لەگەڵ ئەوەشدا سەیئاتی سفوور، بەو وەجهە، مەشهوودی ئەنامە! حەقیقەتەن ئیشاعەی سەیئات لە تەرەف ژنان زۆر ئاسانە، زوو تەعەمموم ئەکات! حەتتا ماتەمی حوسێن سەبەب بە تەئەثور لە ژنان، بوویتە سەبەبی تەعەمموی تەشەییوع. لاقەیدی مەسیحیان دونیای کردە موتەمەسیح.
٢٥٩/٦

## عەقڵ حاکمییەتی زۆر زەعیفە!

هەرچەند عەقڵ ڕێ ئەبا بە چاکە، ئەمما حاکمیەتی زۆر زەعیفە، ناتوانێ ساحێبی بگێڕێتەوە، خصوص کە مەیل بە قووەت و عام بووا! بەعزێ عەقڵ ئەکەن بە حاکمی موتڵەق، ئەمما صەواب نییە!

عەقڵی قەوی بێ مەیل و موحابات لەگەڵ صەلاحی قووەی بەهیمەیی

و تەربیەی دینی باشە! ئەوەی بە تەعلیم نەیزانێ، خۆی ڕێی پێ ئەبا ئەتوانێ ئیستنباطی بکات! ئەمما لەگەڵ میول لە مابەینی نائەهل، چی پێ ناکرێ! بەڵکو خۆی وەرئەگێڕێ، دوای مەیلی فاسید ئەکەوێ! ئەخلاقی حەیوای لەناو هەیکەلی ئینسانی زوو جێ ئەگرێ مەحکەم ئەبێ! درەنگ دێ، جێی نییە، ئەبێ قەرەپەستێ بکات، زۆر ئەبێ ئەساسەن جێێ نابێتەوە، واش ئەبێ دوایێ دەرئەکرێ!

## بە مەحەببەت و تەقلید خۆت کۆرە مەکە!

ئیحتراس بکە حەتتا لە حەق مامۆستات، حوکم بە تەزکییەی مەکە! بە مەحەبە و تەقلید خۆت کۆر مەکە! ئەوی تەعلیمت ئەکا، تێفکرە چی تیایە! وەك بەرناردشۆی کاتبی شەهیر ئەڵێ: ئاگات لەخۆت بێ گەلێ موعەللیم ئارەزوو ئەکات عەقلی خۆت لێ سەلب بکات، عەقڵی خۆی باوێتە دەماغت.

من زۆر دەفعە بە فەقێی خۆم ئەڵێم: موقەییەد نەبن! بە حوسنی زەن غافڵ مەبن لە موغالەطە.مەلای زۆر گەورە بۆ ڕەواجی فیکری موغالەتەی ورد وردی هەیە، تەواو دیقەت نەکەن، تێ ئەکەون! خاسەتەن بەناوی ئیعتیقادی دینی. حەقەقەن لەبەر تەرخیصی دینی یا مەزهەبی یا تەریقی، هەرچەند ئینسان مەلا بێ، کەم وایە تەززەککی نەفسی ببێ! خصوص مەلای ئەحزاب و فیرەقی سیاسییە ئەیەوێ حەق و حەقیقەت تابیعی فیکری خۆی بکات. خواهیش تەقویەی حیزبە! ئەگەر عولەمای ئوممەت ئایەتی (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ (یان کردبا میثقەلی مشتومالی نەفس، نەفس تەزکیە ئەبوو! ئەمما بە تەریقی ڕیازەت زۆر کەم و نادیرە، ئەکثەر صیفاتی ذەمیمەیان زیاد ئەکا بەقووەت ئەبێ! گەلەکیان تووشی کوفر ئەبن. حاصلی تەئسیری ئیمان لە دڵان ڕسوخی بە نەوعێ بێ غەلەبە بەسەر قیوای حەیوانی دا بکا، نایابە!

٢٦٠/٦

## زەواتی گەورە گەورە لەسەر مینبەران لەعنەتیان لێ ئەکرا!

گەلێ کەس هەن بە تەفائولن، تەماشای جەمال و حوسن و تەبیعەت ئەکەن، هەرچی لە دونیا واقیع بی، مولاحەزەی جیهەتەکی خەیر ئەکەن، حەتتا بـۆی ئەدۆزنەوە، وە جەمعـی موتەشـەئیمان بە غەیـری قەبـایح و وەقایح و شروور چیتر لە کائینات نـابینن، حەتتـا بـۆ ئەمـری زۆر چـاك، جیهەتی بەدی بۆ ئەدۆزنەوە، یاخود هەڵی ئەبەستن. دەربـارەی ئەسـلاف عەینی فیرقەتەین مەوجودن. حاڵی ئـوممەت گەیشـتە دەرەجەیە، زەواتـی گەورە گەورە لەسەر مینبەران لەعنەتیان لێ ئەکرا. ئایا مەنابیری ئیسلامیە بۆیە دروست کران، ئەو نەوعە لەعنەی لەسەر بگوترێ؟ ئای، وای!

ئێمە بە موفادی ئایەتی (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ) تەماشـای خـراپە نـاکەین، سەعی لە چاکە، چـاکەیی مـوافیقی زەمـین و زەمـان ئەکەیـن. ئـامۆزای پێغەمبەری لەگەڵ حەرەمی پێغەمـبەری نیزاعیـان بـوو، مـن لەبەر نسـبەتی رسول الله هەردووکم خۆش ئەوێن، بۆ خـاتری چتاقیـان نـابمە دوژمنـی ئەوی دی. الحمدلله خەیاڵێ سووکیان بە دڵم دا نـایە، زۆرم لا گەورە و گـرانن. لە جیـاتی عەداوەتـی ئەوانە لایـق وایە عەداوەتـی مۆسـۆلینی و ستایلی بەدخواهانی دین و دنیامان بکەین. مۆسۆلینی چـی بە مسـوڵمانانی تەرابلـوس ئەکـات؟ مەلای شـیعە بەگـژ ئەبـو هـورەیرەدا دەچـێ! دەك هەناوت کەوێ مەلا، لەگەڵ غیرەت و قووەتی ئیمانت!

٢٦٢/٦

## هەولێر گەلەك لە کۆیە چاکترە!

وڵاتـی مە بەربـادە، سـەلامی چـی و ئیسـتئیذانی چـی؟ هەڵئەکـوتێتە بنەبانی، لەبەر ئاگردانی، لەناو ماڵی و ژنـی سـاحێب خـانووی دادەنیشـێ، واقیعەن ئەکـەریش پێیـان خۆشـە، سـڵ نـابن. ئەگەر دەسـتەبرا بـن، زۆر

کەیفیان پێ دێ، چونکی لایان دەلالەت لە خۆشەویستی و ڕێکی ئەکا. ئەمما شارە گەورەکان، وەکی موصڵ و بەغدا لەو جیهەتە زۆر باشن، هەولێریش گەلەك لە کۆیە چاکترە. عەقڵەن و عادەتەن و تەعلیلەن.

دیارە موراد لەو بیوتە سوکنایە، کە عائیلەی تیا بێ، ئەمما بیوتی موعامەلە و موناقەلە، وەك کاروان سەرای و قەیسەری، خمخانەی جوان، سەلاملغ و دیوەخانان ظاهیرە جێی ئیستئیذان نییە، بێ مانیعە. ئەمما خەرەبە و چۆڵی، بۆ دەفعیان نازانم چ بڵێم؟ دوورە لە مەقام، مەگەر بڵێین لەبەر ئیحتیراس لە تەوەهومی عموم.

٢٦٦/٦

## چارۆگە بوزی ڕەش!

ئیمامی نەوەوی تەماشای دونیا بکە چی بەسەرهات! چارەیێ بکەین بۆ ژنە مسوڵمانان! قابیل نییە ئەمڕۆ پێچەی مووی کلکی بارگیری بە ڕووی خۆیانـدادەن، یان چارۆگە بوزی ڕەش، یان شینە پۆتی و چەکمەی ڕەق، وەکو کۆنە ژنی هەولێرییان بچنەدەر. گوێ لە خیلافی مسوڵمانان ڕاگرن، ئایا سفوور باشە؟ یا سەتر؟ ئەمما چ سفوور سفووری کۆهی نوور! حەققەن هەمووی ئیفراط و تەفریطە!

ئەوروپایی پەکیان بە ناموس و شەرەف نەکەوتیە، خۆی لە ولاتێ، ژنی لە ولاتێ. لەکن دۆست و ئەحبابیان بۆ سیاحەت ئەچێ، بەڵام لەسەر مەسرەح بەو نەوعە سفوورە، ڕەقس ئەکا پارە پەیا ئەکات. گۆڕ هەڵتەکێنە عبدالله بن سلول ئەمڕۆ ڕۆژی تۆ بوو، بووبای بە مەسرەح چی، پارەت پەیا ئەکرد!

ئەی ئوممەت بە قسەی ئەورپایان مەخەڵەتێن! لەبەر سفووری هاکەذایی ڕۆژێ چەند وەقایع و وەقایح ڕووئەدا! ئەگەر بەشەر بەڕاستی تەعەهود ئەکا، بۆ حیفزی خوارێ، با سفوور کەن! ئەمما بەخوای درۆیە، مەقسەدیان هەدمی دینە، هەتکی شەرەفی بەشەرییە! عوزەمای جاران و ویقار و تەمکینیان، گرانی ئەدا ئەرزا! ئێستا ئەمەندە سووکن لەگەڵ کچە تیو و میو دانس ئەکەن. سەبەب بە فەحشیاتی ئەوروپا، فەحشیات لەناو

ئێمە بڵاوبوویتەوە! تا ئەوروپا ئیسلاح نەبی، سائیری بەشەر ئیسلاح نابن!

## لەچەکێ دزەییان!

حالەن لەناو دزەیی عادەتە ژنیان مشکێ ڕەنگ تاریك ئەکەنە لەچەك، سەر و مل و شان و بەرۆکیان دادەپۆشێ؟ وەقتێ لە کۆیە دەسماڵ هەبوو زۆر لەتیف بوو. لاکین علی الاکثر ئێستا چارۆگە بەسەریاندا دەدەن، بە لای پشتەوە شۆڕ ئەبێتەوە، لای پێشەوە داناپۆشی، سینگ و بەرۆك ئاچوغە، زۆر ئەبێ لە یەقەیاندا، سفیدی باغی سێوان دەرئەکەوێ! ئەو لێرە وایە! لە بیلادی قەریب و تێکەڵاوی ئەوروپاییان باسی حیجابی سەر و مل و بەرۆك، تەسەتتور کردن نییە! سەر شان و کەلەکە و ڕان، مەکشووفە! زۆریان لە بەعزە مەواقیع، غەیری دوو کونەکان، ئەویتر هەموو لە گۆڕێ مەشهوودی ئەنامە! بالطبع بۆ مسوڵمانانیش سیرایەت ئەکا.

خولاسە زینەتی حوسن و ئاداب، حیفزی شەڕەف و ویقار، هەڵگیرا!

٢٦٩/٦

## چارشەو لە کۆیە هەر مایە!

سەییدی ئالووسی قسە لە چارشەوی کەمەرەلی سوورمەدار ئەکات. فی الحقیقە لەبسێ جالبی نەزەرە! ئێستا لە بەغدا لەغو بووە، ئەمما لە کۆیە مایە. لام وایە لێرەش لەغو ئەبێ، یا مەکشوفەن ئەگەڕێن، یا بە بەتیە ئیکتیفا ئەکەن، وەکی ژنە تورکانی زەمانی عوسمانی.

٢٧١/٦

## پارە هەموو شت بە ئینسان ئەکا!

بە یەکێ لە ئینگلیزانم وت: ئێوە قەومێ بە شەهامەتن، نەدەبا قەحپەخانە لەناو ئێوەدا هەبا.

وتی: حەقیقەتەن ئێمەش دوژمنین، لاکین ئەگەر قەحپەخانە نەمێنێ، حکومەت زۆر زەرەر ئەکا، لە پێنج ملیۆن لیرەی زیاتر لەقیس ئەچێ.

بەڵێ پارە هەموو شت بە ئینسان ئەکات! حاصڵی بەشەر و ئاداب و مەحاسینی شەریعەتی ئیسلامییەت لێك دوورن.

٢٧١/٦

## ژن و ماڵ، نەك ماڵ و ژن!

زۆرمان دیت فەقیر بوون، ژنی چاکیان نەسیب بوو، بە کەسابەت و ئیقتیصاد سەعییان کرد، دەوڵەمەند بوون. بە کوردی ئەڵێ: ژن و ماڵ، نەك ماڵ و ژن. زۆر دەوڵەمەند ژنیان هێنا، ئیسرافیان کرد، فەقیر بوون، وەعدی ئیلاهی صەحیحە، تەئویلی پێ ناوێ.

٢٧١/٦

## ئەوەی ئەبێتە مەلا برسی و ڕووت!

بنۆڕنە زادەکان، خانەدانێ، ئاغایێ و سیادەت و عیلم نابێ بە کەسابەت بکا، ئاغازادە سبەی ناچار ئەبێتە کەنناس و کەننافی بەلەدیە. مەلازادە ئەبێ هەمیان بخوونن، ببنە مەلای (لَمّا حین)ە، (کان)ە بوو، نەختێ ئەخوێنێ، برسی ئەبێ، ڕووت ئەبێ، چی بکا؟ لە کار و کەسبیش ئەکەوێ، نەشبووتە مەلا. (چارە یۆك/ یۆخ)!

ئەوەی ئەبێ بە مەلا حاڵێ چۆنە؟ مەپرسە! برسی، بێ حورمەت و چاولەدەستی خەڵك، بۆ دین و دونیا بێ کەڵك!

٢٧٢/٦

## ئیجابات ئینسانی مەجبوور ئەکا!

مەلایێ گەورە لە زەمانی عبدالملك بن مروان، بە ئیلچیەتی چووە

ئەستەمبۆڵ لەگەڵ ئیمپراتۆر بەعزە گفتوگۆی کرد. ئەز جوملە سوئالی لە مەسئەلەی ئیفکی صددیقە کرد، مەلا فەرمووی: بەڵێ دوو ژنی گەورە توهمەتیان پێ کرا، یەکێ مەریەمە یەکێ عائیشە. مەریەمە کوڕی بوو، ئەمما عائیشە لە مێردی خۆشی وەلەدی نەبوو!

بەو جەوابە زۆر مەخجول بوون. کە مەلا هاتەدەر گوتی: خوایە خۆت ئەزانی ئیمانم بە بەڕائەتی مەریەمە هەیە، ئەمما مەقام وای ئیجاب ئەکرد دەفعیان بەم تەرزە بکەم.

ڕاست ئەفەرمووێ، ئیجابات ئینسانی مەجبوور ئەکا! گەلێ مەلا ترسی لە سەریان غەلەبە ئەکات، ناتوانن لەو نوعە مەقامە چ بڵێن! لە زەمانی سابق یەکێ لە ئودەبای تورك مەشهوورە بە **قلنجی زادە ئیسماعیل حەققی** مودافەعەکی لەسەر جەنابی ڕیسالەت پەنا کردبوو، هەرچەندە مەلایانی دینی لەعنیان ئەکرد، ئەمما قسەکەی زۆر لە جێ ئەچێ! ئەوان تەعنیان لە ڕیسالەت پەنا دابوو بە ئەنواعی تەعن، ئەویش موفەصصەلەن جوابی دابوونەوە، لە فذلکەی مودافەعە ئەڵێت: محەمەد هەرچی هەبێ، خۆ داك و بابی مەعلوومە، مەحصوڵی نیکاحی مەشرووعە. ٢٧٥/٦

## فەقیر چی لەمست دێ؟!

سبحان اللە، فەقیری بەستە دەست و پا، چی لەمست دێ؟ بۆ ئوممەتی موحاریب کەڵکی چییە؟ فەقیریی بۆ عالەمی ئیسلامیەت زەهری قاتڵ بوو، ئەکثەری دەوڵەمەندەکانیش، بە بێ هوودە ماڵیان صەرف ئەکرد، مزگەوتیان زۆر بینا ئەکرد. ئێستا مزگەوت لە بەغدا ئەوەندە زۆرە، گەلەکیان موعەتتەڵن، خەریکن بیانکەنە بەعزە مەبانی نافیعە بۆ حکومەت. فەریادی چەند کەسێ مانیعە وە ئیللا تا ئێستا ئەکرا، ئەمڕۆ نا، سبەی ئەکرێ. سبحان اللە ئینسانیش وەك تەبیعەت خەریکی بۆری و زۆرییە. کۆیە ٢٢ مەدرەسەی هەبوو، ئێستا دووی لێ زیادە، بەخێو ناکرێ. بنۆڕە ئەو ئینسانە لاوانەی جەبریان لە جاریەیان ئەکرد بۆ زینا!

٢٧٨/٦

## مەلا مەلا بێ!

مەلا مەلا بێ، ئەتوانێ لە شەرحی قۆشەجی تۆمارێ بێنێتەدەر، وە هەروەها لە سائیری کوتوبی کەلامی.

٢٨٠/٦

## لەبەر نەحوو و صەرف ئاگای لە نووری ئایات نامێنێ!

مەلا قورئان ئەخوێنێ، تەفسیری ئەکات، سەبەب بە بگرە و بەردەی نەحوویان و صەرفییان و بولەغایان و نوقتالان و فوقەهایان ئاگای لە نووری ئایەت نامێنێ! ناشکوری نەبێ ئیقتیباسی لێ ناکا!

٢٨٠/٦

## کەو و سووسکە!

دیقـقەت لە تەدبیری ئیلاهی کە، ئەو تەیرەی وەکی حەیوان لە ئەرزیدا فەرخە هەڵدێنی، چونکی فەرخەی (*حسب الضرورة والفطرة*) زوو دەڕوا. ئەوی ماڵەکی بێ، نافڕێ، ئەوی چۆڵی بێ، وەکی کەو و سووسکە، لەبەر ترس نەختێ ئەفڕێ. ئەگەر ترس نەبا، هەندەش نەدەفڕی. ئەوی فەرخەی لە هێلانەدا دەبێ، تا گەورە دەبێ، لە جێی خۆی ساکینە، ناڕوا، دوایە چاك ئەفڕن، بە دەوام لە فڕین. تەیرەحەواویلە، چونکی ئەسڵەن بەسەر عەردی دا نافڕێ، لام وایە لە هەموو تەیرێ زیاتر لە هەوادا دەخولێتەوە، زێدە سەبەبی فڕین و خولانەوەی تەیر و حەیوانات بۆ تەڵەبی ڕزقە.

لە توحفەی طبیەی فارسی دیومە، باسی نەباتێ ئەکا، ئەڵێ: بیخی بۆ عقم ئیستیعمال ئەکرێ. ئافرەتێ لەو ڕەگە بخوا، ئیتر ئاوس نابێ. ئەمەش لە پلنگ وەرگیرایە، پلنگ بۆ وەزعی حەمل غایەت موتەئەذی ئەبێ. ڕەگی ئەو گیایە ئەدۆزێتەوە ئەیخوا، جارێتر ئاوس نابێ.

تەماشای کە چەند عەجایبە، ئەو عیلمەی لە کێ بوو؟ کێ فێری

کرد؟ محیر العقولە، وە سەعی بەشەریش جێی تەقدیرە، وە عوطالەیی کوردیش مەوجیبی تەکدیرە.

۲۸۱/٦

## ئەگەر شەرع بباتەوە دەڵێ: دەستێ شەرع بیبڕێ، خوێنی لێ نایە!

ئەو نەوعە کەسانە لە هەموو عەسرێدا زۆرن، ئەگەر شەرعیان بردەوە زۆر مەسروور ئەبن، ئەڵێن: ئەدی برام ئێمە بە چی مسوڵمانین؟ دەستێ شەرع بیبڕێ، خوێنی لێ نایە!

ئەگەر بیدۆڕێنێ ئەڵێ: نا واللە هیچ وا نییە و هیچ! شەرعت گۆڕی، ئەمن بە شەرعی ناکەم دەچمە مەحکەمەی مەدەنی! ئەگەر بشزانێ لەوێش بۆی ناکرێ ئەڵێ: ئەچمە تجارەت! قەومێ هەن جەسوور، بێ ئەدەب ئەڵێن: شەرعیش بتداتێ ئەمن ناتدەمێ.

شەخسێ لە ئەهلی ئیمان دائیمەن بە تەسبیحات و صەلەوات و طالب الجماعة، ڕۆژێ لەگەڵ کرمانجێ هاتنە لام بۆ شەرع. زاتێ دیانەت پەناهی فەرمووی: قوربان کەسێ عەربە گەنمێ بچێنێ، پاش شینبوون نیوە عەربەی ئەو تۆیەی بە کەسێ بفرۆشی، بەیعی دێت؟

وتم: نا، بەیعی هاکەزایی باتڵە!

وتی: بابم نەمگوت حەرامە، پارەکەم بدەوە دەغڵەکە بۆ خۆت!

کرمانجەکە گوتی: باشە ئەوە هەر بۆ ئەوساڵ حەڕامە یا هەموو وەقتێ؟

وتم: ئەوە مەعنای چییە؟

گوتی: قوربان ئەوە چەند ساڵە ئەو زاتە معامەلەیێ هاکەذایی لەگەڵ من ئەکات، هەموو ساڵێ موقابیلی پارەکەی گەنمی چاك و زۆری وەرگرتییە، بێ دەنگ و بەنگ، ئەمساڵ گەنمەکە کەمێ خراپە پێکبڕە لێیدا و باران کەم بوو، خراپ ژیاوە، مع هذا کیسەڵیشی بوو، ئەڵێ بابم بە شەرع ئەو معامەلە دروست نییە. ئەگەر ئەمساڵ دروست نییە، با

ساڵەکانی ڕابردووش دروست نەبێ، بەسەر هەردوو چاوم. ئەوەندەی گەنمت لێ وەرگرتیمە بمدەوە، ئەوەندەی پارەم لێ وەرگرتووی ئەتدەمەوە.

منیش گەلەکم تەکدیری زاتی دیانەتلو کرد، بە مەخجوولی ڕۆیی.

٢٨٤/٦

## تا جوو بووی ئەمین بووی، بوویە مسوڵمان زەرەرت بوو!

کەسێ ئیمانی هەبێ بە خوا، بە ڕەسوولی، بە جەزای، ئەمما ئەوەی خوا و پێغمبەر بفەرموون، ئیتاعە نەکات، هەرچی بەدییە، دەرحەق ئوممەت بیکا، ئەمە کوو موئمینە؟ ئیمانی بێ ئەثەر چییە؟ ئینسان نازانێ بڵێ چی؟ موعتەزیلیەتی، ئەشعەریەتی لە ئێمەیان تێك دایە.

خوایە خۆت ئەزانی بەعزێ هەن، ناو مسوڵمان: ئەحمەد و مەحموود و سائیری ناو ئیسلامی، بۆ مسوڵمان و مسوڵمانی لە عروس و فەڕەنگ خراپترن. فەرخە جوێ زیندی مسوڵمان بوو، چووە لای ئاغایە، دەستی کرد بە دزی.

وتم: تا جوو بووی، مسوڵمان لە شەڕت ئەمین بون، کە بووی بە مسوڵمان ئەوجا زەرەرت بوو.

٢٨٥/٦

## ریجالی نایاب و نادر سێ کەسن!

حەقیقەتەن خوا وەعدی خۆی هێناجێ، بە موددەکی کەم مسوڵمانان ظاهیر بوون ئیستیلای جیهانیان کرد، بوونە سەییدی ساداتی خۆیان. ئێران و ڕۆمیان فەتح کرد، تاج و تەخت و عەمەلی کیسرا و قەیصەریان بە تاڵان هێنا. بێ خەوف و ترس، ئیقامەی شەعائیری دینیان کرد. بەڵام مع الاسف زۆر نەچوو، لێیان وەرگەڕا موتەفەریق بوون، بە دەسیسەی ئەجانیب، بوونە دوشمنی یەك. حکومەتی عەرەب لە شەرق و غەرب

مەحوو بوو، سوننی و شیعی بەگژیەکدا چوون، لە بەینی دەوڵەتی عوسمانی و ئێران حەرب دەوامی کرد، هەردوو دەوڵەت سست بوون هێزیان نەما. ئەوروپا قیامی کرد، ڕوویان کردە مەمالیکی ئیسلام، سەبر سەبر ئیستیلایان کرد.

حکومەتی ئێران تەرەفداری عروسی پێ چا بوو ئەیکرد تا وایلێهات ئێران بووە جەولانگاهی ڕووسی. نیهایەتی حەربی عمومی چ ئێران چ توران، هەمووی کەوتە ژێر پای ئینگلیز. خوا کردی دوەلی غالبە لێك هەڵوەشان، بە تەقسیمات ڕازی نەبوون، خوا مستەفا کەمالی موەفەق کرد عیصمەت پاشای بنودی موعاهەدەی ڤرسای پارچە پارچە کرد، ئیمتیازاتی ئەجنەبیان ئیلغاکرد. سبحان اللە بۆلشەویکی ڕووسی زۆر بە سەماحەت بوون لەگەڵ کەمالییان. لەشکر و ئومەرای ئینگلیز و حولەفا وڵاتیان بەجێ هێشت، ئێرانیش دەرچوو. ئەو ئەساسە بە نیوەی لە بەینی ئینگلیز و ڕووسی تەقسیم کرابوو! ئەمڕۆ چەند حکومەتێ لە عەرەب تەشکیلی کردیە- گوایا موستەقیلن- عێراق و یەمەن، میصر، نەجد، حیجاز خەریکی مەسئەلەی فەلەستینن.

وەفدی عەرەب چووینە لەندەن دەعوەت کراینە سەر مائیدەی موستەدیرە، بزانن سیاسەت چۆن دەوران ئەکا؟! ئێران لە سایەی ڕەزا شای پەهلەوی، حەیاتێ نوێی هاتیتەبەر. ئەفغان باشە! گەرچی سەدەماتی ڕۆژێی بەسەر هات، توغیانی بەچکە سەقا و فیراری ئەمانوڵلا خان، مع ئوسرەی مالیکە غەلەبەی نادر شا بەسەر بەچکە سەقا و، لە وەقتێ ناسك ئیغتیالی نادر شاە، خەوفی دا بە مسوڵمانان! بەڵام ئەوروپا مەشغوڵ بوو، وە ئیللا ئەڕۆیی.

ئەلئان ڕیجالی سیاسەت وا مەشغولن، ڕیجالی عیلم نیزاعیان لەسەر خیلافەتی ئەبوبەکر و عەلییە! ئەو ئایەتە[1] دەلالەت ئەکا لەسەر حەققیەتی خەلافەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی، چونکی ئەو وەعدی ئیلاهی لە زەمانی وان هاتە جێ! مەلای شیعی ئایەتی خێر لا تسلم ذلك،

[1] مەبەستی ئایەتی (وعد الله الذین منکم.... سورەتی نور)

بە دوور و درێژ. حەتتا لەو ساڵانە مەلایێ شیعە تەئلیفێکی کردیە تەعن لە ئەبا هورەیرە و ئەمثالی ئەدا. وتم دەوجا بنۆڕە ئەبا هورەیرە فەقیری بەستەزبان، تۆ ئەچی بەگژیا؟ بۆ ئێوە ناچن بە گژ مۆسۆلینی ئەوا ئیسلامییەت لە ئەفریقا مەحوو ئەکا؟ دەخلتان چییە بە سەربردەی لە ۱۳۰۰ هەزار و سێسەد موقەددەم؟

سەییدی ئالووسی لێرە مەیدانداری کردیە، حەقیقەتەن نەسەبەن حەیدەرییە ئەمما مەشرەبەن عومەرییە! ئەکثەری مەباحثی لە توحفەی اثنا عشریة هێنایەتەدەر. ئەو کتێبە ئەلئان لای منە موتاڵەعەم کردیە و زۆر کتێبێ قیمەتدارە! ئەو و منهاجی السنەی ی شێخی ئیبن تەیمییە شایانی ئیعتینان. ئەمە وا! ئێمە سەرفی نەزەر ئەکەین لە ڕیوایاتی (حدثنا فلان) تەماشای تەئریخی بەشەر ئەکەین ئیستیدلالە بە ئەثەر دێنین نە بە خەبەر!

بنۆڕە ئاثاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد شیرازی دین و دونیا تێك چوو. عالەمێ مورتەد بوون، عالەمێ دەعوای ڕیسالەتیان ئەکرد، شەرذمەی ماوە، خۆیان زۆر بە زەعیف ئەزانی، ڕازی بە قەزاو قەدەر، نوێژ و ڕۆژی بکەن و بگرن، تا بزانن چییان بەسەر دێت. ئەبوبەکر بەو حاڵە قایل نەبوو وتی ئیللا حەڕب ئەکەم، ئەوی مورتەدن ئەبێ بگەڕێنەوە یاخود بکوژرێن. وە ئەو کەززابانە ئەبێ دەفع بکرێن، ئاڵای رسول الله (صلى الله عليه وسلم) نابێ بخرێ، لەشکر ئەبێ بڕوا بۆ لای سوریە حەربی ڕۆم!

ئەیهو ئێمە لە چ حاڵداین، ئەبوبەکر لە چ فکردا؟ لێك دووریـن! نیهایەت ئیصراری کرد بالمجبوریە یارانی مصطفى (صلى الله عليه وسلم) موافەقەیان کرد. ناپلیۆنی ئیسلام یەعنی خالدی بن ولید بووە قائید- القائد الذى لم يغلب- تاکو ئومور ڕێك کەوتەوە، کەززابەکان نابووت بوون، دەست کرا بە فتوحات، هەم لە جیهەتی ئێران هەم لە جیهەتی ڕۆم.

ئێوە و خودا بنۆڕن ئەمە چۆن بوو؟ والله دەهشەتە حیرەتە لەو هەموو گەرداو و گێژەڵۆلەی فیتەن و مەصائیب دەرچوون و سەرکەوتن! شتێ نییە قەڵەم و زوبان بتوانێ بە تەواوی تەحریر و تەوصیف، تەقریر و تەقدیری بکات! وە عومەریش فی الحقیقه عضدی ئەبوبەکر بوو، دینیان

بە مورتەد نەجات دا و کردیانە مایەی حەیاتی ئومەم.

لە جێی تریشم نووسیە ڕیجالی نایاب و نادر الوجود لە عالەمی تاریخ سێن، هەر یەك لەگەڵ معاونی: ١-ئەبوبەکر و معاونەکەی عومەر.

٢- محەمەد چەلەبی عوسمانی موئەسیسی ثانی معاونەکەی یەعقوب پاشا.

٣- موحیی تورکیا ڕەحمەتی لێ بێ مستەفا کەمال ئەتاتورك[1] معاونەکەی ڕەئیسی حالی عیصمەت پاشا. تا دیققەتیان لێبکەی موتەحەییر ئەبی دەهشەت ئەتگرێ! ئەمما بەشەر بڵێم چی بەعزێ تەرجیحی غاندی ئەدەن بەسەر مستەفا کەمال *(لا حول ولا قوة الا بالله)* قیاسیان لێك ناکرێ. مەوقیعی ئەتاتورك لە کێ؟ حاڵ و وەزعیەتی غاندی لە کێ؟ حبزبوز ڕەحمەتی لێ بێ ئەیوت: غاندی بە کلکە تەشی موقابەلەی تۆپ و تەیارە و ئوستوڵی بەریتانیا دەکات؟ چشی پێ نەکرا!

منیش وتومە:

**منیش هەروەکوو غاندی هەناسە سوار و ماندی**
**لە قەومی کورد و هیندی، چی مەقصود بوو نەماندی**

ئەوروپای ئەبوبەکر و عومەر و خالیدی لە زومرەی نابغی و عەبقەری حیساب ئەکەن. حەتتا تەفزیلی ئەبوبەکر و عومەر بەسەر ئەسکەندەر و فردریکی کەبیر دا ئەدەن. وە خالیدی لە ناپلیۆنی ماهیر حیساب ئەکەن. ئەمە وا ئەنۆڕێ عەرەبی ڕەش و ڕووت، بێ دەرپێ، عەورەت نەشۆر و لچ ئەستوور و پیسی بۆگەن، مردۆخی مردار، دەرحەق بەو زاتانە زوبان درێژی ئەکەن، ئەمەش لە بێ ئەدەبی مەلایەکانە، حەقەن بێ تەربیەن! ئینسان دەرحەق پیاوی گەورە وەلەو دوشمن بێ، قسەی نالایەق کوو ئەکات؟ من کوو جنێو بە هیتلەر و مۆسۆلینی بدەم؟ ئایا ئەوان لە جێی بن من ئەتوانم لەوێ ڕاوەستم؟ ئەتوانم پڕ بە چاو تەماشایان بکەم؟

---

[1] دیارە مەلای گەورە هەر لە دوورەوە هەواڵی مستەفا کەمالی بیستووە و ئاگاداری ستەمەکانی نەبووە، بۆیە وا بە ڕێز و ناردنی ڕەحمەتەوە باسی دەکات. زیاتریش مەسەلەکە پەیوەستە بەوە کە مرۆڤی سادە نابێ دەرحەق ئەو پیاوە گەورانەی دونیا جنێودەر بێ، ئەگەر ئەوانە دوژمنیش بن.

ئیمپراتۆری بەریتانیا سەرداری چارسەد و پەنجا ملیۆن نفووسی بەشەری، من چیم قسەی سووکی پێ بڵێم؟ گۆیا من مسوڵمانم! بەڵێ مسوڵمانم! وە مسوڵمان ئەبێ بە تەربیە بێ! جنێودان بە گەوران چ موقتەزای دینە؟ حاشا! وە حەزرەتی ئیمامی عەلی بە عیلم و بەلاغەت و شوجاعەت لە نەوابیغانە مومتازە! ئەی عولەمای ئیسلام لە کوللی مەوقیع لە مەواقیعی خصامی عەرزتان ئەکەم (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ) ئەو ئایەتە بۆچی ئیهمال کرا؟ ئیلاهی!

٢٨٧/٦

## مەلای شیعە و مەلای سوننی!

ئەتوانی بڵێی مەلای شیعە زەکات ئەدا؟! مەلای سوننی لە وڵاتی ئێمە هێندەی نییە پێی بژێ، چ جایێ زەکات بدا! دەوڵەمەندان زەکات ئەدەنە مەلا، ئەمما هیچ! مەلایێ بە قەدەری پیرەژنێ وەرئەگرێ؟ ئەویش ئەگەر لە مەنسووبانی دەرگا بێت، ئەوجا وەرە دین بنج و بنەوان بگرێ.

٢٩١/٦

## ئەفریقییەکان و شەرەفی کچان!

ئەمشەو شەوی شەموو، بیست و یەکی ماهی قوربان، لە موجەلـلەی (کل شئ) ی میصری ئی یازدەی شەعبان (١٣٥٢هـ) دیم باسی لە قەبیلەیێ ئەقزامی ئەفریقیە کە لە غابات ئەژین و ژیان بەسەر ئەبەن، ئەکرد. لە مەیانی ذیکری عاداتی بووك گوێستنەوەیانی ئەیووت: دەستگیران لەگەڵ دەستگیرانی مومکین نییە پێك بگەن و وێکڕا قسە بکەن، ئیللا لە حزووری ئەهل و ئەقاریبی. ئەو قەومە زۆر بە ئیعتینان بۆ حیفزی کچیان، کچێ خۆی بدۆڕێنێ یا لە مەواقیعی سووئی جێی توهمەت خۆی نەپارێزێ، بێ حورمەت ئەبێ و کەس مارەی ناکات، نابێتە ژنی ساحێب ماڵ و مێرد، نایانخوازن، ئیللا بۆ خزمەتی زەوجاتی صالیحات.

وتم: سبحان الله ئەقوامی ئەفریقییە ڕیعایەتی ئەو شەڕەفە ئەکات، ئەوانی ئێمەش لە سەدری صورەت چی ئەفەرموون؟! فی الحقیقە ئەو ئایەتە بۆ زانی و زانیە، سەددی عەجیبە!

٢٩٣/٦

## باغەوانی خۆمە ئیشی پێم نەبێ، میوەم بۆ نایەنێ!

مەسەلەن بە وەکالەت، وەکو باغ و مێگەل و ماشیە چێڵ و گامێش و مەزرووعات، خۆزیا بەشی ساحێبیان دابا، لە تەصەڕوفاتی خۆیان گەردنیان ئازاد بێ.

بڕوام پێ بکەن باغەوانی خۆمە ئیشی پێم نەبێ، میوەم بۆ نایەنێ، وەکەذا شوانکارە!

٢٩٥/٦

## خزمت خۆشتر دەوێ یان دۆست؟!

حەققەن دۆستی ڕاستی فوق الکلە، زۆر مەمنون ئەبێ دۆست بێتە ماڵی شتێ بخوا، ئەوی لازمی بێ، بێ پرسی بیبا. مەلا ئەحمەد چەلەبی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دۆستێ، برایێ، برادەرێ، ڕەفیقێ چابوو. سەڵتەیەکی چۆغەی مەیلە و زەردم هەبوو، ڕۆژێ دەمەو بەهار چووبووە ماڵێ تەڵەبی سەڵتەکەی کردبوو. عائیلەش تەقدیمی کردبوو. لەبەری کرد، هاتە مزگەوت بە تەبەسسوم وتی: ئەو سەڵتەم کڕییە، ڕات لێیە؟

وتم: یاخوا موبارەکت بێ زۆرباشە!

لە بەینی بەشەری عەسر زۆر حەقی لەسەرم هەیە. مع الاسف بۆم ڕێك نەکەوت لەگەڵ وەرەثەی وەفاداریێ لایەق بکەم -الفقر سواد الوجە فی الدارین-.

لە زاتەکیان پرسی خزمت خۆشتر ئەوێ یا دۆست؟

فەرمووی خزم ئەگەر دۆست نەبێ بۆ چیمە!

بەڵام دۆستی جانی بەڕاستی زۆر کەمە، خاسەتەن ئێستا! موحیببەتی قەلبی نەمایە هەمووی بوویتە سیاسەت! حەققەن سیاسەت دونیای بە با دا. فەزائیلی مەحوو کرد. شەڕەفی بەشەری نەهێشت!

٢٩٥/٦

## بێ بانگ کردن نەچوویمە هیچ ماڵێك!

لە زەمانێ حاجی حەسەن ئەفەندی لە کۆیە قائیمقام بوو، ئێوارەیێ ڕەمەزان مەدعو بووین نوێژمان تەنها تەنها کرد، وێکڕا نانمان خوارد. زاتێکی گەورەی میوان وتی: ئەمە چۆن وا ئەبێ؟

وتم ئێمە عادەتمانە نوێژ بە مونفەریدی ئەکەین نان بە جەماعەت ئەخۆین!

وتی: حەقیقەتەن زۆر باشە!.

ئەو حوکمە غێر مەنسووخە، مادام خزمایەتی و دۆستایەتی و عەواتیفی ئیسلامیەت نەفەوتێ! ئەگەر گۆڕا، تەبعەن حوکم ئەگۆڕێ! زاتەن تا حوکمی تەبیعی نەسخ نەبێ، حوکمی شەرعی نەسخ نابێ!

بێ بانگ کران نەچوویمە ماڵی هیچ خزمێ، دوور و نێزیك. ئەمما چوویمە ماڵی مەلا ئەحمەدی چەلەبی و مەلا مستەفا مام یەحیا لە دۆستان، حاجی کاکە ئەفەندی کوڕی خاڵە موفتی لە خزمان! حەتتا نەچوویمە ناو باغی نورەدینی برام. لەگەڵ ئەوەی باغچەمان لە تەنیشت یەکە لە چنارۆك! برایێ واشە ئەگەر هەموو باغەکەی لە ڕەگ و ڕیشە دەرێنم پێی ناخۆش نییە. وە بە هیچ وەجهێ خۆی بە ساحێب ماڵ نازانێ! خوا لێکمان نەستێنێ وا زووا!

٢٩٥/٦

## هەڵات، سەگ کوشتی!

زۆرمان دیتیە کەسێ لە کارێ خۆی ئەدزێتەوە، تووشی موسیبەتێ ئەبێ بە هیلاکەتی ئەدات. حەتتا دێتە یادم لە ئەوائیلی حەربی عمومی، شەخسێ لە ئەهالی ئەترافی کۆیە هەڵاتبوو، هاتبۆوە بۆ دێی خۆی، لە نێزیك دێ، سەگ بۆی دێن، دادێتەوە بۆ بەرد، لە پشتەوە سەگێك گونی ئەگرێ ئەیپچڕێ، زۆر نەچوو مرد.

شەخسێ لەو چەندانە لەبەر ئیجباری دائیمەن لە شاخ دەبێ، نایەتە ناو

دێ. شەوێ چەند زەلامێکی تووش دێن ئەیکوژن، کەلەشیان هێنا سەرای حکومەت. فی الحقیقە ئەلئانیش ئەو نەوعە تەخەللوفە تەئسیری هەیە، ئەمما خەڵکی عیبرەت ناگرن.

...ئەی نووری سەماوات و ئەرز! ئەی نووری سەروەری! حیفزی مەجد و شەرەف و عەرز و ناموسی مسوڵمانان، تەفەووقی شەرق لەسەر غەرب، ئینعامی عام بە نەشری نووری ئیسلام بکەی!

٢٩٨/٦

## بەسەرهاتی ئەدیسۆن!

ئەدیسۆن ڕۆژێ لە سەیارە دێتە خوار، نینۆکەکی عەزابی ئەبێ، بە ڕەفیقی خۆی ئەڵێ: هەرچەند من موختەریعم، ئەمما لە صونع و تەرکیبی نینۆك موتەحەییر و عاجزم.

بەڵێ ئەوانی موختەریع ئیمانیان بەخوا لە غایەتی فەوقە. دیارە بت و ئەصنام و هەیاکل ئەثەری صونعی بەشەرە، مع أنە صانع مەصنووعی خۆی ئەپەرستێ، بە مومەثیلی مەعبوودی ئەزانێ. بەشەر تا بڵێی سەیرە (العیاذ باللە) ئەگەر تەصەووری تەمثیل بکەین بەشەر بۆ مومەثیلی فەوقی هەموو کائیناتە. سۆفی کە بە سەی ئەڵێ: **هذا ربی**، زۆر غافڵە، ئەحمەقە، ئاگای لە مەسلەکی خۆی نییە. نازانێ حیصصەی وجودە لە حەیوانات. بەس شێخی عەرەبی تفطنی بۆ ئەو دەقیقە کردیە.

٣٠١/٦

## بوختانچی سوڕەی نوور زۆر نامەردن!

ئەو ئەصنامی ئەوان سوجدەی بۆ ئەبەن[1]، تیمثالی عەزرا، کە ئەمڕۆ ئەمر دراوە لە تەڕەف دیکتاتۆری ئیتاڵیا ئەولادی مەکاتب کە مونەووەر و حوڕ بوون، هەموو ڕۆژێ بەرانبەری ڕکوع ببەن. چ مەلائیکەت هاتیە

(١) مەبەستی دیاناکانە.

بڵێ ئەوانە ئیلاهی ئێوەن یا مومەئیلی ئیلاهن، ساحێبی خەزنە و باغ و باغاتن؟ عەجائیب بۆ ڕیسالەتی بەشەری ئەوە ئیجاباتە؟ بۆ ئولوهیەتی حەجەر و بەقەر، هیچ! ئەمە چییە؟

سبحان الله جەنابی ڕیسالەت پەنا لە دەستی ئەففاکان نەجاتی نەبوو! ئەمما هیچ نەبێ ئەففاکی ئێرە نەزەر بە ئەففاکی سورەتی نوور نەوعەن ما مەردن! ئەففاکی سورەتی نوور حەقیقەتەن نامەرد و بێ مروەت و شەرەف بوون.

٣٠٤/٦

## ئەحمەقی خەڵك گومرایی سەرۆکەکان دروست ئەکات!

زۆر جار تەئەممول ئەکەم، ئایا (ضلال)ی سەوادی ئەعزەم لە بەشەر ئەساسەن خەتای خۆیانە؟ قەراری قەتعیم پێ نەدراوە. ئەمما تەحەمموقی ئەهالی دەخلەکی زۆری هەیە، لەسەر تەشجیعی ڕوئەسا بۆ ئیضلال و تەسخیر و ئیستیخدامیان. ئەهالی بێ موحاکەمە هەموو شتی عاجاتی قبوڵ ئەکا، جارێ ناڵێ:کوو وا ئەبێ؟

ئەوە خۆشە، ئەوی حەقیقەتیان تەعلیم ئەکا، لەگەڵیان ساغ بێ، نایانەوێ، بە سووکی ئەیئنۆڕنێ، بەڵکو بە چاوی عەداوەت!

.. حاصلی دنیا مەجالی جیدالە، مەیدانی حەربە، مەکتەبی ئیمتیحانە، مەردی دەوێ صەبر بکا.

٣٠٧/٦

## گاپەرستی و شێخ پەرستی!

گاجووت چۆن ئەپەرسترێ؟ بە چ خەیاڵێ؟ بە چ فکرێ؟ صەنەمێ لەبەرچاوی دائەتراشێ، ئەیباتەوە ماڵێ، عیبادەتی ئەکا، لەسەرچی؟ لەبەرچی؟ بەس هەوا و مەیل نییە؟ ئەو مەیلە کو زائیل ئەبێ؟ زۆر زەحمەتە.

دوێنێ شەوێ، ئێکی گێڕایەوە: ئەسیر بووە لەلای هیندستان، جەمعەکی گاپەرستان، لە شووشەیە گۆسالەکیان لابوو، عیبادەتیان ئەکرد.

یەکێ لە مسوڵمانان بە دزی ئەیهاویتە ناو خەلا. سبەی ئەنۆڕن نەمایە. دوایە ئەیدۆزنەوە لە مەقامی مەعبوودی هاویشترایتە قەدەمخانە. ومع هذا باز (کما کان) تەقدیسی ئەکەن. ئیتر چارە؟ وهکذا عیبادەتی قەومێ لەمە، بۆ موتەشەییخان، عەینی گا و کەر پەرستییە. مەیلێکە تێیاندا پەیا بووە، ئەوی ئەو ناوەی لێ بێ لایان خوایە، (حاکم علی الله)یە.

١٢/٧

## مەلای ئیلاهی و مەلای تەبیعی!

ئێستا لای ئێمە ئاخیر مانگی زستانە وەقتی بەفر و بارانە. لە ئەمریکا ئاخیر مانگی هاوینە گۆنگەری سەبزە و میوەجاتە! تەفەککور و ئیعتبار کەن! ئەگەر کەمێ عیلمی هەیئەتیان زانیبا، تەذەکوریان ئەکرد!

سبحان الله گەلێ لە ئەهلی عیلمیش لا ئەدەن لە ڕێ، ئەحوالاتی ڕاهینە ئەکەنە ئەعمالی تەبیعەت، بێ حاجە بۆ صانیع و مودەببیر! موئمین و مەلای ڕاستی ئەوەیە هەم ئیلاهی هەم تەبیعی بێ! قەول بە تەبیعەت و مودەببیری تەبیعەت بکات! ئەوا دیارە مەعمەل ئیش ئەکا، ئەمما بێ مورەتتەب ئەبێ؟ حەقەقەن تەرەفەین تەعەددا ئەکەن! کەسێ خۆی لە عەقڵ نەکا، ئەثەری عیلمی زاهیرە، قابیلی ئینکار نییە! عیلمی تەبیعەت ئیستخدام ئەکات تەبیعەت *طوعا أو کرها* خزمەت ئەبینێ!

١٥/٧

## قووەتی ئایەتی قورئان لە تۆپی هاوەن بەقووەتترە!

حەققەن کوللی ئایەتێ بۆ هەدمی قەلعەی کوفر، لە دانەی تۆپی هاوەن بەقووەتترە. هەرچەند قووەتی تۆپ و تەیارەمان نەبوو، ئەمما قووەتی قورئان ئەڵئانیش خۆ موحافەزە ئەکا! ئینسانێ ئەوەی لە مەوقیعی خۆی ڕوو لە هەدەف ئیستیعمالی کا، ئەتوانێ بە قورئان لەگەڵ ئەنام جیهاد بکا!

١٥/٧

## ئاو ئەبێتە بەرد!

بڕۆ تەتەبوعی ئەحواڵی بیحار بکە، عەجایبی صونعی پەروەردگار ببینە! ئەسبابی مەلوحە و تفت و تاڵی ئاو مەعلومە، بە واسیتەی بەعزێ عەناصیر و مەوادی خاریجی ئەبێ! بەڵام پیانەتی ئاوی فوڕات و عذب، عیلم و قودرەتی خصوصی ئەوێ! چونکە ئەو عەناصیر و مەوادەش مەخلوقی خوایە، بۆ لەوێ ئەبێ؟ بۆ لێرە نابێ؟ میاهی مەعدەنی دەردەقولێ هەندێ عیونی کبریتن، هەندێ جبر/ قیرن، عەینی مائی کبریتی بەعزەکی گەرمن، بەعزەکی ساردن.

ئاوێ هەیە لەلای سابڵاغ، بابم چووبووە تەماشای. زاهیرەن ئاوێ سافە، نەختێ ئەڕوا ئەبێتە بەرد، بەردێ ڕوون وەك بلەور، ئەمما مائیل بە زەردییە. لە حەقیقەتدا ئەوە بەردە لە دەروونی ئەرز ئەبێ بە مایع لەگەڵ ئاو تێکەڵ ئەبێ. وەکی ئاو دێتەدەر جەریان ئەکا، کە سارد بۆوە تەجەممود ئەکا. حاصڵی عەجایباتی صونع لە ئاوی مەعدەنی و غەیرە مەعدەنی، (لایعد)ە! نە خۆیان نە ئیلاهیان ناشکوری نەبێ چی لێ نازانن!

١٦/٧

## ئینسان لەسەر حەیوان ئەکوژن!

تەصەوور کە، کەسێ زۆر عاقڵ و دانا بێ، ئەمما ئاگای لە قاعیدەی ئیلاهی بۆ خەلقی متطورات نەبێ خالی الذهن بێ، نەختێ لە ماددەیی مائی بەشەری نیشان دا، بڵێ: ئەمەیە ئەبێتە ئینسان، ئینسانێ وەکی توو هەزار سوێندی بۆ بخۆی بڕوا ناکا.

زەڕڕەیێ حەیەوی لەناو ئەو ئاوە، ئەچێتە مەوقیعێ (طورا بعد طور)ی بەسەرا دێ، ئەبێتە بەشەرێ، مودریکی خێر و شەڕ، ساحێبی عەقڵ و سەمع و بەصەر، ئەبێ بە موختەریعێ بە ڕادیۆ نوتقێ تەها حوسێن لە میصر ئەباتە لەندەن. وە یا لە لەندەن ئەیهێنێتە کۆیە. بارێ ئەی کەرپەرستینە، مادام غەیری خوا ئەپەرستن، بۆ ئەو ئەعازیمە عەباقیرە

نەوابیغانە ناپەرستن؟ باریٚ هیچ نەبیٚ بەو ئینسانانە، فەخر لەسەر کەر و گا و سەگ بکەین، ڕۆنتکین و کەهرەبایان بۆ کەشف کردینە، لە سایەی وان، دەروونی ئینسانی (أبینیه)ی ڕەش و تاڵ بۆمان بویتە ڕۆژ! بۆ وا (خضع الرقاب)، (نواقص الابصار) لەبەر دەستی ئەو حەیواناتە، هەیاکلی ئەو حەیواناتە، ڕائەوەستن؟! هەی هەر دوو چاوتان کۆر بیٚ، نمەك بە حەڕامینە، ئینسان لەسەر حەیوانیٚ هکذایی ئەکوژن.

١٦/٧

## ئەریٚ ڕاستە مەلایان قسوورەکیان هەیە لە عیلمی ئیقتیصاد نازانن؟!

ڕۆژیٚ لە خدمەت والی موصڵ سلێمان نظیف بەگ ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ، گفت و شنەومان بوو. بیلموناسەبە فەرمووی: مەلایان قسوورەکیان هەیە لە عیلمی ئیقتیصاد نازانن.

منیش تەبەسسومم کرد.

فەرمووی: بۆ؟

وتم: ئەووەلەن ئێستا مەلایان چاویان لە دەستی ئێوەیە، ناشکوری نەبیٚ، دەستی ئێوەش سفرە، مەلایان ئیقتیصاد لەچی بکەن؟

ثانیەن: ئەوی ئاگای لە قورئان بیٚ، عیلمی ئیقتیصاد ئەزانی.

وتی: قورئان و ئیقتیصاد!؟

وتم: بەڵیٚ! ئەو ئایەتەم بۆ خوێندەوە (وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا)، وە بە تورکی ئیزاحم بۆ کرد.

فەرمووی: عەجایب ئێمە وامان نەزانیبوو! وە فەرمووی: قورئان مولاحەزەی (أمم القاعدتين)ی کردیە، قاعیدەی ئیستحصال، (قاعیدەی ئیستهلاك، قاعیدەی ئیستهلاك ئەهەممە، ئەوەی زیکر کردیە.

واقیعەن وەکی ئەفەرمووی: قورئان تەماشای ئیستیحصال ناکا، چونکی هەر خەریکە شتیٚ پەیا کا، داعی هەیە، داعی تەبیعی موغنی یە لە داعی شەرعی، ئەمما مەیل بۆ ئیسراف و تەقتیر ئەڕوا، ئەوەش خراپە. قورئان

تەصریحی پێ ئەکا، حەتتا علی الاکثر بۆ سەفاهەت بیلا حیساب صەرف ئەکەن، بۆ خێری بەراستی خێر بێ، بەخیلن. بۆ خێری موزەخرەفیش خێران.

شەوێ لە ئەعزەمیە نووستم، مەلا نوعمان و حاجی ئەحمەد ئەلئەعزەمی وە شێخ نوری مودیری کولیە زۆر لوتفیان نواند. سبەینەش خەریکی ئەسبابی فطور بوون. لەو وەقتە نازانم لەبەر چی قامووسیان هینا لە ماددەی (قتر)ە، تەماشایان کرد، ئەیانخوێندەوە.

عەرزی مەلا نوعمانیم کرد: مەولانا ئێوە، ئەوەی مایەی جەود و کەرەم و فەزڵ بوو بەجێتان هێنا، بۆ تەماشای ماددەی (قتر)ە ئەکەن؟

فەرمووی: مەقسەدمانە عەرزی جەنابت بکەین، کە بەخیلی نەفەرمووی، ئەمڕۆش لە خدمەتدا بین.

وتم: استغفر الله مەمنونم، بە خدمەت ئێوە موشەڕەف بم، ئەمما ئەوشەو ئەڕۆمەوە، بەعزێ ئیش هەیە، ئەبێ دروست کرێ.

هەزار ڕەحمەتی لێ بی، ضیاعی گەورە بوو بۆ ئیسلام. تا ئەبەد تەئەسسوفی نوعمان و سەیید ڕەشیدم لە دڵ دەرناچێ. مع الاسف بێ جێ و بێ جێنشین ڕۆیشتن. (انا لله).

٢٢/٧

## بە وەسوەسەی بێ ناموسان خۆتان لە شەڕەف و لە دین مەکەن!

عباد الرحمن بەو تیرازی کە خوا دایناوە، کێ حەق وایە بکوژێ، بۆ سیاسەت و ئیستیقامەی ئوموری خۆیان کەس ناکوژن چ جایە، بە بەهانەیە، وڵاتێ کۆرکەنەوە، بە گوناهو بێ گوناه پیر و جوان، ژن و منداڵ بۆمبەردومان بکەن؟ وا دەرئەکەوێ زومرەی سیاسییون ئەمڕۆ عباد الرحمن یان تیا نییە...

ئەبێ ئەوانیش لە حەقیقەتدا ئەمین بن، بە سەداقەت و خیللەتی ئەورووپیی هەڵنەخەڵەتێن. فەتاتێ لە باوەش ئەکا، بە سینگی خۆیەوە

ئەنووسێنی، گۆیا ئەمە مەحەبیەت و عەتف و حەنانە. وە چەند ماچی باوکانە لە لێو و کولمی هەڵ ئەگرێ، خوا ئەزانێ درۆیە! زۆر ناچێ فەتاتی قوڕبەسەر زگی پڕ ئەبێ، ئەو باوکە ڕەفیقە ئەو موحیببە صادیقە تەرکی ئەکا. ئەوجا ئەوی بەسەری دێ، دێ! دەخیلەکەم (ایها المؤمنون) ئاگاتان لە شەڕەف و نامووس بێ، بە وەسوەسەی بێ نامووسان خۆتان لە شەڕەف و لە دین مەکەن!

٢٤/٧

## مەلا لە کولبەی ئەحزان!

ئەمڕۆ عوشرەت زۆر بووە، خاصەتەن لە بەینی ڕیجالی ئەعازیمی دەوڵەت. زۆر کەس لە ئەهلی عەمامە بوونە یاری مێزیان، نائیلی مەناسیبی گەورە بوون.

ئەوەی بە مەلایەتی ماوە، خەریکی تەدریس و ئیرشاد و وەعز و تەفسیر بوو، ماوە لە کولبەی ئەحزان، بێ یار و یاوەر و دۆست و بێ حورمەت و معاش. (إنا لله). ٢٥/٧

## قوڕەتولعەین!

قوڕەتولعەینێ وەك ئایەتی (وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا) ، نادیرە بیێتە إمام الاتقیاء. پێرار لە شەخسەکی سابڵاغی ئەحواڵی ئەولادی میرزا فەتاحم پرسی.

وتی: ئەولادی هەیە، بە ئەولاد حسێب نین. ئەمما لە وجاغ کۆری چاترە.

خوایە قوڕەتولعەینی بەندە بکەیە إمام الائمة، هەردووکیان لە نەوابغی عەبقەریان حیساب کرێن، بە عومری درێژ و ئیقبال و عافیەت زۆر بژیەن.

ئاخر ڕۆژی مانگی قوربان، ١٣٥٧، ٧ی شوباتی ڕۆمی.

٢٦/٧

## حەزەر لە موستەقبەل!

حەزەر لە موستەقبەل لەگەڵ تەدارەك و خۆ حازرکردن زۆرباشە. یەکێکە لە مەزایای دەوڵەتی بەریتانیا و سائیری دوەلیش. تەماشای ئەکەن ئەمڕۆ غەمی هەزار ساڵ دوایی ئەخۆن، اخضاراتی بۆ ئەکەن، ئیشیان لا بە ئەهەممیەتە، بۆ دەرکردنی ئۆزدەمیر[1] لە ڕواندز- با وجودی شەززیمەیە بێ ئەسبابی لەگەڵ بووە- بە لەشکری موتەجاوز لە چوار هەزار نەفەر (مع معدات)ی حەربی، تیرازی جەدید، قائیدی ناردنە سەر دەریکردن.

۳۷/۷

## خۆیان لە عیلمی ئیبن تەیمییە مەحروم کرد!

گەلێ زاتی زۆر گەورە، زۆر باش هەن، ناویان بە خراپە ئەبەن. ئینسانیش ئاگای لە ئەصڵی عەداوەتیان نییە، دوایان ئەکەوێ. مەلایانی ئەتباعی سبکی و عوببادی خۆیان لە عیلمی ئیبن و تەیمییە مەحرووم کرد. دەخیلەکەم بە قسەی مەلایان ڕقتان لە مەلایان نەبێتەوە. ئیستیفادەیان

---

(١) ئۆزدەمیر: مەبەستی ئۆزدەمیر پاشای فەرماندەی سوپای تورکە، کە ئەفسەرێکی تورك بوو لە ساڵی ١٩٢٠ لەگەڵ ٤٠٠ سەرباز و ٨ تۆپ هاتە رواندز، نزیکەی سێ ساڵ لە ڕواندز حوکمی گێڕا. لەو سەردەمەدا ئینگلیز زۆر هەوڵی دا ڕواندز لە ئۆزدەمیر بستێنێتەوە بەڵام بۆی نەچووە سەر. خەڵکی ڕواندز زۆر بە چاکە باسی ئۆزدەمیر پاشای ئەکەن و زۆر لێی رازی بوون. ئەڵێن: ئۆزدەمیر مرۆڤێکی باش و لێهاتوو بوو وە مسوڵمانێکی باشیش بوو. دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٢٣ ئینگلیز هێرشی هێنا، ئۆزدەمیر کە زانی شەڕ بێ سوودە و ئومێدیشی نەبوو لە ئەنادۆڵ هاواری بۆ بێ، بۆیە فەرمانیدا بە سوپای خۆی ڕواندز چۆل بکەن و بەجێی بێڵن. پاشان ئۆزدەمیر بە ڕێگای دۆڵێ ڕوست ئاوای شاری شنۆ بوو لە ئێران و لەوێشەوە بە مەرگەوەڕدا ئاوابوو بۆ شەمدینان، پاشان بۆ وان و دواتر گەیشتەوە سوپای کەمال پاشا لە ئەنادۆڵ. بڕوانە:(مێژووی رواندز، مەمدوح مزوری، هەولێر،٢٠٠٦ز، لا ٣١٠-٣١٤)

لێ بکەن، ئەگەر قسەی خراپیان بوو، ڕەددی کەن، ئی باش قبوڵ بکەن، فەرقی مەلا و مەلا مەکەن.

٤١/٧

## بەهەشت فرۆشی دونیاکڕ!

موتەشەییخەکان بە تەسویە ڕازی نین، بەوەندە عیبادەتی خوا لەسەری دانایین قایل نین. ئەبێ ئەوان بە گەلێ زیاتر بپەرسترێن، ئەبێ وا حسابم کەی خوا ئەمر بەری وانە. ئێمە چاکیان تێئەگەیشتین، *اولیاءالله، احباء الله، ابناء الله، وسطاء الله، امام الله*، ئەوی بیانەوێ، خواش ئەیەوێ. ئەوێ گوناهکارێ ئیبلیسی پڕ تلبیس لەمیان گۆڕی.

بەڵێ زۆر دۆستی بە ڕەحمی دڵ گەرم، زگی بە ئینسان بسووتێ، وەکی موبەشیرانی قادیانییان، بەهائییان، ڕوئەسای طەرائیقان، گەلێ موتەئەسیر ئەبن بۆ بەشەر، ڕۆژی قیامەت موعەززەبە. بێ دین، ئەگرین، ئیعتیقادت ئەخەنە سەر ئوموری مایەی نەجات، جا ئەبێ خوای بخەیە ناو زگی کچە جوێ، بێ بە منداڵ و بێتە دەر، وەکی فەرخەی حەیوانات، گەورە بێ، خۆی بکا بە فیدیە، گۆیا ئەویش بەزەیی بە بەشەردا هاتووە. موعەزەب بووین، بووە فیدیە نەجاتیان بووە. ئەگەر عەقیدەت وا بێ قورتار ئەبێ، وە ئیللا ئەکەویە ژێر دەستی شەیتان، عەزابت ئەدا، عەقیدەت وابێ ئەمە مەسیحێ تازەیە، موجەددیدە نیهایەت بێ ئەدەبی نەبێ ڕەسوولە. خوا ڕەحمی بە عالەم کردیە، ڕەسوولی سەلامی ناردیە، دەك ئەو ڕەسوولی سەلامە بە خێر و سەلامەت نەیە. لەوەتی ئەو هاتووە بە ملیۆن شڕووڕ و فەساد زیادی کردیە!

ئەمە وەکیلێ قوتبە، یاخود خۆیەتی، ئیدارەی زەمین و زەمان بە دەستیەتی، زەڕاتی کائینات، بێ ئەمرو ئیدارەی وی حەڕەکە ناکا، جا بەو تەسویلاتی، سەلبی عەقل و مال- نعوذ بالله- ناموس ئەکەن. ئەگەر فەقیر بوو یا وەکی کەر ئیستیخدامی ئەکەن، یا شەقێکی تێهەڵئەدەن، وەکی سەگی گڕوو، ئاوارەیی دونیا ئەبێ. ئەمە هەموو لە ڕووی مەحەبەت و سەداقەت و دۆستی بەشەری.

ئیمـانم هەیە بەو نەوعەی جەنـابی حەق تەصـویری فەرمـووە، وایە، ئیمان و عەمەلی صالح، باقی فەنن و فێڵە، دۆستی چی و شـەفیعی چـی؟ بەهەشـت فـرۆش دونیـا کـڕ، دوشـمنی ئیمـانی حەقیقـی و بەشـەرییەت، دۆستی میولی فاسیدە و حوببی ئیستیلا و ڕیئاسەت، ئیسـتیخدامی ئینسـان وەکی حەیوان.

٤٣/٧

## شێخ قوتبی ئاشە، بە ئاو و نیعمەتی خەڵك دەگەڕێ!

ئامان خۆتان لە ساحێبی دەعوەتان، کەززاب و ئیبلیس بپارێزن، وەکی ئاش بۆ دانە، بە ئاوی نیعمەتی خەلقی ئەگەڕێن. وەك حاجی ئەڵێ:

**کە وای گوت شێخی من دەستەگیرم**
**لەلام وابوو لەبەر جەهل و جەوانـی**
**کە پیربووم تێگەیشتم دەستی گـرتم**
**لەکار و کەسب و تەحصیلی مەعـانی**
**بەڵێ شێخ قوتبە، ئەممـا قـوتبی ئاشـە**
**بە ئـاو و نیعمەتـی خەڵقـی گەڕانـی**

٤٦/٧

## ئاسیا و سەروەتی تەبیعی!

ئاسیای ئێمە سەروەتی تەبیعی هەیە، عیلم و صەناعەتی نییە، ئەورووپا بیلعەکسە. مەگەر (بعد الانتهاء) بگۆڕێ، دەنا هەر وڵاتێ سەروەتی تەبیعی بووبێ، سەروەتی صناعی نەبووە. قەومەکەی ئیحتیاجییان حـس نەکـردیە، اضطرار و محیوری یان نەدیتیە، ئەمما وڵاتی (من حیث الطبیعة) فەقیر بن مەحیورەن سەعیان کردیە، بە جیدد و جوهد و کۆشش و لوقمە نانێکیان دەست خۆ خستییە. عاقیبەت بەسەر تەبیعەت غالب بوون.

٤٧/٧

## لەبارەی قیرائاتی قورئانەوە

ئەوەی ظـــایێ لە (ت)یێ دەغـــم ئەکـــا[1]لام موحتـــاجی وەعـــز و نەسیحەتە، بێ لەتافەتە، دوورە لە زەوق و لە قاعیدە، لازم نییە ئەوەی لە (موثوق بە) نەقلکرا، قبوڵ بکرێ. وە ئیللا صەحابان قیرائەتی میسلی ئیبن مەسعوودیان فـڕێ نەدەدا. (ڕیزوانـی خوایـان لـێ بـی)، ئەوان قورئـانی مونەقیحیان بۆ تەحریر کردین، لاکین عوششاقی نەقل ڕپیان کـردەوە لە دەغیلە.

٤٧/٧

## های کەرە های!

کەسێ لە تەڕەف خوا بناردرێ، ئەبێ عەلامەتەکی عەزیمی هەبێ، لە دەعوای بوەشێتەوە. حەقیقەتەن تەڵەبی ئایەت شتێ باشـە، لازمە، وە ئـیللا ڕیسالەت ئەبێتە مەلعەبە وەکی ئێستا، ئۆینبـازی و تـابیعی هەوا. مەسـەلەن: قادیانی ئەوا ئیددیعای کرد، ئایەتی چ بوو؟

هـیچ. بەعـزە قسـەی پڕوپـووچی پیرێژنـانە! موقـابیلی ئەو حوکەمـای تەبیعەت و کیمیا و هەندەسە و هەیئەت، ئەو دوهاتە موختەریعـانە، ئەبـێ ئـایەتی ڕەسـوول چ بـێ؟ لە فەوقـی تەیـارە و غەواصـە و ئەلەکتریـك و تەلفەز، تەلەفۆن و ڕادیۆ بێ. بەڵێ ئایەتی ڕوسولی ئێسـتا، بـێ شـەرمی و بێ حەیاییە! لەسەر جەهل و ناتەواتی خۆیان، موقابیلی ئەو هەموو عولەما و حوکەما و عوزەما و نەوابیغ و عەبقەرییانە، کە بە تۆزی پێیـان نـاگەن، دەعوای ڕیسالەت ئەکەن! ئەوانەن کورد پێیان دەڵێن: های کەرە، های!

قادیانی و بەهائی ئەبـا ئایەتیـان حمـار اللـە بـا. بەڵـێ خۆیـان ئـایەتن،

(١)مەبەستی ئایەتی (أوعظت ام لم تكن من الواعظين)ە،

گەرچی قسەی بێ ئەدەبی لە من ناوەشێتەوە، ئەمما بێ حەیایی وان، مع الاسف کەمێ بێ ئەدەبی کردم.

٤٩/٧

## تەرجەمەی قورئان بۆ کوردی!

من بۆ تێگەیشتنی ئەجانیب، تەرجەمەی قورئان ئینکار ناکەم، بەڵکو زۆر بە فائیدەیە، لاکین نەڵێن ئەمە قورئانە! وەکی تەورات و ئینجیل بە هەر لۆغەتێ بێ کیتابی موقەدەسە، تەوراتە ئینجیلە.

ئارەزووم ئەکرد جەمعێ لە عولەمای عەرەبی و زوبانزان و کاتیب وموحەریرێ غایەت بە قووەت بە جەزالەتی عیبارەتی وەکی جەلال نووری و تەها حوسێن، فیکری ئیباضە قورئانیان بە عیبارەتی جوان، خۆش ئەدا، سهل الفهم، تەرجەمەیان کردبا، زۆر بە فائیدە ئەبوو. ئێستا بڵێین: دروستە، دروست نییە! تەرجەمە کرا بە لیسانی موختەلیفە. ئەوانی تەرجەمەیان کردیە وا دەرئەکەوێ زۆر لە ئەربابی قەلەم نەبوون. مەعلووم ئەجانیب تەدەخولاتی تیا ئەکەن، ڕوحیان ئەمین نییە، تەرجەمەی بە تورکی کراوە، زۆر بێ تامە، لام خیانەتێکی تیایە ئەگەرچی وا ئەنوێنن بۆ ئاسانی تێگەیشتنی عەوام وامان تەرجەمە کردیە. قورئان تەرجەمە بکرێ، لەگەڵ موحافەزەی ئەصلی وەکی ئینگلیز کردویانە، صەفحەیە قورئانە، صەفحەیە تەرجەمەیە، جوانە.

٥٤/٧

## درۆ نەکەی قسە زۆر بێ تام ئەبێ!

حەققەن ئینسان ئەمڕۆ تەماشای سەییئاتی بەشەر ئەکا، ئەوەندە پیس و نەدوو دونە، شەیتان لێی بەرییە، ئەوەندە لەئیم و بێ ناموس نییە. گەلێ جار ئەڵێم : ئێوە تەماشای ویجدانی خۆتان کەن، وەقتێ حیکایەتێ ئەگێڕییەوە، لەمەیانە، درۆیە دێ، تەجەسسوم ئەکا، ئەگەر درۆیەکە نەکەی، قسەکە زۆر بەتام نابێ، ئەگەر ئەو پینەیەی لێ دەی، غایەت

جوان دێ، ڕەونەقی ئەداتێ. ئەگەر خۆت گرت، درۆیەکەت نەکرد، جارێ دوو جار، ئەوسا لەسەر درۆ غەلەبەی ئەکەی، نایکەی.

وا ئەبێ ئەو تەجەسسومە زائیل ئەبێ، وە ئیللا بە دوای درۆیان ئەکەوێ، بەتام، بێ تام، ئەوی بێتە سەر زارت نایگێڕییەوە، ئەوجا ئینسان ئەبێتە ئەففاك و کەززاب! ٥٨/٧

## مەدحی ملوکان!

تەحەوولاتی بەشەری عەجایبە، سابیقەن مەدحی ملوکان، بە شەجاعەت و فروسییەت و مەیدانداری و قووەتی بازوو ئەکرا، ئێستا بە عینوانی فنونی جەمیلە ڕەقس و سەما وا زینەت دراوە، مەدحی ملوکان، ئیمپراتۆران بە دانس ئەکرێ.

٦٥/٧

## عومەر و عەرەب!

عەرەب پیاوی بەلیغ و ئازا و شاعیریان زۆر بووە، ئەمما مودەبیریان کەم بووە. عومەر مودەبیر بووە، سیاسی، ئیداری، زاتێ قەدیر، قەوی، بە هەیبەت و صەلابەت بووە. عومەر وەکی مەلیك فەیسەڵ لە حەققی ئەفەرموو: موبدیع بووە.

ئەوروپایی لە زومرەی ملوکەکانی نابیغی و عەبقەری خۆیانی عەد ئەکەن، موسا سەلامە[1]ی قیبتی ئیعتیراف بە نبوغی عومەر ئەکا، ئەڵێ:

قەومێ نابیغی وەکی عومەر پێ بگەیەنێ، دوور نییە لە زەمانی کەم ئیستیلای جیهان بکەن.

ئەمما فەزیلەتی ئەئیممە و ئەولیایانی ئەوان، لە وادییەکی ترە،

---

(١) مەبەست سەلامە مووسا (١٨٨٧-١٩٥٨ز) رابەری سۆسیالیزمی میصرییە و لە بەهنەبای میصر لە دایك و باوکێکی قیبتی لەدایك بووە. یەکێك لەوانە بوو کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد بە زمانی عەرەبی عام بنووسرێ. نەجیب مەحفووز قوتابی ئەو بووە.زیاتر لە چل بەرهەمی لەپاش بەجێماوە.

حەقیقەتەن لە حیکایەتی غەریبە چ ئەسەرێ تریان نییە، گەرچی لە زومرەی ئیلاهـ عەد کراون. (انا لله).

٦٨/٧

## وای کوو تێك چوو!

بڕوا مەکە حەزرەتی داود چی بەجێهێشتبێ بۆ ئەولادی، تا سولەیمان بە میرات وەریگرتبێ. خۆزی ڕەسوولی ئێمەش وەلەدی وەك سولەیمانی هەبا، ئیرسی لێ گرتبا، ئوممەت وا تەفرەقەیان نەکردبا، ئەوان ڕۆیشتن، ئوممەت تا ئەبەد لەسەر میراتیان شەڕ ئەکەن. با ئەمڕۆ عولەمای شیعە وەرەسە و ظەهیری ئالی بەیت، دەعوای میرات لە مەلیکی حیجاز ئیبن سعوود بکەن، ناشکوری نەبێ ئی خۆیان لە دەست چوو. ئەو هەموو مولکەی ئیسلامەتی ڕۆیی، شیعە لە کافرانی تەڵەب ناکەن، بە هەموو دەمێ، خەریکی فەدەك و مەدەکن، وای کوو تێك چوو! ئایا ئەبێ بۆمان ڕێك کەوێتەوە؟ باوەڕ مەکە تا مەلا وا بن، نابێ.

٦٩/٧

## تەیر چۆن قسان ئەکا؟

طیور و حەیوانات و ماشیە لە بەینی خۆیان، گفتوگۆیەکیان هەیە، تێك ئەگەن، مومکینە بۆ ئینسان کەشف ببێ. زاتەن غەربی خەریکن بەعزە حروفی هیجایان دۆزیتەوە، کە مەیموون و کەلب قسەی پێ ئەکەن. موراد ئەوە نییە، تەیرێ یا نەوعێ یەك جوملە ئەڵێ، بڕوا ئەکەی دەڕڕاج بڵێ : (الرحمن علی العرش استوی)؟

خوا ئەیزانێ ئەو عیبارەتە تا بۆ موحەممەدی خاتم الرسل نەهاتیە، کەس بەسەر زوبانیا نەهاتیە. موراد لە قسەیان ئەوەی عائید بۆ مەصالیح و تێك گەیشتنە.

ئەو تەیرانەی بە جەماعەت ئەژین، ئیحتیاجیان بە تەفاهوم زۆرە،

ئەوانەی بە مونفەریـدی ئەژیـن، لەسـەر زگ ئەخشـن، بـێ دەنگـن، هۆشەکیان لێوە دێ، ئەویش بۆ تەخویفە. هەتـا سـەربەرزتر بـن، لە قسـە نێزیکترن.

زوبان زانین زۆر خۆشە، بۆ مەلایان لازمە، ئێمە ئەگەرچی زمانی تەیر نازانین، لۆمەمان ناکرێ، ئەمما ئەبا زوبانی یەکدی بزانین، ناشکوری نەبێ لەو نیعمەتە مەحروومین ئەویش سەبەبی مەعلوومە. لە عولەمای دینەوەیە. حەتتا پێیان ئەگوتین: تورکی زوبانی جەهەننەمیانە.

٦٩/٧

## مولکی سولەیمان ئەوەندەی مولکی عوسمانی نەبووە!

مولکی سولەیمان ئەوەندەی مولکی عوسمانی بەڵکو ئێرانی وە گەلـێ حکوماتی دی نەبووە. ئیستیلای جیهان بۆ کەس نەبووە، وە نـابێ. حەتتـا لە زەمانی سولەیمان تەفرەقەیان کەوتە بەین، دواییە پارچە پـارچە بـوون. ئەساسی لە مەڕ تـاڵووتی، وە سـیعەتی لەبەر داودی، حیشـمەت و دارا و کەوکەبە و دەبدەبە لە زەمانی سولەیمان، بەعـدەهو تەفـرەقە و ئینحیتـات الی الانقراض.

ئەمڕۆ دەوڵەتێ وەکی بریتانیا بە سیعەتی مولك و موستـەعمەرە نیـیە، وە نەبووە. مع أنە نەزەر بە ئەرزی وە جەمیعی ئومەم پارچەیە گچـکەیە، وە بە هەموو عەسکەر و تۆپ و ڕەشاش و ئوستوڵ و تەیارە و غەوواصە و سەییارە و دەبابە، لە ئیدارەی مولکی عاجزە، دائـیمەن شـەڕ و شـۆڕ و ثەورەیە، هەموو ئەرز بە حکومەتێ کوو ئیدارە ئەکرێ؟

٧٠/٧

## ئینسان پیر ئەبێ، تەبیعەتی منداڵی دانانێ!

من تەعەجوب ئەکەم لە حاڵی ئەهلی عیلم، ئینسان پیر ئەبێ، تەبیعەتی منـداڵی دانـانێ، زۆر کەیفـی بە قسـەی بـێ مانـا دێ. علـی الاکثـر بـێ موحاکەمە قبوڵی ئەکەن! مولاحەزە بکە: مەسئەلەی نێر و مێـی نەمـلە، چ حەڕبەکی تەشکیل کرد؟ مەنشەئی لە کوفە چووە میصر، تەمەووجـی دا،

بۆ ماورائولنەهر، هاتەوە بەغدا. سەییدی ئالووسی ڕەحمەتی لێ بێ، عەجایب بە سەریا ئەڕوا، مودافەعەی لەسەر ئیمامی نەوەوی ئەکا، لاکین بۆ قبوڵ نەکردنی حیکایەتی قوصاصان، زۆری مەمنون ئەبم.

وە گەلێ قیرائاتی غەیرە موتەواتیرە نەقل ئەکا، ئەغلەبی ئیحتیاجی بە تەکەللوفات هەیە، من کەیفم پێیان نایە، خۆزی ئەکەم بزربووبان. ... بەعزە قوصاصی بێ شەڕەف و نامووس قسەی وایان کردیە، لەو مەیانە تەعەروز بۆ حورمەت و مەکانەتی والیدی موحتەرەمی سولەیمان بکرێ.

٧٢/٧

## پەپوو سولەیمانکە!

لە بارەی پەپوسولەیمانکە سەیید ئەفەرموێ: تەیرێ مەعرووفە، مونتینە، یەعنی بۆگەنی خوێن ئەخوا. ئەمما ئەڵێ: (*علی ما قیل*) ئەوەی ئێمە پێی ئەڵێن پەپووسولەیمانکە، تەیرێ زۆر جوانە، لە شیددەتی بەهار دەرئەکەوێ، دەندووکی تیژە، کرم و مێروو ئەشباهی دەردەخا ئەیخوا. کەس دەخلی ناکا، مع هذا کەم نەسلن.

٧٣/٧

## مەلیکە!

ئەلئانیش ژن لە ئەوروپا حەقی مەلیکی هەیە. ئەمڕۆ وەلی عەهدی بەریتانیا کچە، تا حاڵ مەلیکە بۆ ژنی ملوکی ئیسلام نەدەگوترا، لاکین بێ قەرار و قانوون کوتتابی میصر بە زۆری، ئی عێراق کەم کەمە، بە ژنی مەلیك ئەڵێن: مەلیکە. نازلی خانم[1] داکی مەلیك فاروقی، فەریدە خاتوون[2]ی حەرەمی لە صەحائیفی میصریە ناویان بە مەلیکە ئێنان. ئەمما

---

(١) مەلیکە نازلی (١٨٩٤-١٩٧٨ز) کچی عەبدولرەحمان پاشای صەبرییە و بووە ژنی مەلیك فوئادی یەکەم، دوای ئەوەی تەڵاقی وەرگرت لە مێردی یەکەمی.

(٢) لە بنەڕەتدا ناوی صافیناز ذوالفقار (١٩٢١-١٩٨٨ز)ە، ژنی مەلیك فاروقی یەکەمە. لە قاهیرە لەدایك بووە و لە ئەسکەندەرییە مردووە.

عائیلەی سعوودی و ئیمام یەحی هیچ ناویان نیە. فەزڵ لە صوورەتیان، ئی عێراقیش بۆ صوورەت باشە، فتۆغرافیان نیە. ئەمما عایلەی میصری وەختە لە ئەوروپای نێزیك بن. واقیعەن ئەوەی کترینی ڕووسی [1] و وە فکتۆریای ئینگلیز [2] کردیان، کەم ملوکی ڕیجال وایان پێ کرایە.

بە کوردی دەڵێ شێر لە بێشەی بێتە دەر چ نێر، چ مێ. نازانم شیعە چ مەراقیانە؟ بۆ ئیمام ئەڵێن: ئەبێ هەموو شت بزانێ، چی لێ بزر نەبێ؟ وەکی حوکەمایەکان ئەڵێن: ساحێبی نەفسی قودسی کە لە ئەکداری بەدەن پاك بوو، تەجەڕودی کرد، هەموو شت ئەزانێ. یا وەك سۆفییەکانی مە، قوتب عیلمی وەك خوایە. ئەمانە هەذەیانن، ناشکوری نەبێ، چییان زانیە؟ نەزەر بە عیلمی حوکەمای تەبیعی! ئەمڕۆ چیان زانییە کەڵکی ئوممەت بگرێ؟ کەڕامات و ئوعجوبە وەرای سەماوات وتحت الارضین وە جەبەلی قاف، شاری جابولقا و جابورسا، تورەهات و پڕوپوچ و خەیاڵاتی بێ هوودەن نە بۆ دین نە بۆ دونیا فائیدەی نەدا.

ڕەجا ئەکەم گوێ مەدەنە شتێ بێ فائیدە، ئیهتیدا بە قورئان، ئیقتیدا بە ڕوسولی کیرام کەن.

٧٥/٧

---

(١) کاترینی دووەم (١٧٢٩-١٧٩٦ز) ناوی ئەلکسیڤنا کچی کریستیانە، یەکەم لە فەرمانڕەوا و دەستەڵاتدارە گەورەکانی ڕووس بووە، ٣٤ ساڵ حوکمی وڵاتی گرتووە. ژنی ئیمپراتۆر پەترۆسی سێیەم بووە.

(٢) فیکتۆریای ئینگلیزی (١٨١٩-١٩٠١ز) لە ساڵی ١٨٣٧ەوە بۆتە مەلیکە تا ڕۆژی مردنی. ئەو کچی ئەمیر ئەلبێرت بووە کە کوڕی چوارەمی مەلیك جۆرجی سێیەم بووە. ناوبراو ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی سیاسی بەریتانیا بینیوە.

## عەرش!

قیمەتی عەرش بە پانی و بڵندی و درێژی نییە، نازانم خانی لەسەر سەریری حوکمداری کوو دروست ئەکرێ؟! ئەریکەیە تووڵی ٨٠ زیراع، بە ٨٠ زیراع بڵندی، ٨٠ زیراع ئەمە کوو ئاوڕەنگی پادشاهی هەیە؟ ئەمە ئاوڕەنگی پادشاهی نییە. مع أنە عەزەمەتی ملوك بە عەزەمەتی عەرش لە نەزەر عەوامە. لە حەققەتدا عەزەمەتی عەرش بە عەزەمەتی زیلعەرشە، مەنۆڕە زەخاریفی تەختیان، گوێ مەدەرە بەدی قیرائەتیان وەقفە لەسەر عەرش ئەکەن، عەزیم ئەهاوێنە سەر. ٧٦/٧

سوڵتان موحەممەدی فاتیح و سولەیمانی قانوونی و سەلیمی ئەووەل لەسەر ئاورەنگی عوسمانی بوون، وکەذا ئیبراهیم و موستەفا لە دەوری ئاوانی سابیقی عوسمانی چ جەلالەکی هەبوو! لە دەوری ئەوانی تریش بە غەیری قیمەتی صونع و موجەوهەرات چ قیمەتی تری نەبوو.

٧٨/٧

## نحن یان أنا؟

ئەووەلی تەشکیلی حکومەتی عێراق بوو، مەلیك فەیسەڵ بە (نحن ملك العراق) ئیمزای دادەنا. یەکێ لە ئینگلیزان گوتی: هێشتا مەلیکی بەریتانیا ناڵێ (نحن). دەڵێ: أنا.

٧٩/٧

## کێن هەرچی و پەرچییان گەورە ئەکەن؟

سبحان الله ئێستاش وایە، ئەنصاری حکومەت، عوزەمای سابیق زەلیل ئەکەن، هەرچی و پەرچییان گەورە ئەکەن، ئیدارەیان ئەهاوێنە بەردەست، هەتا دەرحەق بە قەومی خۆی بە لەئامەت تر بێ، لای وان بە کەرامەترە! تا میعادێ ئەگەر بۆیان بچێتە سەر، نە ئەو دێڵن، نە ئەم. هەمووی ئەکەنە ڕەعایا و موستەخدەم. ئەمە بە دیقەت تەماشاکەن،

قـەولێ قیمەتـداره، له دەسیسـەیی سیاسـیان به حەزەر بـن، به وەعـدەیان هەڵمەخەڵەتـێن یەك دوو ڕۆژان بـۆ نـاوداران به قەشـمەری حـورمەت ئەنوێنن، بۆ ئیحترامیـان تـۆ پـێش ئەهـاوێن. ئەممـا زۆر نـاچێ، ئەیـانکەنه ئەسیر، وەکی دز و ڕێگران حەپسیان ئەکەن، ڕەزیل و بـێ حـورمەت و مـاڵوێران! بـرام تەئەممـول که له قورئـان، ئیهتیـدای پـێ بـکه، گـوێ له حیکمەتی ڕاگره، موبالەغاتی بێ فائیدەی مەبیه. خوداوەندێ عالەم قسەی مێرووێ، ژنێ، بۆ خاتم الرسل نەقل ئەکا، بۆ ئیستیفادەی ئوممەت، ئەمما بەحس له مەلائیکەتی به قەدەر عالەم زەلام و گەوره چەند هەزار سەری هەیه، هەر سەره چەند هەزار ڕووی هەیه، هەر ڕووه چەنـد هەزار زاری هەیه، هەر زاره چەنـد هەزار زوبـانی هەیه، به هەر زوبـانی چەنـد هەزار لۆغەت ئەڵێ: نازانم چ دەڵێ؟! ناکا. بۆ؟ (لا یخلو) یان وا نییه، یـان بـێ فائیدەیه.

ئەوی ئەیفەرمووی ڕووحی هیدایەتت، مەدارێ حەیاتێ به عیـززەتە، لاکین مع الاسـف کەیفـی منـداڵی هەر لەگەڵ ئوعجوبەی بـێ کەڵـکە، خسوس ئەگەر له ئەولیایان نەقل کرێ.

٨٠/٧

## ئەو مەلیکانەی وەك کۆسەبەبە خۆیان ئارایش ئەکەن!

سبحان الله له عەزەمەتی سـولەیمان، له ئیمـانی سـولەیمان، نه مەیلـی کرده هەندێ که مەلیکه، نه بەو خاریقه عەزیمه گۆڕا! ئەشـهەد و بـیللا ئەو زاتانه شایانن، ئینسان ئیتباعیان بکا، به کەمالی عبودییەت و ئیخلاص دوایان کەوێ. چەند هەزار پیاوی لا خۆ گەوره به مسته ئـاوێ کەوتیـنه مەله. چەنـد مەلیکـی گەوره گەوره، ئەبینـی وەك کۆسـه بەبەی مـت و مـۆری به خـۆوه ئەکـا به ئەڵمـاس و مـرواری خـۆی ئـارایش ئەدا، ئیفتیخاری پێوه ئەکـات. ڕیجـالی ئـاورووپی زۆر تەقـدیری عەبدولحەمیـد خانیان ئەکرد، ئەیانوت: پیـاوێ زۆر گەورەیه، لیباسـی سـورمەلەیی لەبەر ناکا، نیشان و جەواهیر له خۆی نادا، بەس نیشانەیەکی گچـکه، نیشـانەی خانەدانی سەڵتەنەت له ئەییامی ڕەسمی به سینگەوەی ئەکرد، باقی لیباسێ عادی.

ئەگەر حەقیقەتەن ئینسان مەلیك بێ، چۆن مەیلی ئەو جۆرە ئارایشە ئەکات؟ لاکین هەموویان مەلیك نین وەلەو تەختیان زۆر موجەوهەر و گەورە بێ. لام وایە سەریری (ثور)ی میصرییانیش وەکی سەریری ملوکیان بووە، یا زیتر.

٨٣/٧

## باغی دێمی!

سبحان الله هاوینان لە چنارۆك[1] تەماشا ئەکەین باغەکانی دێم، گەلێ

---

(١) مەسعوود محەمەدی کوڕی مەلای گەورە لە کتێبی گەشتی ژیانم دا بەسەرهاتێکی باوکی لە چنارۆك دەگێڕێتەوە: جارێک لەو جارانەی پێمەڕەداران بۆ خزمەتی باغەکانی چنارۆک مام ئەحمەد ناوێکی خەڵقی دیوی کوردستانی ئێران کەوا چەند ساڵێک بوو گوزەران هێنابوویە کۆیێ و لە حەسارەکەی بەرانبەر ماڵماندا خۆی و کوڕێکی سەعید ناو و کەرێکی بۆزی کارگوزار دەژیان و پێشیان دەگوت لالۆئەحمەد و لالەحمەد و وەک فەقێکانی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدی نزیک ماڵمانەوە ڕاتبەی ئێوارانی بۆ دەچوو. ئا ئەو لالۆئەحمەدەش بەگەڵ هەرەوەزەکە کەوتبوو. مرۆیەکی ئێسکسووکی قسەخۆش بوو. سوێندی هەرەگەورەی لای براگەورەکان ئەوەبوو دەیگوت: بەگیان تۆ بە گیان سەعە بچێ بۆ بان کەرەبۆز... لەو ڕۆژەدا پێمەڕەدارەکان لە لاپاڵێکی باغچەی مێو و هەرمێیان خەریکی پێمەڕەکاری بوون. باوکم چاوی گێڕا لالۆئەحمەدی نەدیت. بە پرسیار زانی بەرەو چ لایەکەوە ڕۆیشتووە، گوتی: کوڕینە بگەنێ هەتا موتوربەی هەرمێیە ئەلماسییەکەی ڕیشەکەن نەکردووە. باوکم خۆیشی بۆ ئەولا کشا دیتی لالۆئەحمەد پاڵەوانانە لە کاری خۆی بۆتەوە و گوتی: قوربان ئەم بنەکۆلکەم لە کۆڵ باغچەکەت کردەوە، لایەکی لێ داگیر کردبوو، ئەمامی تازەی لە جێگەدا دەچێنین، قەزات بچێ بۆ بان کەرەبۆز... بابم زۆر لێی بە پەرۆش بوو بەڵام بوو بە پێکەنینێک هەر مام لالۆ سەری لەو پێکەنینە سوڕ مابوو. موتربەکەش تەنها قەڵەمێک بوو بۆی هاتبوو لە خۆشناوەتی لە نێوان چەند قەڵەمدا کە خۆی گرت و شین بوو، ڕێکیش نەکەوت جارێکی دیکە لەو نەوعە قەڵەمە پەیدا بێتەوە... لالۆئەحمەد دوای دوو سێ ساڵ گەڕایەوە بۆ نشیمەنی خۆی و لێمان نەبیستەوە. لە سەرەتای پاییزیشدا کە ماڵ دەگەڕانەوە بۆ کۆیێ باوکم بە خۆی و چەند بەردەستێکەوە بۆ ماوەی بیست ڕۆژێک دەمایەوە بە نیازی خزمەت کردن و ئاوەدانی باغەکان. ڕەزەوانی مەعلان و لێزانی خۆشناوەتی ئەو وەزعەیان دەزانی دەهاتن بۆ یاریدەدان لە خزمەت و لە موتوربە کردن و هەڵپەرداوتن و ئیشی دیکەی سەربە ڕەزەوانی. زۆر لەوانیش تەڵەیان پێ دەبوو تا

←

سەوزو جوانترن لە باغەکانی بەراو، ئان زیادە مێوی دێمی گەڵێ بە ڕەونەقترە لە ئاوی.

٩٠/٧

## من و قەشە!

سەفەرێ لیجنەی ئوممەی چوونە هەولێر قەشەمان لەگەڵ بوو[1]. لە

---

ئەوەی گەڵێک شەوان ٨-٩ تەڵە دادەنـدرایەوە و بەزۆری ئەوەنـدەیان لـێ دەتەقـین گۆشتیان تەئمین دەکرد. ئەو باغەوانانە لە خۆیانەوە بێ تەکلیف دەهاتن. بێگومـان بـۆ ئەوان ڕەفاقەتیی «مەلای گەورە» لە نزیکەوە هەڵکەوتێکی دڵدەرەوە بـوو دە جـاران ئەوەنـدە ئەرکەی دەهێنـا کە لە پیـاوەتی خۆیـانەوە بێمـزە بە چنارۆکیـان دەبەخشـی. بـاوکم لەحەدبەدەر ئاشـقە درەخـت بـوو لەو ڕووەوە لـێم دەبیسـت کە زەردەشـت چاکەی بە سـەر ڕەزداری و بـاغەوانییەوە هەیە لە نێـو کوردەواریـدا... دەشـیگوت لە شاخی پیـرمەمەوە تـا کۆتـایی دێ لە بەرانـبەر دووکـان پێـنج هەزار ڕەز کـاول بـوو لەسەردەمی عوسمانلییان لەبەر زوڵم و زۆریی ڕەزانەستێنان. مەراقـی زۆری لەو دەردە بێـدەرمانەی درەخـت دەخـوارد کەوا لە پـێش چـاوی خـاوەنەکە دەیکوژێـت و دەسەڵاتیشی پێی ڕاناگات. یەکێک لەو دەردانە کەمعومریی دار خۆخ و قەیسی بـوو. جارێکیان لەو باغەوانانەی پرسی ئاخۆ لە کەسبەکەیانەوە یان لە بیستنەوە چ چارێکیان بە بیردا نـایەتەوە گوتیـان، قوربـان جەنـابی مەلا ئەوە بە ئەمـری خـوایە. بـاوکم پێـی گوتنەوە، ئێوە لای خوا بۆ من لێ گەڕێن من لە ئێوەی شـارەزاترم، ئەگەر لە زانینـی دنیاییەوە شتێکتان وەرگرتووە پێمی بڵێن. بەداخەوە هیچیان لێ نەدەزانی. دواتر باوکم کەوتە سەر ئەو باوەڕە کە مردنی ئەو دوو درەختە، بەتایبەتی خۆخ کە زۆر ناسکە و خێراشکستە، دەچێتەوە بۆ گەزەنـدەیەک (حشـرة) لە قەڵغەتـدا هێنـدەی سیسـڕەیە، بە درەختەکەوە دەنووسـێت و شـرینقەی نـاو دەمـی تێـدەچەقێنێ تەڕایـی نـاوەوەی لـێ دەمـژێ. کە دەمیشـی لـێ هەڵگـرت، لەو کـونەوە کە تێـی خسـتووە دارەکە جەوی دەردەکات و پێیدا دێتە خوارێ یان بە تۆپەڵە لە دەوری کونەکە کۆمەڵ دەبـێ ئنجـا کە درەختێک بیست گەزندەی ئەوتۆیی لە هەموو لایەکی قەدیەوە برینداری بکەن و ئەو هەموو جەویەی لەبەر هەڵبنیشـێ و گەرمـای هـاوینیش لە ژوورەوەی دەرختەکە یـارمەتیی ئەو جەوی لەبەر هەڵنیشـتنە بـدات، ئایـا لە سـێ سـاڵاندا چ خوێنێـک لە دەمـاری درەختـی ئەوتۆییـدا دەمێنـێ بـایی ژیـان بکـات کە دەزانـین جەوی خـوێنی درەختە؟ ئەو تێبینییە بەوەدا پتـر خـۆی دەسـەپاند کە درەختـی خـۆخی نـاو سـێبەر و فێنکایی پتـر دەژیـا لەوەی هەتـاو داغـی دەکـرد چونکە لە سـێبەردا کەمتـر جەویـی دەردەکرد.

(١) مامۆستا مەسعوود محەمەد لە باسـی پەیوەنـدیی مـەلای گـەورە و مسـوڵمانەکانی ←

گەڕانەوە باران و قوڕ بوو، قەشە بەربێوە لە وڵاغ، خود تاڵع، نورەددینی برام خوا سەلامەتی کا، عیززەتی ئامۆزام خوا عەفووی کا، پێی گەیشتن، سواریان کردەوە؟ لە مەنزیل باسی ڕێیە کرا. وتم: قەشە فەندی! ئەگەر نورەددین و عیززەت لە قوڕیان دەرنەهێنابای هەزار جاری بتگوتبا مریەم! مریەم کەڵکی نەدەگرت!.

٩١/٧

## قائیدی بەحری!

(قبود)انی بەحری کە بە شەو وەقتی فەرتەنە و زوڵوماتی هائیل ئیدارەی پاپۆڕی ئەکات، ملیۆنەك ئیلاهی ئێوە ئێنی. قائیدی موبەحری بۆ

---

کۆیە بە قەشەی دیانەکان، لە کتێبی حەماغای گەورەدا دەنووسێت: کەمایەتی ئایینی دیان و جووی کۆیێ لە کۆنی کۆنەوە بە تەبایی لەگەڵ مسڵمانی کۆیە و ئەو ناوە هاتوونەتە خوارێ. نەبیستراوە بە جۆرێکی ئەوتۆ ناوی گەلەکۆیی پێوە بێ لە لایەن مسڵمانانەوە دەسدرێژیان لێکرابێ. ڕەنگە بەهۆی تەقیەی جوداوازی دینەوە بێگاریان کەمتر پێکرابێ لە مسڵمانان هەروەک لە عەسکەری و خزمەتی ئاڵادا ئەرکەکە کەوتۆتە سەر شانی مسڵمانان. لە دەمی ئاژاوەدا کە بە عادەت تێکەڵ پێکەڵی دەبێت و سنوور دەبەزێنن ئەو کەمایەتییە ئایینییانە لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە پارێزراون. لە کۆیێ دەسەڵاتی دنیایی بەزۆری لە دەست غەفووری و حەوێزییاندا بوو لە سەردەمی حەماغادا ئەو دەسەڵاتە پتر بۆ ئەو دەچۆوە دوای ئەو کە جەمیلاغا بوو بە قائیممەقام پشکی حەوێزییان لە دەست ڕۆیشتن زیادی کرد هەروەک لە دوای حاجی بەکرئاغا غەفووری برەویان ستاند. جگە لەم دوو بنەماڵەیە مرۆی دیکەش هەبوون بتوانن چ بە خاترانە چ بە مەرکەزی تایبەتی خۆیان بێت پەنای ئەو لەخۆ ترساوانە بدەن، بەڵام لێرەدا قسە لە حەماغایە کە پیاوی دنیایی و ئاغا بوو، بۆیە تەنها لە تای تەرازوودا هەر ناوی حەوێزییانم هێنا. خولاسە دیان و جوو بە ئاشکرا دەسدرێژیان لێنەکراوە مەگەر چۆناوچۆنی بووبێ. پیاوماقووڵ و قەشە و ماڵەکانیشیان لە هاتوباتی ڕەسمیات و جەژنەدا بارتەقای ماقووڵەکانی مسڵمانان بەخێر دەهێندران و ڕێزیان لێدەندرا. من بە چاوی خۆم دەمدیت لە دیوەخانەی باوکم هەمیشە قەشە و ماڵم لە باری هەرە سەرەوە جێگەیان ڕەچاو دەکرا. ئنجا هیچ سەیر و سەمەرە لەوەدا نییە کە جوولەکە و دیان حەسانەوەیەکیان لە سێبەری حەماغادا دیتبێ، چونکە حەماغا دوژمنی خۆیشی پەنا داوە کە ڕووی لێنابێ یاخود کورە دیان کە مەحرەم و تا ڕادەیەک مەسرەفچی ماڵی حەماغا بووبێ.

سەرفرازی ئوممەت هەزار مامۆستا و شێخ ئێنێ.

٩٢/٧

## فەرقی بەینی پێشکە و جوبرائیل!

حەققەن نسبەت بە مەقامی ئولوهییەت، فەرق لە بەینی پێشکەیێ و جوبرەئیل نییە. ئەی بەشەر خۆڕایی خۆت لە خوا ئەکەی، ڕەزل و سفیل، بۆ جەمادێ بۆ حەیوانێ (دون)ی خۆت، وەکی خۆت، زانو زەدەی عبودییەت ئەکەی. گەردەن کەچ، چاو لەسەر یەك، لەسەر پا ڕادەوەستی لەبەر دەستی کەسێ!

گەر ڕادەوەستی، ئەوەش ڕسمێکە، ڕسمی بتپەرستی!

٩٢/٧

## ڕەتکردنەوەی ڕایەکی کەلامی!

مەلایانی ئێمە هەرچەند ئەفەرموون (عدم الدلیل لا یدل علی عدم المدلول) ئەمما وا نییە. ئەگەر بنۆڕنە (جهة الدلالة) ئەزانن ئینتیفای دەلیل دەلیلە، لەسەر ئینتیفای مەدلول، بەو شەرتە موساهەلە لە مەدلول نەکەن ئەڵێن: ئەگەر عالەم نەشبێ، خوا هەر هەیە. بەڵێ ذاتی الله واحیدی حەقیقی، واجب الوجود، عالەم ببێ، نەبێ، هەیە. لاکین ئەمما عالەمی دەلالەت لە صانیعی کا، عالەم نەبێ صانیع کوا؟ ئەو عالەمە مەوجودە، لەبەر ئیمکان یا حدوث، دەلالەت لە وجودی واجب الوجود یا قەدیم ئەکا ئەگەر عالەم واجب الوجود بێ واجب الوجود صانع نابێ، کوو ئەبێ؟ مادام ئەوانە بورهانیان لەسەر وجودی شەریك نییە، دیارە شەریك نییە، ئەگەر بیا موتڵەق ئایەتی ئەبوو، ئیلاهـ ئەبێ خۆی دەرخا.

٩٣/٧

## غەیب لە عیلمی کەلامدا!

بزانین غەیب چییە؟ وە ئەسبابی عیلم چەندە؟ ئەوجا ئەزانین غەیری خوا کەس غەیب ئەزانێ، یان نا؟ ئیدراکی جوزئییات بە ئالەتە، یەعنی چاو و گوێ، بلێم: زوبان یا ذوق، کەپۆو یا (شم)، پێست یا لەمس؟ ناشکوری نەبێ زوبانی کوردی قەت نەبۆتە لیسانی عیلم تا تەوەسسوعی بێ. وەکەذا ئالاتی باتینە وەك خەیاڵ و واهیمە و موفەککەرە، یاخود وەك سەلەف ئەڵێن: حیسسی موشتەرەك، خەیاڵ، وەهم، حافیزە، موتەصەریفە ئەوانەش ئەبێ لە طوروقی حەواسی زاهیرە واریداتیان بۆ بێ وە بۆ ئیدراکی کوللیات ئەمێنێتەوە عەقڵ، شتی جوزئی بە بەر حەواس نەکەوێ، کوو ئەزاندرێ؟

مەعلومە ومجمع علیە یە لە ئەسبابی کەسب نییە، مەعلومی بالضرورەتە، ئەوی خۆی یا ئاساری، بە بەر حیسس نەکەوێ، نازاندرێ هەیە، نییە؟ بەڵکو بە بەر خاطر و خەیاڵ ناکەوێ. ئەگەر کەسێ بڵێ عیلم بە جوزئییات چۆن بۆ خوای ئەبێ؟ بێ ئالەت و واسیتە (فلا برهان لە). وە هەم وەکی شێخی ڕەئیس ئەفەرموێ: عیلم بە عیللەتی تامەی ئەو شتە چۆن ئەبێ؟ چۆن ئەزانی؟ ئەوەی متوقف علیە وجودی ئەو کارەیە، حەتتا ڕەفعی مەوانیع هەمووی لە ئانە تەحەقوقی کردیە یا ئەکا؟ تا ئەمڕۆ ئەهلی تەقویم خەبەریان لە گەلێ شت دایە، کە لە سەیری کەواکیبیان وەرگرتیە. ئەمما نەیانزانییە سەیارەیی دی لە مەنزومەیی شەمس هەیە یان نییە؟ دوایە کەشف بوو، بەڵکو ئەو سەیارەش لەو ئەمرە تەدەخول بووبێ، یا گەر نەیبووە ئەبێ زانیبیتی کە نەیبووە. مع أنە خۆی مەجهولی بووە. دیارە عیلمی محیط، عیلمی جزئیات، بێ ئالەت بەس بۆ خوایە، حەتتا حوکەمای یۆنانی ئیدراکی مادديات چونکو بە تەریقەی حەوواسە ئینتیباعە، بۆ خوای بە مەحاڵ ئەزانن.

بەڵێ گەلێ کەس بە وەلی و غەیرە وەلی، بەعزە خێر ئەدا، واش ئەبێ ئەمما حاشا لە عیلمەوە نییە. شتێ ئەکەوێتە دڵی ئینسان جەزمی پێدا

دیتێ، ئەمما نازانی بۆ وایە؟ عیلمی باری موقتەزای زاتە، یەعنی زاتییە. وەکی موعتەزیلە ئەفەرموون، یا صیفەتی زاتییە وەکی ئەشاعیرە، ئەهلی سوننە ئەفەرموون. کافییە بۆ زانینی ئەشیا، وەلەو کیفایەت و ئیقتیزایە بۆ جەنابی حەق ئیختیاری نییە، وە موقتەزای شوئونی زاتی حەق نادرێتە کەس غەیرە مومکینە، نابێ مەحاڵە. ئینسان لە ئەووەلی فیترەت بێ ئیدراکە، وردە وردە ئیدراکی حەواسی بۆ ئەبێ. مع الاسف درەنگە عیلم و عەقڵی بۆ پەیا ئەبێ، بۆیە ئەڵێن ئینسان قابل العلمە ئەسڵی زاتی نییە، عمومی بطریق الاولی کەسێ بە موقتەزای عیلم خۆی غەیبی بزانێ، ئەبێ هەموو غەیبی بزانێ. وە ئیللا لە موقتەزای زاتی نییە، خصوصییەتی هەیە، ئەمە ئەبێ، ئەوە نابێ، ئیتر زۆر چاك تێی بفکرە، قسەکان وردن وە بە موتابەعەی عەمرو زەید خۆ لە طەوری عەقڵ دوور مەکە.

سۆفییە هەندێ قسەیان هەیە، دوورن لە ئیدراك لە عەقڵ لە حەق و حەقیقەت. هەرچەند ئەفەرموێ (مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ) ئەمما موراد دیارە. ئەوەی ئەهلی عیلم بێ لە علوویە و سوفلا، ماددی و موجەڕەددی ئەوەی بە خاطر و خەیاڵ دا بێ، عیلمی غەیبی نییە.

٩٣/٧

## تەلقین!

مەلای تەڵقین خوێن ئەوەندە ئەشیرێنێ، لەناو قەبری مردی گوێی لێ ئەبێ؟ من گەلێ جار بە مسوڵمانان ئەڵێم: ئەو تەلقینە بۆ زیندییانە زۆر باشە، ئەمما لێی بگەن، بزانن سوئالی چیان لێ ئەکەن، بە گوێرە ئیحزارات بکەن. ئەوی مردی ئەوا ڕۆیی، چۆن بوو، ئەگەر موئمینی بێ خەدشە بێ جواب ئەداتەوە، وە ئیللا نەڕە نەڕی ئێمە فایدەی نیە!

ئەمما نازانم بۆچی ئەبێ تەلقینیش هەر بە عەرەبی بێ؟ هەر قەومە بە لیسانی خۆی بێ، زیندییەکان ئیستیفادەی لێ ئەکەن.

٩٨/٧

## ئاهـ لە دەستی ڕوواتان!

زاتێ هاتە کۆیە، نوعمان ئەفەندی لە ئالی جەمیل بەغدایی تەشریفی هات، لە مەدرەسە مولاقاتمان کرد. لە مەیانی گفتوگۆ لەو ئایەتەی (وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لَا يُوقِنُونَ)[1] سوئال کرد. وتم:

ئەڵبەتە ئەزانیت ئیشکالە، لە مەلایانیشت سوئال کردیە، بە جوابیان قانیع نەبووی.

فەرمووی: بەڵێ.

منیش ئەوهام بۆ شەرح و ئیزاح کرد، زۆر مەسروور بوو.

دوای گەڕانەوە کاغەزەکی بۆ زاتێ نووسیبوو، فەرمووبووی: فلان کەس لە زوڵوماتی کوفر نەجاتی دام، دەستی ماچ ئەکەم، داخوا چەند غوفەلای دی وا گرفتاربوون، لەسەر ئەو هەموو ئیختیلافەی کە لە (دابة) یدا هەیە، چۆنیان کردیتە ئەشراتی ساعەت؟ حەتتا داخلی ئیعتیقادیان کردیە!

ومن العجایب قسمێ لە شیعە ئەڵێن: ئەمە ئیمامی عەلی یە گۆیا ڕیجعەت ئەکا، ئینتیقام ئەستێنێ! واقیعەن ئەو نەوعە ڕیوایەتە، ئەو هەذەیانەتە و مەسەلی وی، یەکێکن لە (دابة الارض) عالەمیان بە فەساد برد، ئایەتی قورئانیان بێ ڕۆح کرد، حەتتا بەعزێ لەهجەی قیرائەتیان بۆ تێك دایە، گۆیا ئەوە کەلامە داخیلی کەلامی وی یە.

مەسئەلەی عەصای موسا و خاتەمی سولێمانی سەیرە! گۆیا لەو ڕۆژە بە دەست و لە دەستی ئەو (دابة) دان! عەصا خوا ئەزانێ ڕزیوە، خاتەم بێ ئەصلە، لە مەقولەی حەکایەتی ئەلف لەیلایە. ئیمامی ڕازی ڕەحمەتی لێ بێ کەیفی لەگەڵ ئەو (دابة) یە نایە، ئەڵێ: قورئان دەلالەتی لەو قسانە نییە. وایە. گەر تەفصیلت ئەوێ تەماشای ڕوح المعانی کە، من ناتوانم

---

(١) سورەتی النمل/٨٢

قسەکانیان نەقل کەم، دڵم بۆ قورئان و بۆ ئوممەت سەخڵەت ئەبێ، ئاه لە دەستی ڕوواتان!

٩٩/٧

## پاپا و مەلایانی ئێمە!

ئەمساڵ (١٣٥٨) پاپ غەیری گۆشت هەموو شتی لە دیانان حەلاڵ کردیە، لە ئەییامی پارێز، کەس ناڵێ ئەمە چۆن ئەبێ؟ بۆ تا ئێستا حەلاڵ نەبووە؟ بۆ ئەمساڵ حەلاڵە؟ حەیوانی لەمە زیاتر ئەبێ؟ ئەو نەوعە (دابة) ئەزانن قەوم چی پێ خۆشە فتوا ئەدەن. ئەوانی ئێمەش شتێکن وەکی پاپ، ئەمما زۆرن، بێ ئینتیزامن وە ئیللا مومکین بوو ساحێبی عەرشێ وەکی عەرشی فاتیکانیان لێ پەیا بێ.

١٠٠/٧

## ئەدیبەی کچم و دایەنەکەی!

ئەو مەمك نەخواردنەی موسا خاریقەیە، وە ئیللا ئەوە بۆ گەلەك منداڵان ئەبێ، حەتتا ئەدیبەی کچی من لە نۆ مانگی دایانی ڕۆیی! هەرچەند پەلەیان کرد، تێکۆشین بە سەد حیلە، بۆی هاتنە پێش، تێکۆشین فایدەی نەبوو. ئاخیری بە شیری حەیوان بەخێو کرا، گەورە بووبوو، دەگەڕا کە مەیلی ئەچۆوە شیر، ئەهاتەوە ئەیگوت: مەمە.
مەمەی شووشەیان بۆ پڕ ئەکرد. گەلێ پاش موددەیی ڕیزاع لە شیر کرایەوە. ئەبێ ئی حەزرەتی موسای پێش داك ناسین بووبێ.

١٠٩/٧

## لە لەندەن ساعەت لێ ئەدا، لە کۆیە گوێیان لێیە!

ئینسان ئەبێ تەئەممول کا، گەلێ شت بە مەحاڵ ئەزانرا، مع أنه واقیع بوو. تەمەووجاتی هەوای لۆندەرە و یا بەرلین و پاریس و واشنتن و ئەنقەرە و میصر و فەلەستین و بەیروت و بەغدا و تۆکیۆ و مۆسکۆ وا

لەسەر سندوقی ڕادیۆ لە کۆیە تێکداوێن، لە لەندەن ساعەت لـێ ئەدا، لە کۆیە گوێیان لێیە.

١١٠/٧

## یارمەتیدانی زاڵم!

ئەبەدەن نابم بە پشتیوانی موجریمـان، ئەوانەی ئینسـان ئەهـاوێنە نـاو جورم و گونـاه، یـا ئەوەی موعـاونەتی سـەر ئەکێشـێتە جـورم و گونـاه ئینسان بە موعاونەتی ئەبێتە موجریم، واقیعەن ئیعانەی زاڵمـی زۆر خـراپە، زاتەن ئەوی زاڵمە بە قووەتی عەمر و زەید زوڵمی پـێ ئەکـرێ، کەسـێ زوڵمی بەدی بکا، مەخلوق ڕووی لێ وەرگێڕن چی پێ ئەکـرێ؟ ئەممـا کە نـائیلی ئیستیحسـان بـوو، جـورئەتی زیـاد ئەبـێ، ئەممـا تەرکـی مەئمورییەتی حکومەت لای من زۆر خراپە.

لە وەقتی خۆی، مەسەلەی ئیمامی ئەعـزەم مەیلـی قـازییەتی کردبـا و وشـکە سـۆفی موعینیـان نەدابـا، ئەمـڕۆ ڕیئاسـەتی مەحـاکیم نەدەکەوتە دەسـتی ئەجنەبـی. بەڵـێ ئەعمـالی حـوڕڕە باشـترە، ئەممـا کـوا؟! ئەگەر زادەکان ڕەغبەتیان بووبا، کار نەدەکەوتە دەستی ئەسافیلان، دنیـا وا ژێـر بەرەو ژوور نەدەبـوو. مسـوڵمانی خـانەدان هەرچـی بـێ، لە نامسـوڵمان و ناخەنادانی باشترە، خاسەتەن لەبەر فەقر. ئەگەر تەربییەتی عـائیلەوی تێـك نەچووبا، شتێ تر ئەبوو. خۆزی مەلایانی سـابق ئەمڕۆیـان دیبـا، دەرکەی ڕزق لە ئەهلی عیلم بەسترایە مەدرەسە چۆڵ بوون، وەختە عیلم بە جارێ مەحوو بێتەوە، دین نەمێنـێ، بە ئەهـالی خـدمەت نـاکەن، پێیـان نـاکرێ، حکومەت نایکا تەدبیری!

ساحێبی ڕوح المعانی موفتی بوو، عەزلیان کـرد، بە خـۆی و بە روح المعانی چـووە ئیسـلامبۆل، بـێ فائیـدە گەڕاوە. نیهـایەت بە حەسـرەت و ئەندۆه لە دونیایە ڕۆیی.

١١١/٧

## ئینگلیزەکان ئەجنەبی لێیان بکوژن هەر ئیعدامی ئەکەن!

نەزەر بە تەحەییوری ئەقوام، ئەوان مادەم غەیری عونصری خۆیان لێیان بکوژن، ئیللا ئیعدامی ئەکەن بە هەر صورەتێ بێ. لە دەورەی مەدینەتی حازری ئینگلیز، موقابیلی قەتلی سەردار ستاکی، ئەوی کردی کردی. بەعدەهو نیو ملیۆن لیرەی زێڕی لە میصر ستاند.

١١٣/٧

## کێن ئەوانەی باس لە یجوز و لایجوز دەکەن؟!

سبحان الله ئەوی لای خوا ئەهەممییەتی نییە، لای نوققالان زۆر بە ئیهتیمامە، قورئان ئەوەندە ئەگەیەنێ، ئەو دوو کچە -مەبەستی کچەکانی شوعەیبە- باوکیان پیاوی پیر بووە، ئەوزاتە کێیە؟ شوعەیبە یاخود برای بووە، ناوی رعاویل یا یثرون یا یثرب یاخود شەخسێ ئەجیننی بووە، خزمایەتی لەگەڵ شوعەیب نەبووە، ئەو مونازەعاتە سەمەرەی چییە؟ هیچ!
کەسێ مولاحەزەی شەیخوخەتی بابیان و بێ کەسیان ناکا، لام وایە ئەو تەدقیقاتە ئەمڕۆ زۆر قیمەتی نییە، لەو بیری بوو، یا بیری تر؟ ئەمەش نیزاعێ دی، چی پێ ئەوێ؟ کەشفی حەق و حەقیقەتە، بەڵێ کەشفی ئێمە هەر ئی شتی وایە. من زۆر سەغڵەت ئەبم، بە تەماشاکردنی ئەو موخالەفاتە، وە تەعەجوب ئەکەم لە سەییدی ئالووسی چۆن ئەتوانی ئەو هەموو قیل و قالە بنووسی؟

برام لەوەندەی ئایەت ئەیفەرموێ، زێتر گوێ مەدەرێ. ئەوانەی لەو نەوعە حالە بەحس لە یجوز و لایجوز ئەکەن، ئەگەر خۆیان لەو حاڵە دابان، چییان ئەکرد؟ ئێستا موسا چ بکا؟ غەریب، ماندی، برسی، فەقیر، بێ پارە و پوول، حەتتا لۆقنتە نییە، ئوتێل نییە، چ بخوا لە کوێ بێ؟!

١١٥/٧

## عیلمی مەنتیق!

ئەگەر موستەمیع پەکی لەسەر تەرتیبی مەنتیقی کەوتبا، کەم کەس فەهمی قسەیان ئەکرد، بە عەمەلیات ئینسان تەواو ماهیر نابێ لە مەنتیق، ناتوانێ قیاسی جەدید هەڵبەستێ. زۆر کەس هەن، ئیشتیغال ئەکەن بە عیلمی مەنتیق بە غەیری ئەمسیلەیە کە لە کتێب دایە خۆی قیاسێکی پێ تەشکیل ناکرێ.

١١٧/٧

## ڕەنجبەری!

گەلێ ساحێب ماڵ هەن لەگەڵ ڕەنجبەر و دەست و پێ، زۆر بە خورتە خورت و ورتە ورتن! وا بڕۆ، وا وەرە، بۆ وا ناکەی؟ تەنبەڵی، بێ دیققەتی، ڕەنجبەر لە خۆی وەڕز بێ، فکری لێ تێك ئەچێ. بەعزەکیش زۆر باش، ئیشی پێ ئەسپێری و تەسلیمی خوای ئەکا.

١١٧/٧

## جەزوە!

لە وڵاتی مە ئەلئانیش وایە، لە شاری نا، ئەمما لە دەرێ، بڕکە دارێ سووتانی تەڕ، سەری گەرم ئەکەن، بە کوتك و قونکە بیور، ئەیکوتن. وەکی سیواك ڕیشاڵ ڕیشاڵ ئەبێ، بۆ شەو بە ئاگری هەڵی ئەکەن، وڵاتی پێ سەح ئەکەنەوە، کای پێ ئەدەنە وڵاغان، مومکینە لە عەرەبی جذوە ی پێ بڵێن.

١١٩/٧

## مووم کافووری زەمانی منداڵیم!

لە ئەییامی منداڵیم، شتەکیان هینایە کۆیە بۆ فرۆشتن، وەکی مووم کافووری بەعزێ ئەستوور، بەعزێ باریك، پارچە پارچەیان ئەکرد، بە

ئاگریانەوە دەنا، کەفی ئەکرد. وەکی مارەکی لێ دەرکوڵێ وا ئەبوو ئەبووە ماری تەواو، ئەوەندە بوو ڕۆحی نەبوو. عەجایبی ئەمە بوو، چ پارچەی لای سەری، چ ناوەندی، چ ئاخیری.

خولاسە هەر پارچەیە با، لەو لای ئاگری ئەگرت، سەری ماری لێ ئەهاتە دەر تا خەلاصی. مارێ بە سەرو کلك، پاشان چیتریان نەهێنا، باسی نەما، نەمانزانی لە چیان دروست ئەکرد، بۆنی زۆر ناخۆش بوو.

١٢٠/٧

## ئەوەی لە کوژرانی خۆی بترسێ ناتوانێ ڕیسالەت ئەدا کا!

موبهەمە حاڵی کوللی حکومات ئەفرادی ئەصلی شەعبی خۆی بە وجوهـ تەرجیع ئەکا لەسەر غەیر. ئەوەی لە کوژرانی خۆی بترسێ، ناتوانێ بە تەلاقەت و جەسارەت ئەدای ڕیسالەت بکا.

١٢٢/٧

## مەلیك لای شەعب!

میسری، فیرعەونیان بە ئیلاهـ حیساب کردیە، وەکی لە تاریخی عومومی وەردەگیرێ عیبادەتیان کردیە، بە کوردی ئامون و شەمسیان زاناندیە، بە تەلقیناتی کاهینان وایان زانیوە فەراعینە لە سولالەی ئیلاهن، لە جێی وان حوکمڕانی ئەکەن. وەك ئەلئان لە ژاپۆن میقادۆی بە ابن السماء ئەزانن، لە ئەمر و ئیتاعەی دەرناچن. حەقیقەتەن ئەبێ مەلیك لای شەعب *(من حيث الاعتقاد)* ئیمتیازی هەبێ، کە لە ئۆغری تەرکی حەیات بکەن، ڕوح نثار کەن، تا عولوویاتی مەعنەوی نەبێ، تەسەللوتی ڕۆحی نابێ. وەکی لە تاریخ ئەڵێ فیرعەون هەم ڕەئیسی ڕووحانی، هەم ڕەئیسی جیسمانی بووە. مەلیك کە لە ڕیئاسەتی ڕوحانی، لە سەیتەرەتی ڕوحی تەجرید کرا، قیمەتی نامێنێ، هەرچەند تەقەددوسی ئەور و بەعزە حەیواناتی تریان کردیە، ئەمما خەلەلی بە مەقامی فیرعەون نەداوە! ئامادەی خدمەت بوون.

١٢٣/٧

## تەوڕات و ئینجیل!

لاشـەك ئەو تەوڕاتەی ئەلئان تەرجەمەی لای ئـێمە هەیە، بە کیتـابی ئیلاهی حساب نییە، بە غەیـری بەعـزە ئەحکـام و حیکایـات کە قورئـان زیکری ئەکا، باقی تر قیمەتی وەحی نییە. خۆ قـانونی برصـا ئەسـڵەن لە خـوای ناوەشـێتەوە بـۆ عەبـدێ بە وەحـی بینێـرێ، کـاهینییە، کۆڵێنـانییە، قسمەکی تەوارخە، بە عەینی تاریخ، بێ عیبەر و وەعـز و عەتفـی نەزەر، تاریخ فەوقی وی زۆرە. ئەگەر قورئان نەیفەرموبا: خـوا کیتـابەکی هەیە، باش هـادی و مـونەووەری قولـوب، حـاوی ئەحکـامی شـەرعییە، ئەوەی ئەدنا شعوری هەبا، ئیمانی بە تەورات نەدێنا. وا دیارە ئەو تەوڕاتەی خـوا ئەیفەرموێ نەماوە، ئەوە لە تەرەف کاتبیان داندرایە.

وەکـەذا ئینجیـل، ئینجیـل هەر هیچـی مەعلـوم نیـیە، تەرجەمە حـاڵی عەینییە، تەرجەمەی لاهوویی، حەقیقەتی تاریخی نیـیە. ئینجیـل ئەساسـەن تەدوین نەکراوە. بەڵێ جەنابی ڕیسالەت تووڕەبوو لە فارووق، کە ئیزنـی خواست لە ڕەسوولی ئەکرەم بۆ قیرائەتـی تەورات، ئەممـا لەبەرئەوە بـوو ئیسلام حدیث العهد بوو، خروجی عن الکفر جەدید بوو، نەهی مـوتڵەق نەبوو (قُلْ فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ) دەلالەت لەسەر ئەمە ئەکات.

ئەممـا نـازانم مەلایـانی شـەرعی بـۆچی مەنعیـان فەرمـوو؟ مـع أنە ئاگاداری ئیتلاعی بما فی التورات والانجیـل بـۆ عولەمایـان موفەسسـیران زۆر باشە، زێدە قیمەتی قورئانی پێ دەرئەکەوێ؟

١٢٧/٧

## بەرد دەبوونە شفتی و گوندۆرە!

سبحان الله حالی بەشەر ئیفرات و تەفریتە، لە کوتوبی مەوعیزەی بێ قیمەت ئەڵێ: مەلائیکەت ئەهاتن، لەپشت کێوی ئەبـو قوبەیسـی بەردیـان ئەهاویشتە ناو خرار، باریان ئەکرد لە حوشتران، ئی بەهشتی، بەردووکـان

ئەبوونە شفتی و گوندۆرە و هەنار و سائیری میوەی دی. حەتتا مەغرور بووبوون ئەیانوت: مسوڵمان بێ منەت بن، با نەیەنە حەج، مەلائیکەت دێن لە جیاتی وان حەج ئەکەن، خێر و بەرەکەتمان بەسەردا دەبارێنن. ئەمما لە حەڕبی عموومی دەرکەوت ئەمە لاف و گەزافە.

ئێستاش ناشکوری نەبێ مەدینە شڕە، خصوص مەلایان پەرێشانن، ئەوەش جەزای خدمەتی دین! ١٣٥/٧

## مەیلی مەلایان لە نیزاعە!

ئەگەر تەعەصوبی مەزهەبی لێگەڕێ، دیارە خوا بە خۆڕایی عیبادی خۆی هیلاك ناکا. ئەگەر مولاحەزەی شارعی ئیلاهی و حیکمەت و لوتف و عینایەتی ئەکەی، واقیعیەکەی ئەوەیە، کە خۆی ئەیفەرموێ: رحمن و رحیم رب العالمین، هەنجەت بە کەس ناگرێ، ئیغوای بکا، تا عەزابی دا، کەیفی بە عەزابدان نایە.

ئەگەر تەماشای قودرەت و قووەت و کیبریائی و غینای زاتی و قەهر و وەحدانییەتی ئەکەی، کائینات زێڕ و زەبەر کا، ئەڵێ: چی؟ کێ دەسەڵاتی هەیە؟ (مَن يَمْلِكُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا)[1]. ناشکوری نەبێ، چونکی مەیلی مەلایان لە نیزاعە، فیرقەیە بە نەوعێ ئەنۆڕێ، فیرقەیە بە وەجهێ تر. حاکمییەتی عەقڵ ئیدراکییە، قووەت و تۆبزی لەسەر ئینسانێ دون نییە، فکیف واحدی قەهھار؟ ١٣٦/٧

## هاوار یا ئۆمەرمەندان، یا خاڵخالان، پیرۆتە سووری مەرگێ، شێخ پریسی ئەنگۆزی!

نازانم ئەشاعیرە بۆچی سەلبی قودرەت یا تەئسیری لە ئینسان ئەکەن،

---

(١) سورەتی المائدة/١٧

ئەمما ئەڵێن جنۆکە قودرەتیان هەیە خۆیـان تەشـەکول کەن بە ئەشـکالی مـوختەلیفە. سـبحان اللـە ئینسـان، حەیوانـات ئەو هەمـوو تەتەوڕات و تەشەکولاتەی بەسـەردا دێ، هیچـی بە ئیختیـاری بە ئاگـاداری نییـە. لام وایە تەشـەکول کـردن مەحـاڵە، بەڵـێ سـەلبی قـودرەت و عەقڵیـان لە مسوڵمانان کرد، ڕوویـان لە مادییـات وەرگێـڕا، کەوتـنە وادی خەیـاڵ و عیلمی غەیب، دەستیان کـرد بە کەشـفییاتی مـافی اللـوح المحفـوظ، مـا تحت الثریا، ئابـار و جیبـال و ئەودیەی جەهەنـنەم، باغـات و کۆشـك و سەرای بەهەشت، جابولقا و جابورصا، ئەرزی سمسمە، لە ئەرز غافڵبوون!

ئەوروپایی لە خورافاتی تەورات و مەسیحی ڕوویان وەرگێڕا کەشفی ئەسراری تەبیعەتیان کـرد، بە تەیـارە فـڕین، بە غەواصـە چـوونە قەعـری بیحار، ئیستیلای مەمالیکی ئیسلامیان کرد. مسـوڵمان بـێ قـودرەت و بـێ دەسەڵات و بێ ئالات و ئەدەوات، بیـاڕێوە، هـاوار یـا ئۆمەرمەنـدان، یـا خاڵخاڵان، پیرۆتە سووری مەرگێ، شێخ پریسی ئەنگۆزی[1]، یۆك! کەس نییە، کەس بە فریاد نایە. حەققەن ئەوانەی ئیختیاریان لە مسوڵمانان سەلب کرد، عەقڵیان لێ گۆڕین، لە سەعی و عەمەلی دونیەوییان کـردن. بـوونە موعینی غایەت بە قووەت بۆ ئیستیلای کوففار.

ڕیسالەکم هەیە لە بەحسی ئیختیار، زۆر نایابە، قیمەتدارە ئومێد ئەکەم نەفع داتە ئەربابی عیلم. ١٤٠/٧

## تەوەکول!

تەوەکول بەو نەوعەی سـۆفییە ئەفەرمـوون، لەگەڵ ئیسـلامەتی ڕێـك ناکەوێ (لە الحمد) ئیلجائـات و زرورییـات سـەوقی ئـوممەتی کـرد بـۆ کەسابەت. وە ئـیللا حیکـایەتی سـۆفییان، یجـوز و یجـوز و ی سـوننیان عالەمی مەحوو ئەکرد. ڕیزوانـی خـوای لە فـاروقی ئەعـزەم ئەفەرمـوێ: متوکل ئەوانەن تۆو ئەهاوێنە ناو ئەرز. بۆ شینبوون و پێگەیشتنی ئومێدیان بەس بە خوایە.

(١) ئەنگۆز دێیەکە سەر بە ناحیەی بێتواتەی قەزای ڕانیە.

لە باسی تەوەکول تەماشای ئەحیای غەزالی ئەکەی دەهشەت ئەگری، ئەمما لە بەعزە ئەبوابی دی تێ هەڵدێنێتەوە. ١٤٢/٧

## پارچەیە ئەستووکی بە فڕێ ترشێ سندان ئەکا!

لەزەتی لێ بزانە، بخۆ، بپۆشە بەناوی ئیقتیصاد لە بەخالەت مەکە، یا لەبەر کەسرەتی ئیشتیغال و ماندیەتی ئاگات لە حەزی خۆت نەمێنێ. نەختێ ئارام، کەمێ ئیستراحەت، دەمێ لەزەت. گەلێ توجار هەن لەبەر پڕ ئیشی و حەریص بە بەر نان خواردنی ناکەون، کە هیلاك بوون، بە خۆ هاتنەوە، پارچەیە ئەستووکی بە فڕێ ترشێ سندان ئەکا.
١٤٥/٧

## جەددی عالیی من!

زۆر کەس سەروەت و سامانی مەحوو بوویەتەوە، حەتتا خۆی، وەکی ئیمام الحرمین فەوتایە. جەددی عالیم، مەلا عەبدوڵلا ئیبن جەلی، بە دوای یەکێ لەو دەججالانەوە بوو، ماڵی زۆری سەرف کرد، دوایە برا و ئەقاریبی تەهدیدی کابرایان کرد، ئەگەر نەڕۆی ئەتکوژین، هەڵات، گوم بوو. تا ئەو ئاخیرەش چەند دانە (طلق) لە تاقی کوتوبخانەیدا مابوو.
١٤٥/٧

## وەلی عەهدی ئێران ئەلئان لە میصرە بۆ خوازبێنی!

لازم نییە خۆمان کەینە موزەیینی زینەتی قاروون، خوت و خۆڕایی تووشی موبالەغاتی ناپەسندانە ببین، باوەڕ مەکە بگاتە زینەت و جەلالی وەلی عەهدی ئێران کە ئەلئان لە میصرە بۆ مارەکردنی دەستگیرانی

فەوزییە[1]ی خوشکی مەلیك فاروقی چووە، چ جایە ئەو زینەتەی لە وەقتی وصولی بۆ تەهرانی پایتەختی پەهلەوی.

١٤٧/٧

## پادشای فەوقی فیرعەون بەراورد بە هیتلەر بە فەقیر حیسابن!

لە ئومەمی دی پادشای فەوقی فیرعەون، وەزیری فەوقی هامان، دەوڵەمەندی فەوقی قاروون زۆر بوون. ئەگەر موقایەسەسان کەی لەگەڵ هیتلەر و فۆردی بە مسکین و فەقیر حیسابن.

١٦٧/٧

## جاڵجاڵۆکە!

چەندێ لەمەوپێش ڕۆژێ دیم؛ جاڵجاڵۆکەیە دەمی لە زگی جاڵجاڵۆکەیە نابوو، ئەیمژی وەکی مێش و حەشەراتی دی کە صەیدی ئەکا. موتەحەیر بووم. نەمدیبوو نەمبیستووە، بۆ یارانم باس کرد، عەجاییبیان ما. دوایە لە تەحقیقاتی بەححاسان دەرکەوت، کەمێ پاش فەرخەکردن، بە گژ نێریا ئەچێ، کەمێ مودافەعە ئەکا، مەغلووب ئەبێ، ژنی ئەیخوا.

حوکەمای ئەووەلین و ئاخرین ئیتیفاقیان هەیە، قووەتی ماددی تەواو ئەبێ، موتەناهییە، کە قووەت نەما، ئاسن وەك تاری عەنکەبووتی لێ دێ، سست ئەبێ لەبار یەك دێتە دەر، لە صنعەتی نەسیج زۆر ماهیرە. مومکینە بۆ بەشەر ئوستاز بووبێ، یەعنی لەویان ئیقتیباس کردبێ. وە ئەڵێن ئینسان گەلێ کاروبار لە حەیوانات فێربووە، جاڵجاڵۆکە بە صەبرە لەسەر

---

[1] فەوزییە کچی مەلیك فوئادی یەکەم، مەلیکی میصر (١٩٢١-٢٠١٣ز) لە ئەسکەندەرییەی میسر لەدایك بووە، لە ساڵی ١٩٣٩ بۆتە ژنی محەمەد ڕەزا پەهلەوی جێنشینی ئەوسای ئێران. لە ساڵی ١٩٤٨ لە هاوسەرەکەی جیا دەبێتەوە و مێرد بە عەقید ئیسماعیل شیرین دەکات کە لە ئامۆزاکانی خۆیان بووە.

برسیایەتی. بێ شك غەیری مێش و صەرصەرە و ئەمسالیان چیتر ناخوا، ئاو ناخواتەوە. لە موجەللاتی میصری دا خوێندمانەوە، کە مار موعەتتەل ئەکا، دەوری ئەتەنێ، زەبتی ئەکا. ئەمما ئەو نەوعە عەنکەبوتە لە وڵاتی مە نییە. تەتهیری بەیت لەخۆ و نسج ی زۆرباشە. حوکەما ئەڵێن: حاملی میقرۆبی سەرەتانە لە حەدیس یا لە ئەسەر ئیشارە ئەکات، گوایا شەیتانە!

(نسج)ی لە دەرکەی غار مەعلوم نییە ئەگەر بێ لازم نییە، هەمووی بە حورمەت بێ، دەری غاری هیجرەت ئەوەندە گەوەر نییە، زوو (نسج) ئەکرێ. هەرچی فیرعەون و قاروون و ئەمسالیانە، لە دروستکردنی بەیتێ وەکی بەیتی عەنکەبووت عاجزن، مەغروور نەدەبوون.

١٦٩/٧

## رکوع بۆ پاپ ئەبەن!

بەعزێ لە حوکەمای نەفس ئەڵێن: مەسیحی کۆنە بتپەرستن، ناوی ئیلاهەکانیان گۆڕی، بۆیە لەناو بتپەرستان، وا قبولکران، وە ئەکرێن. ئەورۆش ڕکوع بۆ پاپ ئەبەن بە خەلیفەی پۆلسی کۆنەجوو، ئەوانە هیچی لە خوا بزر نابن.

١٧٠/٧

## نوێژی سەرسەری!

لازمە موئمین زۆر بە جەلال و عەزەمەت و هەیبەت ناوی خوای بینی، ئەمما مع الاسف زۆر بە سووکی ناوی ئێنن، حەتتا وەکی ئەشتەو هەرامە و مەسەلەن (شیسمە) بوویتە مەداری کەلام! هەزار سوێندی درۆی پێ ئەخۆن، ئەمە سەبەبی چییە؟ لام وایە تەهلیلە موداخەلەیە زۆری بووە، سوئال پێکردنیش تەئسیرێ کەمی نییە، کە سطوەت و هەیبەتی کیبریائی لە دڵدا ڕاسیخ نەبێ، نوێژی سەرسەری، تەلەفوزی لیسانی فائیدەکی چەندانی نییە. عالەمێ زۆر مسوڵمان بوون، ئەمما تەربییەت و سەقافەت و ڕوحیان وەرنەگرت. سڕی ئیعتیقادیات و عەمەلیاتی تەئسیری تێنەکردن.

دوو تائیفە لە بەعزێ مەواقیع دەچنە جومعە، ئەساسەن خزمن، ڕوو لە

یەك قیبلە ئەکەن، کەچی لێك ئەمین نین (لا تفعلوا عن اسلحتكم) موقابیلی دوشمنی دین ڕاوەستاین، صلاە الخوف ئەکەن، جا ئەمە فائیدەی چ بوو؟ تەهلیل و خەتمە ئەکەن، قورئان ئەخوێنن، بە حەسەد و بوغز و عەداوەت و کیبرن، بە عیبادەت ئەیانەوێ ببنە مەعبوود.

١٧١/٧

## لەسەر ئەو عیززەتە ڕەزالەتی وەك من قبوڵ ئەكا؟

موتیع و مونقادین، سەر تەرەدودی بۆ کەس ناکەین، ڕکوع بۆ پاپ نابەین، جا پاپ کوو مسوڵمان ئەبێ؟ ئایا لەسەر ئەو عیززەتە ڕەزالەتی وەك من قبوڵ ئەکا؟مسوڵمانان بێ حورمەتی کەن؟ وای لە مسوڵمانان تەلقینیان بۆ ئەخوێنن، گۆیا مردی لەناو قەبر ئەبیبە وە تێی ئەگا. ئەمما ئەوانی زیندی نابیبەن، گوێی نادەتێ! بعد السؤال جواب ئەداتەوە: الله ربی، ومحمد نبی، والاسلام دینی، والقران إمامی، والكعبة قبلتی، والمؤمنات اخواتی. لەسەر ئەو حاڵەی تەماشای عەداوەت و بوغز و هەرەج و مەرەجیان کە لە کەعبە بیان نۆڕێ، ئیختیلافی مەزهەب و طەریق چی پێ کردینە با وجودی سوئال لە ئیمامی مەزهەب و طەریق نییە، لە ئوصول نە لە فروع. تەورات تەدوین کرا، دوایە فەوتا، شتەکی ما لە صدور، تێکەڵاوی حیکایەتیان کرد، خورافاتی کولێنانی بابلیان هێنا ناو، ئەمما ئینجیل تەدوین نەکرا، ئەوی ئێستا هەیە، سیەرێکی مەسیحە، ئەم و ئەو خڕیان کردیتەوە لای ڕاستی، چەپە..

١٧٣/٧

## ئاوی حەمامۆك و نەفتی باباگوڕگوڕ!

ئەمە زۆرە، دەوڵەمەندی نقە بووە، پاشان بوویتە موحتاجی لیلة العشاء، کەم کەس هەیە هەتا سەر دەوڵەمەند بێ، وە کەم کەسیش بە گوێرەی حاڵ هەتا سەر فەقیر بن. وکذا ڕزقی بەعزێ زیاد ئەکا، گوزەرانی واسیع و خۆش عەیشی بەعزێ تەنگ ئەکا، کەم ڕزق وەقتی

ڕائەبوێرێ، نەمردی نەژین، هەمووی داخلی (مشیەت)ە، دەوڵەمەندی خاصی بەعزێ نییە، وە فەقیری خاص بەعزێ زۆر فەقیر و تەنگ مەعیشەت تێکۆشیون، زۆر چووە بۆتە واسع الكرم.

دیمان دوێنێ لە کۆلیتێکدا بوو، ئینتسابی (شرکە)ی دوخانی کرد بووە ساحێبی کۆشك، پادشاهان لەسەر ئاورەنگی ئیقتیدار و حوکمداری نگونسار بوون کەوتنە مەزەڵەت و تەنگی. مەعیشەت و خاکساریی ئەمڕۆ گوزەران موشکیل بووە، ئاوروپایی بە گوزەران و سەروەت دەستخستن سەعییە بێ شومار ئەکەن، ئەو سەروەتی خوا بۆ عالەمی دانابووە، بە عیلم و عەمەل دەرئەخەن نەفت لە باباگوڕگوڕ ئەبەنە لەندەن و پاریس بە لوولە ئەڕوا تا کەناری بەحری سفید. سبحان الله لە یەك وەقت لێرە خەریك بوون، ئاوی حەمامۆك بە بۆڕیە بهێننە کۆیە، ئەوانیش خەریکی نەفتی باباگوڕگوڕ بوون، بۆ ساحیلی بەحری ببەن، ئی وان تەواو بوو، ئی ئێمە نەگەیشتە ناو شار! حاڵەش بە تەواوی چا نەبووە.

ئینسانیش ئەگەر پەیڕەوی عەقڵ و عیلمی عەمەلی بکا، سەروەت دەست ئەخا، ئەمما ئەوەی ئەفەرموون لە ڕیعایەتی مەسڵەحەت بۆ ئەمڕۆ تەوافوق ناکا. دەوڵەمەندی بۆ ئوممەتی موحەممەدی زۆر مەسڵەحەتە هیچ مەصالیحێ بێ سەروەت ڕێك ناکەوێ. ئەجانیب غایەت بە سەروەتن، بۆ تەعالی دەوڵەتی خۆیان،ماڵیان سەرف ئەکەن. بەعزە دانە گوڵەیە حەڕبی هەیە، بە چوار هەزار لیرە دروست ئەکرێ، ئێمە ناشکوری نەبێ، بە فەقیری بە عارددا چووینە خوار، سەراوژێر و نغرۆ بووین، ئەوانی زەمی دنیایان کرد، بە وەجهێ غەلەت ئوممەتیان تێگەیاند، خەتەئیان کرد. بەڵێ ئێوە بگەڕێن لە ئەرزی خوای واسیعە خوا بە ئەحوالتان ئەزانێ، دەری ڕزقی زۆرە، ئەیکاتەوە.

١٧٨/٧

## لە نێوان عومەر و صەلاحەددین و قائیدی فرانسە!

لازم بوو ئەوی بلێ مسولمانم، ئیفتیخار بە ئیستلای عومەری، وە عەدالەتی عومەری، وە معامەلەی عومەری بکا. عەدلی عومەری وە سیاسەتی عومەری وە حوسنی ئیتباعی صەلاحی بۆ ئێمە زۆر بە کەڵك هات. کە قائیدی فڕەنسە داخیلی شام بوو لە حەربی عوزما، وتی: معامەلەی عومەری و صەلاحی[1] دەرحەق نەصارا چۆن بووە، ئەمڕۆ منیش معامەلەی وا لە حەق مسولمانان ئەکەم.

١٨٤/٧

## کلکەتەشی!

دەرحەق بە زوعەفایان تەماشای دەوری دولابی فەلەك کە لە تەئریخی ئەنام چ تەقەللوباتێ ڕووی داوە؟ چەند دەوڵەت زەلیل بوون کەوتینە ژێر نیری ئەجنەبی، پاشان کوو قوتاربوون، چیان کردییە؟ بە چ سەعییە؟ بە چ غیرەتێ؟ بە چ صەبرێ؟ بە چ مەتانەتێ؟ بە چ تەدبیرێ؟ بە چ سیاسەتێ؟ ئەمما ئەمڕۆ نەجاتبوون زۆر موشکیلە، دەوڵەتەکانی غالب زۆر بەقووەتن، بە ئیحتیراسن، بە (تیقظ)ن، ئالات و ئەدەواتی حەربی عەصری لە دەست گیرۆدەکاندا نییە، وەکی حیزبوز بە ڕەحمەت بێ ئەیوت: غاندی بە کلکە تەشی موقابەلەی تەیارە و مودافیع و ئوستوڵی بەریتانیای ئەکا؟

١٨٥/٧

---

(١) مەبەستی صەلاحەددینی ئەییوبییە.

## فاسقی ئێستا!

لە سەدری ئیسلامەتی موئمینی فاسق حاشا! ئەمما لە ئەییامی ئێمە زۆر فاسق هەن، لە کافران خراپترن، زەرەریان بۆ ئوممەت و میللەت و مولك و دەوڵەت و وەتەن لە کافران زیاترە. نازانم ئەوانە کوو داخیلی زومرەی ئەهلی سوننەت وجەماعەت ئەبن؟ لەژێر ئاڵای شێخی ئەشعەری حەشر ئەکرێن؟ مع أنه من لام خۆش نییە بچنە بەهەشت، چ زەرەریان بۆ ئێمە نابێ، خوای تەعالان مۆهڵەتیان نەدا، زوو موعاقەبەیان بکا، بۆ وانیش و بۆ مسوڵمانانیش خێرە. ئەوان کەمتر گوناه ئەکەن، مسوڵمانان زێتر لە شەڕیان ئەمین ئەبن.

١٨٩/٧

## باسی هاوکوفی و سوکنەت بەخشین لە هاوسەرگیری!

ئەووەڵەن بە موافەقەی مەیل و مەشرەب، ثانیەن بە جحێلی، ثالیثەن بە جوانی، ڕابیعەن بە گوزەرانی موافیقی حاڵ. واقیعەن مەداری سکونەت ڕازی بوون بە یەکدینە. لاکین مع الاسف فەوقی کەم بووە. توخوا پیاوێ بە شەوکەت مەیلی سکونی لەگەڵ ژنێ ناشیرین ئەبێ؟ کچێ چواردە ساڵە بە پیرە ئوفتان ئارام ئەگرێ؟

چەند لەمەو پێش، شەوێ لە ڕادیۆ زاتێ میصری دائیر بە سکونەتی ژن و مێرد نوتقەکی زۆر پڕ حیکمەتی دا، شایانی نووسینەوە بوو، ئەگەر لە جەرائید و موجەلـلە ببینم، ئەینووسمەوە.

١٩١/٧

## زمانی کوردی!

ئەسنافی بەشەر زوبانیان موختەلیفە، زۆریان دەنین، بێ قەواعیدن، قسمەکیان ڕاقین، شوکری بەعزێ ئەورووپایی ئەکەین. لیسانی کوردیش بە لیسانێ زیندووی ڕاقی حیساب ئەکەن، واقیعەن بە قەواعیدە، لاکین

مەوادیَ زۆری زایع بووە. ئەوەی لە دەست لادێیان مابیَ مایە، ئی کەوتە ناو مەلایان فەوتا. هەتا ناشکوری نەبیَ گەلێکی ئیفادە و ئیستیفادەی پێوە نەهێشترایە، حەتتا کوللی قەومیَ زوبانیان شێوەی لێك جودایە، دوو ئینسان وەك یەك قسە ناکەن، ئیختیلافی لیسان و لەون، دەخلی ئەوزاعی ئەرز و ئاسمانی تیایە، ئەگەرچی قائیم بە بەدەنە، ئەمما بە ئافاقی حیسابە.
۱۹۲/۷

## کارەبا!

ئەوائیل لە بەرق چییان نەدەزانی، حوکەما ئەیانکردە (ادخن) ەو (مدخن) ە، تاوەکوو لەو ئەواخیرە قووەتی بەرقی ئەلەکتریکی کەهرەبائی کەشف کرا، دونیای پیَ مونەووەر بوو. شەوی پیَ ئەکەنە ڕۆژ، وە لە گەلیَ ئوموری هاممە ئیستیخدامی ئەکەن، لەو سەر و ئەو سەری دونیا حەوادیسی پیَ ئەزانن. دەرکەوت ئەمە لە دووکەڵ و زەنگەسوورە و کلکی گا نییە، ئەوانەی ئێمە با خەریکی ئیعراب بن، ناشکوری نەبیَ لە تەرکیب و نەزمی کائینات نە مەفعولیَ، نە مەعلولیَ، نە فیعلیَ، نە قووەتیَ نەبوو.

بە قووەی عەقڵ ئەزاندریَ، ئیستیحصالی قووەی کەهرەبایی، تەرکیبی سەحاب، باران بارین، چ قووەت و قودرەت و تەدبیرێکی ئەویَ؟! ئەگەر عەقڵ نەبا، بەرق چۆن کەشف ئەکرا؟ ئەمە شاهیدییە لە تەرەف خوا کە ئەو حوکەمایانە عاقڵن، ئەفەندی مەش ئەڵیَ: فلان وەلی ئەمری کردە هەور: ببارە. باری. مەبارە، نابارێ!

ئەڵێن باران بە ئەمری شێخ ئەباری
بە ئەمری (کن، فکان) وەك ئەمری باری!
ئەمەش ئەصفیایەکانی ئێمەن!

۱۹۳/۷

## دین و عەقڵ!

دین بۆ بەشەر لە ئوموری فیترپیە، حەیاتی ئیجتیماعی بێ دین نابێ، وەکی حوکەما ئەفەرمون: (مدنی الطبع بێ قاعیدە و قانوون و تەعاون و تەوافوق ناژین). هەرکەس بە دوای هەوا بکەوێ، هەر کەس عەقڵی خۆی لا پەسەندە بێ، حەیاتی مەدەنی کوو ئەبێ؟ حەتتا حەیوانات کە بە هەیئەتی ئیجتیماعی بژین، بێ دین نابن، وەکی نەحل و نەمل و ئەرزە.

گەلێ کەس کەوتنە فیکری ئیلغای دین، وە حەتتا جەمعێ موتەقەددیمین ئەڵێن: عەقڵ موستەغنییە لە بەعثی ڕەسوول بۆ وەزعی دین.

ئەمما غەلەتن. شارەزای ئەحواڵاتی بەشەر نین. دوایە ڕیجالی سیاسەت و تەدبیر، حەتتا وەك (هندن بونح، مۆسۆلین، هیتلەر) لە عەباقیری عەصر تێگەیشتن. حەیاتی بەشەری حەتتا حەیاتی سیاسی بێ دین نابی. ئەمما مع الاسف دینێ وا لە ئەوروپای دانەبوو، بە دین حیساب بێ. دینی ئیسلام فی الحقیقە دینێ فیترِی، پاکە، بێ مەیلە، دینی سەعی و عەمەلە، دینی ڕەحمەت و فەزڵ و شەرەف و ناموس و ویقارو نەباهەتە، لایەقی ئینسانی ئینسانە، حافیزی کەرامەتی ژنانە، دینی مەردانە، دینی ژیانە، ژیانی خۆش و وەسەت، بێ ئیفرات و تەفریت، تەجاوز لە تەبیعەت ئەکا. دین لەگەڵ تەبیعەت ضید بێ ناژیە، دەوام ناکا. دینی تەوسیع دانە، مەیلی علی کیفك دین نییە، ئەگەر دەخائیل تێکەڵاوی دینی ئیسلام نەکرابا، تا ئەبەد موصەوین و بێ خەلەل ئەمما، ئەبووە مەعشووقی بەشەر.
١٩٩/٧

## مەزهەبی شافیعی!

عولەما و ڕوئەسای ئەدیان دین ئەکەنە ماکینەی تضیق، ئەها ئەو قسەی مەکە کافر ئەبی، بنۆڕە کوتوبی حەنەفیان، ئەگەر وا بی، مسوڵمان لە ڕووی عەردی نییە، ئەها ئەوە گوناهە، حەرامە، ئەگەر وابی، صالحی تازە ڕۆییوە. عوەیصاتی ئیعتیقادیات ئەبی لات وا بی، ڕەببی چبکەم؟

ناچتە دەماغ، عەقڵ هەڵی ناگرێ، مەخۆ، مەخۆوە، تەماشاکە، بگری، هەر دەبن عاردی خۆت عەزاب دە، وە ئیللا لە قیامەت مەحرووم ئەبی.

ئاخیری لەبەر تضیق ئینقلاق ئەکا (رغم انفهم) لە دین دەردەچن! گەلێ جار لەسەر دروسی فەقێیان ئەڵێم: بەعزێ زەواتێ بە سێ مەسئەلە مەزهەبی شافیعییان ئینقراز پێدا.

١-ئیقتیدای نییەت لە نوێژ.

٢-عەدالەت لە نیکاح.

٣-ڕوئیەت لە بەیع.

مەزهەبێ نوێژ و نیکاح و بەیعی پێ نەکرێ، چی پێ ئەکرێ؟

٢٠١/٧

## هیچ مەزهەبی!

ئەبا تەبەقەیە لە ئەهلی عیلم هەبا، نیسبەتیان لەگەڵ هیچ مەزهەبێ نەبا، مسوڵمانان و مەلای مسوڵمانان. ئەوە سەیرە ئەوانی ئێمە بە موعتەزیلییان ئەڵێن ئەصحابی بیدەع و ئەهوا، ئەمما ئەوان ئێمە زێتر دوور ئەخەنەوە، لە سوننەت و ئەتباعی کیتاب. خۆزی مەلایان نەزەر بە ئیختیلافی مەلایانی پێش خۆیان فەرمووبایان: (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ) با ئێمە سەعی کەین، لە ویفاق و ئەتباعی (ما هو الالیق والاوفق) بێ تەعەصوب بۆ ئیمامی ڕەئسەن.

نازانم لە عاقیبەتی ئیختیلاف نەفکرین؟ بەڵام مەیلی شیقاق و خیلاف، بەناوی تەعەصوبی دین کە قووەتی بەست، جێی تەئەممول و تەفەککور، عاقیبەت ئەندێشەیی نایەڵی، سەوقی ئەکا، بۆ مەیدانی حەرب، چ حەرب؟ حەربێ خانەگی، شەڕی خۆبەخۆیی. حەیف و سەد حەیف بۆ قەومێ، ساحێبی ئەو دین و کیتابە بن، وا موتەفەریق و پەراگەندە بوون! ڕیجالەکانی بێ قووەت و هێز بوون، تاکو (علی رغم) ی ئیبن عەبباس بە دەست ئەورووپاییان، فحولەکان خەسان، ئەلئانیش ئەڵێن (اختلاف امتی رحمة) ئەوە نەوعێکە لە تەبدیلی خەلقی خوا.

ئەمما حەقائیق تەبەددول ناکا، هەموو عالەم سەجدە بۆ گاجووت ببا، بڵێن: ئەوە خوایە، خالیقی ئەرز و سەمایە! نابێ بە خوا، هەر گاجووتە، سەری بڕە، گۆشتی بکە شفتە و کفتە! بە مەلایەتی بە ویلایەت بە مەلەکی بە نبووەت بە ڕیسالەت ئینسان تەبەددول ناکا، هەر ئینسانە، لە قەواعیدی عاممەی بەشەری دەرناچی، سەد هەزار جاری بڵێ: علمه کعلم الله، عیلمی نابێتە وەك عیلمی، عیلمی هەموو عالەم نەزەڕ بە عیلمی خوای (لاشيء)ــە، ئیحتیاجی بە ئەکل و شەرب هەیە، ئەخەوێ، ئەکەوێ، ڕاست نابێتەوە، ئەمرێ.

٢٠٢٠/٧

## مەلای وا هەیە، بە چلەی بەهارێ، تێر ماستی ترش ناخوا!

ئافرەتێ ئەلئان لە میصرە، بەعزێ ئەڵێن: کوردە، بەعزێ ئەڵێن ئێرانییە. شەو بە سەد لیرە ڕەقس ئەکا. ئەمڕۆ مەلایە خەریکی تەدریس و تەفسیر و خدمەتی دین بی، ڕزقی نابێ. بەڵکو ئی هەیەتی ئەیدزن. حکومەت و میللەت خەریکی نان برینینی، لە ئینقیلابی ئیستیعمالی تووتن، بەعزە کەسێ ڕووت و ڕەجال ئینتیسابی ساحێبی مەعمەلەکانیان کرد، بە موددەیە کەم دەوڵەمەند بوون، شەق شەقانێ بە دیناران ئەکەن. مەلای واش هەیە، بە چلەی بەهارێ، تێر ماستی ترش ناخوا.

عەرەب بە چی دەوڵەمەند بوون؟ بە جیهاد، بە زەڕبی شیر، کنوزی ڕۆم و فارسیان تاراج کرد. حەقیقەتەن ئەمە لە سایەی دینی ئیسلام و قورئان بوو.

٢٠٤/٧

## فەساد تۆغیانی کردیە!

ئەمڕۆ فەساد لە بەڕ و بەحر و هەوا تۆغیانی کردیە، کوڕڕەی ئەرز لە ئیزتیڕابە. نازانین چی بەسەر دێ، عالەم زەندەقی چووە لە حەڕب،

مۆسـۆلینی دیکتـاتۆری ئیتالْیـا، هیـتلەری ڕوحـی حەماسـەتی ئەڵمانیـا بـۆ حەرب پێکۆڵیانە، قەلب لە خەفقان دایە.

٢٠٧/٧

## لە خۆشی گوڵەجۆیەك دەستیان كرد بە صەلاوات!

ساڵێ لە کۆیە، کەمێ دەغـڵ شـین بـوو، وا نەبـوو، زۆر بە بەهـا بـێ. ئەمما سەغڵەت بوون لەبەر فەقر، دەغڵی کۆن هاتبووە بڕان، ئی نوێ پـێ نەگەیشتبوو. ڕۆژێ لە مزگەوتی گەورە خەریکی دەرسی فەقێیـان بـووم، هایو هو و هەلهەلە و بانگی صەلاوات لە بازاڕ ئەهات، عەجایب ئەوە چ قەوماوە؟!

فەقێیەکم نارد، هاتەوە وتی: یەکێ گـوڵە جـۆیەکی هێنـایە، مەخلـوق دەورەیان لێدایە، لە خۆشیان وا بانگ و صەلاوات لێ دەدەن!

٢١٠/٧

## چنارۆك و بن پێمەڕەی ڕەزان!

زۆر وا دەبێ لە زەمـانی بـێ بـارانی، هەور دێـن و دەچـن. ئەووەڵەن ئومێدێ پەیا ئەبێ، کە تێپەڕی نائومێد ئەبن، وهاکەذا میرارەن تـا هەورێ دێ بارانی پێوەیە، بە عەلائیم نەختێ ئەزانـرێ. ئەممـا چـونکی زۆر جـار هەور هاتییە، ڕۆیشتییە، نەبارییە، باز بێ ئومێد بوون، حەتتا نەیکاتە ڕێژنە، دغـدغەیان لە دڵ، گرژیـان لە ڕوو نـابڕێ، کە ئەو جـارەی بـوو ئەوجـا ئەڵێن: ئۆخەی خوایە هەزار جار شوکر لە گەلێ وڵات قوربانییان ئەکەن. من خۆم ئەو حاڵەتەم گەلێ جار دیوە، سێ بەهار پێش ئەم بەهارە بارانێ بوو، هەور دەهـات و دەچـوو، گـوێی گەیانـدە عەردی هـیچ نەدەبـاری. ڕۆژێ موهەییەئـ بووین بچینە چنارۆك بۆ بن پێمەڕەی ڕەزان.

وتم: نورەددین ئەمڕۆ هەورێکی تیرە وا بزانم ئەبارێ.

وتی: کاکە ئەورۆژ وەکی ڕۆژان دێ و دەڕوا.

بە قەڵەباڵغی چووین دەستمان پێکرد، باران تەك و توو ئەهاتە خوار.

وتمان: چ نییە ناکا دەستی پێکرد، دایکوتا باران، ئەمما باران! پەنامان

بردە بەر کۆلیتی ڕەزەوان، وە ئیللا زۆر پەرێشان ئەبووین. باران دنیای زیندی کردەوە، بیستم لە کەرکووك چەند حەیوانیان کردبووە خێر و سەدەقە. ئێمەش چونکە بە فەلاحەت گوزەران دەکەین لەو ئەحواڵاتە ئاگادارین.

٢١١/٧

## کەرکووکی و حەکایەتی عەنتەر!

فی الحقیقە عەصرێکە، ئوممەتی مەرصوصە لەو حاڵە دایە، مەشغوڵن بە حەکایات و خورافات و حەکایات و کیراما، واعیز ئەگەر بە مەیلی وان بێ، دەوری لێ ئەدەن، گوێی لێ ڕائەگرن، وەکی کەرکووکییان کە بە گیان و ڕوح گوێ لە حیکایاتی عەنتەر ڕائەگرن. پەچاغی یدی یوز باطمان، ئەدی ئەدی قوربان ئۆلەم سەنە.[1] خۆ حیکایاتی ئەولیایان سەد هەزار هەندی ئایات و ئەحادیس پێ خۆشترە، ئەبەدەن گوێیان لە حەقائیق نییە، حەتتا ئەوانی مونەوویرن، بە ئەنواعی لەهوو وەقت بەسەر ئەبەن، عیلم و عیرفانە کە بە خۆڕایی ئەڕوا. ئان زیادە عیلم و مەعاشیان بە قومار ئەدۆڕێنن.

٢١٨/٧

## ئیمان بە ئەولیا!

بزانن ئیمان بە ئەولیا چی لە مسوڵمانان کرد، حەتتا مەلای زۆر مەلا، عەقڵ و عیلم و شەرعیان لێ گوم ئەبێ، ئەو مەلایانە قسەیان نافذ بووە، مع موافقە المیول، زۆر بە مومکین لە دەماغیان دا جێی گرتییە. خوا ئەزانێ من ئیمانم هەیە بە کەڕامەت، ئەمما بە ئەندازە، مەحاڵ بە هیچ وەجهـ نایەتە وقوع، وە ئیللا ئیش لە ئەساسەن تێك ئەچێ. ئەمما مع

---

(١) چەقۆیەکی حەفتسەد گرانی، بیم قوربانی تۆ.

الاسف غافلن. ئەمڕۆ قسەکردن لە حەلاڵ و حەرامی ئەغانی فەزیلەیە، عالەم مەفتونیەتی چی بڵێن؟ لە میصر ئوم کەلسوم ئەخوێنێ بە ڕادیۆ لە کۆیە گوێمان لێیە. وە ئەسڵ لە ئەشیا ئیباحەیە، ئەگەر عاریزێ بوو، حوکم بە گوێرەی عاریزە، کە ئەبێ موحەققەق حوکمێ موقابیلی فیترەت دادەنرێ، خۆی ناگرێ. تەتبیقاتیان لەسەر ژنان کرد، ئاخیری دەرچوون، کاسیاتی عاریات لەگەڵ ملوك و عوزەما و ئەعالی لە مەقاماتی ڕەفیعە دادەنیشن. بنۆڕە مائیدەی مەلیك فارووق و شاپووری.

٢١٩/٧

## وەعز بە کوردی!

وەعز مەعنای ئەزاندرێ، ئەمما بە کوردی نازانم چۆن تەعبیری بدەمەوە؟ ئەگەرچی خۆشم واعیزێ زۆر نایابم، قسەکانم هەموو حیکمەتە، لغو الحدیث و لهو الحدیث نییە. ئەمما مع الاسف با بردی، نەچووە گوێیان.

٢٢٢/٧

## قەبیحی جاران، ئەمڕۆ جوانە!

ئەوی جاران لامان زۆر قەبیح بوو، ئێستا زۆر جوانە. لە موجەلـلەیە میصری تەماشای صورەتی شاپووری ئەکەی- بعد النکاح- دەستی فەوزیە ماچ ئەکا، مەلیك فارووقیش ڕاوەستایە تەبەسسوم ئەکا. ئێمە کە ئەینۆڕینێ گرژ ئەبین، دڵمان سەخڵەت ئەبێ، مووچڕکمان بە بەدەنی دادێ، لامان زۆر ناشیرینە، لای ئەورووپاییان و ئەوانەی موتەئەسیرن بە ئادابی، ئەمڕۆ پێیان زۆر جوانە.

٢٢٥/٧

## ئیمام ئەشیرێنێ!

لە زەمانی سابق یەکێ لە بەگزادانی جاف هاتە کۆیە، حاجی حەسەن ئەفەندی سلێمانی قائیمقام بوو، دەعوەتی بۆ کرد. ئێوارە ئیمەشی بانگ کرد پاشی جەماعەت، قائیمقام لەزگ بوو مەدحی من لای بەگ بکا، وتی: قوربان حاجەت ناکا! لە ئیمامەتییەکەی زاناندم مەلایە.

بەعزێ هەن دوو کەس لە تەکیانە ئیمام ئەشیرێنێ یەك بە خۆی، دنیایە پڕ ئەکا، گوێ کەڕ ئەکا، ئەو زاتە بە قەدەر کیفایەتی ئێمە، لە فاتیحە و سوورەت دەنگی بەرزکرد، نەیکرد بە هەرا هەرا.

٢٢٧/٧

## ئەدیسۆن و حەزرەتی موسا!

بنۆڕنە عولەمای تەبیعەت چییان کرد؟ چییان دەرخست؟ ئەو تەحەممول و صەبر و سەباتە، حەقیقەتەن شایانی تەقدیرە، بە بن بەحران دا دەڕۆن، بە هەوادا دەفڕن، بە کەهرەبا دنیایان مونەووەر کرد، بە ڕۆنتکین کەشفی دەروونی بەشەریان کرد. ئێمە خەریکی چین؟ سەد خۆزی بە ئەهالی چین! بابی و بەهائی و قادیانی، دینی تازە و ڕەسوولی نوێ؟ توخوا شەرم ناکەن؟

ئەتوانم سوێند بخۆم، ئەمڕۆ خوا موسای کردبا بە ڕەسوول تا ئایاتی فەوقی ئیختیراعاتی ئەدیسۆن و ئەمسالی نەدابایە قبوڵی نەئەکرد، بە درۆ و دەلەسە و خەیاڵات و خەونی پیرێژنانە قابیلی ئەو عولەمایانەی صونع و ئیختیراع، دەعوای ڕیسالەت ئەکەن؟ یارەبی لەسەر حەماقەتی وانە، ئینسان کو صەبر ئەکا، لەبەر غایەتێ بێ حەیایی نەبێ، ئەوانە کوو ناتاوێنەوە؟ من ئەوا وەختە بتلێمەوە!

٢٢٣/٧

## بە عمومی وا ئەخەڵەتێن!

ئەوەی ئەڵێ من تکات بۆ ئەکەم، یان فڵان نەجاتت ئەدا، چووزانن؟ بە ئیمان بە قیامەت لە دڵیاندا ڕاسیخە، نە تەصویر و تەصەووری شیددەتی هەولی ئەکەن، عالەمیش لە حاڵی دونیایان غافڵە. ئەویٚ ساڵێ بۆنبەردومان کراین، موتەعەهیدەکانی قیامەت پێش هەموو کەس، هەر ڕایان ئەکردە کونان! عیلمی قیامەت بەس لای خوایە، عائیدی خوایە، بە قسەی کەززابەکانی جەللاب هەڵمەخەڵەتێن.

ئیلاهی بۆچی مسوڵمانان گوێیان لەو قورئانە نییە؟ بە عمومی وا ئەخەڵەتێن.

٢٣٤/٧

## مەلیکە فەریدە!

مەلیکە فەریدە هاتە زان، خەبەریان دابوو، کوڕی ئەبێ دوایە بە کچ دەرچووا لە ساحێبی موجەللەیە سوئالیان کرد، بۆ ئەمە وابوو؟

وتی: ئەووەلی بە ڕۆنتکین تەماشایان کرد، وایانزانی کوڕە، کە هاتە دەر، وا نەبوو.

ساحێبی موجەللە ئەڵێ: بە ڕۆنتکین نازاندرێ، *ما فی الرحم* کوڕە، یا کچە، چونکە وەزعییەتی منداڵەکە وا نییە، ناوگەڵانی کەشف بکرێ، بزانن چی پێوەیە.

٢٣٥/٧

## کۆیی لە هندستان مردن!

حاجی ئەڵێ:

ئەمین مەبە لە سبەینێ، ئەوەت بەسەر دێنێ\
حەوادیساتی زەمانە، کە نایەتە تەخمینێ!

بە خەیاڵی کێ دا دەهات کۆیی لە هیندستان لە سربیا، لە عالیچا بمرن؟ ئوسترالیایی، ئیرلەندی لە کوردستان لە ئێران بکوژرێن؟

۲۳۵/۷

## حیکایەتی لوقمان و مەجیدی برازام!

ومن العجائب، حیکایەتێ لە لوقمان نەقل ئەکەن، کەئەننەهـو پیاوێ تەبیب بووە، جارێ چوویتە شارێ، وایان گومان بردیە کە جاسووسە، هاویشتیانەتە زیندان، سەریان گرت، سەری بوو بە مەزبەلە، لە خاطر و خەیاڵی کەسدا نەما. پاش سەد ساڵ حوکمداری مەملەکەت تووشی دەردێ دەبێ لە گەرووی، چارەیان پێ نەکرێ، بەو موناسەبە پیر و پێشینان ئەڵێن: زاتێ بوو ناو لوقمان، دقتۆری چا بوو، ئەگەر مابا عیلاجی حوکمداری پێ ئەکرا.

ئەڵێن: شەخسێ لە تەئریخێ قەدیم هاتە ئێرە وایان زانی جاسووسە، فڕێیاندا ناو زیندان، ئایا ئەو زیندانە لە کوێیە؟ شوێنی هەیە؟ نییە؟ تەحەڕڕی ئەکەن ئەیدۆزنەوە، یەکێ ئەچێتە ناو زیندان، ئەبینی لە لا پەڕێ شەخسێکی تیا ڕاکشایە، پیستەکی لە پشت سەرییە، شتێکی لێ نووسرایە، پێستەکەی هێنا دەر، خوندیانەوە: ئەی پاشای ئەو عەصرە، تۆ تووشی بەڵایە ئەبی، بە من نەبێ چارەت ناکرێ، ئەمن هەر وا مەینە دەر، وە ئیللا ئەمرم.

لە وەقتی خۆی بەعزە تەرتیباتیان بۆ تەحریر ئەکا، تا بە گوێرە ڕەفتار بکەن، وە کردیان، لوقمان بەخۆ دێتەوە، پاش چەند ڕۆژێ دێتەوە سەر خۆی، موباشەرەت ئەکا، بە تەداوی مەلیك، عەرزیان ئەکا: چارەی تۆ بە خوێنی کوڕت نەبێ ناکرێ!

ئەویش تاقە کوڕێکی هەیە، لە ڕوحی خۆی خۆشتری دەوێ. دەڵێ: ئەمە قەت نابێ، با هەزار جار من بمرم، ئەمما کوڕەکەم بمێنێ.

ئاخری بە بەری دا دەکەون: شوکر گەنجی، تۆ سەلامەت بی ئینشائەڵلا کوڕی دیت زۆر ئەبن.

حاصلی ئیقناعی ئەکەن، لوقمان بە کوڕەکەی ئەڵێ: مەترسە، تۆ سەر

نابرم، لە پەنا ڕا گیسکێکی بێنن، کە کێردم پێدا هێنا تۆ بزیرڕێنە، لە مەوقیعێ نزیك مەلیك.

کە گیسکەکە سەر ئەبڕێ کوڕەکە لە زریکژن ئەدا، هاوار ئەکا: ئەی بابە هاوار!

حوکمدار لە تاوا بە کەمالی قووەت صەیحەکی لێ ئەدا، پارچە گۆشتەکی بە قەدەری هەناری، لە گەرووی دەردەپەڕێ، ئەکەوێ بە بێ هۆش. لوقمان خوونی گیسکەکەی لێ ئەدا، حوکمدار بەخۆ دێتەوە، ئیستیراحەت ئەکا وردە وردە بۆ صیحەت ئەڕوا، ئەمما زۆر موکەددەرە ئەگریە لەبەر کوڕەکەی ئارامی نییە.

بەعدەهو لوقمان بە صورەتێ کە فوجائی نەبێ –نەك شادی مەرگ بێ- تێئەگەیەنێ، کە کوڕەکەی مایە، سەد هەزار شوکر، سەد هەزار خۆشی! ئەوجا سیرڕی تێگەیاندن: قووەتێ وا هائیل نەبا ئەو پارە گۆشتە لە گەرووی نەدەهاتە دەر، موحەریکی مەلیك بۆ قووەتی وا، بە غەیری زیرەی کوڕی، لە وەقتی سەربڕینی تەصەوور نەدەکرا! بۆیە ئەو حیلەم کرد.

جا بزانە سورەیی لوقمان، ئاخیری ئەو ئایەتە، حیکایەتی ئەم حیکایەتە، بە خوای حەیف بۆ مسوڵمانان، بۆ بیستنی قورئان کەڕ بوون، بۆ (لغو الحدیث ولهو الحدیث) گوێی خۆیان کلۆر کردووە! وەقتێ ئێرەم ئەنووسی، شتێ پێش نوێژی نیوەڕۆ بوو، مەجیدی برازام هات وتی: ئەمر درا ئاڵای داخەنە خوار. ئەما ئەڵێن عەلامەتی ماتەمە، سرڕییە، نازانین چ قەوماوە، هەندە نەچوو، هاتەوە و وتی: مەلیك غازی ئەمشەو گۆیا لە قصر الزهور سواری سەییارە بوو، بە دیرەگەیەکی کەهرەبائی دەکەوێتە بەر شەرارەی کەهرەبائی پارچە پارچە بووە.

دوێنێ کێ ئەیزانی وا ئەقەومێ؟ بەو نەوعە غازی نەوجەوان، ئەڕوا و مەحوو ئەبێتەوە، ئیمانم زۆر بەقووەتە، غەیب خوا نەبێ بە عیلمێ موافقی جازم بێ ئیحتیمال کەس نایزانێ. ئەوی میفتاحی هەبێ ئەزاندرێ، وەکی کسوف و خسوف و ئەشباهی، ئەمما ئەوەی میفتاحی نەبێ، وەکی شفرەیێ بێ میفتاح نازاندرێ.

۲۳٦/۷

## تەتەجاف و تەتەبڵباس!

مەشهووره مەلایە هیجرەت ئەکا لەناو جافان، دێتە ناو بڵباسان لای ئاغایە دادەمەزرێ، هەموو ئێوارە پاش نوێژی مەغریب، سوورەی سەجدە ئەخوێنێ، کە لە سەجدە سەر هەڵ ئەگرێ ئایەتی (تتجافی ....)[1] ئەخوێنێ، کە ئاغای گوێی لێیە، پاش یەك دووساڵ ئاغا ئەڵێ: مەلا ئەوە موددەیە کە لای ئێمەی، زۆرت خدمەت ئەکەین، ئەتوو بۆچی هەر ئەڵێی تتجافی، جارێ ناڵێی تەتەبڵباسا!؟

٢٤٤/٧

## عاقیبەتی عێراق!

تەفسیری سوورەتی سەجدە تەواو بوو، ڕۆژی پێنج شەموو، وەقتی عەصر با وجودی دڵم زۆر مشەووەش بوو لەبەر حەوادیس و وەقائیعی ناخۆش، نازانین عاقیبەتی عێراق چی لێ دێ؟ خودا بە ڕەحمی خۆی ئەو فیتنە بەر تەرەف کا، ئامین، ١٥ی صەفەر، ٢٤ی مارتی ڕۆمی سەنەی قەمەری [2]١٣٥٨، شەرقی ١٣١٨.

٢٤٧/٧

---

(١) مەبەستی ئەم ئایەتەیە(تتجافی جنوبهم عن المضاجع..... سورەتی السجدة/١٦

(٢) دەکاتە ١٩٣٩/٤/٦ی میلادی

## جاندرمە و بێ ئاگایی قەلب!

فی الحقیقة قەلب لە ئوموری موعتادە زۆر بێ ئاگایە، ئێستا سوێند وەکی بەعزێ کەلیمە، هەرامە، هین، عەیب نەبێ، بیلا مەعنایەکی، ئیشتە، شیسمە، بەسەر زوباندا دێ، قەلب هیچ ئاگای لێ نییە. حەتتا ئەگەر بە ئاگاداری قسان بکا و ئارەزوو کا، ئەو کەلیمەی مەداری کەلامە تەرکی ئەکا، غایەت لەسەری گران دێ، بەڵکو و ناتوانی قسە بکا، ئیتر لازمە ئینسان لە ئەووەڵەوە ئاگادار بێ وە ئیللا ئەڕوا. مامۆستا مەلا ئەحمەد ئەیفەرموو: جاندرمەیە هەبوو *ئۆندەن صۆری* مەداری قسانی بوو، حەتتا کە نوێژی دادەبەست الله اکبر ئۆندەن صۆرە.

٢٥١/٧

## دختۆری بەغدایێ!

ڕۆژێ لە بەغدا نۆڕیمە تاهیری موعتەمیدم وە فەقێ عەبدوڵڵای خۆشەویستم، زۆر لاواز و تێك چووم هاتنە بەرچاو، بردمنە لای دقتور شوکری محمد، موعاینەی کردن! وتی: ئیصابەت کرد، هیناتن، یەك دوو خطوەیان مابوو بۆ مەرەضی عیلاجی ناپەزیر.

حەقیقەتەن بەعزێ تەرتیبات چابوون، شوکر هاتنەوە سەرخۆ.

٢٥٦/٧

## قسەی بەر ئاگردان تاوێ یەکانە جیاوازە!

هەر کەس لە شێنەیی ئەتوانی بڵێ : وا ئەکەم، من وام، وە چی وە چی!

وەکی کوردی ئەڵێ: قسەی بەر ئاگردانی تاوێ یەکانەی جیاوەز. ئینکاری شیددەت و زوعفی ئیمان ناکرێ، جێی کەثرەت و قیللەت بە ئیعتیباری (مؤمن بە) نییە. گەلێ کەس خۆی بە موئمینێ قەوی ئەزانێ، خصوص ئیمان بە ئەجەل یەکە و دوو نییە، مومکینە تەئلیفاتی هەبێ، لە

ئیعتیقادیان، ئەمما کە حەرب دامەزرا، گرم و هۆڕی تۆپان هات، دانەی (شەرانبیل) تەقییەوە، بۆمبا ئینفیلاقی کرد، ئیمانی ئەبێ بە هەبا. ئەجەلی چی؟ هەڵێ بە پەنا و پێچان، خۆ بشارەوە لە کونە شاخان، ئیمان بە عەمەلیان قووەت زیاد ئەکا، بە نەزەرڕییات تەواو نییە، خوایە لێمان نەقەومێ!

٢٥٩/٧

## عەزیزی بێ قووەت نابێ!

با ئەورادی ئەئیممە و ڕیجالی غەیب، ئەقتاب و ئەوتاد بە هانای مسوڵمانان بێن، ئەڵێن: ئیتالیا مندالە مسوڵمانان لە تەیارە فڕێ ئەدەن. ئەڵێن: با موحەممەد بە فریادیان بگا. ئەوەیان غەدرە، موحەممەد و ئەتباعی ڕاستی موحەممەد قەت وایان نەگوتیە، ئەتباعی تەریقیش لەبەر شێخەکان ناوی رسول الله یان گوم کردیە، لە خوا و ڕەسوولی خوا و کیتابی خوا، وەرئەگیرێ مەدار، قووەت، عەزیزی بێ قووەت نابێ.
٢٦١/٧

## ژن شووشەی نامووسە، پاوانی ئینسانی بەغیرەت و مەردییە!

ئەو نسبەتەی لە بەینی مێرد و ژن دایە، ئەو بێ پەردە و حیجابە لە بەینی باب و کچ دا نییە، کچ هەر چەند لە غایەتی فەزڵ و زەکا و شەڕافەت دا بێ، بۆ بابی نابێتە محەللی ئەسرار. ژن شووشەی نامووسە، پاوانی ئینسانی بەغیرەت و مەردییە، ئیحتیڕام و حیفزی نامووس و عەرضی ئینسانی عالی لەسەر ژن، لە ئەتتەم و ئەهەممی واجیباتە، وەکەذا سرپۆشینی زۆر موهیممە. ١/٨

ئەوانەی ژن ئەپەرستن، تەبیعی هەموو ژنێ ناپەرستن، کەسی زۆر جوان و مومتاز ئەپەرستن، بەو وەهمە، کە ئیلاهی حوسنی بۆ خۆی خەلق کردیە، لەبەرئەوە ئەو ژنە نە خۆی مەیلێ ئەکا، نە کەس ئەتوانێ بە دڵیا بچێ مەسئەلەی زەواج و مەواج. بەڵکو ئەبێ بە مەعبوودە، ئەمما

ئەوی موونافیق بێ مەیلی حیزی هەبێ، لازمە خۆ لێ پاراستنی حەتتا (بأبعد وجه) فی الحقیقه ئافرەت کە بە نێری قسە بکا دڵ بۆی ناچێتەوە... ئەو ژنانەی ئەمڕۆ لەگەڵ پیاوان بە مەکشووفی مەجالیسە و ئیختیلات ئەکەن، هەرچەند زۆر ڕاقین بە سەقافەتن، ئەمما بە بۆدرەو تەوالێت و قسەی نەرمە حیزانە، جەلبی نەزەڕ و مەیل ئەکەن، وە ئەغلەبی خۆیان تێوە ئەگلێن.

٢/٨

## هەرای بەینی شیعەو سوننان!

سەیدی ئالووسی لە (تحفة اثنی عشرة)ی گەلێ مەباحیسی نیزاعی بەینی سوننە و شیعە وەرئەگیرێ، لە تەفسیر ئیرادی ئەکا، زۆر بە فائیدەیە، ئەمما لای حەقیر ئەو هەرا هەرایە گوم کرێ باشترە، بێ لزومە. هەرچەندە ئەمڕۆ شیعە دەستیانە، لاکین سیاسەت لە قەپۆزیان ئەداتەوە، ئومێدم وایە بە غەلەبەی عیلم و مەدەنییەتی عەصری، ئەم تەشەییوع و مەشەییوعە نەمێنێ.

٢/٨

## ڕووتیی ژنان!

سبحان الله لە بەعزێ ئەدواری غابر ئەحوالاتی وا لە بەینی نێر و مێ جەڕیانی ئەکرد، کە لە زەمانی ڕیسالەت پەنا، نەك حەڕەمانی موحتەڕەمانی ڕەسوولی ئەکرەم، ژنە دۆم و قەرەج نەهییان لێ ناکرێ، یاڕەببی چەند بێ ئاگان! زەمانێ قەومێ دوورکەوتنەوە لە شەرائیع، زەمانی جاهیلییەتی ئولا، نەزەڕ بە زەمانی ڕیسالەتی جەدید، دوای خاتم الرسول بووە جاهیلییەتی مەدەنی.

تەماشای ژنە ئەورووپایی و ئەمریکایان کە، باوەڕمەکە لە هیچ عەصرێ وا بووبێ، خۆزیا بە حاڵێ تەبیعی یا وەکی پیاوان تەبەڕوجیان کردبا، لاکین تەبەڕوجیان زۆر موسریفانەیە، وە بێ لزومە، ژنی گەورە، ژنی گەورەکان بۆ حەفلات دەعوەت ئەکرێن، وەکی کچەتیمی عادی،

خەریکی سۆرا و سپیاو و زینەت لەخۆدان و کەشفی بەدەنن شتی وا لەبەر ئەکەن، کەمێ بەینی ناوك و بەینی نێو ڕانیان ئەپۆشن، باقی مەکشووفە، لەسەر مائیدەی ملوکان دادەنیشن. ئەو ئەحواڵە سیرایەتی کردیە بۆ ناو مسوڵمانانیش، حەتتا سەتری ئافرەت بە عەیب ئەزانن، باشە ئافرەت تەبەڕوج بکا، ئەمما تەبەڕوجی جاهیلییە بۆ بەشەر زۆر سەیرە، ئەوەی لای ئێمە زۆر عەیبە زۆر عارە زۆر بێ غیرەتی و ناموسییە، ئاوروپایی ئەبەدەن موبالات پێ ناکەن، بەڵکو لایان زۆر جوانە حەقیقەتەن بە مەسئەلەی کەشفی ژنان و ڕەقس و سەمای سینەمایان. ئاوروپایی با بڵێم مەسیحی موەفەق بوون بەسەر فەوتانی دین و غیرەت و ناموس، لام وایە حاجەت ناکا، بە باسی خروجی حەزرەتی عائیشە بۆ لای بەصەر لە مەسئەلەی قەتلی ئیمام عوسمان، چونکی ژنە ئێرانی شیعەکانی عەلی لە سایەی ڕەزاشای پەهلەوی هەمووی هاتەدەر، من ئەساسەن حەزم لە بەیانی ئەو ماجەرایە نییە، ئارەزووی مەحوی ئەکەم.

ئەمڕۆ چارەسازی بۆ ئیسلامییەت لازمە، کەس گوێی ناداتێ، عولەمای شیعی و سوننی چی قازانجیان بێ دوای ئەکەون، نەتیجەی تەبەڕوجی ثانی تەماشاکا، فەسادی دین و دونیایە، ڕۆژی هەزار مەجائیع ئەقەومێ لە جیهەتی بێ دینی ئەگەر لە جیهەتی دین یا ئەوروپایی ئابڕووی دینیان ئەبرد. تا ئەوروپایی وا بن تابیعی هەوا و هەوەس بن، وە عالەمیش کوڵاوی تەقلیدیان بن بەشەر ئیصلاحی نابێ. بە ملیۆنێ وەکی قادیانی و بە ملیارێ وەکی بابی. واقیعەن لە دەوری ئەو ڕەسوولە نوێیانە، شەڕ و شۆڕ فسق و فجور و سەییئات و وەقایح و قەبایح و زینا و بە فرێدان و قەتل و سەلب و ئیحراق و بێ ناموسی و دەیوسی و گەوادی. ئانەن فەئانەن لە نمادایە، بە سەر دونیا یا سیڕایە ئەکا، با ئەمە موعجیزەی ڕەسوولی ئیسلام بێ.

٣/٨

## ژن لە ڕوانگەی ئیسلام!

با هەموو عالەم بزانیٚ ژن لە نەزەرِ دینی ئیسلام زۆر موحتەرەمە، حیجابیٚ بۆ حیفز و حورمەتە وەکی شووشەوات لەناو سندوقان ئەندریٚ تا بە سەلامەت بگاتە جیٚ. ژن ئەوەندە بە حورمەتە دینی ئیسلام بۆ ملیۆنیٚ لیرە ڕیٚ ئەداتە ژنیٚ بە ڕووتی ڕەقس و سەما بکا، لەبەر چاوی خەڵکی، سەیری ئەوروپایی هەڵیان ئەپەرێنن، وە پێیان ئەڵێن: سەیدات! تەمام!

٦/٨

## ژن بەو نەوعە لە حەد دەرنەدەچوون!

لام وایە ئەوەی شەریعەتی ئیسلامی ئەیەویٚ ئیجرا کرابا، ژنی بیٚ مێرد، مێردی بیٚ ژن نەدەماوە. دەییوسی گەوادی مەنکوبی قەحپەیی نەدەبوو، ژن بەو نەوعە لە حەد دەرنەدەچوون، ڕەسوول بێوەژنەکانی گەورە گەوەری ئەهێنان، ئەیتوانی ئەوەی هێنای مارەی ئەکرد، حەزی نەفسی با، کیهان کچی ناسك و نازدارە ئەیهینا مارەی ئەکرد. حەتتا ئەوەی ئیمانی پیٚ نەبوو، بە داماوی وی فەخری ئەکرد، جوو لە وەقتی خۆی ئەوروپا ئێستا، بە ژن زۆرهێنان، تەعنیان لە ڕەسوولی ئەعزەم بیٚ مەعنایە. عەجایب تەعنی ئاوروپاییان کۆنە قسەن، بەینە بەینە نوێی ئەکەنەوە. ئێمە لەبەر دین نەبیٚ، ئەتوانین تەعنی وایان لیٚ دەین جەرگیان ببڕین، لاکین رسول الله خۆی مانیعە، حەتتا ئێمە لەبەر ئیمان ئەو قسەی بیٚ مەعنای جوو و سائیرە لە حەق ڕوسولەکانی ئەیکەن، ڕەدیان لیٚ ئەدەین، تەوجیهی جوانیان بۆ بەیان ئەفەرمووین.

١٠/٨

## دیسان خیلاف و شیقاق!

تەماشای ڕەوشتی عالەم کە، ئەوەی ئەمڕۆ دین و ئایین و ئوممەتی هەبیٚ لە ڕوسول: موسا و عیسا و موحەممەدە (صلی الله علیه وسلم)، لە

سایەی ڕوئەسایی دین و سیاسەت، ئەو سێ ئوممەتە چ خیلاف و شیقاق و عەداوەت و جەنگ و موحاڕەباتیان لە بەیندا بووە وە هەیە، وە ئەبێ، وە هەر ئوممەت خۆی بە خۆی چەند فرقەی هەیە. عەدووی یەك بە خوونی یەکتر تێنی (معاذ الله) دوای حەزرەتی موحەممەد نەبی ڕەسوول هەبا.

عالەم چەند موتەفەریقە هەزار هەندە موتەفەریق ئەبوون، بڕواکە دە کەس لەسەر تەبەق خڕنەدەبوونەوە، مەیلی بەشەر لەسەر شیقاق و خیلافە، خصوص ڕوئەسای دین و دونیا هەرچەند گەلێ کەس دەعوای ڕیسالەتیان کرد، لای عولەما لای حکومەت مەیدانیان نەداتێ نابووت بوون. لەو ئاخیرە دەرکەیانی کردەوە، عولەمای ڕاستی کەم بوون، سەتوەیان نەما، حکومەت گۆیا بە موقتەزای حوڕمەتی ئەدیان، دەخل ناکا هەر دەعوایە ئەیکا بیکا، بەس دەخلی سیاسەت نەکا، غەڵەتن، ئەساسی لەسەر سیاسەتە. تەئریخ مەعلومە زۆر کەس بەناوی ئیرشاد و ڕیئاسەتی طەریق، تەشکیلی حکومەتی جەدیدیان کرد، لایە لە ئێران بابی، لایە لە هیند قادیانی سەریان بڵند کرد، تەفرەقەیە نوێیان هاویشتە ناو ئیسلام، لایە حکومەتی عیسەوی وا دوشمن و بە قووەت، لایە ئەوانە بەناوی ئیصلاح، عالەمی ئیسلامییەیان بە فەساددا، هەر چەند دەعوای ئیصلاح ئەکەن، ئەمما فەساد ئانەن فەئانەن لە تەزایود دایە، فەزائیلی بەشەری نێزیکە مەحو بێتەوە.

تەقالیدی ئەوروپایی بێ غیرەت و ناموسی لە عالەمی شەرقی شەقی ئەوا سەیرایەت ئەکا، عالەمی ئیسلامییە لە هەموو قووەت مەحرووم بوون، نە ماددی نە مەعنەوی، بەس بێ عاری بێ حەیاتی! ئیلاهی کەسێ حەیای هەبێ، موقابیلی ئەو حوکەمای تەبیعەت و کیمیایی و میکانیکی، ئەو موختەریعە عەزیمانە کوو ئیددیعای ڕیسالەت و نبووەت ئەکا؟ ئەو سیاسەتەش لە ئەسەری خەیالیونانە لێیان بوو بە (ماخولیا). کەوا بێ دەرکەی ڕیسالەت ببەسترێ، موتەنافیی ڕەحمەت نییە، حەققەن پێوەدانی ڕەحمەت بوو، چاو بچوقێنە مل شۆڕکە ئەنواری موجەڕەددات ئەبینی. مەلەك (نعوذ بالله) بەڵکو خوا بۆت (تمثل) ئەکا، نبووەتی تەشریعی سەد کرایە، وەلێ (وەلی) وەحی بۆ دێ زاتێ وەکی شێخی عەرەبی وا

ئەفەرمـوێ، چ قەیـدیيە بڵـێن سـەهووی فەرمـووە؟ پەك لەسـەر چـی کەوتووە؟ مەلەك بۆ وەحییان بۆ بێ؟ عالەمی ئیسلامییە لەو وەحییە چی ئیستیفادەی کرد؟ لوح المحفوظ ئەبینن، چیان دیت؟ گوناهـ و شتی پـڕو پووچ و ناشیرین! لە قورئان شەرم ئەکەم تەصریحی پـێ بـکەم حاصـلی ساحی ویلایەت شتی وایە سنجدەیی عەقڵ و شـەرع نـابێ، ئەکسـەری طورێ (وراء طور العقول)ـە، بناء علیە پیاوی عاقڵ لەگەڵیان قسـەی پـێ ناکرێ. ملیۆنێ پێغەمبەر بێن بێ فائیدەیە، ئەوروپا ئیصلاح نەبی بەشـەری کوڕەی ئەرز ئیصلاح نابێ، ئیصلاحی ئەوروپایی لە دائیـرەی ئیمکـان دا نییە، مەگەر خوا بە قەهری خۆی هیلاکیان کا مەحوو ببنەوە!

بەهـائی ئێرانـی وەکـی لە بەعـزێ کوتـوبی بەیـانم دیـوە، ئینکـاری حەشری ئەجساد ئەکا وە موسەددەقی داروینە، کەوابێ ڕیسالەتی چی پێ ئەوێ؟ داروین بـوو بە ڕەسـوولی بەهـای ئێرانـی، زەمـانی ڕیسـالەت و نوبووەتی عیسا موقەددیمە هاتنەوەی مونافی خاتەمی ڕیسالەت پەنـا نیـیە، ئەگەر لە ئاسمان بێتە خوارێ، حوکم بە چی ئەکا؟ بە شەریعەتی ئیسلام، موقەللیـدە یـا موجتەهیـدە، بەڵـێ لە چـی کیتـاب لە سـوننەت ڕەنـگە موخالەفەی ئیجماعی پێ نەکرێ، قسەی سەیریان هەیە مەلایان ناشکوری نەبێ دین نەما، شەرائیعی سـەماوی ڕەزیـل بـوون، حوکمیـان ئیلغـا کـرا، کوفر و فیسق و فوجور و هەرەج و مەرەج و فیـتەن ئیسـتیلای جیهـانی کرد، نە لە عیسا ئەسەرێ، نە لە مەهدی خەبەرێ!

١٢/٨

## خوێی لە کەوشی ئەکەن!

گەلێ کەس موعجیزن، وەقت و ناوەقـت ئەچـنە مەجالیسـان، مـاڵان، دادەنیشن، قسەی نارەوا ئەکەن، ساحێبی ماڵ سەخڵەت ئەبێ بـۆ هەسـتان کینایەت ئەهـاوێ، گوێیـان نـاذەنێ. لە کـوردەواری عـادەتەن خـوێی لە کەوشی ئەکەن، نازانم چییە؟ بۆ زۆرگۆیـان ئێمەنـی وەردەگێـڕن، ئەگەر سەر بلووریێنی وا ئەکەن.

١٩/٨

## بۆ ژنان نە شیش بسووتێ نە کەباب!

ئیحتیات لە حەق سەییدات لازمە، سەییئاتی ئەوروپایی شاهیدە لەسەر قوبحی سفوور و ئیختیلات لە جێی وەکی پاریس و لەندەن، ڕۆژێ بە ئالاف بەر فڕێ ئەدرێ، غیرەت و حەمیەتی بەشەری هیچ، ئی حەیوانیش نەما ئەگەر عولەما و حوکەما و حەمییەتمەندانی کیرام سەعیان کردبا نە شیش بسووتێ نە کەباب، ئافرەت حەپسیش نەبان، واش بەرەڵڵا نەکرابان خراپ نەبوو. لاکین لە دەست چوو، قەلبی نێر و مێ لەگەڵ یەك خصوص دەست لە ملانێ و ڕامووسانێ و بادەگوساری وێکڕا بکەن.

١٩/٨

## ڕوئەسا و مەڕئوس خەتای کامیانە!

بە خەیاڵ زۆر جار موحاکەمە ئەکەم، ئەساسی قەباحەت لە تەڕەف ڕوئەسایان یان لە تەڕەف مەڕئوسانە؟ لە سەیری ئەنام خصوصەن حاڵی حازڕە وا دەرئەکەوێ خەتای عەوامە، ڕوئەسا بە گوێرەی مەیلی وان سەوقیان ئەکەن بۆ ئەنواعی جەهالەت و زەلالەت.

٢٥/٨

## خوا بۆ تەکلیفی عیبادەتی لە ئینسان کرد؟

زۆر کەس (علی الدوام) خەریکی ناموس بردنی ئەڕبابی ناموسن، ئەمڕۆ بەشەر بە نەوعێ تەحەممولی ئەمانەت ئەکا، قەحپان گوشاد ئەکا، گۆیا حیفزی عائیلات بێ، ڕەقس و سەمایان پێ ئەکا بە ڕووتی هەڵدەستن و دادەنیشن. گۆیا ئەمە چاتر حیفزی شەڕەفی ژنانی پێ ئەبێ! بێ شەڕەفی و بێ ناموسی و دەییوسی و حیزی و بێ غیرەتی و بێ شەرم و بێ حەیایی، گەیشتیتە دەرەجەیە ئینسانی بە ناموس تەمەننا بە

بەعزە حەیواناتێ بێ غیرەت ئەخوازێ، ئەگەر ئەمانە عام کەین، دیسان باشە، حەتتا تاعەت و عیبادەت ئەنواعی مەشاقی تەکلیفی لە تەڕەف خوای لەسەر دانرا، خەتای خۆی بوو، خۆی خۆی هاویشتە ژێر بار، ئەگەر سوجدەی بۆ دار و بەرد و کەر و گۆلك نەبردایە بە ئەوهام و خەیاڵ خۆی ئەوەندە عەزاب نەدابا لەسەر عەیشێ بەسیت بمابا، خوا بۆ تەکلیفی عیبادەتی لێ ئەکرد؟ حەتتا زانوو زەمین یا (علی القدم) (خضع الرقاب نواکس الابصار) بەرامبەر بوتێ ڕاوەستێ بۆ خوا ئەو تەنەززولە ناکا. حەقـقەن ئەوە زوڵمێ عەزیم و جەهلێ ئەعزەم و ئەشنەعە ئەو عەرزە وەکی عولەمای بەیان ئەفەرموون، تەمثیلە وە ئیشارەیە بۆ ئەهەممیەتی ئەمانەت، وە زێدە لزوم و ئیعتینای بەشەر بە حیفزی، ئەو ئیجرامە ئەو کائیناتە خۆی پاراستووە لە تەحەممولی ئەمانەت لە ترسی خیانەت، تۆ هەڵت گرت ئەوجا (بجمع قواك) ئامادە بە بۆ صیانەتی!
٢٧/٨

## ئەصلیحەی حەڕبییە!

ئەصلیحەی حەڕبییە جیهەتی خەیریشی هەیە جیهەتی شەڕیشی هەیە. ئەوی باش بێ خواپەرست و لە خوا ترس بێ، لە خێری ئیستیعمال ئەکا، ئەویدی لە شەڕی صەرف ئەکا. کەسێ میسقالە زەڕڕەیە ئیمانی بە خوای هەبێ غازی موخنیق ناهاوێتە شارێ، بێ دەسەلات و بێ مودافەعە، پڕ لە ئەتفالی مەعصوم، ئافرەتی مەزلووم. ئەوی ئەمڕۆ ئەیبینی، ئەسەری تەرەقییاتی عیلمی بەشەرە، کە بەدخواهانی ئینسانییە ئەوانەی بێ دین و ئیمان، صرف لە شەڕی سەرف ئەکەن. حەقیقەتەن تەڕەققی ئەوەلەن بە تەزکیەی نەفس و تەربیەتی جوان و ئەخلاقی فازیلە و ئینساف و موڕووەت و مەرحەمەت، ئەوجا بە عیلمی ئیختیراق و ئیکتیشافە کەسێ ئیمانی هەبێ، خوا بە عەمەلی وی بەصیرە، سەعی لە چاکە ئەکا، وە بۆ چاتر هەوراز ئەچێ. ئەوی ئاگای لە خوا نەما ئەوی بیکا ئەیکا! ٣٣/٨

## چەند خۆشە لیسانی واسیع!

ئەڵێن لەناو عەرەبان لە سینی گەورە گەورە لە تەعام ئێنن، وەکی گردەلۆکەی پڵاو گرئەبێتەوە، حەیوانەکی بە تەواوی لەسەرە، تێرەخۆری سەد کەسی زیتر. لۆغەتی عەرەبی حەققەن زۆر واسیعە، حەتتا لە قاپ و قاچاغ بە گەورە و گچکەیی ناویان ئەگۆڕێ، لە هەمووی گەورەتر بێ پێی ئەڵێن جفنە. لەوی بەرەژێر کە تەعامی دە کەس بگری قصعەیە. لەوی بەرەژێر کە تەعامی پێنج کەس بگری صفحەیە، لەوی بەرەژێر کە تەعامی دوو سێ کەس بگری پێی ئەڵێن: مکلە.

چەند خۆشە لیسانی واسیع، لاکین زوبان درێژی بە خورافات و تەوەسسوعی بێ مەعنا خۆی نییە ئەڵێن: یەك جفنە، هەزار کەسی لە دەور دەبوو ئەمە قسەیە؟!

٣٤/٨

## تەماسیل و هەیاکیل لە ئیسلامدا!

تەماسیل و هەیاکل لە شەریعەتی ئیسلامییە حەرامە، چونکی ئەووەلەن بوتپەرستی لەو صونعەتە پەیابوو، مویولی بتپەرستی حالەن لە دڵان جێگیرە. وە بالفعل عیبادەت ئەکرێن، لەناو مەسیحیان، وە سائیری بوتپەرستان، نێزیکە لەناو ئێمەش عیبادەتی ئەصنام عەود بکاتەوە. هەر وەقتێ ئەو مەیلە نەما، یا حەڵاڵ بێ، یا هەم دروستکردنی، هەم دانانی لە مەوقیعێ. ئەمما بۆ هەموو کەس هەیکەل دروست نەکرێ، بۆ ئەوانی هونەروەری خادیمی میللەت و دەولەت و وەتەن، ڕافیعی لیوای مەجدی ئوممەت بکرێ، نەك یەکێ خۆی بکوژێ هەیکەلی بۆ بکەن، یا دوو سێ قەسیدە بڵێ، سێ چار قسەی ناو دڕا دائیر بە دین بکات، بیکەن بە فەیلەسوف و هەیکەلی بۆ بکەن. حەقیقەتەن ئەوە غایەتی هەیکەل نایەڵێ، بە فەسادی ئەبا، بە جارێ ئەبێتە حەرامی شەرعی، حەرامی

سیاسی لە ئەحواڵی بەشەر. وا ئەزانم مەیلی صەنەم پەرستی حوکمی فەرمایە، لە عالەمی ئیسلامییەت بە خەیاڵی سۆفییانە و موراقەبەی حەزرەتی شێخ ئیعادەی ئەکاتەوە.

چەندێ پێش زاتێ فۆتۆغرافی خۆی ناردبوو بۆ لای کوێتی تا ئەوانەی مەحرووم لە دیداری بە زیارەتی صورەتی موشەڕەف بن. گەلێ کەس عیبادەتیان ئەکرد، خوای موجەڕەد بپەرستن، بە ئیمانی موجەڕەد زۆر موشکیلە خصوص کە خەیاڵ و وەهم لە غەلەبەت دابن، وە عەقڵ بێ هێز بێ، بۆیە ئەکسەری خەریکی ئیزالەی عەقڵن.

## مەلا و ئەولیای دەوڵەمەندم خۆشدەوێن!

من بەعزە ئەولیا و مەلای دەوڵەمەندی قەدیمم زۆر خۆش ئەوێن، بە هەموو نەوع خدمەتیان کردیە. مەلای فەقیر شوکرانەی خوای بە عەمەل چۆن بکا؟ چاوی لە دەست ئەم و ئەوە، ناوێرێ لە موخالەفەی میولیان قسە بدۆڕێنێ، وەلی زاویەنۆشین گۆیا دەستی لە دنیا هەڵگرتیە، چ خدمەتەکی پێ ئەکرێ غەیری درۆ و ئیغرا؟!

دیارە دین و دونیا بە قووەت موحافەزەی ئەکرێت.

٣٥/٨

## کۆیە!

شاری ئێمە یەعنی کۆیە، بە باغ و داغە، وەکی حاجی قادر ئەڵێ:

**نموونەی جەننەتی شێوەی ڕەزانی**
**لە بەهار شامە ئەیامی خەزانی**

باغاتی لە جیهەتی غەربی شیمالی ئیمتیداد ئەکا، بۆ شەرقی، مەیلەکی ئەکا بۆ جنووب، ڕووباری بەناو دادێ، لەپشت شاری بەلای باواجی تا حەمامۆك باغ و قەتعەی ئەڕازی بۆ شینایی زۆرە. مەوقیعێ زۆر خۆشە، لاکین دەستی صونعی بەشەری بە گوێرەی حەزارەتی حازیرە پێ نەکەوتووە، لە سایەی ئەحمەد دیونی قائیمقام و سمایل ئاغای ڕەئیسی

بەلەدیـیە دەروونـی شـار سـەراپا مولەووەسـە. ڕێگـایێ لە ڕێـی چیـای چنارۆکی ناخۆشترە، تا دونیا لە مەدەنییەت تەرەقی ئەکـا، ئێـرە لەبەر بـێ پیاوی تەدەنی ئەکا، ئەو جێی حکومەت دەستی ئەداتێ، خۆزی دەستی نەداتێ، ئەوەندەی هەیە لەوەندیش ئەبین!

٣٩/٨

## ئاستانە![1]

واقیعەن وەکی ئەڵێن ئاستانە مەوقیعێ مومتـازە، لاکـین مـع الاسـف ئەلئان ڕەونەقی جـارانی نەمـاوە. مەرکەزی حکـومەت بـۆ ئەنـقەرە نەقـڵ کراوە.

٣٩/٨

## غەزەبی مشك!

ناشکوری نەبێ، لەبەر مەحروومی لە تەرەقیاتی صـونعی خـوا، چەنـد ساڵە مشکی لەسەر ئێمە موسەلـلەت کردیە، چەند دێی مەحوو کـردەوە. ئەمسـاڵ ئـێمە نانمـان لە فەلاحەتـی خۆمـان چەنـگ نەکەوت، بـۆ سـاڵی جەدید نازانم چۆن ئەبێ؟ حکومەتیش زۆر سەرف ئەکا لە موەززەفین لە کیفـاحی ئەو نەوعە ئافـاتە، لاکـین بـێ هـوودە ئەڕوا، خەسـارەت دوو خەسـارەت، باغاتیشـمان بە ژەنـگ و هەدەر، بـێ سـەمەرەت ئەڕوا، چ فائیدەکی لێ چنگ ناکەوێ، نـازانم سـەبەبی ئەو غەزەبە زیـاد لە عـالەم چییە؟

٤٠/٨

ئیلاهی ئێمە موئمینین و شـوکرانەی نیعمەتـت ئەکەیـن، بە حـوڕمەتی خۆت، ئەو ئافاتانەمان لەسەر هەڵگری، بیهـاوێیە سـەر ئەوانـی بە هەردوو

---

(١) مەبەست شاری ئیستەنبوڵە.

مەعنا کافرن، نە بڕوای پێت هەیە، نە نیعمەت لە تۆ ئەزانن. بە عیلم و عەمەلی خۆیان سەعی ئەکەن، بۆ مودافەعەی و موکافەحەی ئافاتی مەزرەعە و باغات وە خدمەتی فەننی ئەڕزاقیان سەبزەیان میوەیان (کما کیفما) لە تەرەقییە.

سێوی ئەمریکای دێتە کۆیە، ئینسان حەیران ئەبێ، میوەجاتی ئێمە لەبەر حەشەرات نابێتێ، بێ ڕەونەق، گڕوو و گڕنی گڕنی، لاخوار، بەد ڕەنگ (کما وکیفما) لە تەدەننی، بۆچی؟

مع الاسف ئێمە نە ئیصلاحی دین سەعی ئەکەین نە لە ئیصلاحی دنیا.

٤١/٨

## داری نەبەك

داری نەبەك لە بەغدام دیتییە، دارێ زۆر جوانە بەری زۆرە، تۆزێ بێ تامە. گێوژی کوردان گەلێ خۆشترە.

٤٠/٨

## بازرگانی!

لە یادمە کەسێ لە کۆیە چووبا بەغدا عائیلەی دۆستی بۆی ئەگریان، تیجارەت ئەو وەقتە لەبەر دەست چەند زەواتێ بوو، پێیان ئەگوتن: توجار. ئەوانیدی کوتاڵیان لەوان وەرئەگرت بە جومعانە پارەیان ئەدانێ، بەوانەیان ئەگوت بەززاز. بازرگان ئێستا ئەمڕۆ لە کۆیە سواری سەیارە ئەبی، ئەچێتە کەرکووك بە قیتاری شەمەندەفەر سبەی زوو لە بەغدایە، گەلێ کەس سەربەخۆ ئەچێ ئەمتیعەی ئێنێ، بە حازڕی بە قەرد، لەگەڵ جووان ڕێك ئەکەوێ، کۆشك و شانوشین.

٤٢/٨

## ئینسان ئەوەندە فیتنەبازە پێویست بە ئیبلیسیش ناکا!

تەئسیری ئیبلیسی ئینس لە ئیبلیسی جن زیاترە، فیتنە و شەڕ و شۆڕ لە بەینی مسوڵمانان دائیمییە. بەعزێ ئەڵێن: ئەوە دەسیسەی ئینگلیزە.
عەرزیـــان ئەکەم مســـوڵمانان لەگەڵ یەك ئەوەنـــدە موتتەعیـــددی عەداوەتن، فیتنەبازی ناوخۆیـان ئەوەنـدە زۆرە، گەورەکـان ئەوەنـدە زوو ئاگر ئەستێنن، حاجەت بە ئینگلیز ناکا، حاشا حاجەت بە ئیبلیسیش نییە!

## شەفاعەت بۆ گەورە پیاوانە!

من ئەڵێم تکای رسول الله بۆ ئەهلی کەبـائیرە، یەعنـی ئەوانەی لێیـان بوەشێتەوە، مەسەلەن صلاح الدینی ئەیوبی، سوڵتان مەحمـودی غەزنەوی، سوڵتان موحەممەدی فاتیح. تەبیعـی لە ئۆغری دیـن و فتوحـات تووشـی کەبائیر بوون، نەکرابا نەدەبوو، ئەوانە نائیلی شەفاعەتی ڕەسوولی ئەعـزەم ئەبن. وە کەسێ ئیعتیماد بە تکا و گوناهـ بکـا، لە شـەفاعەت مەحـڕووم ئەبێ. وەکـەذا ئەوانەی ئیعتیمادیـان لەسـەر فیـدیەیە لێـی نـاخۆن، ئەممـا ئەوانەی سەرسەری بێ حەیا (بکـل وجه) بەد سـیەر، بەد ڕەوشـت دز و حیز و کەبۆ، ئوممەت لە کافران موزیرترن بۆیە پێغەمبەر تکایان بۆ بکا؟ بۆ تکا قبوڵ بکرێ بۆ ئەوانە؟

٤٥/٨

## تەحەممول ناکەی بیبینی!

کەسێ ئینسـان و موصـلیح بـێ، نـاتوانێ بەشـەر لەو زیلـلەتەدا ببینـی، کەسێ ڕکوع بۆ کەر ئەبا، توخوا ئەگەر ویجدانت ببی، ئەتوانی بینۆڕیە، تەحەممولی بکەی؟ ئەگەر دەستەڵاتت هەبێ مەحووی ئەکەیتەوە.

٤٧/٨

## بە دوو هێلکەی سەر قەڵەمانەش بەسەری ناکەنەوە!

واقیعەن ئەمڕۆ بە گوێرەی مەیلیان هەڵگێڕ و وەرگێڕیان پێ ئەکەن. ئەو ڕەئیسی بە گوێرەی مەشرەبی وان بدوێ، حەرەکە بکا موحتەرەمە، سەرو ماڵ پێش کێش ئەبێت، ئەوی ساغ بێ، حەقیان پێ بڵێ ڕێی ڕاستیان نیشاندا، گوێی نادەنێ، مەهتووکە، بە دوو هێلکەی سەر قەڵەمانەش بەسەری ناکەنەوە.

٤٨/٨

## ئینسان زۆر سەیرە!

ئینسان زۆر سەیرە کەسێ لە سەگ خراپترە، باسی خراپەی زاتەکی لا بکەن، دوو سێ جاران، دڵی پڕ ئەبێ لە بوغزی. وەلەو زاتێ بێ عەللامەی دەوران، دائیم خەریکی ئیصلاحی بەشەر بێ.

٤٩/٨

## دینی ئیسلام بە حاو و حووی دەروێشان، فڕمە فڕمی سۆفییان حیفز ناکرێ!

ئەمڕۆ دین بێ دونیا موحافەزە ناکرێ. مسوڵمانان دەوڵەمەندی شاکریان پێ ئەوێ، ئەگەر (معاذ الله) مەیلی دەوڵەمەندان و فەقیری مەلایان وا دەوام کا، عیلمی دینی مەحوو ئەبێتەوە. مەلای بێ فڕوفێڵ، ئەگەر بە حەق مەلا بێ، تەبعەن فەقیر ئەبێ. عومری خۆی قووەتی خۆی لە تەحصیلی عیلم و نەشری عیلم سەرف ئەکات، بێ کار و کەسب و واریدات ئەمێنێ. حکومەت یا میللەت بەخێوی نەکا چبکا؟

ئەوانی خادیمی عیلم بوون نەمان، حکومەت موبالات ناکا، خراپ ئەکا. دین بۆ حکومەت زۆر لازمە، ئەوی دین ئەیکا، تۆپ و تەیارە و عەسکەر نایکات، دینی بە حەق روح الحیاتی ئیجتیماعییە،

دەوڵەمەندەکانی میللەت مائیلی شێخانن. حەقیقەتەن دینی ئیسلام بە حاو و حوویی دەروێشان، فڕمە فڕمی سۆفییان وە کیفە کیفی تەوەججوهان خیفز ناکرێ. بە عیلمی صەحیح ئەبێ.

ئەگەر بە دیققەت بنۆڕن، نە فەقری عالەم و مەڕزووقی جاهیل ئەبێتە موجیبی تەحەییور و زەندیقی عالیمی تەحریر، نە بوئسی لەبیب و تەیبی عەیشی ئەحمەقی ئەبێتە دەلیل لەسەر حیکمەت و قەزا. گەلێ کەس ئەحمەقی ئەنوێنی، ئەمما بۆ دونیاداریی زۆر عاقڵن. حەتتا لە تەئریخێ وای لێهات، ئەو مەلا و شێخێ خۆی ئەحمەق کردبا، لای حکومەتی عوسمانی -بەڵکو پادشا- موحتەڕەم ئەبوو، گۆیا بەستەزمانە، ئەدنایە ئاگای لە دنیا نییە، (مثری) ئوممەتیش چاکی بەخێو ئەکەن.

مەلای عاقڵ و مودەببیر بێ حورمەت بوون، بەڵکو لە حەیاتی خۆیان ئەمین نەبوون، شەیتان لە شەرمیان ئەترسا، لەبەرئەوەی بوو حەماقەت لە مەیانی ڕوئەسای دین تەحەمومی کرد.

٥١/٨

## ماڵ و ئەولاد!

ماڵ و ئەولاد ئەگەر لە جیهەتی خەیر سەرف و ئیستیخدام کرێن، زۆرباشن، وە ئیللا (لا). وەلەدی دز و حیز و فاسق و فاجر و موبەززیر و بێ نامووس و غیرەت، کەڵکی چییە؟ ماڵێ سەرف نەکرێ، یا سەرف کرێ، لە عەیش و عیززەت و قحار و فیسق و فجور بەڵایە. وەباڵە بە ملی ساحێبی، ئەوەی عەبد لە خوا نێزیك ئەکا، ئەو خۆیەتی، نێزیکی لە خوا بە ئیعتیباری سیفاتی حەمیدە و ئەفعالی پەسەند دیدەیە. دووری لە خوا، بە ئیعتیباری سیفاتی حەمیدە و ئەفعالی بەدە، ئەوانەی تەقەڕوبی الی الله یان نەبێ، خێرێ لە ماڵ و مناڵی خۆیان نابینن.

٥٢/٨

## خێری بێ هوودە!

ئەمڕۆ دوەلی مەسیحی وە ئەعدای دین و دەمی مسولمانان لە چ حاڵدان؟! بەو گوێرە ئەبێ مسولمانان ئەعمالی سالیحە بکەن. ئەمڕۆ لە کوردستان عیلمی دینی (العیاذ باللە) نێزیکە لە ئینقیراز، تەدبیری چییە؟ چ ئەعمالێکە بخونجێ، بۆ ئیدامەیی دین و عیلمی دینی؟ ئەوروپایی موبەششیر بڵاوئەکەنەوە، بۆ وەرگێڕانی مسولمانان، عیلاج چییە؟ ناشکوری نەبێ مسولمانان کەڕو کۆرن نابینن، خێری بێ هوودە ئەکەن، کە حەقیقەتەن سەراپا بۆیان ئەبێ بە شەڕ!

٥٢/٨

## ئەحمەد زۆغۆیی ئەرنەئود!

ئەوی بە لەهوو و لەعب مەشغول بن وەکی ئەحمەد زۆغۆیی ئەرنەئود، ئاگای لەخۆی نییە تێی هەڵئەدەن، لە وڵاتی بە خۆ و ژنی تازە زایی دەرئەکەن، لە قەسر و جینانی مەلەکی.

٥٣/٨

## زەمانی دەوڵەمەندی لە بیستی تا چلییە!

یەك شەخس وا ئەبێ، ڕزقی واسیعە، دوایە تەنگ ئەبێ، یا ڕزقی تەنگە واسیع ئەبێ. تەبەددولات و تەغەییوڕات دیارە موشاهەدە، بە تەتەببوع دەرئەکەوی، زەمانی دەوڵەمەندی لە بیستی تا چلییە، دوایە موشکیلە ئەگەر ببی نادیرە!

٥٣/٨

## کتێبان بکڕن باشترە لەوەی سێ چوار حەجان بکەن!

بەو نەوعە سەرفیاتی ئەوروپایی بەسەر ئێمەدا غالب بوون، ئی ئێمە خێراتیان مەولودێ بە دەفە، دونبەلەکە ئەویش لەبەر بەعزە حیکایەت گۆیا ئەوی مەولود بکا یەك دوو قازانج ئەکا، هەموو ئامالی پێك دێ، خوا لە هەموو گوناهی خۆش ئەبێ. ئەمما کتێبێ نییە تەدریسی تیا بکەین، کەس نییە بە خێری خۆی بەعزە کتێبێ چاك جەلب کا، سێ حەج و چار حەجان ئەکەن. معاذ الله عیلم لە وڵاتی براوە، حەج بە چ کەڵکیان دێ؟ هەرچەند مسوڵمان حەزیان لە خێرانە، ئەمما خراپ فێر کراین خێری بە کەڵك ناکەن.

٥٤/٨

## مەلەك پەرست!

ئالئانیش مەلەك پەرست زۆرن، داسنی بە مەعبوودی خۆیان ئەڵێن مەلەکی تاوس. یەعنی ئێوە دەعوەتی وانتان کردیە بۆ عیبادەت و پەرستنی خۆتان؟ ٥٤/٨

ئیمان بە مەلەك لە ڕەسوول وەرگیرایە، نازانم چۆنیان گۆڕی؟ ئەبێ زۆریان مەدح و سەنا و باسی قودسییەت و قودرەت و قووەتیان بیستبی، ئاخیری وتویانە: ئەمانە ئیلاهن، (بنات الاله) ن .

٥٥/٨

## دیسان عەقڵ!

هەندێ زەوات لە بەشەر هەڵئەکەون، بە شاز حیسابن، ئیشی وا ئەکەن، خاریجی دائیرەی عەقڵە. ئەگەر بنواڕنە عەقڵ، بە قسەی عەقڵ بکەن، قەتعییەن ئیقدام ناکەنە سەر ئەو جۆرە کارانە. لە ڕیجالی دونیا مەسەلەن ناپلیۆن چی کرد؟ قسمێ لە عولەمای ئەورووپی نیسبەتی جەننەت ئەدەن بۆ ئەو نەوعە، یەعنی کاریان کاری خیرەد نییە، ئەمما ئەو

نەوعە زاتە، بە چ قـووەتێ ئیقـدام ئەکـا، چ ڕوحێکـی هەیە؟ مەجهـووله جەنابی ڕیسالەت پەنا، نەك و تەنیا، بە موقابیلی ئەنـام ڕاوەسـتا، نە تـابیعی حکومـات و نە شـەرائیعی دەعـوەتی ئەنـامی ئەکـرد، ئەیفەرمـوو: مـن ڕەسوولی خوام، بۆ عالەمی نـاردیمە، پاشـاهانی ڕووی زەمـین، عولەمـا و حوکەما و قوواد، ڕەئسەن ئەبێ ئیمانم پێ بینن، وە تابیعم بن!

لەسـەر ئەوە عـالەم عەداوەتـی کـرد، زێـدە خزمـانی خـۆی سـەبری گرت، دەوامی کرد، ئەو هەمـوو ئەزیەت و مەڕارەتەی چێشـت، دەسـتی هەڵنەگـرت، ئـاخیری مـوەفەق بـوو. بیلفعـل کـاغەزی دەعـوەتی بـۆ شاهەنشاهی ئێران و ئیمپراتۆری ڕۆم نووسی، ئەمە چییە؟ لە چیـیە؟ بـووە ساحێبی دەعوەت، واضعی ئەحکام، فروعی و ئوصولی، قائیـدی حەرب، ئیمامی میحراب، خەتیبی سـەر مینـبەر و ساحەی قیتـال، ئەو جینـنەتەیە حوکەما و عوقەلا نیسبەت ئەدەن بۆ ڕەسوولی ئەعقەل و ئەعلەم. لاکـین ناشیئەی ئێمە لەو تەعبیرە ناگەن، ئەمما جەلال نووری ئەزانی ئەو جیننەتە چییە؟ بۆیە هەزار جار عەقل فیدای ئەو جیننەتە ئەکات. مستەفا کەمالیش یەکێ بـوو لەو مەجنوونـانە، حەتتـا ئەمـڕۆ نیسـبەتی جەنـنەت بـۆ هیـتلەر ئەدەن، کە کوڕڕەی ئەرزی لەبەری ئەلەرزی، ئەگەر ستایشـی ریسـالەت پەنا بکەین ئەوەی ساحێبی بوردیە فەرموویەتی، ئینشادی ئەکەین:

كفـاك بـالعلم فـى الامـى معجـزة

فـى الجاهليـة والتـأدب فـى اليـتم

فمبلـــغ العلـــم فيـــه أنـــه بشـــر

وأنـــه خيـــر خلـــق اللـــه كلهـــم

دع أدعتـــه النصـــارى فـــى نبـــيهم

والزم بما شئت مدحا فيه واحـتكم

حەققەن (نادر الوجود)ێکە، لە عالەمی بەشەرییەت یەکیدی وا نەبووە، وە نە ئەبێ!

## گوێی مەدەنێ!

مەڵێن خوا غەفوور و ڕەحیمە لێمان خۆش ئەبێ، چی بەسەر عەزابی ئێمەوەیە؟ چ پەکی کەوتیە؟ مەڵێن ڕەسوول شەفاعەتمان بۆ ئەکا، ئێمە لە ئەتباع و ئەولادی ڕەسوولین موعەززەب نابین. مەڵێن: فیدیە تەقدیم کراوە، بوزا و عیسا خۆیان کردیتە فیدیە. بە قەشە و مەتران و ئەمسالیان هەڵمەخەڵەتێن، موقابیلی گوناه بعد الاعتراف شتێ بدەنە وەکیلی پاپ، چی ئەکەن بیکەن. مەڵێن: بەهەشت زاتەن مەعلوم نییە، خۆی بیچێتێ. ئەوانە هەمووی لە تەڕەف شەیتانی ئیلقا ئەکرێن، گوێی مەدەنێ.

٦٤/٨

## ئێمە خەریکی حووحانێین!

ئەبێ بزانن عەمەلی ساڵح چییە؟ ئینگلیز مانگێ سێ سەد تەیارە دروست ئەکا، ئێمە خەریکی حووحانێ بین، خۆی نییە! عەمەلی ساڵح ئەمڕۆ ئەگەر ڕوئەسای دین ئینساف کەن، دیارە.

٦٥/٨

## لە کەڵلەی دەن دەستی ماچ ناکا!

ئەمڕۆ بنۆڕە حاڵی بەشەر کوو ئەبالیسەکان لێیان گۆڕین! حوسنیان کردە قەبیح، قەبیحیان کردە حوسن. حەتتا گەلێ کەس وای چوویتە دەماغی، کە حوسن نییە، بەس ئولف و عادەتە، شتێ لای قەومێ عادەتیان نییە، لەکنیان قەبیحە. لای قەومێ کە موعتادیان حوسنە، بەناوی مەدەنییەت و فنوونی جەمیلە، شتی وایان موستەحسین کردیە، کە لای مسوڵمانەکانی باش لە هەموو شت ناشیرینترە!

کوردێ ئافرەتێ مارە بکا لە کەڵلەی دەن دەستی ماچ ناکا، سەرامەدانی مەدەنییەت، شاهەشازادەکان، بە کەمالی ئیفتیخار دەستی ماچ ئەکەن، لەبەر ئەو تەقەللوباتە، ئەوی ئەڕبابی فیکر و نەزەڕ بێ لە

ئیصلاحی بەشەری مەئیوسە! بە ملیۆنێ وەکی قادیانی و بەها ئەفەندی عیلاج ناکرێ. بێ هوودە خۆیان بۆ ئیدیعای باتیڵ ماندی کرد، لە سایەی وان، ئان بە ئان قەبایح و شروور و فیسق و فجوور لە تەزاید و نما دایە.

٦٥/٨

## ئەوانەی تابیعی مەیلن!

ئەوەی تابیعی مەیلە، بە ئیزالەی مەیل نەبێ، چارە ناکرێ. کە لافاوی مەیل هەستا عەقڵ وەك قانکە لاشکە، با ئەیبا. هەندێ مسوڵمانی کۆیی، لە حەربی عمومی ئەسیر بووبوون، بردبویاننە هیندستان، بۆیان گێڕامەوە: بەعزێ لە هندۆسان هەیکەلێ ئەپەرستن، مسوڵمانێ شەوێ ئەیدزێ ئەیهاوێتە ناو خەلا[1]. بتپەرستەکان ئەکەونە ئیزتیراب، خەبەری حکومەت ئەدەن، بعد التحری لە قەدەمخانە ئەیهێننەدەر، ئەیشۆنەوە، باز بەناوی بابە، بانگی ئەکەن!

جا ئەوانە چۆن چارە ئەکرێن؟ بتپەرستیشیان بە عەقڵ نییە، تا بە دەلیلی عەقڵ ئیزالە بکرێ، غەلەتیان دەرخسترێ.

لە زەمانی عومەر پاشا والی موصل بە گژ داسنی[2] یان داچوو، تیمسالی مەلەك تاوسی بە بەر شەقان دا، بە قۆندەرە ئەچووە سەری، قەومی داسنی وەلوەلەیان ئەچووە ئاسمان. باز تیمسالیان لا موقەددەس و مەعبوود بوو. ئەو نەوعە قەومە ئیمان بە ئایات نایەنن، گەورەکانیان ڕابردینە، مەگەر عیلاجی منداڵەکانیان بکرێ هەزار جاری (اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ) یان بۆ بخوونەوە لایان بای دێ! مونەوویرەکانیش ئەیکەنە ئەسبابی تەبیعی، موئمینە سالحەکانی ئەولیاپەرست ئەیدەنە شێخان، ئێمە

[1] خەلا: ئاوەدەستخانە
[2] داسنی، واتە ئێزیدییەکان.

کە خواپەرستین، چی بڵێین؟ ئەگەر مەیلی فاسید و فەساد نەبی، مەسئەلە دیارە.

٦٦/٨

## گەنمی چەند هەزار ساڵ لەمەوبەر شین بوو!

سبحان الله قووەتی حەیات سیرڕێ عەجیبە. ساڵێ دەغڵ خراپ بوو، هەرزنمان چاند جوان ڕوا، نیوە کارەکەم وتی: ئەو هەرزنەم پازدە ساڵ بوو هەڵگرتبوو لە کووپی، قووەتی حەیاتی زایع نەببوو. لەوە ئەعجەب وە (أعجب الی الغایة عجیب) کە (تووت عنغ ئامون) کەشف کرا، نەختێ گەنمیان دۆزیەوە، لە خدمەتیان دانابوو، چاندیان نەختەکی لێ شین بوو. ئەو چەند هەزار ساڵە حیفزی حەیاتی بوو.

٦٧/٨

## من قاعیدەکەم داناوە!

ئەوانەی عیبادەتی غەیری خوا ئەکەن، حەقیقەتەن زۆر بێ عیزەتن، شەڕەفی بەشەرییان نییە. کەسێ ڕکوع بۆ گایە، یا (شە)ی ببا، چاو نەوی، ملکەچ و دەست لەسەر دەست، بەرابەری جسمێ ڕاوەستی (علی قدم الذل) ئەوە چ قووەت و زەکای نەفس و نەزاهەت و نەزاکەتی هەیە؟ ئەوەی عیززەت و صەلابەت و شەڕەف و مەناعەتی ئەوێ، ئیمان بە خوا بێنێ.

بە ئیمانی کامل و عیلم و عەمەل، ئینسان عەزیز ئەبێ، بڵند ئەبێ، خۆی ئەکاتە مەزهەری سیفاتی مەعبوودی خۆی. ئەبێ بە عالیم و قادیر و موریدێ (ذی العزم) سەمیع و بەصیر و موتەکەللیم و خەتیب و موبین و موفهیم و مورشید، صانیع و موختەریع، لە صونعی خەلیفەی خوا. بە کەرپەرستی چ پەیا ئەبێ؟ بە چی لە ڕوتبەی جەمادی، حەیوانی ئەچێتە دەر؟ ئەولیای زەمانە هەتکی نەفس ئەکەن، ئەنواعی ڕەزالەت ئەکەن، کە حەیوان لە حەرەکاتیان شەرم ئەکا، بە خۆدا دەشکێنەوە. بەعزەن

نزکەنـدن خۆیـان ئەشـکێنن، هەزمـی نەفـس ئەکەن، ئەممـا حەقـیقەتەن عەجایبە، بەعزێ شەدەڵەیی فێر ئەبن وەکی مەنزەلیۆز تەقە ئەکاو ئەڕوا و ناژمێردرێ، تا مەیلی لێ بێ نابڕێ!

ئیمانی ئێمە ئەگەر وەکی ئەوائیلـی سـەحابان، بـێ غەلـل و غەش بـا، ڕوحی لەتیف چۆن ئەوانی بڵند کرد، ئێمەش بڵند ئەبووین، لای ئەقەللی نەدەکەوتین، ئوممەت تووشی ئینحیتـاتە نەدەبـوو. مـع الاسـف ڕوئەسـای مەزاهیب وایان لە ئەدیانی سەماوی کرد، کە لە نەزەڕی تەبیعیوون بوویتە پیقلێ مانیعی صعود. واقیعەن وایان لێکرد، گەرچـی خۆیـان بە مووەحیـد ئەزانن، ئەمما بە عەدەدی ڕوئەسا ئیلاهیـان هەیە، کەلیمەیـان بـڵاوە، یەك ناگرن.

من قاعیدەکم داناوە، لە حەقائیقی ئیسلامیم وەرگرتییە، هەر حوکمێ، هەر ئیعتیقـادێ، یـا عەمەلـێ ئەگەر ئینسـان بڵنـد کـا، ڕوحەکـی سـەعی عەمەلی بداتێ، ئەوە لە دینـی ئیسـلامە، ئەگەر بـیلعەکس بـێ، خـاریجی ئەصلی دینە، داخیل کراوە.

قەولـی چـاك و پـاك لەگەڵ عەمەلـی سـالح ئینسـان پـێ ئەگەیەنـی. حەقیقەتەن ئەو صعود و ڕیفعەتە بۆ ساحێبیەتی. وە عیلم و عەمەل وێکـڕا ئەسەریان نومایانە، لاکین وەك عەرز کرایە ئەبێ بنۆڕینە عەمەلـی صـاڵح. فەقیـرێ ئـاگری لە خـانی بەربـووە، هـاوار هـاواریەتی، مسـوڵمانان پـێ ڕاناگەن، ماڵ و مناڵی مەحوو ئەبێ. لەو وەقـتە حەلـقەی زیکـری بگـرن باشە؟

نا بە خوای زۆر خـراپە. بە سـاعەتێ مۆسـۆلینی ٤٠٠ تەیـارەی نـاردە سەر ئەرنائوتان لەگەڵ ٣٥ هەزار عەسکەر، دوژمـن وا بە قـووەت، ئـێمە خەریك بین طەیلەسانی ڕێکخەین؟ کلی لە چاوان کەین؟ ڕدێنی بە شانە کەین؟

ئای وای ڕوئەسای دین چیان بە دین کرد! کـوو هاویشـتیانە ئەدنـای دەرەکـات، وای لەو مەکـرە! سـەلبی قـودرەت و قـووەت و عەقـڵ و عەمەلیان لە مسوڵمانان کرد، ئاخیری وامان بەسەر هات، ئالئانیش ئەوانـی لە ئیعتیبار دان، بە غەیـری ئیفسـادی دەمـاغ بە چیـدی ئیشـتیغال نـاکەن،

عەینەن وەکی کوردی ئەڵێ: **کفن بە من ببڕێ، مردی گۆڕ بە گۆڕ چێ!** دائیـر بە سـەییئاتی ڕوئەسـا لە حەق دیـن، بە حەق ئەوەنـدەی بنووسـی کەمە، تەواو نابێ.

٦٨/٨

## عومر چۆن درێژ و کەم دەبێ؟

عومر درێژ نابی و لێی کەم نابێتەوە، یا ئەوەی عومری کورت ئەبێ، وە زێدە و نەقس بۆ عومری شەخسێ قابیلە. لاکـین مـوتەوەققیفە لەسـەر بەعزێ ئوموور، ڕیعایەتی لازمە، ئێستا تەئمینی ئەکەن.

فەقێیە لە مزگەوتی ئێمە، العیاذ باللە تووشی دەردێ بوو، نێزیـك بـوو نەفسی ببڕێ. دقتورێ لێرە بوو ریاض مخمرچی حەلەبی زۆر حاذق بـوو لە ئەمڕازی گەروو و کەلـلە. عەمەلیاتی کرد، خوا کـردی نەجـاتی بـوو، وتی: چارەگەکی پێ چووبا ئەمردا!

ئەمما کە واقیع بوو ناگەڕێتەوە.

واقیعەن ئێمە ئومێدمان بە خوایە، ئەمما حوکەمای تەبیعەت خەریکن، بۆ عومری بەشەری، زیادکردنی. ئەممـا ئافـات لەسـەر بەشـەری ئەوەنـدە گربـوویتەوە، چارەی موشـکیلە، ئەگەر مەحـاڵ نەبـێ. واقـیعەن عاقـڵ لە عـومر کـورتی و درێـژی مـوتەحیرە. ئـی وا هەیە لە عـومری خـۆی وەڕەزە، ڕەق و تەق و چـاو کەم حـوکم، بەڵکـو کـۆر و فەقیـر، زۆر عومری درێژ ئەبێ نامرێ. ئاوا دەوام ئەکا! یەکی تەن و مەند، بە قووەت و حاڵ خۆش، گۆنا گۆنی خۆشی و وەسەتی حەیات، ئەبینـی ڕائەقەنـێ، ئەڕوا.

سرڕێکە خوا نەبێ، کەس نایزانی.

٧٠/٨

## بۆ خەڵکی خۆتان مەگۆڕن!

سیفاتی ئیلاهی موقتەزای زاتە، حاجەتی بە کەسب و مەسب نییە، وە پەکی بە معاونە ناکەوی، موعاریزی نییە، بۆیە عیلمی شامیلە، هەرچی مومکین بێ قابیلە بیهینیتە حەییزی وجود. شتێ موقتەزای زاتی کیبریائی بێ، بۆ غەیری ئەو مەحاڵە، مومتەنیعە. لە قورئان بگەن باشە، بۆ خەڵکی خۆتان مەگۆڕن، قسەی جاهیلانە قبوڵ مەکەن، وەلەو لە مەلایە گەورە گەورە نەقڵ کرابێ، موقتەزای مەقامی ئولوهییەت موحافەزە بکەن، لێی بترسن، تابیعی هەوا مەبن. زاتێ وا عالیم و قادیر ناتوانێ ئیعادەتی ئێمە لە عەناصیری ئەصیلەمان بکاتەوە. من شوبهەم نییە، ئەتوانێ، وە ئەیکا، ئەمما کەی ئەیکا خۆی ئەزانی؟

هەرچی بیلێم لە تەعیینی وەقت غەڵەتە. مع الاسف مەلای گەورە گەورە وەکی سیوتی، پێشی وی، دوای وی، زۆر سەهوو بوون، وکذا مع الاسف ئێستاش، عیسا و دەججال و مەهدی ئەزهانی مەلایان مشەووەش ئەکەن!

٧١/٨

## ئاوی کانیی خاتوونی چنارۆك!

مەلای گەورە لە واتای (هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ) دەفەرموێ: شیرینە، سووکە، دافیعی عەطشە، خۆش گوارە، تەختایی گەروو گیری نییە، زۆر خۆشە، وەکی ئاوی کانی خاتوونی چنارۆکێ. (وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ) سوورە، تاڵە، لە دەروونداا گەرم ئەبێ، عەطش زیاد ئەکا، وەکی ئاوی کۆیە گرانە، هەزم نابێ.

٧١/٨

## مسوڵمان مەعمەلی بەقووەتیان زوبانە!

سبحان اللـه مسـوڵمانان، ئەووەلـی ئیسـتیفادەیان لە بەحـر کـرد، دوایە لەسەر سـەفینە و کەڵەك مـانەوە. ئاوروپـایی گۆڕیـان، کـردیە مەراکیبـی بوخاری، مسوڵمان لە بەحـر پەکیـان کەوت، دوایە لە بەڕڕیـش کەوتـن. ناشکوری نەبێ نەچوونە هەوا تا بزانین چییـان لـێ دێ، ئێسـتا خەریکـن. لاکین ئەکەون، خۆیان مەعمەلی شتی وایـان نیـیە، مەعمەلـی بەقووەتیـان زوبانە.... سبحان اللە ئەووەلەن ئیستیلای ئیسـلامەتی لە ئەفریقـا و گەلـێ مەواقیــع بە واســیتەی توجــارەتی بەحــری بــوو، دوایە کەوتە دەســتی ئەجانیب! هەرچی هەیە جمود و تەقالید ئەیکات!

٧٢/٨

## ئیمانی مەیل و تەقلید!

ڕۆژێ لەگەڵ جەمعـێ موحادەسـەمان ئەکـرد، حسـب المناسـبة وتـم: ئەلئان من ناتوانم شاهیدی بدەم کە حەزرەتی رسـول اللـه، یـا جـوبریلی ئەمین ئاگای لە حاڵی منە، چی ئەکەم، چی ئەڵێم؟ ئەمما شـاهیدی ئەدەم ئەلئان خوا خەبەرداری منە، ئاگای لە **مافی الصغیرم** هەیە.

یەکـێ لە صـولەحا وتـی: ئەمـن شـاهیدی ئەدەم کە پێغەمـبەر ئەلئـان ئاگاداری حاڵی ئێمەیە.

گوتم: کوو شاهیدی ئەدەی، عیلمی موحیت شەرتی ڕیسالەت نییە، تا بڵێم ئەگەر ئەو شـتە نەزانـی، ڕەسـوول نـیـیە؟ گەلەك شـتیان سـوئال لـێ کردیە نەیزانییە، ڕەسوولیش بووە، ئەمما خـالیقی کـول، ئەبـێ ئاگـاداری کول بێ، ئولوهییەت و ڕوبوبییەت بێ عیلمـی موحیـت نـابێ. مـن مـادام ئیمانم هەبێ، خوای منە، ئەبێ ئیمانم هەبێ کە ئاگادارە بە حاڵم.

بعد التأمل وتی: بە خوای ئیمانی ئێوە لەگەڵ ئیمانی ئێمە فەرقی زۆرە.

یەعنی ئیمانی وان تەقلیدییە، یا مەیلە، کەم وایە لە بورهان بێ!

٧٣/٨

## ڕوباعی خەییام!

ئەی خەلیلەکانم، خۆشەویستەکانم! ئاگاتان لە خۆ بێ، دائیمەن ئەو دوو ڕوباعییەی خەییامی بخوێننەوە، زۆر بەقیمەتە، مایەی نەجاتی دونیا و قیامەتە:

ئەی تازە جەوان بشنەوو ئەز ئین پیری کوهەن
ایـن نکـتە کـی انـدرو بـود مغـزی سـخن
یـاری کـی دەرۆ معرفـت نیسـت، مەگیـر
کارێ کی دەر مەنفەعەتێ نیست، مەکون! (١)

٧٦/٨

## کافری بەخێر!

ئەوەی کافر بی بێ خێرە، نە تەنها کۆری چاو، کۆری دڵ. وە ئیللا تەها حوسێن کۆریشە، ئەمما بەصیرە، واقیعەن قیبلەی میصرییانە. یەکی تریش هەیە لە عێراق مهدی البصری ئەویش شایانی تەقدیرە.

٧٧/٨

---

(١) ئەم چوارینە بە گوێرەی بەدواداچوونی ئێمە هی خەیام نییە بەڵکو هی حکیم افضل الدین محمد مرقی کاشانی ( بابا افضل)ـە و بە هەڵەی ڕێنووسیشەوە لە تەفسیرەکە چاپکراوە. ڕاستییەکەی بەم شێوەیەیە:

ای تازه جوان بشنو از این پیر کهن
یک نکته که هست مایه و مغز سخن
یاری که در او معرفتی نیست مگیر
کاری که در او منفعتی نیست مکن

## سێبەر و شەوبا!

ئەکسەری سێبەر، خاسەتەن سبەینان فێنکە، گەرمیی باشە، ئەمما شیددەتی -خصوص لەگەڵ سموم- خراپە، قاتیلە. لە قاموس ئەڵێ حرور بای گەرمی شەوە. واقیعەن شەوبای گەرمی زۆر ناخۆشە. خصوص لە بیلادی حاڕڕە، شەوی گەرمی بە گەرمەیا، میسلە بۆ ئەوانەی لە حینی ئەمەلی خۆشی، ناخۆشی بدەن، لە سایەیان شەڕ ببیندرێ.

۷۷/۸

تەلقین بۆ کوردان بە کوردی!

ئینسانێ جەماد بپەرستێ لە ئەمـوات بەرەژێرترە. سبحان اللـه ئەو زیندیانە، ئەو مردیانە ئەمڕۆ چەند دیارن! ئەقوامی حەیـیە و ئەقوامی مەییتە، نازانێ ئینسان چ بڵێ؟ قورئان و دەعاوی زۆر لێك دوورن، ئوممەت و قورئان یەکناگرن. ئەوەی سەیرە، لە تەلقین ئەڵێ: سوئالت لێ ئەکەن، ئیمامت، ئەبێ جواب دەیەوە: قورئان.

واقیعەن ئیمام و مەئمومێ نالێ، هەریەك ڕوو لە لایەك...مەلای مولەققین زۆر ئەشیرینێ، تا مردی گوێی لێ بێ، ئەننهەهو لە ڕەغمی قورئان قووەت ئەداتە خۆی، ئاگاشی لێ نییە، چ جایە مردی، زیندییەکان نایبیەن، تێی ناگەن!

من گەلێ جار ئەڵێم: برادەران، تەلقینی سەر قەبران بۆ زیندیانە، تێی بگەن، بخوونن. مەلا بە سریانی تەلقین بدا کوردی بەستەزمان، لە عەرەبی ناگا. کە مرد هەموو شتێ فێر ئەبێ. تەمام! خۆزی تا زیندین شتەکتان زاناندبا، گەر لە مەلا سوئال کەی: زوبانی سریانی چییە؟ چۆنە؟ جوابی پێ نادرێتەوە. چ قەیدی یە؟ تەلقین بۆ کوردان، بە کوردی، خوتبەی جومعە نییە، واجبیش نییە، سونەتیش نییە، ئیتر بڵێم چی؟!

۷۸/۸

## هەر عولەما لە خوای ئەترسێن!

هەر عولەما لە خوای ئەترسێن، عولەماش موختەلیفن. بەعزێ نەحوین، بەعزێ صەرفین، وەهاکەزا. ئەمما عیلمی قیل و قال خەوف نادا، زاتەن عیلم نین، موقەددیماتن بۆ عیلمی نافیع. عیلمی نافیع عیلمی صانیعییەتە، عیلمی تەبیعەتە:

عیلمی تەبیعەت، عیلمی خودایە
قال و قەولە گشتی هەبایە

بەڵێ کەسێ ئیمانی بە خوا هەبێ، ئەسراری کائینات، دەقائیقی صونعی ئیلاهی بزانی، جەلال و عەزەمەتی خوای، ئیستیللای بەسەردا دەکا، بە حەق دا دەکا، بە حەق لێی ئەترسێ، کە ناوی بێنی، زەلزەلەی ئەکەویتە بەدەن. ترسی وی خەیاڵی و وەهمی نییە، عەمەلی و حەقیقەتە، ترسی تەبجیل و تەقدیس تەعزیمە؛ فەقێ تێگەیشتی؟

کە دەرەجە لە عیلمی مامۆستای خۆی تێگەیشت، وا هەیبەت و سەتوەت و مەلایی ئیستیللای ئەکا، ئەوەندەی لێ ئەترسێ، ئەوەندەی شەرم لێ ئەکا، کە دەهشەتی پێ ئەدا. جاهیلێ تەك بە تەکی دادەنیشێ، گوێشی ناداتێ، قەدری نازانی، وە مەرحەباشی لێ ناکا. مەلای تەبیعی ئیمانی بە خوای صانیعی عالەم زۆر بەقووەتە، خورافات هەڵناگرێ، لەبەر خورافاتی نوقالان، ئیمانیان بە ئەدیان و بە ڕوسول نەماوە، نیە.

مع الاسف عولەمای سوئ وایان تێگەیشتینە، عولەمای دین لەسەر ئینکاری تەبیعەتە، ئی عولەمای تەبیعەت لەسەر ئینکاری شەریعەتە، ئەگەر خودا کەرەم کا مەلا، مەلای شەریعەت و تەبیعەت بێ، خۆیەتی، فائیدەی دارەینی ئەبێ. لاکین کەمن، یان نین ئەو ئایاتی کەریمە، وەکی مەعلوومت بوو، میفتاحن بۆ سێ عیلم، عیلمی نەبات، عیلمی مەعدەنە، مەنشەئی حەیوان نەباتە، حوکەمای بەو سێ عیلمە خەریکن، قازانجیان کرد، بەسەرکەوتن.

حوکەما ئیمانیان بە خوا هەیە، ئەمما تەماشای عیلەل و ئەسبابی قەریبە ئەکەن، سەبەبی قەریبی ئیختیلاف ئەدۆزنەوە. حوکەما ئیمانیان بە صانیعی

عالەم هەیە، ئەمما تەماشا ئەکەن، صانیع چۆن ئەو مەصنووعە ئەکا؟ تا لێی فێر بن، ئەوانیش صونع بکەن، حوکەما تیلمیزی خوان، حوکەما مـن تەغیریان بە ڕەسوولی تەبیعەت ئەدەمەوە.

لێرە عولەمای تەسەووف موراد نین، خەوفیان کەشفیان لە عالەمی وەهمییات و خەیالاتە، کەشفی جابورسا و جابولقا، لەگەڵ کەشفی ئەمریقا ئەوجا ئەزانی بێ نەفعە، بە نەفع چییە؟ فەرقی چەندە؟ ناتۆڕنە قورئان، تەماشای لوح المحفوظ ئەکەن، ئەوەی بە خەیاڵ تیای ئەبینن، بێ کەڵك و وەجە، بەڵکو موزیرڕی دونیا و قیامەتە.

واقیعەن صولەحایەکانیان گەلێ باشن، ئەمما ئەو مەسلەکە، لەگەڵ ئەساسی دینی ئیسلام ڕێك نەبوو، حیفزی دینی ئیسلام زۆری پێ ئەوێت ئەمڕۆ زۆرتریشی پێ ئەوێ. لاکین چوو! ڕوئەسای سوێ دینیان گۆڕی، لە مەیادینی نەبەرد و مەردی، گەڕانەوە بۆ ژێر زەمین، ئاخیری ڕۆچوون... ئەدیانی سەماوی، مەلایان گۆڕیان، ڕوئەسای لاهووتی و ناسووتی تێکیان دان، ئیتر ئەوەندە بەسیە.

٨٣/٨

عولەمای ڕاستی، یەعنی لە ڕوئەسای سیاسی نەبێ، لە خوا ئەترسێ، ورد و لە جیهەتی خوا نەکا، خوا بانگی کردم: ایها العالم الكبیر، والمجتهد الاعظم، ئەوە لایان نییە، لەبەر خەوفی خوارەوە بێ درۆیی ئاخیری ئەو فیرقە بێ حورمەت بوون، ئەوانی درۆزنی لە خوانەترسن، بوونە رأس الكل ی فی الكل، ئوممەت سوجدەیان بۆ دەبەن.

٨٤/٨

## دەرسی تەفسیر!

من ئەو بەینە دەرسی تەفسیر ئەڵێم: ئەمڕۆ لە سورەی ئالی عیمران دەرسمان ئەدا کرد. زۆر جار بە جەماعەتی فەقێکان ئەڵێم: تەفسیری قورئان وەکی باغێکە، هەموو نەوعە میوەی تیابێ، لەم دەچی بۆ ئەو لەو ئەچی بۆ ئەم، هەر یەکی لەزەتی هەیە. بۆ ئەربابی زەوق حەقیقەتەن

وایە، وە ئەوەی عیلمەکی زۆر موحیتی نەبێ، ناتوانێ بە حەق دەرسی تەفسیر بدا، وە علومی عەسرییەش زۆری پێ ئەوێ.

٨٤/٨

## خێر بە دزیی چاترە یان بە ئاشکرا؟

هەندێ کەس تەماشا ناکەن، لێک نادەنەوە، دغدغەیان بە دڵ دابێ وابکەم ڕیاییە، بە دزی چاترە. بەڵێ جێی ئینفاقی سیرڕی جودایە لەگەڵ ئینفاقی عەلەنی. کەسێ مزگەوتەکی دروست ئەکا، کوتوبخانەیە دادەنێ، چۆن بە دزی ئەکرێ؟ بەڵێ کەس لە جەهالەتەوە ناوی خۆیان و تەئریخی بینای مەسجید نانووسن، دوایە لە فکر ئەکرێن. حەقیقەتەن خەیاڵێ باتیڵە. حەزرەتی خلیل الرحمن دوعای بەقای ناوی خۆی کردیە، ناشکوری نەبێ، ئەو جوملە مەلایەی خوا لەم عەسرە ئیخراجی کرد، علی الاکثر فەقیرن، چاویان لە دەستی خەڵکییە، ئی دەوڵەمەندیش کەم وایە بۆ خوا لە ڕێی عیلم ئینفاق بکا.

چەند خۆش بوو ئەربابی قووەت و سەروەت بینە مەلا، بە قووەتی ماددی و مەعنەوی خدمەتی دینیان کردبا، ئەو وەقتە عیلم و دین قەت بێ قەدر نەدەبوو. زاتەن عولەما گەورەکانی سەلەف ئی نامدار، هەموویان ئەربابی مەکانەت بووین، دەوڵەمەندی دونیا و قیامەت بووین، مەلای فەقیری بێ دەسەڵاتی، بێ ئەحواڵ، چی لەمست دێ؟ خۆی پێ بەخێو ناکرێ، خاوەنی دین چۆن ئەکات؟

٨٥/٨

## حەق بۆ ڕیوایەتان مەگۆڕن!

حەق بۆ ڕیوایەتان مەگۆڕن، بۆ خاتری عەمر و زەید خۆتان مەکەنە دوژمنی حەق، دینی خۆتان، کیتابی خوا، بۆ نەفعی شەخسێ مەدۆڕێنن، خۆتان مەکەنە خەسارەتمەندی دونیا و ئاخیرەت. درۆ بۆ مەلا نەفعە، بۆ شێخی وەی خەسارەتمەندی دونیا و ئاخیرەت، بەناوی ویلایەت خۆی

کافر ئەکات. عەرزم کردن مەلا لە خوا ئەترسێ، درۆ ناکا، وایە. لاکین مع الاسف بەعزێ هەن لە خوانەترس، بۆ خەڵکی درۆ ئەکەن، بۆ خەڵکی درۆیان قبوڵ ئەکەن، تەرویجی ئەدەن، عالەمێ ئیغوا ئەکەن. حەقیقەتەن تیجارەتێ بێ فائیدە، بە مایە و قازانج تێئەشکێ. تا ئەتوانن تەمەسسوك بە قورئان کەن، بە قیل و میل هەڵمەخەڵەتێن، عاقیبەت وەخیمە!

٨٦/٨

## هەردووك بە یەك ئەڵێن: ئەسحابی بیدەع و ئەهواء!

ئینسان نازانێ ئەو هەموو ئیختیلافە چییە؟ نیزاعی ئەشاعیرە یاخود سوننی و موعتەزیلە دائیمەن بەرپایە، هەردووك بە یەك ئەڵێن: ئەسحابی بیدەع و ئەهوەئـ هەرچی هەیە کەسێ بە ئینساف تەماشای ئوممەت کا، ئەزانێ فاسقەکانی موئمین بۆ دین و دونیا، بۆ ئیسلامەتی لە کافران خراپترن. شکستی ئیسلام نشوستی ئیسلام، زیللەتی مسوڵمانە هەمووی لە ڕووی فاسقانی بەد عەمەل و بەد ڕەوشت، بۆ حاڵی دونیا وایە. با بۆ خاتری سوننیان، لە قیامەت کێ ئەفسەقە، پێش رسول الله وە خلیل الله حولییان لەبەر بکرێ. واقیعەن ئەگەر دەرکەی عەفوو و غوفرانیان بەو دەرەجە نەکردبایەوە، فسق وا تەعەمومی نەدەکرد.

شافیعی ئیعتیباری عەدالەت ئەکا لە ویلایەت و شەهادەت، ئەگەر ئەئیممەکانی دی موافەقەیان کردبا، ئەمڕۆش ڕەونەقی تەقوا ئەما. خولاسە بە هەموو لایە تێکمان دا، ئێمە جەزا ئەبینین، کەوتینە جەحیمی زیللەت. ڕۆژی جەزا بزانین چیمان بەسەر دێ؟ هانامان ئیلتیجامان بۆ لای خوایە!

٨٧/٨

## ئینسان و مەیلی منداڵی!

سبحان اللە ئینسان علی الاکثر حەتتا لە ئاخیرەت مەیلی منداڵی دانانێ، ئەگەر مەیلی منداڵی نەبێ، پادشاهی عظیم الشأن مت و مۆری چۆن بە خۆیەوە ئەکات؟ بە ئەجار و مەجار مەسروور و مویاهی ئەبێ؟

عەبدولمەجید خانی سانی زاتێ گەورە بوو، لیباسی سوورمەلی ئەسڵەن لەبەر نەدەکرد، نیشانەکی بە حەجم گچکە، نیشانەی خانەدانی سەڵتەنەت لە ئەیامی ڕەسمییەی بە سینگییەوە ئەخست و بەس. وە مەعلوومە زێڕو زیو و زینەت و ئارایشی جەننەت قیاس لە ئی دونیا ناکا.

٨٨/٨

## چۆن بە درهەمێ ڕابوێرێ!؟

ئەمڕۆ بەو گەرمایە، بەو هەوا موکەددەرییە، نەوجەوانێ، فەقیر، موحتاج، ئەڕواتە چنارۆك. بە پای پیادە، ئەو هەوراز و نشێوەی ئەبڕێ، ئەچێ لەناو باغی پێمەڕە ئەکات، عارەقی ڕەش و شین ئەڕێژێ، باز بە کەمالی تەعەب دێتەوە، بە درهەمەکی یەعنی پەنجا فلس. ئەوجا ئەگەر ساحێب عائیلە بێ، بە چی بدا؟ چۆن بە درهەمێ ڕایبوێرێ؟

٩٠/٨

## حەمەدی حەمەدانی هەرتەلێ!

کابرایە بانگی شەخسەکی ئەکرد لە هەرتەلێ: هۆ هۆ حەمەدی حەمەدان!

جواب: ما باکەی؟

-بنۆڕە بەردا بۆرا پشت مالان، بزانە کووچە کەرا من نییە؟

حەمەدی حەمەدان: ئێمە بە لەپکی لە چاوان کەتی، گەر ئەڵێی بەردا بۆرە پشت ماڵان، ما ئەڵێی بزانە کووچە کەرا من نییە؟

٩٢/٨

## چەند ساڵە خسوس ئەمساڵ، ترێ لە وڵاتی ئێمە ئافاتی هەیە!

ئەگەر تەماشای تەریقەی تەکوینی سەمەرە بکەی، هەر دانە چەند دەفتەرێکە، لە فەوقی تۆماری ئەفلاتوونی. مع الاسف چەند ساڵە خسوس

ئەمساڵ ترێ لە وڵاتی ئێمە ئافاتی هەیە. هەم هورڕەی ئەیبا، هەم ژەنگ لێی ئەدا بێ کەڵك ئەڕوا! ئومێدم وایە ساحێبی ئەو ئایەتە ڕەحمێ بکا، دەرد و بەڵامان لەسەر هەڵگرێ.

سبحان الله نەبییە ئوممییە وەحی ئیلاهی ئەو دیقـقەت و سونع و تەکوینە ئەزانێ، حوکمەن وە عیلمەن لێی غافڵ بوون، تا لەو ئاخیرە کەشف کا. ئەمما شتێ هەیە، عەجایبە لە وڵاتی مە، دۆشاو دروست ئەکەن، گڵی سپی هەیە ئەیهاوێتە ناو مەنجەڵی سۆراوی ترێ تێئەگەڵێ غەیری ماددەی سوککەرێ مەوادی تر فڕێ ئەدا. دوایی تەسفیەی ئەکەن ئەبێتە دۆشاوی شیرین! چۆنیان زانی دۆشاو بەو گڵە ئەکرێ؟ میفتاحیان چۆن دۆزیەوە؟

گەلێکم سوئال کردیە، کەس نەیتوانیە جواب داتەوە ئەوانیش وەکی حیرەت ماین!

١١٠/٨

## شێخ سمایلی عەوداڵان!

گوێگرە قسەی نوقڤالان، ئەو شەمسی وا عەزیمیان کوو کردیتە قوتولەی قەلەم و زوبانیان! بۆ شوعاعی شەمس و نوور پەکی عیسای ڕەسوولی مەللاحە. ئەدی پێش عیسا؟ ماشاءالله هذا بهتان عظیم.

شێخ ئیسماعیل حەزرەمی ئەمری کردە شەمس: ڕاوەستە! ڕاوەستا! ئیشارەی کرد: ئاوابە. ئاوابوو!

شێخ ئیسماعیل —سمایلی عەوداڵانی خۆمان، حەوت ساڵان جلەوی ڕۆژی ڕاکێشا، ملیۆنێ وەکی ئیسماعیل هەموو ئەرز و کائیناتی نەزەر بە شەمس بە قەد دانە هەرزنێ نابێ، بە قیاسی قوببەیە وەسیع و ڕەفیع، لە نزهة المجالیس[1] ئەڵێ: ناوی حەزرەتی ئەبوبەکری لەناو دڵی شەمس نووسراوە، هەموو ڕۆژێ کە ئەگاتە نێزیکی سمتی کەعبە، ئەیەوێ

(١) مەبەست کتێبی نزهة المجالس ومنتخب النفائس، کە دانەرەکەی عبدالسلام الصفوری (٨٩٤ ك، کۆچی دوایی کردووە)یە.

ڕاوەستێ، یەعنی بەسەر کەعبەیا تێنەپەڕی، مەلائیکەکانی جلەوکێش سوێندی پێدائەدەن؛ بە حەقی ئەو کەسەی ناوی لە ناوت نووسراوە، ئەگەر نەڕۆی، ئەوجا ئەڕوا، وە هاکەزا قسەی هیچ و پووچیان زۆرە.

١١٢/٨

بە موناسەبەی کەعبە لەبەر ئیمانی قەومێ وە زێدە لە ئەندازەی دەرچوون، عولەمای شەرع ئەفەرموون: ئەگەر کەعبە لە جێی خۆی نەما، مەسەلەن چووە زیارەتی وەلییە لە ئەولیائوڵلایان، لە نوێژدا ڕوو لە هەوای مەوقیعەکەی ئەکەین.

وە ئەڵێن: چووە بۆ زیارەت، بالفعل واقیع بووە.

لاشەك ئەمە خورافاتە بێ ئەسڵ و بێ ئەساسە، سێ سەد بوتی پێوەبوو، بۆچی یەکێ فڕێنەدان؟ تا حەزرەتی خاتم الرسل لە نەجاسەتی ئەصنام پاکی کردەوە! حاجەت بە تەئویلی مەلایەکان و سۆفییە گەورەکان نییە، شەمس شەمسە، کەعبە کەعبەیە، حەقیقەتیان دیارە، چ ماهییەتێ مەجهوولیان نییە.

حوکەمای جەدید ئەڵێن: شموس و ئەقمار زۆرن. وە مەلای تەنتاوی خوا بەرقەراری کا، لە تەفسیری خۆی ئەفەرموێ:

مەلایە تونسی گۆیا ئەمە بە کفر ئەزانێ، ئەننەهو خوا نەصصی داناوە، شەمس یەك، قەمەر یەك، تەعەددودی نییە، ئەمە کەلامێ جاهیلانەیە. مەلایە وەکی تەنتاوی مسوڵمان و جگەرسۆز بۆ ئیسلامەتی، چۆن بەو نەوعە قسە تەکفیر ئەکرێ؟ بەڵێ ئەمە کۆنە سیلاحێکە بە دەست مەلایانی کۆنەوە، لاکین سیلاحێ کولە، لاشەك بۆ خۆیان زەرەرە.

مەتێ یە فەندی ڕیسالەتی هەی، بەناوی سوپەری ساعیقە، چەند فەسڵەکی تیایە، لەسەر قەولی حوکەمای فەلەك و تەبیعەت. ئەیفەرموێ: دوای کوللی فەصل (ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ) ئەنوسێ. زۆرم پێ خۆش بوو، دیارە ئەم تەقدیر و تەرتیب و تەرکیب و صونع و تەشخیرە لە تەرەف زاتێ غایەت غالیب و عالیم بە عیلمێ عەمەلی، صونعی، ئیجاد کرایە. لە تەبیعەتێ جاهیلییەوە نابێ، وە تەئسیری تەبیعەتیش کە مەخلووقی خوایە ئینکار ناکرێ. یەکێ لە شاهیدانی سوپەری صاعیقەیە.

١١٣/٨

## ڕۆژگیران!

لەو ساڵانە ڕۆژ کەمەکی گیرا، تەقویمی ئێران ئەیوت: بیستی مانگ نحوسەتی باقییە" بە نورەدینی برام وت: لەو قسە ئەفامرێتەوە، ساڵی (أتی) ڕۆژ ناگیرێ.

حەقیقەتەن وابوو، وە لە تەقویمی جەدید وتیان: ناگیرێ! عولەمای میللی خۆڕایی، خۆیان بە ڕەددی ئەم نەوعە حەقائیقە ماندی ئەکەن، ئەگەر شەریعەت وەزعییە، ئەگەر تەبیعییە، هەردوو ئی خوایەکن، تەنافییان نییە. ئیللا بە ئیعتیباری وەهم و خەیالی میللیونان نەبێ.

١١٤/٨

## مانگ ژیانی لەسەر بووە!

ئەگەر چی عولەمای تەفسیر و هەیئەت، مەنازیل بۆ قەمەر تەقدیر ئەکەن، وە ئەو مەنازیلانە ئیعتیبارین، مانگ لە هیچ مەنزلێ دانابەزی، ڕاناوەستێ، قۆناغی ناگرێ. تەفسیلی مەنازلت ئەوێ موراجیعەی کوتوبی هەیئەت و تەفسیری روح المعانی سەییدی ئالووسی بکە. ئەگەر قسەی ئەهلی فەلەکی جەدید ڕاست بێ، قەمەر حەیاتی تیا بووە، بە مروری ئەدوار حەیاتی تیا نەمایە (حَتَّىٰ عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ) مومکینە پاش ئینقیتاعی حەیات نووری خۆی تیا مابێ. بۆیە لە ئەووەلی شەهر، شکڵ و ڕەنگی وەکی ڕەگی دار خورمای پیر، یا لاسقی وشکی، یا باسکە لقی وردەلەی هیشك بووبێ ئەنوێنێ.

ئەساسەن ڕەگی دارخورما، مەداری حەیاتییە. بەعزێ ئەحکامی حیسسی، حیسس بە تەواوی پێی ناگا، بە قووەتی حەدەس ئەزاندرێ. ئەفلاتوون بە قووەیە غەربییە، ئەمما نایەبە، لای مللییون کەم دەست ئەکەوێ، نایەڵێ، یاخود ناڵێ نییە. لاکین لای حوکەمای تەبیعەت و کیمیا و فەلەك هەیە، ئەکسەری ئیختیراع لە ئینتیقالی حەدەسییە، بێ

سەبەقی تەفەککور و خەیاڵ. من مەقالەیە، یا ڕیسالەیەکم هەیە (الحدس سُلّمُ الارتقاء) حەققەن شایانی موتالەعەیە. قەدیمییە مەعنا کۆنە، موقابیلی نوێ و تازەیە، نەك مەوجودی بێ ئیبتیدا، دائیم و مستمر الوجد ی بێ نیهایەت.

١١٤/٨

## کەسێك دووبارە لەسەر دەستم مسوڵمان بۆوە!

عولەمایانی نەقل و حیکایات دەمیان لە فەلەکییات داوە، رجما بالغیب قسەی نامەعقوولیان زۆر کردیە، بۆ تەرویجی ئەوهام و موزەخرەفاتیان، حەدیسی زۆریان ڕێك خستییە. وەکی ئالووسی نوقتاد ئەفەرموێ صەحیح لە ئەخبار کەمە! وە سەییدی موحتەڕەم ئیعتیماد لەسەر ڕیوایاتی ئیمامییە و ئەکسەری (ما فی الهیئة)ی سوننیە نییە. ڕەحمەتی لێ بێ و خوا جلال الدین سیوطی عەفوو کا، زۆر خورافاتی گردکردیتەوە، بە ناوی حەدیس مەوجیبی ئینکار و مەعازەڵلا کوفری ئەهلی عیرفانە، ئەوانەی کە ئاگایان لە مەڕاتیبی ئەحادیس نییە.

یەکێ لە ئەعازیمی ڕیجالی عوسمانی لە زەمانی حەڕبی گەورە هاتە ئێرە، تەڵەبی کردم، چوومە زیارەتی. لە کەیفییەتی تەدریس و چ نەوعە عیلم خوێندنی پرسی.

جوابم دا، ئەز جوملە عیلمی هەیئەت ئەخوێنن.

وتی: کیهە هەیئەت؟

وتم: هەیئەت هەر یەکە!

وتی: نا دووە!

وتم: خێر، یەکە!

وتی: جانم بە منداڵی بە ئێمە ئەڵێن عیلمی هەیئەت دووە، یەکی یۆنانی، یەکی ئیسلامی.

وتم: حاشا وا نییە، هەیئەتی ئیسلامی چییە؟

وتی: ئەوەی کە ئەڵێن: ئەرز لەسەر شانی مەلائیکەتە، مەلائیکەت لەسەر بەردە، بەرد لەسەر گاجووتە، گاجووت لەسەر ماسییە.

وتم: سبحان الله کێ ئەڵێ ئەم هەیئەتی ئیسلامییە؟ تەئمینت ئەکەم، ئەو قسەیە لە بەینی دوو لێوی پێغەمبەری دەرنەچووە، ئەو خورافات و

موزەخرەفاتە ئەغلەب لە کەعب و ئەمسالیەتی، ئیسرائیلییاتە هێنایانە ناو ئیسلامەتی.

ڕووی کردە قائیمقامی مەرحووم ئەحمەد حلمی، وتی: بە شاهید بە ئەلئان من لەسەر دەستی فلانی مسوڵمان بووم. وەڵلا قەلبەن ئیمانم نەبوو، چونکی وام ئەزانی ئەو قسانە لە تەڕەف حەزرەتی موحەممەدیە، وە مەعلوومیشە وا نییە. ئەمڕۆ مەعلووماتی بەشەری بوویتە عەیانی.

جا چەند هەزار ئینسانی وا بە بێ هوودەیی لە دڵدا موئمین نەبووە، وە واش لە دونیا چوویتەدەر، تووشی مەلای نوققاد نەبوون، بەیانی حەقائیقیان بۆ بکات. ئەو چەند حەقیقەتە تا بڵێی تەفسیر و تەحریر هەڵئەگرێ، حەققەن حەققە بە یاسین بڵێن قلب القرآن ـە.

١١٦/٨

## خوا بتداتێ!

جەهلێ ئاشکرا، مادام خوا ئەو ڕزقەی داتە ئێمە، ئێمە بۆ بیدەین بە خەڵکی؟ فی الحقیقة ئەو ئیعتیرازە دێتە سەر ئەشاعیران. لاکین بە ئەسبابی عادی خۆیان نەجات ئەدەن. واقیعەن خوا ئیرادە بکات، ئیحتیاجی کەس بە کەس نایەڵی، ئەمما نەزمی حەیاتی دونیا لەگەڵ ئەمە ڕێك ناکەوێ. ئەسبابی مەعیشەت تەقسیم کرایە، زۆر کەس لەبەر پیری، نەخۆشی، بێ موناسەبەیی لەگەڵ مەسلەکی وەکی مەلایان بێ کار و کەسابەت ئەمێنن. دونیەن وە ویجدانەن ئیجاد ئەکا، موساعەدە ئەکا، موساعەدە بکرێ، دیارە ئەو قەومە جاهیل و بەخیلن، نە تەحسیلی عیلم ئەکەن، نە کاری چاك. زۆرم پێ ناخۆشە، کە فەقیرێ سوئال ئەکات، پێی ئەڵێن: خوا بتداتێ! ئەگەر چی بە وەجهی دوعا ئەیڵێن: سبحان اللە. وا دەرئەکەوێ غەیری ئیتعام لە ئینفاق، حەتتا بە نەفییش بە دڵیان دا نایە. باز سبحان اللە ئەمڕۆش ئەوانەی ناصیحن، بە عەینی کەلام موقابەلە ئەکرێن! بەڵێ وایە، چارە لە تەڕەف خودایە!

١١٩/٨

## عەزابی قەبر!

عەزابی قەبری با ببی، ئەمما لازم نییە تا ئەبەد یەعنی تا بیعسەت دەوام کات. ئینسان نازانێ بڵێ چی؟! لینین ئەوا چەند ساڵە، لەناو مەرقەدی مینا خەوتووە، چ ئەسەری عەزابی تیا دیار نییە. ئەگەر گورزی مەلائیکەتەکانی پێ کەوتبا، تەبیعی قەبرە مینایەکەی خرد و خاشاك ئەبوو، هەیکەلی فەراعینان چەند هەزار ساڵ بوو، لەناو ئەهرامان دان، بە مۆمیاکراوی مابوون، لە پاڵ یەکیش نەهاتبوونەدەر. دیارە عەزابی قەبر شتێ ترە، وەکی عەزابی حیسسی دونیا نییە، ئەسەری لە بەدەن زاهیر بێ، هەرچی هەیە خوا بمانپارێزێ.

١٢٠/٨

## شەیتانیان حەساندیتەوە!

ئەقوام و ئومەمی زۆر حەتتا خۆی ئەگۆڕێ لە بەعزەکان بەناوی مەلیکی تاوس عیبادەت ئەکرێ. لە بەعزێ موجەللەی میسریم دا دیبە، داسنی وڵاتی ئێمە ئیبلیس بە ئیلاهی ئەرز ئەزانن، ئەڵێن : خوا زۆر خەریك بوو، بۆ ئیسلاحی بەشەر بۆی مویەسسەر نەبوو، چۆوە ئاسمانان، زیمامی ئیدارەی ئەرزی دایە ئیبلیس. لام وایە ئەڵێن تا دە هەزار ساڵ.

لەتیفە: بۆ کێ هەیە بڵێ: ئیبلیسیش زیمامی ئیدارەی تەدلیس و تەبلیس و سیاسەتی حیلەکاری بوو فیتنە ئەنگێزی دایتە سیاسیونی ئینگلیزی، لە گەڵێ جیهەت شەیتانیان حەساندیتەوە.

حەققەن ئەمڕۆ ئیبلیس کاری خۆی لە بەشەر دیت، ئارەزووی تەمام هاتە جێ.

١٢٣/٨

## کوێری و تەمەن!

ئینسان بە گەورەیی کۆر بێ چی پێ ناکرێ، بە ڕێی جادە و مەئلوف دا ناتوانێ بڕوا. ئەمما ئەوانەی بە منداڵی کۆر دەبن، زۆر زرنگن، عەجایب ئەڕۆن حەتتا بەعزەکیان دار بە دەستەوە ناگرن.

١٢٥/٨

## مرۆڤ و ورچ!

شەخسێکم دی ڕووی زۆر بە ورچ ئەچوو، خسوس لێو و چەنەگە و کەپووی. حەتتا بۆ موبالەغە ئەیانوت: ئەوە لە ورچە، داکی لە ورچی گرتووە، لە چیای لای مەرگە.

١٢٥/٨

## کێن ئەوانەی دەبن بە شاعیر؟

شاعیری و مەیل و میزاجی ڕیسالەت پەنا لێك دوورن. ئەشراف زادەکان نابن بە شاعیر، مەگەر خیسسەی تەبعیان بێ، هەجوو مەدحی خەڵکی بە ژنان و ئەمرادان هەڵگوتن لایەقی تەبعی عالی نیە. ئیغرا لە عالی نەژادان نایە، بەڵێ مومکینە بەعزە زەواتی گەورە، چەند مەواعیز و نەسائیح و حیکمەت باوێتە قالبی مونەززەم و عیبارەتێ خۆش و نازك و لەتیف. ئەمما ئەو کەسە شاعیر نیە، نازمی دوڕ نەسساجی خیوطی زەهەبی و حەریرییە. زۆر وادەیێ لە ئەسنای قسان عیبارەتێ مەنزوم بەسەر زوبانی ئینسانی دا جاری ئەبێ. حەتتا لە مەقولەی کوتتابانیش زۆرە و قائیلە، نەتوانی شیعر بخوێنێتەوە، یەعنی ئینشادی بفەرموێ. وەلەو کەوا نەقل کراوە، ئەگەر ئینشادی شیعری کردبێ، بە لەنگی خوێندبیتەوە. تەبعەن لا قەسدەن کە ڕەسوولی ئەکرەم شاعیر نەبێ، قورئانیش شیعر نیە.

١٢٦/٨

## هێرشی ئەستێران و وەفاتی کاك ئەحمەدی شێخ!

من لە ئەوائلی منداڵیم، دیم شەوێ ئەستێرە لە شیمال و جنوب و شەرق و غەرب وەکی لەشکری هجومیان ئەکرد بۆ جیهەتی مەنتیقە، عالەم کەوتە دەهشەت تا سبەینێ دەوامی کرد. نازانم بە ڕۆژ ما یان نا؟ ئەمما بۆ شەوی ئاتی ئەو حاڵە نەما، ئەمما شوهوبەکان موکەددەر بوون، وەکی ئەوانی جار جار ئەبێ، ڕووناك مائیل بە سەبزی یا بە سووری نەبوون. مومکینە لە ئەوائیلی ڕیسالەتی ڕەسوولی ئەکرەم شتێ وا بووبێ. وابزانم دیمە لە تەئریخ لە زەمانی عەبباسییانیش شتی وا بووە. وە ئەڵێن: بە شەش سەد ساڵ جارێ وا ئەبێ؛ والعلم عند الله.

ئەو ساڵی من ئەڵێم حەزرەتی کاك ئەحمەدی شێخ وەفاتی کرد، حەتتا گەلێ جەهەلە ئەیانوت: لەبەر وەفاتی وی بوو! وابوو تەئریخ هەزار و سێ سەد و چوار یان پێنج بوو[1].

١٣٨/٨

## ئەمانە بۆ لەگەڵ جووان حەشر نەکرێن؟

حەققەن کوفری پیاوان لەمەڕ ژنانە، خسوس ئەمڕۆ زۆر ئاشکرایە، گەلێ لە ئاوروپایی حەز ئەکەن مسوڵمان بن، ژنیان مانیعە. سەبەب بە موحەققیڕی موعامەلەی مسوڵمانان لە حەق ژنان، وا دەزانن موقتەزای دینی ئیسلام ئافرەتەکان تەنەففوڕ ئەکەن. وە ئەو کەشف و کەیفی مەسیحی پێیان ئەدات، دینی ئیسلام تەبیعی پێیان نادات. لە فاورووقی ئەعزەم نەقڵ کراوە، تەفسیری ئەزواج بە ئەمثال و ئەشباه، یەعنی ئەوانەی وەکی وانن، لە عەمەلی سەیێ، هەریەك لەگەڵ هاوعەمەلی خۆی حەشر

(١) کە دەکاتە ١٨٨٦ یان ١٨٨٧ی میلادی.

ئەکرێ. وەلەو کافریش نەبێ، ڕیباخۆر لەگەڵ ڕیباخۆر، زانی لەگەڵ زانی، شەڕابخۆرەوە لەگەڵ شەڕابخۆرەوە، ئەمە بۆ مسوڵمانان ئینزاری عەزیمە، بە خوا حەققە.

ئەو ڕەمەزانە و گەلێ ڕەمەزانی تر، جەمعێ لە مسوڵمانان، بە ڕۆژ ئەچوونە ماڵی جوولەکان، ئەیانخوارد و ئەیانخواردەوە، ئەمانە بۆ لەگەڵ جووان حەشر نەکرێن؟ ئەمساڵ بەعزێ ئەچوونە خەلاخانان، قەسپ و هەناریان ئەخوارد، ئەمما نازانم ئەوانە، لەگەڵ کێ حەشر ئەکرێن؟ لام وایە نە جوو، نە دیان، نە بتپەرست، نە لادینی، ئەو دەنائەت و خیسسەتە ناکا.

١٤١/٨

## دقتۆر لە هەمو کەس زێدە شەڕاب ئەخۆنەوە!

ئەڵێن: فەرهاد لە کێوی بێستون لە مەسافەیە دوور جۆگەی لە بەرد داتراشی بۆ قەسری شیرینێ، لەوێڕا شیریان تێ ئەکرد، ئەهاتە ناو حەوزی قەسری شیرین.

ئینسان مەئلووفە، بۆیە ئەیبیستێ و تەعەجوب ناکا، ئاو لە کانیان، لە کارێزان لاینقطع دێ. نەفتی باباگوڕگوڕی چەند ساڵ بوو، ئەسووتا، حەفرییاتیان لێ کرد، نەفتی لێ ئینفیجار بوو. هەر وا بیران لێ ئەدەن، نەوت دەرئەکەوێ، لە حەواڵەی کەرکووك بۆ حەیفا و یافا جەریان ئەکا. خوا ئەزانێ چەندەها ساڵی تر دەوام ئەکا؟ ئێمە ئەمە بە غەریب نازانین، چۆن شیر لە عاردی وەکی ئاوی کانی دێتە دەر، حەڕەکە ئەکا؟ کەوا بێ مومکینە بڵێن: حاڵێ مەوقیعێ لە مەواقیعی عالەم وەکی ئی مە عەناسیری شیر، عەناسیری خەمر، عەناسیری هەنگوین، سەربەخۆ تیای تەرەککوب بکا. وەکی ئاو لە هایدرۆجین و ئۆکسجین، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر دیققەت کەین، تەکەوونی هەنگوین و شیر و خەمر، بە ئوسوڵ و تەرتیب و تەرکیبی داری دونیا، زۆر حیکمەتە، مەعمەلی عەجیب و عەوامیلێ غەریب و مودهیش و دەقائیقی صونعی زۆر تیایە، نەوعی تەکەوونی ئاو و نەوت نیە...

واقـیعەن مەی موەلیـدی کئـولییە، مـوحریقن، زەرەر بە سـیحەت و حەیـات ئەگەیەنـن، عەلاوەی تـام ناخۆشـی، شەخسـێ ئەیـوت: ئەگەر شەڕاب واجب بـا، خـواردنەوەی مەگەر یەکـی وەکـی کـاك ئەحـمەدی شێخ بیخواردبایەوە، وە ئیللا کەس نەیدەخواردەوە.

خەیام ئەڵێ:

**مەی گر چی بە شرع زوشت نامەست خوش است**
**چـون بـر کفـی سـاقی غـلامە سـت خـوش اسـت**
**تلـخ اسـت و حـرام اسـت و خوشـم مـی ایـد**
**دیر است کی هرگیز حـرام اسـت خـوش اسـت[١]**

سبحان اللـە هەر دقتـۆرێ عەسـری هەن، بە زوبـان و قەڵەم غەیبەتـی شەڕاب ئەکەن. بە عومومیش لە هەمو کەس زێدە ئەخۆنەوە، نەمبیسـتووە دقتۆر عوشرەتی نەبێ، غەیری صەلاحەدین وەصفی لە ئەهلی شام.

١٤٧/٨

## ئەبو نەواس و سەرخۆشی

ڕۆژێ ئەبو نەواس تەماشـای سەرخۆشـەکی ئەکـرد، لە حەڕەکـات و گفت و گۆی پێئەکەنی، پێیان وت:چۆن پێئەکەنی، لە دیتنی سەرخۆش؟ وە حاڵی توو مەعلومە!

وتی: لە عومری خۆم تا حاڵ، سەرخۆشـم نەدیتیە، هەرچەنـد لەگەڵ یاران (تعاطی) ئەقداح ئەکەین، ئەممـا مـن لە پـێش هەمـووان مەدهـۆش ئەبم، پاش هەمووان بەخۆدێمەوە.

---

[١] لە ڕاستیدا چوارینەکە ئاوایە:

می گرچـە بـە شـرع زشـت نامسـت خوشـت
چـون بـر کـف سـاقی غلامسـت خوشسـت
تلخسـت و حرامسـت خوشـم مـی آیـد
دیریست کە تا هرچـە حرامسـت خـوش اسـت

خولاسە ئەشریبەی بەهەشت، وەکی ئەشریبەی دونیا بە کودورات نییە، عەینی لەززەتە.

١٤٧/٨

## خوایە ئەو تەریقانە هەر چەند ئەساسیان زۆر باش بوو، بۆچی وای لێهات؟

سبحان الله بەشەر چەند عەجایبە؟ شێخ عەلائەدینی شێخ عومەری چەند فۆتۆغرافی خۆی ناردبوو بۆ جیهەتی قەزای ڕانیە تا ئەوانەی لە دیداری مەحرووم بووین بە دیتنی صورەتی موشەڕڕەف بن. وام بیست گەلێ دەستەو نەزەر لە بەری ڕائەوەستان. عادەتەن ئەیانپەرست.
وتم: ئایا ئەوەی شکلی شێخی کێشایە بیپەرستن، ئەو لە فەوقی ساحێبی صورەتە، خوایە ئەو تەریقانە هەر چەند ئەساسیان زۆر باش بوو، بۆچی وای لێهات؟ کەوتە دەستی جاهیلی خودپەرست لە خوا بە دوور! سامری لەبەر چاوی قەوم هەیکەلی گۆلکی دارژاند، پێی ئەوتن: هذه الهکم واله موسی. ئەکسەریان ئەیانوت: بەڵێ وایە سەجدەیان بۆ ئەبرد. مع هذه ئەبا سەجدە بۆ سامری ببەن.

١٥٦/٨

## کاردی بە ملی دادێنا نەیئەبڕی!

بە منداڵی ئیسماعیلنامەمان دەخوێند، لەوێ دەڵێ: کاردی بە ملی دادێنا نەیئەبڕی، حەتتا ئەڵێ: سیکارد بە جەواب هات، وتی: تو میگویی: ببر، الله جبار مرا فرمان ندادە، اندر نیکار (علی کل حال).

١٥٩/٨

## خۆم موتەحەییرم لە خەلقی نینۆك!

هەرچەند ئەمڕۆ ئینسان گەیشتیە دەرەجەیە لە ئیختیڕاع و سەنایعی (فوق التصویر). باز لە صونعی ئیلاهی موتەحەییرە، هەرچی بیکا، لە

دیققەتی صونع و بەثی حەیات، ناگاتە خەلقی پێشوولەیە. ئەدیسۆن مەشهوورە دەفعەیە نینۆکەکی ئەزیەتی پێ ئەگات بە ڕەفیقی خۆی ئەڵێ: لەسەر ئەو هەموو ئیختراعەی خۆم موتەحەییرم لە خەلقی نینۆك!

ناڵێم ئینسان خالیقە، ئەمما هەرچی ئەپەرستی غەیری خوا مادونی خۆیەتی، ئەو فەوقی مەعبودیەتی. حەتتا ڕۆژ هەر چەند ئافتابی عالەمی تابە، ئەمما بە عەقڵ و هۆش و دڕایەت و عیلم و فیکر و تەدەبور ناگاتە ئینسان. سبحان الله خوا ئینسانی وا عەزیز کردیە، ئەمما خۆی خۆی وا ڕەزیل ئەکا، سەجدە بۆ بت و گا و ئەمسالی ئەبا. (وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ) بۆ غەیری زاتی ئەقدەس سەرفروودی ناکەن. لاکین مع الاسف تەبعی لەئیم قەدری ئەو عیززەتە نازانی، وەلەو خۆی بە عیلم و فەزڵ و ساحێبی قەدر بی.

١٦٣/٨

## خوا پێی کردووم!

سبحان الله گەلێ لە مسوڵمانان ئیشی بەد و ناشیرین ئەکات، کە تێی ئەفکری پێی عارە بڵێ: من کردوومە!

ئەڵێ: خوا پێی کردم!

گوایا ئەمە ئیماندارە، نیسبەتی خێر و شەڕ بۆ کیبرائی، نازانم چ فەرقی هەیە؟ ئەوانەی شێت و گێژ و وێژ و عەورەت بە دەرەوەی قون نەشۆر، ئەڵێن: وەلی خوان!

ئەگەر قەدری خوایان بزانیبا، ئەلبەت ئەیانزانی کێ لایەقە، بۆ ویلایەتی خوداوەندی!

١٦٨/٨

## ئەننەهو ئەللور بلورانێ ئەکات!

ئەڵێن ئیمامی ئەبوبەکر فەرموویەتی: مەلائیکەت بەناتی خوان بە زەعمی ئێوە، ئەدی دایکیان چن؟

جواب: کیژی گەورە گەورانی جن. ئەبێ مەقسوود شەیاتین بی.

وە بەعزێ ئەڵێن: ئیبلیس کوڕی خوایە، عیسیانی کردیە، حەڕبیان بووە، عاقیبەت باوکی غالب، ئەڵێ: یۆنانی قەدیم هەذەیانیان زۆرە، شوعەرایان وەکی شانامە حەڕوبی بەینی ئالیهەیان نەزم کردیە. یەکی برای کوشتیتی کوڕی تۆڵەی کردیتەوە، ژنی نازانم چی کردیە؟ ئەفلاتوون زۆر سەرکۆنەیان ئەکا ئەڵێ: ئەو قسانە بۆ بەشەر زەرەرە، مادام ئیلاهەکە مەبدەئی سەعادەتە، لایان وا بە شەڕو شۆڕ بن، بەشەر ئەبێ چۆن بی؟

حەقـقەن بە غەیـری خولاصـەیی ئەهلـی عـیلم لە مسـوڵمانان و حوکەمای ئیلاهییون دائیر بە مەقامی ئولوهییەت بێ موحابا، ئەوەی هاتیتە سەر زوبان، وتویانە، وە جەهەلەی سۆفییان (ومنهم القادیانی)، عادەتەن لە گەڵێ وەك شەخسێ عادی گفتوگۆ ئەکەن، هەر وەختی ئارەزوویان بی ئەچنە لای. خوا لەسەر عەرش دادەنیشی ئەننەهو ئەللور بلورانێ ئەکات!

١٦٩/٨

## کوو دەبی حەزرەتی داود چل ڕۆژ لە سوجدەدا بمینێ؟

کوو دەبی حەزرەتی داود چل ڕۆژ لە سوجدەدا بمینێ، گیای لەبەر فرمێسکی شین ببی؟ مع أنە گیا لە شۆڕەکات شین نابی بە ئاوی سوێر کوو شین بوو؟ لەو موددە ئیدارەی مولك کوو کرا؟

١٨٥/٨

## ئیشارەی کردە ڕۆژ، ڕۆژ ڕاوەستا تا شێخ گەیشتە شار!

ئەڵێ: شێخ ئیسماعیلی حەزرەمی ئەچۆوە بۆ شاری زوبێر، ئێوارە نەختێ درەنگ بوو، ئیشارەی کردە ڕۆژ، ڕۆژ ڕاوەستا تا شێخ گەیشتە شار، ئیشارەی کرد ڕۆژئاوا بوو، دنیا تاریك بوو. بەڵێ مەلایان بە نووکی قەلەم عارد و ئاسمان ژێر و زەبەر ئەکەن! ڕۆژ بگەڕێتەوە موددەیە ڕاوەستێ.

عالەم ئەیزانی من لە ئیختیاری مەعنای نووسراوم دوو ئیمامم هەیە، ئێکی ئیمام فخرالدین ئێکی شێخ محی الدین ئیبن عەرەبی (رضی اللە عنهما)، حەقـقەن تەتبیقـی عیبـارەتی قورئـان لەگەڵ سـەبەبی نـزول یـا ڕیوایەتی مەعنا بە ڕەحمەت ئەکرێ. سبحان اللە زاتێ نـاو عەوف ئەڵـێ: پێم گەیشتییە! یەعنی خەبەرم درایتێ، ئەو صافناتە (إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ) ماینی بەحرێ بوون باڵیان هەبوو، بـۆ کەس نەبـووە بـۆ کەس نابێ. وەکـەذا لە حەسـەن نەقـل ئەکەن. ئیـبن جەریـر و غەیـرە لە ئیبراهیمی تەمیمی ڕیـوایەت ئەکەن بیسـت هەزار فورسـی باڵـدار بـووین دەك لە منی کەوێ مام برایم! لاشەك ئەوانە لە حیکـایەتی وەکـی (الـف لیلة) وەریان گرتیە. بەو جۆرە حیکایەتە نەفسـیان موتەئەسـیر بـووە. قسـە زۆرە ئەمەندە لێرە بەسە.

١٩١/٨

## شارێ بۆنباران ئەکات!

بنۆڕە ئەمڕۆ ئەو دوەلە غاشیمە زاڵمە، بێ ڕەحم و مروەتانە، کە تەیارە و ئوسـتوڵ و مەوادی نـاریەی مـونفەلیقەی مـوتەبەرقیعە لە چـی سـەرف ئەکەن! شارێ بێ ئیستیحکام میللەتی فەقیـر پـڕ لە نەخـۆش و پیـرەژن و منداڵ بۆنبارانی ئەکات بێ ڕەحم و بێ شەفەقەت بـێ هەمـوو مەئاسـیری حەیوانی فەزڵ لە ئینسانی. ئەگەر ئەو ئـالەتە بە دەسـتی قەومـێ مـوئمینی نیك نیهاد بە ئەخلاق با، قەت لەو نەوعە وەقایعەی ئیسـتیعمال و سـەرف نەدەکرد. حەزرەتی سلێمان ڕیح و جن و مردەی لە ئومـوری خەیـرییەدا ئیستیخدام کرد.

١٩٣/٨

## عیبادەتی ئەو گەورانە وەکی عیبادەتی سۆفیلکەکی ڕەش و ڕووت!

قصاصـان قسـەیان زۆر کـردیە لە حەق سـلێمان، لە حەق مـولکی سلێمان، لە سەدی ئێکی سەحیح نییە. خاسـەتەن مەسئەلەی دروسـتبوونی هەموو شەو لەگەڵ هەزار ژن. ئینسانێ وا لایە نەبی لایە مەلیك بە (رفث) و (ضغث) چۆن شەو بەسەر ئەبا؟

سبحان الله حەکیمی ترمزی نەقل ئەکا لە سەعید بن المسیب: سلێمان سێ ڕۆژان خۆی لە خەڵکی بزر کرد، خوا وەحی بۆ نارد یا سلێمان سێ ڕۆژان خۆت ئیختیفا کرد، تەماشای ئوموری عیبادی منت نەکرد، حەقی مەزڵوومت لە زاڵم نەستاند!

دیارە خوا بەوەندە ئیختیفایەی ڕازی نییە، فکیف بە خەلوەتی سـاڵ و دوو ساڵ؟ عیبادەتی ئەو گەورانە وەکـی عیبـادەتی سـۆفیلکەکی ڕەش و ڕووت ئەووەلەن وەبیززات ملوك و عەدالەت و ئینفازی حوکمی خوایان لێ مەتڵووبە.

١٩٤/٨

## کچێ پێنج ساڵی زاوە، منداڵەکی بووە!

ئەمساڵ لە موجەللات لە جەرائید ئیعلانیان کـرد، فۆتۆغرافیـان کێشـا کچێ پێنج ساڵی زاوە، منداڵەکی بووە لە مودیری مەعاریفی عـام سـامی شـەوکەتم سـوئال کـرد کە چـووینە هەولێـر بـۆ ئیسـتیقبالی وەصـی عەبدولئیلاه[1] لە خزمەت مەلا ئەفەندی مولاقاتم لەگەڵ سامی شەوکەت

(١) وەصـی عەبدولئیلاهـ (١٩١٣-١٩٥٨ز) کـوڕی مەلیـك عەلـی کـوڕی شـەریف حوسێنی هاشمییە، لە شاری تائیفی حیجاز لەدایك بووە. برای مەلیك فەیسـەڵی یەکەم بووە. لە ساڵی ١٩٣٩ بە وەصیی عێراق هەڵبژێردرا و تا ساڵی ١٩٥٣ لەسـەر دەسـەڵات بوو.

بوو، وتی: ئەبێ ئەمما ئەو نەوعە بە لیقاح نابێ، حەتتا واقیع ئەبێ لە جەنبی ڕەجول ئینسان پەیا ئەبێ.

مەلا ئەفەندی فەرمووی: کە وابێ ولادەتی عیسا بێ باب ئیعجازی تیا نییە.

من ئەڵێم: کەوابێ بوونی حەوا با بڵێین: لە جەنبی ئادەم جێی وەقفە نییە، خصوص بیدای فیترەت عەجایبتی زێترە... خۆزی ئەم مەسئەلەم تەحقیق کردبا لە ڕەسائیلی ئەوروپاییان.

٢١٠/٨

## دوو ملیار بەشەر سوجدە بۆ گا و کەر بەن!

ئەووەلین و ئاخرین موئمین و (وعلی اتقی قلب رجل) بن، خوا چ زەرەری پێ ئەگات؟ دوو ملیار بەشەر سوجدە بۆ گا و کەر بەن، گا و کەر نابن بە خوا، هەر گا و کەرن. هەر وەقتێ ئارەزوو کەی، گۆشتی بکە بە کفتە و شفتە، هەر وەقتێ حەز کەی باریکە تەنگی بە بن کلیا بیە.

٢١٢/٨

## هەر کەس هەڵدەهات زوو بگاتە کونێ خۆی تیا تەقەت کا!

وەقتی بۆردومان ئەکراین، شێخ و مورید و مەلا و فەقێ و ئاغا و خزمەتکار، نەفسی نەفسیان بوو. هەر کەس هەڵدەهات زوو بگاتە کونێ خۆی تیا تەقەت کا. بەعدەهو پێم ئەوتن: ئەو شێخانە چەندە لە بۆمبەردومانی دنیا حیفزی کردن، هەر هەندەش لە ئەهوالی قیامەت حیفزتان ئەکەن، لاکین بەشەر عەجایبە! ئەوەی دوای مەیل کەوت، بە ئایات و عیبەر و عەقل ناگەڕێتەوە.

٢١٣/٨

پاش ئاتەش بارانی کۆیە، چەند ئەبیاتێ کوردیم دانا!
پاش ئاتەش بارانی کۆیە، چەند ئەبیاتێ کوردیم دانا، ئەز جوملە:

خۆزی ئیمامی ڕازی ئەمڕۆکە زیندی بایە
تا لە صونعی بەشەری تەیارەی بدیبایە
ئەوجا ئیمانی ئێنا بە قودرەتی بەشەری
قەت ئینکاری نەدەکرد بە تەقلیدی ئەشعەری

٢١٥/٨

## ناوی خوای ئیللا بۆ سوێندی بە درۆ نەبێ نەماوە!

ئێستاش ڕوو لە خوا ناکەن، مەگەر لە هەزار یەك. یەکێ لە شاعیرانی کوردی سلێمانی ئەڵێ: ناوی خوای قوربانی ناوی بم ئیللا بۆ سوێندی بە درۆ نەبێ نەماوە. نە شیعرەکەم لەبەرە نە ناوی شاعیرەکەم لە یادە. حەقیقەتەن قسەکەی ڕاستە.

٢١٦/٨

## ئەوانی دەوڵەمەندن، خەریکی عەیش و نۆشن، سەرئامەدانی عیرفان دائیم مەست و سەرخۆشن!

یەکێ ڕوبعی قەرنێ لە عومری خۆی سەرف ئەکا بۆ ئیختیراعی ئالەتێ کەشفی بنی بەحرانی پێ بکات، ئەوا ئەبینین موبەشیرانی مەسیحی تەحەممولی چ نەوعە مەشاق ئەکەن؟ خاسەتەن لەناو وەحشیان لە مەشریق و مەغریب و جنوب و شیمال حەول ئەدەن، تا شەخسێ بکەن بە مەسیحی.

ئەی مسوڵمانینە ئێوە چ ئەکەن؟ نە بۆ دین نە بۆ دنیا تێناکۆشن ئەوانی دەوڵەمەندن، خەریکی عەیش و نۆشن. سەرئامەدانی عیرفان دائیم مەست و سەرخۆشن.

٢١٩/٨

## لە وڵاتی ئێمە عیلمی دینی لە ئینقیرازە!

ئەمڕۆ مع الاسف لە وڵاتی ئێمە عیلمی دینی لە ئینقیرازە. مەلا لە برسان تەدریسی پی ناکرێ. فەقێ لەبەر ناخۆشی حال و ئیستیقبالی ڕوو لە مەئمووریيەت ئەکا بۆی مەیسەر بێ، دەوڵەمەندانی دیانەت پەروەر مەولوود ئەکەن، تەق و هۆڕی دەفە و (صلوا یا رفاعیة) تا نێزیکی بەیان خەو لە مسوڵمانان حەرام ئەکەن، وا ئەبێ؟ جەهل وا نیعەم بکا، العیاذ بالله کوفر لە ئیستیلادا بێ، ئەهلی خەیرات بە نوێژ و بە تەسبیحات و سەلاواتی لیسانی خەریك بن، وا باشە؟ بڵێم چی؟! ئەوە وایە.

٢٢١/٨

## ئاوی بێخاڵ دەتوانێ کارەبا بۆ سلێمانی دابین بکا!

ئاو لەناو عاردی بڵند ئەبێ لە تۆقە سەری چیایان، وەکی قەندیلی ئێمە ئاو دەردەکولێ، گوڵ تەشکیل ئەکا، ئاوی بێخاڵ لە تەڕەفی ڕواندز لە چ حەییوقەکی هەڵدەڕژێ ئەوەندە زۆرە. بەعزێ لە ئەهلی خیبرە وتویانە قابیلە ئەو ئاوە ماکینەیە بە حەڕەکە بخا تا سلێمانی بە قووەی کارەبا مونەووەر بکا. لە پشتی دێی چناران چ ئاوێ دێتەخوار بە کێودا، مەملەکەتێ پاراو ئەکات. بچۆ بۆ بێتواتە و هەرتەل و زێوە لە دێهاتی کوردستانی ئێمە حیرەت ئەیکەی. ئاو بە بارانێ زیاد ئەکا، ئەمما من حیث الاصل لە ئەندەروونی عەردی بە ئیختیلاتی هایدرۆجین و ئۆکسجین ئاو ئیجاد ئەکا.

٢٢٢/٨

## هەر شتێك موافەقەی دڵ و دەروونت نەبێ، دڵت پێی توند ئەبێ!

ئەگەر ئەهلی ویجدانی بنۆڕە ویجدانی خۆت، هەر حوکمێ هەر مەسئەلەیە هەر شتێ موافقی مەیل و ڕەئی و ئارەزووت نەبێ، چۆن دڵت پێی تەنگ ئەبێ، سینگت وێکدێ، ڕووت گرژ ئەبێ، نەفرەتی لێ ئەکەی، حەز ناکەی بیبیەی، بەحسی لێ کەی. ئەوەی موافیقی مەیل و میزاج و مەشرەبت بێ، وەلەو بزانی درۆیە وانییە کەیفت پێ دێ، دڵت پێ گوشاد ئەبێ، سینگت فەراح ئەبێ، ڕووت مونبەسیت، چاوت ئەپشکوێ.

حاڵێ حازر هیتلەر زەعیمی ئەڵمان ئینسانێکە لەو عەسرە فەردە بۆ تەعالیی ئەڵمان چی کرد و چی ئەکا؟ هەمووی (محیر العقول)ـە. بەدخواهانی بێ شەرم و موحابا قسەی سووکی لە حەق ئەکەن: مەجنوونە، بێ زەکایە، سوفەلایە، وەهاکەزا. بەعزێ ئینسان قسەی نالایقی لە حەق ئەکا، نەزەر بە هیتلەر بە پشیلە حیسابی ناکرێ. کەسێکت خۆش ئەوێ ستایشی ئەکەی، یا ئەمەلت پێیەتی، ئەیکەیە نابغ النوابغی عەبقەری. گوێ و لێ کە مەسیحی لە حەق موحەممەد چ ئەڵێن؟ بۆ صورەتی مەریەمە و فەرخۆڵەی چ ئەکەن؟ دیارە مەیلی فاسید ئەگەر ئیستیحکامی بوو بە قەهری خوا نەبێ قبوڵی ئیزالە ناکا. ئەگەر دڵ خاوێن بوو بە حەسەد و عەداوەت و حوببی ڕیئاسەت بە فەساد نەچووبوو زوو قبوڵی حەق ئەکا. هەرچەندە گەورەیی خۆی ئەیێنێتە ڕێزی حەق خواهان وەلەو زۆر فەقیر و (دون نسب) بن، کیبر و ئەنانیەت نامێنێ، یا نابێ یا مەقهوری ئەکات.

ئەوەی بە فەساد چووبێ، بە دەرەجاتی موتەفاویتە بەو گوێرەیش لە حەق دوور ئەکەوێتەوە.

٢٢٤/٨

## تەئەسور بە مەزهەب زۆر عەجائیبە!

ئەڵێن: ئەمڕۆ عەسر عەسری نووره، ئەو هەمـوو ئیکتیشـافات و ئیختیراعاتە تەئسیرێ ناکا، بەڕاستی عەقائیدی زائیفە نابا، ئەنـواری علـوم ئەو زوڵوماتەی لانادا، ئیللا بۆ لای فجـور و بـێ دینـی ئەڕوا. چـونکی مەیلی ئیزالەی صەعبە. ئەبینی زاتێ ئیمان ئێنێ، مسـوڵمانی بـاش بە عیبادەت، لاکین مەیلەکەی نەمردووە، بەس وەك سڕ بوو بی ئاگـای لـێ نامێنێ. وا ئەبێ (حسب الظروف) وەك ئاگری بـن کـا هەڵئەبـێ، عـالەمێ ئەسووتێنێ. برام بە بەصیرەت تەتەبوعی ئەمزیجە و میـول و ئەحـوالاتی نەفسـییە بـکە، ئەوجـا لە ئایـاتی قورئـانی قسـە بـکە. خەریـك مەبە بە مونازعاتی ئەهلی سوننەت و ئەسحابی عەدل و تەوحید.

تەئەسور بە مەزهەب زۆر عەجائیبە، من زۆر بێ مەیل و موحابام، لام وایە تالبی حەقم، قەولی هەر ئیمامەی کە بزانم موافیقە قبوڵی ئەکەم زۆر ئیعیترازم لە ئەئیممەی خۆم هەیە، کە ئەئـیممەی شـافیعی و ئەشـاعیرەن. لەگەڵ ئەوەشدا یەکێ لە عولەمای مەزاهیبی تـر ئیعتیرازیـان لـێ بگـری، دڵم سەغڵەت ئەبـێ زۆرم لا گـرانە، ئەوەنـدەی مـومکینم بـێ سـەعی لە دەفعـی ئەکەم. ئیتـر لازمە ئینسـان زۆر ئاگـاداری ئەحـوالاتی نەفسـییە و ئەتواری بێ.

٢٢٥/٨

## هیدایەت

کەس هیـایەتی پـێ نـادرێ، چونکـە تـا زەڕڕەیە ئیسـتیعدادی هەبـی، ئەگەر زووش نەبی، درەنگ ئیمان ئێنێ، هیدایەتی بە قورئان ئەبی، ئەمما ئەوەی بە فەساد چوو لە قـابیلییەت ئەچێتەدەر چـارە نـاکرێ، تەصـەوور ئەکەی! یەکێ وەکی (کلمنصو) عەدووی دین و عەدووی خـوا فیکـر و ویجدانی وابی، (عن صميم القلب) بڵـێ: تـا ئەو قورئـانە مـابی فەسـادە. تەصەور ئەکەی ئیمانی بە قورئان لە دائیرەی ئیمکان دابی، دێتـە خەیاڵی

فیرعەون ئیمان بە موسا بێنی؟ وە ئەڵێ (الم نربك فینا ولیدا) دێتە وەهـم ئەبـو جەهـل پڵنگـی قـورەیش لەگەڵ ئەبـو هـورەیرە و بـیلال و ئەو فوقەرایانە مساوات قبوڵ بکا؟

ئەتو بی و خوا بـاوەڕ ئەکەی، پادشـاهی سـاحێبی تـاج و تەخـت و حیشمەت و کیبریا بۆ کەسێ بەناوی مەهدی لە تەخت بێتە خـوارێ؟ بە هەموو دەوڵەت و میللەت و سوپای بکەوێتە دوای، ئەی وای دەماغێ بێ هووده پوخت و خەیاڵی باتیڵ کەرد. سەییدی ئالووسی، سـەید نوعمـانی کوڕی سەید ئەحمەدی دەحلان ئەڵـێن: سـوڵتانی عوسـمانی بە تەبیعەتـی مەهـدی ئەگـات، پـاش مەهـدی بـاز خەلافەت و مولکـداری ئەکەوێـتە دەسـت پادشـاهانی ئـالی عوسـمانی، خـانەدانی عوسـمانی ناشـکور نەبـی مونقەریز بوون پەراگەنـدە و ئـاوارەیی دارو دیـار، نە مەهـدی هـات، نە مولك و سەڵتەنەتی وان ما!

ڕیاکاری یەکێکە مەلا بە فەساد ئەبا (أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ).

٢٢٩/٨

## زمان

ئەگەر بەعزە کەلیماتی لۆغاتی ئەجنەبییە، قبـل نـزول القـران، عەرەب وەریگرتبـێ شـکلەکی عەرەبـی لەبەر کردبـێ، موسـتەعمەل بـوو بـی لە قورئاندا، واقیع ببی، مەنافی عەرەبییەتی نییە. قەوم لە قەومـێ وەرئەگـرێ، ناچارییە.

ناشکور نەبێ کوردی ئێمە کەلیماتی عەرەبی و فارسی لێ وەرەگری، چی نامێنی، ئەمە عەلاماتی زێدە مەغلوبییەتە، زوبانی خۆی بزرکردیە، چ مەغلووبی مولکداری چ مەغلووبی عیلم و سەنایع و ئیختیراع، مەجبورەن لە غالب وەرئەگرن.

٢٣١/٨

## لەبەر خیصامی خۆبەخۆیی، ئایەت تەئسیرمان تێناکا!

سبحان الله لەبەر خیصامی خۆبەخۆیی، ئایەت تەئسیرمان تێناکا، تا خەریك بین تەرکی خیصام کەین، نازانم کێ ئیستیدلال ئەکا بەو ئایەتە[1] لەسەر کوفری ئەهلی بیدعەت؟ تەماشا ئەوانە موعتەزلی ئەکەن ئەهلی بیدعەت، موعتەزلیش ئەوان بە ئەهلی بیدعەت و غەوایەت ئەزانن. وهکذا کوللی فیرقەیە خۆی لەسەر سوننەت و ڕەوشی ڕەسوول و یارانی ئەزانی، ئەوانی تر بە کافر یا موبتەدیع حیساب ئەکا.

جەنابی حەق بەیانی خیصامی ئەهلی نار ئەکات، تا خۆمان لە خیصام بپارێزین، ئەمما ئێمە تیژتر ئەبین، حەتتا لە مەسائیلی فەقیهـ ئیختیلافی بەعزێ مەلایان بوویتە باعیسی عەداوەت و تەفرەقە، (الآن کان کما کان) لە هەمووی موسیبەتتر یەکێ وەکی شێخ ئیبن سینا، فارابی، ئیبن ڕوشد حەتتا غەزالی تەکفیر ئەکەن. مەلایە تونسی تەکفیری شێخ محمد عەبدە و سەید ڕەشید و تەنتاوی ئەکا، کە ئەوانە کافر بن ئەدی کێ مسوڵمانە؟ نەعوزوبیللا ئەساسەن ئەگەر مەلا ڕێك بان ئوممەت ڕێك ئەبوون، با ئەو خیصامەش بۆ قیامەت بی.

٨/ ٢٢٢

## خوا لەو سەفەلە و جەهەلە ئینتیقامی دینی ئیسلام بکاتەوە!

ئومێدم وایە خوا لەو سەفەلە و جەهەلە ئینتیقامی دینی ئیسلام بکاتەوە، دەفعیان کا وەئیللا ئەوەندە تەرووسکەش نامێنێ. حەققەن عیززەتی زینتیقامی قووەی قاهیرەی خۆی (عن قریب) شەڕی عرووس و

---

[1] مەبەست ئایەتی ( فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى اللَّهِ وَكَذَّبَ بِالصِّدْقِ إِذْ جَاءَهُ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ ) الزمر:٣٢.

ئەڵمـان و ئیتاڵیـا و فرەنسـە و ئینگلیـزی لەسـەر مسـوڵمانان دەفـع بکـا، ئیتیحادێ بخاتە بەینی فیرەق و عەناصیری مسوڵمانان چیـدی نەبـتە ژێـر دەست و مەلعەبەی ئەجانیب.

٢٣٥/٨

## نانی بە دۆی ڕاناگا!

ئەبینین شەخسێ فەقیـر، سـەعی ئەکـا دەوڵەمەنـد ئەبـێ، لە قوڕکـاری ئەبـێ بە توجـار، لە دەربەدەری ئەبێـتە سـاحێبی کۆشـك و سـەرا. ئەممـا کەسێ تر وەکی وی سەعی ئەکا نانی بە دۆی ڕاناگا، بۆ؟ یا عەینی ئەو شەخسە لێی ئەگۆڕێ ئەوی دەستی بۆ ئەبا، بۆی نایە. وەکی تورك ئەڵێ: شانسی نامێنێ ئەمە چییە؟

دیارە لەژێر پەردە ئیدارەیە هەیە لە ئـێمە مەجهـوولە، کە لەو جـیهەتە موساعەدە نەکرا تێکۆشین بێ فایدەیە. تێکۆشە سەعی کە، کە دەوڵەمەند بووی مەغروور مەبە، ئیعتیمادت لەسەر خوای بی، زەمانی فەقیـری لەبیـر مەکە (احسن الله کما احسن الیك)

٢٤١/٨

## فەقیری ئیمتیحانە!

فەقیـری حەقـیقەتەن ئیمتیحـانە، کەم کەس لەو ئیمتیحـانە دەرئەچـێ. هاتەوە یادم، پیاوێ هەبوو ڕەسـوولە کوردەیـان پـێ ئەگـوت: مسـوڵمانێ باش، کاسب، ئەمما فەقیر و دائیم ڕووت و برسی. ڕۆژێ وتی: لە خەوما دیم ئینسانێ زەعیف ڕەنگ زەردە کەوتبووە ناو دەقنەیە تا بـن هەنگڵـی! وتم: قوربانت بم ئەتوو کێی؟

وتی: ئەمن تاڵیعی تووم!

دەخیل، ئامان وەرە دەرێ. قۆڵم گرت قووەتم دایە ئەو تەکانی خۆی ئەدا بێتەدەر، نقوومتر ئەبوو. ئاخیری پێلەقەکم بە تەپڵەکەی سەری دادا لە قوڕێدا ختم بـوو، ئەوجـا ئەیـوت: قەت بە تەمـا نـیم تێـر بە زگـی خـۆم بخۆم.

حەقیقەتەن زۆر نەچوو لەسەر ئەو حالەش کۆر بوو. نەعوزوبیللا ئەمە قصوری چییە؟ خولاسە، نەقلیاتی دەهر و ئەوزاعی بەشەر (محیر العقول)ـە، حاڵی دنیا ئەوەی لە صالیحاتی سەرف کا باشە، وە ئیللا (وبال)ە.

٢٤١/٨

## ئەوەی سوڵتانی عوسمانی لە هەولێر سواڵ دەکا!

زۆر دەولەمەندی وا بووە ئاخیری لە برسان مردیە، دونیا عیبەری زۆرە. سبحانك یا ربی. ئەمساڵ یەکێکم لە ئەحفادی عەبدولعەزیز خانی ئیمپراتۆڕی عوسمانی لە هەولێر دیت، ئینتیزاری ئینعامی مەولوودی ئەکرد، وەقتێکیش کائینات چاوی لە دەستی وان بووا.

٢٤٢/٨

## ڕیجالی وەقت بەس بۆ ڕەفاهی مەنسوبینی خۆیان خەریکن!

ئەوەی موئمین بێ ئەبێ بە چاوی ئیعتیبار تەماشاکا. لازمە بنۆڕنە ئوممەمی ئەجنەبی، چ ئەکەن؟ چۆن بە عموومی دەوڵەمەند ئەبن؟ بۆ تەعالی ئوممەتی خۆیان، کووی سەرف ئەکەن؟ ئوممەمی دی سەر و ماڵی خۆی بۆ حکومەتی ئەوێ، حکومەتیان ئارام و ڕاحەت لە خۆ سەلب ئەکەن بۆ حیفزی گەورەیی و مەکانەتی ئوممەتیان (بین الامم)، وەکی ڕوح و جەسەدن. مع الاسف مسوڵمان وا نین، مەنگەڵیی یە بدەنە حکومەت وا ئەزانن تاڵان کراین، فەقیر و زوعەفای ئوممەت لە هەر حاڵێ ناخۆش و ڕەزیلانە دابن، ڕیجالی وەقت ئەهەممیەتی نادەنێ، بەس بۆ ڕەفاهی مەنسوبینی خۆیان خەریکن. خوا عاقیبەتی خێر کا. ئامین.

٢٤٣/٨

## عەرەبی زوبانی عیلم نییە

تەفەننونی عەرەبی یاخود نەحووی لە گەڵێ جێ، مانیعە لە فەهمی موراد. بۆیە من ئەڵێم: عەرەبی زوبانی فەساحەت و بەلاغەتە، زوبانی عیلم نییە. عیلم ئەیەوێ عیبارەت سەریح لە موراد بێ، بێ ئیحتیمالاتی بەعیدە، یا قەریبە.

٢٤٦/٨

## ناشکوری نەبێ!

ناشکوری نەبێ تائیفەیە نەبوو لە ئەهلی عیلم فەصڵی جیدال بکا بە نەوعێ دڵ پێی ساکین بێ، نە شیش بسوتێ نە کەباب، خیصام ماوەتەوە. من ڕیسالەکم هەیە لە بەحسی (اختیار) لام زۆر باشە، حق الانصاف تەئسیری قووەت و قودرەتی صونعی بەشەری، یەعنی عەمەلی صانیعی و وەستایی. جێی ئینکار نییە، حوکەمای تەبیعەت و کیمیا و میکانیکی و (طب) و جەڕاحی، ئەسراری تەبیعەت (فطرة الله)یان دەرخست، (محیر العقول)ن. بە قووەتی ئینتیباهـ و دەوام و صەبر لەسەر تەجرەبە تەفەوقیان کرد. مع الأسف ئێمە مەغلووب بووین، ئەمما هەرچەندە ئینسان تەرەقی بکا لە عیلم و قووەت و قودرەت، نەزەر بە خوا زەبوون و عاجزە، بێ دەسەڵاتە.

٢٤٧/٨

## هەوای نەفس و شێخ قادری تاڵەبانی

موتابەعەی هەوای نەفس عەینی ئەسیرییە، وەکی شێخ قادری تاڵەبانی ئەفەرمووێ:

هەواو حرصی نەفسە ئەکلە شوربە فائض ە قولشن
ئوتان بونجە اسارەتلە دیمە حرتیم واردر[1]

یارب لك الحمد ولك الشکر. لەبەر دەستی کەسێ گەر ڕادەوەستی ئەمەش ڕەسمێکە ڕەسمی بوتپەرستی، ئەدی چییە؟ تەئویلە؟ ئەوانیش تەئویل ئەکەن.

٢٤٩/٨

## لەبەر مەحەببەتی پێغەمبەر خودایان لەبیر نەماوە!

بۆ تەرغیبی سەڵاوات ئەڵێن: خوا وەزنی عەمەلی شەخسێ ئەکات، ئەمر ئەفەرموێ: بیبەنە جەهەننەم. لە ڕێ پێغەمبەر تووشی ئەبێ هاواری ئەکاتێ ئەفەرمووێ: بیگێڕنەوە!

مەلائیکەت بعد الاستئذان بۆ پێی میزان ئەیگێڕنەوە، دووبارە وەزنی عەمەلی ئەکەن. پێغەمبەر ڕوقعەیە لە گیرفانی دێنێتە دەر ئەیهاوێتە پێتەرازووی خێرانی بەسەر پێتەرازووی شەڕانی ئەکەوی. کابرای ئەبەن بۆ جەننەت، ئەڵێ: بە قوربانت بم ئەمە چ بوو؟

ئەفەرموێ: ئەوە سەڵاواتێ بوو هەڵم گرتبوو بۆ توو!

ئایا خوا نەیدەزانی؟ مادەم ئەو خێرەی هەبوو بۆچە وەزنی نەدەفەرموو؟

کوو ئەفەرموێ والوزن یومئذ الحق، دیارە ئەووەلی حەق نەبووە خێری ماوە بۆی وەزن نەکراوە. لەبەر مەحەببەتی پێغەمبەر ئاگایان لە خوای نەماوە. ئیتر مەخەڵەتێ سەعی کە.

٢٥٥/٨

[1] واتە: ئەتۆ لەناو ئەسیری دای و منیش داوای ئازادی دەکەم.

## بەشەر زۆر گۆڕایە

ریسالەت پەنا ئەفەرموێ: ئێمە ئەمرمان کرایتێ قسان لەگەڵ خەڵکی بکەین لە قەدەری عقولیان. لازمە موفەسیر و واعیز و موحەددیس تەماشای عەقلی بەشەر کەن، بەشەر زۆر گۆڕایە هەر عەجایبات و غەرایباتێ بڵێی ئەوی بەسیت و بێ موحاکەمە بێ قبوڵی ئەکات. لاکین ئینسانی عەقل ورد بێ موحاکەمە، خصوص نەختێ لە علومی کەون بزانی هەموو شتێ (سلمه السلام) قبوڵ ناکا. بە خۆڕایی تەکفیریان باش نییە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمڕۆ کەس لە تەکفیر ناترسێ، ئەوەی عایدی قیامەتە ئەبێ وای ئەداکەن نەشئەت بی، حازیرە قبوڵی کات. یەکێ ئەڵێ عالەم ڕوو لە شام ئەکا بۆ حەشر، ئەمە قسەیە؟ یاخود ئەڵێن: هەرچەندی مەوجودات هەیە، لە حەیوانات و جن و شەیاتین و مەلائیکەی سەماوات، حەتتا عەرشی ئیلاهی بە (حافین) و (صافین) دێنە سەر عەردی تەنها کورسی (وسع السموات والارض)، (فکیف بالعرش)؟
٢٥٧/٨

## موبەشیرانی ئێستا بە خۆو بە قوونی بە گوویان دێنە وڵات!

ئەمڕۆ دەوڵەمەندی کافران و سەعیان بۆ دونیا و سەرفیان لە مەنافیعی میللی بەسەری خستن، ئێمە نزم بووین بەڵکو کز و کەساد ماینەوە. مەلایە زۆر مەلا، لەبەر فەقیری چی پێ ئەکرێ، کەس معاونەتی عیلمی نەکا؟ ئافرەتێ لەسەر مەسرەحی هەڵپەڕێ، حەفتەی دوو هەزار لیرە وەرگرێ، ئەبێتە باعیسی ئینقرازی عیلم و دین، خودا ئەو چەرخە نەگۆڕێ (عن قریب)، دینی ئیسلام مونقەریز ئەبێ.

خوا ئەزانی دنیا بۆ خزمەتی عیلم و دین زۆر لازمە، بەڵێ مەغروور بوون بە دنیا بە هەرچی خەیاڵێ کەی، خراپە عاقیبەتی وەخیمە، مومکینە خولانەوەیان لە بیلاد بۆ ئیفساد و سەددی عیباد بی لە ئیمان، وەکی موبەشیرانی ئێستا بە خۆو بە قوونی بە گوویان دێنە وڵات لەوێ و لەوێ

ئەگەڕێن، مسولمانی پاك و خاوێن و بە دەستنوێژ ئیغوا بکەن ببنە مەسیحی. خوا بە قەهری خۆی لەگەڵ دەولەتەکانی موئەییدیان مەحوو و نابوودیان کا، وەکی قەومی نوح و سائیری ئەحزابی کوفر و زەلال.

٢٦٠/٨

## بەڵا بۆ دینی حەق؛ ڕووس و ئەڵمانیا و فرەنسە و ئینگلیزن!

ئیلاهی خۆت ئەزانی ئەمڕۆ بەڵا بۆ دینی حەق بۆ ئایات و کیتاب بۆ بەشەرییەت و ئەقوال و خیصاڵی حەمیدە، ڕووس و ئەڵمانیا و فرەنسە و ئینگلیزن. ئەمریکا کەمێ دوورە ئەویش لەگەڵ ئیسلام فکری بەدە، ئەوەی ڕوئەسای دینییان لە حەق رسول الله ی ئەڵێن، کافرەکانی پێشی نەیانوتیە. ئیلاهی چارەیە شەڕیان لەسەر ئیسلام دەفع کەی، ڕەفع کەی بە قەهری خۆت بیانگری.

٢٦١/٨

ئەوانی ئێمە ساحێبی ئاگرن، دنیایان سوتاند، عالەمیان بە فەساد برد، ڕەببی بە ئاگری غەزەبی خۆت بیانسووتێنی بە ئوسوتووڵ و تەیارەیانەوە بیانخنکێنی؟ ئەوە ئەمڕۆ بە کەلکی دینی ئیسلام دێ هەرچەند مسوڵمانەکانیش ئەکسەر خراپن، ئەمما لەوان هەر چاکترن. خراپەی ئەمان لە سوئی تەئسیر و غەلەبەی ئەوانە ئیتر ڕەحمێ بە عیلم و دینی ڕەسوولی ئەکرەم کەی.

٢٦٢/٨

## شیعری سوڵتان سەلیمی یەکەم!

سوڵتان سەلیمی ئەووەل[1] کە میسری فەتح کرد، بە دەستی خۆی ئەو

(١) ناوی سەلیم کوڕی سوڵتان بایەزیدی دووەم کوڕی محەمەد فاتیحە (١٤٧٠-١٥٢٠ز)، سەلیم کوڕی هەشتەمی سوڵتان بایەزیدی دووەمە. ناوبراو نۆیەمین سوڵتانی عوسمانییە، یەکەم کەسە لە ئالی عوسمانییان کە نازناوی ئەمیرولموئمینینی لێنراوە.
←

دوو بەیتەی لە دیواری قەسرەکەی نووسی:

الملـــك للـــه مـــن يظفـــر بنيـــل منـــى
يـــردده قســـرا ويضـــمن بعـــده الـــدركا
لـــو كـــان لـــى او بغيـــرى قـــدر نمـــله
علـــى البســـيط لكـــان الامـــر مشـــتركا[1]

بڕوا ناکەم ئەو شیعرانە ئی خۆی بێ گەرچی لە تورکی و فارسی شاعیرێ بە قووەت بووە، خەییامیش ئەڵێ:

ان قصـــر كه بهـــرام دروجـــام گرفـــت
اهـــو، به چه كـــرد ڕو به ارام گرفـــت
بهـــرام كه گـــورم ی گرفتـــی هـــمه عمـــر
بونگر كه چ گۆنه گور بهرام گرفت! [2]

٢٧٠/٨

## مەدح و سەنا کوو ئینسان پێی پف هەڵئەمێنێ!

---

دوای ئەوەی کودەتای بەسەر باوکی خۆیدا کرد، هاتە سەر دەستەڵات. لە سەردەمی ئەودا بوو سەفەوییە شیعەکان لە ئێران و ئازەربایجان پەیدابوون. لە سەردەمی حکومڕانی ئەودا سنووری خاکی دەسەڵاتەکەی زۆر فراوان بوو. شەڕی چالدێران و زۆربەی زۆری فتوحاتەکان لە سەردەمی ئەودابوون.

(١) لە ڕاستیدا شیعرەکە ئاوایە:

الملـك للـه مـن يظفـر بنيـل منـي
يـردده قهـرا ويضـمن بعـده الـدركا
لـو كـان لـي أو لغيـري قـدر أنملـة
فـوق التـراب لكـان الأمـر مشـتركا

(٢) لە ڕاستیدا شیعرەکە ئاوایە:

ان قصـر كه بهـرام درو جـام گرفـت
اهـو بـچه كـرد و روبه ارام گرفـت
بهـرام كه گـور ميگرفتـی هـمه عمـر
ديدی كه چگونه گور بهـرام گرفـت؟

کەسێ دیققەت لە خۆی کا، ئەزانێ مەدح و سەنا چ تەئسیرێ لە ئینسان ئەکا، کوو ئینسان پێی پف هەڵئەمێنێ؟! لەگەڵ ئەوەشدا ئەزانێ خۆی بۆفە و هەیکەلی خاڵییە! گەلێ ملوك بەو جۆرە سەنایە هەروەها موتەشەییخە و موتەممەلا لەخۆئەچن ڕێیان لێ ئەگۆڕێ.

٢٧٨/٨

## قەسیدەی موعەلیم ناجی!

حەدیسێ نەقل ئەکەن: الدنیا ساعة. بەو ساعەتە هاتەوە خاترم، دەفعەیە سوڵتان ڕەشادی عوسمانی ساعەتێ ئەداتە موعەلیم ناجی(١) شاعیرێ مەشهوور، لە شوکرانەی قەسیدەیە بە تورکی لە مەدحی پادشا دادەنێ ئەو بەیتەی زۆر خۆشە

دنیا چون امامی رسل ساعه دیدی
دنیایه آمدی شاه به نه اعطا بیویردی

٢٧٩/٨

## ئەدی کەری دەجالی؟

ئەساسی خۆی شەڕ لەسەر دەجال عایدی ئێمە نەبوو، حەڕبێ بوو لە بەینی جوو و دیانان. جوو ئەڵێن: ئەو مەسیحە کە ئێوە ئیمانی پێ ئینن ئەمە دەجال بووە. مەسیحی بەڕاستی (مبشر به) کە ئیعادەی مەجدی ئالی داود ئەکا. دواتر دیان دەڵێن: مەسیحی ڕاستی هات ئەوەی مونتەزیری ئێوەیە مەسیحی دەجالی موشریکی مولحیدی زەندیقی (مغوی) و (مضل)ـە، مسوڵمانان چ حەقیانە لەسەر ئەم حەڕبە؟
وە ئەو دەجالەی مسوڵمانان بە خەیاڵ عالەمی لێ ئەتۆقینن، تەئمینیان

---

(١) موعەلیم ناجی نووسەر و شاعیرێکی تورکە، لە ساڵی ١٨٤٩ لە فاتحی ئەستەنبوڵ لە دایك بووە و لە ساڵی ١٨٩٣ کۆچی دوایی کردووە. لە دوای مردنی ژمارەیەك بەرهەمی لە پاش بەجێماوە. لەوانە دیوانی شیعری، فەرهەنگ، مەکتووبات، کتێبی قوتابخانە، شانۆ، چەند وتارێکی وەرگێڕدراو...

ئەکەم نایگەنێ، وەکی جوولەکان تا ئەبەد ئینتیزاری بکەن، بەو جۆرەی کە دەڵێن، نابێ نییە، نەبووە، ئەدی کەری دەجالی؟ قسەی لێ مەکە زۆرن. لام وایە ئەمڕۆ عیسایەکەی خۆمان ئەگەر بێتەوە سەر عاردی بە سواری کەرێ ناگەڕێ، ئەلبەتە (شمبرلین) لێناگەڕێ لە هەوا بە تەیارە لە عەردی بە قیتار و سەیارە لە بەحری بە ئوستوول و غەوواص سەیر و جەولان ئەکا، کەری چی؟ دەجال ئیشی خۆی کرد، مسوڵمانی تەفرەقە پێخستن، ئەمڕۆش ئەوا لە دینیان ئەکا. دوەلی ئەجنەبی با بڵێم: مەسیحی سەوقی ئوممەتی موحەممەدی، دینی ئیسلام بۆ مەحوو و ئینقیراز ئەکەن. ئێمە تەمەننای خروجی مەهدی و نزولی عیسا ئەکەین...

٢٨٣/٨

## نەفعی تەعقیبی ئاساری ئوممەمی!

بریا مسوڵمانان پێش ئەورووپاییان تەعقیبی ئاساری ئوممەمی ڕابردوویان کردبا، دوو نەفعی تیا ئەبوو: دینی، دونیەوی، لاکین نەیانکرد.

٢٩٠/٨

## ئەقوامی وەسنییە بۆ حەیاتی دنیا عیلمیان زۆربووە!

بنۆڕنە ئەهرام و هەیاکلی مۆمیاکراو، حوکەمای عەسر تیای حەیرانن، ئەقوامی وەسنییە بۆ حەیاتی دنیا عیلمیان زۆربووە، ئەمما بۆ ئیعتیقادییات تا بڵێی بێ ئیدراك و شعوور بوون. مەلیکی (عظیم الشأن) تەبەقی موجەوهەری لەسەر دەست لەبەر دەمی گاجووت ڕاگرتییە، ئالیکی بخوا، ئەمەی بە خدمەتێ عالی زانییە، پێیان ئەگوت: مەلیکێ دیندار، ئیقامەی شەعائیری دین ئەکا، ئەوانە بە عیلمی خۆیان کەیفخۆش ئەبوون، گەمەیان بە ئەحکام و ئادابی ڕوسول ئەکرد، جەزایان پێگەیشت، عیلمی خۆیان بە کەڵکیان نەهات.

فی الحقیقە بۆ حەیاتی ئیجتیماعی عیلمی ڕوسول ڕووحە. ئەمڕۆ بە ئەکسەرییەت ڕوویان لە عیلم و دینی ڕەسوول وەرگێڕایە، علومێ کە ئەساسەن لە یۆنانییان وەرگیرایە، تەرجیحی ئەدەن، بە هەزار دەرەجە

لەسەر ئەحکامی دین. حەتتا ئوصول واقیعەن ئەو عیلمە زۆر نافیعن، ئەمما بێ دین هیچ شت نەفع نادا، تا دین کەمتر بێ، دنیا ناخۆشتر ئەبێ، وەلەو علومی ماددی لە غایەتی تەرەققی بێ، وەکی ئەو عەصر.

٢٩٠/٨

## ئیسلامییەت لە دەستیان، زۆر زەبوون بووە!

جەنابی حەق ئەهلی ئیمان موەفەق کا (عن قریب) دوشمنانی دین خەسارەتمەندی دارەین بن، ئامین.. خوایە خۆت ئەزانی دوشمنی دین چەند زۆر و چەند بەقوەتن. ئیسلامییەت لە دەستیان زۆر زەبوون بووە. ئیلاهی ڕەحمێ بە دین و عیلمی حەق بکەی. ١٩٤٠/١/٢٢ز.

٢٩١/٨

## ئەگەر عەقلێ تەواو نەبوو بروسکەیە لە ئاسمان بێ، لێیدا بیسووتێنێ!

به حەکیمێکیان وت: بۆ ئینسان چی باشە؟

فەرمووی: عیلمێ نافیع

وتیان: ئەگەر نەبوو؟

وتی: عەقلێ تەواو، مودارای پێ بکا، لەگەڵ خەڵکی خۆش بژیە.

وتیان: ئەگەر نەبوو!

وتی: ماڵێ عەیبی خۆی پێ داپۆشێ.

وتیان: ئەگەر ئەمەش نەبوو؟

وتی: بروسکەیە لە ئاسمان بێ، لێیدا بیسووتێنێ.

٢٩٧/٨

## یەکدی ئەکوژن لەسەر کۆتکە جۆ!

ئەوانەی یەکدی ئەکوژن لەسەر کۆتکە جۆیە، ئاگر لە پاوان و

خەرمان و خانی یەك بەرئەدەن، وە ئەنۆڕن، ئاگری باباگوڕگوڕی کوو ئەسووتێ، وە چۆن نەوت ئەچێ بۆ ئاوروپا؟ ئەبا ئەو ئاگرە لە دەروونیاندا گڕ بستێنێ، هیچ نەبێ یەکگرین، لێك گەڕێین. لەلایە تریش ئەهلی تەریق، موجەددیدی خالیدی، عەسکەری شەدەڵەیی، خۆیان شێت ئەکەن، تەریق و دین و دونیا ئەکەنە فشقیات و فەحشییات. ئەمە حالی ئەولیائوڵلایان!

٣٠٣/٨

## لە بەهەشت نێرکە پیازی تیا نییە!

لە بەهەشت ئەوەی تەمەنای کەن هەیە، ئەمما مع الاسف نێرکە پیازی تیا نییە. مەشهوورە لە ئەلسینەی عەوام، مەلایە باسی ناز و نیعمەتی جەننەت ئەکا، لە ئەنواع و ئەلوانی ئەتعیمە و میوەجات ئەدوێ. کوردێ ئەڵێ: لالۆ وەسیاقەو بم، تەڕە لەیلانی هەس؟

ئەڵێ: نا! شتی بۆگەنی لە بەهەشتێدا نییە.

لالە ئەڵێ: مەلا گشتی وە هیچ!

٣١٠/٨

## قەولی گەلێ چرووك!

ئومێدم وایە لە تەفسیری قورئان، ئەوەی ئەحسەن بێ قبوڵ بکرێ، وەلەو قائیلی گەورەو نامدار بێ. سبحان الله قەولی گەلێ چرووك چرووك نسبەت بۆ بەعزێ زاتێ ئەدەن، مەسەلا وەکی حەزرەتی ئیمامی عەلی، کە ئینسان ناتوانێ قسە بکا.

٣١٢/٨

## قورئانی کەریم نەوەد و پێنج تەرجەمەی هەیە!

ئەگەر قورئان هەڵگرتبا لە قورئان خراپتریان لێ ئەکرد، ئەعدای داخلی و خارجی (لا یعد)، بە تەصریف و بە تەئویل قصوریان نەکرد.

ئەمما دیارە، وەکی لەکەی ڕەش لە لیباسی سپی، گەلێ جارم وتیە: کەسێ بنۆڕێتە تەفسیری شیعان، وا دێتە خەیاڵی، کە قورئان شاهنامەی عەلی و ئەولادی عەلی یە. لەگەڵ ئەوەشدا خوا خۆی ئەزانێ لە حوببی عەلی و ئەولادی عەلی، موزەخرەفن، ڕاست نین. وە ئەکسەری دەخائیل لەبەر ڕیعایەت نەکردنی نەزم و نەسجی قورئان، هێنایتیانە ناو تەفسیری و تەرجەمەی قورئانیان کردیە. لاشەك تەحریف و تەبدیل هەڵئەگرێ، وە موتەرجیمەکان عەمدەن تەجویل ئەکەن تا ئەمڕۆ. مع الاسف مەلایە بەدین، عەرەبیزان، کاتبی بەلیغ و ئەدیب، مەلیح بەیان، عاریف و بەقووەت لەو زوبانی کە تەرجەمەی پێ ئەکا، تەرجەمەی نەکردیە. دوایە لە موجەلەی (هلال)ی ینایری ساڵی ١٩٤٠م دیت قورئانی کەریم نەوەد و پێنج تەرجەمەی هەیە، بە سی لۆغەت تەرجەمە کرایە، ئەکسەری موتەرجیمەکان ئەجنەبین. ئەمە پاش ئەوە کە ئەجانیب قورئانیان تەرجەمە کرد زۆر لازم بوو، بێ شوبهە واجبە، نەك زاتێ جەمعێ لەو نەوعە عولەمایانە، ئیعتینا بە تەرجەمەی قورئان بکەن، ڕێی تەحریف و تەبدیلی ئەجانیب ببەستن.

مع الاسف لە عولەمایانی ڕوئەسایانی دین، بڕوا ناکەم کەسێ هەبێ عەرەبی زۆر چاك بزانی، وە لیسانی ئەجنەبی گەلێ باش بزانێ، مەسەلا ئەگەر مەلایە وەکی تەها حوسێن یا ئەمیر شەکیب ئەرسەلان، یا فیکری ئیبازە بی لە عەرەبی، وەکی جەلال نووری بێ لە تورکی، عیبارەتی جەزیل و شیرین و خۆش گوار بێ، تەرجەمەی قورئان بکا، ئێ وەڵلا خۆیەتی، هەرچی هەیە، تا ئەسڵەکە بەو حاڵە مایە، باشە وەکی تەوراتی لی نایە.

٣١٦/٨

## ئینجیل کەس نازانێ چ بووە!

حالەن ئینجیل هیچ کەس نازانێ چ بووە؟ بە تەئریخ مەعلوومە ئەصلی تەورات چی بەسەر هاتیە. سبحان اللە هەموو صنفێ وایە، مەلایەکانی پێشین، ئەئیممەی مەزاهیب، ڕوئەسای تەریق، کە دوای

خۆیان تەقدیس ئەکرێن، لە زەمانی خۆیان لە ئێمە حاڵیان لە دەست قەومیان ناخۆشتر بووە. قسەی خراپتریان لە حەق کردینە. مع أنه ئەهلی عەصر بۆ ئەهلی عەصر کەڵك ئەگرێ، شێخێ هەزار ساڵ پێش ئەوڕۆ چووزانێ بۆ ئەمڕۆ چ بە کارە؟ غەیری کیتابی ئیلاهی ئەویتر زۆر قابیلی دەوام نییە، لە خۆڕا نەسخ ئەبێ، شەریعەتی تەبیعەت فڕێی ئەدا، ئیبتاڵی ئەکا، ئەمما قورئان لەگەڵ هەموو فەصل موافەقە ئەکا.

٣١٨/٨

## کێ زەبتی قورئانی بە ئەلسینەی ئەجنەبییە کرد؟

دێتە خاتیرت کەسێ عەرەب لە ڕووی ئیستیعلام بڵێ: بۆ قورئان بۆ موحەممەدی عەرەبی بە زوبانی فارسی یا ئینگلیزی نەهاتیە؟ ئەمە ئەگەر لە قەشمەری نەبی ناگوترێ، یا کەسێ بڵێ: بۆچی بەعزەکی عەرەبی وە بەعزەکی عەجەمی نییە؟

حەتتا ئەگەر کوردی یا تورکی یا ئێرانی یە، ئەم قسە بکا، مەعقول نییە، وەلەو کی ڕیسالەتی عاممە بە گوێرەی ئیقتیراحی ئەلیسنەی موختەلیفە ئەبا، چەند لیسانی هەیە با بڵێین ئی ڕاقی ئەوەندە قورئانەی بۆ هاتبا، لاکین کێ زەبتی قورئانی بە ئەلسینەی ئەجنەبییە کرد؟

٣١٩/٨

## پەنا بە خوا لە کۆنە ناوی کۆییان!

ڕۆژێ قیامەت بانگ ئەکرێن بە ئەشنەع ناویان، پەنا بە خوا لە کۆنە ناوی کۆییان. ئیبن کەسیر شتێ ئەڵێ: گۆیا ئیمامی عومەر، کەسێ لە مسوڵمانان دانیشتبی، کابرا نیدای کردیە: یا لبیکاه! ئیمام عومەر فەرمویەتی: ئەمە بۆ؟ کەست دیتیە؟ کەس بانگی کردیت؟

وتی: لە وەڕائی بەحر، یەکێ بانگی کردم.

ئیمامی عومەر ئەو ئایەتە (أُولَٰئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ). ئەخوێنێتەوە.

ئەگەر وابێ، وێ ئەچێ، ئەو زاتە ئیمامێ لە سۆفییان بێ، لە غەیبەوە

نیدایان ئەکریێ، لاکین بڕوا ناکەم کەسێ لە خدمەت عومەر بتوانێ ئەو جەسارەتە بکا.

٣٠٩/٨

## بە کوردی زەحمەتە!

بەعـزێ موسـتەلەحاتی بەلاغەت هەیە، (تـذییل)، (تکمـلە)، جـوملەی (معترضە)، (أیغال) بە عەرەبی دێ، ئەمما بە کـوردی زەحـمەتە. وە کەم کەس تێی ئەگا، وەکەزا بەعزێ تەرکیباتی نەحووی صـەعبە بە کـوردی ئەداکردنی، وە صەعبە تێگەشتنی، بۆ ئەکسەری قـوڕڕای کـوردی، بـۆیە تەعەڕوزی بۆ ناکەین، مەگەر ئیجاب بکا.

٨/٩

## وحدة الوجود

واقیعەن قسەلێکردن لە وحدة الوجود، ناسـکە، وە گەلـێ کەس تیـای گومڕا بـووە. ڕەحـمەت لە شـێخ فـارووق سـەهرەندی بـێ، ئەڵـێ: ئەوانە وحدة الشهودیان لێ بۆتە وحدة الوجود، وەکی کەسێ بە ڕۆژ تەماشـای ئاسمان بکا، ئەستێرە نەبینی، وا ئەزانی ئەستێرە نین. ئینسان نازانێ لە حەق سۆفییان بڵێ چی؟ وایە وجودی حەقیقـی بـۆ خـوایە، ئەممـا کائینـاتیش وجودی هەیە، خەیاڵ و ئەوهام نییە، وە وجـودی لە تەڕەف خـوایە، ئەو ئیجادی نەکردبان، مەوجود نەدەبوون.

٨/٩

## دوعا

ئیلاهی ئیعادەی مەجدی ئیسلام کەی، ئیلاهی ڕەحمێ بە ئەهلی عیلم بفەرمووی، دەرگەی خەزێنەی خۆتیـان بـۆ بـکەیەوە، خیلافیـان لە بەینـا هەڵگری، ئەشـقیایان تەنبیـە کەی، زەربە لە ئەعـدای دینـی ئیسـلام دەی، زەلیل و بێ هێزی بکە و نەبەر حوکمی ئەهلی ئیمان.

١٢/٩

## لیسانی عەرەب واقیعەن عەجایبە!

عەرەبـی، لیسـانێ واسـیع و مـوبین، ئەگەرچ مەجبـوورەن، بەعـزێ کەلیماتی ئەجنەبی وەرگرتییە، صوقڵی دایە، لیباسی عەرەبی لەبەر کردیە، حەقیقەتەن سیعەتی لیسانی عەرەب (محیر العقول)ـە، قەومێ بـێ دۆسـت و مەدەنییەت، ڕەحالەی بادیەنۆشین، بێ صونع و ئیختیراع و تیجـارەت و زراعەت لە ئەتراف، ژێردەستی ئەجانیب، ئەو زوبانە واقیعەن عەجایبە.

من ئان زیادە لە نـاوی ئەعزایـی ئینسـان و حەیـوان، لە دەروون و بە ڕوونـی، لە تـۆقی سـەر تـا نینـۆکی پـێ، کـوللی جـوزئەك، نـاوەکی سەربەخۆی هەیە، بێ مەدەنییەت بێ فەوقەلعادە، وە جەڕڕاحی وە عیلمی تشریح الابدان چۆن ئەبێ، حەیرانم؟ جەواهـری کەلیمـاتی، ئیشـتیقاقاتی، ئیعلالاتی، تەرکیبـی کەلیمـاتی، تەفەننـونی عیبـاراتی، غەوری ئیشـاراتی، دیققەتی ئیستیعارات و کیتاباتی جەلبی نەزەر ئەکا.

١٣/٩

## چ نەبا لە سەر ئایەتێ ئیتتیفاق ئەکەن!

سبحان الله ئەگەر خوا ئیرادەی کردبا، ئەو مەلایانە، ئەبوونە ئـوممەتێ واحید، چ نەبا لەسەر مەعنای ئایەتێ ئیتتیفاقیان ئەکرد.

١٤/٩

## ناوێرم بڵێم!

خولاسە ئەسەر بۆ خوا ئیسبات ئەکەین، ئالەت نا، کەیفییەت عائیـدی وییە، ئێمە نایزانین. بەڵـێ ئەو کەیفیـیەتە مەجهـووڵە، وە حەقە مەجهـوول بێ.

ناوێرم بڵێم (الاستواء معلوم والکیف مجهول) هی ئیمامی مالیك خۆی نییە، بە هەر کەیفییەتێ بێ جلوس بۆ خوای نییە، نابی. وەکەزا صعود و نزولی خوای، ئەمە سەیرە، گەلێ وای بۆ ئیسبات ئەکەن و دەشلێن: لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ، خوا لەسەر عەرش دادەنیشی، لینگی لەسەر لینگی (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ) خوا دێتە سەر صورەتێ لایق (وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ) (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ) ئەمە چۆن ئەبی، تەجریدی عەقل لە وەهم و خەیاڵ موشکیلە.

١٨/٩

## ساحێب ملیۆن لە برسان ئەمرێ، ئیفلاس ئەکا، خۆی ئەکوژێ!

دونیا پڕە لە مەعادین و مەنابیع، سەروەت و گوزەران و مەعیشەت، ئوصولی مورەککەباتان، گڵی ئەڕزان، بە ئەمری باری، تەکەوون ئەکا، وە زۆریشی سەعی و عەمەلی بەشەری ئەوێ. خۆت بنۆڕە، تەماشای عیلمی تەبیعەت و کیمیا بکە، ئەو زێڕ و زیو و ئاسنە، چۆن دێتە دەست، گر ئەکرێتەوە؟ کە ئینسان خێری لێ ببینێ، ئەو نەوتە بە چ حاڵێ ئیستیخراج ئەکرێ؟ کوو تەصفیە ئەکرێ؟ چەند نەوعی لێ وەرئەگیرێ؟ ئەوا دیارە هەمووی بە عیلم و جوهدی بەشەرە، غەڕبی نەبان، لەناو غەبییان تا ئەبەد بە ناوی چاك و پیر، نەوتی بابەگوڕگوڕ ئەسووتا و خەسار ئەبوو.

وە عیلمەکیان داوە، عیلمی ئیقتیصاد، باس لە ئیستیحصالی مال و ئیستیهلاکی ئەکا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەبینی، ساحێب ملیۆن لە برسان ئەمرێ، ئیفلاس ئەکا، خۆی ئەکوژێ، شەریکەتی دونیا دادەگرێ، وەك شەریکەتی ڕەگەمێکووك. (قبلَ الحرب العام) دونیای پڕ کرد، هەندە نەچوو، لە سایەی حەڕبی عوزما مەحوو و نابوود بوو، ئەو خەرمانە ڕەگە مێکووکە بە زایەع چوو. ناشکوری نەبی، ئێمە کەسمان نەبوو ئیستیفادەی لێ بکا، نازانم کوو فێر بووین، ئەیکوڵێنن، وە ئاوەکەی قیوامی ئەستێنێ

وەکی دۆشاوی، پێی دەڵێن چرك، تەداوی بەعزێ برینی ولاغانی پێ ئەکەن، وە حەتتا نەمانزانی شەریکەتی ئەو ڕەگەمێکووکەکەی بۆچی بوو؟

١٨/٩

## حەنەفی و شافیعی، لە جوو و دیانان لەگەڵ یەك خراپتر بوون!

تەفرەقەی (فی الدین) بۆ ئەسڵی دین زەرەرە، وەلەو تەمویەی بکەن بەناوی حەق و وصولی (الی الحق) نە لە ئوصول نە لە فروع، نە لە طورڕوق نە لە مەسالیك، ئیختیلاف کەڵکی نییە. موجیبی وەهەنە، موجیبی عەداوەتە، موجیبی ئیستیلالای عەدووە، حەتتا سەر ئەکێشێتە شیرك و کوفر، فیرقەی ناجییە، ئەشاعیرە ماتوریدی، سەلەفی، چەند عەدوون، چییان پێك کرد؟

حەنەفی و شافیعی، لە جوو و دیانان لەگەڵ یەك خراپتر بوون، هەروەها چەند ڕوئەسای دین و طەڕیق پەیابوون، ئەوەندە ئیلاهـ لە ئیسلام تەشەککولی کرد، اختلاف امتی رحمة بێ ئەسڵە، لای موحەدیسین نییە، بەڵێ ئەگەر تەعەصوب و جەهالەتی ئەتباعی نەبا، مومکین بوو ئوممەت ئیستیفادەی لە عیلمی موجتەهیدان بکا. وا تێئەگەم لە فیقهی مودەووەنی موجتەهیدینی ئیسلام، عولەمای بێ تەعەصوب بە مەرحەمەت لەگەڵ ئوممەت، موتەئەسیر و موتەئەللیم لە تەفرەقە و زیللی مسوڵمانان، ئەتوانن فیقهێ غایەتە موکەممەل و نافیعە، فوق کل القوانین، تەدوین بکەن، لاکین تەفرەقە لێ ناگەڕێ، وە ئەو نەوعە مەلایە، بڕواناکەم هەبن، ئەگەر بشبن، زۆر کەمن.

ئەوەی مەیلی لەسەر خیلاف و شیقاق بێ، کوو قبوڵی ئەکات؟ من (لە الحمد) مەیلی خیلاف و تەفرەقە نیم، بۆیە؛ ئەووەلەن هەزاران هەزار شوکری خوای ئەکەم لەسەر (بعث)ی (رحمة للعالمین، خاتم النبیین)، کە خەتمی نبووەت و ڕیسالەتی کرد، دەرکەی خیلافێ زۆر عەزیمی بەست، ئەتباعی ڕەسوول، موسا و عیسا و موحەممەد، چ نەوعە عەداوەت

و تەفرەقەیان هەیە، کە لە بەینی بت پەرستان ئەو نەوعە بوغز و عەداوەتە نییە. مەعازەڵلا ڕوسولی تر هاتبان، هەزار هەندی دی تەفرەقە ئەبوو.

ثانیەن: شوکر ئەکەم لەسەر ئینقیتاعی ئیجتیهاد، ئەتباعی موجتەهیدین چ لە حەق یەك ئەکەن؟ چ ئەڵێن؟ وە هەر مەزهەبە چەند خیلاف و جیدالی تیایە! ئیجتیهاد مابا مەعلووم نەبوو، دە مسوڵمان وێکڕا موتتەفیق بن. بەڵێ، میللەت، میللەت با، دڵپاك لەگەڵ یەك، موجتەهید، موجتەهیدی ئیسلام با، بێ غەل و غەش و مەیل-تەمام، دەوامی ئیجتیهاد زۆر باش ئەبوو، لاکین ئەمە موحاڵە، مەیلی ئەهلی عیلم لەسەر خیلافە، مادەم ئەوان موختەلیف بن، ئوممەت ڕێك ناکەوێ، بۆ عولەمای ئیسلام لازمە، تەوحید، لە تەوحیدی ئوممەت سەعی کەن، چ نەبێ، تەوحیدێ وەکی ئەڵمانیایی، وەکی ئەمریقایی، با حکومەتیان هەبێ، خەلیفەکیشیان ببێ.

١٩/٩

## دیسان تەفرەقە

ئەوانەی ئیمانیان بە وەحدانیەتی خوا و ڕیسالەت هەیە، تەفرەقەیان بێ مەعنایە، قەومییەت و عەداوەت و حەسادەتە، ئەوە موسا، ئەوە عیسا، ئەوە محمد، دەعوەتیان خصوصی ئی موسا و محمد، وەکی یەك بووە، (داعی الی الله) موقابیلی جەبباران، سەبر لەسەر مەکارە، ئایاتی بەیینات، کتێبی هادی، عیسای موئەییدی دینی موسا و ڕافیعی بەعزێ لە ئەسقال و ئەغلال بووە، ئەننەهو تەعدیلی ئەکرد، کوفر و تەفرەقە و عەداوەت و قیتالی (طول الدهر) بۆ؟ ئاگایان لە مونکیری ئولوهییەت، مونکیری وەحدانییەت و مونکیری ڕیسالەت نەمایە. خەریکی عەداوەتی یەکن، ڕجوع بۆ لای خوا خوایە، خوا فەصلی قەزا ئەکا، خۆزی مسوڵمانان بەو نەوعە، تەفرەقەیان، عەداوەتیان بەو دەرەجە نەبا، وا دەرئەکەوێ، تا ئەبەد ڕێك ناکەون، وە بە عومومی ڕوویان لە فسقە، وە لە دین دەرچوونە، مەیلی قەومییەتیان بە شیددەتە. مع الاسف ئەو مەیلەش لە عەداوەتی یەك سەرف ئەکەن، لە ڕێکی قەومی خۆیان نا. سبحان الله سەرئامەدانی ئاوروپا هاوار ئەکەن بۆ دینێ باش، سەرئامەدانی ئێمەش هاوار ئەکەن لە دەست دینێ باش، خوا ئەنجامی خێر کا.

٢٣/٩

## ئەوروپایی بە ژنان بەسەر ئێمە غالب بوون!

ئەمـڕۆش هەر وڵاتـێ، کەمـێ، قـووەتی دینـی ئیسـلامی تیـا بـێ، موبەششیرەکانی مەسیحی خائیب و خاسیریان چییان پێ ناکرێ. واقیعەن ئەوروپایی یا مەسیحی بە دەلیـل و بورهـان بەسـەر ئـێمە غالـب نەبـوون، ئەممـا بە ژنـان بە لاقەیـدی غالـب بـوون، نـازەنین سـەنەمێ، گـوڵ غونچەدەمێ، تەن قاقومێ، ڕوحێ موجەسسەم بە سینگ و مەمـك و ڕان و ناوشان ڕووت بە غەمزە و نـاز، بێتە لات، بە تەبەسسـوم بە نەغەمـاتێ نازکانە ڕووت تێکا، خۆی باوێتە سـەر شـان و قـۆڵ و ملـت، کـولمە لە دەم، نێزیکە بۆ ئیغـوا لە هەزار دەلیـل قەوی تـرە. ئەگەر دیـن لـێگەڕێ، مەسـیحی دەعـوای خۆیـان شوبهەشـیان نیـیە، مەلایە قاعیـدەی مونـازەرە ڕیعایەت کا، مەسیحی ناتوانێ بە موقابەلەی لەل بکا.

٢٤/٩

## کە تەوازن نەبوو کار سوقوتە!

هەر قەومێ موازەنە بن، حالیان باش ئەبێ، بێ خـیلاف ئەبـن. ئەوەی بێ تەوازن بێ،ماڵیان خـراپ ئەبـێ، زۆر بە ئیختـیلاف ئەبـن. لە ئەمثـال دایە: کابرایە کێشکەکی گرت، کێشکە وتی: بەرمـدە سـێ نەسـیحەتانت ئەکەم، یەکێ دەستت پانکەوە، لەسەر دەست عەرز ئەکەم، یەکێ ئەفڕمە سەر سەرت، سێیەم لەسەر ئەو دارە.

وتی ئەووەڵەن، ئەگەر خەبەرێکیـان پێـدای، بیـدە بەر میزانـی عەقـڵ، موحاکەمەی کە، ئەوجا یـا ڕەدد، یـا قبـوڵ. فـڕیە سـەر سـەری و وتـی: شتەکت لەقیس چوو، خەفەتی لە دوا مەخۆ، فڕیە سەر دار و وتی: ئەوی دی؟

وتـی: ئـای ئەگەر بەرت نەدابـام، دانە دوڕڕەکـم لە چکلـدانەدابوو، خەفەت میسقال گرانی بوو.

کابرا لە تاوان دەستی لە دەستی خـۆی دا، لێـوی گـرت، بـاز، وتـی: نەسیحەتەکەی سێیەم!

وتی: توو دوو نەسیحەتەکەت لەفکر کرد، سێیەمینت بۆ چییە؟ ئەگەر موحـــاکەمەت کردبـــا، دوڕڕی حەوت میســـقالی کـــوو جێـــی لەنـــاو حەوصەلەی من ئەبێتەوە؟ وە خەفەتت نەدەخوارد.

یەعنی نەسیحەت لە گـوێ گـرە، لە وەقتـی خـۆی ئیسـتیعمالی کە بە کەڵکت دێ، مەسەلەن هەر کەسێ واریدات و مەسرەف تەوازون نەکـا، بە بن ئەکەوێ، صـەڕف بە میـزانە، بەلاغەت بە میـزانە، شـیعر بە میـزانە، نەزەڕ بە میزانە، کە تەوازن نەبوو کار سـوقوتە. (المیـزان حـق والصـراط حق) ئەشهەد و بیللا ئەگەر کەسێ تەرازووی عەقڵی هەبێ، خـوا ئەینێـتە تەرازووی مەوجودات و مومکینات.

٢٤/٩

## کە هات بە خۆڕا نەدەگەیشتن!

بە ئینکار و گەمە دەڵێن دەبا بێ، بزانین چ ئەبێ؟ وەکی کۆییان پێش ئاگربارانی تەیارە، ئەیانوت: چییە، با بێ، بزانین چی ئەکا؟

غایەتی تەیارە هات، جیقنەکی بەسەر هینی وان دا بەرداوە، کە هـات بە خۆڕا نەدەگەیشتن. ئەوانەی مەقامی شەفاعەت بۆ خۆیان ئامادە ئەکەن، زۆر حەز ئەکەن، قیامەت ڕابـی، تـا موریـدەکانیان قورتـار کەن، ئەوجـا لێیان مەعلووم ئەبی، شێخیان چیـیە؟ چەنـد مـوقەڕڕەبە، بەڵـێ وا ئەنـوێنی مریشك و هێلکەی پێ ئەستێنێ.

٢٦/٩

## لە ترسی سەنگبارانی بەریتانییا کوو ئەلەرزین و ڕەنگیان زەرد ئەبوو!

موئمین کە لە هەولی خەیال ئەکا، لە مەوفیقی خۆی ئەنوڕێ، مووچڕکی بە قەلبی دادێ، دڵی سەخڵەت ئەبێ. ئەوانەی بەڕاستی ئیمانیان پێی نییە، وا دێتە وەهمیان، گوایە سەیرانگەهە، بە سەیر تەماشای خەلقی ئەکەن، ئەو نەوعانەمان دیت لە ترسی سەنگبارانی بەریتانییا کوو ئەلەرزین و ڕەنگیان زەرد ئەبوو، هەڵدەهاتن بۆ کونان، خۆیان حەشاردەدەن.

٢٦/٩

## ئەگەر تەشریع نەبا، دنیا پڕ ئەبوو لە دەعوای ڕەسوولان!

بە نەزەری من تەشریعی ئەحکامی مەعقول و مەقبوول وەکو شەرعی ئیسلام لە هەموو شتێ صەعبترە. ئەگەر تەشریع نەبا، دنیا پڕ ئەبوو لە دەعوای ڕەسوولان، بەڵێ دەبێ ئەمما وەکی قادیانی، تەئیدی ئەم دینەی درۆیە، ئەگەر تەشریعی پێ کرابا، تەئیدی نەدەکرد. ئەگەر دانێ شرم برم، شتەکی دادەنێ، تووڕەهات وەکی بەهائی، حەتتا تەقریر و وەزعی ئەحکامی عەمەلیم لا گرانترە لە ئیعتیقادی، بۆیە تەفرەقەیە زۆر و موخالەفات لە ئیعتیقادیات هەڵئەستێ، مع ئەننەهو لایان وایە وە ئەڵێن: ئیعتیقاد ئەبێ یەقینی بێ، لە فروع ئیکتیفا بە زەن ئەکەن، ئەگەر ئیختیلافی ڕیوایەت نەبا، عولەمای ئیجتیهاد خیلافیان زۆر کەم ئەبوو، لەم عەصری عیلم و عیرفان و سیعەت و ئیتلاعی لەسەر شەرائیع و قەوانینی، مەجالیسی مەبعووسان لە هەموو دەوڵەتان، قانوونێ باشی مونتەزەم و مەقبوولی مەقولیان پێ دانانەدرێ. ئەکسەری قانوون دادەنێن، لە مەصلەحەت و مەفسەدەی ناگەن، ئەڵێن: تەجرەبەی ئەکەین، ئەگەر باش بوو، با بمێنێ، ئەگەر باش نەبوو ئەیگۆڕین. مەئموور قەیدی نییە تحت

التجربـة، ئەممـا قـانوون کـوو تحـت التجربـة ئەبـێ؟ چـارەی قـانوونێ مـوکەممەل وا ئەبـێ، کە عەرزم کـردینە، لە مەزاهیبـی ئیسـلامییە، هەر مەسـئەلەیە ئەوفەق و ئەرفەق بـێ، بـۆ ئینتیزامـی ئەنـام، ڕوحـی حەیـاتی ئیجتیماعی تیا بێ، بۆ تەعالی و تەنەزوە سـەوقی ئـوممەت ئەکـا، لە هەر مەزهەبێ بێ قەیدی کەن، قانوونی دێتە حصول، ئەتەم، ئەکمەل، ئەنفەع، ئەدوەم، ئەعەم و موحکەم.

ئەتوانین بڵێین: ئەمە شەریعەتی ئیسلامییە کاملە، وە ئیللا هەر مەزهەبە بە تەنێ تەوان نییە و جوزئێکە لە تەواوی شەرعی ئەحمەدی.

٢٨/٩

## پف!

لە تەفسیری ئیبن کەسیر لە جەماعەتێ نەقل ئەکا، ئەڵێ: جەماعەتێ لە ئەهلـی بەهەشـت، پـارچە هەورێ سـێبەریان لـێ ئەکـا، ئەڵـێ چتـان بـۆ بباریێنم؟

هەر کەسە چی ئارەزوو ئەکا، بۆی ئەبارێنی. حەتتا قائیلێ لەوان ئەڵێ: کەواعیبی ئەتراب کچی تازە، ناسك، مەمك هاتیمان بۆ ببارێنە. ئەیبارێنێ. پف! حەقیقەتەن بارانێ خـۆش. مـومکینە سـێگردکانی و ئۆمەرگـونبەدی بڵێن: پیازمان بۆ ببارێنە. بڵێین چی؟

٢٩/٩

## موحیببەتی زوبانی ئاسانە، خاسەتەن نانی تیابێ!

لە بەغدا بووم، ماتەمیان ئەکرد، ئەیانوت: چوارسـەد هەزار ڕوپیەیـان کۆکردیتەوە، بۆ مەسـرەفی ئەم ئێـوارانە. سـەیدێ فەقیـر بە خـۆ و شـاڵی سەوزی لەبەر دەرکان سواڵی ئەکرد، ئەم شیوەن واوەیلایە بۆ حەزرەتـی حسێنی بن عەلی.

بابی مەلیك فەیسەڵی بووە ئەسیری ئینگلیزی، ئالی نەبەوییان لە حیجاز دەرکرد، یەکێ لە موحیببانی ئال و بەیت نەجوولاوە، حەتتا فرمێسکێکی

نەڕژاند، حاجەت ناکا، باسی یەزید و ئەوانی ڕابردوو کەین، ئەمڕۆ بزانین حوببی شیعان لە حەقی ئال و بەیت چۆنە؟ ئەتوانم بە ڕەببی کائینات سوێند بخۆم: ئەو دونیاپەرستانە لە زەمانی ئەمەوییان بان، هەموویان ئەبوونە تەرەفدار و عەدووی ئال و بەیت.

بەڵێ موحیببەتی زوبانی ئاسانە، خاسەتەن نانی تیابێ، شەرتی عەمەلیاتە، لەوەتی فەیسەڵی ئەووەل هاتیتە عێراق بە مەلیکی، لە جنوب ئەوره نەکوژایتەوە، شیمال سەد هەزار هەندی وان موتیعن، موحیببن. شێخ مەحموودیش سەیید بوو خزمی خۆی لەسەر حیسابی کوردان بەبە. موحیببەت بۆ ئیتیکال و ئیعتیماد نییە، گۆیا من رسول الله م خۆشدەوێ، ئەوجا ئی بیکەم، ئەیکەم، درۆ. *ان المحب لمن یحب مطیع* موحیببەت ڕابیتەی ئیتاعەیە، واسیتەی عیصیان و بێ ئەمری نییە. موحیببەت بە چاکە ئەبێ.

٣١/٩

## زوبانی کوردی هەڵیناگرێ!

سبحان الله حەق و باتڵ موصادەمە بکەن، حەق غالب ئەبی، لاکین سیاسییون بە تەعبیری شەرعی شەیتانی تەهویە ئەکەن، لیباسی حەق لەبەر باتڵ ئەکەن، بە حەقی ئەنوێنن، لیباسی باتڵ لەبەر حەق ئەکەن، بە باتڵی ئەنوێنن. ئەوجا حەق مەغلوب ئەکەن. ئەمە مەسلەکی شیعری یۆنانییە، مەلایانی تەفسیر گەلێ فەرمایشیان هەیە، زوبانی کوردی هەڵیناگرێ.

٣٢/٩

## بۆ تەشکیلی کوتوبخانەیە عادی، مەلایە وەکی من، هەزار دیناری پێ ئەوێ!

تا ئەمڕۆ عومومی بەشەر، مەگەر بەندەیێ چاکەکار و خالص لەسەر ئەو تەبعە بوون، بە دەوڵەمەندی مەغروور ئەبوون، ئێستاش ئێمە لەسەر ئەو تەبعە نەگۆڕاوین، ئەگەرچی دەوڵەمەندمان نەزەر بە دەوڵەمەندی غەرب بە فەقیر حیسابە. باز مەغروور ئەبن، بەڵکو بە دوو مستە ئاو

ئەکەون مەلە. غەربی نەبی بە دونیایە بۆ خۆیان مەغروور نابن، لە تەعالی خۆیان سەرفی ئەکەن.

ئێمە لە گرانی گەورە قورتار بووین، ئەمما بۆ مەسرەف گەلێ خراپتر بووین ئی بە سەد حاڵ نەجاتی بوو، ئەمڕۆ فوق العادة ئیسراف ئەکات. غەربی وا نین، ئەییامی ضەیق و ناخۆشی لە فکر ناکەن. واقیعەن لەسەر ئێمە تەجاوزیان لە حەد کردیە، ئەمما بۆ خۆیان غایەت بە تەوازوع و نەرم و حەلیم و بە ڕیفقن، شەل و سەقەت و کۆر و پیر و بێ نەوایان بەخێو ئەکەن، نایەڵێ بە سواڵ و ڕەزالەت بژیەن. حکومەتیان ڕەئیسی حکومەتیان لا زۆر گەورە و موقەددەسن، ئیمپراتۆڕ فەوقەلکول ئەزانن، ژاپۆن مەلیکی خۆی بە ئیبن السماء ئەزانێ، واجب الاطاعەیە، حرام المخالفەیە، ئەوەی ئەمری بشکێنێ، مەلعوونی ئەبەدییە. ئەو ئیعتیقاداتە لای مسوڵمانان نەما. مەسەلەن لای ئێمە کە عێراقین، مەقامی حوکمداری زۆر موحتەڕەم نییە، خصوصی لای جەعفەریان، گەلێ مەقامی ڕابردوویان هەیە، بە هەزار دەرەجە بە فەوقی مەقامی مەلەکی ئەزانن، حورمەتی مەعنەوی مەلەکیان، زەڕەیە لا نییە دەوڵەمەندن بۆ خۆیان، حەتتا بۆ خۆشیان لەزەت و خێری لێ نابینن، علی الاکثر لە سەفاهەتی سەرف ئەکەن، بە قوماریێ ئەیدۆڕێنن.

عالەمی ئیسلامییەت، لەبەر فەقر و فاقە و ئیسراف و بێ سەنایعی و ئیختیراع تێکچوو، دەوڵەمەندی بۆ مسوڵمانان باشە، بە شەرتێ وەکی سەدری ئەووەل بە جێیان سەرف کردبا. سەرووەت بۆ مەلای باش زۆر چاکە، مایەی تەوسیعی زینەتی عیلم مەنقەبەیە زۆر عالییە. ئەمما لەگەل ئیحتیاجی بێ نەشەئو ڕەونەقە. نفوزی نییە، ئەمڕۆ بۆ تەشکیلی کوتوبخانەیە عادی، مەلایە وەکی من، هەزار دیناری پێ ئەوێ، ئیدامەی مەدرەسە و گوزەرانی تەڵەبە بێ سەرووەت چۆن ئەبێ؟ مەلا چاوی لە دەستی ناس بێ، خدمەتی دینی کوو پێ ئەکرێ؟

٣٤/٩

## گەلێ فەقیر دەوڵەمەند بن هار ئەبن!

گەلێ کەس فەقیرییان بۆ چاترە، دەوڵەمەند بن هار ئەبن. بەعزێ دەوڵەمەند باشە خێرات ئەکەن، وەکی حەمەدی حەمە ڕەقی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، تا فەقیر بوو چی بۆ نەدەکرا، کە دەوڵەمەند بوو، عالەمێ لە سایەی ئەو گوزەرانی ئەکرد. خەیراتی ئیلا ماشاڵڵا دەرحەق فەقیرو بێ دەسەڵاتان زۆر بوو. لاکین مع الاسف زوو ڕۆیی، ڕۆژی سێ شەمبە پێنجی ماهی شەعبان، شەشەمی ئەیلولی ڕۆمی ساڵی ١٢٥٨ك/١٩٢٩م وەفاتی کرد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) الی الابد. باپیریشی حاجی وەسمان زۆر مولکی کردە ئەوقافی عومومی، ئەلئانیش مەلا و فەقێی کۆیە خێری لێ ئەبینن. خوا خێری خێرداران نەبڕی. توغیان بە ئینسانی فەقیر ناکرێ، بەڵێ ئەبێتە دزو درۆزن، چاوەش، خدمەتکار، قەرەور.

٣٥/٩

## لەسەر حوشترێ دوو عەشیرەتی گەورە چەند ساڵ شەڕیان کردیە!

تەماشای سیەری عالەم کەن، قەومێ عەرەب و غەیری عەرەب کوو تووشی قەتل و قیتال و سەلب و نەهب و سووتان و برژان بوون، لەسەر حوشترێ دوو عەشیرەتی گەورە چەند ساڵ شەڕیان کردیە، یەکتریان مەحوو و نابوود کردیە، دین و ئایینی نەبووە، ئەوان لەو حاڵە بگێڕێتەوە. تەماشاکە ئەکسەری ئەمراض لەبەر بێ موبالاتی، ئینسان تووشی ئەبێ و بڵاوەئەکاتەوە. واقیعەن زۆریشی لە جەهلەوە بووە، ئەویش نەوعەن ما قصورێکە، سەییئاتی تەبیعی وەکی سەییئاتی شەرعی جەزای هەیە علی الاکثر لە ئیختیارەوە ئەبێ.

٣٧/٩

## دین و توبب تەعەمموم بکا بەشەر ئەکەوێتە خۆشی!

بەشەر بە حەق دینی ئیسلامی قبوڵ کـا، لە ئیصـلاحی نەفس سـەعی کا، لە سەدا نەوەد و نۆ فەرق ئەکا. حەیاتی دونیاش فەردی و ئیجتماعی خۆشی ئەبێ، وەئیللا فەلا. دین و توبب تەعەمموم بکـا بەشـەر ئەکەوێـتە خۆشی. سوبحانەڵلا قورئان چەنـد عەجیـبە، ئەمـڕۆ عولەمـای توبـب زۆر ئیعتینا ئەکەن، بە ویقایەی هێز، نایەڵن ئەمـراز ببـی، ئەوەیـان لا لە تـوببی تەداوی باشترە، لە دوعای مەلائیکەتانیش زاندرا، ئی بەڕاستی ڕەحمی پێ بکا، ئەوانەن کە تووشی سەییئات نەبن، ویقایەیان بکات.

٣٨/٩

## بووینە خەنسا، ئەوەندەی سەردولکان بە صەخری دا هەڵبلێین!

قەومی نەجیب موقایەسەی خۆتان کەن لەگەڵ ئوممەی دی، بە هەموو نەوع لە ئێوە تەفەووقیان کردیە، ئەو کۆنە کەشتیانە بـوو، ئەوان کردیـانە ئوستوڵی حەڕبـی و تیجـاری. تەماشـاکەن وەکـی چیایـان بەرزبـووینەوە. خصـوص ئەعلامیشـیان لەسـەر هەڵئەکـرێ. (علـم فـوق العلـم) ئەوەیە، ئەمانەش گشتی ئەسەری عیلمە، عیلمی عەمەلی، نەزەڕیات، (لکـان کـذا یحتمل ان یکـون کـذا) زۆر فائیـدەی نییە، بەڵکـو ئینسـان غەرق ئەکـا. نەزەڕی مع التجربە خۆیەتی. خوا ئەو ئایەتە بـۆ ئێـوە زیکـر ئەکـا، نـاڵێ (ومن آیاتە، ملائکة) لاقی لە بن عەردانە، سەری لە ئاسـمانانە، قـۆچی بە قەدی خۆی درێژە، مع الاسف بە غەیری صەخر چیـدیمان بە چەنـگەوە نییە، (کأنە علم فـی رأسـە نـار) نـازانین ئیقتیـدا بە کـێ بکەیـن؟ بـووینە خەنسـا، ئەوەنـدەی سـەردولکان بە صـەخری دا هەڵبلێـین، یەکـێ نەبـوو وەکی دەلـی بەتـرۆس، قرالـی عەرووس بە تەبـدیل بچـێ، فێـری پـاپۆڕ دروست کـردن ببێ. ئەلئـانیش کەس نییە، ئەکەونە کـۆنە لانکـی سـەر ئاوێ، کۆنە کۆلارەی هەوایی، زۆر نـاڕوا، ئەو نقـوم ئەبـێ، ئەم سـقوت ئەکا.

٣٨/٩

## ئاخیری نابن بە هیچ ئەبنە هیچ و پووچ!

گەلێ کەس حەز ئەکەن کتێبێ بە دەرسێ بخونن ئارام ناگرن، بازبازانێ لەو کتێبێ بۆ ئەو کتێب ئەکەن چەند دەرسێ ئەخوونن، خۆ هەڵ ئەدەن، ئاخیری نابن بە هیچ ئەبنە هیچ و پووچ. هەروەها کاسبی دونیا ئەوەی سنعەت فێر ئەبێ بێ سەبر و قەرار ناگا بە مەقسەد. یەکێ لە ئەجانیب ٢٤ ساڵ لە عومری خۆی سەرف کرد بۆ ئیختیراعی ئالەتێ کەشفی ناو بەحری پێ بکا، موەفەق بو. عولەمای ئیختیراع سەبریان نەکرد پاپۆڕ و تەیارە و غەواصات نەدەهاتە ساحەی ظهور وە شهود، چەندیان لەو ڕێگەیە فەوتان، ئیخلافیان تەعقیبیان کردن، بێ ئومێد نەبوون تا گەیاندیانە سەر! وا ئەبێ.

ئێمە نەکەی (وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ) حەقیقەتی مەعناش نازانی، ئەمما لە ئەووەلی شەو تا نیوەشەو دەف و دونبەك لێدەن، هەڵپەڕن، هاو و هوویی بەناوی زیکر و عیبادەت بکەن، ماندی و عارەقەی ڕەش و شین بڕێژن، قەی نیە بۆ خوایە.

ئەوانەی بە خەیاڵ و فکر عەجوول بن، نەزەریان نفوز ناکا، سەتحی ئەڕۆن، لە ئایات نازانن، وەکی حەیوانات ئەبینن، مەزایا نازانن، توبىی عیونی تەبیعی ئەسرار و دەقائیقی ئەشیا زۆر دەرك ئەکەن. ئەمما لە وەجهی ئایاتی ئیلاهی تەماشای ناکەن. بەڵکو سەبەب بە جەهلی عولەمای دینی خۆیان، تا قەتعی عەلاقەیان لەگەڵ خوا نەکرد، بە مەڕامی نائیل نەبوون. ئەوەی موئمین و متەفەکیر بێ، بە چاوی عیلم و عیبرەت ئەنۆڕێتە کائینات، بۆ (الدارين) ئیستیفادەی لێ ئەکات. لاکین ئەوانە کەمن، یا نین (مع الاسف) ئەوەی ئیمانی بە خوا هەیە، نەفیی تەبیعەت ئەکا، هەردوو قاسیرن، ناوێرم بڵێم هەردوو کافرن.

بەڵێ ئینکاری تەبیعەت ئەثەری بۆ ئێمە خراپ بوو، واقیعەن ئەوائیل کە قسەیان لە تەبیعەت کردبا، بۆ ئینکاری ئیلاهـ دەڕۆیشتن. بۆیە عولەمای دین علومی تەبیعەیان حەرام کرد. ئەمما ئەمڕۆ ئێمە بەحسی لێ ئەکەین، بۆ تەسخیر و خێر لێدیتنی، بۆ ئینکاری ئیلاهـ و ئولوهیەتی

تەبیعەت تا موئمینی هاکەزایی غایەتی شوکری ئیلاهی لەسەر ئەو نیعمەتەیە.

(لك الشكر یا ربی) موەفەقت کردم بە لوتف و کەرەمی توو، بووم بە مەلا، حەقائیقی ئەشیا ئەزانم، بۆیە کائینات بۆ موئمینی صەباری شەکور ئەبێتە ئایەت، ئەوانی پێشی ڕێیان بە تەحریر و تەفصیلە نەبردیە.

٤٠/٩

## دەور و دۆلابی فەلەك لە دژی ئێمەیە!

هەزار سەفینە پڕی گاور بووە بە سەلامەتی چوون و هاتنەوە. گەلێکیش پڕ لە مسوڵمان و حەجحاجی بەیتوڵلا لە پاپۆڕدا سووتان، غەرق بوون. تەبیعەتی زاڵم فەرق لە بەینی موئمین و کافر و بیرڕ و فاجیر ناکا. لەو ڕۆژانە با وجودی بە نیگبەتی زەلزەلە، پاپۆڕێ تورکیا موصادەمەی صەخرەیە ئەکات، غەرق ئەبێ، چیبکەین؟ دەور و دۆلابی فەلەك لە دژی ئێمەیە. (علی کل حال) ئێمە لە کافران ئەهوەنترین.

٤١/٩

## ئینسانی تووڕە چی پێ ناکرێ!

ئینسانی تووڕە چی پێ ناکرێ، سەبری نایێ، دوشمنی زۆر ئەبێ، مەنفوور و مەترووك ئەبێ، ئەگەر بێ دەسەڵات بێ، ئەیکەنە قەشمەرجار، ئەوەی بەخۆی وێرا بە هەموو کەس ئەوێرێ.

٤٣/٩

## نوێژی ئێستا ڕووحی نییە!

نوێژ ڕابیتەیە بەقووەتە لە بەینی خوا و عەبد و عیبادی موئمین خۆبەخۆیی خصوصی بە جەماعەت بێ، وە ئیمام مەلا بێ، مەئمومی تاڵبی زانین بن، ئەتوانن بەعزێ قورئان بە زوبان لە ئیمام وەرگرن. لاکین

نوێژی ئێستا ئەم ڕووحەی نییە.

٤٣/٩

## هەربژی پەرلەمانی عێراق!

واقیعەن ئەگەر حکومەتێ شوورا (کە ئەیلێنێ مەشرووتە) بە حەق حکومەتی شوورا بێ، زۆر نافیعە بۆ ئوممەت، ئەمما هاوکار و پشتیوانی ئیستیبداد بێ، زاهیرەن شوورا بێ، ئەوە زۆر موسیبەتە، ئەمڕۆ فەرقی حکومەتی موستەبیددە و مەشروتە چییە؟ موستەبیددە خیلافی قانوونی ئەکرد، بێ موبالات زوڵم تەجاوزی ئەکرد، ئی مەشرووتە ئێستا زوڵم و جەور و تەعەددای ئەکەنە قانوون، نازانم بڵێم چی؟ ئێمە لە مەجلیسی تەئسیی عێراق ئەعزا بووین، وا ئەزانم بۆ مەبعووس چەند شەرت لازمە، زوبان بزانێ، وە ئاگای لە شەرائیعی قەوانین بێ، جسوور و جەربەزە بێ، لە دائیری ئەدەب دەرنەچی، غەزەب نەیگرێ، تەعەصوبی حیزبی نەبێ، بە چاوی بێ مەیل و موحابا تەماشای مەسالیح و مەفاسیدی ئوممەت بکا، فەقیر نەبێ، لە گوزەرانی ئەمین بێ، بەلیغ و جەززاب بێ، خولاسەی ئەوەی ئەیناسی، بلێ وەکی حوسێنی مەلا ئاغای دزەیی[1] بێ، کە حالەن مەندووبە، هەربژی پەرلەمانی عێراق!

٤٤/٩

---

(١) ناوی تەواوی حوسێن کوڕی محەمەد ناسراو بە حاجی مەلا، کوڕی بایز ئاغای دزەییە. لە ساڵی ١٨٧٠ لە دەشتی هەولێر لە دایك بووە و کەسێکی خوێندەوار بووە و بە سەرپەرشتی کردنی کاروباری تایبەتی کشتوکاڵییەوە خەریك بووە. ناوبراو لە خولی شەشەم و نۆیەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی بە نوێنەرایەتی لیوای هەولێر بۆتە ئەندامی ئەنجومەن و یەکێکیش بووە لە هاوسۆزانی بزووتنەوەی مایسی ١٩٤١ بە سەرۆکایەتی ڕەشید عالی گەیلانی. دوای ئەوەش بە کاری خۆیەوە خەریك بووە تا ئەوەی لە ساڵی ١٩٥٧ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گوندی قازیخانەی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی هەولێر نێژراوە. (بڕوانە: ئەندامە کوردەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی لە ڕۆژگاری پاشایەتیدا ١٩٢٥-١٩٥٨، ئەحمەد محەمەدئەمین ئۆمەر، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٧.ل٤٦)

## بۆ سەعادەتی دەوڵەت و میللەت!

بۆ سەعادەتی دەوڵەت و میللەت، ئینفاق زۆر لازمە، چ ئیستبدادی بێ، چ مەشرووتە و دیموقراتی و ئوستقوراتی بێ، بێ ماڵ و بێ ئینفاقی دەوڵەمەندانی ئەسخیای مەرد و موحیبی وەتەن، قەوم ئیدامەی نایێ. کەسێ تەماشای جومهوریيەتی ئەفلاتوون کا، لە تەقسیمات و ئەحوالاتی حکومات، لە عەقل و عیلم و تەدبیر و سیاسەتی ئەو زاتە تەحەیور ئەکا، ئەڵێی حکوماتی ئەو عەسرەی لەبەر چاو بووە، حەسەنات و سەیئاتی بە تەجرەبە زانییە، لە جیهەت لەوازمی ئومەڕای حکومەت، موناسەبەی فیکری لەگەڵ مەشرەب و موعامەلەی ئیمام عومەر هەیە. لاکین ئەفلاتوون ئیفرات ئەکا، وە مەقسەدی حەکیمانەی تەجریدی حوککامە لە هەموو میول، لاکین ئەمە بە موحاڵ حیسابە، ئەگەر بێ غایەت نادیرە، مەگەر یەکێ وەکی عومەری فارووق (وانی یأتی بمثله الزمان).

دیارە، ئەوەی مەئموورییەت بۆ معاش و گوزەران بکا، نە ئوممەت نە حکومەت خێری لێ نابینن ئەو ئەوساف و موناقیبەی بۆ ئیدارەی داخلی و ژیانی ئیجتیماعی خۆیانە.

٤٤/٩

## ئەڵێن عیسا ئەفەرموێ!

ئەڵێن عیسا ئەفەرموێ: کەسێ زللەکت لە لا ڕووێ دا، ئەویتری بۆ ڕاگرە، با زللەیە لەویش دا!!

بڕوا ئەکەی ئەمە تەعلیمی ئیلاهی بێ؟ تەبعی بەشەر هەڵیناگرێ، مەگەر تەبعی ئینگلیز لە وەقتی بێ دەسەلاتی، یا وای ئیش بۆ بچیتە سەرێ، ئەوە ئەساسی حیلەبازییە، بێ دەسەڵاتانایە. قوربانی ڕەسوولی سەلام بم لەوەتی تەشریفی هاتییە، ڕۆژ بە ڕۆژ فیتنە و شەڕ و شۆڕ زیاد ئەکا. خسووس لە زەمانی دەعوەتی دووەمی ڕەسوولی سەلام، بەهائوڵلای بابی، بەڵکو پاپی ئانەن فانەن شەڕ و فەساد و بێ شەرمی و بێ ئەخلاقی و بێ مروەتی و بێ عەرض و ناموسی و بێ غیرەتی، لە نما و ئینتیشار

دایە. بەڵێ غەرەزیان سەلبی بەشەرییە، لە مسوڵمانان تا ئیمحای دین و دنیایان کەن، ئەگەر یەك دوو ڕەسوولی تر ڕەسوولی سەلام وەکی بەها هاتبان، ستارەی مەنحووسەی ئەرز، سەراپا ئاگری تێبەر ئەبوو، بەڵکو ئینسان مەحوو ئەبۆوە لەو های و هووە نەجاتی ئەبوو!

تازە مەجەلـــەی هیلالیان هێنا، لە میلادی عیسا ئەدوا، نەختێ موتەئەسیر بووم لە بەعزێ قسەیان، لاکین تەسەللی خۆم داوە. چونکی دوور نییە لە بەشەرێ ولادەتی عیسا بکاتە مەیدانی ئاتی و ڕابردوو، ناوی ئەوانی پێشی نەمێنێ، عەجایب نییە لە بەشەرێ، چ جایە عیسا گاجووت بکا.

بە خوا حەقولئینساف تەماشا کەن، حەزرەتی عیسا لەگەڵ حەزرەتی موسا موقایەسە بکەن، لە عالەم تاریخی، دینی، سیاسی، کامیان حەقیان هەیە ببنە مەبدەئی تاریخ. یۆنانی بنۆڕنە عوزەما و حوکەمای خۆیان، بنۆڕنە ئەسکەندەر حەقە شەرم کەن، لە تاریخی خۆیان لە ئیزاعەی مەجدیان. بەڵێ بە واسیتەی ئیمان بە حەزرەتی محەمەد ئیمانمان هەیە بە ڕیسالەت و گەورەیی حەزرەتی عیسا، لەگەڵ ئەوەشدا لە عالەمی تاریخ بێ ئەثەرە، وەلەو ئەورووپایی کردیانە واسیتەی بەینی سابیق و حەق.

٤٥/٩

## ئەمە درۆیە، بەهانەیە واهییە!

ئەورووپایی گۆیا وڵاتیان تەنگە، نفوسیان زۆرە ئیدارە ناکەن، تەحەممولیان نییە، مەجبورەن لە ئەفریقا و ئاسیا وڵاتی عیبادی خوا داگیر ئەکەن، ئەمە درۆیە، بەهانەیە واهییە. ئەوان ئەگەر ئیقتیصاد بکەن، وڵاتیان لەخۆ واسیعە، واریداتیان زۆرترە، ئەمما ئەو ئیسرافی ئەوان ئەیکەن لە سەفاهەتی دونیایان بەش ناکا. کۆنە چەتیوێ ڕەقس ئەکا حەفتەی دوو هەزار لیرەی ئینگلیزی ئەدەنێ، دوو پێستەی ڕیوی ڕەش بە سێ هەزار لیرە، شووشەی موسکیری گچکە بە دوو تا چوار لیرە، شووشە عەترێ بە قیمەتێ زۆر، بە کورکی خۆی دائەکا. بینایە بۆ تەعلیمی ڕەقس بە ٢٢ ملیۆن لیرە. ئەوە سەییئاتە تەرك کەن، گوزەرانێ موعتەدیل نە شیش بسووتێ نە کەباب، وڵاتی خۆیان سەر و زیادیانە. یا ئیلاهی بەسطی

ڕیزقت بۆ کردن، توغیانیان کرد، ئەوجا نۆبەتی عیقابە.

٤٧/٩

## تووشی دەردەداری بووین!

ئێمە خوێندمان سەعییمان کرد موفریط لە حوجرەی مزگەوت و ئۆدەیی مەرطوب، هەوای مولەووەث نوستین. ڕیعایەتی حیفزی سیححەتمان نەکرد، یا بۆمان نەکرا، تووشی دەردەداری بووین، تا ئەمڕۆ دەوام ئەکا. ئەو نەوعە کارە هەم تەجاوەزە لە تەبیعەت، هەم تەجاوزە لە شەریعەت، شەریعەت گەلێ شت بە ئیعتیدال پەسەند ئەکا، زێدەباری خۆ گران کردن قبوڵ ناکا.

٤٩/٩

## لە ئەواخیری عومری خوا حەمەزیاد ئاغای پێ کەڕەم کرد!

حەماغای غەفووری زادە خوا عافووی بکا، ئەولادی نێری کەم کەم ئەبوو، وە نە دەژیان، لەسەر ئەو سەروەت و سامانە گەورەیە، حەسرەتمەند بوو. لە ئەواخیری عومری خوا حەمەزیاد ئاغا[1]ی پێ کەڕەم کرد، خوا بەرقەراری کا.

---

(١) محەمەد زیاد (کاکە زیادی کۆیی): ناوی تەواوی محەمەد زیاد کوڕی حەمە ئاغا کوڕی مەحموود ئاغا کوڕی حەمە ئاغا کوڕی کەریم ئاغا کوڕی غەفوور ئاغایە و لە بنەماڵەی بەناوبانگی غەفووری شاری کۆیێە. لە ساڵی ١٩١٤ لە کۆیە لە دایك بووە و خوێندنی سەرەتایی لەو شارە خوێندووە، خوێندنەوەی لە زمانی کوردی و عەرەبی باش بووە، لەگەڵ کەمێك لە زمانی ئینگلیزی. کاکە زیاد ڕۆڵێکی کارای لە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستاندا بینیوە. ناوبراو لە خولی یازدەهەم و دوازدەهەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی بە نوێنەرایەتی لیوای هەولێر دەبێتە ئەندامی ئەنجومەن. بەڵام داوای دەست لە کار کێشانەوەی کردوە لە ساڵی ١٩٤٨، لەبەر ڕازی نەبوونی بە پەیماننامەی پۆرتسمۆت، کەچی دوای شکستهێنانی پەیماننامەکە و حکومەتی ساڵح جەبر گەڕاوەتەوە وەکو ئەندام ئەنجومەنێکی بەرهەڵستکار. کاکە زیاد لە ساڵی ١٩٩١ لە کۆڕەوەکە لە ئێران کۆچی دوایی کردووە.

پیاوێ هەبوو کەچەڵی گوڵزارێیان ئەگووتێ، فەقیر، بێ ئەنوا، هەموو ساڵێ کورەکی ئەبوو، بەڵکو بەعزە ساڵان ژنەکەی جووت جووتی ئەیەنا، ئەگریا: باری! ئیلاهی! ئەمن چیان لێ بکەم؟ کوویان بەخێو کەم؟ ئەتوو بۆ کوڕێ نادەیە حەماغای ساحێبی ئەو جاهـ و مەکانەتە، ئەمن بۆ چمە؟

٥٠/٩

## ژنی دەروێش حەسەن ئاوس بوو!

عولەمای فیقهی وەکی زەرکەشی و ئیبن حەجەر ئەفەرموون: زکورەت و ئونوثەت لە ئەووەلی تەختیتی مادده تەقەڕوڕ ئەکا. کەوابێ پاش تەقەڕوڕ ناگۆڕێ، حەتتا بە شێخ حوسامەدینی تەوێڵە، ئەوەی شێخ عەلی هەولێری ئەڵێ: ژنی دەروێش حەسەن ئاوس بوو، شێخ وتی، ژنەکەت کچی لە زگی دایە، ئەوا کیرەکم پێوە نووساند. گۆیا کردی بە کوڕ، نابێ. جەهل و بەساطە و حوب هەموو شت بە ئینسان ئەسەلمێنێ.
٥١/٩

## دوو سێ قسەیان کرد پێیان ئەڵێن فەیلەسووف!

ئەگەر شتەك ببێ بە تەقلیدە لە ئەجانیب وەریئەگرین، عەمەللیات نەزەریياتی بێ عەمەل. کە دوو سێ قسەیان لەو نەوعە علوومە کرد پێیان ئەڵێن فەیلەسووف، چەند کەیفی پێ دێ. عولەمای غەرب علی الاطلاق ئەڵێن دین مانیعی تەرەققییە، قسە دەرحەق دینی ئیسلام ئەساسەن ڕاست نییە. ئەمما نەزەر بە ئیعتیقادییاتی ئیجتیهادییە و کەسالەت و بەتاڵەتی موسلمانان قسەیان ڕاستە.

٥١/٩

## بووینە ژێر چەپەڵۆکی غەربییان!

مع الاسف لە قووەتی خوای مەحرووم بووین، زەعیف و بێ دەسەلات بووینە ژێر چەپەڵۆکی غەربییان، هەرچەند وەکی موشریکان هاوار ئەکەینە ئیلاهمان و ئەئیممەی مەعصومین فائیدەی نییە، بە هاوارمانەوە نایەن. إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ وای ئایەتێ چەند بە قیمەتە!

٥٢/٩

## توو خوا دێتە دڵت خوداوەندی عەزیموششەئن زوڕنا ئەنگێوی چاوەشێ، بکا بە قوتب؟

گەلێ کەس لە مسوڵمانان ئیشێ زۆر بێ ڕێز ئەکا، لۆمەی ئەکەن، قەباحەتی لە خۆی لا ئەدا، ئەڵێ خوا پێی کردم. شەخسێ هەبوو گێژ و وێژ، زاتێ ڕەحمەتی لێ بێ فەرمووی لام وایە ئەوە وەلییە.

وتم ئەگەر کەسێ بڵێ ئەوە برای تۆیە پێت خۆشە؟

فەرمووی نا!

وتم: ئەدی خوا کوو ڕازی ئەبێ بڵێی ئەمە وەلی خوایە؟

بنواڕە حورمەتی خوای، لای ئەکسەری مسولمانان ئەو نەوعانەیان لا وەلییە، وە مومکینە بە مودەبیری ئەرز و ئاسمانیان بزانن. توو خوا دێتە دڵت خوداوەندی عەزیموششەئن زوڕنا ئەنگێوی چاوەشێ، بکا بە قوتب، تەفویزی ئیدارەی کائیناتی پێ بکا؟ ئەتو و خوا ئەمە بە ئیعتیقادی صەحیح ئەزانی؟ سبحانك ربی ما قدروا حق قدرك.

خوای تەعالان بە لوتفیَ خۆی دڵی مسوڵمانان لە عەقائیدی فاسیدی موزەخرەفە پاك کاتەوە.

٦١/٩

## قسەیە حەق بکەی ئەڵێن ئەمە موبتەدیعەە!

قسەیە حەق بکەی ئەڵێن ئەمە موبتەدیعەیە، بەڵکو مەعازەڵڵا کافرە.
٦٤/٩

## ئەتباعی شێخ نەبی ماویلی تەریقیان تێکدا!

کەسێ بە ویجدان بێ ئەزانێ ماددەی خەبیسە لە کۆڵ ئینسان نابێتەوە، دائـیمەن لەگەڵیەتـی، کەم وایە لە تەحریکـات سـاکین بـێ، مەگەر مەشغولییەتێ زۆری بە سەرا بێ، ئەو شـەیتانە عیلاجـی موشـکیلە. مـن لە ئەوائیلی نەشاطم حیسسم ئەکرد شتێ لەلای قەلبم بوو، زۆری سـەخڵەت ئەکردم، دەفعەیە حیسسم کرد، زیکەیەکی لێ هات، بۆ لای ڕاستم چوو لە لای سیپەلکم قەراری گرت، حالەن لەوێـیە، دەوام ئەکا. لاکـین (لـە الحمد) زەعـیفە، ئەممـا خاسـیەتەکی بە سـووکایەتی گەلـێ سـەخڵەت و موتەئەسیر ئەبێ هەیە، بۆیە ناتوانێ سەوقم کا بـۆ ئومـوری دونیـیە، لەبەر بـوغزی معـامەلاتی چرووکـی جەمعـێ لە ڕوئەسـای دیـن لە قیرائەتـی نەکـردم. مەیلـی زۆرە، چـونکی سـەراپا لە علیـیەی ئەوانـم ئەبینـی (لـك الحمد یـاربی) ئەگەر لە یەك نـوقتەی دی غەلەبەم بەسـەرا بکـا، ئەویـش چارەی لای خوا سەهلە. ئەگەر بەعزە دوعام قبوڵ کا ڕەهونەتی نامینی.

باپیر مەلا عەبدوڵلاشـم دیـارە بە شـەیتانی وا گرفتـار بـووە، ئەممـا بە تەوەجـوهی حەزرەتـی مەولانـا خالیـد لە کـۆڵی بـوویەتەوە، خەتەرات و وەسواس و قسەی نالایەقی تەبەددول کردیە، بە (سلطان الـذکر). لاکـین مع الاسـف کەسـێ وا بـۆ ئـێمە نەبـوو، وە ئەتبـاعی شـێخ نەبـی مـاویلی تەریقیـان تێـك دا، خاسـەتەن شـەدەڵەیی، بـالمرة لە دیـن و لە شـەرەفی ئینسانییەت دەرچوون، بوون بە قەرین و موعینی شەیتان، مومکینە شەیتان لە سایەی وان نەختێ حەسابێتەوە.

٧٠/٩

## لە سایەی قورئان عەرەب بڵندبوون!

لە سایەی قورئان عەرەب بڵندبوون، ئیستیلای جیهانیان کرد، لە سایەی قورئان چەند عیلم بۆ زوبانی عەرەب تەدوین کرا، لیسانی عەرەبی بووە لیسانی عیلم، لە بەینی دوەل و ئوممەمی دی موسەللەمە، قورئان بووە مەسدەری فیعلێ فەوقی قانون الانام. مەنشەئو بۆ ئوسولی ئیعتیقادیات و ئیجتیهاد لە سایەی قورئان بوو. عەرەبی ئوممی بوو بە ساحێب قەلەم، عولومی جیهان بە زوبانی وان تەرجەمە کرا، لاکین عەرەب ئەوانەی لا بێ قیمەت بوو، دۆڕاندی. تا ئەمڕۆ قورئان بە بیست لۆغەت تەرجەمە ئەکرێ، کرایە. لام وایە بە هەموو لۆغەتی بەقیمەت تەرجەمە ئەکرێ. سبحان اللە بەعزێ لە کوتتاب ئەیانەوێ تەبدیلی حروفی عەرەبی بە حروفی لاتینی بکەن، وەکی تورکان، نابێ ئەوانە ئەسڵەن عەرەب بن، چەند موجیبی فەخر و موباهاتە بۆ قەومێ، دین لە خۆیان، ئایین و ئاداب لە خۆیان، قەوانین لە خۆیان، کیتابەت لە خۆیان، بۆ هیچ شت لەو نەوعە ئوموری هاممە ئیحتیاجیان بە ئەجنەبی نەبێ.

٧٤/٩

## سوڵتان مەحموود بە بێ دەستنوێژ ناوی موحەممەدی بەسەر زوبانی دانەهاتیە !

کەسێ ئەدنا زەوقەکی ببێ، حەز ئەکا ناوی بە خێر و گەورەیی بێ. ئەشرافی قورەیش لەقیس خۆیان دا، بیلال لەسەر مناران فاتیحەی بۆ ئەخوێندرێ، ئەبو جەهل لەعنەتی لێ ئەکرێ، قاروون هیلاك شود، کی چهل خانە گەنج داشت، نوشیروان نەمرد، کی نامی نیکۆ گوزاشت[1].

---

(١) ئەم شیعرە هی سەعدی شیرازییە و بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

←

مەشـهووره لە روح المعـانی یـش دایە، ڕۆژێ مـوئەزین بـانگی ئەدا، هۆلاکۆ وتی: کێ پادشایە؟
وتیان توو!
وتی: نا پادشا ئەو کەسەیە شەشسەد سـاڵ لە وەفـاتی ڕابـردیە، لەسـەر مناران ڕۆژی پێنج جاران زیکر ئەکرێ، مەقسوودی حەزرەتی ڕیسـالەت پەنا بوو. حەققەن ئاذان مایەی فەخرە بۆ عەرەب، حق الانصاف ئـومەمی دی زێدە فەخر بە ڕیسالەت پەنـا ئەکەن، خصوصـتر حەزرەتـی فەخـری عـالەم ئەفەنـدی، بەنـی، زیشـەئن، فەخـری کائینـات، سـەروەری عـالەم، خواجەی هەردوو سەرا، بەو کەلیماتە ناویـان ئەهینـا، عەرەب زۆر ئەڵـێ وحیاة محمد.
مەشهووره ئەڵێن سوڵتان مەحموودی سـەبکتەگین بە بـێ دەسـتنوێژی ناوی موحەممەدی بەسەر زوبانی دانەهینایە.

٧٥/٩

## شێخ ڕەزا لە مەدحی کۆیە!

شێخ ڕەزا لە مەدحی کۆیە دەڵێ:
شاری کۆیە کە لەبالەب لەبووتی نۆش لەبە
گەر فەلەك لێی بگەڕێ مەنبەعی عەیش و تەڕەبە
کوڕەکانی بە مەسەل هەروەکوو ئەشعاری منن
کامی لێی دەگری، ئێژی ئەویان مونتەخەبە[1] ٧٦/٩

---

قارون هلاک شد کە چهل خانە گنج داشت
نوشین روان نمرد کە نام نکو گذاشت
(١) دیارە ئەم شیعرە بە هەڵە نووسراوەتەوە، ڕاستییەکەی بەم شێوەیەیە:
شاری کۆیە کە لەبالەب بووتی تووشنەلەبە
گەر فەلەك لێی بگەڕێ مەنبەعی عەیش و تەڕەبە
دڵبەرانی بە مەسەل هەروەکو ئەشعاری منن
کامی لێ دەگری دەبێژی ئەمەیان مونتەخەبە/ دیوانی شێخ رەزا، شێخ محەمەدی خاڵ و ئومێد ئاشنا، ل ٨٥

←

## بەهەشت با تەڕەلەیلانی کوردی تیا نەبێ!

ئاخر کەسێ دەچێتە بەهەشت، تەبیعی مەنزیلەتی لە هەمووان بەرەژێرە، سەد ساڵە ڕێی بۆ تەوسیع ئەکرێ، لە قەسری زێڕ و خیامی لوئلوء، هەمووی ئاوەدانە، قاوەڵتی و ئێوارە، حەفتا هەزار سەفحەیی زێڕ، هەریەکە نەوعە تەعامەکی تێدایە، لە هەر حەفت هەزاری ئەخوا، ئەووەلی ئیشتیهای چۆنە، ئاخیریشی وایە. یەعنی ئەووەل و ئاخیری ئیشتیهای باقیە، کەم نابی بە خواردن. ئەوانە ئەمڕۆ زەحمەت قبوڵ بکرێ، بەڵێ بادیە نۆشین، کرمانج، فەقیری برسی، تا تەوسیعی بۆ بدەی پێی خۆشە، دڵی پێ واسیع ئەبێ، بە ئومێدی وەیە، خوا کەرەمی لەگەڵ بکا، لەو تەنگی عەیشی دونیا بکەوێتە سیعەتێ وا.

شێخی نابلسی ئەڵێ: یەك مەرد چەند حوری هەبێ، بە یەك ئان بە یەك ئالەت لەگەڵ هەمووان دروست ئەبێ. ئەفەرمووێ: ئەوە عولەمای زاهیر قبووڵی ناکەن، ئەمما عولەمای باتین یەعنی ئەولیائوڵڵا تەسدیقی ئەکەن. دیارە ئیش بە مەشرەب ئەگۆڕێ، وە ئیللا ئەوەی شێخ ئەفەرموێ موحاڵە، تەسویر و تەسەوور ناکرێ، هەرچی بڵێن لە مەدحی جەننەت ناگاتە ئایەتی (وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ). بەلام لازمە ساحەی تەفسیر و ساحەی جەننەت وەکی ساحەی دونیایە بە ئوموری دەنییەیە تەلویس نەکەن، ئەوەی لە بەهەشت و بەهەشتی بوەشێتەوە، موشتەهای نەفس بی، لە خواردن و خواردنەوە و وڵاغی بەرزە، با حوشتریش بێ،

---

لە دیوانی شێخ ڕەزاش کە شوکور مستەفا کۆیکردۆتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە هاتووە:

شاری کۆیە کە لەبا لەب لەبتی غونچە لەبە
گەر فەلەك لێی بگەڕێ مەنبەعی عەیش و تەڕەبە
دڵبەرانی بە مەسەل هەروەکو ئەشعاری منن
کامی لێ ئەگری ئەبێژی ئەمەیان مونتەخەبە. لاپەڕە ١٠١

ئەوەی چاو لە تەماشاکردنی لەزەتی پێ بگا، لە مەنـازیر، ئەوەی موبصـیر و جوان بێ، شایانی تەماشا و جالیبی نەزەر بێ، تیایەتی. بـا تەڕەلەیلانـی کوردی تیا نەبێ، لەوێ شتی وا بۆگەنی ئـارەزوو نـاکرێ، هەر نـازیرانی مەیدانیان بۆ سیعەتی خەیال و وەهم دۆزیـوەتەوە. لاکـین تـۆ بە ئەنـدازە بنۆڕە، وە حالی موخاتیب بزانە، تەوالید هەیە لە بەهەشت؟ خیلافیـیە، لام وایە تەوالید نییە، دونیا مەزرەعەیە، دونیا خەلاص. ٨٧/٩

## چییە هەموو کەس ئەدای ئەکا، وە کەسیش پێی خۆش نییە!

لە موجەلـلەیە میصـریم دیـت، جـۆرجی ڕابـردوو مائیـدەی بەریتانیـا لەسەر مالکیە، عائیلەوی سوئال ئەکا: چییە هەموو کەس ئەدای ئەکـا، وە کەسیش پێی خۆش نییە؟

کچی جۆرجی حازری، کە ئەلئان وەلی عەهدە، جوابی دا و وتی:

ئەوە حەقە، هەمـوو کەس دەڵـێ حەقـم دەوێ، وە کەسـیش بە حەق ڕازی نییە.

تەحسینی کرد و ئەیوت: ئەمە شایانی ئیمپراتۆڕییە.

مومکینە کەڕامەت بێتە جێ، ئیمپراتۆری لە وەقتـی کـوڕی نیـیە لەبەر شیددەتی کەڕامەتی حەق تەدبیریان لە فەوتاندنی رسول الله ئەکرد.

٩٠/٩

## ڕەمەزانێ لە تەمموز بە ڕۆژی بووم!

واقـیعەن لە گرانـی وە بـێ بـارانیە هەوا مـوغبەر ئەبـێ، لەبەر چـاوی برسی، ئەڵێی دووکەڵە دنیای داگـرتیە. حەتـتا خـۆم لە ئەوائیلـی حەربـی عوزما، ڕەمەزانێ لە تەمموز بە ڕۆژی بووم، پاشی عەسر چاوم زۆر بـێ حوکم ئەبوو، لەبن کەپری چنارۆك ئەمنۆڕی، لە مەسافەی یەکەم، فەرقی کەر و بار و زەلامم نەدەکرد، هەر سیاهیم دەرك ئەکرد.

٩٩/٩

دەرکەیان لەسەر خۆ کلیل دا چوونە ناو جیێ، نووستن هەموویان تێکڕا مردن!

جەمعیێ نەقل ئەکەن لە حەزرەتی عەلی و بەعزێ بوزرگەواران، گۆیا پێش قیامی قیامەت دوخانێ پەیا ئەبێ، دونیا پڕ ئەکا، بۆ مسولمانان نەوعە پەسیوێ ئەدا، ئەمما کافر وەکی سەکرانی لێ دێ، لە کونەکەپووی و گوێ و دوبوری دووکەڵ دێتە دەر. ئەو نەوعە قسانە زۆر خۆشن، مسولمان کەیفیان پێ دێ، حەتتا لە باسی فیرعەون و ئایاتی موسا ئەڵێن: موئمین و کافر لە یەك کۆتك ئاو ئەخۆنەوە، بۆ کافر خوونە، بۆ موئمین ڕوونە.

لاکین مع الاسف ئێمە ئەبین، ئافەت و بەلای سەماوی شیددەتی بۆ مسولمانانە، کافرەکان بە ئاسانی خۆیان نەجات ئەدەن، وەقتێ تاعوون و وەبا گێسکی لە مسولمانان ئەدا، ئەجانیبەکان تەڕد و تەبعیدیان ئەکرد، ئالئان مەقرووبی تاعوون و وەبا ئەکوژن، وە غازی موخنیقیان پەیاکردیە، ئەتوانن بە بۆمبایە، شاری وەکی کۆیە بخنکێنن، ئەسبابی مودافەعەمان نییە، ئەوا عالەم ئەنێری لە غەرب کوممامی واقییان بۆ بێ. نعوذ باللە قەحط و غەلامان دیت، فوقەرا بە کۆمەڵە ئەمردن بە سەریەکا ئەڕمان، مەئموورەکانی فاسیق و فاجر دونبەڵەکیان لێ ئەدا و ڕەقس و سەمایان ئەکرد.

پیاوێ بوو، وەستا مەعرووفی ئەحمەچەی خوا عافووی کا لەگەڵ عائیلەی، ئەوەی هەبوو خواردیان، خەلاس بوو، برسیایەتی تەئسیری تێکردن، پیاوێ بە غیرەت و ناموس بوو، نەیتوانی خۆی عائیلەی سواڵ بکەن، یا دەخیلی کەسێ ببی. دەرکەیان لەسەر خۆ کلیل دا چوونە ناو جێ، نووستن هەموویان تێکڕا مردن. بە بێنێ زاندرا کە مردینە، دەفن کران. مع الاسف ئەو نەوعە مەردە غەیورە ناویشی گوم ئەبی. ١٠٠/٩

## گرانییان زوو لە یاد چوو!

ئەو زیلـلەتەی غەلای سێســەد و ســی و شەشـیان زوو لە یـاد چـوو، ئەوەی موحتاجی گێچکە نانێ بوو، ئەلئان بە پاقلاوە ڕازی نیـیە. دەنـانیر سـەرفی قومـار و شـەراب و سـەفاهەت دەکـا، ئەو نەوعە بەلایـانە نەوعە ڕەسوولێکن بۆ ئینتباهی ئەنام، لاکین کەمیان مونتەبیهـ ئەبن.

١٠١/٩

## بەینی مەلایان و بەدگۆیی!

فەقێیە هاتە لام، شرح تجرید ی ئەخوێند، پاش بەینـێ وتـی: قوربـان! چەند ساڵ بوو، ئارەزووم بوو، بۆ تەحصیل بێمە خدمەت، ئەمما ئەیانوت: مەلا لەسەر دەرس زۆر تووڕەیە، فەقێ تەحقیر ئەکا. لەو ترسە نەدەهاتم، وا مەعلووم بوو قسەیان ئیفتیڕا بووە.

لە بەینی مەلایان بە واسیتەی بەدگـۆیی، مـوعتەبەر نـاوێ، زاتـێ زۆر عالیم و موتەبەححیر و موتەدەیین بەد ئەبی، عـالەم لە عیلمـی مەحـرووم ئەبن، وەکی شێخی ئیبن تەیمییە، سەبەب بە بەعزە قسـەی نـالایقی ئیـبن حەجەر، عولەمای کوردان لە عیلمی ئیـبن تەیمیـیە مەحـرووم بـوون. لام وایە ئەووەل کەســێ لە عولەمــای کــوردان، تەماشــای کوتــوبی ئیــبن تەیمیـیەی کردبـێ مـنم، وە تەئەسسـوفم کـرد بـۆ حیرمـانی خۆمـان. لە (الجواب الصحیح فیمن بدل دین المسیح) وە لە (منهاج السـنة) حەقـقەن ئەبایە، هەر کەس مەلا بی، ئەم دوو تەئلیفەی شێخی لا بێ.

١٠٣/٩

## حەماغا وەختێ دیل بووا

حەماغـا ڕەحمەتـی لـێ بـێ، ئەیـوت: مەحبـووس بـووم، لە غەزەبـا ئەیانبردم، حەسیر مەیدانیان ئەکردم، دەمگوت: لێم دەن، دەسـەڵاتم نیـیە.

ئەمما جوونم پێ مەدەن، تەحەممولی ناکەم، جوێنتان پێ ئەدەمەوە.
١٠٧/٩

## ناتوانم بە سووکی ناوی کەس بێنم!

لازمە موئمین ئەدەب لە قورئان فێر بێ، ناوی گەوران بە سووکی نەیەنێ. گەلێ ئینسانی زۆر دون ناوێ شەخسێ گەورە لە ئەجانیب ئێنێ بە سووکی، بە قسەی ناشیرین زیکری ئەکا، ئەمە زۆر خراپە. من ناتوانم، خەیاڵ ئەکەم ئەو زاتە لە جێگایە بێ، ئایا ئەتوانم، من بە خدمەتی بگەم؟ ئەتوانم گفتوگۆی لەگەڵ بکەم؟ ڕیجالێ وەکی هیتلەر و وەکی مۆسۆلینی وەکی کەمال ئەتاتورك کوو بە سووکی ناویان ئەتوانم بێنم؟
١٠٧/٩

## نەفخی ڕووح لەگەڵ هەمیانەی چەقۆکەریان، لا وەکی یەکە!

مسوڵمان بە حیکایەت، هەزار کەس زیندی ئەکەنەوە. مەلائیکەیە بە لەشکری بیست هەزاری کەسی وت: بمرن! مردن.

بەعدەهو وتی: زیندی ببنەوە! هەموو زیندی بوونەوە. نەفخی ڕووح لەگەڵ هەمیانەی چەقۆکەریان، لا وەکی یەکە، بەڵکو ئەو سووکترە، نەك بۆ خوا، بەڵکو بۆ ئەوەی مەیلیان لێ بێ، دەججال قسەی لێ ناکرێ داك و بابی ئینسان خوا ئەزانی چەند هەزار ساڵە مردیە، بۆیان زیندی ئەکاتەوە. ئەڵێن: ڕۆڵە ئیمان بەو زاتە بینە، خوای تۆیە! ئەمانە هەمووی بۆفن، تا میعادی خۆی. ئەویش خوا ئەزانێ کەی ئەبێ، مردی زیندی نابێتەوە، وە زیندیبوونەوەشی خوا خۆی ئەزانێ کووی ئەکا. ئیمان ئەبێ بە فکر و نەزەر تەحسیل بکرێ، ئەگەر کەسێ بیلفعل ئەلئان زیندی بێتەوە، ئەبێ بە عەیان، ڕێی ئیعتیقادی بە سەرەوە نامینێ.

بینائەن عەلەیهی ئەم موتاڵەبەیان لە نەزەر نوززاران بێ مەعنایە، عینادە.
١٠٩/٩

## ئەگەر ئەمە بۆ عەرەب دروست بێ، بۆ کورد هەر دروستە!

نەقلێ ئەکەن، شەخسێ هەرچەند سەعیان لەگەڵ کردییە، نەیتوانیە بڵێ(أثیم)، هەر وتویەتی یەتیم.

ئیبن مەسعوود فەرموویەتی: ئەتوانی بڵێی فاجر؟

وتویەتی بەڵێ! ئەننەهو ڕوخسەتی دایە بە ناچاری وای بخوونێتەوە، ئەگەر ئەمە بۆ عەرەب دروست بێ، بۆ کورد و تورك و ئێرانی، بطریق الاولی دروستە. گەلێ حرووفی عەرەبی هەیە، لەم لیسانانە دا نییە، زەحمەت تەلەففوزیان پێ ئەکرێ.

ئاغای کوڕی مەلا ئەحمەد ئاغای مام سلێمانی غەفووری زادە، لە سوختەخانەی مزگەوتی گەورە ئەیخوێند، گوێم لێبوو، موعەللیم بۆی ئەخوێندەوە (الا ابتغاء وجه ربه الاعلی) ئەم ئەیگوت: الا اتباغا.

هەرچەند بۆی تیکرار ئەکرد الا ابتغاء ئەو هەر ئەیخووندەوە الا اتباغا. نازانم ئەگەر لای حەزرەتی ئیبن مەسعوود با چۆنی چارە ئەکرد؟

تەبدیلی کەلیمەیەك لە قورئان بە کەلیمەیە لاشەك ئەنجامی تەحریفە، نە خوا، نە ڕەسوول پێی ڕازی نین، وە سەددیشی زۆر باش بووە، ئەمما تەرجەمەی خۆزی زوو لە تەرەف مسوڵمانانی قوی الایمان، قوی القلم، قوی اللسان، تەرجەمە کرابا، لە موجەلـلەی مایۆی هیلالی ئەمساڵ، نەقلی کرد: قورئان بە ٢٠ زوبان تەرجەمە کرایە، ئەکثەری لە تەڕەف ئەجانیبە. بە هەر زوبانێ بێ حسب الاستطاعة چاك تەرجەمە بکرێ زۆر بە نەفعە، بەشەر ئیستیفادەی لێ ئەکات، مادام لە تەرجەمەی کوتوبی موقەددەسەی غەربییان ئیستیفادە بکەن، لە قورئان زێتر فائیدە ئەبینن.

١١٢/٩

## باوەڕدارێکی فاسق لە کافرێك خراپترە!

خودایە خۆت خەبەرداری، موئمینی فاسقی فاجری لا أبالی خەیلێ بە دەسەڵات، بۆ دین بۆ حەیاتی ئیجتماعی موئمین گەلێ لە کافری ئەجنەبی خراپترە، زەرەری زێدەیە. ئەگەر توو زەربەیەکیان لێ نەدەی، حکومەتێ نەبێ، جەزایان دا، معاذ الله عن قریب، لەو وڵاتە دین نامێنێ، ئەگەر بە ئەشقیایانیش مەحوو نەبێتەوە، یەسوعدییان یەعنی مونتەسبینی طەرائق مەحوو ئەبێتەوە، مەلای چاکیش بەو حاڵە پێ ناگا.

١١٤/٩

## دوو ساڵە بە میوەی هاوینی و پایزی زگم دێشێ!

کەم کەس هەیە، هەموو میوەی بە میزاجی کەوی. مع الاسف ئەمن دوو ساڵە، بە میوەی صەیفی و خەریفی زگم دێشێ، ئانزیادە هەنجیر زۆرم عەزاب ئەدا.

١١٥/٩

## مەلا دەڵێ ڕادیۆ حەرامە گوێلێگرتنی!

واقیعەن ئینسانی بەسیت و سەتحی قیمەتی ئەشیا نازانی. مەلای بەسیت ئەڵێ: غرامەفۆن و ڕادیۆ حەرامە گوێ لێ ڕاگرتنی. نازانێ بە چی عیلم و قودرەت و مەهارەتێ هاتیتە وجود، ئەمانە ئایاتن، لە ئایاتی حاصیل ئەبن، ئینسان کە خۆی ایة الله یە، ئەبێ مەعدەن و مەنبەعی ئایات بێ. گوێم لێ بووە جنێویان بە حوکەما داوە، جا ئوممەت چ ئیستیفادە لەوانە دەکا، غەیری جەهلی.

١١٩/٩

## کەسێ مەلا بێ دەرحەق زانایان وا ئەکا؟

توخوا کەسێ مەلا بێ، بەعینوان ئیتیباعی حەق، دەرحەق زاتێ وەکی ئیبن تەیمیە ساحێبی تەفسیری منهاج السنة، ساحێبی الجواب الصحیح، ئیستیعمال ئەکا؟ یا لە حەق زاتێ وەکی ئیبن سینا ئەگوترێ العیاذ بالله، من اتباع الهوی؟

١٢٤/٩

## لەناو کوردان غیرەت کەم بووە!

غۆستاف لۆبۆن ئەڵێ: عەقل موقابیلی مەیلی شەدید هیچ نیە، لافاوی مەیل ئەیبا. وە لای عولەمای عولیای نەفس، دین نەوعە مەیلێ وایە، ئەگەر مەیل عەجەلا سەوقی ئینسان نەکا، چۆن سەجدە بۆ گۆلك ئەبا؟ ئەگەر مەیلی کەرانە نەبێ، شەدەڵەیی چۆن وا ئەکەن؟ بێ پەروا و بێ غیرەت و شەرەف و نامووس ئەخولێنەوە.
مع الاسف لەناو کوردان غیرەت کەم بووە، زۆر کەس دوایان ئەکەون، دین و ئایین و مەحاسین و ئاداب و حوسنی مەعاشەرە و دەرس و کیتاب و هیدایەت و نوصح و ئیرشاد، بێ ئەسەرە، العیاذ بالله، چارەیان زۆپەیە.

١٢٥/٩

## ئەسەف بۆ مسوڵمانان بەناوی وەلی چی بۆیان نەقل کەن، قبوڵی ئەکەن!

یەکێ لە عەلامەتی قیامەت، ئاگرێکە لە عەدەن دێ، سەوقی بەشەر ئەکا، بۆ ئەرزی مەحشەر، تەواو! ئەمە وابزانم تەحەقوقی کرد، ئینگلیز بووە مالیکی عەدەن، خۆی ئاگری فەسادە، وە عالەمی عەرەبی سەوق کرد بە قووەی نارییە، ناری ئەفسانە، ناری نقود و عود. بۆ ئەرزی مەحشەر شامی شەریف، گۆیا یا دەخلی ئینپراتۆرییەتی عەرەبی ئەکا، شامی گێڕا بە عاصیمە. فەیسەڵ بن حوسێن بووە مەلیك، هەندە نەچوو، فڕەنسە دەریکرد، شام کەوتە قەبزەی فڕەنسە، مەهدی مەدەنییەت.

ئیخباریان دا لە قیامی قیامەت، بۆف دەرچوو، ئیخباریان دا لە یەئجوج و مەئجوج بەو نەوعەی ئەیلێن، بێ ئەسڵ دەرکەوت، کون و کاژێرکی ئەرزی هەموو پشکندرا. قەومێ وا نەبوو، نییە، وکذا چیای قاف بیحاری ئەترافی ئەرزی، بەردی بن پێی مەلائیکە، گاجووت، ماسی موقەددەس، هیچ. ئەمە ئەساسەن هەڵبەستە بوو، ڕەحمەت لە سیوتی داخلی هەیئەتی ئیسلامی کرد، گەلێ کەسی پێ کافر بوون...

ئەسەف بۆ مسوڵمانان بەناوی وەلی چی بۆیان نەقل کەن، قبوڵی ئەکەن، گۆیا ئەگەر ئینکاری کەن کافر ئەبن، لەگەڵ ئەوەشدا گەلەکی مەحاڵە، مەحاڵ مومکین نییە وقوعی.

١٣٤/٩

## لە هەموو عومری خۆم یەك ساعەت بە تەواوی مسوڵمان بام کافییم بوو!

دەفعەیە بە مامۆستا کوڕەم گوت: ئەمن ئیعتیقادی ویلایەت و مەلایەتیم بە توو نییە، ئەمما بەعزە ئەخلاقت هەیە، بە مسوڵمانی بەڕاستی ئەچی.

هەناسەیەکی هەڵکێشا، فەرمووی: لە هەموو عومری خۆم یەك ساعەت بە تەواوی مسوڵمان بام کافییم بوو.

یەکێ لە حەقی ئیسلامەتی تێکۆشینە، بۆ صەلاحی زورییەت، دینی و دنیەوی، وەکی ئەڵێن: تەئمینی ئیستیقبال، مع الاسف سەوادی ئەعزەم ابن الوقتن، سەعی بۆ ئاتی، بۆ ئەولادیان ناکەن، خۆیان خۆش ڕابوێرن سبەی هەرچی بادا، باد. الهی اسألك حياة طيبة وذرية طيبة.

١٤٠/٩

## کوڕێك دایکی خۆی عەزاب دەدا!

لەو ساڵانە ئەمرێ زۆر غەریب لە جیواری ئێمە ڕوویدا؛ ئافرەتێ کوڕەکی هەبوو، بە خوونی جگەر، گەورەی کردبوو. ڕۆژێ لەسەر قادرمەی بانی فڕێیدا خوارێ، وابزانم شەقەکیشی لەبن زگی داکی دابوو، ئافرەتەکە بێ هۆش بوو، حەتتا وتیان ئەمرێ. بەخۆهاتەوە، لەبەر خوا ئەپاڕایەوە: خوایە کوڕم نەگری، عەزابی نەدەی، گەردەنی ئازابی.

موقابیلی ئەو ئیهانە و عەزابە، لەبەر خوای ئەپاڕایەوە تکای بۆ ئەکرد.

١٤١/٩

## کە مانگ ئەگیرێ تەقە تەق ئەکەن!

سبحان الله ساڵێ چەند لەوە پێش، صەعقەیە لە تەڕەفی سەماوە هات، بەردێکیشی لە دوای هاتە خوار، لە نێزیك هەڵەجە، دێیەکە لە حەوالەی هەولێر کەوت. ئێمە لە قووەتی دەنگی وەخت بوو مەعازەڵڵا گوێمان گران بێ. کەچی لە کەرکووك و نێزیکتریش گوێیان لێ نەبوو بوو. مع هذا کۆیە، وە ئەمساڵی کۆیان کە مانگ ئەگیرێ، تەقە تەق ئەکەن، تاکو جنۆکەکانی مانگیان گرتییە، بترسێن، بەرەڵڵای کەن. ئەمە عەلامەتی بێ گوێیە.

١٤٦/٩

## کەمایەتییە، بە کلکە تەشی موقابەلەی تەیارەی بەریتانیا!

زاتێ هەبوو، موحتەڕەم سلێمان نظیف بەگ والی موصل، قبل الحرب العظمی، بە کەمێ، بە خدمەتی موشەڕەف بووم. حەقیقەتەن لە ڕیجالی ئولولعەزمی ساعی بێ فتوور حیساب بوو، ئەیفەرموو: حکومەت لازمە، سابیقەن تێفکرێ، ئەمرێکی ئەیدا، قانوونێکی وەضع ئەکا، ئایا قابیلی ئیجرایە، قابیل نییە؟ موعارەزەی ئەبێ، نابێ؟ موحاکەمەیە موکەممەل بکا، ئەبی کە ئەمری دا نەگەڕێتەوە، هەرچی با دا، باد، ئینقازی بکا.

وە ئەیفەرموو: لە وڵاتی فەوقی قووەتی حکومەت قووەتی هەبێ، حکومەت لەوێندەرێ لزومی نییە، یەعنی ئەبێ قووەتی حکومەت فەوقی هەموو قووەتێ بێ، ئەگەر قووەتێ بوو موعارەزەی بکا، نەییەڵێ.

ریجالی تاریخ، دینی و دنیەوی هەمووی ئولولعەزم بووین، بێ عەزم و جەزم ئیش ناکرێ، ڕیجالی ئولولعەزم لە ئەییامی ئێمە سەعد زەغلوولی میسر، فەیسەڵی ئەووەل مەلیکی عێراق، مع الاسف زۆر نەژی. حالی حازر لە غەڕب هیتلەری ئەڵمانی، مۆسۆلینی ئیتاڵی لە عەجایباتی دەهرن، غاندییش مومتازە، ئەمما وەکی نوری ثابت ئەیوت: کەمایەتییە، بە کلکە تەشی موقابەلەی ئوسطول و تەیارەی بەریتانیای. ومن الغرائب، قسمێ لە بەشەر تەرجیحی غاندی بەسەر ئەتاتورك دا ئەدەن، ئەمە جێی تەئەسسوفە.

١٥١/٩

## دوشمنە ڕاستییەکە ئەوانەن، کە ماون و فێرایان کردیە!

ئەگەر تاریخی یەغمام بدۆزیباوە، وەقفەیی سوڵتان موحەممەد ئالثی فاتح ئەگەڕام بۆم نەقل ئەکردن، ئەم دوو ئایەتە[1]زۆر موافیقن. شتێکی دیش ئەفەرمووێ ئەفلاتوون زۆر قیمەتدارە بۆ مسوڵمانان، ئەڵێ: پیشەی ژن و عەقل سووکانە، تەماشای لاشەی مردیان بکەن، بە چاوی عەداوەت، ئەوانە ڕۆیین. دوشمنە ڕاستییەکە ئەوانەن، کە ماون و فیراریان کردیە، ئەوەی دوای وان نەکەوی، بە کەلاکی مردیان خەریك بی، خراپترە لە سەگێ، کەسێ بەردی پێ دا ئەدا، هجوم ئەکاتە سەر بەردەکە، تاو نادات ئەوەی بەردی پێدا دەدا، هەزار ئافەرین.

حەقیقەتەن بۆ ئەهلی غیرەت و عیزەتی نەفس کەلامێ بەلیغە، واقیعەن زۆر ئەبی، بە سەی دا دەدەن، زۆر ئەبی، پێی ناکەوێ بەردەکە دوور دەڕوا، تاوی ئەداتێ، بەردەکە بە دەم ئەگرێ ئەیگەزێ.

١٥٥/٩

## خەفەت زۆرە قسەم گەلێ ماوە!

بنۆڕە فڕەنسە، ئینگلیز، ئەڵمان، ئیتاڵیا، ڕووس، ژاپۆن، جەماهیری موتتەحیدە، چیان ئیختیراع کرد؟ وە چی ئەکەن؟ ناشکوری نەبی مسوڵمان خەریکی یەئجوج و مەئجوج و دەجال و کەری دەجال و هاتنی مەهدی و نزولی عیسا بوون، لەبەر سوننەت دەستیان لە شیر و تیر و سنان هەڵنەگرت. بەلکو بە کوتەکە قیڕینە، تاویان ئەدایە سەر تۆپ، بە ئیختیراعی ئالاتی جەدیدە مەشغوول نەبوون، بە بلعاتیان ئەزانی، تاکو لێیان دان، لە هەموو جەوانیب بە بن ئەجانیب کەوتن، ئەعزەمی

---

[1] مەبەستی ئایەتی (فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ)

سیلاحیان دوعا بوو، لە دەوری مەراقیدی صولەحا، ڕیعایەتی ماددیاتیان نەکرد، مەعنەوییاتیشیان چوو. والسلام.

کەسێ خەیاڵی سیلمی عموومی بکا، کەسێ گۆیا لە تەڕەفی خوا، بۆ سیلم ئیرسال کراوە، لاشەك یا هەوایە، سیاسەتە، یا حەماقەتە. هەموو دەوڵەتەکان هاواریانە بۆ سیلم، خاسەتەن موسلیحی ئەعزەم حکومەتی بەریتانیا، حاجی سیلم و تابیعی ڕەسوولی سیلم، موعینی ڕەسوولی سیلم، مع أنه علی الدوام ئاگرۆکەی فیتنە هەڵ ئەکەن! خەفەت زۆرە قسەم گەلێ ماوە، لاکین بەسیە، ئومێدم بە ئیسلاحی مسوڵمانان نەماوە.

١٥٦/٩

## نەصرەتی خوای بە کل لەچاو کردن ئەدرێ؟

نەصرەتی خوای بە چی ئەدرێ، بە کل لەچاو کردن؟، بە سوواڵ، بە نوێژ، بە ڕۆژی؟ ئا ڕۆژی ئەسەری زۆرە، گەلێ باشە، ئەمما خاصەتەن بۆ ڕەمەزان، نا پستە پست و چرتە چرتی تەسبیحات و تەسبیح، نـاء، هاو و هووی دەروێشان و نەڕە نەڕی سۆفییان و خێری زیارەتی عەتەبات و بەردە مۆرە ماچ کردن و هـای و هووی دوورە، دوعا و ئیستیمداد و تەوافی مەراقید، (لا) ئەڵێ بابا، (لما) لحین، (کان) بوو، واو موتەحەریك، ماقەبل مەفتووح، قەلبمان کرد بە ئەلف، قەول بووە قال، چی بەسەرچی؟ ئەدی چی؟

وەحدەتی مەبدەئ و وەحدەتی غایە، کوللی ڕەئیسێ کوللی ئیمامێ، لە ئەئیممە و ڕوئەسای مەزاهیب، بوونە ئیلاهی موستەقیل، جیهادی فی سبیل الله نەما، حەتتا ئەسەری عەداوەتی سوننی و شیعی گەیشتە دەرەجەیە، لە حەربی ١٢٩٣ دەوڵەتی ئێران لە دژی عوسمانی بۆتە موعین و تەرەفداری ڕووس، ئەننەهو عەدووی ئیسلامە. ڕوئەسای دین بە مەنزیلەی دڵن، تا ئەوان ئیسلاحیان نەبێ، ئوممەت ئیسلاح نابێ، ئەلئان کان کما کان، هەر شیعەیە تەرجیحی مەزهەبی خۆی ئەدا، ئیمان بە ماددیات و مەعنەوییات بۆ نەصرەت زۆرچاکە. ئێمە ئیعتیمادمان دا سەر عالەمی غەیب و مەعنەوییات، تەرکی ماددیاتمان کرد، تەبعەن مەغلووب

بووین، بە حوشتر بەرابەری دەبابە ئەکرێ؟ قووەت، قووەت. خوا خۆی ئەفەرموێ واعدوا لهم ماستطعتم من قوة، ئایا قووەت بەس عیبارەتە لە تیر؟ ئەمڕۆ تیر، کەڵکی کێشکە کوشتنیش ناگرێ. دوو ئایەتی کەریمە (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ..) و (إِنَّ اللهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ..) بکەینە دەستوور، ئیختیلاف لەسەر ئوممەت لادەین، عەقائیدی زائیفە نەیەڵین، یەك دڵ و یەك غایە تێکۆشین، تەیارەمان بەسەر تەیارەی ئەجنەبی کەوێ، دەبابەمان بەسەر دەبابەیان پاس دا، هەم بۆ ڕەزای خوا، هەم بۆ سەر بڵندی و عیززی دین، سەر و ماڵ و وەلەد لەسەر دەست دانێن، بۆ نەیلی حەیات ئیستیحقاری مەوت کەین، وە ئیللا چمان پێ ناکرێ. نە مەهدی ئەمڕۆ دێتە دەر، لە ئەرزی، نە عیسا دێتەخوار لە ئاسمانێ، نە مەلائیکە نە ئەولیا لەشکرمان بۆ ناکەن. ئەووەل و ئاخیر خۆمان ئەمێنینەوە بۆ خۆمان، تەقسیمی ئەعمال، جەمعی ئەموال بۆ یەومی شەدائید و ئەهوال، تەدریب و پێگەیاندنی ڕیجال، تەهذیبی ئەخلاق. ویفاقی بێ نیفاق، عیلمی نافیع عەمەلی صالیح پێویستە.

٩:١٦١

## قوربان! وەقتی ئەو قسانە نییە، ئیشەکەم لەقیس ئەچی!

ئەمڕۆ ئەو دوەلی موعەززەمە، ڕووس، ئەڵمان، ئیتاڵیا، ئینگلیز، فرەنسە، هەر یەك عیبادەتی ئەمەلێ ئەکا، ئەوا دونیا وێران ئەکەن، ئەوروپایان بەسەردا وێران بێ. ئایا ئێستا ئێمەش وا نین؟ ئایا بەڕاستی کەیفمان بە ما أنزل الله ی دێ؟ ئیتتباعی ئەکەین؟

نا وەڵلاهی گوێی خۆمانیشی نادەینێ. حیکایەتێ موافیقی مەشرەبی عەطالەت و کەسالەتمان بێ، سەد هەزار هەندی ئایەتی خوامان لا خۆشترە، خوا (خذوا حذركم) ئەفەرموێ: ئەڵێن: لا يغنی الحذر من القدر. خوا ئەزانێ، زۆر جارانم ئەو قسەیە کردیە، هەر ئایەتێ هەر حەدیسێ صەحیح، ڕووحەکی حەیاتی تیا بێ، زەهرەکیان موقابیل داناوە، مع أنه ئیشی خۆیان، مەیلی ئەکەن دوای ئەکەون. موتڵەقەن ئاگایان لە

قەزا و قەدەر نـامێنێ، خـوا سـەلامەتی کـا، زاتـێ هەیە مـوحتەرەم، هەر قسەیە بکا، ئەڵێ ئەگەر خـوا حەز کـا، وا دەبـی، حەزکـا وانـابی، کەی ئەڕۆی؟

ئەگەر خوا حەزکا، سبەی.

کەی بە خدمەتت ئەگەم؟

ئەگەر خوا حەزکا، ساعەتێ دی. وهکذا...

ساڵێ ئیشەکی مـوهیمی هەبـوو، ئەوراقـی لە حکـومەت دابـوو، هـاتە ئێرە، ڕەجـای لـێ ئەکـردم، سـەعی بـۆ بـکەم زوو ئەوراقەکەی ئیکمـال بکرێ، بچێ بۆ لیوا، منیش بە لەتیفە عەرزم ئەکرد، ئەگەر خوا حەزکـا، زوو ئەبی. ئەگەر حەز نەکا، زوو نابی.

سەری بادەدا، قوربان! وەقتی ئەو قسانە نییە، ئیشەکەم لەقـیس ئەچـی، فرسەت ئەڕوا، وەقت تەنگە. قوربان خێرا عیلاجی کە!

١٦٢/٩

## کورد لە مەلای سیاسی سفر بێ تاریخن!

کـوردی قوربەسـەر، ئیختیلافـی دیـن و مەزهەبـی کەمە، لاکـین ئیستیلالای دووەلی هەم دین و هەم جیواری پـارچە پـارچەی کـردیە، بە نەوعێ قابیلی ئیلتیزام نـیـە. پێشـی ئینقـیلاب دوو لەت بـوو، یەکـی لەبەر دەست عوسمانی، یەکی لەبەر دەست ئێرانی، بعـد الحـرب کـرایە چـوار لەت، مـع الاسـف سیاسییشـیان کەمـن، بە دوو شـێخ و کەڕامەتـانیش کەوتینە، جا لە موعالەجە دەرچووینە، تا ئەمـڕۆ لە شـەتری میللـی تەك و تەنها حاجی قادریان هەیە. لە مەلای سیاسی سـفر بـێ تـاریخن. حـالاش مەلایان مەیلی تاریخ ناکەن، تەرجەمەی حـالی دوو مەلا و دوو ڕەئـیس نانووسنەوە. ماضـی خۆیـان نـازانن، بـۆ موسـتەقبەل سـەعی نـاکەن، لـۆیە حالەن حالیان وایە.

١٦٤/٩

## ئەوەی دوای نەفسی خۆی کەوێ، عەمەلی ساڵح ناکا!

ئەوەی دوای نەفسی خۆی کەوێ، عەمەلی ساڵح ناکا، دائیمەن لە خەیاڵی زگ پڕکردن دایە. لازمە ئێمە بنۆڕینە ئەم ئایەتە (وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ) لاکین زەمامی ئیدارە لە دەست عەقڵ و حیکمەت دەرچووە، عالەم لە خواردن و نۆشین و پۆشین، وای تەبەسسوط کردیە، نایەتە ساحە و سیعەتی خەیاڵ، وا بەرەڵلابووین، قابیلی بەندی پەند نین، هەمووش هاوار ئەکات. خۆ (حبس)ی لەتیف لەگەڵ عەیشی خشن قەت ڕێك ناکەوێ. سبحان الله ئەوەی لە گرانی دوای حەرپی عالەم بە سەگمەرگی نەجاتی بوو، لە هەموو کەس خراپترە، بۆ تەعقیبی لەزائیز هیچی لە فکر نەمایە. ئەوانە لە بەهەشت خەتیان نییە.

١٦٥/٩

## مسوڵمان نەبووبا نەیئەتوانی وا بکا!

بەچەیە یەهوودییە مسوڵمان بوو، کەوتە لای دزان، بووە دزێ خراپ، مسوڵمانی لە زەقزەقە نابوون. ئەگەر زاهیرەن مسوڵمان نەبووبا، نەیئەتوانی ئەو ترس و هەراس و زیانە بداتە مسوڵمانان.

١٧١/٩

## ئەپاڕایەوە یا پانی شین!

لە شێخ مەعرووفم بیست: شەخسێ لە تەکیا نوێژی بە جەماعەتی ئەکرد، بعد الصلاة ئەپاڕایەوە: یا پانی شین.

وتم: مەقسەدت بە پانی شین کێ یە؟

وتی: ئاسمان!

وتم: بە چی ئەزانی؟

وتی: بە خوا چونکی مسوڵمان ڕوو لە ئاسمان ئەکەن، دەستەو دوعا!

عەوامی موقەلیدی بێ کەس وا ئەزانن ئاسمانی شینی پان، خوایە. حەققەن لەبەر بێ مەلایەتی، عەقائیدی باطیلە چوویتە دەماغی عەوام، موقەلید لێیان بتۆزرێتەوە، کەمیان مسوڵمان دەرئەچن.

١٧٧/٩

## وەکی پیرێژنان لە سینگی خۆیان ئەدەن!

حاڵی مسوڵمانان عەجایەبە، بۆ حەزرەتی حوسێن بن عەلی لە بەغدا و سائیری بیلادی شیعان ماتەمیان ئەکرد، حوسێن بن عەلی[1] بابی مەلیك فەیسەڵ کەوتبووە قەبزەی ئینگلیز، نەفی کردبووە تەبرێز، یەکێ بە جواب نەهات و فرمێسکێکیان بۆ نەڕژاند. ئیبن سعوود ئالی نەبەوی لە حیجاز طەرد کرد، شیعەیە عیبادی ئالی بەیت نەجوڵاوە، شڵپە شڵپ، وەکی پیرێژنان لە سینگی خۆیان ئەدەن؛ حەسەنم وای، حەسەنم وای، لە حەمیمەت و حەماسەتە! بۆ ئەحوالی حازیرە هیچ، بۆ وەقفە بێ، هەزار و سێسەد و ئەوەندە ساڵە، شینی ئەکەن، بەڵێ مەلایانی شیعە قانزانجیان لەمەدایە.

ڕۆژێ لە مەجلیسی ویلایەت، پاش موەزاکەرەی ڕەسمییە ئەو باسە هاتە ناو، عەلی فازڵی موصلی بە ڕەحمەت بێ، لەعنی لە یەزید کرد.

والی سلێمان نظیف موعارەزەی کرد، من کەمەکم قسە لێکرد، والی فەرمووی: فازڵ ئەفەندی سوئالەکت لێ ئەکەم، ئەمما بە ویجدان جوابم دەوە!

وتی: حاڵی حازر سوڵتان ڕەشادە، وە شەریفی مەککە حوسێن بن

---

[1] حوسێن کوڕی عەلی ئەلهاشمی (١٨٥٤-١٩٣١ز) دامەزرینەری میرنشینی حیجازی هاشمیە و یەکەم کەسە کە داوای سەربەخۆیی عەرەبەکانی کردووە لەبن دەستی عوسمانییەکان. لە ئیستەنبوڵ لەدایك بووە و لە سێ ساڵیدا چۆتە مەککە و بە هاوپەیمانێتی بەریتانییەکان بۆتە فەرماندەی شۆڕشی گەورەی عەرەبی. لە نێوان ساڵانی ١٩٠٨-١٩١٧ بۆتە شەریفی مەککە و لە نێوان ساڵانی ١٩١٧-١٩٢٤یش بۆتە میری حیجاز. لە تەمەنی ٧٧ ساڵیدا لە ئوردن وەفاتی کردووە.

عەلی نەوعەن ما سەرپێچی ئەکا، پادشا، تۆ بکاتە مەئموور، عەسکەرت داتێ بۆ سەر حوسێن چ ئەکەی؟

وتی: ئەووەلەن ئینزار و دەعوەتی ئەکەم، بۆ ئیتاعە، ئەگەر ئیتاعەی نەکرد، لێی ئەدەم، ئەیکوژم!

فەرمووی: ڕەحمەتت لێ بی، یەزیدیش لەسەر مولك و سەڵتەنەت مەئمووری نارد، حەزرەتی حوسێنیان کوشت، ئەمە مولك و شاهییە، دین و ڕەحم ناپرسێ.

تەمام وایە، گەلێ لە ئەقاریبی عەلی، لە ئەقرەبی ناس، بۆ دونیا نەدەچوونە لای موعاویە؟ مەیل و مەحەببەتیان لەگەڵ نەدەکرد؟

١٨١/٩

## کورد بۆ بۆ سەر حوسەین ناگرین؟

شەوی حەفتەمی موحەڕڕەم ئەو ساڵەی کە لە بەغدا بووم، چوومە دوکانی حاجی کەریمی کۆیی، ڕەحمەتی لێ بی. کەواکیبی ماتەم بەوێدا بۆ لای نوواب ئەچوون، مەوکیب دوای مەوکیب لەوێ تەوەقوفییان کرد، بۆ تەڕەفی ماڵی نوواب ئەچوون. منیش بە لیباسی عادی لەوێ دانیشتم، لە ئەثنای هات و چوونی مەواکیب، یەکێ کەشیدە بەسەر، لە حاجی کەریمی سوئال کرد:

-کورد بۆ بۆ سەر حوسەین ناگرین؟

گوتم: هەیکەلی مۆدیان لەسەرە جارێ بۆ ئەم جیهەتە ئەگریەن، بۆ حوسەین ناگرین.

کابرا گەشایەوە، پرسیاری کرد:

-ئەمە کێیە؟

وتیان فلانە! مەلایەکی کوردانە!

هات، وتی: حەقیقەتەن حەق بەدەست ئێوەیە، توخوا ئەمە ئیشە عالەمی ئیسلامی لەو حاڵە دا بی، ئیهتیمامی نەدەنێ، بۆ حەزرەتی حوسێن بگریەن؟ ئەمە حەماسەتە، ئەمە دین و ئایینە؟ ئەمە شیعایەتی ئال و بەیتە؟ حاشا نازانم کەی مسوڵمانان بەڕاستی مسوڵمان ئەبن؟ لەسەر خێران،

گوێ و چاویان ئەکریتەوە، نەدەبا تاریخی ئیسلام ببینێ، لەسەر مەنـابیری جەوامیع، قسمێ لە خوتەبای ئەهلی قیبلە لەعن لە حەزرەتی ئیمامی عەلی کەن، قسمێ لە حەزرەتی موعاویە چانەبوو، دوای خاتم الرسل ڕەسوولێ دی نەهات، وە ئیللا ئەوەی دەربارەی ئەم ئوممەتە نازل ئەبوو، دەربارەی بەنی ئیسرائیلی نازل نەدەبوو. مع أنە ئەوان داخلی خیر القرون بوون.

بەسیە دڵ موتەئەثیر ئەبی، ئەکەویتە یەئس، ئەو یەئسـە ڕاحەتـی نیـیە، دڵ و جگەر ئەسووتێنێ.

١٨١/٩

## با من بۆ عەرەب و تۆ بۆ یۆنان بگریەین، ئەدی کورد؟

حەقیقەتەن زۆر غەریبە ئوممەتێ ئەم قورئانەی هەبـێ ئەوهـای بەسـەر بێ. من ئەووەلەن بۆ عەرەب، ثانیەن بۆ یۆنان زۆر موتەئەسـیفم، سـەبەبی تەئەسسوفم بۆ عەرەب دیارە، بـۆ یۆنـان چـۆن بە مـوقتەزای بەشـەرییەت تەئەسسوف ئەخۆم. قەومێ حوکەمـا و دانشـمەندی وەکـی ئەفلاتـوون و ئەرستۆیان هەبـی. ئەمـڕۆ کائینـاتی عـیلم، موباهـات بە حوکەمـای یۆنـان ئەکـا، تەرکـی موتـابەعەی وان بکـات، دوای بطـروس و بـۆلس کەوی، حەز ئەکەی قیمەتی تەئەسسوفی مـن بزانـی؟ موتـاڵەعەی جمهـوورییەتی ئەفلاتوون و هاوڕێی ئەفلاتوون کە، ئەوجا من بۆ عەرەب و تۆ بۆ یۆنان بگریەین، ئەدی کورد؟ ئەوان خوا لە قیامەت ڕەحمیان پێ بکـا، دنیایـان چوو!

ئەو عالەمە تەدەبوور لە قورئان ناکا، لەبەرچی؟

ئەووەلەن مەیـل و میـزاج لێـك دوورن. دووەم ئیختیلافـی عولەمـای تەرکیب و موخاصەمەی ڕوئەسای عەقائیـد و شـەڕ و حەڕبـی فوقەهـای مەزاهیب، ئیزتیرابی ئەحادیث، مـوزەخفەراتی نوقـال و حیکایەتخوانـان، هەر یەك نەوعە قوفلەکە، دەرکەی فەهم ئەبەستێ.

١٨٢/٩

## ئەگەر کەسێ قەدحێ لە ئایاتی قورئان یا لە حەدیسێ بدا، عەرەبەکان ئەیلێنێ: فەیلەسووف!

ئەقفالی زەمانی ڕیسالەت، کیبر و حەسەد و تەمەع و لاپەیدی و تەمەککونی مەیلی فاسید بوو، دەوری دوایە کللك زۆرە، مەیلی طەریق لە هەمووی خراپتر بوو، ئەربابی وەجد و ذەوق بە شیعر و دیلانان وەجد و خالیان وەك ئاگر و ئاو کەوتنە مەحوو بە قورئان، بە قورئان گوێیان لێ بی، سەریان ئەستوور ئەبی، (دف الزجاج وراقت الخمر) هاهوو، ماهوو! أنا من أهوی؟ ومن اهوی أنا؟ تەئەسسوف هۆڕەیان نانووسرێتەوە، ئەبێ گوێت لێ بی. ئیشتیغال بە زات بکە، لە سیفەت گەڕێ، ئێوە لە مرۆیان وەرئەگرن، ئێمە ڕەئسەن لە زیندی (حی قیوم) وەرئەگرین. حدثنی قلبی عن ربی، تەمام!

بەشەریش لە خوای دەوێ بە ماددەیە خوایی، لە دینی خوای گەڕێ، کەسالەت و عەطالەت زۆر موقوین، قەومییەت بۆ غەیری عەرەب بووە قفلێ، بە جارێ بەستێ چاکە ئەوانەی ژێر دەستی ئەجانیین. مەیلی تەرجەمەی قورئانیان هەیە، بەڵکو شتەکی تێبگەن، بەو شەرتە باشیان بۆ تەرجەمە کەن، توخوا عالەمی ئیسلامییەت، تەماشای خۆتان و قورئان و ئاوروپایی و کوتوبی موقەددەسیان کەن، چ خورافاتی تەرویج ئەدەن، ئێوە دەست لە چ جەوهەرێ هەڵ ئەگرن؟ أسفا علی اسف، علاوة علی هذا. ئەگەر کەسێ قەدحێ لە ئایاتی قورئان یا لە حەدیسێ بدا، عەرەبەکان ئەیلێنێ: فەیلەسووف. گۆیا یا گۆستاف لۆبۆنی فرەنسەیە.

١٨٣/٩

## ڕیجالی سیاسی، تا ئیشی پێتە تەشیت بۆ ئەڕێسێ!

لە ئەمانی خەیاڵی درێژی داینێ، گوێ مەدەنێ، عومر ئەوەندەیە، بە خۆشی ڕایبوێرن، بە کەیفی خۆتان بکەن، مسوڵمانانیش هەڵ ئەخەڵەتێنێ، بە ئەمانی؛ خوا غەفوور و ڕەحیمە، پێغەمبەر خۆشەویستە، تکاکاری ئوممەتییە، وەلی خوای خۆی کەفیلە، نایەڵێ موریدی بچێتە نار... گەمە بە عالەم ئەکا، تەسویلات و تەسهیلاتی ئیبلیس خۆی نییە، کە تووشی صعوبات بووی، خەندینی پێت دێ، وەکی ڕیجالی سیاسی، تا ئیشی پێتە تەشیت بۆ ئەڕێسێ، هەزار وەعدەت پێ ئەدا، کە ئیشی نەما مەرحەباشت لێ ناکا. مەعازەڵڵا گەر ئیشت پێی بوو، تا مومکینی بێ، بۆت دروست ناکا.

١٨٤/٩

## شەخسێ دێتە ئێرە، لام وایە ئەحمەقە!

شێخ محەممەدی ڕەزایی وتی: ڕۆژێ بابم لە خدمەتی شێخ عەبدولڕەحمانی نەقیب دەبێ، شەخسێ ئەفغانی دێ، بۆ زیارەتی نەقیب، نەقیب لە پەنجەرەوە ئەیبینێ، ئەڵێ:

شێخ ڕەزا ئەوا شەخسێ دێتە ئێرە، لام وایە ئەحمەقە.

یەعنی لە سیمای ئەزانی، دێتە ژوور، بەعدەهو تەڵەبی ئیحسانێ ئەکا لە نەقیب، نەقیب ئەڵێ:

- ئەوە چ ئەڵێ؟

-قوربان عەرز ئەکا شتەکی پێ ئیحسان کەی!

ئەڵێ: قوربان حەقیقەتەن فەراسەتی حەزرەتی نەقیب مەعلووم بوو، ئومێدی ئیحسانی بە جەنابتان هەیە!

بە کابرا ئەڵێ: بڕۆ ماڵ خراپ، ئەمن چەند ساڵە، ملازمی خدمەتم، بە پەشیزێ نائیل نەبوویم، تۆ چی؟

١٨٧/٩

## بە دوای ڕەسوولی سەلام مەکەون هەمووی درۆیە، سیاسەتە!

لە خەوف و جەبالەتەوە وەکی سیاسییە حەیالەکان مەبن، دەعوەتی *الی السلم* ئەکەن، وعلی الدوام ئاگری فیتنە ئایسێنن. ئەی مسولْمانینە بەو دەعوەت و تەرەف داریـیە هەڵمەخەڵەتێن، مەقسەدیان وەهنـی ئێوەیە، عەزم و جەزم و سەبرو ثەباتتان نەمێنێ، خەریکی ئەسبابی حەڕب نەبن، ئەوجا بە کەیفی خۆیان بێ هەراس بتانخۆن، بە دوای ڕەسوولی سەلام مەکەون هەمووی درۆیە، سیاسەتە، سەلامی چی؟

بەها ئەفەندی (لا بها ولا نعمة) بە ڕیسالەتی سەلام هات، چی کرد؟ لە ئەسەری سەییئاتی نحوسەت پەناهی شەرق و غەرب کەوتە نائیری حەڕب، حەڕبێ وا، کە تاریخ پێش ئەم ڕەسوولی ئەم بەنی سەلامە، سەلامەت نەبی، نەیدیوە. باز حەڕب هەڵایسا خوا حافیز! دوای عیسا علیە السلام، سەولی سەلامی وا بە شەڕ و شۆڕ قەدەم نەحس نەهاتیە، وەك لە سایەی موجەددیدی ئەلفی ثانی، لیباسی مەنکووبی و مەغلووبی و خواریی بۆ ئیسلام نوێ بۆوە، لە ووتی درا. ئەلحەق موجەددید وا ئەبی، موجەددیدێ دی هاتبا، بە جارێ ئیسلامەتی لە کۆڵ ئەکردەوە. واقیعەن لازم بوو بۆ عالەمی ئیسلامی لە سەر هەر سەد ساڵە، موجەددیدێ، ئەمما بە گوێرەی زەمانە موجەددید نەیانبا، بۆ عالەمی خەیاڵ و قرونی قبل التاریخ، لاکین مع الاسف، ئەمەش نەبوو.

شێخێ ئادابی زیکر و فیکر دانێ، مەلایە دوو سێ تەئلیفی خیلافی بکات، موجەددیدن، یەکێ دوو سێ قسەی حوکەمایان بدزێ، یەکدوو تەعن لە دین دا، فەیلەسووفە، ڕەببی موبارەك نەبی، ئەو موجەددیدانە ئەو فەیلەسووفانە، قادیانی عیسا و موحەممەدی چی بۆ کردین؟ ئەوا خۆمان هاویشتیتە حوجرە، دەوڵەتی سەلام بزانین چۆنمان ئەخوا؟ گورگ ئەڵێ: ماڵی بابم مەڕ، دەخۆم دونگی تەڕ، خۆی ناکا لە لەوەڕ.

بەڵێ ئەو نەوعە موسالیمەی زۆر خۆش ئەوێ!

١٨٩/٩

## مسوڵمانان کەڵکی شەڕیان لەگەڵ ئەجانیب پێوە نەماوە!

بۆ حەڕب و سیلم ئەبێ بنۆڕنە قووەت و عەدوو و پەرێشانی خۆتـان. پێغەمـبەر لەگەڵ قـورەیش بـۆ مـوددەی دە سـاڵ هـودنەی کـرد، لەگەڵ دەوڵەتی بەریتانیا مەسەلا یا فڕەنسە یا ڕووسیا، سەدساڵیش کەمە. حەڕبی ئێستا قیاس لە حەڕبی سابیق ناکرێ، ئەسبابی دەوێ، مـاڵی دەوێ، ڕزقـی دەوێ، واسیتەی نەقلیەی ئەوێ، جیدد و جوهد و سەداقەتی ئەوێ، صەبر و ثەبات و تەحەممولی موشاققی لازمە.

ناشکوری نەبی، مسـوڵمانان کەڵکـی شـەڕیان لەگەڵ ئەجانیـب پێـوە نەمـاوە، مەگەر بە صـورەتی ئیسـتیخدام، وەکـی هنـدییان، لە معیەتـی لەشکری ئینگلیز هـاتنە سـەر دەوڵەتـی عوسـمانی ئەچـوون بـۆ زیـارەتی عەبـدولقادری گەیلانـی ئەیـانوت: سـلم، الـهە مـدو للـە، عەبـدولقادری گەیلانی تیك، یاسین والقرءان ئەلحەقم، هی تیك.

تەمام انا لله وانا الیە راجعون!

١٩٠/٩

## باپیرم حاشییەکی هەیە بە ڕیسالە حیسابە!

جەددی ئەعلام مەجدی جەلی کاك مەلا عەبدولرەحمان لەسـەر فـتح المکیة، حاشیەکی هەیە، بە ڕسالەیە حیسابە.

١٩٥/٩

## ئێلکی ڕووت و برسی و سەرمای بێ!

ئەمرۆ زۆر سەرمایە، ئێکی ڕووت و برسی و سەرمای بێ، ئەڵێ: ففی مثل هذا الیوم طابت جهنم، چوارشەمووی ئەووەلی پالۆزە.

٢٠١/٩

## بۆیە خوا دەستی لێ هەڵگرتین، موبالاتمان پێ ناکا!

ئیلاهی القوة القوة، قووەتێ جەدید بخەیتە ناو دڵی مسوڵمانان. هەر قەومێ دەستیان لەناو دەستی یەك بێ، ڕێك و لێك بن، دەستی خوای لەسەر دەستیانە، سەر ئەکەون، بن ناکەون، وەلەو موئمین نەبن! وەکی حوکەمای قەدیم ئەڵێن: تا مورەککەب لە وەحدەت نێزیکتر بێ، موناسەبەی لەگەڵ مەبادیئی عالیە زێتر ئەبێ، ئیفاضەی خەیراتی چاتر بەسەرا ئەکەن، بێ ئیمتیزاجی لە مەبدەئیان دوور ئەخاتەوە. ئەم فەرمایشە هەروەکوو ئەمرێ موحەققەق و ئیعتیقادییە، بۆ سیاسەت و تەدبیری قەوم و دەوڵەت زۆر باشە. مع الاسف ئەمڕۆ کوا ئەو ئیتیحاذ و ئیمتیزاجە لە بەینی ئەهلی قیبلە؟ حەتتا لە بەینی ئەهلی قەریة ئیتتیفاق نییە، بۆیە خوا دەستی لێ هەڵگرتین، موبالاتمان پێ ناکا.

٢٠٣/٩

## نەمزانی عیزرائیل مەخجوولم ئەکا!

دوو زات دۆست بوون، یەکێ ناساغ بوو، ئەویدی ساغ، ڕێك نەکەوت بچتە لای، کابرا چابۆوە، گلەیی لە یاری بێ وەفای کرد:

بۆ نەهاتیە ئەحوال پرسینم؟

جەوابی دا: نەمزانی عیزرائیل مەخجوولم ئەکا،-یەعنی نامرێ- وەئیللا ئەهاتمە لات.

یەعنی تووشی ئەم مەخجوولییەتە نەدەبووم.

٢٠٦/٩

## لە کۆنە دارخورما دەرکان دروست ئەکەن، پێلەقەی پێدادەی پارچە پارچە ئەبێ!

یەکێ لە واعیزانی بەغدا ئەیفەرموو: من چوویمە خەیبەر، حالەن کە مەتانەتی قەلعە و ئەبوابی قەلعە، لە چ دەرەجەیە دایە، بابی خەیبەر چی وا نییە زیکر کرێ. وڵاتی عەرەبستانی حیجاز دەرکەی ئاسن و پۆڵای

نابێ، داری ساج و گوێزی لێ دروست ناکرێ، لە کۆنە دارخورما دەرکان دروست ئەکەن، پێلەقەی پێدادەی پارچە پارچە ئەبێ، ئەم موبالەغاتەی شیعانی چی پێ ئەوێ؟ لام وەیە ئەویش بەلای نوقصان موبالەغەی فەرمووە. ڕەحمەتی لێ بێ شیعە ئەڵێی: کە حەزرەتی ئەمیر دەرکەی هەڵکەند، هەڵیدا بۆ ئاسمان، ڕۆیی، وەقت بوو بە عەرشی کەوی. خوا فەرمووی: یا جبریل بگەیە، وەئیللا عەرشی ئەخا.

یا ڕەخنەداری ئەکا تورەهات! بەڵێ هەر کەس بە یاری خۆی هەڵدەڵێ. لاکین واش نا، حەققەن هەردوولایان زۆر بە موبالەغەن.

٢٠٨/٩

## کورد بێ پیاون!

سەلیم بەگی مامی ئەحمەد پاشای بابان، لەگەڵ یارانی دوانزدە سوارەی مەریوان[1] کوان؟ مەرقەدیان لەکێندەرێیە؟ عەلامەتیان چییە؟ کێ ناویان ئێنێ؟

مع الاسف ئەو هەموو ئەعازیمەی کوردان گوم بوون، بێ سەر و شوون چوون، ناوناوی حەمەکزە، قالەقچۆلە و ئەولیایەکانی شێت و خۆنەشۆرە! خولاسە خەم و خەفەتی کوردان زۆرە، ئیصلاحیان وەختە بلێم موحالە.

ئەمڕۆ قەومی کورد لە هەموو عەسرێ بێ پیاوترن، ئەوە موسیبەتە، موسیبەتێ عەزیمە، عاقیبەتی وەخیمە.

٢١٨/٩

---

(١) دوازدە سوارەکان بریتی بوون لە جوامێر ئاغای ڕەنگینە، ئاغال ئاغای سیوەیلی و زەینەڵ بەگی مەسرەف و مەحموود بەگی قەدیمی باشچاوەش و داراغای میرەدێ و فەراموزی زەنگنە و سوارئاغای بلباس و مەمەند ئاغای میراودەلی و شاپوور ئاغای بەختیاری و زولاڵ ئاغای مەرگەیی و میران بەگی وەلەدبەگی چەلەبی قەدیمی هەمەوەند و سەلیم بەگ. ئەمانە هاریکاری پاشای بابانیان کرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی لەشکری ئێران. سەرچاوە: دوانزە سوارەی مەریوان، پیرەمێرد، چاپی سێیەم، ١٩٨٣.

## هەڵێ، خۆ بشارەوە، هەی هاوار ڕووس هات، چی بکەین چارەسەرە؟

گەلێ کەس لە وەقتی غیرەت دێتە جۆش، دەست بۆ ساحێبی خۆی درێژ ئەکا؛ قوربان فەرموو سەر لە ئۆغرتایە، ئەمە ڕوح لەسەر دەستە، ئەمە ماڵ لە پێناوە. ئەو حینی زۆر بە عەزم و جەزمە، لاکین لە هەنگامە وا نامێنێ، سستی تیا پەیا ئەبێ، ئەو قووەت و مەتانەت و نەشاطە، ئەگۆڕێ.
وەختێ لە کۆیە لەناو عەشیرەتی دزەیی، بەیتی ئەهناس و بەهناس[1] زۆر لەباودا بوو، مسوڵمانان کەوتبوونە غیرەت، خاسەتەن کە ناوی سەحابە ڕووتەی ئەهات، ئەیانوت:

## گیتم[2]! بەقوربانت بم! دەی بە سەدەقەت بم، لێی دە!

دەستیان ئەهاویشتە سەر خەنجەر، ئەیانهێنا و ئەیانبرد، لێویان ئەکرۆژت: ئاخ! بریا دەستەکی ئێمەش لەگەڵ با!
حەتتا کە ئیعلانی حەربی ئیتاڵیای کرا، حەربی تەرابلوس، زۆر کەس خۆیان قەید ئەکرد، وا لەزگ بوون، دوایە کە حەربی گەورە دامەزرا، غیرەتی چی؟ هەڵێ، خۆ بشارەوە، هەی هاوار ڕووس هات، چی بکەین چارەسەرە. وابزانین ئینگلیز لە ڕووس باشترە، با ڕوو بکەینە لای جنووب.

۲۱۹/۹

(١) بەیتی ئەهناس و بەهناس، کە بە بەیتی بەهنەساش ناسراوە، باس لە فەتحی شاری بەهنەسای میسر دەکات و لە کوردیدا بە شێوەی شیعر هۆنراوەتەوە و جاران لە مەجلیسەکاندا لە پاڵ بەیتی سیسەبان و فەتحی شام دەخوێنرانەوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: هێمن عومەر خۆشناو، بەهنەسا، بڵاوکراوەکانی دەستنووسخانەی زانکۆی سۆران، چاپخانەی ئا گرافیك، دیاربەکر ٢٠١٧،
(٢) وشەیەکی تورکییە، واتە: چووم.

## ئینگلیز دوشمنی غالب بە دۆستی مەغلوب نادا!

کە تورك قەتلوعامی ئەرمەنیانی کرد، ئەمەریقا ئیمدادی زۆری بۆ ناردن، لاکین وەقتێ نێزیك بوون تورك ڕوحی ئەرمەنیانی کێشابوو، ئەو سەرداری هاتبوو، بۆ ڕایسی، نووسی:

ئەرمەنی کەڵکیان پێوە نەماوە، بووینە هێسك!

ئەمری وەرگرت:

بگەڕێوە!

لە ئەواخیری عومری فەیسەڵی لە ئەرمەنیانیان دا، خەڵکی لە ترسان گۆیا ئینگلیز لەسەریان بەجوابە.

وتم: نا، مادام مەغلووب بوون، ئینگلیز دەستیان لێ هەڵئەگرێ، دوشمنی غالب بە دۆستی مەغلووب نادا، ئەبێتە دۆستی غالبی، وابوو.

٢٢١/٩

## وەفا بە عەهد بوویتە مایەی تێشکان!

مع الاسف وەفا بە عەهد ئەمڕۆ بوویتە مایەی تێشکان، سیاسیونی عەرب عەهدیان مەحوو کردەوە، لایان وایە، ئەبێ ڕەجولی سیاسی دین و وەفا بە عەهد و میثاق و نامووس و شەڕەف-لدی الایجاب- بخاتە بن پێی خۆی، تا بگاتە مەقسوود.

٢٢٦/٩

## شیعە تەرجیحی موشریکان ئەکەن بەسەر سوننیان!

رحماء بینهم عەکسی مسوڵمانی حازرە. سبحان اللە شیعە لایان موشریك نەجیسە، خۆیان لێ ئەپارێزان، حەتتا لیباسیان نابێ بە لیباسیان کەوی، لەگەڵ ئەوەشدا لە دۆستی و موهاوینەت تەرجیحی موشریکان ئەکەن بەسەر سوننیان، حیزەبخۆیی کە پێی ئەڵێن (تەقی)یە، لەگەڵ ئەم مەنقەبە جەلیلە کوو ڕێك ئەکەوێ؟

ئێستاش ئەگەر ئینتباهیان بێ، لا اله الا اللە محمد رسول اللە لە

موخالەفاتی ئەشخاس دەست هەڵگرن، ئەکەونەوە ئەو مەقامە، چیتر تەشی لەبەر ئەجانیب نارێسن، لاکین وەکی حاجی قادر ئەڵێ:

لەبەر حیزە بخۆیی و ناتەبایی
لەژێر حیزی حیزان بووینە دۆشەگ[1]

خۆزی بەسەرامە داست چ کلکە کوتەیی بۆ ئەجنەبی ئەکات، وە موقابیلی مسوڵمانێ وەکی من، چ عەزەمەت و بێ موبالاتییە ئەنوێنێ. یەکایەتی و مەرحەمەت و لوتف و موراعاتی صەغیر و حورمەتی کەبیر، ئی ئیسلامی عاممە، بۆ هەموو عونصور و فیرەقی ئیسلامییە، سوننی، شیعی، سەلەفی، خەلەفی، اصحاب العدل والتوحید، ئەوەی ئیددیعا ئەکا فیرقەی ناجیە ئێمەین، بنۆڕنە ویجدانی خۆیان، دەربارەی ئەهلی قیبلە، ئەهلی لا اله الا اللـه محمد رسول اللـه لە ئەم ئایەتە (رحماء بينهم) تەماشای ڕەوشتی رسول الله و یارانی کەن لەگەڵ ڕەوشتیان موافەقەی هەیە؟

حاشا هەمووی لەگەڵ یەك دوژمن، تەکفیری یەك، لەعن لەیەك ئەکەن، خاسەتەن مەلایەکان، ئەوەندە قسەی ناشیرین لە حەق یەك ئەڵێن، بەناوی خوا و حیفزی دین، منداڵێ نەوعەن ما حوسنی تەربییەی هەبێ، لەو قسانە مەخجوول ئەبێ. موقابیلی دوشمنی دین و دنیای ئێمە چ لازم ئەکا بیکەین، وە بەچی ئیشتیغال ئەکەین؟ تا عولەما و ڕوئەسا وابن، ئیسلاحی ئوممەت نابێ، غەیرە مومکینە ئەو تەفرەقە کافی نەبوو، تەفرەقەی قەومییەتی عەلاوە بوو، ئەمەندەش کیفایەتی نەکرد، نەعرەتەی ڕیسالەت، لای بهاء الله بۆ سیلم و ئیتیفاقی بەشەر چ فائیدەی بوو؟

لە بیدئی ڕیسالەتی مەنحوساتی، تا ئەمڕۆ، شەڕ و شۆڕ و فەساد و فیسق و فجور و خوا نەشناسی، ئانەن ئانەن لە زێدەیی دایە، دەوری وا بە

---

[1] ئەم دێرە لە دیوانی حاجی قادر بەم شێوەیە هاتووە:
لەبەر حیزە بخۆیی و ناتەبایی
لە ژێری حیزی حیزان بووینە دۆشەك/ دیوانی حاجی قادری کۆیی، لاپەڕە٧٨

شەقاوەت، لە ئەدواری مەنحووسی گەردوون، نەبووە! مەسیح چی کرد؟ چ ویفاقێکی خستە ناو دینی محمد و مەسیح؟

ئەی سەوادی ئەعزەم لە بەشەر، من هیچ نیم، فەریادم ناگاتە گوێی ئێوە، با وجودی لەمێژە، هاوار ئەکەم، ئەی بەنی ئادەم خوا ئەیزانێ، نە ڕوئەسای دین، نە ڕوئەسای دنیا، نە دیموقراتی، نە ئوستوقراتی نە دیکتاتۆری، نە شیوعی نە نازی، هیچ کەس، بۆ سەلاحی حالی ئێوە سەعی ناکا، هەر کەس بە ناوێ هەڵخەڵەتێنە، دوای مەقسەدی خۆی ئەکەوی. کەسێ موتاڵەعەی جمهورییەتی ئەفلاتوون بکا، زۆر موستەفید ئەبێ، دائیر بە ئەنواعی حکومەت تەعەججوب ئەکا لە ئەفلاتوون، وە ئەڵێ: زاتێ حەکیم و دانیشمەند، لە نیهایەتی دیقەت و تەئەممول، لە ئەحوالی دوەل و مەزاهیبی سیاسی، ئێستا فکرییە، مەساوی و مەحاسینی دوەل و ئەفرادی لە غایەت نەزاهەت هینایتە قەلەم. خۆزی ئەو مسوڵمان با، تەفسیری لە قورئان کردبا، ئەو مەنقەبە جەلیلەی ئایەتی کەریمە، شیددەتی موقابیلی دوژمن، دیققەت و ڕەئفەتی دەربارەی یەك، خصوص بۆ یۆنانییانی ئەکردە دەستوور، جەنابی حەق بۆ موئمین، لە هەر عونصرێ بی، تەنیا بۆ عەرەبی دانەناوە.

تەئەسسوف بۆ یۆنانی یان جمهورییەتی ئەفلاتوونیان دا بە ئینجیلی بۆلص، تەئەسسوف بۆ مسوڵمانان ڕوویان لە هیدایەتی قورئان وەرگێڕا، بە خورافاتیان گۆڕییەوە، نازانم بڵێم چی؟ حەسرەت زۆرە، دڵ لە یادی تەنگ ئەبێ، قەلەم نازانێ چ بنووسێ؟

٢٣٠/٩

## نوێژ بوو بە عادەت!

نوێژ بوو بە عادەت، عیبادەتێ بێ ڕووح، تەراویح ئەکەن، انا اعطینا و اخلاص موکەڕەڕ ئەکەن، تا خەلاس ئەبێ. کاکەفەندی نەوە و هەم ئیسمی چونکە ناوی ئەبوبەکر بووە. حاجی بەکراغا ئەیوت: ئەگەر ئەو دوو سوورەتە نەبا، ئیمامانی ئێمە چییان ئەکرد؟ ئێستا لە وڵاتان مەیلی گەوران بۆ نوێژ نەماوە، لەتیفەیە هەیە موناسەبەی لەگەڵ جومعە هەیە، ئەمما نەك لەفکرم چێ، تەئخیری ناکەم:

چەند عەسرێکە لە غەیری کۆیە، لە هەموو مەنابیری ئیسلامییە، کۆنە

خوتبان ئەخوننەوە، ئی زەمانی ئیبن نەباتە[1] و قازی زەکەریا[2]. ئەمما ئی کۆیە لە زەمانی بابم و خۆم خوتبەی نوێ، ئی خۆمان ئەخوونینەوە. یەك دوو ساڵ پێش ئەمڕۆ، لە تەرەف مودیری ئەوقاف ئەمر درا مەلایان لە دائیرە کۆبینەوە بچنە خدمەتی، چۆن فەرمووی:

رجا ئەکەین، لەمەودوا خوتبەی جەدید موافیقی عەسر بخوننەوە، ئەم خوتبە کۆنانە کەڵکی ئەوڕۆ ناگرن.

-بەڵێ بەسەرچاو!

ئەنجومەنێ تەشکیل ئەکەین، خوتبەی موافیقی مەتلووب تەرتیب دەن، لە تەرەف حکومەت تەصدیق کرێ، ئەمر بدرێ بە تیلاوەت یان پەکێ ئەعل.

مەلایە ئەڵێ: توخوا ئیزنم دەن قسەیە بکەم!

فەرمووی: بلێ!

ئەڵێ: ایها المدیر، ئەمڕۆ ئەوەی دێتە نوێژی جومعە شەل و کۆر و سەقەتە، حەممال و چەقاڵ و بەققال و تەقاویتەکان دێنە جومعە. بۆ ئەم گوڕانە، ئەو کۆنە خوتبانە شایانە. هەر وەختێ وزەرا و حوججاب و نوواب و کیباری دەوڵەت و میللەت هاتنە جومعە، خەتیب بە تەبیعەت خۆی خوتبە ئەگۆڕێ.

## قسەیە مەعقوول، لاکین بیستم تەحقیریان کرد.

ڕوئەسای ئوممەتی ئیسلام زۆریان حوررییەت دا بە قەوم، ئەمما بۆ

---

(١) ئیبن نەباتە (١٢٨٧-١٣٦٦ز) ناوی محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی کوڕی محەممەد کوڕی حەسەنی فارقی میصرییە، شاعیر و نووسەر و ئەدیب بووە. لە قاهیرە لەدایك بووە و هەر لەوێش مردووە. دیوانێکی گەورەی شیعری هەیە لەگەڵ چەند کتێبێکی دی.

(٢) قازی زەکەریا ئەلئەنصاری (١٤٢٠-١٥٢٢ز) قازی و شەرعزان و ڕاڤەکەری قورئان و فەرموودەزان بووە. لە میصر لەدایك بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.. بەرهەمی زۆری لەپاش بەجێماوە و کە زیاتر لە پەنجا بەرهەمە، وێڕای ئەوەی لە زۆربەی زۆری زانستەکانیش دەستێکی باڵای هەبووە.

دین زەرەر بوو، علی الاكثر لا قیدی مسولمانان نویژ ناکەن، ڕۆژی ناگرن، سەییئات حیسابی نییە، کەس لێی ناتۆڕێتەوە، نە بە دیانی نە بە جوولەکەیی، نە بە بوتپەرستی، ئەمەی بۆ ناچێتە سەر، گۆیا لە نەشئەی حاضیرە ئەڵێن: ئەغلەبی ئەوانەی نویژ ئەکەن، ناساغن، دڵیان پاك نییە، ئەننەهو ئەمانە نویژ ناکەن و دڵیان خاوێنە، لەگەڵ عیبادی خوا.

حاشا نازانم، ئینسان تەبعەن حەزی لە عیبادەتە، بۆ عیبادەتی خوای لا ناخۆشە؟ گاپەرەست بۆ تەحەممول ئەکا ڕیخی گا تەبەڕوکەن بە نێوچەوانیدا بدا؟ بۆ بۆ خوای خالیق گا و ماسی، سەر ناخاتە سەجدە؟ موئمینی موەحید بۆ تەحاشی ئەکا؟ گۆیا کەللەی پڕە مەعاریف؟ حاشا مەغزی وەکی ناوکە کودووە. ئەگەر دەماغی پڕ با، بۆ خالیقی دەماغ ئەینایە سەر خاك. بۆ بە گەرما ئەچێتە هەرمۆتە بۆ خواردنەوە، ئەم ئەسارەتە قبووڵ ئەکا؟ بۆ بە حوڕڕییەت دوو شەقاو ناوێ بۆ مزگەوتێ بۆ جومعە، دوو ڕکاعەت نویژ بکا؟ حاسلی لە هەموو خصوصێ مسولمان تێك چوون. بۆ ئیتای مەعاریفی ئیتاڵیا لەسەر ئەمری مۆسۆلینی ڕکوع بۆ صورەتی مەریەم ئەبەن؟ بۆ ئەوانی ئێمە ڕکوع بۆ خوا نابەن؟ بەڵێ خسر الدنیا والاخرة.

٢٣٣/٩

## بە ئیعتیماد سوننی بە عەمەل موعتەزیلی!

ئەی برادەر تۆ بە ئیعتیماد سوننی بە، ئەمما بە عەمەل موعتەزیلی، تەعەصوب مەکە، لە هەر مەلایە لە هەر حەکیمێ، لە هەر وەلییە، قسەیە مەعقوولت دی، قەبوولی کە. یەکتر بە ناوی دین مەبوعزێنن.

٢٤٧/٩

## لە بنی زوبانیان ئەزاندرێ مەسدەری ئەو نەرمییە، حیزییە، موخەننەثییە!

گەلێ کەس هەن قسە نەرم، بە کزەڵۆکەیی ئەدوێن، ئەمما ڕیایە، هەڵخەڵەتاندنە، ئی ئەو بوزرگانە، ئەدەبە ئیخلاسە تەوقیر و تەعزیمە،

ئیستیلای هەیبەتە. ئەوانەی بە موونافیقی بە سەبر و نەرم ئەدوێن، لە هەناسە هەڵکێشان و داکێشانیان، چاو هەڵبڕین و داخستنیان، وەکی کوردی ئەڵێ: لە بنی زوبانیان ئەزاندرێ مەسدەری ئەو نەرمییە، حیزییە، موخەننەثییە. لاکین شێری مەیدانی خودا، خنوثەت و ئونوثەتیان لا نییە.

٢٤٨/٩

## دوو فەقێ منیان دیت لەرزین!

دەفعەیە ئەچوومە سەرا، دوو فەقێ لە دوور منیان دیت، لەرزین، بە کەمالی خشوع ڕاوەستان. لەو وەقتەدا کرمانجێ بە تەکما تێپەڕی، شانەکی لە شانم دا، لاقەیدی ڕۆیی، ئینسانێ مێزەر سپی ئەڕوا، چووزانێ چییە؟

ئەهلی بەدو لە هەموو عونسورێ عەرەب و غەیرە عەرەب، لەو خصوصیاتە بێ موبالاتن، حوسنی ئادابیان کەمە، دێنە ناو پیاوان، عادەتەن وەکی لەناو گاڕانێ قسان بکەن دەقیڕێنن، دەشیرپێنن، قیمەتی ڕیجال نازانن، هەیبەت ئیستیلایان ناکا.

٢٤٩/٩

## ژنە ئەوروپایی ژن ڕەزالەت ئەکەن بۆ دونیا!

خۆتان یەکتر کەم مەکەن، نەفسی خۆتان و شەرەفی ئینسانییەتی خۆی، موحافەزە بکا، (لا ینبغی للمؤمن ان یذل نفسه) بە ئەخلاقی فاسیدە، بە ئوموری دەنییە، خۆ سەقەت مەکەن بە فەساد مەبەن، ئایەتێ (وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ..) ئایەتێ قیمەتدارە. ئەووەلەن لازمە ئینسان حورمەتی خۆی بگری، خۆی بێ شەرەف نەکا، ئەبینی بۆ دونیای دەنی، ئەبێتە چاوەش و زوڕناژەنگێو، دۆڵ لێدەر، شەکەرە ڕەقس و سەما ئەکا، ژنە ئەوروپایی ژن ڕەزالەت ئەکەن بۆ دونیا، چەند بێ قیمەت بوون، سیاسەت و حوببی دونیا و پارەکۆکردنەوە، بەشەرییەتی عەیبدار کرد، خستیە دەرکی ئەسفەل.

ئەفلاتوون ئەڵێ: نابێ حوککامی ئێمە تەمثیلی موستەکرەهـ بکەن، کەسێ تەمثیلی شتەکی کرد، نەفسی پێی موکەییەف ئەبێ، ئاخیری تەمەثول بە قەبیح ئەکا وەکی بەعزێ حوکەما ئەفەرموێ: بنۆڕە خۆت، ئەگەر جوانی، بە ئەخلاق و ئەعمالی چاکە خۆت جوانتر کە، ئەگەر ناشیرینی بە ئەخلاق و ئەعمالی ناشیرین، خۆت ناشیرینتر مەکە. حەقـقەن ئینسانی مەعیوب و ناشیرین، بە ئەعمالی چاکە بێ عەیب و جوان ئەبێ.
٢٦١/٩

## ئەلقابی کۆییان!

ئەلقابی ناشیرین بۆ یەك مەهاوێن، سبحان الله لە ئەلقابی کۆییان، زۆر چرووکە، گەلێ جێی تریش وان؛ (قوون بەگوو، قوون بە تۆز، مچەپالاغ، قوون برسی) ئیتر وا...! ئەمما ئێستا چاترە لە سایەی مەکتەب ئەلقاب جوان بووین، لاکین ئەویش لە ئەکثەری ناس خەسارە، لەقەبی گەورە و بێ جێ، باغچەوان شەمسەددین، جووتیار و سەپان نەجمەددین و صەدرەدین، کرێکاری قوڕێ محیەدین.

لە ئیبن عابدینم دیتیە، ئیمامی نەوەوی، پێی ناخۆش بووە پێی بڵێن محی الدین. زاتێ وا خۆی لایەقی ئەو لەقەبە نەزانی، قەبر هەڵقەنێ، دەباغچییە، کوو بە محی الدین مولەققەب ئەبێ؟ بنۆرە جمال و جەلال و جەمیل و کەمال، جەمال و کەمالت لەبەرچاو ئەکەوێ. خۆزیا لە بەینی مسوڵمانان هەر شتە، حەددی خۆی موحافەزە کرابا، خۆ بێیە سەر ئەلقابی ئەولیایەکانی نوێ و ڕۆیوی: قوتبی عالەم، غوث الثقلین، نوورانی و صەمەدانی، نازانم بڵێم چی؟ بۆ مەلایان بحر العلوم، آیة الله، حجة الله، ئەو ئەلقابانە لە ئەعالییان ستاندراینەوە بۆ ئەدنایان.

عولەمای شیعان لەقەبیان زۆر زلە، مەلای سوننی هیچ ئەلقابی مولکداری-ئەلثانیش- لە ئێران حوکم فەرمایە، لە موقەددیمەی ئیبن خەلدوون ڕوباعیەکەم لەبەرە، موحایزی هەندێ بێ: من أرض اندلس

اسماء معتضد فیها ومعتمد اسماء مملکته من غیر سلطنة، کالهر یحکی انتفاخا صورة الاسد[1]. بەڵێ پشیلە خۆی گف ئەکاتەوە، ئەنەهەو شێرن، نیشان ئەدا، لە هەموو سیفەتیم لا ناخۆشتر بە حجر الاسود ئەڵێن ید اللـه، یا یمین الله. سبحان الله بە خالید بن وەلید بڵێن سیف الله علی الرأس، ئەمما حجر الاسود بۆ یمین الله؟ سی ساڵ لە مەذبەلەی کوفە کەوت، باز هەر یمین الله یە؟ العیاذ بالله بە شێتەکانی خۆت ئەیزانی ئەڵێن: اولیاء اللـه، زۆرم لا گرانە، چ موناسیبە؟ موحەقەق بزانە قەدری خوات لا چەندە، بەو نسبەتە لای خوا بەقەدرین، خوامان لا بێ قەدرە، بۆیە لای خوا بێ قەدرین.

٢٦٢/٩

## حەماغای کۆیە

ڕەحمەتی لێ بێ حەماغا عەجایب بوو، لەگەڵ پشمین، بۆ سەفەرێ حازر ئەبوو، بەڕاستی یا بەقەستی، یەکێ یەکجار بپشمیبا، ئەیگوت: سەبری هینا، ئەمڕۆ ناڕۆین.

٢٦٤/٩

## جاسووسی!

لە زەمانی سوڵتان عەبدولحەمید خانی، وای لێ هاتبوو ژن و مێرد لێك ئەمین نەبوون. گەلێ ژن جاسووسی سەر مێردی خۆیان بوون. ئەوجا تەماشای ئەم حەیاتە کە! ... ئەورووپایی بۆ تەجەسسوس لە زەمانی حەرب، حەشریان کرد، ئەوان ئافرەتیان ئەهەناردن، ئافرەتی وا کە بە

---

(١) ئەم شیعرە بە ناتەواوی لە تەفسیرەکەدا نووسراوەتەوە. ڕاستییەکەی هی ئیبن ئەبی شەرەفی شاعیری ئەندەلوسییە و دەڵێ:

ومما یزهدني في أرض أندلس — أسماء معتمد فیها و معتضد
أسماء مملکة في غیر موضعها — کالهر یحکي انتفاخًا صولة الأسد

حوسنی مەککاری غەلەبەی بە قوماندارانی ئەکرد. بەڵێ لە هەموو جیهەت ئەمڕۆ ئەوان پێشەوان، ئیش پێك دێنن.

٢٦٥/٩

## گرانی گەورە!

قەحط و غەلا شیددەت ئەکا، چ نابێ بیخۆن، حەتتا کەلاکە بارگیر و کەریش دەست ناکەوێ، مەعازەڵڵا برایە ئەمرێ، ئەویدی گۆشتی ئەخوا، چ خواردنەکە لە چ وەقتێ دایە؟ ئایا کەس ئەو حاڵەی پێ خۆشە؟ لە گرانی ١٣٣٦ ئەمە ڕووی دا. خوایە نەبێتەوە، بەشەر جارێتر ئەمە نەبینی.

٢٦٦/٩

## هەر تائیفەیە بە قەومییەتی خۆی ئەنازی، غەیری کوردی بەستەزبان!

ئینسان پاشی کەثرەت و تەشەکوللاتی عەشیرەت و لێك جودابوونەوەی تیرە تیرە عەداوەت و بوغزایان کەوتە بەین، ئەوە پیرانە، ئەمە مەنگوڕە، ئەوە مامەشە، ئەوە ئاکۆیە، ئەوە پشدەرییە، ئەمە بەردەری[1]، شەڕو شۆڕ و تاڵان و بڕۆ بوو.

سبحان الله حکومەت بۆ مەصالیح، تەقسیمی شارێ ئەکا بە گەڕەك، وەکی کۆیە: بایزاغا، قەڵات، بەفری قەندی، هەواو[2]، ئەمانە وێکڕا ئەبنە عەدوو، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ تەعاروفە... هەر شەعبێ هەر تیرەیە، وە هەر تائیفەیە بە قەومییەتی خۆی ئەنازی، غەیری کوردی بەستەزبان، پەیامبەرێکی نەبوو، تا بەندانی پێ هەڵا بڵێن. وابزانم لە هەموو کەس

---

(١) پیران، مەنگوڕ، مامەش، ئاکۆ، پشدەری، بەردەری، ناوی چەند هۆزێکی کوردن، تەنیا پشدەری و بەردەری دوو تیرەی هۆزی ئاکۆن.

(٢) بایزاغا، قەڵات، بەفری قەندی، هەواو، ناوی چەند گەڕەکێکی شاری کۆیەن.

زیاتر خۆی هەڵداتەوە بەنی ئیسرائیلین. وە ئینگلیزیش لەوان دانامێنی، ئەمما ئەمانە بۆفن.

٢٦٨/٩

## بە منداڵان ئەڵێن ئەسڵی ئینسان مەیموونە!

ئەمڕۆ لە مەداریسی ڕەسمییە بە منداڵان ئەڵێن: ئەساسی ئینسان لە مەیموونە، بەنی عەممن لەگەڵ شەمپانزی داروین. وە ئەڵێن: بە قاعیدەی نەشئ و ئیرتیقا تەرەقی کردیە، بوویتە ئینسان.

باشە با وابێ، ئەمما پێشیان بڵێن: مادەم تەبیعەت تەرەققی دایە ئەسڵی ئێمە، کردی بەو ئینسانە عاقل و عالم و مودەببیر و حەکیم و سیاسی و قائید و موختەریع و مودەووینی علوم و قەواعید و قەوانین و ئەخلاقی زەکییە، ئێوەش خەریك بن تەرەققی کەن مەگەڕێنەوە بۆ حەیوانی، بە بێ تەربییەی و بێ ئەخلاقی خۆتان.مەکەنەوە مەیموون. وە ئیللا ئەو نەوعە تەعلیمە بۆ ئینسان زۆر زەرەرە.

٢٧٠/٩

## بەناوی تەوازوع مەبنە ڕیاکار!

دەخیلەکەم بەناوی تەزکییەی نەفس خۆتان ڕەزیل و ڕیسوا نەکەن، دێن و دەچن، هەڵئەپەڕن، تڕان بەرئەدەن؛ گوۆیا داخیلی تەریقەت بوون، هەتکی نەفس ئەکەن. دەخیلەکەم بەناوی تەوازوع مەبنە ڕیاکار، ئاگاتان لەخۆ بێ، حەقائیقی جەوهەری عەقڵتان لێ نەگۆڕن، بە دیقەت بنۆڕن، حەییال زۆرن. یەکی وەك مۆسۆلینی، هیتلەر، ئەگەر کوڕڕەی ئەرز وەك فوتبۆل بخەنە بەر قەدەمیان، لام هیچ نین، مادام کڕنووش بۆ صورەتی مەریەمە ببەن. بۆ عیززەتی نەفس لام گاوانێ مسوڵمان لە ئیمپڕاتۆری مەسیحی باڵاترە، حەققی ڕەسوول، لە حەققی باب و داك زێترە ....

حەققی ئوستاد بە حەق زۆرە، لە جەهل بۆ عیلمت بێنێ، جێی تەشەککورە. ئەمما عیلمی نافیع مع تربیة. من ئەگەر چی زۆر بەتەربییەت

نیم، ئەمما لام وەیە قیمەتی ئینسان حوسنی تەربییە و عیززەتی نەفسە، چ مەلیك چ سەدری ئەعزەم، چ عەللامەی دەوران، چ قوتبی زەمان، ئەگەر حوسنی تەربییەی نەبێ، لام گشتی هیچە. خوا مننەت لەسەر ئێوەدا دەنێ، ئێوەش مع الممنونیەت قبوڵی ئەکەن.

٢٧٤/٩

## تەصریفمان بە کوردی وەها پێدەگوترا!

بە منداڵی تەصریفمان پێ ئەگوترا، بە کوردی لەبەر، ئەم شیعرەم لەیادە:

خەرفی عیللە یادکەردەم
ئەلف و واو و یایەرا
هەر کێرا دەردی ڕەسەد
ناچار گۆیەد ئای و ئۆو وایەرا

٢٨٧/٩

## بەڵایە عەزیم، مەسئەلەی بیدعەت و سوننەت!

سبحان اللە ئێمە گۆیا مسوڵمانین، بەعزێ ئیعتیقاد و ڕەوشتی ناصالحمان هەن، رأی العین فەساد ئەبینین، وازی لێ نایەنین، بەڵایە عەزیم، مەسئەلەی بیدعەت و سوننەت، بۆیە ئەوەی لە ئیسلامەتی دەرئەچێ، حەقائیق ئەبینی، وا ئەزانی ئیسلامەتی پەردەیە لەسەر چاو، مەنعی دیتن ئەکا. ئۆباڵ بە ملی ئەوانەی وایان لە میللەت کرد، نووری دینیان کردە مایەی نەدین.

٣٢٠/٩

## خودایە عیلمی ئالی جەلی نەبڕیەوە!

ئیلاهی! من عەبدێ هیچ و پووچ دەرچووم، نەگەیمە ئابا و ئەجدادی خۆم، من لە کوێ، مەلا عەبدولرەحمانی جەلی، عەبدوللا بن جەلی، محەمەد ئەسعەد جەلیزادە، حاجی مەلا عەبدوللای جەلیزادە، لە کوێ؟ خودایە بۆ خاتری رسول الله لەوانم دانەبڕی، بێ عەزاب لە دەرەجەیە زۆر عالی، من و برام و ئەولادمان لە خدمەتیان خڕبینەوە. وە چیدی لە دونیا عەزابم نەدەی، ئامالم پێك بێنی، وە عیلمی ئالی جەلی نەبڕیەوە، مەدرەسەیان الی الابد مەعموور بێ، خۆیان بە دەوڵەت و حورمەت و مەسروور بن.

٣٢٣/٩

## بەهاری زەمانی جاران!

ساڵێ زوو بەهار بوو، چووینە سەحرا، پڵاومان لێ نا، کە تێکرا، وە جووت بە جووت دامەزران، بەعزێ لە یاران ئەچوونە سەر جەماتێ، لەپیان لە لەنگەری دادەگرت، ئەیانفڕاند، هەڵئەهاتن، بە دوای ئەکەوتن، ها لەوێ، ها لەوێ. جار جار لە ڕاکردندا قەپاری لە شیوەکە ئەدا، مرە مڕی ئەکرد، ئەیخوارد، ئاخیرەن ئەیانگرت ئەم لوقمە ئەو لوقمە، ئەم پاروو ئەو پاروولەی لێیان ئەساندەوە، بە کەمالی سروور و خەندە، ئەیانهاویشتە ناو زار. ئەلئانیش خەیاڵی ئەکەم، سروورم بە دڵی ئەگات.

٣٢٤/٩

## جوولەکەی کۆیێ!

ئەغلەبی جوولەکەی وڵاتی مە، لە جێژنی بەهارانیان دا، لە سەحرا ئەخۆنەوە، سەرخۆش ئەبن، لێك ئەدەن، سەر و پۆپەلاکی یەك ئەشکێنن. بەعدەهو بە سەد تەقەتەق و تەقەڵا، تا لە دەستی عەدالەت قورتار ئەبن.

٣٢٤/٩

## شاعیران!

سەبەب بە بێ ئەخلاقی شاعیران شیعر مەذموم بووە، زاتەن لە فەلسەفەی حوکەمایان دەرئەکەوێ شیعر بۆ گۆڕاندنی ئەشیایە، ڕێ هەڵخەڵەتاندنە، جوان ناشیرین ئەکا، ناشیرین جوان ئەکا، وەزیفەی تەزییناتی ئیبلیسانەیە. وە ئیللا ئەسڵی شاعیری باشە، خصوص شاعیری حەکیم، شاعیری میللی، وەکی شێخی سەعدی، حاجی قادری کۆیی، زۆر باشن. ئەمما شاعیری و ڕیسالەت نابن بە یەك، وەزیفەی ڕەسوولی ئیرشاد و ئیزهاری حەققە، بە حەققە، بێ تەدلیس و تەلبیس.

حاجی دەڵێ:

ئەمین مەبە لە سبەینێ، ئەمەت بەسەر دێنێ
حەوادیثاتی زەمانە، کە نایەتە تەحمینێ

ئەم بەیتەی زۆر غەریبە:

ئەم ئەرزە کۆنە هەوارە، خەلایقیش کۆچە
تەماعی سووری نەبێ کەس لەژوور چادری

٣٢٦/٩

قەسیدەیە مەعەرری هەیە زۆر غەریبە!

قەسیدەیە مەعەرری هەیە زۆر غەریبە، مولائیمی ئەحوالاتی ئەعصار و ئەدوارە، (ألا في سبيل المجد..) [1] شایانی لەبەرکردنە، بەڵێ سەهی بە شەمس ئەڵێ نوورت کەمە، شەو بە ڕۆژ ئەڵێ ڕەنگت موکەددەرە! وهكذا.

حافز ئەڵێ:

---

(١) سەرتاکەی ئەم شیعرەی مەعەری ئاوا دەست پێدەکات و ٣٢ بەیتە:

ألا في سبيل المجد ما انا فاعل    عفاف وإقدام وحزم ونائل
أعندي وقد مارست كل خفيّة    يصدّق واش أو يخيب سائل ؟
أقل صدودي أني لك مبغض    وأيسر هجري أني عنك راحل
إذا هبت النكباء بيني وبينكم    فأهون شئ ماتقول العواذل

جای انه است کی خون موج زند در دلی لعل
زیــن تغـابن کــی خــزف میشــکند بــازارش[1]

## درۆی وا ئەکەم خۆم ئەکەومە شوبهە!

شێخ محەمەد ڕەئووفی کوڕی شێخ عەلی ئەفەندی تاڵەبانی ڕەحمەتی خوایـان لـێ بـێ، ئەیـوت: بەخـوا مـن درۆ ئەکەم وای دەڕازێـنمەوە و مودەللـەلی ئەکەم، خۆم ئەکەومە شوبهە، ئەڵێم: ئەمە ڕاستە؟!

٣٤٠/٩

## مەسەلەی نێر و مێ دونیای تێکداوە!

نازانم مەسـئەلەی تـەذکیر و تەئنیـث چییە؟ عـالەمی تێکـداوە، حەتتـا لۆغەتی موشەووەش کردیە. حەتتا لە ئەوائیلی ئیسلامیشدا، ناوی ژنـان لە پیاوان ئەندرا، خەدیجە، ساریە، عائیشە، هند... ئەمە ئیحتیـاجی بە تەفریـق ئەکرد، ***جاء هند*** بۆ نێر، ***جاءت هند*** بۆ مێ، تەوسیعی کرد، بۆ لەفز، لەفزی شمس موئەننەثە وە قمر موزەککەرە.

ئەساســەن نــاوی ژن و پیــاو بە تەواوی تەفریــق کرابــا، لام وەیە، وانەدەبوو، ئەسڵی کوردی ناوی ژن و پیاوانی جـودا بـوو، بە ئیختیلافـی لۆغەت تێك چوو، بەهـجەت و نیعمەت و شـەوکەت و جەودەتیـان تیـا

---

(١) ئەم غەزەلی حافز نۆ بەیتە و ئاوا دەست پێ دەکا:

فکر بلبل همه آن اسـت کـه گـل شـد یـارش
گل در اندیشه که چون عشوه کند در کارش
دلربـایی همــه آن نیســت کـه عاشـق بکشـند
خواجه آن اسـت کـه باشـد غـم خـدمتگارش
جای آن است که خون موج زند در دل لعل
زیــن تغــابن کــه خــزف میشـکند بــازارش
بلبل از فیض گل آموخت سـخن ور نـه نبـود
ایــن همــه قــول و غــزل تعبیــه در منقــارش

پەیا بوو. لاکین گوێ نادەنە ضەمیر و صیفەت، بۆ موئەننەث و موزەککەر یەکن. *مام ئالی هات، ئەستی هات، برزۆ نێزیکە، ساری نێزیکە!* بەڵێ بە شتی ڕەق ئەڵێن: نێر، بە ئی نەرم ئەڵێن: مێ. حەتتا لە بەردان، بە صەلابەت و ڕەخاوەت فەرقی نێر و مێ ئەکەن. ئافەرین لە کۆنە کوردان، پەری موقابیلی دێو و درنج ئیستیعمال ئەکەن، وا دەرئەکەوێ موردایان مەلائیکەیە، ئەمما لایان وەکی بەشەر مونقەسیمن بە نێر و مێ.

لە حیکایەتان وا دەرئەکەوێ تەقەددوس لە نێری و مێیایەتی، وابزانم لایان خاصی کیبریائی بووە، وە نەمبیستووە عیبادەتی بوتانیان کردبێ، خاسەتەن مومەثیلی ژن، کە ئەورووپایی ئەیانکەنە تەمثیلی ڕەحمەت و حەق، ئەیانپەرستن.

٣٤١/٩

## گۆیا ڕوومان کردە ئاخیرەت، لە دونیا غافڵ بووین!

ئێمە کە مسوڵمانین، ئەبێ سەعی کەین، بۆ سەعادەتی هەردوو حەیات، دونیا و ئوخرا، لاکین تیای چووین، نەمانکرد. گۆیا ڕوومان کردە ئاخیرەت، لە دونیا غافڵ بووین، ئیعتیمادمان دا سەر ئەوهام و ظنون، ئەوانی غەیری حەیاتی دونیایان ناوێ، لە هەموو خصوصێ تێکۆشین، بە عیلم بە ئیختیراع، بە تەزامون، تەفەووقیان لەسەر ئێمە کرد، وەکی مامۆستای کۆرە ئەیفەرموو: بە عیززەتی تەرکی دونیامان کرد، بە زیللەت تەڵەبی ئەکەین.

دونیا لای ئێمە مەزرەعەی ئاخیرەت بوو، موحەققەق بێ دونیا حیفزی دین ناکرێ. عیلمی یەقینی، عیلمی بەکارە، (یجوز، یجوز) بەکارنایە، نەدەبا حەمەلەی قورئان دوای خەیالات و ظنون کەون.

٣٤٣/٩

## عولەمای حەنەفی لە بەحسی کوفرییات، دنیا ئەکەنە چەرمی چوێلەکە!

شێخی ئیبن حەجەر کتابێ لەتیفی هەیە: زواجر، شایانی موتاڵەعە و وەعزە، کتێبێکیشی هەیە (قواطع الاسلام)[1] غایەت باشە. بەعزێ لە عولەمایان ڕەحمەتیان لێ بێ، زۆر بە تضییقاتن، عولەمای حەنەفی لە بەحسی کوفرییات، دنیا ئەکەنە چەرمی چوێلەکە، نابێ بجوڵێیەوە گوناهە، نابێ قسە بکەی کوفرە، ئەمە کوو ئەبێ؟ دینی حنیفة السمحی وایە؟ حاشا، هەرچەند ئەوان تضییقات ئەکەن، ئیعتیماد بدە سەر خوا.

## کە ئەووەل نۆبەت بە تەیارە فڕی، لە خۆشییان گریا!

خەیام ئەڵێ:

یا ربی تو گلەم سروشتەیی من چ کونەم
وین پشم و قصب تو ڕوشتەیی من چ کنم
هر نیك و بدی کە از من ایە دبە وجود
تو بر سر من نوشتەیی من چ کنم[2]

ئەمە نەختێ تەجاوزە، ئینسان لە ئەووەلی فیترەتی وەکی هەیولایە، قابیلە لە گەڵێ قالبان دارژێ. بەڵێ بەعزێ مەیلی شەڕیان زێدەیە، بەعزێ مەیلی خەیر، ئەمما وا نییە، مائیلی شەڕ قابیلی ئیسلاح نەبێ. موسلیحەکان بە منداڵی ڕوو لە ئیسلاحن، ئەوی موختەریعە، بۆچی داندراوە ڕوو لەو

---

(١) کتێبی زواجر، مەبەست کتێبی (الزواجر عن اقتراف الکبائر) و کتێبی قواطع الاسلام یش مەبەست کتێبی الاعلام بقواطع الاسلام، هی ئیبن حەجەری هەیتەمی یە.
(٢) لە ڕاستیدا چوارینەکە ئاوایە:

ز اول تو گلم سرشتەئي من چکنم؟
وین پشم و قصب تو رشتەئي من چکنم؟
هر نیك و بدي کە از من آید بوجود
تو بر سر من نوشتەئي من چکنم ؟

ئەکا، ئەوەی ئیختیراعی ئوسطولی کرد، دائیم مولاحەزەی نەججاری ئەکرد. حەتتا صورەتیان کێشاوە لە موجەللان، لەگەڵ داك و بابی دانیشتییە، چای ئەخۆنەوە ئەو مولاحەزەی نەججاری سەماوەر ئەکا، ئی طەیارەی ئیختیراع کرد، دائیما ئەینۆڕیە تەیر و توار، مێش و پێشکە، دیققەتی ئەکرد، چۆن ئەفڕن، حەتتا باوکی خۆی لێ تووڕە ئەکرد، تەماتە بفڕی؟!

کە ئەووەل نۆبەت بە تەیارە فڕی، لە خۆشیان گریا. بنۆڕە سیەری ئەعزام لە منداڵی تا پێگەیشتن، ئەمە ئینکاری ناکرێ، ئەمما زۆری ساحێب مواهب خەسار ئەبن، وەکی هێلکە لەبن مریشکە کورکێ پیس ئەبن نابێتە فەرخە، ئەمەش خۆڕایی نییە، غایەت ئێمە عیلممان ناقیصە.

٣٤٦/٩

## نێزیکی وەفاتی، بانگی کردم، دەستیم نایە ناو دەست!

لە شێخ عەلی ئەفەندیم[١] بیست، فەرمووی: بابم، لە نەساغی پێ مردنی دائیمە ئەیفەرموو:

خوڕەم ئان زۆر کەرزین مەنزلی وێران گوزەرم

وە ئەشیفەرموو:

چە خۆشە هی باشد، کە بعد از انتظاری، بە اومیدی رسد اومیدواری.

نێزیکی وەفاتی، بانگی کردم، دەستیم نایە ناو دەست، هێزی نەمابوو، گریام. فەرمووی: مەگریە، بەعزە نەسیحەتی فەرموو. دوایە فەرمووی:

ڕۆڵە ئەمن نەمدەگوت: من نیم، ئەگەر هەبووم، بۆ وام بەسەرهات؟ ئەو قووەتە چی بەسەرهات؟ ئەگەر ئی من با، بۆ ئەفەوتا؟ ئاخیری فەرمووی: ئۆخەی مردن! ڕوحی موبارەکی دەرچوو! رحمة الله علیهم.

خەییام خۆش ئەڵێ:

---

(١) مەبەستی شێخ عەلی خالصی کوڕی شێخ عەبدولرەحمانی تاڵەبانییە.

تــا ضــن نبــری مــن از جهــان میترســم
واز مــردن و زوکنــدەنی جــان میترســم
چون مرگ حقیقت است زو باکم نیست
چــون نیــك لریســتم ازان میترســم[1]
حەقــقەن ژیــانی نــاخۆش، ناخۆشــە.

٣٥٥/٩

## با لالۆ هەر بڵێ: سەحەرە بێ قەرارە!

چەند ساڵ لەمەوپێش، کێ بڕوای ئەکرد ئینسان لەناو ئالەتی بچێ ناو بەحر و قەعری بەحر کەشف کا، وە فۆتۆغرافی وەرگرێ؟ کێ ئەهاتە خاطری، بە قووەی ڕادیۆ دیلانەی واشنتۆن لە کۆیە ببیەی؟ سەیدی ئالووسی بەحری عیلم، جامیعی مەعقوول و مەنقوول، لای وابووە مومکین نییە، بەشەر بفڕێ، تەیارە بکا چونکی ئەو نەوعە تەسخیرەیان بە موعجیزە ئەزانی. بەشەر فڕی، تێپەڕی ئەوا خەریکە بچێ بۆ قەمەر مومکینە شەققی قەمەر کا، لەوێش هەورازتر بڕوا.

دینی موبینی ئەحمەدی سەری گرت، قەراری بەست، لە مەشاریق و مەغاریب بڵاوبۆوە، دونیا بە نووری قورئان مونەووەر بوو، با لالۆ هەر بڵێ: سەحەرە بێ قەرارە.

سحابة صیف عن قریب تقشع[2]
له الحمد شمسی مونیر تتشعشع

ئەوساڵ هاوینێ شێخ محەمەد ڕەفعەت لە میصر سوورەی والنجمی

(١) لە ڕاستیدا چوارینەکە بەم شێوەیەیە:
تا ظن نبری کز آن جهان می‌ترسم
وز مردن و از کندن جان می‌ترسم
چون مرگ حقست من چرا ترسم ازو
من خویش پرستم و از آن می‌ترسم

(٢) دوای بەدواداچوونمان، دەرکەوت ئەم نیوە دێڕە هی ئیبن و نەباتەی میصرییە.

خوێند، وای چەند خۆش بوو ئێمە لە کۆیە ئەمانبیست. بەڵێ لاکین مع الاسف لەو قڕوونانە ئایەتی ئیلاهی هەر لەسەر دەستی تەبیعیونان دێ، موئمینی مووەحید هیچ، صفر الیدە، حەرامە، بیدعەتە، لە زەمانی پێغەمبەری نەبووە، ئەڵێن: عیلمێ شەیتانییە، گۆیا تەریقەتی شەدەڵە ڕەحمانییە؟ چی بکەم؟ دەستەڵاتم نییە شەویلاکیان لەبار یەك بێنمە دەر سواری کەریان بکەم لە وڵاتیان بکەمە دەر. ئایاتی ئیلاهییان کوو تێك دا؟

گەلێ ئەقوالی عولەمایەکانی پێشی کە ئینکار ئەکران، ئەمڕۆ تەقەڕوڕی بەستووە، وەکی جاذیبە، وەکی لەونییەتی ضەوء، وەکی دەورانی کەواکیب لەسەر مەداران بێ فەلەك، حەرەکەی ئەرز و تەرەککوبی ئاو. چەندێ لەمەوپێش کەسێ بیگوتبا: ئاو مورەککەبە لە دوو ماددە، یەکی موحریق، یەکی موحتەریق، شێتیان ئەکرد، بە قوو قوو و چەپڵە دوای ئەکەوتن، فیتوویان بۆ ڕادەهێشت، بە ملیۆن.

٣٥٩/٩

## چارشەمووی بە شووم ئەزانن!

ئەمڕۆ یەکشەمووی ئاخیری موحەڕەم ٢٦ی شوباتی ڕۆمی، ئەمساڵ کەبیسەیە، کە ئەووەڵی برد العجوزە، ئەمما شوکر خۆشە، ئەڵێن: ئیبتیدای لە ڕۆژی چارشەمووی بووە، وە چارشەمووی بە شووم ئەزانن. لەگەڵ ئەوەی لای ئەهلی عیلم وڵاتی ئێمە موبارەکە، تەڵەبە. ئەووەڵی کتێب لە ڕۆژی چارشەموو دەست پێ ئەکا، وە صەفەر بە نەحس ئەزانن، ئەمە بۆ عەرەبان قەی نییە، أشهر الحرم خەلاس ئەبوو، لە صەفەر ئاگری سەلب و نەهب و قەتل هەڵدەئایسا، ئەمما بۆ کورد بۆ؟

بێ لزومە کورد مانگی ناو جێژنان بۆ بووك تیاهێنان، بە شووم ئەزانن، ئەحوالی ئومەم لە تشأم عەجایبە. لە ئیمامی عەلی بە شیعر نەقل ئەکەن: شەموو بۆ ڕاو، یەك شەموو بۆ بیناء، دوو شەموو بۆ سەفەرباشە، خوون گرتن لە سێ شەموو خراپە، حەوائیج پێکهینان لە پێنج شەمووی،

تەزویج لە ڕۆژی جومعە[1]. بەڵام سەییدی ئالووسی ڕەحمەتی لێ بێ، ئەفەرمووێ: باوەڕ ناکەم گومان نابەم، صەحیح بێ، واقیعەن ئەمە لە إمام الموحدین دوورە. ڕۆژ ڕۆژی خوایە، ڕۆژ هەڵدێ و ئاوا ئەبێ، خەڵکی ناوی لێ ناین، خصوص سەعادەت و نحوسەتی کەواکیب زۆر بێ مەعنایە، ئەگەر نحوسەت هەبێ لە هەموو کائینات نەحستر، ئەرزی ئێمەیە. چ ئان ئان لە فیتنە و ئاشووب خاڵی نییە، بەڵێ سەعادەت و نحوسەتی بەشەر بۆ بەشەرە، بەشەر تریاکە، بەشەر زەهرە، دۆستی ئینسان، ئینسانە دوشمنی ئینسان، ئینسانە.

٣٦٤/٩

## لە وڵاتی مە چەند پیاوی گەورە هاتن، بێ ئەثەر ڕۆیشتن!

زۆر جار ئەڵێم: ئەوەی سولفاتووی ئیختیراع کرد، ئەگەر موئمین با، ڕۆژێ چەند هەزار خێری بۆ ئەچوو. حەتتا لە وڵاتی مە چەند پیاوی گەورە هاتن، بێ ئەثەر ڕۆیشتن، ناویان مەحوو بۆوە، کەس نایاناسێ، حاجی مەلا بەکر ئاغا، ئەو، ئەو مزگەوتەی دروست کرد ناوی ما، خێری نەبڕا. لاکین مع الاسف لەبەر بێ هیممەتی کوردان، تەئریخی ولادەتی مەعلووم نییە، خاڵوانی کێن؟ نایزانین، سیرەتی چ بوو؟ تەحریر نەکراوە.

٣٨٤/٩

(١) مەحویی شاعیر، ئەم گوتەیەی کردۆتە چوارینەیەك و دەڵێ:
شەمبە بۆ ڕاوە، بە یەکشەمبە بینا دانێ، بە دوو
شەمبە ڕیحلەت کە، حەجامەت بگرە گەر سێ شەمبە بوو
چوارشەمبە بۆ دەوا نۆشین و شەمبەی پێنجەمین
بۆ موناجات و دوعایە، جومعە بۆ تەزویج و شوو.
بڕوانە دیوانی مەحوی/ لاپەڕە٣٥٣

## بەناوی تەزکییە، نەفسی خۆی موهان ئەکا

ئینسانی ڕەزیل و سەفیل و دەنیئو بوت پەرست، ئەوەی بەناوی تەزکییە، نەفسی خۆی موهان و موحەقفیر ئەکا، ئەوەی دوای صونع و ئیختیراع ناکەوی، بە تەمای عەمر و زەید لێ ئەگەڕێ، سەعی ناکا، بێ جەلال و بێ ئیکرامە، وەجهی ئیلاهی نییە. ئێوە و خوا تەیارە بەسەرماندا هاتوچۆ بکا، وەکی مریشکان فس بین، لە کونان خۆمان بشارینەوە، لەگەڵ خوداوەندی ذوالجلال والاکرام چ موناسەبەمان هەیە؟

٣٨٥/٩

## بۆ ئەجیننان لە ماڵی مسوڵمانان بە ملیۆن کارخانە دانراوە!

گۆیا کەسێ لە ئیبتیدای جیماع ناوی خوای نەیەنێ بسم الله ی نەکا، جن دێتە لای ژنی! جن ژنی لەگەڵ ئەگێ، وابزانم دیومە: خۆی لە زەکەری ئینسانەکە دەئاڵێنێ ئەو قسە پێی ئەڵێن چی؟!

ئەترسم لە جیننەتەوە بێ! مسوڵمان ئەنجا لە سەدی یەك، لەو حاڵە بسم الله یێ بکا، کەوا بێ بۆ ئەجیننان لە ماڵی مسوڵمانان بە ملیۆن کارخانە دانراوە! موجاهید[1] لەم عەصرە با، مومکین بوو ببێتە ئیمامی شەدەڵەییان.

## کورد لە بەهەشتێ چ شتەك قبوڵ ناکەن؟

فِيهِمَا فَاكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ: ئەمەرەی نەبات، شفتی و گندۆرە، ئەمما گوژارك نا زۆر تاڵە، وەکی زەقوم، با ئەو بۆ جەهەننەمیان بێ، وە میوە دار، وەکی: هەرمێ و سێو و هەرووچکە و زەردەروو حەمەدەشین،

(١) مەبەستی موجاهیدی موفەسسیرە.

بەهێی چاو ڕەشکە و تین و ترێ ئەگەر نەبوکی تیا بێ ئەبێ گێوژی هەبێ، وە ئیللا کورد قبوڵ ناکەن! نەخل و ڕوممان لە دنیایە هەیە لە هەموو جێگایە ناین، هەنار گەرچی خۆی لەبەر سەرما لە خورما زیتر ئەگرێ، لە جیهەتی سابلاغ کە زۆر دوور نیە لە وڵاتی ئێمە، ئەیانوت: قادراغای ئەندەرقاشی بە سەعیبە زۆر لەناو مەرکانە، هەناری چاندووە، بە عەرابە زستان ئەیباتەوە خانووان، وە ئیللا سەرما ئەیبا.

هەنار حەققەن فاکیهەیەن خۆشە، خصوص مێخۆش. مەشهوور لە وڵاتی مە، هەناری شارەبان و هەناری نازەنینە، هەناری کۆیەش خراپ نییە، ئەمما خزمەتی چاك ناکەن. ساڵێ لە شەقڵاوەی لای میرانی بایز بەگ موسافیر بووم، ڕۆژێ چووینە ناو باغی دیوانێ، بە دەستی خۆی هەنارەکی شکاند، لەبەردەمی دانام منیش تەماشام ئەکرد، فەرمووی: بۆ ناخۆی؟

وتم: میرم ئەوەندە دەنکی جوانە، دانەی دەڵێی دانەی یاقووتە، باوەڕکە دڵم نایە بیخۆم!

وڵاتی کوردان میوەی نایابی هەیە، لاکین مع الاسف وەکی ئاوروپایی و ئەمەریقایی نازانن تەربییەیان بدەن، وا دەرئەکەوێ، خواردنی جەننەت علی الاکثر فەواکیهە بێ.

ئەم یەك دوو ڕۆژە زۆر ساردە، خێر بێ، ئەمڕۆ نەورۆزی سوڵتانییە، ئەوا خەریکە خۆشی کا، یوم الخمیس ١١ی صەفەر، هەشتی مارتی ڕۆمییە[1]. یارەببی ئەمساڵ میوەی وڵاتی ئێمە بێ مەضەرەت بێ، بەخۆشی بیخۆین، شوکری نیعمەتت زێدە بکەین.

٣٩٧/٩

## دوعا!

یا ذالجلال والاکرام، یا ذالطول والانعام، ڕەحمێ بە دینی ئیسلام کەی، عولەمای چاك زۆر لازمە، عەبقەری، نابغ، عاقل، دەوڵەمەند بن،

(١) ساڵەکە ١٩٤٠ی زایینی و ١٣٥٩ی کۆچییە.

مودافەعەی لەسەر دین بکەن، وە ئیللا ئەفەوتێ. کوفر و ضلال و فجر و فسوق زۆر عام بووە. مەلای چاك کەمن، ئەوەی هەن، بێ دەستن، فەقیرن نەخۆشن، ئیلاهی ڕەحمێ!

٣٩٩/٩

## گەلێ چیا زۆر پیر بوون!

زاتەن گەلێ چیا زۆر پیر بوون، وەقتە بە تەواوی لەبەر عەردی یەکسان بن، خوا ئەزانێ زەڕاتی بۆ کوێ چووە؟ چی لێهاتووە؟ ئەو زورگی ئەترافی ولاتی مە، هەمووی وات، حەتتا چیای سەفینی لە جیهەتی شەقڵاوە دیارە بوویتە زەوی، چیای باواجی ئێمەش لەو جیهەتی زۆر نوێ بووە، سەری بوویتە گۆڕەپان. ئەوا پیرمەمی قەصر و قصوری صەیفی لێ دروست ئەکەن، بۆ مەلیکی وە حەواشی مەلیکداری، بە واسیتەی دار و نەبات، عومریان نەختێ درێژ ئەبێ.

٤٠١/٩

## مەولوود کردن خصوص بەناوی ئەولیایان، خێرێ نین!

ئەوەی تەماشای خێر بکا، بە نەزەر زەمانی خۆی و بیکا، ئەوە سابیقە، ئەمڕۆ بۆ مسوڵمانان نوێژ و ڕۆژی، گەرچی ئەساسن، مەولوود کردن خصوص بەناوی ئەولیایان، خێرێ نین، ئینسان پێی بێ بە سابق[1]. دین لە نشوستە، عیلمی ئیسلامی لە ئینقراضە، دوشمن دین و دەمی قەوییە، بە ئەسبابە، ئەوەی موقابەلەی وانی پێ بکرێ، ئەوە خێرە، ئەو سەبقی تیایە، ئەوەی بۆ تەوحید تێکۆشێ، مۆئمینە، لە موسابقینە. سد الذرایع لە ئەسبابی سبقە، وکذا اختراع، دیمان بە ئیختراع کوو سەبقیان کرد، ئێمەش بە ئیختراعی درۆ و دەلەسان چۆن دواکەوتین.

٤٠١/٩

(١) مەبەستی ئایەتی (والسابقون السابقون.. ەی سوورەتی الرحمن ـە)

## موجەددیدی تەنها بە مەلایەتی نابێ!

مسوڵمان کە دونیای بوو، قیامەتی ئەبێ؛ الدنیا مزرعة الاخرة، دینی ئیسلام بە زیلـلەت و مەسکەنەت نـاژیە، لِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ ، خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ چۆن ئەبێتە ژێر چەپەڵۆك؟! موجەددیدی تەنها بە مەلایەتی نابێ، قـودرەت و قـووەت و وەرع و تەقـوای گەرەکە، وەکـی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز. حەزرەتی شافیعی، مەلا بوو تەواو، لاکین ئەم قـودرەتەی نەبـوو، القـوة القـوة قـووەتی مـاددی و مەعـنەوی ڕێـك کەوێ، خۆیەتی، بەڵێ اولـوا العزمـی وەکـی هیـتلەر و مۆسـۆلینی لازمە، ئەممـا ئـوممەت وەکـی ئەڵمـانی و ئیتاڵیـایی نـین، زۆر مـوتەفەریقن، گردکردنەوەیان زۆر موشکیلە، خصـوص تـا ئەو نەوعە شـێخ و مەلایـانە مابن، مەحاڵە.

٤٠٣/٩

## زمانی بەهەشتییان!

ئەبـێ کوردەکـان و عەرەبەکـان و هەولێـری، کـوو قسـان بـکەن لە بەهەشتێ؟ بیلا مەعنایەکی، عەیب نەبێ، هەرامە، هـین، گوێـت لـێ بـێ، تێگەیشتی، شیسمە، فهمت؟ گول: انـت! ئیشـتە بە تـوو بلێـمەوە شـت! وا چاکە ئینسان فێری قسان ببێ، دیارە بەهەشت لغو الکلامی تیا نییە.

٤٠٤/٩

## کە جەننەت ئاوی کوفارەی هەبێ، ئەبێ شەللالەشی ببێ!

قابیلە شەللالە بێ مومکینە لە جینـان مەواقیعـی هەبـێ، وەکـی شـاخی دنیا، با لە یاقووت و زوبورجود و مەرجان بن، بنەوەی حەوزی بلەوری،

ئەترافــی صــرخ مــومەررەد لە قەواریــر، لە بڵنــدییەوە وەکــی ســوولی چنارۆکی ئێمە، وەکی ئاوی خانەی وەکی سەرچاوەی زێوەی بێتـواتەی، سـۆلافی عەمـادییە، ئـاوی سـاف و بەرراق هەڵـڕژێتە خـوارێ، حەقـقەن زینەت و شەوکەت و نەشئەی هەیە، جار جار بیچیتـێ، خـوا نەصـیبمانی کا، لێی دانیشین، بە کەمـالی سـروور، لەگەڵ یـاران چـایەی ئەرغەوانـی ڕەنگی تیا عافێت کەین. خوایە چۆن چایی مومتازت پێ کەرەم کـردینە لە دونیا و سوولی چنارۆکی، نەزەر بە جینانیش وا مومتازمان لەو وێـنەیە پێ ئیحسان کەی، کە جەننەت ئاوی کوفارەی هەبێ، ئەبـێ شەللالەشـی ببی.

٤٠٦/٩

## حۆری مەرحەبامان لێ ناکەن!

حەققەن ئەگەر ئێمە بێ وەفـا نەبـین، ئەووەلەن چاومـان لە حەرەمـانی خۆمان بێ، بە حوورییان نەگۆڕینەوە، ئەمڕۆ لەگەڵ یەك ئەژیـن، حـۆری مەرحەبامان لێ ناکەن، سبەی ببنە هەوێیان، وە بۆیان تەرك کـرێن، نـابێ، ئەبێ أعز بن. ...ئەکثەری ژنی دنیا دورشـت خـوون، قسـەیان ڕەقـن، دڵ لێیـان هەڵـدەنگوێ، ئینسـان پێـی گـرژ ئەبـێ، ئەم دژ خـوییە تەبیعـی لە بەهەشت نامێنێ، بە أحسن و ألین ئەگۆڕێ.

٤٠٦/٩

## ئێرە خۆشترە یا لۆندەرە؟

لە بەعزە ئینگلیزانم ئەپرسی: ئێرە خۆشترە یا لۆندەرە؟

ئەیانوت: ئێرە. ئێرە هەوای صافی هەیە، نووری شەمسی بە دەوام لـێ ئەدا.

بەڵـێ مەدەنیـیەت و بـێ دینـی، جێـی وەکـی لۆنـدەرەی کـرد بە جەهەننەم، بێ نووری شەمس و بێ هەوا.

٤٠٧/٩

## پرسیاری کرد ڕۆژووەکە بشکێنم وتم بشکێنە!

حوشتری تێرئاو نەبوویی، حوشتر تووشی دەردێ ئەبێ، وەکی ئیستیشفا، تێر ئاو نابێ. ئافرەتێ، پیاوێ، زاهیرەن بێ عیللەت تووشی بەڵایە بووبوون، علی الدوام ئاویان ئەخواردەوە، وە هەر تێنی بوون. حەتتا ئافرەتەکە بۆ صەومی ڕەمەزان سوئالی لێکردم، وتم: بیشکێنە، وە فدیە بدە!

ئینسان تەحەییوری ئەکرد، ئەم هەموو ئاوە ئەچووە کێندەرێ؟ چی لێدەهات؟ وە بەول کردنیان وەکی خەڵکی بوو.

٤٠٩/٩

دوو سێ ساڵە ژەنگ لە دەغڵی ئەدا!

ئیلاهی دوو سێ ساڵە، حاڵی مسوڵمانان بە ئەکثەری لەوڵاتی ئێمە وایە، ژەنگ لە دەغڵی ئەدا، گەرما دانەوێڵە ئەبا، هوڕە میوە ئەکولولێنێ، شۆکە لە داران ئەدا، بەری ئەفەوتێ، وەك وردە ڕەژووی لێ دێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئیمانمان هەیە بە وەحدانییەتت، بە ڕۆژی جەزا. ئیلاهی ڕەحمێ، لە کافران ئیمتیازێ.

٤١٢/٩

## ئەوێ ساڵێ قالۆچە هەندە زۆر بوو، مەڕ و بزن ئەیانخوارد پێی قەڵەو ئەبوون!

لە پیرانم بیستییە، ساڵێ نەباری، زێی کۆیە، وشك بوو. مەگەر بەعزە جێیە قووڵ، گۆمەکەی مابووبێ، وە ئیللا هیشك بوو، چۆڕێ ئاوی پێدا نەدەهات.

لە حەماغای گەورەم بیست: ئەوێ ساڵێ قالۆچە هەندە زۆر بوو،

لەلای زێیە دەهات، بە دەشتێوە وەردەبوو مەڕ و بزن ئەیانخواردن، پێی قەڵەو و بەشیر ئەبوون، ئەمما شیریان مەیلە و سوور ڕەنگ بوو.

٤١٢/٩

## هەزار سوێندی بە درۆ بە قورئان و خوا ئەخوا، بە سەری شێخی ناخوا!

مەسئەلەی دەستنەدانی بێ دەستنوێژ بۆ موصحەف با لە حەدیس وەرگیرێ، یاخود بە موناسەبە لە ئایەت وەرگیرێ، لاکین تەهارەتی قەلبی لە حەق قورئان گەر نەبێ، تەهارەتی حسسی و دەست و لاقان چ نییە، دەست نوێژ ئەشوا، وەکی حاجی جەلیل ئاغای حەوێزی زادە، علی ملأ الناس بە درۆ سوێندی پێ ئەخوا! ئەم دەستنوێژە چییە؟ چەندی لەمەوپێش، کورد سوێندیان بە قورئان کەم ئەخوارد بە درۆ هیچ، وە ئەیانگوت:

بەو قورئانەی مێردی ئازای لێ ئەگەڕێتەوە.

ئەمما لە بەروەی نەبوو کە قورئان (تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ) و، دیبوویان گەلێ کەس بە سوێند خواردن، گرفتاری بەڵای بووبوون، بۆیە ئەترسان. ئەمما ئەمڕۆ ئەم ترسە نەماوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەئەری دیارە، هەزار سوێندی بە درۆ، بە قورئان و خوا و سیفاتی ئەخوا، بە سەری ئاغای، بە سەری شێخی سوێندی ناخوا.

٤١٥/٩

## عەلی (مکور اللیل والنهار)ـە!

عەلی ئەفەندی هەولێری، لە حەق شێخ عەلی حسام الدین ئەڵێ: عەلی (مکور اللیل والنهار) است!

ئەگەر مەلایە عیلمی فەلەکی با، نەیدەتوانی ئەو قسە بکا. لەو بەینە شێخ حسام الدین وەفاتی کرد، دەور و دەلالی فەلەك هەر وەکی

خۆیەتی. سبحان الله لای خۆیان ئەوانە، وەکی کوردی ئەڵێ: تەریقەت وەرئەگرن، بۆ وصولی الی الله، کەچی تووشی کوفرییاتی وا دەبن، وە بە عەینی ئیمانی ئەزانن!

٤٢٤/٩

## کورد هەموو دەیوت معاشمان دەنێ!

کورد **لا حیاء فی الدین** حکومەتیان تەشکیل کرد، ئەمما هەر کەس ئەچوو، دەوڵەمەند و ڕەئیس و ساحێب قودرەت و موکنەت، ئەیانوت: معاشمان دەنێ!

کەس نەبوو قەمەرییە لە ڕێی حکومەت سەرف کا، ئاخیری بۆف دەرچوو، ئەبایە هەموو ماڵ و ڕووحیان لەسەر دەستیان دانابا، تا بە تەواوی نائیلی مەرام ئەبوون.

وا دەرئەکەوێ مع الاسف مەلای فەقیر لەم ئەجرە کەبیرەی ئایەتی (فَالَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَأَنفَقُوا لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ) مەحرورومە، خوا بکا ئیمانی سەلامەت بێ، کافیە. ئێوە و خوا، لە ئادەمی تا ئەمڕۆ، فەقیر چی پێ کراوە؟ وە چی پێ ئەکرێ؟ (ذهب أهل الدثور بالاجور) وایە، دەوڵەمەندی دنیا و قیامەت ئەو دەوڵەمەندەیە، بە جێ و ڕێی ماڵ لە ڕێی خوا صەرف کا، کون و کاژێرکان بگرێ. ئەمما بە ناوی دین لە سەفاهەت سەرفکردنی ماڵ زەرەرێ گەورەیە، ئەگەر ئیسلامەتی مەلای خانەدان و بە قووەت و دەوڵەمەندی هەبا، قەت وا سووك نەدەبوو، عیلم دائیمەن پەرلاغ ئەبوو. ڕوئەسا و ئومەرا کلکە کوتێیان بۆ ئەکردن، توجار ئەبوونە خزمەتکاریان. ئەگەر خوا چارەیە ئەکا، ئەوەندە ڕەمەقی مایە، ئەوەندەیش نامێنی.

٤٢٥/٩

## کاك حاجی بۆ ناو و ناوبانگ، دوو سێ حەج ئەکا!

سبحان الله مسوڵمانان چەند غافڵن، ئەمڕۆ لە وڵاتی ئێمە علوومی دینییە، معاذالله لە ئینقراضە، کەس غەمی نییە، زرم و هۆڕ بە دەفە و دونبەڵەك مەولوودان ئەکەن، کاك حاجی بۆ ناو و ناوبانگ، دوو سێ حەج ئەکا، کە عیلم لە وڵاتی نەما، حاجییەتی مام حاجی چ کەڵك ئەگرێ؟ ئەوەی خدمەتیش ئەکا، خزمانی پێ بەڕێوەدەبا، مەقسەد ئیدامەی عیلمی نییە.

٤٢٨/٩

## ئەو بلعاتە لەناو ئێمەدا نییە!

سبحان الله لەوەتی حکومەتی ئیسلامییە تەشکیلی کردیە، تا ئەمڕۆ چ قەومێ نەبووە (عن طیب نفس) ، (حتی لدی الضرورة) ماڵ داتە حکومەت بۆ حیفزی دین و دنیا، مەگەر نادر! وە ئیللا ئەوەی دابێ، بە ناخۆشی داویەتی.

واقیعەن نەختێ خەتای ئەفرادی حکومەتی تیایە، کەس نییە، مەحەببەتێ باوێتە ناو دڵی ئەهالی و حکومەت، لەگەڵ ئەوەشدا تا حکومەت بۆ تەعالی ئوممەت سەرفی ڕاحەتی خۆی نەکا، وە ئوممەت لە ئۆغری حکومەت سەر و ماڵ دانەنێ، نابن بە هیچ. وە ئەبێ ئەوەی ڕەئیسی دەوڵەتە، لای ئەرپابی دەوڵەت و عمومی ئوممەت مەعنەن زۆر گەورە و موقەددەس و واجب الاطاعة بێ، وەکی ژاپۆن، وە ئیللا کاروبار سەرناگرێ. خەیراتی مسوڵمانان مەولودە، مەولوودی رسول الله ی نا، ئی شێخان، ئەوە لە مصرێ زۆرە، بۆ زیارەتی عەتەبات و شایی و خەتەنە و شاباش، چەند مەسرەفێ ئەکەن، تا ئێسك و پرووسکی مردییەکانیان ئەبەنە نەجەف و کەربەلا، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ناچێ، لە تونگەی حەمامماندا ئەسووتێندرێن. ئەو بلعاتە لەناو ئێمەدا نییە.

٤٣٨/٩

## مەلایەتی و فەقیری!

ماڵی دونیا بۆ ئەهلی خوا مایەی سەعادەتە، دین و دونیای پێ حیفز ئەکرێ. ئەمڕۆ من مەلام، پارەیە زۆرم پێ ئەوێ، بۆ مەدرەسە، بۆ تەشکیلی کتێبخانەیە موکەممەل، بۆ ئیدامەی عیلم، کە نەبێ چ بکەم؟

مەلایەتی ئەمڕۆ بە شەرحە موغنی و ئیساغۆجی تەواو نابێ. مەلا ئەگەر دەوڵەمەند نەبێ، بە حورمەت نابێ، موقابیلی سوفەهایان چی پێ ئەکرێ؟ توجارێ دوو درهەم بداتە مەلایە برسی، هەزار شاهیدی بە درۆی بۆ ئەدا، ئەو شەرع و دینە بەو نەوعە کەسە کوو حیفز ئەکرێ، عیلم چۆن ڕەونەق و حورمەتی ئەبێ؟

خوایە خۆت ئەیزانی، ئەگەر حاڵ وا دەوام کا، عیلم و دین نامێنێ، ئەم وڵاتە هەمووی ئەبێتە تاریکستانی. نعوذ باللە، ناکەس دەوڵەمەند بن، دین و عیلم چ ئیستیفادەیان لێ ئەکا؟ مەلای دەوڵەمەند و بە قووەت و نەسەب و حەسەب خدمەتی پێ ئەکرێ، یاخود ذەواتی وەك حاجی مەلا بەکر ئاغای هەبن مع الافتخار خدمەتی مەلایان ئەکەن، ئەویش باشە. جەننەت مەکان لە ئیمزای ویم دیە، لە کتێبان خادم العلم والفقراء دادەنێ. خوای تەعالان بە دەوامی عیلمی ئێمە بەقای مەدرەسە و مزگەوتی تا ئەبەد خێری نەبڕێ. ئامین.

٤٤٠/٩

## بنۆرنە کتابی کەون ئەزانن، چ عیبادەتێ ئەمڕۆ بە کەڵك دێ !

ئەی ئەهلی ئیمان تەماشای ئوممەی کەن، بۆ تەقەددومی قەومی خۆیان چی ئەکەن، پێش کەوتەی پاش کەوتە، خۆتان بۆ وا دامالان؟ وەك ئێشەکی بنی ڕەشماڵان، کەوتنە ژێر بەرماڵان، نازانن ئەمڕۆ مەوجیبی ڕەزامەندی خوا چییە؟ بنۆڕنە ئەڵمان، بنۆڕنە ئیتاڵیا، بنۆڕنە

سائیری دوەلی دی، دوێنێ، پێرێ چی وانە بوون، چۆن وا تەقەددومیان کرد، سەرکەوتن؟ دنیایان گرت، ئەو ئیختیراعاتە چۆن ئەکەن؟ ئەو عیلمانە ئێستا لەسەر کاغەز ئەخوون، لاکین مع الاسف عەمەل نییە، جەججالان ئیستیلای جیهانیان کرد، ئێوە ئینتیزاری مەهدی ئەکەن، لە بیرێ بێتە دەرێ، یا حەزرەتی عیسا، لە ئاسمانان بێتە خوارێ! ئەی، ئەی، ئەی هاوار، بۆ غیرەت کێشی مسوڵمانانی پێشی، بۆ موسابەقەیان، ئەم غیرەتە ئەم تێکۆشینە، چی لێهات؟ بەڵێ ارادە الله یە ئەبێ وابێ، بۆ ئەوان وایان نەفەرموو؟ بۆ خوا ئەفەرمووێ: موسابەقە بکەن!

ئەبێ ئەمر و ئیرادەی خوا موخالیف بن؟ کوو ئەبێ عەقائیدی ئیسلامییە خیققەتی ڕوحی ئەدا، نەشاطی ئەبەخشی، ئینسان بۆ عەمەل سەوق ئەکا، بڵندی ئەکا، پێشی ئەخا، پێی بەسەر ئەکەوێ، سەحابە هەموو شتیان لە خوا ئەزانی، بۆ سەعییان ئەکرد؟ مەککە مەدینە لە کێ؟ دەماوەند و نەهاوەند لە کێ؟ لە ئەترافی چین جیهادیان ئەکرد، بە قودرەتی خوا، بە ئیرادەی خوا، بە قووەتی دین و کیتابی خوا. ئێوە خۆتان بە ژێر ئەخەن، هەی هاوار، بنۆڕنە کتابی کەون ئەزانن، چ عیبادەتێ ئەمڕۆ بە کەڵك دێ! پابەندی دنیا مەبن، موسابەقە و موسارەعە بکەن بۆ ڕەزامەندی خوا.

٤٤١/٩

## ئایەتی مار، مەحووی دەوڵەتی کردنەوە!

لە مەوقیعێ نووسیم، ئایا ئینقلابی عەسای موسا بە ئەعبان، موجەڕەد لەبەر صورەتی بووە؟ یا سڕەکی تری تیا هەیە؟ چاك بۆم مەعلووم نەبوو، تا ئەو چەند ڕۆژە، لە موجەلەی هیلالی ئەپریل سەنەی ١٩٤٠ صەحیفە ٦ وە ٨٢، موجمەلێکم دی، زۆرم لا خۆش هات، وا دیارە نەوعێ لە ثعبانیان لا موقەددەس بووە، پێی ئەڵێن کوبرا. وە ڕەمز و نیشانەی ملوك و فەراعینە بووە، ئەو ڕەمزەیان لەسەر نێوچەوانی مەلیك دادەنا، موتتەصیل بە تاجی دەلیل لەسەر قووەت و حیفز لە ئەعدای، لە نەصصی دینییانە أنە ئەو مارە، وەك تفەنگ ئاگری فڕێ ئەدا، دوشمنی مەلیك ئەسووتێنێ. وە

تەمثیلی مەلیك ئەسپوسنسیان کردیە صورەتی ماری موقەددەس بەسەر جەبینی موهیبیا ئەنوڕێ، عەزەمەت و قوودداسەتی بەسەرا ئەڕێژێ، بۆیە ئایەتی مار، مەحووی دەوڵەتی کردنەوە.

٤٤٧/٩

## سوننی، ئیستیفادەیان لە ئاسن ئەمەیە؛ دەروێشەکان زورگی لێ دروست ئەکەن!

ئەو ساڵەی لە بەغدا بووم، ڕەمەزان بوو، بەعزەن ئەچوومە ئیستیماعی وەعزی نوعمان ئەعزەمی[1] (رحمة الله علیه) لە مزگەوتی قەپلانیه[2]، بعد العصر وەعزی ئەدا. ڕۆژێ بە موناسەبەی ئەم ئایەتە (وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ

(١) ناوی شێخ ئەبو یەحیا نوعمان کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل عوبەیدیی ئەعزەمییە، لە گەڕەکی شیوخ لە ئەعزەمییەی بەغدا، لە ساڵی ١٨٧٤/١٢٩٣ لە دایك بووە. لە مەدرەسەی ئیمام ئەبو حەنیفە خوێندویەتی و لە ساڵی ١٩٠٨ ئیجازەی زانستی لەلایەن شێخ عبدالرزاق الجلبی وەرگرتووە. لە مەدرەسەی روشدییەی کەرخ بۆتە مامۆستا و لە ساڵی ١٩١٠ گۆڤاری تنویر الافکاری دەرکردووە و لە ساڵی ١٩١٥ دەوڵەتی عوسمانی بۆ دانوستان دەینێرێتە لای پاشا عبدالعزیزی ئال سعوود. ناوبراو ڕەزامەندی لە سوڵتانی عوسمانی وەرگرتوە بۆ کردنەوەی کۆلیژی ئیمام ئەعزەم. بۆ کاری بانگەوازی و وەعز و ئیرشاد لە ناو عێراق گەڕاوە و دوای داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، ناوبراو دەستگیر دەکرێ و بۆ وڵاتی هیندستان نەفی دەکرێ و بۆ ماوەی دوو ساڵ و هەشت مانگ لە هیندستان دەمێنێتەوە. ناوبراو دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق، پەیوەندی باشی لەگەڵ زانایانی کوردیش هەبووە و ڕەمەزانان لە زۆر لە مزگەوتەکانی بەغدا وەعز و وتاری هەبوو، لەوانەش لە مزگەوتی قەپلانیە و مزگەوتی سەرا. چوار کتێبی نووسیوە بە ناوەکانی (ارشاد الناشئین، التاریخ العام، المواعظ الدینیة الصحیحة، شقائق النعمان فی مواعظ رمضان، اغاريد الهزار فی الاناشید والاشعار). شێخ نوعمان لە ١٩٣٦/٩/٢ لە شاری بەغدا وەفاتی کردووە.

(٢) مزگەوتی قەبلانیە، لە مزگەوتە کۆنەکانی بەغدایە و ئێستا بۆتە بازاڕێکی بازرگانی. قەبلان مستەفا پاشای والی بەغدا نۆژەنی کردبۆوە لە سەردەمی عوسمانییەکان و لە ساڵی ١٦٧٧. کە لەناویدا مەدرەسەیەکی زانستیشی تێدا ئاوەدان کرایە و لەگەڵ کتێبخانەیەکی گەورە، کە پڕ بوو لە دەستنووس، ئەمەشیان لە ساڵی ١٧٠٩ بوو.

بَأْسٌ شَدِيدٌ) فەرمووی: ئەی برادەرانی سوننی و جەعفەری، خوا لە حەق ئاسن گوێتان لێیە چی ئەفەرموی؟ ئێمە کە سوننین، ئیستیفادەمان لە ئاسن ئەمەیە دەروێشەکان زورگی لێ دروست ئەکەن، لە گوپی خۆیان ئەدەن، أنه کەرامەت ئیزهار ئەکەن. ئێوە کە جەعفەرین، زنجیری لێ دروست ئەکەن، لە عەشری موحەررەم، بەولا و ئەولای پشتتان دائەدەن، حەسەنم وای! حوسێنم وای! باقی تر هەر نەفعەکی بووی، بۆ فەرەنگان بووا!
٤٤٨/٩

## پیاوی وەکی ئیبن سینایان تەکفیر ئەکرد!

کەسێ تەماشای تەئریخ کا، ئەزانی مەسیحی چەند قڕانیان بەسەر لێ هات، ڕوئەسای دین لە ترسان ئینقیتاعیان لە عیلم کرد، بەعدهو وردە وردە دینی پۆلص بەناوی مەسیح ئینتیشاری کرد، تا مەلیکی ڕۆم بووە عیسەوی، وە هێلانەی ژنی حەقیقەتەن بووە هێلانەی ئەهلی صەلیب، قووەتیان ساند، ڕەهبانییەتیان کردە داوای دنیا، ئیستیلای سەر و ماڵیان پێکرد. شێخەکانی ئێمەش بەو ناوە، گۆیا ئینزوایان لە دونیا کرد، چوون بۆ عالەمی فۆك و عەینی، ئاگایان لە کائینات نەما، مەحووی شهوود بوون، بوونە ئەربابی نفووسی قودسییە، لە جەلبابی بەشەر چوونەدەر، ڕەهبانییەتیان قووەت دایە، ڕووی لە حەقایق وەرگێڕا، دوای خەیاڵات کەوتن. رسول الله ئەیفەرموو: لا رهبانیة فی الاسلام، ڕەهبانییەت لە مەیدانی جیهادە، ئەمما کردیانە جیهادی نەفس لە قورئان نا، لوح المحفوظ خۆیان تەماشایان ئەکرد، لوح المحفوظ هیچ، قەلبی خۆیان، *حدثنی قلبی عن ربی*، بوونە موتەسەریفی ئەرز و ئاسمان، ئەشاعیرەش قووەتیان دانێ، سەلبی قودرەت و تەئثیری قودرەت و سائیری قیوایان کرد، مسوڵمان سست بوون، ئاگایان لە عیلم نەما، کەسێ لە علومی تەبیعییە بدوایا، ئەیان وت: کافرە!

پیاوی وەکی ئیبن سینایان تەکفیر ئەکرد، خەڵکی ترسان ڕوویان کردە حیکایات و خورافات، عولەمای تەبیعەت کەوتنە سەعی، ئەسراری تەبیعەتیان گەلێ دەرخست، ئیختیراعاتی مودهیشیان کرد، لە هەموو

جیهەت بەسەر مسوڵمانان غالب بوون. ئەلئان لە جیاتی ڕەهبانییەتیان هەموو فەحشییات و سەییئات بەناو ئێمەدا بڵاوبوویتەوە، لە سەدا نەوەد ئیتتیباعیان ئەکەین، زۆری نەماوە معاذ الله دینی بە حەق مەحوو بێتەوە. من لە دوای ئەم حەڕبە زۆر ئەترسێم، ئینگلیز و فڕەنسە چ بەسەرکەون، چ بە بن، غایەت خەوفم هەیە، ئایا بەقییەی بیلادی ئیسلامیە چی بەسەر دێ؟ خوا بە ڕەحمەت و حورمەتی رسول الله و قورئان، چارەیە بکا، بۆ ئێمە و هەموو مسوڵمانان.

٤٥٣/٩

## وەختێ هێرش کرایە سەر ئیسلام، غەزالی خەریکی خەڵوەت بوو!

دوو فائیدەتان عەرز ئەکەم. یەکێ زەکی موبارەك[١] لە کتابی خۆی کە ناوی الاخلاق عند الغزالی یە، ئەڵێ: وەقتێ بەترۆس ناسك لە دژی ئیسلامییەت سەراسەرا ئاوروپای هینابووە جەولان، ئاگری حروبی سەلیبی هەڵئایساند، ئیمامی غەزالی[٢] غەریقی خەلوەت بوو، خەریکی ورد و

---

(١) زەکی عەبدولسەلام موبارەك، شاعیر و ئەدیب و رۆژنامەنووس و ئەکادیمییەکی میصرییە، سێ دوکتۆرای بەدەست هێناوە. لە ساڵی ١٨٩٢ لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٥٢ کۆچی دوایی کردووە. خاوەنی سێزدە کتێبی چاپکراوە.

(٢) پێشەوا غەزالی، ناوی ئەبو حامد محەممەد کوڕی محەممەد ئەلغەزالی یە، نازناوی (حوجەتولئیسلام) ی پێدراوە، یەکێکە لە شەرعزانەکانی سەر بە مەزهەبی شافیعی، لە ساڵی ٤٥٠ی کۆچی لە (طوس) لەدایك بووە، دەگوترێ باوکی پیاوێکی ئەوەندە باش بووە لە بەرهەمی دەستی خۆی بترازێ، هیچ شتێکی نەخواردووە. غەزالی بۆ خوێندن زۆر شوێن گەڕاوە، لە نەیسابوورەوە بۆ مەککە، لە بەغداش دەرسبێژ بووە، ماوەیەك لە شام ماوەتەوە، لەوێ ڕۆژێکیان ڕێی دەکەوێتە حوجرەیەك، دەبیستێ مامۆستاکە وتەیەکی غەزالی ڕاڤە دەکات، لە ترسی سەرسام بوون بە خودی خۆیو فیز و کیبرەوە، شام جێ دەهێڵێ و دەچێتە میسر و دواتر دەگەڕێتەوە طوس، هەر لەوێش لە ساڵی ٥٠٥ی کۆچی، ماڵئاوایی لە ژیان دەکات. ناوبراو بە یەکێك لە زاناو سۆفییە مەزنەکانی سەردەمی خۆی دادەنرێ و بە کتێبی احیاء علوم الدین و چەندین بەرهەمی تر بەناوبانگە. بڕوانە (مکاشفة القلوب المقرب الی حضرة علام الغیوب، لحجة الاسلام ابی حامد محمد بن محمد الغزالی، تحقیق: ابو انس عادل بن سعد بن

←

ئەوراد بوو. وە لە مەوقیعێ تر ئەڵێ: ئەچووە سەر منارەی مزگەوتی دیمەشق تووڵی ڕۆژێ لەوێ ئەبوو، دەرکەی لەسەر خۆی پێوە ئەدا!

بەڵێ ئەم خەلوەت و ڕەهبانییەتە وای بەسەر ئێمە هێنا. ومن العجائب سەید ئەحمەدی دەحلان[1]، کە لە ئەوائیلی ئەم قرنە چووە ڕەحمەتی خوا، لە تەئریخی خۆی کەمێ باسی تەحریکاتی ئەم بەترۆسە ئەکات، وە ئەڵێ: کە خوا ئیرادەی ضهوری شتێ بکا، ئەسبابی موهەییەئـ ئەکا. لەو هەنگامە ئاورووپایی بەعزێ ئوموریان بۆ ظاهیر بوو، عەزمییانی بەقووەت کرد، یەکێ لەو ئوموره داڕژانی بەعزێ کەواکیب بوو، بۆ سەر عەردی، بە ئینتیقالی ئەو کەواکیبە لە جانیبی ئوفوقەوە، عەلامەتی سووری دەمەوی و عەمودی نارییان بە شکلی حەربییەی سەر ئاسن، لە قوربی شەمس بۆ ئاشکرا بوو، وە لە جەووی سەما ئەیاندیت، صورەتی مودن و عەساکیر و وڵاغی بەرزە و ئەسلیحە و سواری مەرسوومیە بە سەلیب. یەکی دی لەو ئوموره، لە موددەی شەش ڕۆژی موتەوالی ئەدیترا، لەسەر جلکی مەسیحیەتی سەلیبێ لە نوور، بە نەوعێ بە جلکیانەوە ئەچەسپا، قابیلی مەحوو نەبوو، نە بە ئاو نە بە ئاگر.

جا توخوا مەلایە کە بە موجەددیدی قەڕنی چواردە حەساب بێ، ئەو نەوعە خورافاتە قبوڵ بکا، وە بە ئەوەندە ئیکتیفا بفەرموێ إذا أراد الله...، عالمی تر ئەبێ چۆن بێ؟!

ئەمەش لە تەئسیری ڕەهبانییەتە، عولەمای دینی پێی بە هیلاك چوون، قەومێ ئەو نەوعە ئایەتە ببینن، چ ئیشتیبایان لە حەقیقەتی دین و دەعوای ئارەزووی خۆیان ئەمێنێ؟ چ شکیان ئەبێ؟ لە بطلانی دین و ئایینی

---

محمد بن مطارع، الطبعة الاولى، دار الغد الجديد، القاهرة، ٢٠٠٨، ص٧-٨)

(١) ئەحمەد کوڕی زەینی دەحلان ئەلحوسەینی بە بەرەباب دەچێتەوە سەر شێخ عەبدولقادری گەیلانی (١٨١٦-١٨٨٦) ئیمامی حەرەمەین و موفتی و زانایەکی شافیعی مەزەب بوو لە سەردەمی خۆی کە لە کۆتاییەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوو. بەرهەمی لەبارەی وەهابییەکانەوە نووسیوە و ڕەخنەی لێگرتوون. ناوبراو بەرهەمی وەك کتێب زۆرە لە بوارەکانی شەریعەت و بەلاغەت و نەحوو و مێژوو. لە مەدینەی مونەووەرە وەفاتی کردوە و هەر لەوێش ئەسپەردەی خاك کراوە.

خصمیان؟ ئێمە کە ئیعتیبار بە خەواریق بکەین، ئەگەر بڵێین: خوا بۆ ئیضلالیانی وا کردیە. بە چ مەعلووم کەرامەتی ئەوانی مەش بۆ ئیضلال نییە؟ ومع الاسف بۆ سەوادی ئەعزەم موجیبی ضلال بوو!

فائیدەی دووەم. عولەما تەقسیمی بیدعەتیان کردە بە حەسەنە و غەیرە حەسەنە، ئەوەی لە زەمانی ڕەسوول و یارانی نەبووبێ، هەرچی بێ بیدعەتە. لەبەر ئەمە عولەمای ئیسلامییەت لە تەرەقی مەحرووم بوون، چونکی پێغەمبەر بە شیر و تیر شەڕی کردیە، ئەمە سونەتە، نابێ عدولی لێ بکرێ. حەتتا ئەمڕۆش سەلەفییون وازیان لەم قیوداتە نەهیناوە، ئەیانەوێ بە ڕیش و سمێڵ و وەزعییەتی نان خواردن و نووستن و هەموو حەرەکات و سەکەنات تەمثیلی ڕیسالەت پەنا بکەن، ئەمما باوەڕ ناکەم بەلای وجود و شەجاعەت و مەیدانداری و ئیثار و ڕەحم بە بێ کەسان و ڕیعایەتی یەتیم و بێ چارەگان، بەلای تەمثیلیا بڕۆن. تۆپ بیدعەتە، ئوستوڵی ناری بیدعەتە، دەبابە بیدعەتە، ضیاءی کەهرەبایی بیدعەتە، غەرامەفۆن بیدعەتە، تەلەفۆن بیدعەتە، ڕادیۆ بیدعەتە، لە قرنی چواردەمین حاڵی ئاوروپا پەیا بوو، بەو نەوعە کە هەیە، ئێمە ئەبێ بیکەینە میرئاتی قرنی سەعادەت.

بەعزێ زەواتی وەکی سەید ڕەشید خۆیان بە سەلەفی لە قەڵەم ئەدا، باش بوو، نەوعەن ما، حوسنی تەئثیری بوو، قسەی ویان قبوڵ ئەکرد، چونکی لە خۆیان بوو. مەلای فیرقەی دی، هەزار وەعز و نەسیحەتیان لێ بکا، گوێی نادەنێ، مونکیرە، لە فیرقەی ضالەیە.

سەید ڕەشید مەلایە ئاگادار بوو، ئەیزانی پێویستی ئوممەت چییە؟ بە چی نائیلی سەعادەتی دونیا و ئاخیرەت ئەبن، شکەمی بە سیاسەتی دینی بوو، خۆی بە سەلەفی ئەزانی. وەکی لە حەدیس ئیشارە ئەفەرموێ: ئەبایە لەسەری هەر سەد ساڵە موجەددیدێ بووبا، دیارە ئەحوالەتی عەصرێ بۆ عەصرێ دی دەست نادا.

٤٥٣/٩

## حەیا بکەن، عەرەقی خەجاڵەت بڕێژن!

سبحان الله ئەحوالات چۆن گۆڕایە، لە مەجەلەی ڕابعی تەربییەی حەدیثە، ئی مانگی ئیپریل سەنەی ١٩٤٠ ئەڵێ: موحسینی شەهیر کارنجی ئەمریکی، مەسیحی، لە ساڵی ١٩٣٩ یەعنی ساڵی ڕابردوو، چوار ملیۆن و هەشت سەد و چل و شەش هەزار و سێ سەد و بیست و شەش ڕیاڵی لە مەعاهیدی علمیە سەرف کردیە. چتاقە موحسین لە موحسینانی مسوڵمانان ئەوەندە فلسەیان لە مەعەهەدی عیلمی چ دینی، چ ڕەسمی سەرف نەکردیە. الم یأن للذین أمنوا، حەیا بکەن، عەرەقی خەجاڵەت بڕێژن، تەماشای خدماتی خۆتان وخەدەماتی ئەجانیب بکەن هەر فرقەیە ئەڵێ: ئێمە ناجیین! ئەمما ئەوەشیان لەگەڵ ڕەوشتی رسول الله و یارانی زۆر لێك دوورن، ڕەسوولی خوای وە یارانی، قەت بەحسیان نەکردیە، صیفاتی کیبریائی عەینی ذاتن، یا غەیرن، یا لا هو ولا غیرن، ئیمانی ڕوح بەخش و سائق بۆ عەمەل، بۆ کەشفی ئایاتی کەونییەی ئیلاهی مورادە.

گەلێ کەس ئیدیعای کوردایەتی ئەکا، ئەمما ئەگەر سێ فلس لە ڕێی قەوم سەرف کا، ڕوحی دەرئەچێ.

٤٥٧/٩

## با فەقێ هەر بڵێ: ڕاتبە ڕەحمەت و لێ بێ، پێخۆری فەقێیان، بچنە بەهەشتێ!

ئەوەی سەعی بۆ دین بکا، بێ شوبهە نائیلی سەعادەتی دونیا و ئاخیرەتە، یارانی ڕەسوول و ئەتباعی سەعییان ئەکرد، بووینە ساحێبی تاج و تەختی پادشاهان، وە خوداوەندی قەسر و قسور.... مەلاش با هەر بڵێ: ڕەببی دەوامتان بێ توججارینە، دوای شێخ کەون، بۆ پارچە نانێ.

فەقێ بڵێ: ڕاتبە ڕەحمەت و لێ بێ، پێخۆری فەقێیان، بچنە بەهەشتێ! لام وەیە لە قیامەتیش هەر وا ئەبن.

٤٥٨/٩

## دنیا بوویتە دز، ئەشرافی کوردان بە دزی ئیفتیخار ئەکەن!

دنیا بوویتە دز. ڕوئەسا و ئەشرافی کوردان، بە دزی ئیفتیخار ئەکەن، لە مەمالیکی ئیبن سعوودی دزی نەماوە، لە ترسی دەست بڕین، دەستی دزینیان بڕاوە، زینا و لیواطە و شوربی خەمر مەپرسە، جیهانی مەدەنی سەراسەرا بوویتە عوممخانە و مەیخانە، هەر مەملەکەتێ ئەحکامی شەرعیەی ئیلاهی تێدا ئیجرا نەکرێ، حەقیقەتەن شەرەفی ئینسانی تیا مەحوو ئەبێتەوە، (الا لكل ملك حمى، وحمى الله محارمة) غیرەت ئەڕوا، ئەهامەت نامێنێ، ئەمما لازمە شتێ تر عەرز کرێ: قورئان و حەدیسی نەبەوی، هەموو ئەحکامی شەرعیەی تیا نییە، عولەمای ئیجتیهاد گەلەکیان ئیستینباط کردیە، ئەگەر بە دەلالەت نەبووبێ، مەجبوور بوون بە قیاس. ئەوانەی ئیددیعا ئەکەن، کیتابی سەماوی هەموو شتی تیایە، ئیددعایە.

فاضلی موحتەرەم بهجت الاثری، مەقالەیە خۆشی هەیە، لە موجەلەی العالم الاسلامی، خوا بەرخورداری کا، عالمێ دینی عەصری زۆر نایابە، من ئیمانی ڕیاکارانەم کەیف پێ نایە، حکومەتێ تەشەککول ئەکات، بۆ ئوموری داخلی و خارجی قەوانینی پێ ئەوێ، تا لە شەریعەت دەست کەوێ، (فبها)، ئەگەر نەبوو، تەدبیر چییە؟ ئەربابی فەزڵ و عیلم ئاگاداری شەرائیع و قەوانین و سیاسەت لازمە تەحریری ئەحکام بکەن، دەوڵەت ئیجرای بکا، وە زۆر ئەبێ، دزیە، قەتلێ، خەرمان سووتانێ، مەزرەعە خواردنێ، بە دەلائیل و ئەمارە تەوەضوح ئەکا، فاعیل کێیە، ئەمما بە طەریقی شاهیدی مومکین نییە، لازمی قانوونێ ئیداری وە ئیللا بالمرة عالەم بە زایع ئەچێ...

مع الاسف لەبەر بێ سیاسەتی عولەما شەریعەتی ئیسلامی لەغوو بـوو، عەمەلـی پـێ نـاکرێ، مـع أنـه هەر کەسـە ئەڵـێ: مەزهەبـی مـن تەواوی شەرعی ئیسلامە، کـافیله بـۆ سـەعادەتی بەشـەر، له جەمیعـی ئەزمـان، له جەمیعی بیقاع الی الابد قابیلی ئیجرایە!

حاشا وانییە، هەر مەزهەبە پارچەیەکە، له شەریعەتی عاممی ئیسـلامی، دیققەت بفەرموون مەزهەبی شافیعی سەبەب بە سیاسەتی موعەتتەڵ بووە، مەحکەمەکی لەسەر تەشـکیل نـاکرێ. چ جـاهێ مەحـاکیم، بەو قیـود و شروطی مەلایانی مەزهەب وەکی ئیمـامی نەوەوی و ئەمثـالی ڕەحمەتـی خوایان لێ بێ، دایانناوە، مەزهەبی شافیعی نە نوێژی پێ ئەکرێ، نە بەیع، نە نیکـاح، نە تەدبیـرێ؟ فیقهـی حەنەفـی بە سـایەی موجەلـلە باشـە، لە مەحاکیم ناوی هەیە، ئەوانی تر هـیچ، چـارە لازمە، ئەممـا طەبیـب نیـیە، اَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ بـۆ جیهەتـی عیـزز و عـولایە، ئیـزالەی خەوفە، ئیستیللایە، حورییەتی ئیجرایە، قسە زۆرە وفی هذا القدر کفایة.

١٠/١٠

## سرتە سرت، پرتە پرت، فسکە فسك !

بەعزێ کەس عادەتی خراپیان هەیە علی الاغلـب لە مەجلیسـان، دوو بە دوو پێکەوە دەنێن، بە سرتە سرت، بە دزی قسـان ئەکەن. حەقـیقەتەن ئەهلی مەجلیس دڵیان مشەووەش ئەبێ، مەجلیس بـۆیەیە، ئینسـان وێکـڕا قسەی خۆش بکەن. یەکێ قسە بکا ئەوانی دی گوێ ڕاگرن، دڵی دەنێ، بۆیە نییە ئەو و ئەم سرتە سرت، پرتە پرت، فسکە فسك بکەن.

١٣/١٠

## ئەوانەی سەلام لێك ئەکەن، علی الاکثر لێك ئەمین نین!

بەغـدایی ئەلـئـان بعـد السـلام بە یەك ئەڵـێن: صـبحك الله بـالخیر! لە سـبەینە تـا نیـوەڕۆ، وا تەرحیبـی یەك ئەکەن. لە نیـوەڕۆ تـا سـبەینە، هەر

مساك الله بالخيره، ئەوانی شەو باش و ڕۆژباش پێت ئەڵێن، بەڵێ لە هەموو شت مع الاسف تەفرەقەیە، مە أنە ئەوانەی سەلام لێك ئەکەن، على الاكثر لێك ئەمین نین.

١٤/١٠

## عیلم شوەدەن چ ئاسان، ئادەم شوەدەن چ مشکل؟!

چرا ئەگەر لە بەینی مەجلیسیش داندرێ، هەر چرایە، ڕووناکیە بۆ ئەهلی مەجلیس. خانەدانی عیلم ئەبێ وەکی حەزرەتی مەلا ئەبوبەکری ئەفەندی هەولێری بێ، خانەدانی عیلم، عالیم، عەللامە، ساحێبی سەروەت و سامان. لەسەر ئەو هەموو حاڵەش موتەوازیعە، کریم الطبع، ئاڵای عیلمی بۆ وڵات هەڵگرتیە، عیزەتی پێدایە، خودا لەگەڵ عیزز و جاهـ و ئەولادی دەوامی بدا. زاتەن دەرەجاتی ئینسان بە ئیعتیباری ئەوساف و ئەخلاق و ئەخلاقی حەمیدەیە. ئەگەر ئیمان و ئەگەر عیلم لەگەڵ ئەخلاقی فاضیلە بێ، خۆیەتی، وە ئیللا چ قیمەتی نییە. عیلم شوەدەن چ ئاسان، ئادەم شوەدەن چ موشکل؟!

١٨/١٠

## ئیمامەکانیش زۆر لە ئێمە بە حورمەتتر نەبوون!

موفتی زەهاوی لە بەغدا چووە زیارەتی ناصرەددین شای قاجار. شا فەرمووی: مونازەعەی ئێوە لەگەڵ عولەمای ئێمە-یەعنی شیعان- لەسەر چییە؟

مەلا فەرمووی: لەسەر ئێوەیە!

فەرمووی: چۆن؟

فەرمووی: خوا ئەفەرموێ: أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ، ئێمە ئەڵێین الْأَمْرِ مِنكُمْ ئێوەن، یەعنی ملوك و سەلاطین. مەلای شیعان ئەڵێن: ئێمەین -أُولِي الْأَمْرِ! حەتتا ئەمر لەسەر شاهـ و پادشاهان ئەکەین.

شا وتی: حەق لە تەرەف ئێوەیە!

بەڵێ ئەو موجتەهیدینی کیرام، وەك ئەبو حەنیفە، وە ئیمامی مالیك، ئیمامی شافیعی، ئیمامی ئەحمەد، گەر بەعدە حین، لە وەفاتیان لەناو ئوممەت موحتەرەم بوون، ئەمما لە زەمانی خۆیان لێیان ئەدرا، حەبس ئەکران، فیراریان ئەکرد لە فتوا، مەنع ئەکران، زۆر لە ئێمە بە حورمەتترنەبوون.

ومن العجائب ئەو ئوممەتە ئەوەی لەگەڵیان ساغ و پاك و ناصح و ئەمین بێ، نایانەوێ، حورمەتی ناگرن، بەڵکو عەداوەتی ئەکەن، ئەوەی بیلعەکس بێ، لایان موحتەرەمە، ساحێبی سەر و ماڵە. عولەمای ئەهلی سوننەت و جەماعەت زۆر نەمایە ئینقیراض بکەن، خاسەتەن لە کوردستان. ئەسڵەن ڕەواجیان نەمایە. ئەکثەری سەوادی ئەعزەم فەقیرن، بێ کەس و نەوا و بێ دەرامەتن، وە ئەوەی ئەڕوا معاذ الله بێ شوێن ئەڕوا، ئەوەش موجیبی خەوف و ئەسەفە. حاجی قادر شکایەتی لە زەمانی خۆی هەیە، کە مەلا نەماین، لەگەڵ ئەوەشدا نەزەر بە عەسری ئێمە دونیا بە عیلم مەعموور بوو، حەتتا لە ئەوائیلی عومری من مەلای چاك لە کوردستان زۆر بوون، لاکین مع الاسف ڕوو لە کەمی بوون، خوا مەرحەمەت کا، ئەو دینە نەفەوتێ، مەلای چاك و بە قووەتێ بۆ بڕەخسێنی.

ئەمڕۆ لازمە، جەمعێ لە عولەما، عولەمای ئیسلام بن، تابیعی فیرەقی مەزاهیب و ئەحزاب نەبن، وەکی أطبای حەذذاق تەماشی ئەو نەخۆشیە بکەن، بۆ تەداوی تێکۆشن، بێ ئەمەل بن، مەحزەن بۆ خوا سەعی بفەرموون، ئەگەر وا نەبێ، چارە ناکرێ. وە جەنابی حەق دەوامی مەلا ئەفەندی هەولێر و ئەم داعی فەقیرە بدات، ئامین!

١٩/١٠

## ئیددیعا ئەکات ئەو فرقەی ناجیەیە و ئەوانی دیش ئەسحابی بیدعەن!

کوللی فیرقەیە لە فیرقەی ئیسلامیە، ئیددیعا ئەکات: ئەو فرقەی ناجیەیەی حزب اللە یە، ئەوانی تر ئەصحابی بیدەع و ئەهوان، وفی

النـارن. لەگـەڵ ئـەوەی هیچیـان بە حەق لەسـەر ڕەوشـتی رسـول اللـە و یارانی وی نین، لەگەڵ یەك عەدوون، تەکفیری یەکتری ئەکەن. سبحان الله چ جایە فیرەقی مەذاهیبەکان لە یەك فیرقە وێکڕا ناسولحێن! دائیم لە مونازەعاتن، ئەگەر سەیفێ ئەگەر قەلەمێ، ئایا حزب الله وا ئەبێ؟ حاشا نابینن چەند بە فەوز و فەلاحن؟ زەلیلی میلەلن. خودایە تەرەححومێ!

٢٩/١٠

## مەسئەلەی سوننەت و بیدعەت، دەست و پێی بەستی!

لە مەیـانی ئەڵمـان و ڕووس و سـائیری دوەلان، غەیـری ئینگلیـز و ئەمریکا لە هەمووی جوو حەشر ئەکـرێن، ئەیـانکوژن، طەردیـان ئەکەن، ماڵیان بەتاڵان ئەبەن، بە تەما بوون، لە سایەی بەریتانیا العظمـی لە ئەرزی مـوقەددەس، ئەرزی مەحشـەر، فەلەسـتینی موبـارەك حکـومەتێ تەشـکیل کەن. ئەوانەی لە وڵاتـان دەرئەکـران، بەریتانیـا ئەیهێنـانە فەلەسـتین، تـا حوببی حاضر ئەلمان ئیستیلای فڕەنسەی کرد، بەریتانیای عوزمای هینـایە موحاصەرە، ئەکثەری جووە دەوڵەمەندەکان فیراریان کرد بۆ ئەمریکا، لە شاماتی وان، بەریتانیا کە سید الانام بـوو، زۆر زەلیـل بـووە، ئەو دەوڵەتە واسع الملك ـە، دونیای لێ تەنگ هاتییە، بزانین ئاخیری حەرب چی لێ دێ؟

ئەڵێن عباد الله کە زیندی بـوونەوە سـەوق ئەکـرێن بـۆ ئەرزی شـام، لەوێ فەصـبی قەزا ئەکـرێ! ئەمە قسـەیە زۆر بـێ مەعنـایە، غـایەت بەسیطانەیە، لە ئادەم تا ئینقراض بەشەر ئینسانەکان زینـدی ببـنەوە، ئەگەر لەسەر گەڵی ئەنگوستان لاقـان ڕاوەسـتن، لەسـەر هەمـوو عەردی جێیـان نابێتەوە، خوا ئەزانێ لە کوێ بـۆ کـوێ سـەوق ئەکـرێن؟ ئەڵـێن شـەڕی مەهدی و عیسا لەگەڵ دەججالی لەوێ ئەبێ! قسەیە هیچ و پووچ! ئەڵێن: عیسا دێتە خوار لە ئاسـمان، لەسـەر منـارة البیضـای! نـازانم کوێنـدەرێ؟ منارەی چی؟ دوای حەربـی عمـوومی فڕەنسـە داگیـری کـرد، مسـوڵمان تووشی کەشمەکەش و ئەورە بوون، کەسیان بە ئیمداد نەهات، ئەمـڕۆش نازانین مەصیری فڕەنسەی کە کەوتیتە ژێر پای عەسـاکیری هیـتلەری، چ

دەبێ؟ چۆن دەبێ؟ تا بزانین ئەرزێ ئەمێنێتەوە بۆ مسوڵمانان؟

ئەی مسوڵمانی بەدبەخت، لە بێ تەدبیر و سیاسەت و بێ تەئەممولی لە عاقیبەت، بە حیکایەتی بێ ئەساس خۆت مەشغوول کرد، بێ ئاگا لە ئەسبابی حەرب و موتەفەریق و بێ هێز، ئەڵێن: ئینسان بێ قودرەت و ئیرادەیە، تەئثیری نییە، هیچ شت تەئثیر لە هیچ شت ناکا، بەس مەحز خەلقی خوایە! ئەوەندەی هێزت بوو، ئەویش چوو، مەسئەلەی سوننەت و بیدعەت، دەست و پێی بەستی، ئاخیری دیت چیت بەسەرهات! لە چەند جێ، لەو دار و دیاری خۆتان دەرکران، ئەگەر مانەوە، بوونە ژێر دەست، وەکی جوولەکەی وڵاتی ئێمە، موحەققەر و موهان. حالاش ڕوئەسای دنیا و دین، وەکی سابق لاف و گەزافیانە. دەست لە ئەفسانەی خۆیان هەڵناگرن، ئەگەر حاڵ وا دەوام کات، حاڵی بەقییەی مسوڵمانان زۆر ناخۆش ئەکا، ژیان موشکیل ئەبێ، نە عەلی نە عەبباس نە خضر نە ئەلیاس نە مەهدی نە عیسا علیە السلام دەردی وانیان پێ دەرمان ناکرێ. چارە ئیتیحادە، قووەتە، سەعییە، لە ئیختیراعی کەشفی جەواهیری ئەرزی، ئیستیفادە لە کنوزی- چ مەعادن، چ مەزارع!

ئەگەر ئەمجارە مسوڵمان لە حەربی ئەڵمانیا عیبرەت وەرنەگرن، لاشەك ئینقیراضیان ئەبێ!

۳۳/۱۰

## خوا بە قوربانی کەنگری کا!

قەومێ ئارەزووی دەوام کات، نابێ زۆر بە عەیش و عوشرەت و لەززەت و ناز و ناسکی ڕابوێرێ، ئەبێ بە خشونەتی عەیش ئیعتیاد بکا. لەسەر ئەمری سامی شەوکەت لە مەکاتیب ئەئەرێکی عومەری ئەنووسن: إخشوشنوا فإن الترف یزیل النعم! وایە خاسەتەن دوژمنت موقابیل بێ، لەم حەربە حاضرە. فرەنسە بۆ وا زوو تەسلیم بوو؟ تابی موقاوەمەی ئەڵمانیا نەیەنا، بریتانیا العضمی بۆ وا کەوتە تەنگی؟ ئەڵێی شێرە لە قەفەس کرایە، خۆشی نازانێ چی بەسەر هات و چی بەسەر دێ!؟ ئەسبابی تەرەف و عوشرەت و ڕەقس و سەما و گەڵ و گیپاڵی ژن

بەڕەڵاکردن و خواردن و خواردنەوەی موتەنەوویع و قیمەتدار بوو.

سبحان الله مسوڵمانان ئەو هەموو زیللەتەیان دیت، وە ئەیبینن، ئیعتیبار ناکەن؟ لە گرانی حەربی عمومی لە سەدی حەفتای لە برسان مردن، ئەوی ماوە خوا بە قوربانی کەنگری کا، شانی لێ هەڵکێشا. بە قبوڵی و قەزاتمە ڕازی نابێ، لە هەموو جیهەت هەموو عالەم خراپتر بوون. ئەمساڵ ساڵێ دژە، حەربی ئەورووپایی بووە باعیسی تەرەققی، شەکر و چا و جغارە و ئەلبیسە، کلۆ و سن و کیسلە، ژەنگی باغان، بوونە باعیسی بێ ڕزقی و تەرەققی ئەسعار، ئەوەی نەختێ حاڵ و وەختی هەیە، موبالات ناکا، وەکی هەرزانی خەریکی لەذائیذە.

لە ئەحوال و ئایەتی کەریمە بەدەرئەکەوێ، ئێمە قەومێ بێ بەصیرەتین، بێ عارین، ئیعتیبار ناکەین، بێ سەبر و مەتانەتین، موقابەلەی هەوا و هەوەسی خۆمان پێ ناکرێ..

٣٦/١٠

## ئەڵێن: دەوڵەمەند پێنج سەد ساڵ پاش فەقیر ئەچنە بەهەشت!

ئەڵێن؛ دەوڵەمەند پێنج سەد ساڵ پاش فەقیر ئەچنە بەهەشت! خۆزی ئەمن هەمبا ئەوەی ئارەزووم با، بۆ تەرویجی عیلم لەو دیارە، بەجێم هێنابا، با پێنج هەزار ساڵ پاش حەمەبزن و شەکە و تسن بچمە بەهەشتێ، دین و دونیا بەرەکان، دونیا لەبەرچاوی جاهیلی مسکین ئەخەن، تا ئەوەی هەیەتی بیانداتێ، بێ چارە هەڵئەخەڵەتێ، دوایە فەقیر ئەبێ، ژن و منداڵی ئاوارە ئەبن، خۆی بە سواڵی ئەکەوێ، لەسەر ئەو مەشهووراتەش حالەن عەوام پێیان هەڵئەخەڵەتێن.

تەماشا مسوڵمانی دەرکرای، تەرکی یار و ماڵ و دیاری کردیە، خواهشی ڕەزای خوا بووە، نوصرەتی خوا و ڕەسوولی خوای دایە، مەلای لا هەڵپچکڕای لە عومری خۆی، خێری فلسەکی بۆ دین نەبووە، دەرحەق ئەو نەوعی مسوڵمانە هەذەیان ئەکا، تەعنی لێ ئەدا. خەیاڵێ لە

خۆی ناکا، ئەگەر لەو وەقتەی با، ئایا ئیمانی ئەهێنا؟ تەحەممولی ئەو ئالام و شەدائیدەی ئەکرد؟ ئەوانەی شین بۆ حوسێن ئەکەن، لاشەك ئەگەر لەو عەصرەی بان ئەبوونە تەرەفدار و قاتیلی حوسێن.

٤٣/١٠

## لەبارەی مەلایان!

فیرەقی ئیسلامییە هەموو لە حەق یەك بە غەلل و غەشش و حیقد و حەسەد و شوح و بوعز و عەداوەتن. عەلاوەی ئەهلی مەزاهیب، لە فیرقەیە لەگەڵ یەك عەدوون. اولیاء الله ئەربابی سلوك و موجاهیدین بۆ تەزکییەی نەفس لە هەمووان خراپترن، هەر طەریقە هەر شەعبە، لە طەریقی بەدخواهی یەکن. دوو مەلا نییە، بەڕاستی یەکیان خۆش بوێ، مەلایان زۆر معامەلەیان سەیرە، مەلایە ئەچێ بۆ شارێ وەکی کەرکووك مەسەلەن، مەلایانی شار وەکی کەڵەباب بۆ شەڕەکەڵەبابی بچن دوغد دوغد دوغد، دەوری ئەدەن، لە مەجالیس سوئالی لێ ئەکەن بەڵکو مەلا ئاگای لێ نییە، لای قەوم ئەشکێ.

زاتەن شیقاق و نیفاقی ئوممەت، لە ڕوئەسای دین دا کەوت، موحەققەق ئەوانە لێك و پێك بان، ڕوئەسای دنیا چییان پێ نەدەکرا.....

ڕۆژ بە ڕۆژ تەفرەقە تەوەسسوع ئەکا، کەس لەگەڵ کەس ساغ نییە، مەحەببەت بۆ سیاسەت، عەیب و عار نەما، بەدئەصل کەوتنە کار، مەئاثیری خانەدانی فەوتا. ئەمشەو فەقەرەکم دیت، حسێن هەیکەل لە (انا تول فرانس) ئەویش لە کچەکی نەقل ئەکرد، ئەیوت: کەس ناتوانێ خۆی لە عیبادەتی قودەما قورتار کا!

وایە لاکین یەکێ عیبادەت ئەکەن، یەکیتر بە لەعنەت ئەکەن. کوللی ئیمامێ کوللی ڕەئیسێ لە ڕوئەسای دین، بۆ فیرقەیە بووە ئیلاهی خەیر، بۆ تائیفەیە گەڕا بە ئیلاهی شەڕ، لە ئەعزەمی ڕەئفەت و ڕەحمەتی کیبریائی یا، لە حەق بەشەر بە عوومی، لە حەق ئێمە بە خصوص، کە چ ڕەسوولێك، دوای خاتم الرسل نەبوو، وە ئیللا مقطع ئەبووین، ئایاتێ

لە حەق ئێمە نزولی کردبا، نەوعێ ئایاتێ نەدەبوو کە دەربارەی بەنی ئیسرائیلی نازل بووین.

٤٥/١٠

## دوعا!

ئیلاهی بە حورمەتی خۆت و سیفات و ئەسمات، ئەو دەرد و بەڵاو نحوسەتە، لەسەر ئێمە و ئوممەتی موحەممەدی هەڵگری، ئاوروپای ژێر بەرەژۆر کەی، مسوڵمانان حیفز کەی لە فیتنەی ئەم حەربە سەلامەت بن، ئیعادەی مەجدی ئیسلام بکەیەوە. ڕیجالی اولی العزم، مەزهەری سیفاتی کەمالات لە ئێمە زۆر کەی. عیلمی دینی زیاد کەی، بێ حورمەتی هەڵگری، میلەلی موسلیمە بین الملل مەوقیعیان زۆر بڵند بێ، ڕزقی ئوممەت زۆر کەی، گرانی نەبێ. خانەدانی جەلی بە عیلم و عەمەل و دین و سەرفرازی، بەردەوام کەی. ئامین!

٥٨/١٠

## ئەهلی عیرفان لە نەشئەی جەدید تەرکی عیبادەتیشیان کرد!

سەرامەدانی عیلمی دینی ڕیعایەتیان نەفەرموو، بەڵکو قیمەتێ ئەو نەوعە وەقائیعەیان نەگرت، تەرجیحی دەروێش و سۆفیەتی و خەلوە و خەتمەیان لەسەر ئەوانە کرد، ناویان لێ نا جیهادی ئەکبەر. ئاخیری لە ڕقی ئەمانە وای لێهات، ئەهلی عیرفان لە نەشئەی جەدید تەرکی عیبادەتیشیان کرد، چ فائیدەشیان نەبوو، بۆ حیفزی مولك و میللەت. من حازرم بۆ فتوا بە تەرکی بەعزێ عیبادەت بۆ کەسێ وەك مستەر ئەدیسۆن کە ئەوقاتی خۆی سەرف کا بۆ ئیختیراعی نافیع، بەشەر خێری لێ ببینێ، ناشکوری نەبێ، دین و میللەتی ئیسلام نە لە عیلم، نە لە جەهل ئیستیفادەی نەکرد.

٦٠/١٠

## دەنگی تۆپی ئینگلیز دەهات، مسوڵمانان دەیانوت گیان، خێرابە بۆ نایەی!

لە حەربی عموومی لە تکریت شەڕە تۆپ بوو، دەنگی تۆپی ئینگلیز گەلێ جار لە کۆیە ئەبیسترا، زۆر لە مسوڵمانان ئەیانوت: گیان! لەبەر ناڵەت مرم، خێرا بە، بۆ نایەی!

٦٢/١٠

## لەو زەمانە سیاسەت بوویتە درۆی مەحز!

لەو زەمانە کە سیاسەت بوویتە درۆی مەحز، صرف هەڵخەڵەتاندن و عەهد و پەیمان و وەفا و سوێند و ڕیعایەتی حقوقی هیچ نییە. اللە سیاسەت کوو عالەمی بە فەساد برد! حەتتا عیلمیشی لە کەدار کرد، ئەوەی عیلم بۆ نەفعی بەشەر دەریئەخا، ئەوان ئەیکەنە مەداری هیلاکی بەشەر، تەخریبی عیلم و عیمران!

٦٢/١٠

## کەسێ بەڵایەکی بێتە سەری، ئەڵێن: ئەمە هیممەتی فلان شێخ بوو گرتی!

لەمێژە کافران خۆیان هەڵدەشەکێنن، ئەگەر ئافەتێ هاتە سەر مسوڵمانان ئەڵێن: ئەوە ئی ئیلاهی ئێمەیە! وە هەم لەناو مسوڵمانان زۆر موتەداویلە، کەسێ بەڵایەکی بێتە سەرێ، ئەڵێن: ئەمە هیممەتی فلان شێخ بوو، یا فلان سەیید، یا وەجاعی فلانی گرتی!

من دائیمەن لە خوا ئەپاڕێمەوە ئەو جەهەلانەم پێ خۆش نەکەی، لەگەڵ ئەوەش ئەوەی بەسەر ئەوانە دێ، بەسەر غەیری نایە. چەند ساڵێ لەمەوپێش لە بازاڕی، شەخسێ لەگەڵ سەییدێ بەشەڕ هاتن، شەو سەییدەکە بە دەردێ فوجائی وەفاتی کرد، مەلا حەوێز ئاغای حەسەن

ئاغـای بـۆ سـبەینێ وتـی: ئەگەر ئەو شەخسـە بمردبـا دەیـانگوت: ئەوە هیممەتی سەییدی بوو. ئەمما کەس نالێ: سەیید وەفاتی کـرد، هیممەتـی ئەو شەخسە بوو!

حاسلی زەخرەفیاتی ساختەیی لە ئیعتیقادییات زۆرە.

٦٥/١٠

## لە مەجلیس لەبەر مالم یا قەشە هەستی، چ نەقسێ بە مەقامت بە دینت ئەگا؟

ئێسـتا بەعـزێ، ئەرواح و ئەولادی قوربـانی هیـتلەر ئەکـات، بەعـزێ عیبادەتی ئینگلیز ئەکەن، مەحەببەتیان فـوق التصـورە، ئەمە زەرەرە، ئەبـێ عاقڵ لە غەیرە دین بەر حەزەر و بە ئیحتیراس بێ، ئەو غەیرە دینی لەناو ئێمەدایە، ئەگەر حوسنی معامەلەیان لەگەڵ بکەیـن، چ زەرەری هەیە؟ لە مەجلیس لەبەر مـالم یـا قەشـە هەسـتی، چ نەقسـێ بە مەقامـت بە دینـت ئەگا؟

سیاسەتی من، لەگەڵ ئـی مەلایـانی جـودایە، ئەوان ئەفەرمـوون: لەبەر زەروورەت نەبێ، نابێ لەبەریان هەستی.

کە زەروورەت بوو، دەسەلات چییە؟ چ مننەتـی تیـایە؟ هەڵناسـتی بە شەق هەڵت دەستێنن، ئەمە خۆی نییە، قسە زۆرە، ئەمەندە بەسیە.

هەموو عالەم سەنای صلاح الدینی ئەیوبی ئەکەن، لەسەر ئەو حوسنی معامەلەی کە لە حەق ئەجانیب کردی، تا لە حەربی عموومی کە فڕەنسە هاتە شام، ئەو چاکەی ڕەچاو کرد، وە ئیللا کارێ خراپیان بە مسوڵمانان ئەکرد، مەسەلەی کوردییە: ڕۆژ هەموو ڕۆژێ، لە دەرەجەکی هەڵنایە.

بەڵێ تەنەققولات و تەبەددولاتی زەمانە، نایەتە تەخمین، ئەمما مەردی عاقڵ خۆی و قەومی، عاقیبەت ئەندێشـی ئەکـا، لاکـین مەلا سـییەما کە صەلابەتی دین بنوێنی، هیچی نایەتە بەرچاو. خصوص تەرجیحیان کات، لەسەر قەوم و هەم دینی خۆی، ئەوانە زوڵم لە خۆیان ئەکەن، زۆر بووە بە واسیتەی خائینێ هاکەزایی، دەوڵەتێ مەحوو بوویتەوە، عەرەب لەگەڵ ئینگلیـز و فڕەنسـە ڕێـك کەوتـن، بەگـژ دەوڵەتـی عوسـمانی دا چـوون،

عوسمانییان لە وڵاتی عەرەب دەرکرد، پاشان چ بوو؟ وەفایان بە عەهد کرد؟ حاشا. ئیمڕۆ لەبەر دەستیان بێ ئارامن، بنۆڕە سوریە و فەلەستین، پاش حەربی حاظرە، خوا ئەزانێ چیان بەسەر دێ؟

حەققەن لەمێژە مسوڵمانان تەدبیر و حوسنی ئیدارەی قورئانیان تەرك كردیە، جێی ئەسەفە، خاسەتەن بۆ عەرەب، کورد ئەوا بڵێین تێناگا، خۆ عەرەب تێئەگات، ئەو مولك و خەلافەت و سەرداری ئەنامەیان لەقیس چوو، چونکی ئیتتیباعی ئەو قورئانە حەکیمەیان نەکرد. وە ئیللا ***الآن كان كما كان*** .

٦٩/١٠ — ٧٠/١٠

## قورئان ئیمامە، دەستوور، لاکین موجەڕەد بۆ نوێژ و تەڵاق!

مسوڵمان لە ئیدارە، لە سیاسەتی حەقیقی قورئانی زۆر غافڵن، وە یاخود خۆیان ئیغفال ئەکەن. ناپلیۆن مسوڵمان بوو، لە میصر هاتە مزگەوت، حورمەتی مەلایان زۆر ئەگرێ. مۆسۆلینی حامیی ئیسلامە، ئیعلانی کرد، مسوڵمان بووە، خەی خەی! هیتلەر پاش حەڕب ئەچێتە سەر مەرقەدی رسول الله ئیمان ئێنێ! قوڕ بەسەر قەومی بێ کیاسەت و سیاسەت، غافڵێ لە ئایاتی قورئان، قورئان ئیمامە، دەستوور، لاکین موجەڕەد بۆ نوێژ و تەڵاق، نا، موعتەبەر لە ئیقتیدا بە قورئان، جیهەتی حوسنی ئەخلاق، حوسنی ئاداب و تەربییە، حوسنی ئیدارەی عائیلە، ئیدارەی هەیکەلی ئیجتیماعییە، عیباداتیش ئەگەر لەو وەجهە، حوسنی تەئسیری لە نەفس نەبێ، فائیدەیە چەندانی نییە.

مسوڵمانان مع الاسف ظاهیر بینن، بێ تەفەرروسن، ئەوا پەنحاس مسوڵمان بوو، لێدەن، لە دۆڵ و زوڕنایە، هەڵپەڕن لە شەوقی دینی موحەممەدی، ئەوەی قەردی لەسەری بوو، گەردەنی ئازاد، لە دەفتەرەیش ڕەشی کردەوە، جلێ باشیان بۆ کرد، ئیعانەیان دا، زۆر نەچوو، چووە کەرکوك، بۆوە جوو!

شەخسێ هات ماشاء الله چەند بە عیبادەتە، شەو بە خەبەر، ڕۆژ بە

ڕۆژی، بە ئەنواعی خدمەت، خـدمەتی ئەکەن، عـاقیبەت تەڕنەکیـان پـێ ئەدات، ئابڕوویان ئەبات! چەند ئینگلیز هاتن بە ناوی فەقێیەتی، دەروێشی لە وڵات مانەوە، واقیفی ئەسرار بوون، چوونەوە، ڕەزائیلی عیبادیان نەشـر کـرد، دەرەجەی دینیـان دەرخسـت. حەراسـەتێ دڕایەتـێ، تەرەققـوبی ئەحوالی نەبوو، ئەوەشیان ئەکردە دەلیل لەسەر غەباوەتی مسوڵمانان.

وامزانی وەقتێ ڕووس خەوفی هەبوو، لە سەروەتی مسوڵمانان، ساڵێ ئەوەندە نفووسە ئەچێتە حەج، ئەلبەتە سندوقێ عموومیـان هەیە، تـا ئێسـتا بـێ شـك سـەروەتێ زۆر عەزیـم گربـوویەتەوە، ئەگەر دەوڵەتـی ئیسـلام بکەوێتە شەڕ، بە ئەو سـەروەتە، ئاورووپـای شـڕ ئەکـا، جەمعـێ مسـوڵمان بوون، حەتتا خۆیان سونەت کرد، بە ناوی محەمـمەدۆف، عـومەرۆف و عەلیۆف و حەسەنۆف، ڕۆیشـتن بـۆ حەج، تەماشـای مسـوڵمانانیان کـرد، زانیان خەزێنە بۆفە، ئەو خەیاڵە بە دەماغیان دا، عبوری نەبووە، تێگەیشتن صەرفییاتی مسوڵمانان ئەکڤەری بێ هوودەیە، لەبەر مەعنەوییاتی وەهمـی، ئاگایان لە حەقائیقی ماددی نییە، لە هەمـوو تەجاربیی زەمـانە غـافڵن، بە ئایاتی قورئانی جاهیل، عاقیبەتی وای لێ دێ، کە ئەیبینن، کوردی دەڵێ: دۆی ئازموودە، لە ماستی نازموودە چاکترە!

٧١/١٠

## جاسووسی ژنان!

بێینە سەر جاسووسی ژنان، لە شەڕی گەورەی ڕابردوو، چییان کـرد؟ بعد الحرب لە مـوجەللات لە جەرائیـد نەشـر کـرا، حەسـنای وا هەبـوو، غەلەبەی ئەکـرد بەسـەر قومانـدانێ، یـا ڕەئیسـی ئیسـتیخبارات، موتتەلیـع ئەبوو، بەسەر پیلانی حەربی و ئەسراری حکـومەت، خەبەری ئەنـارد بـۆ دەوڵەتـی خـۆی، ئەبـووە باعیسـی سـەرکەوتنی، قائیـد بە خەجـاڵەت و ڕووسیاهی ئەماوە.

لە ئەوائیلی ئینقلابی عوسمانی، ئافرەتێ نەمسایی چۆنی غەلەبە بەسـەر داهیە وەکی عەبدولحەمید خانی کرد؟ حەتتا سـەوقی کـرد، بـۆ کـاغەز نووسین، بە لای ئینپراتۆری نەمسا، کە لەشکر بکاتە سـەر ژۆنە تورکـان، مـوتتەفیقەن لە ناویـان هەڵگـرن، کـاغەز بە دەسـت ژۆنەکـان کەوت،

هەیەجانیان کرد، بووە باعیسی خەلعی عەبدولحەمید خان، بنۆڕنە سیەر و تەئریخی ژنان لە قسوری ملوکان چییان کردیە؟ وە عاقیبەتێ کردەوەیان بۆ دەولەت و میللەت چەند خراپ بووە. لە حەدیسی شەریف ئەفەرموێ: احترسوا بسوء الضن، فاعتبروا یا اولی الابصار!

٧٢/١٠

## شەرع گۆڕایە !

ژنە مسوڵمان لە کافران حەرامن و کافر لە ژنە مسوڵمان حەرامن، تا ئەو ئەواخیرە، مسوڵمان مع الافتخار حیفزی ئەو حوکمەیان کرد، لەم ئاخیرە سسست بوون، شەرع گۆڕایە قانوون. مع الاسف تەجویز ئەدا، کچە تورك مێرد بە غەیرە دین بکات. لە ئەلسینە دەورانی ئەکرد، وەقتێ سوڵتان عەبدولعەزیز خانی عوسمانی چووە ئاورووپا بە سیحەت، لە مەجمەعی مەلیك سوئالیان لێکرد: بۆچی ئێوە ژن لە ئێمە ئەخوازن؟ ئەمما ژن نادەن بە ئێمە!

فوئاد پاشای وەزیری کە لە مەعییەت دابوو، وتی: ژن پێکدان، سەمەرەی ئیمانە بە ڕەسوول، ئێمە ئیمانمان هەیە بە ڕەسوولی ئێوە، ژنتان لێ ئەخوازین، ئێوە ئیمانتان بە ڕەسوولی ئێمە نییە، ژنتان نادەینێ، وەرن ئیمان بێنن، تا من حالەن چەند کچم هەیە، لێتان مارە بکەم!

ئەمما ئەتاتورك ئەمەی تێکدا. حەقیقەتەن من زۆرم لا ئەستەمە، کچە تورکێ بکەوێتە ژێر کوڕێ ئەرمەنی، یا ڕووسی، قەومێ خوێنی باشی هەبێ، حەیفە تێکەڵ و پێکەڵی کا، بە زایعی بدا.

٧٣/١٠

## لە سایەی فەحشییات فڕەنسە هاتە ئینقیراض!

کچ لە ترسی ئاوس بوون، علی الاکثر خۆیان ئەپارێزن لە زینا، ئەمما ژنی بە مێرد، تەبیعی ئەتوانی بە زوبان درێژی بڵێ: لە مێردی خۆی ئاوسە! لەو جیهەتە ناترسێ، لاکین سەرامەدانی غیرەت و ناموسی غەرب وە عالەمی جەدید، ڕێیان بۆ کچیان دۆزیوەتەوە، ئەڵێن: ئەسبابی عقم ئەمڕۆ زۆرە، وە زۆر ئاسانە، کچ مەبادا تووشی عیلەل بێ، ئەتوانێ لەگەڵ هەر کەسێ بێ موعاشەرە بکا، لاکین نەیەڵی ئاوس بێ، کە مێردی کرد، تا یەکدوو ئەولاد بۆ مێردی ئەگەیەنێ، لەگەڵ غەیری مێردی موعاشەرە نەکا، بەعدەهو حورڕە عەلاقە لەگەڵ هەر کەسێ ئارەزوو ئەکا، پەیکا، بە شەرتی ئاوس نەبوون.

لە سایەی فەحشییات فڕەنسە هاتە ئینقیراض، کەم نفوس و بێ ئەخلاق و غیرەت و تەربییە بوو، دوشمنی بیلعەکس خۆی پاراست لە زینا، قووەتی دا ئیزدیواجی مەشرووع، نفوسی زیادی کرد. نەتیجە بە مانگی سەراسەر، مەمالیکی فڕەنسەی هاویشتە ژێر قەدەمی، خولاسە زینا بۆ دونیا و قیامەتی قەوم خراپە.

٧٧/١٠

## جەهلی ژنان لەم سەردەمە زۆرە!

لەناو ئێمە زۆرە، لەبەر نەزانی و جەهلی ژنان، منداڵ نەختێ نەساغ ئەبێ، بێ عیلم و مەعریفەت ئەیخەنە ژێر دەرمانان، ئاخیری ئەیکوژن. جەهلی ژنان لە ئەییامی ئیمە، مع الاسف بە دەرەجەیەکە، لەو ساڵانە سۆرکە کەوتبووە ناو منداڵان ئەمما زۆر مودهیش بوو، ژنێ لای خۆی بە مەعریفەت و زانا بوو، منداڵەکیان هێنابووە لا، سۆرکەی گرتبوو، چاوی تێك چووبوو، ناو زاری ئاوسا بوو، ئەیوت: ئەوە چاوی دێشی!

دەرمانی چاو ئێشی تێ ئەکرد، وە گەرووی کەوتووە، گەروو هەل ئەداوە، ئەی دەست خۆش ئەی حەکیمەی فاضلە!

لە مەناقیبی عومەریدا دیومە، شەوێ لە دەوری شاری ئەگەڕا، گوێی

لێ بوو منداڵێ هەر ئەگریا، ژێر نەدەبوو، بە داکی وت: ئەمە بۆ ژێر نابێ؟!

وتی عومەر هەتا منداڵ لە شیر نەبێتەوە، لە بیت المال چی بۆ دانانێ، ئەوەش هێشتا وەقتی فطامی نەهاتووە، ئەمما لە شیرم کردیتەوە، تا عومەر شتەکی بۆ تەخصیص بکا.

عومەر فەرمووی: داخوا چەند منداڵی وات فەوتایە!

ئەمری کرد: ئەو قانوونەیان تەعدیل کرد. زۆر ئەقەومێ ژنەکی بە ورتکە، مێرد ئەکات، منداڵەکانی ئەفەوتێنێ. وە ئیللا لەگەڵ مێردی دووەمی ڕێك ناکەون، دیارە ئانزیادە ژن موکەللەفە بۆ حیفزی منداڵ!

٧٧/١٠

## هەر قەومێ ئازا بن، ژنیان ئازان

ئەساسەن حەیات و مەماتی مەعنەوی و ڕووحی لە تەرەف داکەوەیە، دایك ئەتوانێ بیکاتە ئینسانی نافیع بۆ هەیئەتی ئیجتماعی، زاتێ زیندی، وە ئەتوانێ بە ڕەزائیل بیمرێنێ، بیکاتە شەخسێ سفیل و عاطل و باطل و جاهیل.

ناپلیۆن ئەڵێ: ئەوەی لانکی ڕادەژێنێ، ئەتوانی ئەرزی ڕاژێنێ، بهەژێنێ!

دیققەت بفەرموون، هەر قەومێ ئازا بن، ژنیان ئازان، هەر قەومێ ترسنۆك بن ئەساسەن ژنیان ترسنۆکن، لەوانیان وەرگرتیە. جەمعێ ئەبەن بۆ عەسکەری، داکیان ئەڵێن: ڕۆڵە بڕۆن لە حیمایەتی خودا بن، خدمەتی وەتەن بکەن، شیری مەتان لێ حەڵاڵ بێ، خیانەت نەکەن!

ئەوانە عەسکەری باش ئەکەن، ئەیبەنە سەر. جەمعێ تر داکیان ئەگرین ولوولە و زیرە زیر؛ وەی ڕۆڵە! چاوی داکت کۆر، کوو دەبی، ڕۆژێ سێ جارانت نەبینم؟ ئەو ژیانەم لە دووری تۆ ناوێ، خوا هەڵی نەگری، پێغەمبەر قبوڵی نەکا!

قوڕی لەسەر سەری خۆیان دادەنێن، لەناویان شین و شەپۆڕە!

ئەو جەمعە ئەچێ بۆ عەسکەری، چۆن عەسکەری ئەکا؟ خولاصە

أول الامر حەیاتی دەوڵەت موتەوەققیفە لەسەر حەیاتی ئەفرادی مەنازیـل مەداری ئەم حەیاتە، ئەووەڵەن داك، ثم باوکە.

٧٩/١٠

## هەرچەند ئیمان بەقووەت بێ، بەدەن گۆشتە، مودافەعەی گوللەی پێ ناکرێ!

لاشــەك هەمــوو قەومــێ، پــێش تووشــبوون زۆر کەس خۆیــان هەڵئەدەنەوە، ئەگەر بکەوینە مەیدانی کارزار، وا ئەکەین؛ یارەببی خـوایە ڕێکــی خەی، زوو بچیــنە غەزایە! ئەممــا کە قەومــا کەم کەس خــۆی ڕائەگــرێ، خصــوص مەلا و شــێخێ کە وەقــائیعی حەڕبیــان نەدیبــێ، ئەووەلی وا ئەنوێنن، بە گۆپاڵ تاودەنە سـەر تۆپخـانە، لاکـین کە تەقەی تۆپ هات، ئانێ خۆیان ڕاگرن، هەڵێ! ئەبنە باعیسی شکستی لەشکر.

سەبەب بە موداخەلەی مەلایـانی بـێ سیاسـەت و تەجـرەبە، ظـاهیرەن دیندار و ئیمان قەوی، زۆر جـاران دەوڵەتـی عوسـمانی تووشـی شـەڕێ بـوو، ومـع الاسـف شـکا، زۆر لازمە، مەلایە کە ئاگـاداری سیاسـەت و ئیـدارە نەبـێ، مـوداخەلەی ئومـوری حکـومەت نەکـا، وە بە حیکایـاتی کەونییەی بێ سەنەد و ثبـت، خـۆ و خەڵکـی هەڵنەخەڵەتێنـێ، هەرچەنـد ئیمان بەقووەت بێ، بەدەن گۆشتە، مودافەعەی گوللـەی پـێ نـاکرێ، بە بەر ساچمەی بۆمبا کەوی، پارچە پارچە ئەبێ. ئەبایە مەلایـان، ڕوئەسـای دین لە قورئان نەختێ لە سیاسـەت و تەدبیـری حەسـەنە وەرگـرن. بەنـی ئیسرائیلی بە نەبییەکی خۆیان وت: پادشایەکمان بـۆ دانـێ، لە ڕێـی خـوا حەڕب بکەین! ئەویش بۆی دانان، ئایا ئەوانە لە نەبی ئاگادارترن!؟

٨١/١٠

## ئەوەی فێسی لەسەر نابا، ئەیانوت: ئەمە کافر بووە!

مع الاسف مسوڵمانان قووەت و قودرەتی ئیختیراعیان نەبوو، حسب الطاقەت ئەسلیحەیان لە غەرب ئەکڕی، تا ئەوان فێری ئیستیعمالی ئەبوون، سیلاحی چاتر ئیختیراع ئەکرا، ئەوی پێشی سقوطی ئەکرد، ناچاری ئی نوێیان ئەکڕی، ئەمەش لە تەڕەف حکومەتی عوسمانی وا دەبوو، زۆر تووشی هەرا هەرا ئەبوو، لەگەڵ مەلایان، ئەمە بیدعەتە، نابێ حەتتا ئەوەی فێسی لەسەر نابا، ئەیانوت: ئەمە کافر بووە!

قسمێ سەلەفی هەر لەسەر هەوای کۆن مانەوە؛ شەمەندوفەر بیدعەتە، تەیارە بیدعەتە، ئەو ئەلبیسە و ئەسلەحە گشتی بیدعەتن، نابێ مسوڵمان ئیستیعمال کەن. ئەمڕۆش کە ئەڵمان بە دەبابە دێتە مەیدان، بە پەڕەشووت عەسکەری موجەههەز لە ئاسمان ئەنێرێتە سەر دوژمنی، بە واسیطەی ئەم ئالاتە، بە زەرفی مانگێ، دەوڵەتەکی وەکی فڕەنسەی زێر و زەبەرد، قسمێ لە ڕوئەسای دین: بیدعەتە!

ئەم قیوداتە حەقیقەتەن بووە پابەندی مسوڵمانان، مەنعی کردن لە تەرەققی، وە بۆ ئیستیلای دوژمن، حەققەن بووە موقەوویيە عەجیب. عەلاوەی سەلبی قووەت و ئیختیار، عەلاوەی ئیعتیماد لەسەر کەرامات و حیکایاتی بێ ئەسل و ئەساس. لاکین ئەگەر عولەمایان ڕێیان دابا، ئایا ڕوئەسای دونیا، ئەهلی عیرفان بۆ ئەم ئوممەتە ئیشی باشیان ئەکرد؟ بڕوا مەکە، ئەوانیش بە دوای هەوا و هەوەسی خۆیان کەوتووین، وەکی حالەن ئەیانبینن. ئەجانیب بۆ تەرەققی و تەعالی خۆیان چی ئەکەن؟ ئەوانی ئێمەش چی؟

ئەمڕۆ لازمە هەموو لایە، وەك بنیانی مەرصوص مادده و مەعنا یەکتر بگرین بۆ حیفزی حەیات وێکڕا نابن، حەربی ئێستا لەناو عاردی، لە هەوا، لەسەر بەحری ئەکرێ، سەف و مەف نەما، سواریش بۆ شەڕ، دەوری چوو، وەسائطی صنعی و سولطەی طبیعی ساقطی کرد، ئەدای صلاة الخوف ئەمە ناکرێ. ئانێ لە حەرەکاتی دوژمن غافڵ بن، وای بە

حاڵیان، بە تۆپ بە ڕەشاشە، بە تەیارە، عەسکەر بونبەردومان ئەکرین، ئایا نویژ بە خەیاڵ دادێ؟ بە خاطر ناکرێ، چ جایە بە ئیماء!

بۆ ئەو ئوممەتە موجەددیدێ زۆر لازمە، لاکین ئەویشیان گۆڕی، موجەددید ئەوەی کۆن بوو حسب الزمان بێ کەڵك ما، ئەبێ بیگۆڕی بە شتێ نوێ، چاك، موافیقی عەصر. موجەددیدی دونیامان لازمترە، لە موجەددیدی دین، ئەو مەعنایە کە عموم تێئەگەن، ئەمڕۆ بە هەزاران تەکیە و زاویە و خانەقا زۆرە، لە مەداریسی ئێمە، مەعمەلی ئەسلیحە، ئەلبیسە، حەوائیجی عەصر نابینی، ئەگەر ئەو ئیختیراعاتە لە دەست مسوڵمانان هاتبا دین وای بەسەر دەهات؟ مومکین بوو ئەکثەری کافرەکان مسوڵمان بووبان ئەیانوت: ئەوانە لە ئاثاری دینی حەقە!

خوای تەعالان ئەوانەی لە ڕێی وی، لەسەر عەردی صەف بەستەی حەرب ئەبن، خۆش بوێن، بە هەزار دەرەجە ئەوانەی بە تەیارە لە جەووی سەماء بە غەوواصات لە قەعری بیحار لە ڕێی وی شەڕ بکەن، خۆشتری ئەوێن. حوکەمای غەرب تا تەرکی دینیان نەکرد نەبوونە موختەریع، بۆیە بوونە دوژمنی دین، بەڵێ دینی ئیجتیهادی تابیعی ڕەئی قەشە و مەشە بێ حەققە عەداوەتی لەگەڵ بکرێ، فڕێ درێ. لاکین دینی ئیلاهی مایەی تەعالییە، ڕوحی تەرەققییە، خودا صانیعە، صانیعی زۆر خۆش دەوێ، خەلیفەی خودا لە عەردی صانیعن، موصلیحە گەورەکانی موددەببیرن، أما مع الاسف سیاسەت عیززی عیلمی حوکەمایانیشی بە فەساد دا، ئەوەی ئەوان بۆ سەعادەتی بەشەری ئیختیراعیان کرد، سیاسیون لە ئیمحای بەشەری سەرفی ئەکەن، نازانم بڵێم: چی؟!

خودا بە لوتف و مەرحەمەتی خۆی ڕەحمێ بە بەشەرییەت بکا. دیارە جەنابی ڕەسوولی ئەکرەم، بە قەول و عەمەلی ئەو نەوعە کەسە، متأذی ئەبێ.

٨٣ /١٠

## کوردیش هاتوونەتە خەڵەتان، گۆیا بعد النصر حکومەتیان بۆ تەشکیل ئەکری!

بەند و باوی دەروێش و سۆفییان، مەجذووب و حاڵداران، ڕەواجی فوق الحدی دا بە شیوخی طەرائق، ئێستا دیعایەی سیاسییونانە، ئەڵمانی و ئینگلیزی، نازانین ئەم حەربە ئاخیرەکەی کوو ئەبی؟ لاکین دیعایە کەففی ئەڵمان تەرجیح ئەکا، خصوصەن حالەن زۆر غالبە، لە بەعزێ کەلیمات، کوردیش هاتوونەتە خەڵەتان؛ گۆیا بعد النصر حکومەتیان بۆ تەشکیل ئەکات. خەیاڵی باطل، جووی فەلەستین لەسەر ئەو هەموو سەعی و کۆشش و پشتیوانی بەریتانیا العظمی تەشکیلی پی نەکرا، کورد ئەیکەن؟ لەسەر ئەو هەموو سستی و تەفرەقە و بوخل و ئیثاری نفس علی الغیر. الحاصل قەومی فاسق و زاڵم و بێ مروەت و ئینساف، بێ عەهد و میثاق، بێ وەعد و شەرەفی بەشەری، خوا هیدایەتی نادا، قابیلی هیدایەتی نییە، تا الحالة هذە، یێ کوردیش لەسەر ئەم تەفرەقە بوویتە ئاردی ناو دڕی، قابیلی یەکگرتنیان نییە. چارە ئیتتیحادە، لەگەڵ عەرەب، لەگەڵ تورك، لەگەڵ ئێران، بە شەرتی بەقای لۆغەت و بەعزێ عەنعەناتی قەومی، تەضییقیان نەکەن، بۆ تەعریب و تەتریك و تەفریس، ئەگەر ئینساف کەین، هەموومان مسوڵمانین، ڕابیطەی دین کافییە بۆ تەئلیفی بەین، ئیمانی پاك، شیرازەبەندێ چاکە.

٩٠/١٠

## شێخە جاهیلەکان، بە کەیفی خۆیان مەلایان داژۆن!

سەبەب بە فەقر و زیللەتی مەلایانی حەقیقی ئیسلامی کەس ڕوو لە دەرسی دینی ناکا، چونکی پاش سەعییە زۆر ئەبێ بە مەلا، مەلایە چاك، پاش ئیجازە چی بکا؟ چی بخوا؟ بێ مەئکەل، بێ مەشرەب، بێ مەسکەن، بێ مەلبەس، جیران، لەوێ لەوێ، عومری عیلمی بێ هوودە ئەڕوا. عالیم زۆر کەمن ئەوی هەن مع الاسف مەعلوول و مەغلووبن، شێخە جاهیلەکان، بە کەیفی خۆیان دەیانژۆن، سوفەلای ئوممەت کە

ئەکثەری تەبعەن سوفلان، دوایان ئەکەون، لە هەموو نیظام و ئینتظام و دینێ دەرئەچن. حاسڵی ئەمڕۆ کائینات خەریکی کوژاندنەوەی نووری خوان، عینایەتی ئیلاهی ئومێدە، بەکار بکەوێ ئەحوال بگۆڕێ، نووری ئیسلام حیفز و زیاد کا. حیفزی دین بە مەلای چاکی بەقووەت و قودرەت ئەکرێ، مەلای فەقیر و بێ هێز، بێ عیرق وەلەو عەللامەی دەوران بێ، چی پێ ناکرێ یا نور السموات والارض، نووری دینی حەق بە قووەت بکەی، دونیای پێ مونەووەر بفەرمووی!

٩١/١٠

## بە حاکمی سیاسیی ئینگلیزم وت!

کە ئینگلیز ئیستیلای وڵاتی کرد، ڕۆژێ بە حاکمی سیاسی ڕەندێلم وت: ئێوە بەناوی مەسیحی غەلەبەتان لەسەر ئێمە نەکردیە، بە ئالات و ئەدەواتی جەدیدەوە، سەروەت و دەسیسە غەلەبەتان کردیە، ئەگەر بە ناوی دین بێنە پێش، موحەققەق هەر ئێوە مەغلووبن.

وتی: ئێمە ئەوەی ئەزانین!

٩٣/١٠

## من ئیمانم بە کەرامەتی ئەولیا هەیە، بەڵام!

من ئیمانم بە کەرامەتی ئەولیا هەیە، لاکن خەواریقی جای ئیعتیماد نییە، نابێ بە قاعیدە، نابێ قاعیدەی پێ تێك دەن.

٩٤/١٠

## دوعا!

ئیلاهی لەو شەڕە چەپارەی مسوڵمانان دەی، چییان پێ ناکرێ، بێ ئەسبابن، ناڵێك و ناڕێکن. ئیلاهی بە حورمەتی ئەو موئمینانە نەهری قەمەرانم دەیەوە لە دەست حکومەتی قورتار کەی، ئەعدای دینم پێ خۆش نەکەن، ***حرمة بيتك الحرام، وروضة رسولك، والحجيج آمين، ثم آمين*** لە

ڕۆژی دووشەموو ٧ی زیلحەججە بە حیسابی تەقویمی ئێرانی ١٣٥٩هـ
٩٥/١٠

## دینیان کردە مایەی عەداوەت!

سبحان الله دین بۆ تەوحیدە، کەچی بەشەر کردیە مایەی عەداوەت چ جایە ئیختیلافی دین، ئیختیلافی مەزهەب، ئیختیلافی مەشرەب و مەسلەك، بە ئەدنا خیلافێ ئەیکەنە مایەی عەداوەت و جیدال و قیتال.
٩٦/١٠

## حەواری چۆن دەعوەیان کرد؟

تەماشای سیرە بکەی، ئی صەحیح کە عولەمایانی ئێمە قبوڵیان کردیە، حەواری چۆن دەعوەتیان کرد؟ تەلامیذیان بە ئەقطار بڵاو کردەوە، یەکێ بۆ لای ئەنادۆڵ، یەکێ بۆ لای ڕۆما، وهکذا الی الجوانب. ڕوویان کردە مەخلووقات، صەلب ئەکران، ئیعدام ئەکران، یەکێ دی لە جێی وی سەعی زیاتر ئەکرد، زۆر بوون، لاکین چەند جاران ملووکی ڕۆم و ڕۆما بە دەسائیسی یەهوود مەسیحییان ئەکوشتن، قڕانی پێ دەخستن. لە عەسری بیرۆنی ئەوەندەی کوشتن، نێزیك بوو تەواو بن، لە موجەللەی هیلال ئەڵێ: مەسیحی لە نەوت هەڵئەکێشان، ئاگری تێبەر ئەدان، ڕێ و باغاتی پێ تەنویر ئەکردن.

وە لە دەوری چەند ئەباطیرێ دی کاریان پێ کراوە، قەلەم ناتوانێ بینووسێ، تا قوستەنتین مسوڵمان بوو، مەسیحی قووەتیان ساند، بوونە ساحێبی دەوڵەت. ئەوجا تۆڵەیان لە یەهوود کردەوە، زۆریان بە بەهانەیە، لێ ئەکوشتن، ئەگەر ئەو ماجەرایە بنووسرێ زۆر درێژ ئەبێ.
٩٦/١٠

## بە حوشتر مەیە بۆ موقابیلی دەبابە!

بعد تهیء الاسباب و متوکلا علی الله ان یمدك، نەصرەتی دینی خودا بدە، بە مطوار هەڵمەکوتە سەر تۆپخانە، بە حوشتر مەیە، بۆ موقابیلی دەبابە. دائیم لە تەجەددود بە، ئیصرار لەسەر ئوموری کۆنە مەکە، هەموو شتێ قەدیمیش فڕێ مەدە، بە ئەخلاق و سەبر و مەتانەت بە، ثابت قەدەم بە، لەگەڵ ئەفرادی ئوممەت وەك بنیان مەرصوص یەکبگرن، بە ڕەقس و سەما و مەشرووبات و مەئکولات و مەلبووسات و موساحەبەی ڕاقیساتی کاسیاتی عاریات، مایەی مێردی لە قیس خۆتان مەدەن، پیاو بن، بکل معنی الکلمة، وإلا دائیم ژێر کەوتی ئەبن، ئومێدە ان شاء الله خودا ڕەحمێ بە دینی حەق بکا، نووری حەق هەڵکاتەوە. ٨ی زیلحەججەی ١٩٤١.

٩٧/١٠

## لەبارەی تەزکییەی نەفس!

برادەران ئەووەلەن لازمە تەزکییەی نەفس، پاککردنی لە ئەخلاق و ئەوساخی قەبیحە، ئەوجا عیلم، عیلم ئەگەر لەسەر دڵی پاك و ئەخلاقی چاك دانرا، حەقیقەتەن ساحێبیشی و خەڵکیش، خێر لەو عیلمە ئەبینن. وە گەر لەسەر دڵی پیس و ئەخلاقی بەد دانرا، ساحێبیشی بە فەساد ئەچی، وە عالەمیش بە فەساد ئەبا، بۆیە ئەهلی عیلم ئەبن بە حەکیم، حەکیمی ماددی و مەعنەوی، ئەبن بە ئیکسیری حەیاتی ئیجتماعی، وە بەعزێ ئەبن بە جەربەزە، دەججالی ماددی و مەعنەوی، زەهرەی حەیاتی ئیجتماعی. یەکێ ئەبێ بە مورشید و هادی، یەکێ ئەبێ بە فضل و عادی، مغالط و مشاغب و علیم اللسان، منافق القلب.

١٠٠/١٠

## من لە دژی مەعاریفی ئێوەم!

دەفعەیە سلێمان نظیف بەگ بە منی فەرموو: کەسم نەدیوە لە ئەربابی عەمامە، وەکی توو موحیببی مەعاریف!

عەرزم کرد: مع أنە من لە دژی مەعاریفی ئێوەم!

فەرمووی: بۆ؟

وتم: مەعاریف لەسەر ئەخلاقی ڕەزیلە و موفسیدە دانرێ، زۆر بەدنیهاد ئەبن، ئەگەر نەبنە ئەهلی مەعاریف ناتوانن زەرەر بە کەس بگەیەنن. ئەمما کە بوونە ساحێبی عیلم و قەلەم، بە شەرارەیە دونیای ئەسووتێنن. ئەمما ئەووەلەن حوسنی تەربییە، بەعدەهو تەحسیلی مەعاریف!

فەرمووی: حەققەن ڕاستە.

ئەبینی یەك سیلاحەکی بەدەستەوەیە، بۆ صەلاحی عالەم ئیستیعمالی ئەکا، ئیعادای بەشەرییەت پێ ئیزالە ئەکا. یەکێ تر عەینی سیلاحی بۆ فەساد ئیستعمالی ئەکا، برای خۆی پێ ئەکوژێ، بناء علیە ئەم تەرتیبە زۆر مەعقوول و مەقبوولە!

١٠١/١٠

## ئینسان ئەو ئینسانەیە، خۆی ببێتە ئوستادی خۆی!

برام! ئەگەر ئینسان هەر شت لە کتێب وەرگری، لەو قەید و لەم حاشییە بنۆڕیە تا شتێ تێ ئەگا، ئەو کەسە نابێ بە هیچ. ئینسان ئەو ئینسانەیە، خۆی ببێتە ئوستادی خۆی، بە نەزەری خۆی شت بزانی. ئەوانەی سەرامەدی ئیختیراعن، لەو قەڕنانە، زۆریان نەخوێندەوارن، ئەمما تەجرەبە و تەتەبوعاتیان زۆرە، دائیم لە تەفەککور دابوون، ئارامیان نەبووە، تا مەتلووبیان کەشف کردیە، وەك قوتبی مەنتقی ئەفەرمووێ: موفەککیر ئەو کەسەیە، خۆی نەزەر بکا، ئەوەی بە ڕێی خەڵکی دا بڕوا، موفەککیر نییە!

حەقیقەتەن وایە طفیلی یە لازم بوو، ڕەسوولی ئێمە، ئوممی بی، ئەمما

ئوممەت ئەبا، بالمرة لە ئومییەت دەرچێ، کیتابەت و عیلم لەناویان تەعەمموم بکات. ئەقەللەن لە سەدی هەشتای زانا و میرزا بێ، وە لای حەقیر (قبل کل شیء) تەربییە! ئاغایە بە تەربییەم لا چاترە، لە ئەفەندییە بێ تەربییە!

١٠٢/١٠

## مەلیك تاوسی ئەهێنا، فڕێی ئەدا سەر عەردی، بە قۆندەرە ئەچووە سەری!

ساڵێ عومەر پاشای ئیالە، هەیکەلی مەلیك تاوسی ئەهێنا، فڕێی ئەدا سەر عەردی، بە قۆندەرە ئەچووە سەری، پێلەقەی پێدا ئەدا، داسنییەکان ئەگریان، ئەیانزیڕاند، یەقەی خۆیان ئەدڕی، زێدە مەیلیان شەدید ئەبوو. مع أنە ئەبایە بە جارێ دەست لە مەلیك تاوس هەڵگرن، عیبادەتی نەکەن، ئەوانە بە مەدارایە حەکیمانە، تەدریجەن، مومکینە چارەیە بکرێن. شەدەڵەیی بە چی وا خۆیان گۆڕییە؟ خۆیان لە عەقڵ و دین و عیلم و عیرفان کردیە، مەیلێکی کەرانەیە، بە عەقڵ چارە ناکرێن، وەك غۆستاف لۆبۆن ئەڵێ: مەسەلی عومومی هاتە جۆش و خرۆش، عەقڵ خۆی ناگرێ، وەك پانگە لاچك با ئەیبا!

خوا چوویتە ناو زگی مانگا، موقەددەس بوو، ئەوە ئیعتیقادیاتە، ئەساسەن، لە ئیضلال و ئیغوای دا ئیبلیسییە، کەمێ بە مەیل و عەواطف تەبەددول ئەکا، ئیمحای غایەت مشکل ئەبێ.

١٠٢/١٠

## جوولەکە!

جوو سەبەب بە کردەوەی خۆیان، لەگەڵ یەك، وە لەگەڵ ئەقوام، وە دوەلی هەم جیوار، بالمرة ئەشکان، ترسیان غالبە. حەتتا تەئثیری لە سولالەی کردینە. ئەمڕۆش باز ئەو ترسنۆکەن، غیرەت و جەسارەت و شەهامەتیان نییە، عەرەبەکانی تازە بووبوونە جوو، قووەی عەرەبییان مابوو، نەوعەن ما، موقابەلەیان ئەکرد، ئەمما ئەویش چ نا، حەتتا ترسیان

لە موئمینان زیاتر بوو، لە ترسی خوا.

لەو چەند شەوانە ئەحمەد دەباغ زاتێکە لە ئەهلی فەلەستین هاتیتە عێراق، ئەمساڵ لە متەوەسطەی مەردەسەی کۆیە وتی: ئێمە هاوار ئەکەین لە دەست جووان، ئەمانکوژن، تاڵانمان ئەکەن. حاشا وا نییە، درۆیە، جەماعەتێ زۆر لە جووان، موکەممەل و موسەللەح، ناتوانی بەرابەری مسوڵمانێ ڕاوەستێ، لاکین عەسکەر و پۆلیسی ئینگلیزی مودافەعەیان لەسەر ئەکات، ئێمە بەر تفەنگان ئەدەن!

جوو ترس و حوببی ماڵ و حەیات ئیتسللای بەسەردا کردینە، ئەگەر بە حیلە و دەسیسە و مەدارا و کلکە کوتە، ئیشیان بۆ چووە سەر، باشە، وە ئیللا چییان پێ ناکرێ، بۆیە ئەبەدەن ئارەزووی مەوت ناکەن، حەیاتێ بە زیللەتی هەزار هەزار هەندەی مەوتی بەغیرەت لایان خۆشترە. صددیقی ئەکبەر بۆ قائیدی ئەعزەم خالیدی بن وەلیدی ئەنووسی: تەڵەبی مەوت کە تا بگەیە حەیات. قائیدی ئەعزەم بۆ سوپاهسالاری ئێرانی ئەنووسی: لەشکری من ئارەزووی کوژران کردنیان زێترە لە ئارەزووی ئێوە بۆ حەیات!

بەعزەن ئەینوسی: ئەوەندەی ئێوە خەمرتان پێ خۆشە، عەسکەری من مردنیان پێخۆشتر و بە ئیشتیهاترە!

وایە قەومێ ئیستیحقاری حەیات نەکا، ناگاتە حەیات، لە مردن ترسان کاری مەردان نییە، زڕە واعیز و زڕە شێخ ئوممەتیان لە مردن ترساند، غەڵەتیان کردن. سەیری بەختی واژۆن، قەومی ئێمە بە نەزەر بە عەدوو زۆر کەم دەترسن، حەیاتیان زۆر خۆش ئەوێ، بە نەزەر خۆبەخۆ حەیاتیان لا گەلێ بێ قیمەتە، برا برای ئەکوژێ، لەسەر کۆتکە جۆیە، دوو مستە نۆك!

١٠٥/١٠

## ئێستا لە کۆیە ئەو عادەتە هەیە!

ئێستا لە کۆیە عادەتە نەختێ پێش وەقت لە بازاڕ بانگ ڕادێرن الصلاة یا أمة محمد الصلاة.

١٠٧/١٠

## تەعەددودی خوتبە!

تەعەددود بە نسبەت کەثرەتی نفووس ئەبێ: هەولێر لە دوو جێ باشە، کەرکووك چوار جێ، بەغدا هەشت، زیتر! تا لە بەغدا مزگەوتی زەلام زەلامیان دروست کردیە، بۆ جومعە! لاکین ئێستا ئەکثەری بۆشن، حکومەت نازانێ چییان لێ بکات. خۆزی ئەکثەری مەعمەلی ئەسلەحە بان، شارێ دوو ملیۆن نفووسی هەبێ، قابیل نییە، لە مەوقیعێ گردبینەوە، ئەگەر قەڵەباڵغ بوو، لە میکرۆفۆن خەتیب دەنگی خۆی بڵاوکاتەوە.

پارەکە پێش مەوسیمی حەج چەند کەلیمەکم نووسی، دائیر بە خوتبەی خەتیبی عەرەفات، لایق وابوو، مەلیك عەزیز، خۆی خوتبە بخوێنێ، محەطەی ڕادیۆ لای دروست کەن، لە ئافاقی ئیسلامییە گوێیان لە خوتبەی مەلیك بێ. تەعەددودی جومعە موجیبی تەفرەقەیە. لە سالفی زەمان، لە مەرکەزی حکومەتی سوڵتان موزەففەری جومعە بەس لە جامیعی قەلعە ئەکرا، شێخ محەمەد سەعید سەعی کرد، کە جومعە لە خانەقاش بکرێ، کەشماکەشێ زۆر بوو، حەتتا فتوایان لە باپیرم حاجی کاکە مەلا ئەسعەد جەلیزادە، تەڵەب کرد، فتوای بە عەدەمە جەواز دا، دوایە بە ئەمرێ ملووکانە ڕوخسەت درا، عەداوەت کەوتە بەینی دوو تائیفەی گەورەی هەولێرێ، حالەن دەوام ئەکا. وەقتی لە هەولێر تەعەددودی جومعە لە چوار و پێنج تێپەڕی.

## لەتیفە:

مەشهوور بوو ڕۆژێ لە هەرتەل، خەڵکەکە موعەتتەڵ ئەبن بۆ ئەدای جومعە، خەتیب دیار نابێ، لە میعاد دابێ، گاوانی گوندی ئەڵێ: ما ڕاوەستاین؟!

-لەبەر ئیمامی، دیار نییە خوتبەن بۆ بخوونی!

ئەڵێ: بەخوا ئەمتای خوتبە وا لەبەرە، ئەوەندەم گوێ لێ بووە هەموو جومعان هەر ئەو خوتبە خووندرایە، گەر ئەڵێن ئەزی خوتبە بۆ ئەخوونم، چ فەرقی هەیە؟!

ئەمما من خۆم دیم، ڕۆژێ لەسەربانی حەوزی مزگەوتی خۆمان دانیشتبووم، پیاوێ هەروا سەرەتاتکێی ئەکرد و ئەگەڕایەوە، منیش بانگم کرد: برادەر چ ئیشت بە من هەیە؟

وتی: بەڵێ، ئەزی شاورییم، زۆر لەمێژە خەتیبن هەر یەك خوتبە ئەخوێنێ، لەبەر دڵی بێزایە، ئەگەر ئەمرت کردبایە، فەقێیە، سێ چوار خوتبەی جەنابتی بۆ نووسیباینەوە، زۆر مەمنوون ئەبووین!

الحاصل جومعەش وەکی حەج بێ فائیدە دەرچووا! هەیئەتی ئیجتیماعی لەم دوو ڕووحە مەحرووم بوو، سەعی بکەن بۆ ئیصلاح.

١٠٩/١٠

## سوننە و شیعە!

لە ئەوائیلی تەشکیلی حکومەتی عێراقی گۆیا عومەر و عەلی موسالەحەیان کرد، سوننی و شیعی ڕێك کەوتن، یوسف سویدی و محمد صەدر موتتەحید بوون، لەسەر ئەوە ڕۆژی جومعەیان ئیختیار کرد بۆ تەعطیل، وە موجتەهیدێ جەعفەری بێ موبالات و بێ شەرم، بەو ئایەتە (فَاسْعَوْا إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ) ئیستیدلالی هێنا، لەسەر تەعطیلی ڕۆژی جومعە. سبحان الله هیچ مەلایە ڕەددی لێ نەدا.

١١١/١٠

## بەو ئەواخیرە قسەکیان بە زوبانی من هەڵبەست!

قسمێ لە ئەهلی ئیمان ئەڵێن: قورئان هەموو شتی تیـایە، بەو ئەواخیـرە قسەکیان بە زوبانی من هەڵبەسـت، یەکـێ لە ئینگلیـزان حـاکمی سیاسـی ڕانیە، ناو **کۆك**، گۆیا ڕۆژێ دێتە لای من لەسـەر پـا ڕادەوەسـتی، ئەڵـێ: ئێوە ئەڵێن هەموو شت لە قورئانێ دایە، ئایا ئەوەی تیایە کە من لای تـۆ ڕاوەستم؟

گۆیا منیش ئەڵێم: بەڵێ ئەو جوملەی (وَتَرَكُوكَ قَائِمًا [(١)]) ئەخـوونمەوە، زۆر حیرەت ئەیگرێ! حەققەن ئەمە ئیفتیرایە، تەحریفە، لە من ناوەشێتەوە. پاشی بەینێ لە مجلەی العالم الاسلامی لە مەقالەی بهجة الاثری م دیـت، ئەویش نەقلی ماجەرایە وای ئەکرد، ئەمما پێی ڕازی نەبـوو، بەهجەتـیش وەکی ئێمە ئینکاری ئەو دەعوایە عامە ئەکـا، ئەگەر بەو تەرزەی بەعـزێ ئیددیعای ئەکەن، فەرقی دەلالەت و تەتبیق ناکەن. ئەتـوانین بڵێـین؛ **ظرب زید** هەموو عیلمی عالەمی تیایە!

١١٣/١٠

## مەلایەتی بە شرح مغنی و عبدالله یزدی و گەلەنبەوی تەواو نابێ!

گەلێ مەلا هەن، عومری خۆیان لە ڕێی دین سەرف ئەکەن، کەسـێ تر بە پەڕۆ فرۆشتن و تووتن داگرتن ئەبنە دەوڵەمەند. مەلای بەسـتەزمان چاوەنۆڕە کەی مەرحەبایەکی لێ ئەکا، دوو مەنگەڵـی زەکـاتی ئەداتـێ، خواش لە خیر الرازقینی خۆی ناکەوێ، با بۆ قیامەت بێ! ئەمما لە دنیاش هەر ئەبێ چارە نییە ڕزق لە خوا بخوازین... دامەنیشە بڵێـی ڕەببـی ڕزقـم بدە، نابێ هەیئەتـی عمـوومی، ئەبـێ سـەعی کەن، خصـوص لە عەسـری

---

(١) سورەتی الجمعة/١١

ئێمە، ماڵی دونیا بوویتە ڕوکنی سەلامەتی دین. ابن الجوزی مەلایە زۆر مقدمە، لە کتابی صید الخاطر ئەفەرموێ: بۆ مەلایان لازمە حیرفەیە فێربن، گوزەرانی پێ بکەن، چونکە ئەوەی (مع المسار والافتخار) مەلایان بەخێو ئەکردن، نەمان، لەو تاریخەی وابووە، ئێستا هیچ.

مەلای عەسر لە خەلکی زیاتر ماڵی پێ لازمە، هەزار کتێب هەیە، مەلا پێی ئەوێ، جاهیل بە خەیاڵی دانایە، ابن الجوزی ئەفەرموێ: تا ئەمڕۆ بیست هەزار موجەلەد کتێبم موتاڵەعە کردیە، ئەکثەری ئی خۆی بووە. شێخ ئیبن تەیمیە ناوی چەند کتێبێ ئێنێ، هەر ناویشمان نەبیستیە، مەلایەتی بە شرح مغنی و عبدالله یزدی و گەلەنبەوی تەواو نابێ.

١١٤/١٠

## موراقەبە لای من چییە؟

موراقەبە لای داعی[1] بتپەرستییە، مضجرە، خراپە ئەگەر شێخ شێخ بێ، خۆی بە فەریادی دڵی مورید ئەگا، فیوضاتی ئەهاوێتێ، حەتتا سەبەبە بە موراقەبەی شێخان، مسوڵمانان شەمائیلی رسول الله یان لە فکر کرد، لەبەر تەئەممول لە شکلی شێخێ، خەلیفە و مورشید، زۆر لێك عاجز ئەبن، لەسەر موراقەبە، حیکایەتیان زۆرە، تەفسیر هەڵی ناگرێ. مەقسەدی هەموویان هەدمی دین و میللەت و دەوڵەتە، بەناوی دین، لە دینی حەق لادا لە وە ئیللا میللەتی محەمەدی لە کێ؟ لەهو و لەعب و موراقەبە و سرتە سرتی خەتمە لە کێ؟ بنیانی مەرصوص کوجا؟ خەلوەت و حای و حوویی کوجا؟ ببین تەفاوەتی رە ئەز کوجاست تا بە کوجا؟ یا سلام، سلم.

١١٦/١٠

---

(١) مەبەستی خۆیەتی مەلای گەورە.

## نیفاق و سیاسەت یەك شتن!

نیفـاق و سیاسـەت لە وادیە دان، یەکـن، گەرچـی حسـب الظـاهر سیاسەت عامترە، واقیعەن سیاسەت ئەوەندە تەعەممـومی کـردیە، دیـن و مەحەببەت و دۆستی، گشتی بوویتە سیاسەت، سیاسەت عەهـد و پەیمـان و فەضـائیلی بەشـەری مەحـوو کـرد، وثـوق و بـاوەڕی هەڵگیـرا، مەگەر یەکێ زۆر بەسیط بێ، بڕوا بکا، بـۆ هەڵخەڵەتانـدنی عەرەب، حکـومەتی بەریتانیا العظمی چەند وەعدی دا بە شەریف حوسێن، کە حەڕب تەواو بـوو، هیچـی نەگەیانـدە جـێ، تەحریراتەکـی شـەریفم دی ئەیفەرمـوو: نەمزانی ئەوانە وا بێ عەهد و پەیمانن.

وتم: سبحان الله شەریف هەر وەکوو شـارەزایان نەبـوو، دیققەتـی لە قورئانیش نەفەرمووە. خوا ئەفەرموێ: ..قَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَا أَيْمَانَ لَهُمْ. نەیـدەزانی ئەوانە ئەئـیممەی کـوفر و سیاسـەتن؟ بـێ ئیمـان و ئیمـانن. بڕواییان پێ ناکرێ، خۆزی کیتابی ئیختلافی تەوازنی تەئلیفـی غۆسـتاف لۆبـۆنی تەرجەمەی مەرحـووم دختـۆر صـەلاحم لابـا، دائیـر بە ئەحـوالی سیاسییونان، چەند فەقەرەکەم لێ نەقل کردبا.

١١٦/١٠

## سوێندی بە درۆ

زۆر کەس سـوێندی بە درۆ ئەخـۆن، دەسـت بە قورئـانی دادەدەن، ئەمما بە سەری شێخی، یا ئاغـا بە درۆ سـوێند نـاخۆن. گەلـێ کەس بـۆ چوار فلوس سەد سوێندی بە درۆ ئەخوا، دوو کەس دێـنە شـەرعی لای مەلا، شەڕیانە لەسەر سوێند، ئەو ئەڵێ: ئی مـنە، ئەم ئەڵـێ: ئـی مـنە. مـن سـوێندم لەسـەرە. ئینسـانەکانی عەسـر هەم دەفعـی زەرەر هەم جەلبـی مەنفەعەتی پێ ئەکەن. وەقتاکی بە سوێندی بە درۆ دەرباز بوون، خۆیـان حیفز کرد، جەسارەتیان زیاد بوو.

١١٧/١٠

## عیززەتی نەفس

مع الاسف ئەهلی تەوحید قەدری ئەو عیززەتە نازانن، لەززەتی لێ ناچێژن، دائیم مەیلی شیرك و عبودیەتی غەیر ئەکەن، خصوص بەناوی ویلایەت، ئەوەی موئمین بێ، ئەبێ عیززەتی نەفسی هەبێ لە ئەم و ئەو، لە ئەجانیب قبوڵی زیللەت نەکا، ومن العجائب بەناوی تەزکییە و هەتکی نەفس مەنسووبینی طەریقی شاهی نەقشبەندی تڕان دەکەنن، شەقی تێك هەڵدەدەن، جوونان ئەدەن، گۆیا ئەوانە لەسەر طەریقی شاهن. بەڵێ خۆیان ئەساسەن گەدان، بێ خوێن و بێ دەمارن، سووکیان لا گەورەیە، هەیهوو تەزکییە لە کوێ؟ بێ شەرەفی و بێ مروەتی و کەری لە کێ؟

مامۆستا مەلا ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەرحەق تەریقداران ئەیفەرموو: ئێمە دینمان بە عیززەت تەرك کرد، ئەمما بە زیللەت تەڵەبی ئەکەین. عیززەتی نەفس لەگەڵ کیبر جودایە. عزیز النفس خۆی لە خەڵکی گەورەتر نازانێ، بە چاوی سووکایەتی تەماشای خەڵك ناکا، بەس خۆی لە ئوموری دون و دەنی و ناشایستە ئەپارێزێ، لەگەڵ ئەوەش کار و کەسابەت بە عار نازانێ. سوئال بە زیللەت ئەزانێ، خۆی سووك ناکا بۆ لوقمە نانێ، وەستا مەعرووفی ئەحمەچەپەی حەدداد بوو، حاڵ و وەقت باشی لە گرانی سی و شەش، ئەرزاقی لێ بڕا، کاری ئاسنگەری نەما، کە برسیاییەتی غەڵەبەی لە خۆو ئەولادی کرد، دەرکەی ماڵێی لەسەر خۆیان کلیل داوە، چوونە ناو جێی گۆیا ئەنوون، هەموویان مردن، لە برسان تەنەزولی بە دەرکە ڕاوەستانیان نەکرد. سبحان الله چەند ئینسان وا بە عیززەتی نەفس و گەورە، لە کوردان هات و ڕۆیی وە لە تاریخ ناوی گوم بوو، عیززەتی نەفسی ئەو وەستا مەعرووفە گەلێ لە فەوقی عیززەتی نەفسی ئەحمەد بن حەمزەی بووە ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە روح المعانی ئەڵێ: کە گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە، لەشکر ڕوویان کردەوە ناو شار، عەبدوڵڵای کوڕی ئیبن سەلول شیری هەڵکێشا لە بابی

و وتی: واللە ناچیتە ناو شاری، تا نەڵێی محمد أعزە، ئەمن أذلم، ناچار وتی، ئەوجا ڕێی دایە. ئەمەش حیکمەتی ئیلاهی باب واو کوڕ وا!

١٢٢/١٠

## بەسەرهاتی کەنناف‌یک و هاروونەڕەشید!

ئەڵێن کابرایە کەناف لە بەغدایە کاری خۆی ئەکرد، وە بە خۆی ئەوت: ئەگەر بەو ئیشە و پیشە ڕازی نەبی، کارێ لەوەی ڕەزیلانەترت پێ ئەکەم. ئەز قەزا ڕۆژێ مەئمون الرشید ئەو قسەیەی گوێ لێ بوو، بانگی کرد، وتی: لەم ئیشە ئیشی خراپتر چییە؟
وتی: خدمەتکارییە! ئەوە زیلـلەتە، ئینسان چاوی لە چینکە نانی بەرماوەی ئاغای بێ، من ئەجری خۆم وەرئەگرم، پاك و تەمیز خۆم ئەشۆم، نەفەقەی عائیلە ئەکرم بە کەمالی حورریەت و ئازادی ئیمراری حەیات ئەکەم.

١٢٣/١٠

## ریسالەکم داناوە لە مەسئەلەی ئیختیار!

من ڕیسالەکم دانایە لە مەسئەلەی ئیختیار، حەقیقەتەن شایانی موتاڵەعە و عالمی دانایە.

١٢٨/١٠

## هیتلەر عەقڵی لە نەوەد و سەد ملیۆن بەڵکو زیاتر گۆڕی!

بنۆڕنێ هیتلەر عەقڵی لە نەوەد و سەد ملیۆن بەڵکو زیاتر گۆڕی، عەقڵێ بە هەوەسی خۆی هاویشتییە دەماغیان، ئەوا ساڵەك و پێنج مانگە، ئەو قەومەی بە دار و دیـــواری دادەدا، لە هەوا، لە بەڕڕ، لە بەحـــر ئەکوژن، ئەکوژرێن، ئەسووتێن، غەرق ئەکەن، غەرق ئەبن. بەو عەقڵ و

خیانەتەوە ڕۆژ بە ڕۆژ هەوەسی حەڕب و نەشاطیان زێتر ئەبێ، ئیتر لازمە ئینسان بە ئیحتیراز بێ.

١٣٢/١٠

## لە زەمانی ئێمە تەربییەی عائیلەوی زۆر کەم بووە!

لە زەمانی ئێمە خراپترە، تەربیەی عائیلەوی زۆر کەم بووە، فی الحقیقة، علی الاکثر، قەباحەت لە گەورانە، منداڵ دەبینێ، داك و بابی بە شەڕ دێن، تێك هەڵئەدەن، لێك ئەدەن، جوونی پیس پێك ئەدەن، منداڵی بەستەزبان، لەوان وا فێر ئەبێ، حەتتا کە زوبانی ئەگری، ئەووەلەن جونـدانی فێر ئەکەن؛ بابی جەجی، داکی جەجایی! وە گەلێ کەس ئارەزوو ئەکا مسوڵمان بێ، ژن و ئەولادی لێ ناگەڕێن، ئەویش دڵی بەوان موتەعەلیقە، ناتوانێ لێیان جودا بێتەوە، غەربی فوق الحد مەیدانیان دایتە ژنان، سیادەت لە دەستی سەییداتە، ئەوانیشیان لەبەر تەعەددودی زەوجاتەوە ناڕێکی عائیلاتی ئیسلامییە، لە دینی ئیسلام ترساندیتیانن، ناوێرن مسوڵمان بن، بۆ یەکتر بووینە عەدووی دین. حیکایەت ئەکەن لە جەرائید ئەیاننوسی، لە دەوری سوڵتان عەبدولحەمید خانی عوسمانی گەلێ ژن لەسەر مێردی خۆیان جاسووس بوون. گەلێکیان مێردی خۆیان خستە ناو بەحری غەزەبی پادشاهی.

١٣٨/١٠

## خۆزی ئەو مزگەوتانە مەعمەل بان!

ئەوەی ملووك و ڕوئەسای ئیسلام لە شاعیرو موغەننی و جاریاتیان سەرف ئەکرد، لە ڕێی خوا، بۆ حیفزی میللەت و دەوڵەت و مەفتەن سەرف کرابا، قەت ئەوەی بەسەرمان هات، بەسەرمان نەدەهات، وەئەکثەری خەیراتی گەورە گەورەکان، عیبارەتە لە مزگەوتی گەورە گەورە دروستکردن، ئێستا هەرچەند ئەکەن پێیان موحافەزە ناکرێ، ئەکثەری چۆلن، نوێژیان تێدا ناکرێ، حکومەت نازانێ چییان لێ بکا؟ خۆزی ئەوانە هەموو مەعمەل بان، زەخائیری حەرب و سیلاحیان تێدا

دروست کرابا، ئەگەر ڕون و گۆشت و برنج هەزاران بێ، بە دەف و دیلانە مەولوودان ئەکەن.

١٤٠/١٠

## ئەکثەری ئەولادی گەورە و خانەدان، هیچ و پووچ دەردەچن

خوا ئەزانێ ئەکثەری ئەولادی گەورە و خانەدان، هیچ و پووچ دەردەچن، سەبارەت بە شیری دایانانە. خانمە فەندی خۆی منداڵی خۆی بەخێو ناکا، هەرچی و پەرچی و شیر پیس، منداڵیان بۆ شیر ئەدەن، بەخێویان ئەکەن، ئینسانێ نانەجیبیان لێ دەردەچێ.

١٥١/١٠

## ئاشەوان جۆی لە ئاشی نەدەکرد، مزەی جۆی وەرنەدەگرت، دەیگوت چی لێبکەم!

ساڵی گرانی ١٣٣٦ عالەم کەوتە تەنگانەیە، نایەتە قەلەم، سیعری ئەرزاق لە حەد چووە دەر، یەك دوو ساڵی پێ نەچوو، فەرەحناکی پەیابوو، ئەرزاق بێ قیمەت بوو، حەتتا ئاشەوان جۆی لە ئاشی نەدەکرد، مزەی جۆی وەرنەدەگرت، ئەیوت: چی لێ بکەم؟ واقیعەن لە حینی گرانی و قەحطی کەنگر بە هانای خەڵکی هات، گەلەکی پێ قورتار بوون.

١٥٢/١٠

## دوعا!

ئیلاهی بە جاهو جەلالی خۆت، بە حورمەتی قودرەت و عیلمی کامل و شاملی خۆت، دەفعی شەڕی ئەڵمان و ئیتاڵیا و ڕووس و فڕەنسە و ئینگلیز و ئیسپانیا لەسەر مسوڵمانان بکەی، بە قودرەت و قووەتی عیلم و ئیمان مسوڵمانان سەرفراز بکەی، صیحەت و سەلامەتی، عیلم و عەمەلێ وافیر و خۆشیمان پێ عەتاکەی، وە هەم مال و مەدرەسە و

مولکێ بە نەفع و مەعموور، دەوامی عیلمی ئالی جەلی، لەگەڵ حەیاتێ طەییبە و زوریەتێ طەییبە بدەی.

١٥٨/١٠

## ژنەکانی پێغەمبەر!

بەعزێ موستەشریقین زۆر ئەنای ڕیسالەت پەنا ئەکەن، ئەو سەییداتە ئیاتانەی مارەکردیە، ئەڵێ: ئەگەر مەقسەد حوببی شەهوەتی با، ئەیتوانی کیهە کچە حەسنای گەورە گەورەی عەرەبانە مارەی کا، حق الانصاف قسەیە مونصیفانەی کردیە.

١٦٣/١٠

## بەسەرهاتی خۆشناوەکە و جوولەکەکە!

خۆشناوێ مسولمان لەگەڵ جوولەکەیە بە ڕێدا دەڕۆن، مسوڵمانەکە ئیلحاحی لێ ئەکا ئەبێ مسوڵمان بی، وە ئیللا ئەتکوژم، خەنجەری لەسەر ڕاگرێ، هەرچەند جوو ئەپاڕێتەوە، ئەگریە، فائیدەی نیە.

جوو ئەڵێ: چاکە، چ بڵێم؟ مسوڵمان ئەبم، پێم بڵێ!

بەوێ خوایە ئەزێش نایزانم!

ئەو قسەیە دوور نیە، درۆ نەبێ.

١٦٧/١٠

## وەختی بۆمباران لە تەئەثوران شیعری کوردیم دانا!

وەقتێ بۆمباران کراین، لە تەئەثوران چەند شیعری کوردیمان دانا، ئەز جوملە:

خۆزی ئیمامی ڕازی ئەمرۆ کە زیندی بایە
تا لە صونعی بەشەری تەیارەی بدیبایە
ئەوجا ئیمانی دێنا، بە قودرەتی بەشەری
ئینکاری قەت نەدەکرد بە تەقلیدی ئەشعەری

١٩٧/١٠

## دەغڵ ئەچێنین و ئافات زۆرە!

ئێمە بە حەق موتەوەکیللین، دەغڵ ئەچێنین، الی ماشاء اللە، ئافات زۆرە، ئەووەڵەن کرم، ثانیەن: پیکبڕە، دوایە ژەنگ و گەرما بردن، ئەوجا سن و کیسەڵە و کلۆ، بعد کل ذلك، خەفەتی سەپانان، ثم خەوفی سووتان، بەرازیش زۆر خەسارە ئەدات، ناوێرم باسی ئەو و مشکی بکەم ئەگەر خودا چارەیە نەکا، کاری عیبادی زۆر موشکیلە، ڕزق چییە؟ هەرچی بە نەفع بێ مەئکول و غەیرە مەئکوول.

٢٠٠/١٠

## ئەوەندەی لە عێراق بە فیڕۆ سەرف ئەکرێ، نیو هەندە لە بەریتانیا و ئەلمانیا سەرف ناکرێ!

ئەمڕۆ بەریتانیا کە حەربییەتی لەگەڵ ئەڵمانیا، حەڤدە ملیۆن لیرەی زەهەبی مەسرەفیەتی. قوڕ بەسەر ئێمە هەموو عوملەی عێراقی بە نەقدی مەغشوش و ئەوراقی ٢ ملیۆن و نیوە، ئەمما مومکینە بڵێین ئەوەندەی لە عێراق بە فیڕۆ سەرف ئەکرێ، نیو هەندە لە بەریتانیا و ئەلمانیا سەرف ناکرێ. ئەوان ماڵ بە هیچی سەرف ناکەن.

٢٠٠/١٠

## ئەو نەوعە بەردە گەلێ جار لە ئاسمان دێتە خوار!

لە تاریخی ٣٢٥ ی بعد الالف، شەهقەیە لە ئاسمان هات، دوای موددەیە زۆر بە شیددەت لە ئەرزی دەنگی دا، بعد التحقیق بەردێ گەورە لەلای هەڵەجە بەربۆوە ئەگەر بە دێیە کەوتبا وێرانی ئەکرد. ئەو نەوعە بەردە گەلێ جار دێتە خوار، ئەمما لە لوتفی خوای بە جێیەدا

ناکەوی کە تەلفیات بدا. گەلێ جار نەوعە تەرزەیە ئەبارێ بەردە بارانیکە حەیوانات ئەکوژێ، خولاصە ئینسان لە قەبزەی قودرەتی خوا ناتوانێ خۆی نەجات دا، شاعیر ئەڵێ:

زو منجنیق فلك سنگی فتنە میبارد
من ابلها نە گوریزەم بە ابگینە حصار[1]

٢٠٢/١٠

## شێتێ لە سلێمانی هەبوو...

ئەیانوت شێتێ هەبوو لە سلێمانی بە کۆڵاندا دەڕۆیی، منداڵ دوای کەوتبوون های و هوویی و گەمەیان پێ ئەکرد، بەردیان دەهاویشتێ، ئەویش دوعای دەکرد: ڕەببی قازی و موفتی و مەلایانە، خوا بتانگرێ!

پێیان ئەوت: منداڵان جەفات ئەدەن، بۆ دوعای لەوانە ئەکەی؟

ئەیوت: برام نیکاحی باب و داکیان فرووتە، وەکی ولد الزنا وان، ئەمەش خەتای قازی و موفتی و مەلایانە، ئەگەر ولد الحرام نەبن، چییان بەسەر منەوە؟ نیکاحی داکیان باش با، ئەولادیشیان باش دەبوو!

٢١٧/١٠

## ڕەز و باغی ئێمە چەند ساڵە بەرەکەی ئەکاتە ڕەژوو!

ڕەز و باغی ئێمە چەند ساڵە، خصوص ئی بەراو، بەرەکەی ئەکاتە ڕەژوو، حەتتا عیللەتێ پەیا بووە، لە هەناری ناوی ڕەش ئەبێ، وەکی دووکەڵی نەفتێ کە بۆ مەرەکەبی ئەگرن. ساڵێ لەمێژە سەرەپایزێ وەکی شەختەی ڕەقی کردبوو، کە لەکن ئاگریمان دادەنا خاوئەبۆوە، ئەندەرروونی ڕزی بوو، هەلا هەلا دەبوو. ئافات زۆرە، واقیع گەر ئیرادە کا هەر خوداوەندی باقییە. چەند ساتێکە بۆ حبوبات و باغ و باغات،

(١) ئەم دێرە شیعرە هی (جمال الدین عرفی) یە، بەم شێوەیەیە:
ز منجنیق فلک سنگ فتنه می بارد
من ابلهانه گریزم در آبگینه حصار

ئافات لەسەر ئافات پەیا ئەبێ. لە تاریخ نەدیتراوە. ئەمساڵ لەو ڕۆژەی برنج شین بووە، کلۆیە کەوتە سەری، نازانم چ نەوعە کلۆیە بوو، تا وەقتی دروونی، دەستی لێ هەڵنەگرت، گەلێ کەس بالکلیە مەحرووم بوون لە پارچە برنجی گەورە گەورە چەپکەکیان نەدروویەوە.

حالەن برنج گرانە، ئەمڕۆ سەری شوباتە کۆتکی بە ڕوبعە دینارێکە، دوو هەندی گەنم گرانە. دوو سێ ساڵ کلۆ زەرد کە پێی ئەڵێن: نەجدی، باغاتی نەهێشت، چ جایە پەلك و بەر، پێستی دارانی ئەکرانەوە، دوایە زەنگەسوورە (زەردەواڵە) ئەوەندە زۆر بوو، لەگەڵ پارووی شیو یا دانەیی هەنجیر و ترێ ئەکەوتە ناو زاری ئینسان بە زوبانییەوە ئەدا، کێ ئەیتوانی بە ڕۆژ پشکە گۆشتەکی بە دەستوە بێ؟ میوەی نەهێشت، بەعدەهو ژەنگ و هوڕڕە، بۆ باغات و حبوبات، کەذلك بەراز حالەن دەوام ئەکا. مشك سێ ساڵان دونیای وێران کرد، چەند فەلاحێ لە فەلاحەت خست، ئەو خەلاس، کرم و پێك برە، سن و کیسەڵە و کلۆ، نەوعە کرمێ هەیە شتڵە تووتن، ئەدی گورگە؟ بۆ تەماتە و تووتن! ئیتر نازانین بۆ وایە؟ مسوڵمان نییە وا دەرئەکەوێ، مسوڵمان تا مسوڵمانتر و چاتر بێ، ئافاتی بۆ مەحصولاتی زێتر ئەبێ! شکلی ئەو حەیوانانە لە طەبعدا ڕەسم کرابا باش بوو. خوا بە حورمەتی قورئان چارەکی بکا.

٢١٩/١٠

## سەگ بە کەلاکە ئینسان خواردن هاربوون!

نعوذ بالله گرانی ٢٦ مان دیت، سەگ بە کەلاکە ئینسان خواردن هاربوون، حەقیقەتەن عەزابی قەحط ناخۆشە، خودا دەفعەیە دی نیشانی عیبادی نەدا. ئەمما ئەوانەی دەرچوون زۆر خراپ بوون، بە جارێ ڕوویان کردە ئیسراف و خوانەناسین، ئەکئەریان خوا بە قوربانی کەنگریان کا، دەنا ئەوانیش دەبوونە طەعمی سەیان.

سەوادی ئەعزەم لە بەشەر ڕووی لە تەدەنی و خراپەیە، ئەوەی ترەققی ئەکا، بۆ تەرەققی سەییئاتە، ئەوا عەیانە لەبەرچاوانە.

٢٢٢/١٠

## ساڵێ لە چنارۆك بووین..

ساڵێ لە چنارۆك بووین، ئەواخیری تەمووز یا ئەوائیلی ئوغسطوس دوو ڕۆژان دونیا تاریك بوو، چیای قەندیلمان لێ بزربوو بە هەور و تەم تومان بایەکی ئەهات سارد و بەقووەت. کەم وابووە لە زستانان وا سارد و بەقووەت بووبێ، دوایە هەوا ساف بۆوە، قەندیل دەرکەوت لە بەفری تازەکەوتوو سپی ئەکرا.

٢٣١/١٠

## بۆمبارانی سلێمانی!

ئەوێ ساڵێ کۆیە بۆمبەردومان کرا، گوێیا بۆمبایەکان گەورە نەبوون، پاشی چەندێ سلێمانی ئاگرباران کرا، بۆمبای زەلامیان فڕێ ئەدایە. یەکێ لە ئینگلیزان ئەیگوت: بە گوێرەی عەزەمەتی حوکمدارانی بێ، قونبەلەی گەورەی پێدادرێ.

٢٣٩/١٠

## وتی: بابم کووە؟ وتی: وەفاتی کرد، وتی: بوومە پیاو!

لە کوردی مەسەلەیەکی ئەڵێ: پیاوێ لە سەفەر بوو پاش موددەیە گەڕاوە لە ڕێیە تووشی ناسیارەکی وڵاتی خۆی بوو، ئەحوالی ئەهل و عائیلەی پرسی، وتی: بابم کووە؟

وتی: وەفاتی کرد.

وتی: بوومە پیاو، ساحێب ماڵ، ئەدی خێزانی؟

ئەویش ڕۆیی!

وتی: جێم توێ بۆوە، وەلەدی مرد، ئەوەنا یەکی دی، لە ژنێ نوێ، برای کەذا؛ ئای بابە ڕۆ پشتی شکا، برایە تر کو پەیا ئەکا؟!

٢٤٥/١٠

## معاشی خۆم ئەکەمە سێ قسم

ماڵدانان بۆ لێقەومان خاسەتەن بۆ خدمەتی وەتەن و میللەت، حەقیقەتەن ئەوابێ عەزیمە. برادەرەکم هەبوو عەلی ڕەزا خەڵکی خەرپووتێ بوو، ملازمی ڕەدیفان، ئینسانێ بە جەوهەر، لەتیف، عەنیف، نەظیف، ئەیوت: من معاشی خۆم ئەکەمە سێ قسم، قسمێ ئەخۆم، قسمێ دادەنێم بۆ میوانی و نەساغی و پێویستی فوق العادە، قسمێ دادەنێم کأنە نییە لە فکری خۆمی ئەبەمەوە و کۆی ئەکەمەوە بۆ ڕۆژی حەرب یا تەحەویل. ڕەحمەتی لێ بێ وابزانم لە حەربی بالقان شەهید بوو.

٢٤٧/١٠

## عەیب نەبێ!

دیققەت کە مندال ئارەزوو ئەکا بمیاوێنێ وەکی پشیلە، بوەڕێ وەکی سە، بزەڕێ وەکی کەرێ، وهکذا دیققەت کە لە ئیعتیادی کەلیمەبەیە ئەیهاوێتە ناو قسە وەکی عەیب نەبێ، بیلا مەعنایە کوردان، وەکی سوێندی (واللە) ئەگەر فێری بووی ناتوانی بێ ئەو کەلیمە قسە بکەی. ڕۆژێ پیاوێ هاتە لای من بۆ سوئالێ شەرعی، وتی: عەیب نەبێ هاتیمە خزمەت توو!

وتم عەیبی چییە؟ من مەلا و توو مسوڵمان، بێیە لای من زۆر جوانە.

وتی عەیب نەبێ ژنەکم هەیە.

وتم عەیبی چییە؟ ڕۆڵە ئەو مەخلووقە ئەکثەری ژنیان هەیە.

وتی: عەیب نەبێ قسەیەکم بەسەر زوبانی دادێ.

دوایە پێم وت: ئەگەر قسە ئەکەی بێ عەیب نەبێ، گوێت لێ ڕادەگرم، وە ئیللا، لا.

هەرچەندی کردی نەیتوانی! من خۆم هات فێرم وەکی ئەکثەری ناس لە مەیانی قسان، سوێند بخۆم، ئاگاداری خۆم کرد، چابوو.

٢٤٨/١٠

## باران پردی غازری برد!

لەو ڕۆژانە باران زۆر باری، ئاوی زێیان توغیانی کرد، تەخریباتی زۆردار، حەتتا پردی سەر غازری برد. ٧ی شوباتی ١٩٤١.

٢٥٦/١٠

## قەومی تەنبەڵ ئەیەوێ هەموو شت بێ مشەقەت، خوا بۆی بکا!

ساڵێ لە موصل بووم، ئەعزای مەجلیسی عموومی بووین، ڕۆژێ لە تەرەف مودیری زراعەت، بەعزە ئەوراقیان هێنا لە مەجلیس خوێندرایەوە، قسەیە خۆشی تیا بوو، ئەز جوملە ئەیوت، پار و پێرار بارانی ئەگرتەوە، ئەمدیت مسوڵمانان لە خدمەت شێخی ڕیزوانی لەسەر (تل التوبة)[1] نوێژەبارانیان ئەکرد، ئەگریان، ئەپاڕانەوە. منیش ئەموت: ئەی عیبادی خوا ئەگەر خوا بفەرموێ؛ ئەو زێیە گەورە، یەعنی دیجلە بە بەر دەمتاندا دادەڕوا، بێ هوودە خەسار ئەبێ، ماکینەیە نایەنن، ئاو هەڵکێشێ، مەزرووعاتی پێ ئاو دەن، شەرمێ ناکەن ئەپاڕێنەوە و دوعای ئەکەن؟

بەڵێ قەومی تەنبەڵ و بێ صەنایع ئەیەوێ هەموو شت بێ مشەقەت، خوا بۆی بکا، لەو ئینقیلابە ئەوەندە ماکینە لە دەوری دیجلە و فوڕات داندرایە، مەگەر ئەو بەحرانە هیشك بن، دەنا پەکیان ناکەوێ.

٢٥٨/١٠

---

[1] دەکەوێتە باشووری موصل، مەزاری حەزرەتی یونسیش دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوای تل التوبة. ناوەکەیشی لەوە هاتووە گوایە پێغەمبەر یۆنان لەسەر ئەم گردە وەستاوە و بانگی خەڵکی موصلی کردووە و داوای لێکردوون تۆبە بکەن.

## بوتپەرستی لەناو مسوڵمانان ئینتیشار ئەکات!

ئەمڕۆ لە بەغدایە هەیکەلی مۆد عادەتەن ئەپەرستریَ، لە تەرەف ئینگلیزان، سبەینە و ئێوارە کوتلەیە عەسکەر بەرابەری ڕەسمی تەعزیمی بەجێ ئێنن، حالەن وا دەوام ئەکا، بوتپەرستی لەناو مسوڵمانان ئینتیشار ئەکات. شێخ عەلائەددین چەند قەتعەیە فوتوغرافی خۆی ناردبووە لای ناودەشت و ئاکۆیەتی، موریدەکانی بەرابەری صورەتی ڕکوعیان بۆ ئەبرد، پەرستنی قەبری ئەولیایان لای سەوادی ئەعزەم بوویتە ڕوکنێ دین.

یەکێ لە ئەهالی کۆیە چووبووە زیارەتی ئیمام موسا، خۆی ئەیگێڕایەوە، ئەیوت: یازدە سەجدەیان پێ بردمە بەر قەبری، دە ڕوپیەیان لێ ستاندم.

وتم: باشە، سەجدەکت قانزانجە!

هەمووی بۆ پارەیە، خۆیان و خەڵکی کافر ئەکەن، وەدد و سواع و یەغوث و نەسر و ئەصنامی قەومی نووحی بوون، کەوتینە دەست عەرەبان.

٢٦١/١٠

## سیاسییەکان لەگەڵ بەشەر ناساغن!

شێخ ڕەزا ئەڵێ:

ساغ لە دونیادا نەماوە، گەر قسەی ساغت دەوێ
بێ هەزارت پێنیشاندەم گەر قوڕمساغت دەوێ

سیاسییون و ڕوئەسای ئەدیان علی الاغلب لەگەڵ بەشەرییەت ناساغن، لەگەڵ ئەوەشدا مەقبوول و موطاعن، پاك و خاوێن و موخلیص و خالیص و ناصیح و موشفیق و ئەمینیان ناوێ. ئەو بێ چارانەش وەکی بەشەر گومانیان بردیە، کەس لە جن و ئینس لە تەڕەف جیهەتی ئیلاهـ

درۆ ناکا، ئەوەی ڕوئەسایان گوتویانە قبوڵیان کردیە، بە تەقلید وەکی کوردی دەڵێ: بە گوێی مامۆستا ئەو ئەجیننانە لە حیلەیان گەیشتن. ئینسانەکانی ئێمە مع الاسف وەکی خۆیان مانەوە. خوایە خۆت ئەزانی ئەنواعی درۆیە چ ئەلوانێ تەجەسسومی کردیە بە دیعایەی درۆ بەشەر تار و مار کرایە.

٢٦٩/١٠

## ناوی شێخیان بیست های و هووی و نەعرە و گرمە و لرمە و لرفە ئەکەن!

گوێ لە خوتبەی ئاستانە، ئەعزەمییە، کەرخی، وە شێخ عومەری ، وە برۆ بۆ موصل لە جامیعی نەبی جەرجیس وە نەبی شیث وە نەبی یونس، بەعزێ جەوامیعی تر کە مەرقەدیان هەبێ، ڕاگرە، چ ئەخوێنن؟ چ ئەڵێن؟ چ بڵێن؟ لە حەق ئەوانەی موقابیلی مەساجید بە ئەسمائی موختەلیفە مەواضیع دروست ئەکەن، چ دەڵێی؟ لەوانەی ناوی خودا و ڕەسوول ئەبیەن، کرکە ناکەن، کە ناوی شێخیان بیست های و هووی و نەعرە و گرمە و لرمە و لرفە ئەکەن، بەدەنیان ئەکەوێتە زەلزەلە!

خۆزی سەد خۆزی لە جیاتی ئەوانە چەند مەعمەلمان هەبا، حەوائیجی حەیاتی عومومی لێ دروست کرابا و ڕەسەدخانەکانمان تێك نەچووبان! هەندیان مزگەوتی گەورە دروست کرد، ئێستا نازانن چییان لێ بکەن؟ لە جیاتی بەعزێ مزگەوت لەو جێی ڕەسوولی موجتەبا نوێژی لێ کردبوو، ئەجینان ئیستیماعیان کردبوو و عەلامەتێ ئیمتیازیان دانابا باشتر بوو. مع الاسف وەهابی لەگەڵ مەعالیمی تاریخی ڕێك ناکەون. ئەوەش تەفریط و جەهلە بە جوملە بە تاریخ و حەیاتی دینی، نەظەر بە ئەددیعای ئەدیانەکانی دی چەند شتی بەقیمەت بوون.

٢٧٥/١٠

## شەوبێداری!

کەسێ تەحەممولی شەوبێداری کرد، ئەتوانێ تەحەممولی مەشاغیلی گران گران بکا، بەڵێ شەو بیداری و ئیشتیغال بە ئوموری نافیعە قیمەتی تەواو نابێ بۆ ئوممەت. شەوێ لە بەغدا تا سبەی نەنووستم لە غەما، جەمعێ لە ئێوە خەریکی عەیش و عوشرەت و عوود و کەمان و ساز و سەنتوور بوون تا بەیانی، وە لە قەرارگاهی ئینگلیز تا دونیا ڕوون بوو بە ئەرقامی نووری موخابەرەیان لەگەڵ لۆندەرە ئەکرد. مع أنە ئەوائیلی نەشئەتی حکومەتی عێراقی بوو، ئەبا گەورە و گچکە شەو بێدار و ئاگادار بن، بۆ صەلاحی حال و ئیستیقبال و ئیستیقلال. ئەمما ناشیئەی ئێستا قسەیان لێ ناکرێ بزانین ئەو نەشیئەتە عاقیبەت چی ئەبێ؟

٢٨٥/١٠

## ئیحتیفالی حاجی مەلا بەکراغا!

لەو بەینە ئومێدم وایە ئیحتیفالێ بکەین، بەناوی حاجی مەلا بەکراغای بانیی مزگەوتی گەورە، کە لە تەئریخی ١٢٦٠ بینای فەرمووی، ئەمڕۆش تەئریخی ١٣٦٠ه، ئەوە سەد ساڵە ئەو مزگەوتە بینا کراوە، خوا ئەزانێ چەند هەزار خێرات بۆ ساحێبی نووسراوە. مع الاسف دوای وی کەسێ لە کۆیە پەیا نەبوو، بیرەوەری بکا، نە لە ئەولادی خۆی، نە لە غەیر.

٢٩٢/١٠

## دەوڵەتی وا هەبووە، گەمەی بە کوڕەی ئەرزی ئەکرد، ئێستا بوویتە فۆتبۆڵ!

باوەڕ ناکەم ئەوەی بە ماڵ و مناڵ مەغروور بێ، خوا لێی نەگۆڕێ، وا دەبێ بە ئەدنا کەلیمەیە ئینسان گیرۆدە دەبێ، جلۆکەی نەگبەتی ئەکەوێتە

سەر شان و ملان، ئەمە بۆ شەخس نا، بۆ دەوڵەتیش دەبێ، دەوڵەتی وا هەبووە. تا ئەو چەندانە گەمەی بە کوڕڕەی ئەرزی ئەکرد، ئێستا بوویتە فۆتبۆڵ، ئەوا لە کون و کاژێرکان، لە ترسی تەیارەی عەددووی بە مەغلووبی و مەقهووری خۆی ئەشارێتەوە.

٢٩٧/١٠

## سێ سەد ساڵە ئێمە ساقیتین!

سێسەد ساڵ زیاترە ئێمە لە ئیمتیحان ساقیط بووین، چونکی ئیعتیبارمان بەو علومانە نەکرد، ئەگەر شتەکیشیمان زانیبێ بێ عەمەل بوو، نەظەرییات و قیل و قالی بێ نەتیجە بوو، ئەکثەری ڕوئەسای دین خەریکی سەلبی عەقڵ و عیلم بوون. حەتتا ئیرادەیان قووەتیان لە ئینسان سەلب کرد، قوربەسەر چۆن ساقط نابێ؟ ئێمە خەریکی ئەوهام و خەیاڵات و جنۆکە و شەیاتین و مەلائیکەی زلام زلام و شاخ درێژ بووین! ئەرزی سمسمە و جابولقا و جابورسامان کەشف کرد، دوشمنی دین و دونیامان لە خۆیان بوونەوە، ئەسراری تەبیعەتیان کەشف کرد، قووەتیان ساند، ئەوجا لێدە لە مسولمانان، سبحان اللە *الآن کان کما کان*، بەڵکو خراپتر بووین، مەیلی سەفاهەت گەلێ زێتر بووە، چۆن لە ئیمتیحان دەرئەچین؟ مەگەر شەدەڵەیی و ئەوانەی زگ پڕ لە غاز، موقابەلەی باڵۆن و پەرەشووتی غەربییان کەن!

٣٢٠/١٠

## خصوص شێخەکان، تا قەوم کەرتر بن، کەیفیان پێ دێ!

ئەوەی مەیلی چاکەی هەبێ، بە ڕێی چاکدا دەڕوا، زۆر شوکری خودا ئەکا بەسەر هیدایەت و ئەسبابی هیدایەت، ئەوەی مەیلی خراپ بێ، موتەکەببیر و عنود و خودپەسەند، ئیعرازی لێ دەنێ، زۆری پێ ناشکورە، ناڕازییە، چونکی لە گومڕاهی عەوام ئیستیفادە ئەکەن،

خصوص شێخەکان، تا قەوم کەرتر بن، کەیفیان پێ دێ، ئەگەر خەلکی عاقڵ بێ، وە ڕێی ڕاست بگرێ، خوا ئەزانێ چییان لێ دێ؟ پاپایەکان وە ڕوئەسای شیعانیش هاکەذا، سبحان الله قەومیش کەیفیان لەگەڵ وان دێ، ڕقیان لە ناصیح و ئەمینان ئەبێتەوە، بە ئەحوالاتی نەفسییە ئەگۆڕێ، بیلال و ئەبو هورەیرە مەمنوون ئەبن بێنە ڕێزی ئەبوبەکر و عومەری، ئەبوجەهل و وەلید ناتوانن بێنە ڕیزی بیلال و ئەبو هورەیرەی، فیرعەون ناتوانێ لەگەڵ جووان ببێتە تابیعی موسای. ئەمما ئەوەی تالیبی حەق بێ، کە حەق تەوەززوحی کرد، ئیمانی پێ ئێنێ، وەلەو باب و خزم کوژرایی بێ، وەکی خالیدی بنی وەلید.

٣٢١/١٠

## خۆشناوێك لە بەغدا!

یەکێ لە خۆشناوان لە بەغدا ئەبێ، ئەبیە شەخسێ نیدا ئەکا: سەبیل سەبیل!

ئەویش بانگی ئەکا، بە مەتاڵێکی تاسەکی بۆ تێ ئەکا، ئەیخواتەوە، ئاو ئاوی خۆمان، دێتەوە وڵاتێ. شەخسێ لەوان ئەچێتە بەغدا، پێی ئەڵێ: برا کە چوویتە بەغدا ئەبیەی، یەکێ بانگ ئەکا: سەبیل سەبیل، پێی هەڵنەخەڵەتێی، چ نییە، ئاوەکە پەتی پەتی خۆنە! ئەترسم ئەو نەوعە کەسە بە (عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا)ی بەهەشتیش، بە سەبیلی بەغدای تێبگا، زۆر کەیفی پێ نەیە.

٣٢٨/١٠

## نفووسی فرەنسە ساڵ بە ساڵ لە تەنەززول دایە!

چەند ساڵێ لەمەوپێش موحەریرینی فەرەنسە، ئینزاری فەرەنسەیان ئەکرد، سەبەب بە فەحشیات و بێ مەیلی زەواجی مەشرووعە، نفووسی فڕەنسە ساڵ بە ساڵ لە تەنەززول دایە، عەدووی لەدودی یەعنی ئەلمان بیلعەکس لە تەزایود دایە، حال وا دەوام کا، فڕەنسە مەحکوومی زەوال

و ئینقیــرازە. حەقــیقەتەن ئەثەری ئەو ســەفاهەتە لە حەرِبــی حــازری دەرکەوت، غەلەبەی ئەڵمان بە نەوعــێ بــوو، نەدەهــاتە عەقــڵ، بە زەرفــی سێ چوار هەفتە دەوڵەتــی فڕەنســەی زێــڕ و زەبەر بکــا، ئاڵای زەفەری ئەڵمانی لەسەر قوللەی ئیڤل بلەرێتەوە. بەڵێ ئەوە عەلامەتی قیامەتە.

٢٣٦/١٠

## هێشتاش مسولمانەکان عیبرەت ناگرن!

هەر قەومێ موئمین و کافر بە ســەفاهەت و شــیقاق و نیفــاق مــوبتەلی بوون، موحەققەق بە هیلاك ئەچن. ئەمرۆ بنۆڕە فڕەنسە و بەریتانیـا سـید البر والبحر والهواء، پاش زەفەری حەربــی عومــومی، بە جارێ ڕوویــان کردە عەیــش و عەشــرەت و ســەفاهەت و ئیستیحقاری ئەنام و حەلقــی عەهد و عەهد شکێنی. ئەمڕۆ لە دەست ئەڵمان لە چ حاڵــدان! هەرچەنــد بــەریتانیا العظمــی دەوام ئەکــا لەســەر حەڕب لەگەڵ ئەڵمــان، غــالبی و مەغلووبی قەطعی مەعلووم نەبــووە. لاکــین نەدەهــاتە خەیــاڵ ئەم حــاڵەی ئەمڕۆ تیایە ئەیبینێ، لە بەڕ و بەحر و هەوا، ئەو ذل و هەوان و خوســرانە موشــاهەدە ئەکــا، هێشــتاش مســولمانەکان عیبــرەت نــاگرن، تێنــافکرن، لە سەفاهەت و عەداوەت و دزی و حیزی زیاد ئەکەن.

٢٣٧/١٠

## بەسەرهاتی عەرەبێك!

لە بەعزە کوتــوبی موحــازەرات ئەڵــێ: عەرەبــێ نــاو مــوجریم ئەچێــتە مزگەوتــێ، ئیمــام ڕاوەســتایە، دوو ســەف لە دواوە، ئەویــش نــوێژ دادەبەستێ، لە سەفی ئەووەل ئیمان بعد الفاتحة ئەم سوورەتە دەست پــێ ئەکا؛ کە ئەڵێ: **الم نهلك الاولين.**

کــابرا لە دڵــدا ئەڵــێ: ئەو ســەفە لە پێشــەوەیە بە هــیلاك ئەچــن، ئەکشــێتەوە ســەفی دوایە، ثم نتبعهم الاخرین ئەڵــێ، ئەڵــێ: نــا ئەمــانەش ئەڕۆن، ئەکشێتەوە، کە کذلك نفعل بالمجرمین ئەڵــێ، ئەڵــێ: قبحــك اللــه، لەم بەهیلاك چوونە، هەر منت مەقسوودە، دەردەپەڕێ و هەڵدێ!

وە ئەڵێ: ئیمامێ سوورەی نووحی ئەخووند، زۆری ئایەتی إنا أرسلنا نوحا تیکرار کرد، ئایەتی دوایەی بۆ نەدەهات، یەکێ لە مەئمومیان وتی: مال خراپ ئەگەر نوح ناچێ، یەکیتر بنێرە!

یەکێ لە کوردان لەسەر کانی دەستنوێژ ئەشوا، ئیمام فاتیحە ئەخوێنێ، لە ئایەتی إهدنا الصراط المستقیم.ە تیکرار ئەکا (موستە، موستە، موستە) گۆیا کەلیمەکەی تەواو بۆ نایە، ئەوەی دەستنوێژ ئەشوا، ئەڵێ: مامۆستا بە سەدەقەت بم، دوو مستی ترم بۆ بکە، ئەگەمە ڕکاعەتەکە.

ئەو نەوعە حیکایەتە لە کوتوبی عەرەبی زۆرن، مومکینە ئەکثەری هەڵبەستە بن.

٣٣٧/١٠

## ئاوی کانیی خاتوونی چنارۆك!

ئاوی جیبالی وڵاتی ئێمە حەققەن جای تەشەککورە، ساف و سارد و بێ غەش و سووك و سریع الانحدار و خۆشگوار و بێ میقرۆبە، ڕەحمەتی خوای لی بێ دختۆر صەلاحی وەصفی شامی، دەفعەیە لەگەڵ جەمعێ لە یاران هاتنە چنارۆك، ئەیفەرموو: ئاوی کانیی خاتوون بخۆنەوە، غایەت نافیعە، هیچ زەرەری نییە، بێ میقرۆبی ساممەیە!

ئەحمەد دەیونی قائیمقامی کۆیە، جارێ هاتە چنارۆك، پەرداغێ ئاوی کانی خاتوونی خواردەوە، وتی: أنتم من هذا الماء تشربون؟

وتم: نعم.

وتی: هنیئا لکم.

لە یادم نییە نووسیتم یان نا، دوعایەکی ڕەسوولی ئەکرەم (صلی الله علیه وسلم): (اللهم اجعل لقائك أحب إلی من الماء البارد)م بیست، دغدغەکم هاتە دڵ، چۆن جەنابی ڕەسوول ئەم دوعایەی فەرموی؟ چ نسبەت لە بەینی لیقای خوای و ئاوی باردە؟ ڕۆژێ بۆ جومعە هاتبوومەوە کۆیە، وا ئیجابی کرد، سەلامی نوێژم داوە، یەکسەر ڕۆیشتم بۆ چنارۆك، هاوین، گەرم، زۆرم تینوو بوو، لەو دیوی ئەووەلەن لام دایە سەر کانی خاتوون، دوو مستە ئاوم بە دەم و بە چاو داکرد، قومەکم

خواردەوە، لەززەتێ زۆر عەزیم و عەجیبم دا، ئەو ئانە، دوعای نەبەویم هاتەوە یاد، ئیشکالم نەما، ئاوی کانیی خاتوون دەفعی دوو ناری لێ کردم، لە حەدیس ئەفەرمووێ: ئەووەل شتێ ئینسان سوئالی لێ ئەکرێ: صیحەحەت و ئاوی ساردە، وابزانم من ئەو سوئالەم لێ ناکرێ، صیحەحەتم نییە، موددەیە طەویلە بە ئەنواعی ئالام موبتەلیم، وە ناوێرم ئاوی سارد بخۆمەوە، مەگەر کەم کەم، جار جار. مع هذا شوکری ئینعامی ئەکەم، ئومیدە خودا تۆڵەم بۆ بکاتەوە. ئەوەی کوفرانەی نیعمەتی ئیلاهی بکا، ڕۆژی جەزا خائیب و خاسیرە.

٣٤١/١٠

## صوەری غەریب و عەجیب لە ئەمریکا!

لە ئەمریقا بە صوەری غەریب و عەجیب مەحازینان بینا ئەکەن، کە جالیبی نەزەر بێ، خەڵکی بۆ تەماشای مەجبوورەن وە تەبعەن تووشی شت کڕین ئەبن. لە زەمانی ڕابردوو لە شەوی جلووسی سوڵتانی لە بەغدا، بە ئەشکالی موختەلیفە تەیریان دروست ئەکرد، باروتیان ئەهاوێشتە دەروونی، ئیشتیعالی ئەکرد، لەسەر دیجلە ئەخولانەوە، مەنزەریە جالیبی ئەنواند، شتەکیان پەیا کردبوو، وەکی مۆم، سپی و ئەستوور و باریکی هەبوو، پارچەکیان لێ ئەکردەوە، ئاگریان لەسەر دادەنا، کەفی لی ئەهات؛ کف، کف، کف، تا تەواو ئەبوو، مارێ موهیبی تەشکیل ئەکرد.

٣٤٣/١٠

## عافێتی خۆشناوان!

زاتێ هەبوو گەورە و موحتەرەم، خادیمی دین و عیلم، میرانی خدر بەگی ڕەئیسی فیرقەیە خۆشناو پشت گەڵی، پیاوێ بە ویقار و موهیب

بوو، قازییە شافیعی مەزهەبی دانابوو، بۆ قەوم، فەصلی ئەحکام بکا، قازییش مەلا محەممەد[1]ی ناو بوو، مەلایە بەدین و باش بوو، وابزانم لە تەلامیذی بابم بوو، کە میر لە مەجلیس ئاوی خواردبایەوە، قازی ئەیوت: میرانا عافێت!

ئەوانی حازری مەجلیس تێکڕا ئەیانوت: ئامین بلێ شاڵلا.

لاکین عادەتی عافێت بوون، دوای ئاو خورادنەوە، لە وڵاتان نەماوە، من زۆر لام جوانە، کە یەکێ لە مەجلیس ئاوی خواردەوە، نەخت بە ئارام پێی بڵێن: عافێتت بێ!

٣٤٤/١٠

## ئیعتیماد ئەدەنە سەر قسەی خۆشکەڵە خۆشکەڵە

ئەهلی تابیعی نەفس و مەیلی حەیوانی، بە قسەی پڕوپووچ و درۆ و دەلەسە، ئیمان ئێنن، ئیعتیماد ئەدەنە سەر قسەی خۆشکەڵە خۆشکەڵە، قورئان نەسخ ئەکەن. ئایاتێ ڕووحی حەیاتی تیا بێ، بە زەهرێ ئیزهاقی ئەکەن، بە تەئویلاتی فیرەقی موتەخالیفە لە ئیعتیقاددیات و غەیرە ئیعتیقادیات ڕەونەقی قورئان ئەبەن، بەعزێ خورافات و حیکایات و دوعایان کۆکردیتەوە، پێی ئەڵێن: کیتابی موقەددەس، ئیمانیان هەیە، کە کەلامی خوایە، ئیمانیان بە قورئان نییە، مفتری یە، بڵێین چی؟ ئەوا وایە، زومامی ئەمری دونیا و قیامەت بە دەست ئەورووپایە، چۆنیان کەیف پێ بێ، وا ئەڵێن، وا ئەکەن، ئومێد وەیە لەم حەڕبە ئەدەب وەرگرن، ئەوی بمێنێتەوە ببێتە ئینسان، ئیبن ئادەم. نسأل الله السلام وعز الاسلام الی یوم القیامة.

٣٤٤/١٠

---

[1] ئەم مەلا محەممەدە دەکاتە باوکی زانا و نووسەری خۆشناوەتی خوالێخۆشبوو (عبدالسلام محمد نبی خۆشناو).

## دەڵێ ئەوەی ئینکاری دەججال بکا، کافر ئەبێ!

ئەمڕۆش تەسادوفەن لە فتاوی حدیثیة ی ئیبن حەجەرم دیت، ئەوەی ئینکاری دەججال بکا، کافر ئەبێ، پووچی فەرمووە کافر نابێ، بەڵێ من ئیمانم هەیە بە دەججال، فەقەط دەججال ئیشی خۆی کرد، وهکذا دجال دەوام ئەکەن. ئەوە عەجایبە ئەوانەی لە نوێژ ئیستیعاذەی لێ ئەکەن دوای ئەکەون.

٣٥٤/١٠

## قەسری مەلیك لە پیرمام!

ئەوانەی دەوڵەمەندن لە میصر لە بەغدا، لە گەلێ جێیەتر، ئەچن بۆ صەیفییە، جێی فێنك، میقدارێ زۆر پارە سەرف ئەکەن لەبەر گەرمای هاوین. هاوینی ڕابردوو چەند هەزار دینار لە صەیفییەی پیرمەمی سەرف کرا، قەسری مەلیك و وەصی و وزەرا و فیخام و عیظامی تیا بینا کرا. مع الاسف لەو ڕۆژانە وەصی عەرشی عێراق عەبدولئیلاه هەڵات، قەسر و مەسری لێ بەجێما، ئەمڕۆ لە ڕادیۆن وا وەرگیرا خەریکن وەصییە دی دانێن.

٥٤/١٠

## سوێند بە خەلیفەی ڕاشیدین دەخۆم!

بۆچی سوێند بە شتێ مەشهوود و عەیان بێ نەخۆم؟ بە شتێ مەجهوول و موخەییەل سوێند بخۆم، سوێند بە ڕووحی موقەددەس و موجەڕەددی ڕەسوولی ئەکرەم (صلی الله علیه وسلم) و ئەبوبەکر و عومەر و ئەعوانیان ئەخۆم، لە هەموو میولێ خاڵین، فەرقی کورد و عەرەبیان نەدەکرد، موقابیل بەو هەموو موشکیلاتە بە نەشاط تێئەکۆشین، کأنە سەباحەتیان تیا ئەکرد، کوویان سیبقەت کرد؟ چۆن ئیستیلایان

بوو، قازییە شافیعی مەزهەبی دانابوو، بۆ قەوم، فەصلی ئەحکام بکا، قازییش مەلا محەممەد[1]ی ناو بوو، مەلایە بەدین و باش بوو، وابزانم لە تەلامیذی بابم بوو، کە میر لە مەجلیس ئاوی خواردبایەوە، قازی ئەیوت: میرانا عافێت!

ئەوانی حازری مەجلیس تێکڕا ئەیانوت: ئامین بڵێ شاڵڵا.

لاکین عادەتی عافێت بوون، دوای ئاو خورادنەوە، لە وڵاتان نەماوە، من زۆر لام جوانە، کە یەکێ لە مەجلیس ئاوی خواردەوە، نەخت بە ئارام پێی بڵێن: عافێتت بێ!

٣٤٤/١٠

## ئیعتیماد ئەدەنە سەر قسەی خۆشکەڵە خۆشکەڵە

ئەهلی تابیعی نەفس و مەیلی حەیوانی، بە قسەی پڕوپووچ و درۆ و دەلەسە، ئیمان ئێنن، ئیعتیماد ئەدەنە سەر قسەی خۆشکەڵە خۆشکەڵە، قورئان نەسخ ئەکەن. ئایاتێ ڕووحی حەیاتی تیا بێ، بە زەهرێ ئیزهاقی ئەکەن، بە تەئویلاتی فیرەقی موتەخالیفە لە ئیعتیقاددیات و غەیرە ئیعتیقادیات ڕەونەقی قورئان ئەبەن، بەعزێ خورافات و حیکایات و دوعایان کۆکردیتەوە، پێی ئەڵێن: کیتابی موقەددەس، ئیمانیان هەیە، کە کەلامی خوایە، ئیمانیان بە قورئان نییە، مفتری یە، بڵێین چی؟ ئەوا وایە، زومامی ئەمری دونیا و قیامەت بە دەست ئەورووپایە، چۆنیان کەیف پێ بێ، وا ئەڵێن، وا ئەکەن، ئومێد وەیە لەم حەڕبە ئەدەب وەرگرن، ئەوی بمێنێتەوە ببێتە ئینسان، ئیبن ئادەم. نسأل الله السلام وعز الاسلام الی یوم القیامة.

٣٤٤/١٠

---

[1] ئەم مەلا محەممەدە دەکاتە باوکی زانا و نووسەری خۆشناوەتی خوالێخۆشبوو (عبدالسلام محمد نبی خۆشناو).

## دەڵێ ئەوەی ئینکاری دەججال بکا، کافر ئەبێ!

ئەمڕۆش تەسادوفەن لە فتاوی حدیثیة ی ئیبن حەجەرم دیت، ئەوەی ئینکاری دەججال بکا، کافر ئەبێ، پووچی فەرمووە کافر نابێ، بەڵێ من ئیمانم هەیە بە دەججال، فەقەط دەججال ئیشی خۆی کرد، وهکذا دجال دەوام ئەکەن. ئەوە عەجایبە ئەوانەی لە نوێژ ئیستیعاذەی لێ ئەکەن دوای ئەکەون.

٣٥٤/١٠

## قەسری مەلیك لە پیرمام!

ئەوانەی دەوڵەمەندن لە میصر لە بەغدا، لە گەلێ جێیەتر، ئەچن بۆ صەیفییە، جێی فێنك، میقداریێ زۆر پارە سەرف ئەکەن لەبەر گەرمای هاوین. هاوینی ڕابردوو چەند هەزار دینار لە صەیفییەی پیرمەمی سەرف کرا، قەسری مەلیك و وەصی و وزەرا و فیخام و عیظامی تیا بینا کرا. مع الاسف لەو ڕۆژانە وەصی عەرشی عێراق عەبدولئیلاه هەڵات، قەسر و مەسری لێ بەجێما، ئەمڕۆ لە ڕادیۆن وا وەرگیرا خەریکن وەصییە دی دانێن.

٥٤/١٠

## سوێند بە خەلیفەی ڕاشیدین دەخۆم!

بۆچی سوێند بە شتێ مەشهوود و عەیان بێ نەخۆم؟ بە شتێ مەجهوول و موخەییەل سوێند بخۆم، سوێند بە ڕووحی موقەددەس و موجەڕەددی ڕەسوولی ئەکرەم (صلی الله علیه وسلم) و ئەبوبەکر و عومەر و ئەعوانیان ئەخۆم، لە هەموو میولێ خاڵین، فەرقی کورد و عەرەبیان نەدەکرد، موقابیل بەو هەموو موشکیلاتە بە نەشاط تێئەکۆشین، کأنە سەباحەتیان تیا ئەکرد، کوویان سیبقەت کرد؟ چۆن ئیستیلایان

بەسەر دوو حکومەتی وەکی ئێران و ڕۆما بوو؟ چۆنیان تەدبیری ئومور و ئیدارەی ئەنام فەرموو؟ دڵی ئەتباعیان پڕ لە کەرامەت و شەجاعەت کرد، سەرفراز و موحتەرەم و غورڕ و موجەججەل و چاوگەش، بۆچی سوێند بە ڕووحی صلاح الدینی ئەیوبی نەخۆم؟ چەند ساڵ موقابیلی چەند ئوردووی ئاوروپایی ڕاوەستا، موەففەق بوو، تار و ماری کردن، بۆچی سوێند بە ڕووحی سوڵتان مەحموود سەبوکتەگین نەخۆم؟ چەند مانگە ڕێیەکی ئاڵای محمد (صلی الله علیه وسلم) بردە ناو هیندستان.

لاکین مع الاسف ئوممەت سوێند بەو ڕیجالانە ناخۆن، کە تا ئەمڕۆ لە سایەی واندا ژیاون، سوێند بە دەروێشۆکە و سۆفیلۆکە ئەخۆن، هیچ و پووچ! ئیمام، ئیمام، وەلی وەلی، زیارەت، زیارەت، عەتەبات، ئەوانە بۆ قیامەتمان بەکاردێ، ئەدی ئەفەندی پارەی پێ دەست ئەکەوێ، کفن بە من ببڕێ، مردی گۆڕ بە گۆڕچی بڵێم چی؟ ئەوە وایە. ناتۆڕنە هیتلەری ئەو ڕووحە عالییە، ئەو قووەتە موجەسسیمە، پاش شکستی ئەڵمان ئوممەتی ئەڵمانی گرکردەوە، ڕووحەکی هاویشتەبەر، کە نازانێ مردن چییە؟ بەو موددە، ئەو ئالات و ئەدەواتەیان ئیختیراع کرد، مودهیشە، ئەوا موددەی ساڵەك و هەشت مانگە، حەرب ئەکا، لە هەموو مەیادین غالیبە، لەو ڕۆژانە یۆغسلافیا و یۆنانیشی قووت دا، ئەو هەموو دەوڵەتانەی ئیستیلا کرد، ئەمڕۆ سەرەکی لەشکری لە حدوودی تورکیایە، نیزیکی ئەستەنبوڵێ، سەرەکی لە حدوودی میصرە، لەو موددەیە فتووریان بەسەردا نەهات، ڕۆژ بە ڕۆژ نەشاتیان زێترە، لە مەیادینی بەڕڕو بەحر و هەوا، عادەتەن سەباحەت ئەکەن، چ سبقەکیان کرد؟ ئەم کائیناتە چۆن ئیدارە ئەکەن؟ ئێمە مع الاسف دڵ عاجز نازانین چمان بەسەر دێ؟ ناڕێك و ناپێك، نەفس پڕ لە خەبائەت، کسوول و بێ نەشات، وەك حوشترێ لە چیا و بەردەلاندا بڕوا، وەك کەری ناو قوڕێ، بەطیئی و گران، ڕوو لە پاش، کەوتوو بێ تەدبیر، خەریکی قومار و دزی و حیزی، بزانین عاقیبەت کوو ئەبێ؟

بۆ سوێند بە مەلائیکە بخۆم؟ کەڵکی مەیان چییە؟ هەرچی هەیە مەلائیکە! ئی بە هانای ئێمە بێ، خۆمانین، ئینسان بۆ ئینسان، ئینسانی مومتاز زۆر باشە، بۆ هەیکەلی ئیجتیماعی ڕووحە، حەیات بەخشە، بەسیە

بەسیه بەسیه، ئینسان بەخێوکەن، ئینسان بەخێوتان ئەکا، پیاو پیاو پیاو مەداری فەخرن. مع الاسف ئێمە لە کوللی جیهەتێ پاش کەوتووین، مردنێکمان بەسەردا هاتییە، ئومێدی زیندی بوونەوەمان نییە.

٣٦٥/١٠

## خوتبەی من لە ماڵی مەلا ئەفەندی!

خوتبەی سیاسی ئەمڕۆ ملووك و ڕوئەسای جەماهیر و قووادی ئەعزەم دەر عەهدی ئەکەن، ئەووەڵی سەفەری مەرحووم مەلیك فەیسەڵ بۆ هەولێر، ئێمە چووین. ڕۆژێ لە قەسری موعەللای مەلا ئەفەندی خوا دەوامی بدا، جەمعێ زۆر خڕبوونەوە، ئیشارەیان کرد، من نوطقێ عەجیبم ئیراد کرد، مەلیکیش بە تورکی نوطقەکی دا. ئەمری کردە من، لە وەقتی ئیلقای خوتبە، فەقەرە فەقەرە بۆ حازرانم تەرجەمە ئەکرد بە کوردی. وە بەعزێ بە ئیزنی مەلیکی، خۆم زیادم ئەکرد، شەرحم ئەدایە تا زەریف لە فەرمایشتی بگەن. پاشان چۆوە هۆدەی خۆی، ئەمریان کرد: یەکان یەکان بەعزێ ئەشراف چوونە حزووری، کە من چووم، فەرمووی أشهد بالله خەتیبی!

گوتم: وەکی خەتیبی سەر مینبەری مزگەوتان نا!

فەرمووی: نا، نا! وەکی خەتیبی مەحافیلی سیاسی!

حەققەن ئەویش خەتیبێ بێ نەزیر بوو.

٣٧١/١٠

## مەهدی هەر نەهات، نایەت!

لە بەعزێ مەقالاتی خۆم، ڕەدد لەوانەی ئەڵێن: ئەمڕۆ سبەی قیامەت ڕادەبێ! درۆ و دەلەسان و خەونان هەڵدەبەستن، حەتتا پێشی پەنجایە، تەقویمی ئێرانی ئیعلانێ کرد: لە پەنجای، پەنجاو دووی، چاکم لە خاطر دا نییە، مەهدی ظهوور ئەکا! کە مەهدیش هات، دونیا ئەمەندەی نامێنێ!

من وتم: ئەوە هەذەیانە، ئەگەر نەمرین پەنجاش ئەبینین، وە زێتریش ئەبینین، وە مەهدیش نایە! ئەوا بووە شەست، لا أثر ولا خبر، ئەوەی

ئەڵێ؛ قیامەت ئەمڕۆ، سبەی، چەند ساڵێ دی ئەبێ، یا موئمینە یا تەبیعییونە، ئەگەر موئمینە ئەوا قورئان ئەفەرموێ: إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَاهَا.

٣٧٩/١٠

## بەسەرهاتی دختۆرێك و ژنێکی حامیلە!

حیکایەتەکم لە دقتۆر ڕیاض مەخمەرچی حەلەبی بیست، بە موناسەبە لێرە بینووسم باشە: وتی: لە زەمانی تەحصیلم ئوستازەکم هەبوو دقتۆری حاذق، خاصەتەن لە فەننی تەولید گەلێ ماهیر و باهیر بوو، قاعیدەی وابوو، پاش دەرس لە مەعلوومات و تەجرەبییات و مەشهووداتی خۆی بەعزە حیکایەتی بۆ ئەکردین، ڕۆژێ وتی: ڕۆژێ لە دووم هاتن ژنێ حامیلە، لە وەزعی حەمل کەوتبووە زەیقەتی، چووم تێفکریم قابیل نەبوو ئەو منداڵە لەو مەخرەجە بێتە دەر، قطری سەری لە قطری دائیرەی مەخرەج گەلێ زەلام تر بوو، وتم: ئەو منداڵە نایەتە دەر بە سەلامەتی، ئێستا حەیاتی تیا ماوە، پاش ساعەتێ ئەمرێ، ئەو وەقتە بە ئالەتێ خاصە سەری ئەشکێنم ئەیهێنمەدەر، ژنەکە سەلامەت ئەبێ، ئەوە ئەچمەوە محەللی خۆم دوای ساعەتێ وەرنەوە دووم، دێم عەمەلیاتی ئەکەم.

ساعەت تێپەڕی کەس نەهاتە شوێنم، تەعەججوبم کرد، نەختێ چوو یەکێ هات وتی: ژنەکە بە سەلامەتی منداڵەکەی دانا، حاجەتی بە هاتنی توو ناکا!

حیرەت گرتمی، مستەکم لە نێوچەوانی خۆم دا و وتم: دقتۆر نیم ئەگەر وابێ!

زۆر نەڕۆیی کابرا هاتەوە بە ئیزتیراب وتی: دەخیلەك وەرە، ئافرەتەکە زۆر لە خەتەر دایە!

هەرچەند خواستم نەچم، لاکین ویجدانم تەحەممولی نەکرد، چووم دیم دوختۆرێ تریان هێناوە لە من هەرزانتر، عەمەلیاتی بکا، وە منداڵەکە بە سەلامەتی دەرێنێ، ئەویش بە بەعزە ئالاتی کۆنە خەریکە، ژنەکە هاواری ئەروا بۆ ئاسمان، فەریاد و جزع و فزع و ئەڵئەمان، دختۆریش بێ ڕەحم، گۆیا عەمەلیاتی تەولید ئەکا، تەکدیرم کرد، ناچار سەری

منـداڵەکەم لە دەروونـی دایکیـدا شـکاند، هێنـامە دەرێ، چـابوو ژنەکە ڕزگار بوو، هەندێ دی پێرانەگەیشتبام ژنەکەشی ئەڕۆیی!

۳۸۹/۱۰

## خەڵکی لە برسان ئەمردن، نەدەناژران !

ئێمە دیمان لە گرانی ١٣٣٦ی خەڵکی لە برسان ئەمردن، نەدەنـاژران، لەسەر گوفەکان، لە کۆڵانان، لەناو خانی یان لاشـەیان ئەکەوت، سـەگ ئەیخواردن، پاش ساڵێ ئەوی ما لە فکری چوو، ڕووی کـردە ئیسـراف، ئەتوت: نە بایان پێدا هاتیە نە بـاران. عەجایـب ئینسـان عیبـرەت نـاگرێ، ڕوو لە صـەلاحی دارەیـن ناکـا، تـابیعی هەوا و هەوەسـی خـۆیەتی. هنـدۆکیش مردیـان ئەسـووتێنن، ئەوەش بـۆ ڕیعـایەی مەسـاکینە، بـۆ گەورەگەورەکانی مـوقەددەس نییە، بـاوەڕ نـاکەم تـا قیـامەت بەشـەر لە عبـودیەتی ڕوئەسـا دەرچـن، هێشـتا لە عیبـادەتی کەر و گایـان دەرنەچووین، ئەوەش لەمەڕ ڕوئەسایانە، وایان بۆ دەست ئەدا.

۳۹۱/۱۰

## دوو ڕکاعەت نوێژی وا
## لە عیبادەتی مەلائیکەت خێرترە!

مسوڵمانێ ڕووت و قووت و نەخۆش و لاواز، لە سـبەینێیە وا سـارد، کە شەختەی کردیە، لەژێر لێف لاق و دەست ئەتەزێ، هەستێ بە ئـاوێ سارد دەستنوێژ بشوا، دوو ڕکاعەت نوێژی سبەینێ بکـا، لە هەزار هەزار نوێژ و سەجدە و ڕکوعی مەلائیکە خێرترە، بە هونەرترە. ئینسانێ فەقیر لە هاوینێ گەرم بایەکی دێ تیر ئەپرووکێنێ لە چۆل و سەحرا ئەخـولێتەوە بۆ کەتیرە، بە هەر حاڵێ بێ یەك و دوو ڕب کەتیرە بەدەست ئەخا، دێتە بازاڕ ئەیفرۆشێ، کولێرەیە ئەکـڕێ بـۆ سـەددی ڕەمەقـی ئەیخـوا، ئەڵـێ:

یارەببی الحمدلله، هەزار شوکر یا رب العالمین، ئەو شوکر و حەمد و ئەنایە، چۆنی تەقدیر ئەکەی؟ قیاس ناکرێ لە تەسبیح و تەقدیسی مەلائیکە.

٤٠٧/١٠

فەقیری ڕووت، برسی، بە شەوێ سەرما، بەیانی هەڵئەستێ، بە لەرزە لەرز، ئەچتە سەر ئاوێ، ئاوێ سارد، وەکی شەختە، دەستنوێژی ئەشوا، هەموو بەدەنی لە سەرمان فڕکە فڕکێ ئەکا، دوو ڕکاعەت بە قیرائەت و قیام و ڕکوع و سجود و قنووت ئەدا ئەکا، دیتەوە مالێ، ئەلەرزێ، ئاگری نییە، یا تروسکەیە، وەکی ئاگری بێوەژن و دزان، بە سەد حاڵ و تەقەلا کەمی گەرم ئەبێتەوە، ئەم دوو ڕکاعەتە هەزار ملیۆن عیبادەتی ئەو مەلائیکەتانە ئێنێ.

فەقیرێ ساحێب عائیلە بە زستان، ئەچتە بازاڕ، بە قوڕکاری، بە حەممالی دیرهەمێ پەیا ئەکا، ئەیدا بە نان و شێلم بە ترشی ئەیخوا، لەگەڵ منداڵانی هەزار شوکری خوای ئەکا، الحق الحمد لله، یارەب هەزار جار شوکر! ئەو حەمدە و شوکرە هەزار تەقدیس و تەحمیدی مەلائیکە ئێنێ.

سەپان سەپانی پیر، لە سبەینێ تا ئێوارە، دوورنەی ئەکرد، بە ماندێتی ئەهاتەوە پێش هەموو شت، دەستنوێژی ئەشووشت، نوێژی عەسری ئەکرد، ئەپاڕایەوە لەبەر خودا: خودایە هەرزانی کەی، هێمنایی کەی، تەوفیقی پاشای ئیسلام دەی، خولاصە بەو حالەی کە بەشەر تیایە، ئەدنا عیبادەتی لە فەوقی ئەعلا عیبادەتی مەلائیکەیە.

٦٠٢/١٠

## شێخایەتی سوننیان و ئیجتیهادی شیعان سەعادەتی ئوممەتیان برد!

سەوادی ئەعزەم لە بەشەر، لە هەر قەوم و میللەتی بێ، بە گەلێ کەس بە گەلێ شت فریب ئەخوا، تەبیعی عاممەی بەشەر وایە، ئەوی ڕاست بێ لەگەڵی، بۆ سەعادەتی دارەین سەوقی ئەکا، ئەمری بە چاکە،

نەهی لە خراپە، لەگەڵیان ئەمین و ساف و خاوێن بێ، بە تەرەققی و مەئاثیریان کەیف خۆش بێ، بە تەدەننی و مەسالیبیان مەحزوون بێ، نایانەوێ بە خائینی ئەزانن، ئەوەی لەگەڵیان خائین بێ، بە سازی وان لێ بدا، بە قسەی خۆشکەڵە خۆشکەڵە تەئمینیان کا، بۆی موسەخخەر ئەبن، موتیع و فەرمانبەردار، لایان زۆر موحتەرەمە، زۆر ئەمینە، لایە ڕوئەسای دین، لایە ڕوئەسای سیاسیون لە مەئاریبی خۆیان ئیستیعباد و ئیستیخدامیان ئەکەن. لە عالەمی ئیسلامیەت موصیبەتی گەورە، باعیثی جەهالەت و ضەلالەتی ئوممەت، ڕەوزەخوانەکانی شیعە و شێخەکانی طەریقی سوننسە، ئەلحەق وەکی گوتراوە، دینی موبینی ئەحمەدی مورسەلی بە بادا.

دەر سوننیان تەشەییوخ، وە ئەز شیعە ئیجتیهاد شەرەف و سەعادەتی دونیا و قیامەتی ئوممەتیان برد، بۆتە ژێر چەپەڵۆکی ئومەم، ئەلئان بستە عاردێ نییە لە مەمالیکی ئیسلامییەت، شەرقەن وە غەربەن، جنوبەن شیمالەن، کە لەژێر پای یا نفوذی ئەجانیب نەبێ. *الآن کان کما کان* مەلایانیش کرامة الاولیاء حق، زیارەتی قبور مەشرووعە، زائیر بە مەئجوورە، خوا لەسەر عەرشە یان نا؟ لایە بۆ خیلافەتی ئەبوبەکری، لایە بۆ خیلافەتی عەلی حەڕب ئەکەن، خاصەتەن شیعە بە دیعایە مەشغوولن، لاشەك ئەم حاڵە دەوام کا، ئیسماعیلیش وەکی ئیسرائیلی دووچاری غەزەبی خوا ئەبن، زیللەت و مەسکەنەتیان لێ ئەدرێ، لەسەر هەڵ ئەدرێ، حەتتا قسمێ بە نەوعێ بەستەزمان و عەقڵ کەمەکانی مسوڵمانان ئەفریوێنن، ئەڵین؛ ئەو ئایەتە (يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ) ئەڵێن؛ ئەننەهو تەلقینی خەصمی تیایە، یەعنی ئەی ئینسان بڵێ: ئیلاهی کەرەمی توو منی مەغروور کردیە!

٤١٧/١٠

## بەسەرهاتی خاوەن ماینەکە!

شەخسێ وتی: چوومە کەرکووك، ماینەکی بۆرەم هەبوو، پیر و لاواز، فرۆتم، چەند ڕۆژێ دوایە چوومە مەیدانی ولاغ فرۆشان، ماینەکەم دیت،

قەڵەو بە شەوکەت، حەزم لێکرد، کریم، بۆ ماڵی خۆم گەڕامەوە، سواری بووم، دیم سەبر سەبرە ئەپووتێتەوە. ئاخری چورچ و لاواز بوو، ئەنۆڕم ماینەکەی خۆمە، توومەز فوویان دابوو، ڕەنگیان کردبوو، گۆڕیبوویان کردبوویانە ماینێ ترا! حکومەت و میللەت لە چەنگ ئەوانە بێزارن، ئەمما چارەشیان پێ ناکرێ.

٤٢٤/١٠

## کچی شێخ نەبی ماویلی بەدوای قەتارچییەکی کەوت!

مندالْ بووم لە عومری هەشت و نۆ ساڵی، زستانەکی کچی شێخ نەبی قوتبی ماویلی، لە ماڵی ئێمە بوو، ئەو زستانە نەیانهێشت بچمەوە ناو ماڵ، کچی شێخی ئەیفەرموو: نەزەری حەرامە، بەعزە شیوی نەدەخوارد، ئەیوت: شکم لە حەلاڵی ماڵی ئێوە نییە، لاکین ئەترسم بەققالەکەی ڕوونی لێ ئەکرن بە زەریفی تەرازووەکەی خاوێن نەکاتەوە، ڕوونەکە حەرام بێ، کەم و زێدەیی تیا بێ!

خولاسە بەو نەوعە تەکەللوفاتە زۆری عەزابی عائیلە دا، لە ئەواخیری زستان، تەشریفی بەدوای قاترچییەکی خۆیان کەوت، بە جارێ تەرازووی تێکدا!

٤٢٥/١٠

## گەلێ شەو لە چنارۆك تا سبەینە نەدەنووستم، دەورم ئەکردەوە!

مع الاسف ئێمە لە ئوموری نافیعە مونافەسەمان لەگەڵ هیچ دوەل و ئەقوام نییە، ئەو هەموو ئیختیراعە کرا، لە ئێمە کەسێ نەبوو غیرەتێ بنوێنێ، تەتەبیعی ئاثار و خەواصی تەبیعەت بکا، شتی نوێ پەیا بکا، بۆ ڕۆژێ وەکی ئەمڕۆ بەکاربێ. من لەگەڵ ئامۆزایە خۆم مونافەسەکمان

بوو بۆ خوێندن، گەلێ شەو لە چنارۆك[1] تا سبەینە نەدەنووستم، دەورم ئەکردەوە، لە شار تاریك و ڕوونی بەیانی هەڵئەستام، ئەچوومە مزگەوت بۆ دەورکردنەوە.

قەت لەوە باشتر نییە بۆ کەسبی مەعاریف و سەرکەوتن، نە بۆ دینی حەقیقی، نە بۆ دونیا مونافەسەکمان لەگەڵ ئەجانیب نەبوو، وە نییە، وە نابێ، ئەمما بۆ لەهوییات و خەمرییات حەقـقەن موناقەسە ئەکەین، وە سیبقەتمان کرد، لەو انحطاطە خەریکی پێغەمبەرین، بەهائی و قادیانی عالەمیان خستە دەرکەی أسفل السافلین، سەفالەت و بێ هێزی، عەلاوەی وان، ئەلئان لە کۆیە شەخسێ ئۆمەرگونبەدی موحاکەمە ئەکرێ، دەعوای ڕیسالەت ئەکا، سبحان الله هەموو شتیان کردە گەمە، ڕیسالەتی چی؟ ئەمڕۆ موقابیلی ئەو حوکەمایە، ئەو زوعەمایە، ئەو غیرەتکێشانی ئەورووپا و ژاپۆن، ئینسانێ خۆی بە مێروویێ نایەتە بەرچاو، چ کەرامەتێ، چ موعجیزەیە، بەرابەری ئیختیراعاتی حوکەمای غەرب ئەکا؟

٤٣١/١٠

## وڵاتی ئێمە شەوی سافی زۆر کەمە!

حەققەن گەلێ ماهتاب هەیە ئەوەندە خۆشە، ئەوەندە بە جەمال و زینەتە، شایانە سوێندی پێ بخورێ. زاتێ بوو ڕەحمەتی خوای لێ بێ، شەوی ماهتاب نەدەنووست، ئەیوت: حەیفە ئەو ماهتابە خەسار ببێ. ئەمما مع الاسف وڵاتی ئێمە ئەوەندە مکردە، دائیم غەمبار و هەورە، شەوی ماهتابی صافی زۆر کەمە، هیلال تەرەققی ئەکا، ئەبێتە بەدر عن قریب ڕوو لە نەقس ئەکا، وەکی فووارەی ئاو.

٤٤١/١٠

(١) چنارۆك هاوینەهەوارێکە کەوتۆتە دامێنی چیای هەیبەسوڵتان بە دیوی ڕانیەوە.

## ئەشقیا!

لەو خودایە ذی البطش ـە ئەخوازم زۆر بە زوو لە ئەشقیایان ئینتیقام بستێنی، زەربەیە تەئدیبیان لێ دا هەڵی نەگرێتە قیامەت. ئیلاهی خۆت ئەزانی، ترسی قیامەت لە دڵاندا نەمایە، بە عەزابی ئاخیرەت تەخویفیی ئەشقیایان بکەین، گەمەیان پێ دێ، پێمان پێئەکەنن!

٤٥٧/١٠

لە ئەواخیری دەوری عوسمانی، بەعزێ ئەشقیای شێخ بزێنی خەرمانی دەغڵیان ئاگر ئەدا، ساحێبیان ئەکوشت، ئەیانهاویشتە ناو ئاگرەکە. پێرار لە دێیە لە دێهاتی کۆیە، عائیلەیە بێ دەستەڵات، ژن و منداڵی چکۆڵە، شەوێ بەخەبەر دێ خانوویان ئاگردراوە، باوکیشیان لە ماڵ نابێ، ئەمما دوو میوانیان ئەبێ، خۆو طالع هیممەت ئەکەن منداڵەکان قورتار ئەکەن. حەتتا حاڵی مسوڵمانان بە دەرەجەیە گەیشتیە برا لەسەر کۆتکە جۆیە، کۆتکە نۆکێ برای داك و بابی ئەکوژێ. ئەو هاوینەی چووی دوو برا لە ئەهالی کونەفلووسە پارچە گەنمێکیان ئەبێ، بە سەد موشەققەت ئەیدروونەوە، ئەیکەنە خەرمان گێرەی ئەکەن، شەنەبای ئەکەن، ئاخیر ڕۆژێ ئیشی تەصفیە تەواو ئەبێ برایە بە برایە ئەڵێ: ئەتوو هەڕۆوە دێیە، سبەی زوو کەرەگەل بێنە زوو دەغڵەکە هەڵگرین، من لێرە ئەمێنم هێشکی لە دەغڵەکە ئەگرم. سبەی برای قوربەسەر دێ، ئەنۆڕێ، برای سەربڕاوە و دەغڵیش نەماوە!

ئێمە لە چنارۆك دوقتۆر فایەق نحاس شامی یادی بەخێر بێ، لامان موسافیر بوو، لەو ڕۆژە لاشەیە مەقتوولیان هێنا بە چنارۆك دا بۆ فەحسی طبی، لە چنارۆك مومکین نەبوو، دختۆر ئەسبابی لا حازر نەبوو، لاشەکەیان بردە کۆیە.

حەوادیث بەو تەرزە زۆرە. با ئەوەندە بەس بێ.

٤٦٢/١٠

## کارەبا هێشتا نەهاتیتە کۆیە!

لە تەئریخی ١٨٧٩ ئەدیسۆن میصباحی کەهرەبای ئیختیراع کردیە، دونیای مونەووەر کرد، شەوی ئەننەهو گێڕا بە ڕۆژ، حالەن نەهاتیتە کۆیە لەو چەندانە میصباحی کەهرەبائی طولی ١٤ قەدەم، لە ئیرتیفاعی ١٥٠ قەدەم بە یادی موختەریعی میصباحی کەهرەبائی مستەر ئەدیسۆن لە حەدیقەی منلوپارك نەصب کراوە، نووری ئەو چرایە چەندە میل مەسافە ڕووناك ئەكا. نەصبی تیذكاری لایقی ئەو نەوعە زاتەیە. حەیفە بۆ ئێمە کەسمان نییە، بە حەق شایان بێ، شتێ وای بۆ نەصب کرێ.

٤٦٥/١٠

## شێخ سەلیمی بامەڕنی و سوپەری صاعیقە!

ساڵێ لە موصڵ بووم، لە خدمەت شێخ سەلیمی بامەڕنی، موسافیر بووم، ڕۆژێ ئەمری کرد، لە خدمەتیا بۆ لای باب سنجار چووینە سیاحەت، دەبۆی میری لەوێ بوو، پڕ لە باروود و مەوادی نارییە، دارێ لەسەر بانێ چەقاندرابوو، دارەکە بلوورەکی لە سەر نەصب کرابوو. شێخ فەرمووی: بابۆ ئەوە چییە؟

وتم سوپەری صاعیقەیە!

فەرمووی: چاوا دبێ؟

عەرزم کرد: ئەو دانە بلوورەی ئەبینی، ئەو ئاگری برووسکەی جەزب ئەکات ئەیداتە ئەو تێلانە، تێلەکان ئەیهاوێنە ئەو بیرانەی کە سەریان کەوتیتە ناویان، لەوێ ئەکوژێنەوە. وە ئیللا ئەو نەوعە عەمباری زەخیرەی حەربی ئاگری برووسکەی لێ دا دنیا وێران ئەکا.

ئەفەرموێ: ئەوە زۆرباشە، ئەمما شتی وا بۆ لای ئێمە نییە! یەعنی ئیختیراع ناکرێ.

وتم: خەتای ئێوەیە، ئێوە هەر ئەمر ئەفەرموون: چاوان بقوچێنن،

صـەلاواتی شـەریف و ئیخلاصـی شـەریف بخـوون. بەو حـاڵە ئەو ئیختیراعاتە ناکرێ. ....

هاوار خودایە، هاوار، لە عالەمی ئیختیراعدا ناوی کەسێ مسوڵمانی تیا نییە.

٤٦٦/١٠

## لەبەر (سبح اسم) و (هل اتی) ی نایەمە جومعە!

ئەوساڵ هـاوینێ ئـێمە لە چنارۆك بـووین، حـیکمەت زەهـاوی بـووە قائیمقامی کۆیە، ئەهاتە جومعە، پارەشی ئەدا فەقیران، ڕۆژێ بە کینـایەت وتی: لە عەقرە قائیمقـام بـووم، ڕۆژێ نەچـوومە جـومعە، مەلای جـومعە وتی: بۆ نەهاتیە جومعە؟

وتـم: لەبەر (سـبح اسم)ـە و (هـل اتـی) ی، هەمـوو جـومعە هەمـوو جومعە، لە تەماشاکردنی حوشتر ماندی بووم!

وای پێ خۆش بوو بگۆڕێ. جێژنی ڕەمەزان من ئیمامەتیم کرد، لەبەر وی گۆڕیم، کەچی ئەو نەهاتبووە نوێژ، چاوی تێـك چووبـوو، زۆر پـێ نەچوو، فەصلیان کرد، چۆوە بەغدا.

٤٧٦/١٠

## فەقیر وەکی پەیوولە لە کۆڵانان ئەخولێنەوە: خوا خێر و بنووسێ!

گرانی پێشوو دوور بێ لەوسـاڵ، ئەکـثەری خەڵکـی لەوانـی مـان، بە کەنگری ژیان، ماددەیان لە گیا و گوڵ وەرگـرت. ئەمسـاڵ مـع الاسـف لەوەڕ نییە، زسـتانی سـارد بـوو، بەفـر و بەسـتەڵەك بـوو، حەیوانـات زۆر مـردن، داروبـار وشـك بـوون، بەهـارە بـارانی نیـیە، دەشـت و چیـا بـۆز ئەچێتەوە، هەور دێ و دەچێ، دووکەڵە، خۆڵە، ئاوی تیا نیـیە. معـاذ اللـە بێ بارانی دەوام کا زۆر شڕ ئەبین، ترسی شەڕیش لەوێ ڕاوەستێ. خـوا بە حورمەتی ئەو ئایەتە ڕەحمێ بکا.....

دونیایەکی فانی، کاروان سەرا، ڕەنگە کەس دڵی پێ خۆش نەبێ، بێ

بەقایە، عەلاوەی ئەو هەموو ئەکدار و ئالام و ئەسقامە لەسەر ئەو هەموو ناخۆشییە، حەقیقەتەن عەداوەتی بەشەری شەڕ و شۆڕیان، سەففاکی و خوێنڕێژان، هەزار هەندی تر، تاڵ و ناخۆشی کردیە. خاسەتەن ئەمڕۆ تەماشاکە، لە مەشریق و لە مەغریب حەربێکە، تەئریخی بەشەر نەیدیوە، هەرچی لە ئەترافەوە بۆمان دەهات، غایەت گرانە و دەست ناکەوێ. سعری دەغڵ و دان لە زیادییە، کرم قسمەکی لە تۆی خواردیە، پێکبرە حالەن دەوام ئەکا، ئەوی ماوە، شر بووە، باران نابارێ، هوا مکدرە، موستەقبەل موظلیمە، ئەگەر ئەمڕۆ سبەی باران نەبارێ، ئومێد بە دەغڵ نامێنێ، دڵ وەختە بتەقێ، فەقیر وەکی پەیوولە لە کۆڵانان ئەخولێنەوە؛ خوا خێر و بنووسێ. دار و بار ئەکثەری وشك بوون، لەوەڕ و مەرعا نییە، توخوا بە چی هەڵئەخەڵەتێ؟

ئەمما لەسەر ئەو حاڵەش بۆ بەعزێ دونیا لە نوێیە، ئەمما خەوف، عاقیبەت عاممە مستولی یە.

٤٨٤/١٠ - ٤٧٨/١٠

## کوڕی جورجانی عەرزی بابی کردیە لە ماڵێ ئارد نییە!

مەشهوورە فەرزەندی سەیید شەریفی جورجانی، عەرزی بابی کردیە: لە ماڵێ ئارد نییە!

سەیید فەرموویەتی: عیلمی سی ساڵی لە یاد بردمەوە.

٤٨٠/١٠

## گەلێ شەو لەبەر گەرما و پێشکە خەومان لێ ناکەوێ!

لله الحمد ئێمە مسوڵمانین، هاوینان لە کۆیە، گەلێ شەو لەبەر گەرما و پێشکە خەومان لێ ناکەوێ. منداڵی مەعصوم بەستەزوبان، ئەزیڕێنێ، ناسرەوێ، لەناو جەهەننەم چۆن ئەنوێ؟! ئەوەندەش هەیە طورێ وی طورێ ترە، وە ئیللا ئینسان لەناو ئاگری دونیا چارەگێ دەوام ناکا، ئەمرێ ئەبێتە خۆڵەمێش!

٤٨٢/١٠

## خانووی بێتواتە!

لە بێتـواتە خـانییەکم دی، دوو نهـۆم لە بەردان دروسـت کرابـوو، لە دیوارانی نە قوڕ هەبوو نە چیدی، هـیچ درز و تیکیشـی نەبـوو. ئەڵـێن لە تەڕەف هەورامان ئەکثەری خانووی گەورە گەورەیان لە بەردان دروست ئەکەن، بێ قوڕ و گێچ.

٤٩٧/١٠

## مەلای فەقیر چاوی لە دەستی هەرچی و پەرچییان بێ، چ خدمەتەکی پێ ئەکرێ؟

وا دەرئەکەوێ، مال پێدان و دەوڵەمەنـدکردنی عەبـدی، ئەساسـەن لە ڕووی ئیکرام و ئیحتیرامە، حەقیقەتەن لە کوللی زەمانێ لە بەینی جەمیعی میلەل و نیحەل دەوڵەمەندی مایەی حوڕمەتە، مەگەر دەوڵەمەندەکی زۆر لەئیم و لچ ڕوو و ڕەزیل و فرۆمایەی، خاسەتەن لەو زەمـانە، بـۆ ئەهلـی عیلم، عیلم لە ئەلزەمی لزووماتە، کەسێ مەلا بێ، خوا لە عەمر و زەیدی موستەغنی کا، حەققەن حورمەتە، بۆ عیلم، بۆ دین. مەلای فەقیـر چـاوی لە دەستی هەرچی و پەرچییـان بـێ، چ خـدمەتەکی پـێ ئەکـرێ؟ عـیلم کوو زیاد ئەکا؟ ئەبێـتە مەلایە، کە لەو عەسـرە، بە حەق پێـی بڵـێن مەلا. ئینسانی کریم الطبع، هەوێن پاك، نێك گەوهەر، مەمنوون و موتەشەککیر ئەبێ لە ڕێی چاکە ماڵ صەرف ئەکـا، ئەوی بەدگەوهەر و مـایەپووچ و خوێن پیس بێ لە ڕووی کیبر و عینادەوە.

٥٠٠/١٠

## بە عیززەت تەرکی دونیامان کرد، بە زیللەت تەڵەبی ئەکەین!

من بەعزە ئەولیایە دەوڵەمەنـدم خـۆش ئەوێ، وابـزانم عەبـدولخالقی غەجدەوانی[1] زۆر دەوڵەمەند بووە، حەتتا وڵاغی بەرزەیـی چـاك چـاكی بووە، زنجیریان لە زێڕ، مێخ زنجیریـان لە زێـڕ، دەروێشـێ بـۆ ئیمتیحـان، وڵاغی زۆر عالی لێ ئەخوازێ، ئەفەرموێ: ئەوەتە، بڕۆ بیبە!

دەروێش زنجیرەکەی لە لاقی ئەکاتەوە، تەمای ئەبـێ بە جێـی بێڵـێ، شێخ ئەفەرموێ: جێی مەیەڵە، گوڵ مێخی ئەو زنجیرە لە عاردی چەقیوە، لە دڵـی ئـێمە نەچەقیـوە! یەکـێ لەو نەوعە زەواتە، سـەنەوی واریـداتی مولەلی، شێست حەفتا هەزار دینار بوو، ئەکـثەری لە ڕێـی خـوا سـەرف ئەکرد، ئەیفەرموو: ئەگەر سستی بکەم لە کەسابەت، وارداتم کەم ئەبـێ، خوا حیسابم لەگەڵ ئەکا: بۆچی سستیت کرد؟ سەعیت کردبا، با زیاد با، زیتر لە من سەرف کردبا! ئەلحەق ئەمە خۆیەتی!

حیکـایەت زۆرن، لاکـین حـاجەت بە حیکـایەت نیـیە. مـاڵی دونیـا مەداری ئیعتیبارە، مامۆستا مەلا ئەحمەد ڕەحمەتی لێ بـێ، ئەیفەرمـوو: بە عیززەت تەرکی دونیامان کرد، بە زیللەت تەڵەبی ئەکەیـن. ئیشـارەی بـۆ ئەو شێخانە ئەکرد بێ کار و کەسابەت بۆ جیهەتـی مەعیشـەت ئەگەڕان، بە سواڵ و سەدەقە بەڕێوە ئەچوون. بەڵـێ حـوببی دونیـا سـەری هەمـوو گوناهانە، قسەمان لە حوبب نییە، ئارەزوو ئەکەیـن بـۆ خـوددامی دینـی، خزمەتی دینی پێ بکا.

یـاڕەببی بە ڕەحیمـێ کـی هەسـتی
شـەش چیـز مەرا مەدەد فروسـتی

---

(١) خواجە عەبدولخالقی غەجدەوانی خەڵکی گوندی غەجـدەوانی نزیـك بوخـارایە، ناوبراو لە گەورە پیرانی تەریقەتی نەقشبەندی و لە شـێخە ناودارەکـانی مـاوەرائولنەهر بووە.

ئیمـــان و ئەمـــان و تەندروســـتی
عیلم و عەمەل و فەراخی دەستی[1]

٥٠٣/١٠

## مەلا و زمان زانین!

مەلای ئەمڕۆ لازمە لە علوومی نەقلی و عەصری موتەبەححیر بێ، وە زاتـێ مـوتەفەککیر و مـودەببیر و بە سیاسـەت و کەیاسـەت و قـووەتی تەعبیری چاك بێ، بتـوانێ حەکیمـانە موخاتیـب تێگەیەنـێ، مەلایـان پـێ گەیەنێ، بتـوانێ لەگەڵ ملـوك و عوزەمـا بـدوێ، لە مەحـافیلی سیاسـەت موتابیقی حال و مەقام نوتق بدا، قووەتی موقنیعی بێ، ئەمما زۆر دوورە، شەهامەتی خۆی ئاگاداری بکا، وە چەند ئەلسینە بزانێ.

٥٠٥/١٠

## توخوا کەسێ سەجدە بۆ گۆلك ببا، حەق نییە وەکی گای گێرەی پێ بکەی!

گەلێ کەس هەرچەندە حوڕڕن، خەتیان لە عبـوودیەت پتـرە، بەلاش خۆیـان ئەکەنە عەبـد و بەنـدەیی ئەم و ئەو. توخـوا کەسـێ سـەجدە بـۆ گۆلك ببا، حەق نییە وەکی گای گێرەی پێ بکەی!

لە ئەوائیلی تەحصیلم مامۆستایەك هەبوو، خەلکی لای سابڵاخ، نـاوی مەلا ئەحمەد ئەرشەد بوو، گەلێ جار هەناسەی هەڵئەکێشا: خـۆزی ئێسـتا

---

(١) ئەم شیعرە وەك بەدواداچوونمان بۆ کرد، هی ئەبو سەعید ئەبولخەیرە و مەلای گەورە ئاماژەی بە ناوی نووسەرەکەی نەکردووە و بە هەڵەش نووسراوە، راستییەکەی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

ای بار خدا به حق هستی
شش چیز مرا مدد فرستی
ایمان و امان و تن درستی
فتح و فرج و فراخ دستی

لە دێی بورهان بە پشتێ بەردم بۆ خانەقای شێخ شەمسەدین کێشابایەوە!
پاش ئیجازە چۆوە بورهان وام زانانــد، لەژێر کشانەوەی بەردان مرد، ئەمە گۆیا بۆ ئازادەگی قیامەتە. بزانن مەیلی عبودییەت چی ئەکا! گەرچی جەنابی ڕیسالەت پەنا زۆر تەشویقی کردیە بۆ عەبد ئازادکردن، ئەوانەی تەعن لە دینی ئیسلام ئەدەن، ئەوان کە سەعی ئەکەن عومومی ئەحراری عالەم ببنە عەبدیان.

٥١٦/١٠

## سەعادەتمەند ئەو کەسەیە، کلیلی دەرکەی خێران بێ!

ئەوانەی شووم و بێ کەڵك و وەج و تەنگییان هینایتە سەر فوقەرا و زوعەفا، دەرکەی خێریان لەسەر خۆ پێوەدایە، خوای تەعالا پێش دەرکەی جەهەننەمیان لەسەر پێوە ئەدا. نعوذ باللە سەعادەت مەند ئەو کەسەیە، کلیلی دەرکەی خێران بێ، شەقاوەتمەند ئەو کەسەیە کلیلی دەرکەی شەڕان بێ.

٥١٩/١٠

## بەسەرهاتی مەلای مقوم الناقة!

ئەلین مەلایە وەعزی ئەدا، ئەیوت: ئەی مسوڵمانینە لە خوا بترسن، خوا زۆر بێ موبالاتە، لەسەر حوشترێ چەند درهەم بایی، قەومێ وای هیلاك کردا!
مەلایان ناویان لێ نا (مقوم الناقة). حەقیقەتەن خوا بێ موبالاتە، غەنییە، کائینات بە ئانێ هیلاك کا چ پەکی پێ ئەکەوێ؟ گەلێ جار ئەڵیم خیدمەتی گەورەیی بە دەسەڵاتی بێ موبالات زۆر زەحمەتە!
جەنابی حەق بە لوتفی خۆی موعامەلەمان لەگەڵ بکا. ئامین!
٥٢٥/١٠

## عومەری خەییام!

جەزا و پاداشی چی؟ ئەدی ئەمن ئەمڕۆ ماڵی خۆم بدۆڕێنم، گۆیا سبەی خوا پاداشم ئەداتێ، نەخێر، قەت ئەوەی ناکەم، حازر بە قەردی نادەم، قیامەتی چی؟ جەهەننەمی چی؟ بەهەشتی چی؟ گشت فڕوفێڵ، ماڵ دەرێنەیە، چ گوێم لەو قسانە نییە!

بەڵێ کەسێ بەخیل بێ، ئەو نەوعە هەذەیانە ئەکا، بێ شك وە گەلێ ئەشعاریان لەو مەزموونە یەعنی حازری مەدە بە قەرد، نسبەت بە عومەری خەییام داوە. ئەمما لە حیکمەتی ئەو ناوەشێتەوە، وەلەو لە زومرەی بادەگوساران بووبێ.

٥٢٧/١٠

## نورەددینی برام و وەڵامی منداڵەکە!

ڕۆژێ لە ڕۆژان نووری‌ەددینی برام، لە مەدرەسەی ڕەسمی کۆیە، دەرسی تەفسیری بە منداڵ قوتابیان ئەگوت، وەجهی تەئخیری وەحی بەو وەجهەی مەشهوور کە گوجیلە سەگێ لە بن تەختی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مردبوو، وە مەلائیکە ناچنە جێگای سەی تێدابێ، خصوصی تۆپیبێ. ڕۆژێ هۆدەی ڕەسوولی ئەکرەم (صلی الله علیه وسلم) ئەماڵن، لاشەکەی فڕێ ئەدەن، ئەوجا جبریل دێ وەحی ئێنێ، رسول الله (صلی الله علیه وسلم) سەبەبی تەئخیری سوئال ئەکا، بەو وەجهە جوابی ئەداتەوە.

منداڵێ ڕاست ئەبێتەوە، ئەڵێ: من ئیعتیرازەکم هەیە، چما وەحی هەر لەناو ئۆدەی رسول الله (صلی الله علیه وسلم) بۆی دەهات؟ خۆ پێغەمبەر دائیم لە ژووری ئۆدەی خۆی نەبووە؟ با لە دەرەوە لە مەسجید بۆی هاتبا.

هاتنە لای من، من وتم ئەوانە هیچ نین. وەکی شێخ محەمەد عەبدە بەیانی فەرموو بوو، بۆم بەیان کردن، زۆر مەمنوون بوون.

٥٣٥/١٠

## ئیعدامی مەنصووری حەلاج!

نازانم کێ لە خەودا بە خدمەت حەزرەتی رسول الله (صلی الله علیه وسلم) گەیشتیه، لە خدمەتی قسە لە مەنصوور [1] کرایە، فەرموویەتی: ئەو شەخصە نەزانە، نازانێ ڕەزای من تابیعی ڕەزای خوایە. ئەوا حەوالەی شیری شەریعەتم کردا

ئاخیری مەنصور ئیعدام کرا! لاکین لە نەفس الامرێ ئیعدامی مەنصور شتێ سیاسی بوو، وەك شێخی سوهرەوەردی، بۆ زوبان بەستنی خەڵکی کیسوەیی شەرعیان لەبەرکردینە، وەك مەسئەلەی موعتەزیلی و خولەفای عەبباسییان، دەعوەتی موعتەزیلانیان کردە بەهانەیە سیاسی، هەر مەلایە بەدخواهی سەلتەنەتیان بوو، کوشتیان. لە عائیلەیان ئەمین بوون، دوایە ڕوئەسای موعتەزیلەکانیشیان فەوتاند. لاکین مەلایانی کوتوب ئاگایان لە سیاسەت نییە.

٥٣٨/١٠

## چاوەشیان کردیتە قوتب!

ئەلێن فلان وەلی ئەووەلی دز بووە، ڕێگر و فاسق و فاجر بووە، تۆبەی کردیە، وە نازانم چی کردیە؟ بوویتە وەلییە موختار! نا نا وا نییە، ئەمما سۆفییە قسان ئەکەن نابێ موخالەفەیان بکرێ، حەتتا ئەڵێن: وا بووە، ئینسانێ چاوەش زوڕنائەنگێو، لەناو حەلقەی شایی بووە، لەو ئانە قوتب

---

(١) حوسێن کوڕی مەنصوور (ابو مغیث البیضاوی)، بە (حەلاج) ناسراوە، لە (طور) نزیك البیضاء (فارس) لە دایك بووە، فەیلەسوفێکی سۆفی بووە، چەندین ساڵان لە خەڵوەتی سۆفیێتی ماوەتەوە، بە تایبەتی لەگەڵ (توستری و جونەید)دا، پاشان لەبەر دونیا بەکەم زانین (زوهد)، لە شاراندا گەڕاوە، بە زەندیق تاوانبار کراو، ٨ساڵ زیندانی کراو ئازاری چەشت، دواتر لە ساڵی (٩٢٢ز) لە بەغدا لە سێدارەدرا. لە دوای خۆی ڕێچکەی ئەو پەرەی پێدرا و هەندێك بە پیرۆز و هەندێکیش بە کافری دەزانن، تەنیا بەرهەمێکی بە زمانی عەرەبی بە ناوی (کتاب الطواسین) لە دوا بە جێ ماوە. المنجد، ص٢٤٠

مردیە، ئەویـان کـردیتە قوتـب، ئیـدارەی کائیناتیـان خستیتە بەردەستی، تابیعی ئەمر و ئیرادەی ئەوین!

دەك وێران بێ دنیا، بە قوڕبگیرێ، چاوەش ببێتە قوتب و ئیدارە بکا!

٥٤١/١٠

## فەقیری!

فەقیـری ئەوەنـدە چرووکە، لەگەڵ هـیچ ڕێـك نـایە، دڵ ڕاحەتـی لە جیهەت گوزەران، بـۆ ئەهلـی ئیسـلاح زۆر لازمە، خصوصـی ئیمـڕۆ بـۆ مەلایـانی خـادیمی دیـن ئەلـزەمە. فەقیـر سـووکە، عیلمـی ئەووەلـین و ئاخیرینی لەگەڵ بێ، ساحێبی گران نابێ، بەڵێ هێسك گران ئەبـێ کەس گوێی لە قسەی ناکا، خولاسە خوایەتیش لەگەڵ فەقیـری نـاکرێ، الفقـر مخزی بێ ئەصلە:

الفقر مخزی حدیث مفتری ذکروا

فاحذروا روایته من غیر تنبیه ذکروا

٦٤٣/١٠

## حەماغا گوتی دروستە بڵێی خوا ئازایە؟

لە جەڕبی سـابیق بووبـووە قاعیـدە هەمـوو کەس ئەیزانـی کە وڵاتـێ بدۆڕابا ئیعلانیـان ئەکـرد، دۆڵ و زوڕنـا لـێ ئەدرا، ئەکـوترا، کە وڵاتـێ گەورەمان گرتییە. بەحسی بەعزێ فتووحـاتی بە درۆ کـرا، لە دیوەخـانی غەفووری زادە حەماغـای گەورەی کـۆیە، شـێخێ حـازربوو، شـێخ مەلا محەمـەد ئـەمینی شیواشـانی خزمـی خۆمـان، وتـی: ئەوە ئـازایی مە نیـیە، ئازایی خوایە.

حەماغا بە دزی سوئالی لە من کرد: دروستە بڵێی: خوا ئازایە!؟

وتم: نا!

فەرمووی: بە خوای مەلایەتی شتێ باشە، هیچ نەبێ ئینسـان ئەزانـێ لە حەق خودا بدوێ!

٥٤٦/١٠

## چووینە نوێژەبارانە!

جەنابی حەق لەسەر سوننەتی ڕەسوولی ئەکرەممان لانەدا، دەرکەی ئینعام و جوودی خۆی لەسەر عیبادی فوقەرا بکاتەوە، سوئالی سائیلان قبوڵ بکا، وەقت زۆر ناخۆشە، هەموو شت گرانە، پارە نییە، بێ بارانییە، پیك بڕە دەغڵی نەهێشت. لەو هەنگامە چووینە نوێژە بارانە، مسوڵمانەکان بە عموومی چەند ڕۆژە بە ڕۆژووبوون، مع الاسف بە جارێ خاپووری کرد، نەختێ جۆ مابوو، سن و کیسەڵە مژیان، هیچیان نەهێشت، دێهات بە ئەکثەرییە چۆڵ بوون، ئەوی ماوە تەنك بووە (انا للە!)، گەرماش بەقییەی برد، گەنم بووە پووش بە غەیری دوعا و پاڕانەوە چیمان لە دەست نایە، ئیلاهی چارەیە!

٥٤٦/١٠

## بە منداڵی زۆر ئیشم نەکردووە!

ئەمن بە منداڵی گەلەك ئیش برادەرەکانم ئەیانکرد، ئەمن نەمدەکرد، خەیاڵم ئەکرد، ئەمڕۆ ئەو نەوعە ئیشە بکەم، کە بوومە مەلا لەسەر مینبەر لەسەر کورسی، وەعز چ بڵێم؟ چم پێ ئەڵێن؟ لا هەڵپچکڕایە وەکی من ئەو تەڕحە خەیاڵە بکا، ئێوە کوو محەممەد (صلی اللە علیە وسلم) کە بۆ هیدایەت و ئیسلاحی بەشەری داندرایە ئەبێ چۆن بێ؟

لەو چەند ساڵانە ئێوارەیە لەسەر بانی حەوزی مزگەوتێ دانیشتبوون، بەعزە منداڵ چوونە ناو باغچەی لەبەر مزگەوت، کوولەکە و موولەکە بکەن، منداڵی خەپەڵۆلە لاقی هەڵگرت بۆ ناو باغچە، دەرحاڵ گەڕایەوە، وتی: بە خوای ناچم، کوودی نادزم، ئەوڕۆ دزی بکەم، سبەی شتێ خراپتریش ئەکەم!

وتم: دەك ڕۆڵە عومرت درێژ بێ، خوا بەرخوردارت کا!

٥٥٢/١٠

## عیلمی ئالی جەلی بە زایع چوو!

باپیرە گەورەم جەددی ئەعلام، عەبدولرەحمان جەلی لەسەر (منح المكية)[1] ی شێخ ئیبن حەجەری مەککی، حاشیەیە دوور و درێژی هەیە، بە ڕیسالەت حسابە. دەلیلە موافیق و موخالیف و جەواب و قەدەح و دەفعی زۆر جوانی ئیراد کردینە، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لاکین مع الاسف عیلمی ئالی جەلی بە زایع چوو.

٥٥٢/١٠

## ڕیش پان و درێژ، وەکی جۆڕکی کەرێ، کلکی عەلی شیشێن!

لەو بەینە موتەسەبیینی تەریق، خوا کۆیان کاتەوە، هەذەیانی خراپ ئەکەن، نازانن قسان بکەن، نەزاکەتیان نییە، وەقتێ سەوادی ئەعزەم لە ئوممەت، شەمائیلی رسول الله یان ئەزانی، کە موراقەبەی شێخیان هاتە مەیانە، کەس ئاگای لە شەمائیلی ڕەسوولی خودای نەما. ئەبی شکلی شێخێ بزانن، لە موراقەبە بیهێننە بەر خەیاڵی خۆیان، بەعزەکیان زۆر ناشیرینن، کت و کۆر، ڕیش پان و درێژ، وەکی جۆڕکی کەرێ، کلکی عەلی شیشی، کە چەتر لێ ئەدا، ڕەشی گزرەی مل ئەستووری ورگ زەلام، لام وەیە کە ئەیانخەنە بەر خەیاڵ لە ترسان ئەهاڕینن، وە شیعەش تا قیامەت دەم لە تەفەووهات ناکەنەوە، دائیر بە شیشەیی نامووسی ئەکبەر زوبان درێژی ئەکەن. حەققەن ئەوە هیچ ڕەسوولێك ئوممەتی خۆی نەدیوە جەلال و ڕەفعەتی ڕەسوولی ئەکرەم لە کتابی خاتم الانبیاء تەئلیفی مەرحووم جەلال نووری دەرئەکەوێ، حەققەن کتێبێکە شایانە، هەر کەسێ حەزرەتی موحەممەد (صلی اللە علیە

[1] کتێبەکە ناوی (منح المكية بشرح الهمزية)یە.

وسلم)ی خۆشبوێ و خوێندەوار بێ، نوسخەکی لەو کتێبە لا بێ.

وەقتێ ئەربابی تورك مودافەعەیان ئەکرد، ئەمما مودافیعی جەسوور بوون، زۆر قسەی وایان کردیە مەلایان نەیانئەتوانی ئەو قسانە بکەن، قلنجی زادە ئیسماعیل عەجایب ئەدوێ، یەکێ لە غەربییان تەعنەی لە حەزرەتی محمد (صلی الله علیە وسلم) دابوو، ئیسماعیل مودافەعەیێ جوانی کردبوو، نیهایەت ئەیوت: هیچ نەبێ محەمەد داك و باوکی مەعلووم بوو.

٥٥٤/١٠

## سەبەب چییە، ئەو دۆم و قەرەجانە ئاوارەن!؟

کەسێ بنۆڕێتە کوتوبی ئەوائیل، لە مللیون ئەبینی ئیلاهـ و ئالیههیان کردینە مەلعەبە و مەوزووعی حیکایاتی پڕوپوچ، بە حیکایات هەزار کەسی مردییان زیندی کردینەوە، ئەتیبا چاوی کۆرەمۆش و ئەبرەص و ئەمراضی صەعبتر ئیزالە ئەکەن، زگ ئەدڕێنن، گورچیلە دەردێنن، نە خوا، وە نە کوڕی خوان.

لە بەعزێ تەواریخی عموومیم دیوە، ئەڵێ: سەبەب چییە، ئەو دۆم و قەرەجانە ئاوارەن، هەر ڕۆژە لە جێیە، بێ خان و مانن؟ ئەڵێ: یەکێ لە ئەوائیلیان نای زۆر باش لێ ئەدا، خواش حەزی بە دەنگی ئالاتی خۆش دێ، دەفعەیە خوا هاتە سەر عەردی، گوێی لە نای ئەو کابرایە بوو، لە تەڕەب کەوتە ڕەقس و سەما العیاذ باللە، کە بەخۆهاتەوە، زانی شتێ سووکی کردیە، ئەو خیفەتە سەبەبی ئەو شەخسە بوو، دوعای کرد: بڕۆ بێ مەئوا و مەسکەن و ئاوارەی دار و دیار بن!

ئاوەها خوا دێتە سەر شکلان! العیاذ باللە.

حەتتا لە تەورات دەرئەکەوێ، لای حەزرەتی ئیبراهیم علیە السلام گۆشتی گۆلکی بریانی خواردیە، وە چرە دووکەڵی گۆشت و قۆچ و موو و پێست و سم و چەورایی قوربانی، عەتری خۆش بۆی خودایە العیاذ باللە، بە کاتی تەدوننی هاتە خوار، تا وەکی میقرۆبلا چووە ناو

زگی کچە جووێ خۆی کردە عیسا، عیسای موحەققەر و موهان و مەصلوبی یەهوودییان. نازانم چ بلێم؟
دڵم لە ئەحواڵاتی بەشەر زۆر سەغڵەتە، میقادۆ بووە ابن السمایة، گاجووت ئەکەنە خوا، بە میئاتی ملیون سەجدەی بۆ ئەبەن. انا للە!
٥٥٦/١٠

## لە عومری خۆی ئەو جنێوەی پێ نەدراوە!

مەشهوورە لەسەر ئەلسینە، دوو کەس بە دەمەقاڵە هاتن، یەکیان بە یەکی وت: گەووادا!
کابرا سست بوو، لەرزی، کەوتە سەر ئەرزی، بێ هۆش، دەوریان لێدا؛ ئەمە بۆچی وای لێ قەوما؟ پیاوێ عاقڵ سوئالی لە ماجەرای کرد، حیکایەتیان بۆ کرد، فەرمووی: ئەو ئینسانە لە عومری خۆی ئەو جنێوەی پێ نەدراوە، بۆیە موتەئەثیر بوو، کەوت، بێ هۆش بووا!
چەند دەفعەکی ئەو کەلیمەی بە گوێی دادا، کابرا بەخۆهاتەوە، ڕیجالی گەورە گەورەی خوداوەندی عەزم و جەزم و مەتانەت وای لێ دێ.
٥٥٧/١٠

## وتم: ماڵوێران تو ئەمڕۆ بۆ بەگژ هیتلەر و مۆسۆلینی و ستالین داناچی؟

مەلایە شیعە لەو چەندانە، کتێبەکی دانابوو، بە گژ بیلال و ئەبو هورەیرە و شێخی بوخاری و ئەو نەوعە زاتە داچووبوو، لە مەیدانی جیدال و قیتال وەکی عەنتەر تەعنی لەوانە ئەدا. وتم: ماڵوێران تو ئەمڕۆ بۆ بەگژ هیتلەر و مۆسۆلینی و ستالین داناچی؟ چیتە بەسەر ئەو فەقیرانەی ڕابردووی؟
ئەلئانیش ئوممەت و ڕوئەسای ئوممەت خەریکی ئەو جۆرە ئەو سەفاهەتەن، إنا للە!

٥٦٠/١٠

## علی الاکثر تەبعی بەشەر لەسەر دەنائەت و پەستییە!

مع الاسف علی الاکثر تەبعی بەشەر لەسەر دەنائەت و پەستییە، حەتتا ئەوانەی گۆیـا تەزکیـەی نەفـس ئەکەن، فەرق لە بەینـی پـاککردن و دەنائەت و ڕەزالەت نـاکەن، تـڕان ئەکەنـن، وەك کەرێ دەزەڕن، ڕووی خۆیان ڕەش ئەکەن، شەقێ تێك هەڵئەدەن، دەڵێن: هەتکی نەفسە!

هەتکی نەفس دروست نییە، ئەبێ نەفس تەقدیس بکرێ، لە زەوائیـل پاك کرێتەوە، گەورەبێ، گەورەیی خۆی بزانێ، غەیری خالقی ئەقـدەس و ئەعزەم و زاتـی واحیـدی واجـب الوجـود، کەس حەققـی مەعبـوودی لەسەر وی نییە، ئومێد وەیە خۆمـان خەریکـی نەواجـی و خەواریجـی و شـیعایەتی و فیرقەچییەتـی نەکەیـن، بە مەصـالیحی دونیـا و ئـاخیرەت مەشغوول بین، بەڵکو لەو زیللەتە دەردەچین، نەزەر بە حاڵی خۆمان، خوا شەرحی سەدرمان بکا. رب اشرح لنا صدورنا، ویسر لنا امورنا، ئامین!

٥٦١/١٠

## دوعای سەپانی!

چەندێ لەمەوپێش سەپان لەبەر بەری دروونەی هەڵئەستا، ئێـواران کە دەهاتەوە ماڵێ، دەستنوێژەکی ئەشووشت، نوێژێ باشی ئەکرد، ئەپاڕایەوە لەبەر خوا: ڕەببی هەرزانی کەی، هێمنایی کەی، تەوفیقی پاشای ئیسلامێ بدەی!

ڕووحی حەیات هەرزانی و ئەمنییەتە!

٥٦٤/١٠

## دەك لاڵ بم بۆتان عومەر و صەلاح

لە حەربی پێشی، قائیدێ فرەنسی، کە داخی قودس بوو، خیتابی کردە مسوڵمانان و وتی: ئەوێ ڕۆژێ فاررووق و سەلاحی ئەیوبی هاتنە قودس بە فاتیحی، چ معامەلەکیان لە حەق ئەجانیب کرد، ئێمەش ئیمرۆ ئەحسەنی موعامەلە لە حەق ئێوە ئیجرا ئەکەین!

دەك لاڵ بم بۆتان عومەر و صەلاح، ئەوێ ڕۆژێ حەیات و شەرەف و نامووسی مسوڵمانان حیفز بوو، لە سایەی شەرەف و ئینسانییەت و عولوویيەتی وان، دەخیلتان بم، لەگەڵ قەوم و ئەجانیب هەر چاکە بکەن، بێ حورمەتی مەکەن، وە ئیللا بێ حورمەتیتان دێتە ڕێ. دیتتان لەشکری مسوڵمانان چییان بە ئەرمەنی و سائیری ئەجانیب کرد؟ ئەوانیش چییان بە مسوڵمانان کردەوە!

خەییام ئەڵێ:

معشوق عمرش چو غمم باد دراز
امروز بە نەوە تلطف کرد ئاغاز
بر چشم من انداخ دم چشم و برفت
یعنی کی نیکوبی کن و در اب انداز[1]

٥٦٦/١٠

---

[1] شیعرەکە بەم شێوەیەیە:

معشوق کە عمرش چو غمم باد دراز
امروز تلطفی دگر کرد آغاز
برچشم من افکند دمی چشم و برفت
یعنی کە نکوئی کن و در آب انداز

## کە دین زەعیف بوو، باغاتەکان هەموو بەڕەڵابوون!

گەلێ جار وتومە: ئەو باغاتی لە چیا و چۆلان بوو، دین بەخێوی ئەکرد، کە دین زەعیف بوو، باغاتەکان هەموو بەڕەڵابوون. ئێمە سەوادی ئەعزەم لە بەشەر سەبەب بە بێ دینی، پەرێشان بووین، ماڵ و ڕاحەت و خۆشیمان نەما، بەعزێ کەس، بۆ خاتری لەهو و لەعب خۆی کەم دین ئەکا، تا گوناهی بۆ شیرین و بە لەززەت بێ، ئەمڕۆ نا سبەی نادیم ئەبێتەوە، حوکمی بە حەق ئەوەیە کە لە تەڕەف خودابێ.

٥٦٧/١٠

## ئەوەی قانوون دادەنێ، ئەڵێی قەرداری موجریمانە

زۆر جار ئەڵێم: ئەوەی قانوون دادەنێ، ئەڵێی قەرداری موجریمانە، زۆر تەرەفداری موجریمان ئەکا، خصوصی سیاسەتی ئێستا، گشت قانوونی بەشەری تێك دا. وەکی شێخ ڕەزای تاڵەبانی ئەڵێ:

قانون الاهی وارا کن یعنی شریعت
قانون هذیان در، چ اساسی چ سیاسی[1]

سەرامەدانی سیاسەت قانوونیان کردە تابیعی هەوای خۆیان، یاڕەبی توو أحکم الحاکمینی فأحکم بالحق.

٥٦٨/١٠

## قەلەمی خۆمان گۆڕیمانەوە بە قەلەمی مز و قەلەمی تەنەکە!

پێش ئەو ئینقیلابە بەعزێ صەنایعمان هەبوو، خۆکردی بوون، نەفعی

---

[1] شیعرەکە لە دیوانی شێخ ڕەزا، ساغکردنەوەی شوکر مستەفا وەها هاتووە:
قانون الهی وار ایکن یعنی شریعت
قانون هذیاندر چە سیاسی چە اساسی / لاپەڕە ٥٥٦

بۆ خۆمان بوو، ئەوانیش لەقیس چوون. عەجایب لەو تەرزە، تەرزی قەلەم، قەلەمی وڵاتی خۆمان، چەند جوان و چەند مەحکەم بوو. مامۆستایەکان چەند شیرین دایاندەدا، ئەویش چوو، گۆڕیمانەوە بە قەلەمی مز و قەلەمی تەنەکە، ئەو مەرەکەبە نازدارە فەوتا، مایە لووسی سوور و شین هاتنە جێی، واقیعەن تێشکاین، وەك مەسەلی فارس ئەڵێ: سنگین نشودی، سبوك چرای؟ نازانم بۆ وایە؟ تاکەی هەر وا ئەبێ؟ قەومێ نەجیبی عەرەب، لە سایەی خودا و نەبی ئوممی بوونە ساحێبی قەلەم و کیتابەت و مەسلەك و سەلتەنەت و خیلافەت و قانوون و شەریعەت. یەعنی لە هەموو جیهەت موستەغنی لە ئومەمی تر بوو. مع هذا لەو نیعمەتە عوزەمایە شوکر نەکرا، حەتتا بەعزێ لە ئودەبای عەرەب چەندێ لەمەوپێش بە تەقلیدی تورکان، ئەیانویست حروفاتی عەرەبی تەبدیل کەن بە حروفی لاتینی، ئەمە چییە؟ چی پێ ئەڵێن؟ حەققەن لیسانی عەرەب لە هەموو لیسانان واسیعترە، خەتیان لە هەموو خەتان خۆشتر و جوانترە، هەندێ مەخطوطاتی عەرەبی ئینسان ئەینۆڕێ چاوی پێ ڕووناك ئەبێ، عەرەب چۆن خەتیان پەیا کرد؟ چەند دەور و طەوری بەسەرهات، تا زەمانی عەبدولحەمید، کاتبی گەیشتە ئەو دەرەجە. حەققەن لە ئێرانیش لە زەمانی خولەفای عوسمانی ئیعتینایان بە خەتی عەرەبی زۆر کرد، خەطاطی عەجیبیان لێ پەیا بوو، میصریش باشە، گەرچی سەبەب بە طەبع، ئیعتینا زۆر بە خەت نەدراوە، وە خەت خۆشی بە کیتابەت گوزەران ناکا.

زۆر کەس هەن خەتیان وەك جێی چرنووکی پشیلەیە، لە غایەت گەورەیی و نیعمەت و خۆشییە، گەلێ کەس خەتیان وەکی دوڕڕە، نانی دەرەیان دەست ناکەوێ، وەکی ئەڵێن: قلم البلیغ بدون خط مغزل، بەڵکو تەشی چاترە، بە خوری ڕێستنێ شتێ پەیا ئەکا. بەڵێ هەموو شت طالیعی بەختە، ئەوی تورك ئەڵێ: شانس، ئەو حەز و بەختە چییە؟ لە چییە؟ کەس نازانی، ئینسان لە گەلێ جیهەت موحتاجە، بۆیە ئوموری موتەنەوویعەی هینایتە ساحەی ظهوور، ڕووت خەلق کرا، وە موحتاجی لیباسە، چی کرد؟ بۆ لیباس لیباسی گەیاندە چ دەرەجە؟ موحتاجی خواردنە، زراعەت و طەباخەتی بە چ دەرەجە گەیاند؟ موحتاجی خانە و

بنۆڕە قەسر و قسوری و باغات و جەنناتی، موحتاجی قەواعیدە، چی کرد؟ لە ڕێی تەدوین و علوم و قەوانینی ئیداری و سیاسی موحتاجی حیفزی مەملەکەت و تەوسیعییەتی، چی کرد، چی ئەکا؟ بۆ تەحەسسونی وڵاتی، وە ئیستیلای مەمالیك، ئەو تەبیعەتەی چۆن وا موسەخخەر کرد؟ خولاسە ئەوی کردی، ئیحتاجییە!

قەومێ بۆ دەفعی ئیحتیاجی سەعی نەکا بە موحتاجی و ڕەزیلی ئەژیە، بە ڕەزیلی ئەمرێ، ئینسان موحتاج بێ، خۆی بە غەنی بزانی، حیسسی ئەو نیعەمانە ناکا، حەتتا کیتابەت بە ڕەزالەت ئەزانی.

٥٧٤/١٠

## لەوەتەی لە بەغدام نوێژ تامی جارانی نەماوە!

ئەو تەئریخەی کە لە بەغدا بووم، ڕۆژێ بە حەمە عەلی خوارززام گوت، یاخوا ڕەحمەتی لێ بێ: نازانم بۆ کە لە کۆیە بووم، جار جار لە نوێژدا ترسێ حزووریکم بۆ ئەبوو، مووچڕکم بە بەدەن دا ئەهات، لەوەتەی لە بەغدام ئەوە نییە!

دوایە خۆم وتم: سەبەبی حەرام خواردنە، چ حەرامێ؟ لە جیفەی سەگ خراپتر! ئەکثەری ئەوانەی شتمان لێ ئەکڕین، پارەی قەحپانیان بە ڕیبا هێنابوو، معامەلەیان پێوە ئەکرد، حەققەن حەرام نووری ئیمان ئەکوژێنێتەوە. انا لله!

٥٨١/١٠

## مەسنەوی وەك قورئان تەماشا ئەکەن!

شتەکم لە فکر چوو، ئەوا ئەمڕۆ ئەینووسم، بەعزێ کاتیبەی ڕیاکاری خۆفرۆش، بۆ جەلبی خاطر و ئیزهاری بەلاغەتی قەلەم، گەلێ شت ئەنووسن، بۆ ئینسانی موتەفەککیر مایەی خەجاڵەتە. ئەز جوملە، حسین

کاشـف لە شـەرحی مەسـنەوی[1] موقـابەلە ئەکـا لە بەینـی قورئـان و مەسنەوی، ئەوە ئەڵێ: إقرأ، ئەو ئەڵێ: بشنەو، ئەو ئەڵـێ: علـم بـالقلم، ئەم ئەڵێ: ئەز نەی. مەسنەویان گەیاندیتە ئەو دەرەجە، مع أنە بەڕاستی نە من حیث العبارة نە من حیـث المعنـی کتێبـێ نیـیە، لە طەبـەقاتی عـالیە بـێ، سـاحێبی گەورە و مـوحتەرەم بـووە، تەبەعەی زۆر بـووە، وە ئـیللا ئەو ڕەواجەی نەدەبوو. حەققەن بێ ئینسافییە ئەو نەوعە کتێبە لەگەڵ قورئـان ناوببردرێ، قەلەم لە کێ؟ بلوول لە کێ؟ ئەوی بلوول ئەنگێوتە نەبـێ، لە قەلەم شەرم ئەکا، ئەو موقابەلەیە بکا، تەعەجوب لە قەلەم ئەکەم چۆن موافەقەی کاتبی کردیە لە نووسینی ئەو نەوعە هەذەیانە!

٥٨٣/١٠

## کە حورمەتی قورئان نەما، حورمەتی لەیلەتولقەدر کوو ئەمێنێ؟

لە لەیالی ڕەمەزان و غەیرە ڕەمەزان مزگەوتەکان چۆل و هۆل و بـێ ڕووناکین، هەموو لە لەهوو و لەعب و چایەخانە و قومارخانە و کارخانە و مەیخانە و تیاترۆ و سینەمادان، مەلائیکەت بێنە خوار بچنە کێ؟ لەگەڵ کێ موصافەحە بکەن؟ سەلام لە کێ بـکەن؟ مەلائـیکە لەبەر سـەعادەتی بەشەری ئیحتیفالیان بۆ ئەکرد. کە بەشـەر ئیحتیفـالی بـۆ نەکـا، مەلەك بـۆ بیکا؟ چ جایە ئیحتیفال بە لەیلەتولقەدر، لە سەدا هەشتای بە ڕۆژوو نابی، خصوص لەو بەینە، بۆ هاوین دێ کەم کەس بە ڕۆژوو ئەبـی، شـەرەفی لـەیلەتولقەدر بە نزولـی قورئـانە، کە ئەشـرەفی کوتـوبی ئیلاهیـیە، کە حورمەتی قورئان نەما، حورمەتی لەیلەتولقەدر کوو ئەمێنێ؟

٥٨٨/١٠

---

(١) مەبەستی کتێبی مەسنەوی مەعنەوی جەلالەددینی ڕۆمی بەڵخی یە.

## لەبارەی لەیلەتولقەدرەوە!

ئەوەی حەکایەتخوانان ئەیڵێن، کە لە شەوی لەیلەتولقەدرا ئەبێ، هیچی وا نییە دار و بار و چیا و کۆشك و سەرا و ناکەونە سەجدە، گۆلکی پیرەژنیش بە دارەوە هەڵنائاوەسرێ، ئەوانی بێ ئاگا لە حەدیس ئەم خورافاتە بە حەدیس تێئەگەن، وە بە حەدیسی ئینکاری ئەکەن، ماڵ وێران ئەبن، ئۆباڵیان بە ملی مەلایان. چۆن دێتە میزانی عەقڵ و عەدل و شەرع و ئینساف، کەسێ هەزار مانگ فی سبیل الله غەزا بکا، وە شەڕ بە شەویلاکەی حوشتر بکا، وەك شێری بوڕندە شێران شەق بکا، کە برسی بوو، گۆشتی لەسەرا خەلق کرێ، کە تێنی بوو، ئاوی بۆ لە جێی ددانان هەرقوڵێ، وە کەسێ شەوی لیلة القدر ئیحیا کا وەلەو بە دوو ڕکات نوێژ خێری ئەو کەسەی بگاتێ؟! لاشەك ئەوە داوە مسوڵمانان فێری کەسالەت ئەکا. حیکایەتی ئەو شەمشوونە لە تەوڕات دا هەیە، ئەمما نە بەو نەوعە، تەبیعی ئیسرائیلیات کە هاتە ناو مسوڵمانان حیکایەتخوانەکان کلك و گوێی بۆ ئەکەن، ڕێکی ئەخەن، وە ئەو ژنەی کە بە مووی سەری بەستوویەتی، ژنی نەبووە، مەعشووقەی بووە.

گوێ و لێ بێ، لێرە قسەیان کرد، ئایا شەوی لەیلەتولقەدر گەورەترە، یا جومعە؟ من کەیفم بەو قسانە نایە، جومعە لەبەر نوێژی جومعە شەرەفی زۆرە، ئەمما نەختێ تەماشای جومعە کەن، وە گوێ لە خوتبە ڕاگرن، ئەزانن ئەمڕۆ فەزیلەتی ڕۆژی جومعە لە چ دەرەجە دایە. بەڵێ ئەگەر مەخلووقێ زۆر بە پاك و خاوێنی لە مزگەوتی گەورەی بە حەشمەت، بێ صورەت و لەوحە و نەقش، سپی، بێ پەڵە، خڕبنەوە، زاتێ عالیم ذی نفوس بە هەیبەت و شەرەف بچێتە سەر مینبەر بە گوێرەی زەمین و زەمان خوتبەیە بخوێنێ، قەوم تێبگا، دەرسەکی عومومی وەرگرن، بە ئیخلاص دوو ڕکاعەت نوێژ بکەن، حەققەن ڕۆژێ زۆر ساحێب فەزل و گەورەیە، جێی ئیحتیرام و ئیجلالە. ئەمما دوو سێ گەجەر و گوجەر لە مزگەوتێ پەسموردە، خۆڵاوی، خەرپتە، وە مەلایە چلکن و دیناریاوی، بچێتە سەر مینبەر، کۆنە خوتبەیە هەشتا ساڵ پێش ئەمڕۆ بخوونی، سارد و سڕ و بێ تام. وە لە لە خوتبەی ثانی بە نەوعێ ناوی غەوثی یا ئیمامی ئەعزەم یا شێخی کەرخی، عومەری سوهرەوەردی، ئەوە لە بەغدا، لە موصل حەزرەتی یونس و شیت و

جەرجیس بە نەوعێ ئێنن، ئینسانی مسوڵمان مووی لە بەدەنی ئەبیتە نەشتەر، خوایە ئەمە چییە؟ چ بلعاتە؟ لە چ ڕۆژێ خوتبەی وا خوندرایە؟ جا توخوا ئەو ڕۆژە چ قەدر و قیمەتی هەیە؟ سەد حەیف بۆ مەنابیری ئیسلامییەت، سەد حەیف بۆ ئەییامی قەدری عالەمی ئیسلامییەت، خۆمان لە بەینی ئوممەم قەدرمان نەما، لەیلەتولقەدر قەدری ئەبێ چ بێ؟

٥٨٩/١٠

## ئەم هاوینە لە چنارۆك ڕیسالەکی کوردیم دانا!

ئەم هاوینە لە چنارۆك ڕیسالەکی کوردیم دانا، بەناوی مجدد- نوێکەرەوە، زۆرباشە، ئەگەر مسوڵمانان گوێی لێ کەن، فائیدەیی لێ ئەبینن، ئەگەر موەففەق بم ئەیکەمە عەرەبیش.

٥٩٨/١٠

## بە خوای خدمەتی دین بە فەقیران ناکرێ!

مەلا، لەوەی چاویان لە دەستی خەڵکی بێ، بۆ کۆتکە جۆیە دین بگۆڕن، بە خوای خدمەتی دین بە فەقیران ناکرێ، مەلای موتەدەیین و بەقووەتمان پێ ئەوێ. بێ هێز چی لە مست نایە، مەسیحییایەی قووەتی ساند بڵاوبۆوە، لەبەر قووەتی پاپا، شیعایەتی لەبەر قووەتی مەلایان، ڕۆژ ڕۆژ بە ڕۆژ لە برووز دایە، گەورەیی ئی مەلایانە، ئەهلی سوننە ئەوا ئەبڕێتەوە، لەبەر بێ قودرەتی مەلایان، نەختێ سەلەفی هەن باشن.

٥٩٩/١٠

چەندێ لەمەوپێش ڕۆژێ جەمعێ لە مەلایان لام بوون، گلەییان لە حالی خۆیان ئەکرد، عەرزم کردن: ئێمە حەقی گلەییمان نییە، کە نەزەر بە ئوممەت بێ قەدرین. چونکی گەورەیی دونیامان دا ئاغاوات، وە گەورەیی دینمان دا بە شێخەکانی طەریقەت، خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ، نە گەورەیی دینمان ما، نە گەورەیی دونیا، میللەت بۆ قەدرمان بزانێ، وە خدمەتمان بکا؟

٦٠٠/١٠

## قەزا و قەدەر!

قسمێ خۆیـان گـامەڵاس ئەکەن، سسـت و عاطـل و باطـل ئەبـن، هەرچـی هەیە لە تەرەف خـودایە، ئەبـێ ڕازی بـین، بە قەزای خـوا، ئیرادەی وایە، دنیا بکەوێتە ژێر دەستی ئەجانیب، ئێمە بکەوینە ژێر پێـی ڕەحمەتیـان. سـەوادی ئەعـزەم لە ئـوممەتی ئـێمە لەو حـاڵەدایە، بـۆ قورتـاربوون لە ئەسـارەت و ئیعـادەی عیزەتـی مـوئمین و نەجـاتی حوڕڕییەت، ئەسڵەن تێناکۆشن، وە بەو ڕەزالەتە موتەئەسسیر نـابن. بـۆیە گەلێ لە غەربییان وەکی کەیموون و ئەمثالی لە غەربییـان ئەڵێن: دینـی موحەممەد گولییە بڵاوبوویتەوە، شەلەلی عـاممە، جنـوونە، ئینسـان سـەوق ئەکا بۆ خمول و کەسالەت... الی آخری هەذەیان!

قسمێ لەگەڵ ئیمان بە قەزا و قەدەر سەعی ئەکەن، بەڵکو ئەو ئیمـانە سەوقیان ئەکا، بۆ ئوموری گەورە گەورە، بسم الله هەرچـی خـوا نەیکـا نابی، هەرچی بەسەرمان بێ لە تەرەف خوداوەیە با پێـیدا دەیـن، دەفعـی دوشمن کەین، بۆ خوا تێکۆشین!

لە مەدیـنە سـوار ئەبـوون، لە تەك کێـوی دەماوەنـد حەڕبیـان ئەکـرد، باریقەی شمشێر نووری ئیمانیان ئەخستە ناو دڵی تاریکی گومڕاهان، ئەمە خۆیەتی، ئەجەل یەکە نابێتە دوو، خۆیـان ئەهاویشـتە نـاو سـەفی عەدوو، دیارە ئەوان چـاتری تێگەیشـتینە. واجبە لەسـەر ئـێمە، کـوو مـودافەعەی سەرما و گەرما و برسیایەتی ئەکەین، مودافەعە و موکـافەحەی ئەمـراض و ئافاتی ئینسان و حەیـوان و نەبـات بکەیـن، حیفـزی حەیاتمـان لەسـەر واجیبە، نابی بە هەدەری بدەین. ئەگەر بڕوا ئەبی بە قیامەت، بڕوا بە قەزا و قەدەری خـوا، وایە، ئەوی تەسـلیمی مـوقەددیرات بـێ، سـەعی نەکـا، ناساغی بە خەڵاتی خوا بزانێ، دەرد و بەڵا و فەقیری لەسەر گر ئەبێتەوە، ئەژیە بە ڕەزیلی، ئەمری بە ڕەزیلی، ئەبێتە ژێر چەپەڵۆك، شـەڕەفی دونیـا و ئاخیرەتی نابی. لە قنووتی سـبەینان ئەڵێـین: ***وقنا شر ما قضیت***، دیـارە ویقایە لە شەڕی قەزا و قەدەر ئەبی.

ئەوی سووکە ئەیکەین، ئەوی حەزمـان لـێ بـێ، ئـاگر ئەسـتێنین، تـا

بەجێی ئێنین، ئەوی گران بێ، عیلم و سەبر و ئیرادە و عەزم و جەزم و ئیدراکی دەقایقی لازم بی ڕووی تێ ناکەین، بۆ قەزا و قەدەر بەجێی دێڵین، خۆ و طالیع. مەئموور مەرکەزێ مەسەلەن لە ساعەت دووی شەو تا طلووعی ئافتاب، ئەتوانێ قومار بکا، فتوور و سستی بەسەر نایە، بۆ خەو باوێشکی نایەتێ، ئەمما ناتوانێ ساعەتێ بۆ حیفزی ئەمن و ئاسایش، لەناو شار بگەڕێ، ئەڵێی باری فری لەسەر شان دانداریە!

٦٠٦/١٠

## بوولەرزە!

ئەمڕۆکە چوارشەمووە، بیست و هەشتی مانگە، دوو دەفعە بوولەرزە بووە، یەکێ شەو، یەکێ ڕۆژ ساعەت حەوت و دە دەقیقە باز زەلزەلە. حەقیقەتەن ئەمڕۆ عالەم لە زەلزەلەدایە، گرانییە، هەموو شت گرانە، نەخۆشی ئەنواعی زۆرە، حەرب دەوام ئەکا، جووت لە وڵاتی ناکرێ، تۆ نییە، ئەگەر بشبێ ترسی کرم و پیك برە و نەبارین و سن و کیسەڵە، لە دڵاندایە. خوا مەرحەمەت کا!

٦٠٨/١٠

## باباگوڕگوڕ

لە ئەوائیلی کە ئاباری نەوتی باباگوڕگوڕیان هەڵئەکەند، بیرێ دەرقوڵی، بە نەوعی هائیل، ترسان کەرکووك و ئەترافی کەرکووك لە نەوتا غەرق بێ، پێیان نەوەستاوە، تاکوو موهەندیسێکی ئەمریکایی هات، بە قووەتی عیلم بەستی. ئافەرین لە عیلم.

ئەرز بە قووەت و شیددەتی زەلزەلە شقوقی تیا پەیا ئەبێ، ئەو ئەثقالەی لەناوی دایە، لە مەعادین و کنووز و هەیاکیلی موتەحەجیرە، وە ئالات و ئەدەواتی ئەزمانی قەدیمە، فرێی ئەداتە دەرەوە. ئەمڕۆ حالی حازر بە واسیتەی عولەمایانی جیۆلۆجیا وە بایۆلۆجیا، وە ئەرکیۆلۆجیا، لە ئەرزی ئاثاری عەجایب دێتەدەر. لەو چەند ساڵە ئەهرامی میصریان کون کرد، هەیاکیلی فەراعینەیان هینادەر، عەجایب ضەجەجەیەکی دا،

زەلـزەلەی خستە نـاو مەلایـان. لەو موستـەخرەجاتە ئەخبـاری عەجیـبە وەرئەگرن، ئەنئەهو ئەرز خەبەریان ئەداتێ.

٦١١/١٠

لە بەعزە ئەشعارێ کوردی گوتوومە:

عیلمـی تەبـیعەت عیلمـی خـودایە
قـاله و قەوله گشـتی هەبـایە
ئەگەر قیل و قال چ کەلکـی هەبا
دەبـایە دونیـا هەمـووی ئـی مە بـا!

٦١٦/١٠

## حاشا لەو مەدەنییەتە

بنۆڕە حەربی ئێستا، شارێ فەقیر، پڕ لە ژن و منداڵ و پیر، وە کۆر و شەل و سەقەت، شەو یا بەیانی هەزار تەیارەی ئەنێرنە سەر، بێ ڕەحـم و بـێ شـەفەقەت و بـێ مـرووەت، ئەو زوعەفـا بـێ چـارانە، بۆمبەردومـان ئەکرێن، بە لکووك منداڵی ناو لانکان، بە ساچمەی بۆمبا ئەبنە سەرەند و بێژینگ، حاشا لەو مەدەنیەتە، لەو تەرەقیاتە. خـۆزی هەمـوو ئاورووپـا لە پێ کەوتبا، بکەوتبانە گاگۆڵە، ئەمما ئەم تەرەقیاتە، فڕین بۆ سەما، نقووم بوون بۆ بنـی بەحـر نەبـایە، نە گوێمـان لە غەرامەفـۆن و ڕادیـۆ بـایە، نە حەرب صاعیقەشمان ببیستایە. ئەمە سەیرە، دونیـا وێـران ئەکەن، بە ملیـار بێ چارە و زوعەفا مەحوو ئەکەنەوە، وە ئەڵێن: ئێمە بۆ حیفزی ئەقەللیات و ئەقوامی زەعیفە و خدمەتی بەشەرییەت ئەو شەڕە ئەکەین!

ئەوە سـەیرترە، گەلـێ عاقلمەندیشـیان پـێ هەڵئەخەڵەتـێن، ئـۆخەی ئۆخەی ئەم شەڕە بۆ خێرێ ئێمەیە! سوف یری إذا انجلی الغبار[1]...!

٦٢٠/١٠

---

(١) ئەمە بەشێکە لە شیعرێکی بەدیعوززەمانی هەمەدانی، کە دەڵێت:

وقُلتُ لمَّا احتفل المِضمارُ واحتفتْ الأسماعُ والأبصَار
سـوفَ تـری إذَا انجَلی الغبـارُ أفـرسٌ تحتـي أم حِمَـارٌ

ئەو حرووبی مودونەش، کە غەربییان و ئەکثەری بەشـەر کردوویـانە، حەقیقەتەن بۆ دونیـا بـووە، تەمـاعە، مەحەبەتـی دونیایـان ئەوەنـدە زۆرە، ئەرزیان لا تەنگە، ئیستیللای بیلادی زوعەفایان ئەکەن، بە ناوی ئیستیعمار و تەعلیم و تەربییەی مەدەنی. کاکە لێن گەڕین، وەحشـەتەکەی خۆمـان گەلـێ خۆشـترە لەو مەدەنیـیەت و مەعـاریفەی ئێـوە. موجـادەلەی ئیشتراکییون و ڕەئسمالییون هەر لەسەر دونیا نییە؟ شێخەفەندی بە دەف و دونبەڵەك، یا سواری کەرێ، بەرماڵ بەشان، تەیلەسان لەسەر سەر بە مل، ڕیشی پانی چاو بە کل، گۆیا بۆ خـوا ئەگەڕێ، نەجـاتی بەشـەر بـدا، لە عەزابی قەبر و قیامەت؟ وەی لە قوڕڕێی نێم، سەراپا بۆ داندۆك و ساوار ئەخولێتەوە، وە ئەو هەرایە ئەکا!

٦٢٢/١٠

## چیا!

گەلێ چیا ئەثەری پیریان لێ بەدەرکەوتووە، وەکی چیای چنـارۆکی ئـێمە، ڕووکـاری شـیمالی ئەکثەریـیەت بـوویتەوە خـۆڵ، ئەگەر لەبەر تەڕاشان نەبی، بە بارانی بە ڕێژنە، زوو دێتە خـوارەوە، بە دەشـتایی بـڵاو ئەبێـتەوە. زورگەزراو زوورگـی سـمایل بەگییـان، بـووینە گـرد و تەپە، بەردیان نەماوە، چیای قەراج کەمەکی مـاوە، لەوی مـاوە هەنـدەکی زۆر بەرز و دڕە، پێـی ئەڵـێن: قەرەچـووغ! ئەویـدی موسـاوی بـووە لەگەڵ عەردی. قسمەکیش حالەن ئەثەری جحێلی لێ دیـارە، تەغیـری کەمیـان بەسەردا هاتووە، صونع و قووەتی بەشەری (رغـم أنـف)ێ مـام ئـۆمەری گردخەبری ئەوەندە زیادی کردیە، چیایان ئەکۆڵن، قیتاری شەمەندەفەری بە بندا ئەبـن، بەردی ئەکەنە ئـارد ئەیتـاوێننەوە. بیسـتوومە لەلای باڵەکـان نەوعە بەردێ هەیە، پارچە پارچەی ئەکەن، ئەیکوتن، تا وەکوو لۆلکەی لێ دێ، مومکینە ئەوانی تریش وایان بەسەر بێ.

٦٢٥/١٠

## بەسەرهاتی مەلا ئەحمەدی کۆرە

مامۆستا مەلا ئەحمەدی کۆرە، لە ئەوائیلی نەشئەتی، ئەحوال و وەجهی عەجایبی بەسەردا دەهات، فەرمووی: لە سلێمانی بووم، ڕۆژێ هاتە خەیاڵم: ئایا ئەو تەرازووەی ئەعمالی پێغەمبەرانی پێ هەڵئەکێشرێ، ئەعمالی ئێمەشی پێ هەڵئەکێشرێ؟ ئەی قوڕبەسەرم، چ عەمەلی وامان هەیە بکەوێتە ئەو تەرازووە؟ حال و وەجدی وای بەسەردادێ، لە شار دەچێتە دەرێ. ئاخیری ڕووئەکاتەوە شار، ئەچێتەوە مزگەوتی گەورە، حەزرەتی کاك ئەحمەدی شێخ بانگی ئەکا: ئاشەوان ئاشەوان!

ئەچێ بۆ لای حەزرەتی کاك، کاك ئەفەرموێ: ئایا ئەو تەرازووەی ئەمڕۆ لە دونیا زێڕی پێ هەڵ ئەکێشم. سلق و تووری بەو تەرازووە هەڵئەکێشن؟

فەرمووی لە فەرموودەی حەزرەتی کاك هاتمەوە سەرەخۆ، دڵم داکەوت!

٦٢٧/١٠

## بە مردووان خۆهەڵئەکێشن!

بە مردووان خۆهەڵئەکێشن: فلان، فلان، فلان، زەواتێ مەعرووف و مەشهوور، ئابا و ئەجدادی ئێمەن، ئەوانیتریش بالمقابلە تەعدادی جەمعێ لە ئابا و ئەجدادیان ئەکەن، ئەوە زۆر موسیبەتە. قەومێ لە زەمانی ئینحیطاطی کەسی نەبوو، حالی حازر خۆی پێ هەڵەداتەوە، بۆ ڕیجالی قروونی سالیفە ئەڕوا، بۆ ئەو ئابا و ئەجدادی، کە بووینە بانی مەبانی مەجد و عیزز و شەرەفی قەوم ئەڕوا. حەتتا زاتێ مەشهوور، نەسەب مەعلووم ئەڵێ: ئەو زاتە لە قەومی ئێمەیە، خۆی پێ هەڵئەکێشێ، ئەمما ئەوە نوشوستە وەکی کوردی ئەڵێ: نان ئەو نانە ئەوڕۆ لە خوانە! ئەووەلەن عەرەب، ثم الکرد، مع الاسف بەو دەردە موبتەلابووین. عیلمی ئەووەلین و ئاخیرین، حەزارەت و مەدەنیەت و عیلمی ئاورووپا، لەمەڕ

عارەبانە، ڕیجالی عیلم لە زەمانی ئەسبەق ئەسبەق ئەسبەق عەرەبن، مومکینە بڵێین: ئەدیسۆن داك برا یا پوورزای عەرەبانە!

سبحان الله مەلایەکی زەکی وەکی بهجت الاثری خوا نەجاتی دا لە مەعقەلی فاو، لە موقابیلی ڕیجالی غەرب ڕیسالەت پەنا و صدیق و فارووق زیکر ئەکا. مع الاسف ئەمڕۆ کەسی نەدۆزیەوە، ناعیلاج بۆ هەوراز ڕۆییە. واقیعەن لە عەسری ئێمە یەك دوو زاتی وەکی مەرحووم مەلیك فەیسەڵ و سەعد زەغلوولیان بوو، مع الاسف ئەوانیش ڕۆیشتن. ئەمما کورد حەقیقەن کززەم لە جەرگەوە دێ بۆ کوردان، ئەوانیش بووینە خۆ هەڵکێش، ئەمما ناعیلاجن، ئەبێ موقابیلی عەرەبان ئحمەیە بکەن، واقیعەن فارووقی ئەعزەم، خەلیفەی صدیقی ئەکبەر، بۆ عالەمی ئیسلامیەت مایەی ئیفتیخارن، لەگەڵ ئەوەشدا قسمێ لە عەرەبان لەعنیان لێ ئەکەن، قەومێ لەعن لە عومەر کا چۆن پیاو پێ ئەگەیەنێ؟
٦٢٩/١٠

## مەلای وەهابی!

خۆزی مەلای وەهابییان تۆزێ هاتبانە سەر عەقڵ، بە چاوی ئیعتیبار تەماشای ئەحوالاتی حاضرەیان کردبا، لەبەر لاپەڕە کاغەزی ڕیوایات مەحرووم نەبان لە موتاڵەعەی صەحائیفی ئەییام، مەلای ئەو عەسرە بان، نە مەلای سێزدە قرن پێش ئەمڕۆ، قەیدی سوننەت و بیدعەتیان لە قەواعید و نەوامیسی ئیدارەی مولك و حیفزی مەملەکەت، ئیدامەی عیزز و سەڵتەنەتی ئیسلام هەڵگرتبا، بە خۆشی ئیسلامەتی هەنگاوی هاویشتبا بۆ تەعالی. با مەهدی هەر لەناو بیر بێ، عیسا تا ئاسمان شەق ئەبێ، نەیەتە خوارێ. یا الله زەعیمێ موجەددیدێ، ئەو عالەمە زیندی کاتەوە، لەو بیر و قەبری زیللەت و جەهلە بیانهێنێتە دەرێ.

٦٣٦/١٠

## پێم دەڵێن چونکی من ئیستیغاثە لەبەر غەوس ناکەم، بۆیە چانابمەوە!

شێخ عەلی ئەفەندی جورحەکی لەژێر هەردوو پای پەیابوو، هەژدە مانگ دەوامی بوو، من چوومە زیارەتی ڕووی لە چابوونەوە بوو. ڕۆژێ فەرمووی: ئەڵێن: چونکی من ئیستیغاثە لەبەر غەوس ناکەم، بۆیە چانابمەوە. ناڵێم ئیستیغاثە لەبەر ئەولیایان دروست نییە، لاکین خوایە قەدیر، خوایە سەمیع، خوایە بەصیر، خوایە کە أسهل مایکون ئیش بکا، بۆ نەڵێم: یا الله!؟ بۆ هاوارکەمە بەر غەیری ئەو؟ هەژدە ساڵی دی بەو دەردە بناڵم، بە غەیری خوا هاوار ناکەمە بەر کەس!

بەڵێ شێخی ئەوهامانیش زۆر لازمە، حق الانصاف شێخ عەلی ئەفەندی لە مەسلەکی شێخی بە موجەددید حیساب ئەکرا. حق الانصاف شێخێ خالصی مسوڵمانێ زۆر باش بوو، وە مەلایە زۆر چاك بوو.

٦٣٦/١٠

## لەبارەی عەزابی قەبران دوو نەزیرەی خۆش:

من خۆم ئاگادارم، کچێ تاوس ناو، کچی ئەحمەدی ئۆمەر بەکری، جوانەمەرگ بوو، شەوێ لە خەوا بە داکی ئەڵێ: حاڵم زۆر خۆشە ئەمما قەبرەکەم ئاوی تیازایتەوە، زۆر ناڕەحەتم!

سبەینێ لەگەڵ جەمعێ، داکی چوو، قەبرەکەیان هەڵدڕی. حەقیقەتەن ناوی پڕ بوو لە ئاو، لە جێیەکیدی قەبریان بۆ هەڵکەند.

کچێ فاتیمە ناو، لە ماڵی ئێمە وەفاتی کرد، داکی ئەسڵەن دایانی کاك نورەددینی برام بوو، شەوێ لە خەوی دیت: پێی وت: دایە حاڵم زۆر خۆشە، ئەمما شانە مێرووێ لەسەرینگانێ قەبرەکەمە، عەزابم ئەدەن!

سبەی چوو، واقیعەن شانە مێرووییێ لەبن کێلی سەرنیگای بوو. مێرووەکانی لۆق لۆپاوی زل، شارەکەیان دەرخست، فڕێیان دا، جارێکی تر لەو جیهەتە نەهاتەوە خەونی. ئەو نەوعە حەوادیثە زۆرن، ئیتمیئنان بە دڵ ئەدەن.

٦٣٩/١٠

## موقابەلەی قووەت بە قووەت ئەکرێ!

نازانم کەسێ زالم، فاسق، فاجر، خوونخوار، غەددار، دز و ڕێگر، قاتل، چ ئیمانەکی هەیە؟ ئیمان بێ عەمەلی سالح کوو ئەبێ، وە ئیمان چییە؟ ئەگەر ثەمەرەی چاکەی نەبێ؟ وە لازمە بزانین عەمەلی سالح بە گوێرەی عەسر ئەگۆڕێ، وە عەمەلی ڕەئیس لەگەڵ ئی مەرئووس جودایە، کەسێ هاوار کا: ئەوا ڕووتم ئەکەن، ئەمکوژن! ئەگەر لە ماڵی برادەران جەمعێ لە یاران، بڵێن: ئێستا ئێمە تەهلیلە و خەتمە ئەکەین، ڕێمان نییە دوایە بە هاوارتەوە دێین!

ئایا هیچ ویجدان و ضەمیر و عەقل و شەرع و مورووەت و ئینساف و عاتیفە ئەمە قبوڵ ئەکا؟ ئەو قسەیان بە عوزر ئەشێ؟ حاشا و حاشا، ملیۆن جار حاشا، ئەمڕۆ عالەمی ئیسلامییەت لەو پەژارەیە، لەو بێ دەسەلاتییە، عەمەلێ سالح کە چارەی ئەو نەساغییە بکا، ئەبێ چ بێ؟ نوێژ؟ بەڵێ نوێژ لە وەقتێ تا ڕووحی هەبوو، زۆر باش بوو، ئەمما لەمێژە بوویتە عادەت، وە گەلێ کەس ڕووی لێ وەرگێڕایە، ڕۆژی، ڕۆژی زۆرباشە، بۆ فێربوونی خشوونەتی عەیش. زەکات! ئەگەر سەروەت و سامان هەبێ، زەکات بە حەق ئەدابکرێ، زۆر نافیعە، فەقیری نایەڵێ!

قسمەن ئینهیدامی ئیسلامییەت لە فەقیرییە، حەج! بەڵێ حەج بە تەدبیر بۆ ئاگاداری یەك و تەعاروف و تەضامی مسوڵمانان زۆر باش بوو، لاکین بە حیکایات و مەعنەوییات بۆ ئێمە بێ فائیدە بوو. مع الاسف حەج بە دەست ئوممەتێ سیاسی و مودەببیر و ڕاقی با، قەت ئیسلامەتی نوشوستی نەدێنا. لەوێ ڕۆژێ کە کەعبە بە پیر ڕابیعەی عەدەوییەوە چوو، ڕووحی حەج دەرچوو! زیارەتی عەتەبات و تەوافی مەراقیدی ئەئیممە و ئەولیا، الغیاث، هاوار، یا عەلی، یا عەبباس، یا ئیمام ڕەزا، یا کەرخی، یا غەوس، یا پیرەمەگروون، یا ئۆمەرمەندان، یا خاڵخالان، یا پیرۆتە سووری مەرگە، یا فلان، یا فلان، پوولێ ناکا. خۆتان مەگۆڕن، موقابیلی مەلایین، میثاتی مەلایین عەسکەری ئەجانیب، ملیارەهای ئالاتی

حەرب و ضەرب و تەخریب و ئیزهاقی ئەرواح، های هوویی و دەف و دونبەڵەك، کەڵك ناگرێ، ئەگەر کەلکی بووبا وامان بەسەر نەدەهات.

موقابەلەی قووەت بە قووەت ئەکرێ، حوشتر و دەببابە نابی مـن لە ئەوائیلی ئینقلاب بارەها لە وەعز و مەجالیس ئەموت: مەلا، شێخ، ئاغا، ئەوی دڵی بە ئیسلامەتی ئەسووتێ، ئەگەر ڕاست ئەکا، بۆ ئولف و مەحەببەت و ڕێکخستنی مسولمانان سەعی کا، تەفرەقە، بوغز و تەحەززوب نەیەڵێ، مسوڵمانان ببنە پاڵپشت و قوة الظهری یەك. عەمەلی ساڵح ئەمڕۆ ئەوەیە، مع الاسف کەس نەبوو، بەو ڕێیەدا بڕوا، بەڵکو هەر کەسە خەریکی خۆی بوو (کفن بە من ببرێ مردی گۆڕ بە گۆڕ چی) دەها زیادە مسوڵمانان موتەفەریق بوون. والحال تەفرەقە و عەداوەت و شیقاق و نیفاق لە زیادی دایە. بە کورتی هەرچەند حەسەناتی قەدیم و جەدید هەبوو، تەرك کرا، هەرچەند سەییئاتی قەدیم و جەدید هەیە، تەلەببوسی پێ کرا، موعتەقەدات و موعامەلات وڕوئەسای دین، الآن کان کما کان، ئەمە بە حەق خوسرانە، دەردێ بێ دەرمانە، قسە دێتە قسە دەڵێم: ئاخیری زەمانە، حەققەن نەجات نییە، ئیللا بۆ ئەوانەی کە ئیمانیان هەیە، ڕاسیخ و بەقووەتە. بێ غەلل و غەشە، بە گوێرەی عەسر، ئەعمالی صالیحە بەجێ ئەگەیەنن.

٦٤٥/١٠

## حەق گۆڕین بەڵاێ گەورەیە!

دێتە خەیاڵم لە موجەلەیە میصریم دیتیە، مەلیکی بەریتانیا، ئینپراتۆری سابیق جۆرجی خامیس، ڕۆژێ لەسەر مائیدەی عائیلەوی بیلموناسەبە، سوئال ئەفەرموێ: ئەوە چییە هەموو کەس تەڵەبی ئەکا، وە کەسیش پێی ڕازی نییە؟ لە مەیانە، ئەمیرەی کورەزای لام وایە، کچی جۆرجی حاضرە، وە مومکینە بیێتە ئینپراتۆریچە، جوابی دا ئەڵێ: ئەوە حەقە!

ئینپراتۆر تەحسینی ئەکا، حەققەن ئەو جوابە لە سەدا سەد ڕاستە، حەققە، عەلاوەی ئەمە، حەق گۆڕین ئیمان گۆڕین، عەمەلی ساڵح گۆڕین، بەڵایە گەورەیە. موعزەمی ڕوئەسای دین قەلبی حەقایق ئەکەن

بە قووەییە شاعیران ساحیرانە دەماغ مشەووەش ئەکەن. وەك عوممالی گۆڕینی ڕەنگی لەونی حەق بە باطل، باطل بە حەق ئەنوێنن، وە سەوادی ئەعزەم وای تێ ئەگا وە بە حەقی ئەزانی. خوا لە مەعنادا ئەمر ئەکاتە ئێمە بەو تەواصییە، مسولمانان یەك لە یەك، ئەم لە ئەو، بە تەئکید و ناوەندی دڵی بە یەك بڵێن: ئاگاتان لە حەق بی، حەق. حوکم بە حەق قولوا الحق ولو على انفسكم، شاهیدی بە درۆ مەدەن، حەقی کەسێکتان لەسەرە، ئیعتیرافی پێ بکەن، حەتتا ئیمامیان سەروەریان عەرزی خوا ئەکا، خوایە حوکم بە حەق بکە!

حەق و حەقیقەت گۆڕین، سەرمایەی سیاسییون و ڕوئەسای ئەدیانە، حەتتا بۆ هەوای خۆیان قەلبی تەئریخ ئەکەن، خوای ئەگۆڕن، کە حەقی موتڵەقە، گەلێ عولەمای غەرب، ئودەبای غەرب، حوکەمای غەرب، بە نەوعی سیرە و شەمائیل و دەعوەت و دینی موحەممەدیان گۆڕییە، قسەی وای لە حەق ئەکەن، حەققەن ئینسان لە ئینسانییەت شەرم ئەکا، چۆن توانیویانە حەق وا تەبدیل و تەغییر دەن!؟

سەوادی ئەعزەم چ جوو، چ دیان، چ بووزەوی، چ بورهانی، چ مسوڵمان بالخاصة شیعە بە نەوعێ ئیعتیماد ئەدەنە سەر قسەی ڕوئەسا و ئەئیممەی دینیان، رأى العين، علم اليقين، حق اليقين، بوطلانێ بەعزێ یا کوللی ئیعتیقادییاتێ لا ئاشکرا بووە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا دیعایەی بۆ ئەکا، گۆیا وا ئەزانی ئەوی ئیمام، وەلی، ڕەئیس گوتبێتی، حەق ئەوەیە قابیلی بوطلان نییە، ئەوەی موخالەفەی بکا کافرە، حەققەن ئەو قسە وا نییە، هەرچی بێ قابیلە بە غەلەت بچی، بە هیچ مەنقەبەیە بە هیچ مەرتەبەیە، ئینسان ناگاتە فوق الطبیعەت، غەلەت و سەهوو و نسیان، بۆ ئینسان بۆ ئوموری تەبیعییە.

٦٤٦/١٠

## تەعەصوبی مەزهەبی گەلێ شتی لێ گۆڕینە!

لام وەیە بێ شك عولەمای ئەهلی سونەت، وە عولەمای عەدل و تەوحید بەحث لە حەق ئەکەن، مەقسەدیان ئیزهاری حەقە، سیاسی نین،

لاکین تەعەصوبی مەزهەبی گەلێ شتی لێ گۆڕینە، (اسیراولیفرلدج) لە (برتان ڕسل) نەقل ئەکا. خولاسە ئەوی بەحس لە حەقایقی ئەشیا ئەکا، نابێ مەیل و موحابای هەبی، ئەگەر بە مەیل و موحابا بنۆڕتە ئەشیا، ئەوی کەیفی پێ نەیە، ولو کالشمس فی رابعة النهار، ئاشکرا بی، ڕەددی ئەکا. ئەکثەری ئەحزابی پەرلەمان وان، قەولی حیزبی موعاریزی پێ قبوڵ ناکرێ، وەلەو بزانێ (بحق حق)ـە.

ئوستاد جۆرج داروین[1] قەولێ مونسیفانەی هەیە، خولاسە: هیچ مەزهەبێ نییە هەمووی حەق بێ، وە هیچ مەزهەبیش نییە، هەمووی باتڵ بێ، ئافەرین من زۆر لەمێژە مونکیری ئەو قسانەم.

سەد شافعي المذهب بم ناتوانم بە ئیمامی ئەبو حەنیفە بڵێم: ئەوی توو بە ئیجتیهادی خۆت فەرمووتە، گشتی باتڵە. ئیحتیمالی حەقی هەیە، یەعنی ئیحتیمالێ زەعیف، چۆن ئەتوانم بڵیم: زەمەخشەری و ئەمثالێ لە عولەمای موعتەزیلی بەو هەموو خدمەتە، بەو هەموو تەفسیرە، ضالن، لە ئاگر دانە؟ زەینەل چاوەش، فاتەکەپوویان لەسەر هیدایەتن، ناجین، نعوذ بالله لە عەداوەتی مەزهەبی.

شێخی ئیبن تەیمیە، ساحێبی منهاج السنة، ساحێبی الجواب الصحیح فی من بدل دین المسیح، ضال ـە، گومراهە، ئەوەش جەسارەتێ عەزیمە؟

شێخی ئیبن سینا موعەلیمی ثانی، فارابی، ئیبن ڕوشد[2]، مولحید و کافر بوون؟ حاشا ثم حاشا، شێخ ئیبن عەرەبی هەرچەند بەعزە فەرمایشی هەیە، ئینسان تێی ناگا، ئەمما چۆن ئەتوانم بڵیم: کافر بووە؟ العیاذ باللە

---

(١) جۆرج داروین (١٨٤٥-١٩١٢ز) فەلەکناس و بیرکاریزانی ئینگلیزییە.

(٢) ئیبن روشد (ئەبو وەلید محەمەد کوڕی ئەحمەد) (١١٢٦-١١٩٨ز)، فەیلەسوفێکە لە قورتوبە لەدایك بووە و لە مەراکیش مردووە، زانستەکانی کەلام و فیقهـ و شیعر و پزیشکی و بیرکاری و فەلەك و فەلسەفەی خوێندووە، لە قورتوبە قازی بووە. لەبەر زۆری شەرحە باشەکانی بۆ بەرهەمەکانی ئەرستۆ، ڕۆژئاواییەکان بە شەرحلێدەرەوەی دەناسێنن. هەوڵی داوە لەنێوان شەریعەت و فەلسەفە گونجان دروست بکات، بەتایبەتی لە کتێبی (فصل المقال فیما بین الحکمة والاتصال)، لە کتێبی (تهافت التهافت)یش دژی غەزالی، بەرگری لە فەلسەفە کردووە. (المنجد، ص١٠)

ئەو زەواتە مایەی فەخرن بۆ ئێمە، جەمالی ئەفغانی، شێخ محەمەد عەبدە، سەید ڕەشید، تەنتاوی، لە تەئەسسوفان جەرگیان بۆ ئیسلامەتی سووتاوە، عومری خۆیان لە مودافەعەی دین و ئیرشاد و عیباد و ئیقاضیان سەرف کرد، حەققەن حەیفە لە حەق ئەوانە هەذەیان بکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە هیچیان مەعصووم نین، نەزیکە لە گەلێ مەسائیلی بە غەلەت چووبن.

توو ئەگەر مەلای ڕاستی، قسە چاکەکانیان قەبول کە، عەمەلی پێ بکە، لە قسە خراپەکانیان گەڕێ، وەسیەتی من لە تەلامیذی خۆم ئەمەیە: نەخەڵەتێن، تەکفیری ئەو نەوعە زەواتە بوزورگەوارانە بکەن، لە عیلمیان مەحرووم ئەبن. بنۆڕن سەبەب بە فەرمایشتی سەبووکی و ئیبن حەجەری مەککی ولاتی ئێمە تا ئەو بەینە لە عیلمی شێخی ئیبن تەیمیە مەحرووم بوون، ئەی برادەران تاڵبی حەق بن، لەسەر تەڵەبی حەق سەبر کەن.

٦٤٨/١٠

## ئەگەر ماڵی دنیا نەبێ قیمەتی جاشکەکی نییە!

زۆر کەس ئەبینی ئەڵێ: ماڵی دنیا هیچ نییە! مع أنە ئەگەر ماڵی دنیا نەبێ قیمەتی جاشکەکی نییە. لە کۆیە ئەوی ناوی موخەللەدە لە دەوڵەمەندان، ئەووەڵەن زاتی ئەکرەم و ئەقدەم و ئەشرەف حەویزی زادە حاجی مەلا بەکر ئاغا، نورالله ضریحه، دووەم حاجی وەسمانی حاجی ڕەشکی، سێیەم حەمەشین، نازانم کوڕی کێیە؟ ئەوانە ساحێبی ئەوقافی عومومی کۆیەن. ئەمڕۆش لە سایەی ئەو سێ زاتە عیلم لە کۆیە نەوعەن ما دەوام ئەکا، وە ڕەمەقێکی ماوە، حاجی بەکراغا هەرچەند ئەولادی زۆری بوو، ئەمما نەزەر بە مەسلەکی وجاغی کوێر بوو، إنا لله! پیاوی دەوڵەمەند بە شەرەف و جود و ئیحسان بۆ بەقای عیلم و دینی ئیسلام ڕوحی حەیاتە، کە ئەوان چوون، عیلم و دینیش نامێنێ، خۆت تەماشا کە ولیس الخبر کالعیان.

٦٥٦/١٠

## بەسەرهاتی من و گاجووتەکە!

لازمه به چاوی حەقارەت تەماشای هیچ مەوجوودێ نەکەی، ئەگەر گچکه نەبی، گەوره بی، پێی ناکرێ، ئەگەر گوێدرێژ و قەتارچی نەبی و ئاگرت بۆ نابی، له سەرمان ئەلەرزی، بێ نان و شیو ئەمێنیتەوە. له حیکایەتۆکان ئەڵێ: کێشکەیه هێلانەی له نزیك هێلانەی لەق لەقێ کردبوو، ڕۆژێ لەقلەق فەخری بەسەردا کرد:

ئەگەر من نەبام، مار فەرخەی ئەخواردی!

کێشکه وتی: ئەگەر منیش نەبام گێرکە، مێرووله، فەرخەکانی ئەکردنه سووره ساقته، هەتاو ئەیسووتاندن!

## هەروەك لەقلەق مارە ئەخوا، کێشکەش مێروو گێرکە ئەخوا، لەقلەق بەو گەورەییەی پێی ناوێرێ!

ڕۆژێ له ئەوائیلی سەفەربەری حەربی سابق له ڕێی قازبەگیان بووم، بۆ ئیرشاد و نەصیحەتی عیباد ئەگەڕاین، دیم گاجووتێ، خۆی گامەلاس کردبوو، چار پەلی فڕێ دابوو، سەری به عاردی کردبوو، جووجیلان دەورەیان لێ دابوو دەندووکیان لەناو گوێی له بن کلکی، لەژێر چەنگی ئەدا. هیچ نەدەجووڵایەوە، تەعەجەبم کرد.

گوتم: ئەوه چییه؟

وتیان: ئەو گاجووته گەنەی زۆره، ئاوا خۆی بۆ جووجیلان ڕاکشاندیه، تا گەنەکانی لێ کەنەوە! الله اکبر.

پاش بەینێ له چنارۆك بووین، چێڵ و چواڵمان له کانی کەندێ بوو، خەبەریان داینێ: گۆلکەکەتان ئەوەندەی گەنه و سپێ تێنیشتییه، دەمیان تێچەقاندیه، خوونیان مشتییه، مەعلووم نییه، ئەژیه!

هێنایانەوە، گەڕان، چەند مریشك و جووجیلەمان هەبوو، هینایان، دەورەیان لێدا به دوو ڕۆژ خاوێنیان کردەوە، گۆلك دەرچوو، به چەند ڕۆژێ تەواو هاتەوە سەرەخۆ!

خەلقــی خــوات لا گەورە بــێ، ﴿ما تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِن تَفَاوُتٍ﴾، خصوصەن پیاوی گەورە، وەلەو لەسەر دینت نەبی. ئیمپراتۆری ژاپۆنیا لە سەد ملیۆن زیاتر تەبەعەی بە ابن اللـه ی ئەزانـن، لا هەڵپچڕایـێ وەکـی من، چۆن ئەتوانم بە سووکی ناوی بینم؟ وهکذا سائیری زەواتی باریزە، لە شەرقی یان لە غەربییان لە عالەمی کۆن، لە عالەمی نوێ، سەد حەیـفە سـەد مخـابنە، بـۆ زاتـێ غەربـی نـاوی محمـدی عەرەبـی بە خـواری و ناشیرینی بێنێ، ئەسەف بۆ ئەخلاق و تەربییە، خەییام ئەڵێ:

سـوننەت مەکـون فریضـە حـق بگـوزار
وین لوقمە کی داری زو کەسان بازمەدار
غەیبەت مەکون و خەلقی خودا مە ئـازار
دەر عوهـدەیی آن جهــان مەنەم، بــادە

ئیعتیـرازی لـێ مەگـرە، کە ئەڵـێ: سـوننەت مەکەن، ئەمە تیـای هەیە، گەلێ کە خۆیان بە سوننەتان مەشغوول ئەکەن، وە فەرزی خـوا بە جـێ ناگەیەنن.

وابزانم نووسیوەتم: ڕۆژێ لە دیوەخـانی دانیشـتبووین، ڕۆژی جـومعە دیقەتم کرد، یازدە کەس تەسـبیحیان هەڵئەخرانـد، سـەلەواتیان لـێ ئەدا، فەقیری بە حەق، موستەحەق هـات: نـووزاوە پـاراوە، ئەوی تەسـبیحی بە دەستەوە بوو، پارەکی نەدایە، تا ساحێب مـاڵ شـتەکی پـێ کەرەم کـرد. ئاوا قوربان؟ ئەدی!

٦٥٧/١٠

---

[1] لە ڕاستیدا چوارینەکەی خەییام بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

سـنت مکـن و فریضـه حـق بگـذار
وان لقمه که داری ز کسان باز مـدار
غیبـت مکـن خلـق خـدا را مـازار
در عهـده آن جهـان مـنم بـاده بیـار

## حۆقەی ڕوون وەها گران بوویە لە تەئریخی کۆیە وا نەبووە!

حۆقەی ڕوون بە بیست و چوار ڕوپیەیە، یەعنی سی و شەش درهەم، تەئریخی کۆیە نەیدیوە، وە ئەووەڵی زستانە، ئەو قیمەتە ئەکا، مومکینە زیتر بڕوا، هەوراز چی.

شەوی سێ شەموو، سێیەم شەوی جەژنی قوربانە، خوای تەعالان بە کەرەمی خۆی بۆمان بکاتە جێژنی موبارەك، عن قریب جەژنی خیتامی حەڕب و عەلا بە خۆشی ببینین. ئامین[1].

٦٦٥/١٠

## بەو تەرزە بڕوا، بڕوا مەکە. تا ئەبەد مسوڵمانان ببنە ساحێبی خەلیفە

ئەلئان خەلیفە نیە، جامیعەی وەحدەتی ئیسلامییەت تێك چوو، قەومییەت هاتە گۆڕێ، بەو تەرزە بڕوا، بڕوا مەکە. تا ئەبەد مسوڵمانان ببنە ساحێبی خەلیفە، مەگەر بە هیممەت و بە قووەت و دەبابە و تەیارە و ئوسطولی ئینگلیز مومکینە، هەر شەی ئۆلەر![2]

بەڵای خوا زۆرە، بۆ هەیئەتی عوموومی برسیایەتی و نائەمینی لە هەمووی ناخۆشتر نییە؟ ئەمڕۆ غەلایە، غەلای هەموو شتە، وە ترس غالیبە، نعوذ بالله ئەگەر زستانی ناخۆش و ڕێبەندان بێ زۆر ناخۆشە، حەججاجی بیت الله ئەمساڵ زۆر کەمن، مەسرەف گرانە، کرێ باری ئەمسەر و ئەوسەر تا نەجەف دووسەد دینارە، مەسرەفی خواردن و خواردنەوە خوا ئەزانی، ئەگەر ئەهلی حیجاز بە مەکائینی ئاو ئیستیفادە لە بەحر نەکەن، لە مەولا بە حەججاجان بەڕێوەناچن. وە مەعلوومیش بوو لە

---

(١) ڕێکەوتەکە ساڵی ١٩٤٢یە.

(٢) دەربڕینێکی تورکیە بە مانای هەموو شتێك دەبێ یە.

